# صَحِيحُ الأَدَبِ المُفْرَدِ

## للإمَام البُخَارِي

به كوردى

وەرگێڕانی

سیروان کاکە أحمد

پرۆژەی پیت

بۆ وەرگێڕانی سەرجەم کتێبەکانی فەرموودە

ڕێکخراوی پیت
بۆ پەروەردە و توێژینەوەی زانستی

# صحيح الأدب المفرد
# بەکوردی


نووسینی: الإمام محمد بن إسماعيل البخاري، أبو عبدالله
وەرگێڕانی : سیروان کاکە أحمد
دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی
خەتی بەرگ : نەوزاد کۆیی
چاپی یەکەم : ١٤٤١ز - ٢٠٢٠ك
٤٦٤ لاپەڕە
١٧ * ٢٤ سم
بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٩٠٦ ) ی ساڵی ٢٠١٩ پێدراوە


کتێبخانەی بەناخوی — التفسير — ڕێنوێن RENWEN

# صحيح الأدب المفرد

# بەكوردی


نووسینی

الإمام الحافظ أبي عبد الله محمد بن إسماعيل البخاري

وەرگێڕانی

سیروان کاکە أحمد

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

پاش ستایشی شایستە بۆ خوای بەخشندە، صەڵات و سەلام برژێ بەسەر باشترین بەندەی خوا موحەممەد ﷺ و هاوەڵانی و شوێنکەوتوانی تا ڕۆژی دوایی....

لە خزمەت دا بوونی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بە هەر شێوازێک شەرەف و گەورەیی یەکەی زۆرە بۆ خزمەتکارەکە..

ئێمە وەک ستافی پیت، بە هاوکاری کۆمەڵێک مامۆستای قەدر گران و ئەهلی عیلم و خاوەن توانا و خاوەن عەزم، بڕیارماندا لە ماوەیەکی دیاری کراو بە پشتیوانی خوای پەروەردگار سەرجەم کتێبەکانی فەرموودە وەربگێڕین بۆ زمانی شیرینی کوردی لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە:

١)- نەبوونی ئاشنایەتی ئەم نەوەی نوێیە بە زمانی عەرەبی، کە ئەمەش دواجار دەبێتە بێ بەشبوونی نەوەی داهاتوو لە گەورەترین زانست کە میراتی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

٢)- هەژاری کتێبخانەی کوردی لە کتێبەکانی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە لە کتێبەکانی فەرموودە، تا ئێستا جگە لە (سنن أبي داود)[1] هیچ کتابێکی دیکە وەرنەگێڕدراوە بە کاملی لە سەرەتای تا کۆتایی.

لە ڕاستیدا ئەم پرۆژەیە بە هیچ جۆرێک ئامانجی بازرگانی و قازانجی ماددیی لە نیەتدا نیە.

داوای تەوفیق و هاوکاری لە خوای پەروەردگار دەکەین، لە دووعای خێری خۆتان ئەم ستافە و کارەکەی لە بیر مەکەن.

ستافی پیت

٢٠٢٠/٢/٢

---

(١) کە بەڕێز: (م. ناصح سازانی) وەریگێڕاوە.

## پێشەکی وەرگێڕ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

اللَّهُمَّ أعني يا معين، يا كريم

■ لە خزمەت فەرمایشتی خۆشەویستی خالق و مەخلوقدا، هەڵبژێردراوی نێو کەون و کائیناتدا، شانازی پێکراو لای فریشتەو مرۆڤ و جندا، ژیان لەگەڵ ڕووحی و تێکەڵاو بوون بە هەناسەی صاف و زاری پاك و پاراوو، تەعبیرە هەرە ڕاقی و سادەکانیدا، بیر کردنەوە لەو پیتانەی وشەکانی پێ تێکخستوون و ڕێکخستوون، ڕووحی حەقیقی دەبەخشێ بە جەستەدا، ئاااای کە ڕووح ئاسوودە دەبێ، ئاااای کە دڵیش زۆر ئارام و ساکین دەبێ، ئاااای کە زاریش پاك و بێگەردو صاف دەبێ، پەیامی چاویش لەم کاتە تەنها فرمێسك ڕشتنەو، گوێچکەکانیش خۆ حەز ناکەن ئەم وشەو فەرمایشتانە لە زاری تۆوە ببیستن، بەڵکو دێن و دیقەت دەدەن، ئەوەی چاو بۆیان دەبینێ و، دڵیش دێ تەعبیریان دەکات، حەواڵەی خاوەنیان دەکات، تا لە خودی زاتی پاکی خۆشەویستمان ﷺ جارێکی دی ببیستنەوە..!

بەڕێـــــزان!

بەندە لەم ماوە لە خزمەت خۆشەویستی خۆشەویست ﷺ بووم، واتە: ئیمام و پێشەوای فەرموودەناسان، خۆری تاقانە لە ئاسمانی زانستی فەرموودەناسی، کە موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخارییە، ژیانێکی زۆر تایبەت ژیاوم، بەڵام لەبەر ئەوەی چێژە ڕووحیەکان، بەرجەستە ناکرێن بە قسەو نووسین و هەر شێوازێکی دیکەی تەعبیر کردن، ناتوانم لە چەند دێڕێکدا باسیان بکەم..

بەرەکەتی ئەم کەڵە پیاوە بە کارەکەیەوە زۆر ڕوون و ئاشکرا دیارە، لە ئیخلاص و هەست نەکردن بە ماندوویی و خەمخۆریی و خۆشەویستی لە ڕادە بەدەری بۆ (محمد المصطفی ﷺ) وای لێکردوە، هەموو ژیانی تەرخان بکات بۆ خزمەت وشەو پیتە موبارەکەکانی کە لە قوڕگ و ناخ و زاری خۆشەویستمان ﷺ هاتوونە دەر، بۆ ئەو بەسە شەوێ وەفات کردنی، خۆشەویست ﷺ خۆی لە چاوەڕوانی دابووبێ و پێشوازی لێکردبێ!

## دەربارەی نێوەڕۆکی ئەم کتێبە!

■ هەر ئەوەندە دەڵێم: هەر کەس دەیەوێ بەرنامەی ژیانی خۆی ڕێکبخات، پێغەمبەر ئاسا ﷺ بژیێ، با شوێن هەنگاوەکانی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بکەوێ بە ڕەچاو کردنی ئەوەی لەم کتێبەدا هاتوە، چونکە بە مانای وشە حەقیقەتی ئەم کتێبە ئەوەیە:

دەیەوێ مرۆڤی مسوڵمان پەروەردە دەکات، لە گشت بوارەکاندا، لە ڕێکخستنی ژیانی لە هەر سێ جۆری پەیوەندی لەگەڵ خوا، لەگەڵ خۆی، لەگەڵ خەڵك، بێگومان هەر کەسێکیش بتوانێ ئەم سێ پەیوەندیە باش ڕێکبخات، هەم سەربەرزی دونیاو، هەم سەرفرازی قیامەتە، ئەوەش ئامانجی هەموو کەسێکی پەیامدارو سەر ڕاستە لە ژیان.

ئەوەی پێشەوا بوخاری لەم کتێبەدا تیشکی خستۆتە سەر، بریتیە لە باسی ئاداب و ڕەوشتە بەرزەکان، وەك:

ئەدەب و ڕەوشت بەرزی لەگەڵ خوای تعالی.

ئەدەب و ڕەوشت بەرزی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ.

ئەدەب و ڕەوشت بەرزی لەگەڵ دایك و باوك.

ئەدەب و ڕەوشت بەرزی لە نێوان هاوەڵان.

ئەدەب و ڕەوشت بەرزی لەگەڵ خزم و کەس.

ئەدەب و ڕەوشت بەرزی لەگەڵ هاوسەران.

ئەدەب و ڕەوشت بەرزی لەگەڵ دراوسێکان.

ئەدەب و ڕەوشت بەرزی لەگەڵ هەتیوەکان.

ئەدەب و ڕەوشت بەرزی لەگەڵ منداڵان.

ئەدەب و ڕەوشت بەرزی لەگەڵ گشت چین و توێژەکانی کۆمەڵگە بە گشتی و، ئەوانەی لێتەوە نزیکن بە تایبەتی، کە بێگومان هەموو تاکێك پێویستە ئەم ئاداب و ڕەوشت و چۆنیەتی مامەڵەکردنانە بزانێ، تاکو بتوانێ و بزانێ چۆن مافەکان دەدات و پێشێلیان ناکات.

هەموو ئەوانەو زۆر بە زیادەوەش لەم کتێبە باسکراون، وە ئەم کتێبە بە پێزە شەرح و ڕوونکردنەوەی زۆر بۆ کراوە، بەڵام لەبەر شێوازی کارکردنی ئێمە لەم پرۆژەدا کە بریتیە لە

وەرگێڕانی فەرموودەكان وەك خۆی بۆ زمانی شیرینی كوردی، هەڵساوین بە ئەصڵی ئیشەكە، لە هەندێك شوێن كە بە پێویست زانراوە، تێبینی، یان ڕوونكردنەوەك بنووسرێ، ئەوە نووسیومانە.

لێرەوەش دەمەوێ سوپاسی تایبەتی خۆم پێشكەش بە ستافی (پیت) بكەم، كە دەستیان داوەتە ئەم پرۆژە موبارەكەو دوعای خێرو پێزیان بۆ بكەم لە خوای بەخشندە زیاتریان پێ ببەخشێ لەوەی پێیداون، سەرگەرم و سەرقاڵی گەورەترین كارن كە خزمەتكردنی فەرمایشتی خۆشەویستە ﷺ، لە هەمان كات دووەم سەرچاوەی شەریعەتی ئیسلامە.

زۆر سوپاس بۆ هەردوو مامۆستای خۆشەویست و دڵسۆز: (د. عبدالخالق حمدامین، مامۆستا عباس محمد أمین)، كە سەرباری پێداچوونەوەی بەشێكی ئەم كتێبەو یارمەتی دانیان لە وەرگێڕان و وشە قورسەكان، چەندان فەرموودەشیان وەرگێڕاوە لەگەڵم، زۆریان لێ مەمنونم.

بەڵام مامۆستا (زانا عیسا عابكر)، وەرگێڕی كتێبی: (سنن الدارمي) ڕەنگە پشكی شێری پێ بڕابێ لەم كتێبە، خوا لێی قبووڵ بكات، هەر هەموو كتێبەكەی زۆر بە جوانی بەراورد كردوەو پێداچوونەوەی بۆ كردوە، سەرباری ئەوەی ئیشەكەی بەندەی ڕازاندۆتەوە، بەوە كە هەڵساوە بە ڕوونكردنەوەو تێبینی نووسین لەسەر زۆربەی ئەو فەرموودانەی پێویستیان بە ڕوونكردنەوە هەبووە، كارەكەی زۆر بەرز دەنرخێنم و پاداشتیم پێ نادرێتەوە هەرچەند باسی بكەم، بۆیە دەست بەرز دەكەمەوە دەڵێم: خوا یارمەتیتان بدات و دڵسۆزیتان زیاتر بكات.

سوپاس بۆ كوڕو كچە گەنجەكانمان، بۆ دڵسۆزی و خەمخۆریان وەك هەمیشە لە نووسینەكانی بەندە و هەركارێكی دیكەدا چالاكانە ئامادەن لە كاتە زێڕینەكانی خۆیانمان پێبدەن و پێداچوونەوەو هەڵەچنینی بۆ بكەن، ئەگەر بە ڕیز ناویان بێنم، خوشكەكانمان: (هاوژین أسعد، سارە عبداللّٰه، پشوو كریم، فیردەوس حاجی جمال)، وە برایانمان (قاسم سەلام، أحمد ئارامی، باوەڕ هێرۆیی، زمناكۆ مسعوودو هاوكارانی)، خوا بە باشترین شێوە پاداشتیان بداتەوەو داوای بەردەوامیان بۆ لە خوای بەرز دەكەین، خوا وێنەیان زۆر بكات.

لە كۆتـــایی:

لە وەرگێڕانی ئەم كتێبە بەپێزەدا شوێن هەنگاوەكانی پێشەوا بوخاری كەوتووم، وەك خادم و خزمەتكارێك، لە وەرگێڕانیش ئەم كەمە زانست و توانایەی خوا پێی بەخشیوم و بە یارمەتی هاوكارانم، ئەوەی تەواوو دروست بێ، هەمووی لە زاتی پاكی خوای تعالى وەیە، ئەوەی هەڵەو كەم و كوڕیە لە بەندەیە، بۆیە داوای لێبوردن لە خوا دەكەم، پاشان داوای ڕاستكردنەوەم لە هەڵەكان لە مسوڵمانان دەكەمـ تا لە چاپەكانی داهاتوو، دووبارە نەبنەوە.

سیروان كاكە أحمد - هەولێر

٦/ ٦/ ٢٠٢٠

## ڕوونکردنەوەی مانای: (الأدب المفرد)

■ **(الأدب)**: بریتیە لەو سیفەتانەی کە کەسی پەروەردەکار خەڵکی لەسەر پەروەردە دەکات، بە هاندانیان لەسەر ئەنجامدانی سیفەتە باشەکان و، خۆ دوورگرتنیان لە سیفەتە خراپەکان.

هەروەها دەگوترێ: (الأدب) بریتیە لە حاڵی خۆ پاڵفتەکردن لە هەڵسان و، دانیشتن و، ڕۆیشتن و، ڕەوشتی جوان و، کۆکردنەوەی هەموو سیفەتە پەسندو ستایشکراوەکان.

**(المفرد)**: واتە: بە تەنهاکراو، بەجیا، هۆکاری ناونرانی ئەم کتێبەی بە (الأدب المفرد)، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پێشەوا بوخاری کتێبێکی دیکەی هەیە بە ناوی (الجامع الصحيح المختصر)، کە مەشهورە بە (صحيح البخاري)، ئەم کتێبە بەشێکی تێدایە بە ناونیشانی (كتاب الأدب)، بۆ ئەوەی تێکەڵی ڕوونەدات لە گێڕانەوەی فەرموودەکانی بەشی (كتاب الأدب)ی (صحيح البخاري) لەگەڵ فەرموودەکانی ئەم کتێبەی ژێر دەستمان، کە باسەکانی هەمان بابەتن، هەڵساوە وشەی (المفرد)ی بۆ زیاد کردوە کە واتای (بەجیا) دەگەیەنێ، تا خەڵك فەرموودەکانی ئەم کتێبە بگێڕنەوەو بڵێن: لە (الأدب)ی بوخاری هاتوە، خەڵکیش وادەزانن مەبەست پێی (كتاب الأدب)ی صەحیحی بوخاریە، ئەمەش وادەکات هەڵەی گەورە ڕووبدات، چونکە لە (كتاب الأدب)ی صەحیحی بوخاری تەنها فەرموودەی صەحیح هێنراون، بەڵام لەم کتێبە فەرموودەی لاوازیش هێنراوە، «بەڵام ئێمە خۆمان ئەوانمان نەهێناوە» جا لەبەر ئەو مەبەستە ناو لەم کتێبە نراوە: (الأدب المفرد) ئەدەبە بە جیایەکە.

لە ڕاستییدا ئەم کتێبە موبارەکەی پێشەوا بوخاری ڕەحمەتی خوای لـێ بێ، کتێبێکی یەکجار بە کەڵکە، بۆ باش شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە ببێتە پێشەواو سەرمەشقێکی بەرجەستەکراو، بۆ ڕێکخستنی ژیانی تاکەکەسی هەر مسوڵمانێك، تا خۆی بڕازێنێتەوە بە کردارو گوفتارو ڕەوشتە بەرزو پەسندەکان.

پێشەوا بوخاری لەم کتێبەدا (١٣٢٢) فەرموودەو ئەسەرو وتەی بە نرخی هێناون و، دابەشی کردوون بۆ (٦٤٤) بەش.

**ئەوەی پێویستە بیڵێم:**

١- لەم کتێبەدا تەنیا ئەو فەرموودانە هێنراون لە پلەی (صحیح) و (حسن) دان، بۆیە وشەی (صحیح) زیاد کراوەو ناونراوە: (صحيح الأدب المفرد)، پاشان ئەو دەروازەو ژمارانەی لە نوسخەی

ئەصڵی دا هاتوون، بێگومان گۆڕانكاریی تێیاندا ڕوویداوە، بە هۆی ئەوەی بەشێك لەو دەروازە (باب)انە، لادراون، چونكە فەرموودەی ژێریان لاواز بوون، ئەمەش ناچاری كردووین، دووبارە ژمارەی نوێ بدرێتەوە بە فەرموودەكان، بە هەمان شێوە بە پێویست نەزانراوە، ژمارە بدرێ بە ناونیشانی بابەتەكان.

٢- هەر چی كەوتۆتە نێو دوو كەوانە لە وەرگێڕان جگە لە (رضي اللّٰه ... عنه، عنها، عنهما، عنهم)، باقی دی، زیادەی وەرگێڕە، بۆ مەبەستی ڕوونكردنەوەی زیاترو ڕوونتر بوونەوەی مەبەستی فەرموودەكە نووسراون.

٣- هەندێك فەرموودە وا دێنە پێش چاو دووبارەن لەم كتێبە، بەڵام ئەوانە دووبارە نین لە ڕووی سەنەدەوە، بەڵكو مەتنەكانیان وەك یەكن، ئەمەش زۆر جار پێشەوایان بۆ ئەوە ئەم كارە دەكەن، تا بۆمان بسەلمێنن جگە لەم هاوەڵە، چەندانی دیكە هەمان فەرموودەیان گێڕاوەتەوە، سەربارەی ئەوەش هێنانی هەر یەكەیان لە شوێنی خۆی بێگومان حیكمەت و سوودی تایبەت بە خۆی تێدایە، وە زانایانی ڕوونكەرەوەی فەرموودە باسیان كردوە.

٤- لە وەرگێڕانی ئەم كتێبە پشتم بەستوە بە نوسخەی: (الأدب المفرد بالتعليقات)[١]، هەرچەندە لە هەمان كات چاوم گێڕاوەتەوە بە نوسخەی دی، وەك تەحقیقی: (محمد فؤاد عبدالباقي): (الأدب المفرد- البخاري)[٢]، هەروەها تەحقیقی (علي عبد الباسط مزيد - وعلي عبد المقصود) نوسخەی (الأدب المفرد)[٣].

٥- بە شێك لە فەرموودەو شوێنەوارەكان لە قسەی هاوەڵان و شوێنكەوتووان، پێویستی بە ڕوونكردنەوە هەبوو، كە لەوەدا پشكی شێر بەر بەرێز مامۆستا (زانا عیسا عبابكر) كەوتووەو زۆربەی تێبینیەكان هی جەنابیانن.

٦- دەربارەی ناونیشانی بابەتەكان، زۆر خۆم پاراستوە لە دەستكاری كردنیان، مەگەر زۆر ناچار بووبم، بەوەی كە فەرموودە لابردرابێ و ناونیشانەكەش باسی ئەم بابەتە بووبێ، هەڵساوم بە پێی فەرموودەی دواتر ناونیشانەكەم داناوە.

---

(١) المؤلف: محمد بن إسماعيل بن إبراهيم بن المغيرة البخاري، أبو عبد الله (المتوفى: ٦٥٢هـ-). حققه وقابله على أصوله: سمير بن أمين الزهيري. مستفيدًا من تخريجات وتعليقات العلامة الشيخ المحدث: محمد ناصر الدين الألباني. الناشر: مكتبة المعارف للنشر والتوزيع، الرياض. الطبعة: الأولى، ٩١٤١ هـ-- ٨٩٩١ م. عدد الأجزاء: ٢، [ترقيم الكتاب موافق للمطبوع].

(٢) المؤلف: محمد بن إسماعيل أبو عبدالله البخاري الجعفي، الناشر: دار البشائر الإسلامية - بيروت، الطبعة الثالثة: ٩٠٤١ – ٩٨٩١، تحقيق: محمد فؤاد عبدالباقي، عدد الأجزاء: ١، الأحاديث مذيلة بأحكام الألباني عليها.

(٣) المؤلف: محمد بن إسماعيل أبو عبد الله البخاري الجعفي، تحقيق: علي عبد الباسط مزيد - وعلي عبد المقصود رضوان، الناشر: مكتبة الخانجي- مصر، الطبعة: الأولى ٣٢٤١ هـ - ٣٠٠٢ م، عدد الأجزاء : ١، كتب حواشيه: محمود خليل الصعيدي.

## ژیاننامەی پێشەوا بوخاری (رحمه الله)

**ناوو ڕەچەڵەکی:**

موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی موغیرەی کوڕی بەڕدیزبەی بوخاریە.

**کونیەکەی:**

ئەبو عەبدوڵلایە.

**نازناوی بوخاری:**

نیسبەتە بۆ شاری بوخارا، کە ئێستا دەکەوێتە خۆرئاوای وڵاتی ئوزبەکیستان.

**کات و شوێنی لەدایك بوونی:**

لە ڕۆژی هەینی، دوای نوێژی هەینی لە سێزدەی مانگی شەووالی ساڵی (١٩٤)ی کۆچی، لە شارێك بە ناوی بوخارا کە ئێستا سەر بە وڵاتی ئوزبەکیستانە منداڵێك لە دایك بوو، لە نێو ماڵێکی لێوانلێو لە ئیمانداریی و تەقواداریی، کەوتە نێو باوەشی دایك و باوکێکی پەرۆش بۆ عیبادەت و چاو بە فرمێسك بۆ خزمەتی ئیسلام، ئیدی خۆشەویستیان بۆ فەخری کائینات محمد المصطفی ﷺ وای لێکردن ناوی بنێن (مُحَمَّد)!

هەروەك چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی لێنرا موحەممەد، چونکە شایستەی ستاییش کردن و مەدح کردن بوو، یان بۆ ئەوەی لە داهاتوو کەسێکی ستایش کراوو مەدح کراو بێ، ئەم موحەممەدەی قوتابی پێغەمبەری خواش ﷺ کە پێشەوا بوخاریە، بە هەمان شێوە بوو بە ستاییشکراو تا ڕۆژی دوایی ئامانجی ناو لێنانەکەی هاتۆتەدی و هەر بە ستایشکراوی دەمێنێتەوە.

باوکی پێشەوا بوخاری زانایەکی فەرموودەناس بوو، فەرموودەی لە چەندین شەیخی گەورەوە گێڕاوەتەوە، بەڵام پێشەوا بوخاری هەر زۆر منداڵ بوو کاتێ باوکی وەفاتی کرد، بۆیە ئەم باوکە بەڕێزە، چاوی ڕۆشن نەبوو بە بینینی گەورەیی و بلیمەتی کوڕە جوانەکەی، کاتێ دەبێتە گەورەی جیهانی زانست، ئەم منداڵە مەزنە هەتیو کەوت و خۆشەویستی باوکی تێر نەبینی، بەڵام دایکێکی زێدە ئیماندارو بە سۆزو پەرۆش و دڵسۆزی بۆ بوخاری بەجێهێشت لەگەڵ سەروەت و سامانێك، کە بە کاسبیەکی حەڵاڵ دەستکەوتبوون، ئەوەتا باوکی خۆی کاتی مردن گوتوویەتی: (پێم وا نیە یەك درهەمی حەڕام، یان گوماناوی لە ماڵەکەمدا هەبێ)!

جا وەك سوننەتێكی ئیلاهی، پێغەمبەر ئاسا ﷺ، بوخاری بەبێ باوك مایەوە، تاوەكو خوای پەروەردگار خۆی هەمو كەسی بێ، دایكیشی ئافرەتێكی سەر بەرزو دەست بە دوعاو چاو بە فرمێسك و پەرۆش بوو بۆ خزمەتی ئیسلام، حەزی دەكرد منداڵەكەی پیاوێكی گەورەو مەزنی لێ دەربچێ، بۆ ئەوەی سەری خۆیانی پێ بەرز بكەن لە دوارۆژدا، بەڵام نەیدەزانی پەروەردگاری نەك منداڵەكەی هەر گەورە دەكات، بەڵكو دەیكات بە گەورەی گەورەكان، دەیكات بەو زێرینگەرەی فەرموودە زێرینەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەڵت و خاڵ و خەوش پاك بكاتەوەو بریسكایی كارەكانی چاوی گشت مرۆڤێكی بە ئینصاف سەرسام و حەیران دەكات.

**لە دەستدانی چاوەكانی پێشەوا بوخاری لە منداڵی:**

شایانی باسە پێشەوای پایەدار موحەممەدی كوڕی ئیسماعیلی بوخاری بە بچووكی چاوی لە دەستداوەو كوێر بووە، بەڵام دایكە بە سۆزو دڵسۆزەكەی چووە بەردەم دەرگای خوای بەخشندە، دەستی كرد بە لێدانی دەرگای ڕەحمەت و بەزەیی پەروەردگارو، ڕووخساری نوورانی تەڕ كرد بە فرمێسك ڕشتن، لە سوجدەو ڕكووع و شەونوێژدا، تاوەكو خوا چاوە جوانەكانی كوڕە شیرینەكەی بگەڕێنێتەوە، بۆ ئەوەی پەڕاوەكانی زانست و كتێبی زانایانی پێ ببینێ و بتوانێ خزمەتی ئیسلام و فەرموودەكانی پێغەمبەری خوای ﷺ پێ بكات، جا خوای پەروەردگار چۆن دوعاو پاڕانەوەی ئەو شێرە ژنانە ڕەت دەكاتەوە؟! بەڵكو قبووڵی كردو شەوێكیان پێغەمبەر ئیبراهیمی لە خەودا بینی و پێی فەرموو: (خوا بینایی بۆ كوڕەكەت گەڕاندەوە بە هۆی زۆر گریان و فرمێسك ڕشتنت). دایكی كە هەڵساو بەیانی كردەوە بینی منالەكەی بینایی گەڕاوەتەوەو دەبینێ، پەروەردگار ئەم كەرامەتە گەورەیەی بە دایكی پێشەوا بوخاری بەخشی.

ئیدی دایكە مەزنەكە، بوخاری بچووكی خستە بەر خوێندن و بردیە خزمەتی زانایان، پێشەوا بوخاریش هەر لە تەمەنی دە ساڵیەوە زیرەكی و لێهاتووییەكەی بۆ زانایان دەركەوت، كاتێ لەو تەمەنە دەستی بە خوێندن كرد لای زانایانی شاری بوخارا، وە لە تەمەنی شازدە ساڵی كتێبەكانی ئیبنو موبارەك و وەكیعی لەبەر كردن، وەك خۆی دەفەرموێ: (ئەو كاتەی لە مەكتەبەكانی قوڕئان لەبەركردن بووم، ئیلهامم بۆ هات و دڵم چوو بۆ فەرموودە لەبەر كردن، لە كاتێكدا تەمەنم دە ساڵ بوو، جا كە كەوتمە نێو تەمەنی شازدە ساڵیەوە كتێبەكانی ئیبنو موبارەك و وەكیعم لەبەر كردن و باش لێیان تێدەگەیشتم).

دواتر یەكەم گەشتی زانستی دەست پێكرد بۆ دەرەوەی شاری خۆی و، چوو بۆ مەككە لەگەڵ دایكی و برای، جا دایك و براكەی گەڕانەوەو، ئەویش لەوێ مایەوە، لە خزمەتی زانایان دەستی كرد بە لەبەركردن و وەرگرتنی زانستەكانی فەرموودە، ئەمەش لە ساڵی دوو سەدو دە (۲۱۰) بوو، واتە: ئەو كاتە تەمەنی شازدە ساڵان بووە.

ئنجا دوای وەرگرتنی زانستی زانایانی مەککە، چوو بۆ مەدینەو شام و میسرو نەیسابوورو جزیرەو بەصرەو کوفەو بەغدا و واسط و مرووری و بەلخ و شوێنی دیکە، ئەوەتا خەتیب دەفەرموێ: «گەشتی کردوە بۆ لای گشت زانایانی شارەکان».

**مامۆستاکانی پێشەوا بوخاری:**

پێشەوا بوخاری مانگێك پێش وەفات کردنی خۆی دەفەرموێ: (فەرموودەم نووسیوەتەوە لە هەزاو هەشتا کەسەوە، جا فەرموودەی وەرگرتووە لە گەورە زانایانی تابعی تابعین و، زانایانی وەك خۆی و، زانایانی خوارتر لە خۆی، ئەوەش نیشانەی کاملّی و پڕ زانستی خۆیەتی، وەك وەکیع گوتوویەتی: (پیاو نابێتە زانا تاوەکو فەرمووده نەگێڕێتەوە لە زانایانی گەورەی سەرووی خۆی و، زانایانی وەکو خۆی و، زانایانی خوار خۆی).

کەواتە ئەم پیاوە ئۆقیانوسێك بووە گشت دەریاو دەریاچەو ڕووبارو جۆگەلەی سازگار هاتۆتە ناویەوەو بۆتە سەرچاوەی گشت سەرچاوەکان.

**قوتابیەکانی پێشەوا بوخاری:**

دەبێ چ حەشاماتێك تەصەوور بکرێ لە زانایەك کە گشت قوتابیانی زانست لە سەرانسەرو تەواوی جیهان حەزیان کردوە تەنها بۆ جارێکیش بێت ببینن، حافز صالّحی کوڕی موحەممەد جەزەرە گوتوویەتی: (تەنها لە بەغدا زیاتر لە بیست هەزار قوتابی فەرموودەیان لە خزمەتی دەنووسیەوەو لە مەجلیسەکەی ئەو بوون). وە نزیکەی نەوەد هەزار کەس صەحیحی بوخاریان لە خۆیەوە گوێ لێ بووە، وە گەورە زانایانی بە ناوبانگ فەرموودەیان لەوەوە گێڕاوەتەوە، وەك: پێشەوا موسلیم و، پێشەوا تیرمذی و، پێشەوا ئیبنو خوزەیمەو، پێشەوا ئەبو حاتەم و، پێشەوا ئەبو زورعەو صالّحی کوڕی موحەممەدی جەزەرەو زۆری دیکە.

**عیبادەت و پەرستشی:**

پێشەوا بوخاری مۆمێکی خۆر ئاسا بوو، لە نێو عیبادەت و خزمەتکردنی ئیسلام وەك مۆم توابوویەوە، ئەوەتا کاتێ قاچەکانی دەکەوتنە نێو ڕەمەزان هاوەڵ و هاوڕێکەکانی لە دەوری کۆدەبوونەوە، چونکە دەیانزانی ڕەمەزان لەگەڵ ئەودا گەورەیی یەکجار زیاتری هەیە، بۆیە دەچوونە خزمەتی و ئەویش پێشنوێژی بۆ دەکردن و لە هەر ڕکاتێکدا بیست ئایەتی دەخوێند، تاوەکو قورئانی خەتم دەکرد، وە لە کاتی سەحەردا، بە سێ سەحەر قورئانی خەتم دەکرد، وە لە هەموو ڕۆژێکیشدا خەتمێکی دەکرد، کۆتایی خەتمەکەشی دەکەوتنە کاتی ڕۆژوو شکاندن، وە لە کاتی سەحەردا سێزدە ڕکات شەونوێژی دەکرد لەگەڵ ڕکاتێکی ویتر.

وە هەندێك لە مووی موبارەکی پێغەمبەری خوای ﷺ، بەردەوام لە نێو پۆشاکەکانیدا بوون، کە دەیپۆشین.

ڕۆژێك نوێژی دەکردو، زەنگەسۆرە (زەردەواڵە) حەڤدە جار پێوەیداو گەستی، هەر نوێژەکەی نەبڕی و بەردەوام بوو، وە کاتێ کتێبە صەحیحەکەی خۆی نووسیوە، لە کاتی نوسینی هەر فەرموودەیەك دوو ڕکات نوێژی دەکرد، ئا ئەوە بەشێك لە ڕووە دیارەکانی عیبادەتی ئەم زاتە گەورەیە بوو.

**دڵ و زمانی:**

خۆی دەفەرموێ: (ئومێدم وایە بگەمەوە بە خوا لە کاتێکدا لێپێچینەوەو لێپرسینەوەم لەگەڵ نەکات لەسەر ئەوەی غەیبەتی یەك کەسیشم کردبێ).

جا هەرچەندە کاری ئەو ئەوەبووە خەڵکی خراپ دەربکات و بیاندۆزێتەوە لە نێو فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە سیفەتە خراپەکانیان دەربخات، بەڵام ئەو ئەم کارەی ئەنجامداوە بێ ئەوەی قسەی ڕەق و غەیبەتکاری بکات، واتە: لە جیاتی بیگوتبا فڵانە کەس درۆزنە، دەستی، یان زمانی ناپاکە، دەیفەرموو: فڵان کەس فەرمودەکانی مونکەڕن، فڵانە کەس تێبینی لەسەرە (هەرچەندە لەو حاڵەتانەدا ئەگەر باسی سیفەتە خراپەکەشی بکرێ بە غەیبەت هەژمار ناکرێ)، بەڵام ئەوە پێشەوای پێشەوایانە بوخاری، بۆیە دڵێکی وەك بەفر سپی و پاك ئاسای هەیە، ئامادە نیە ژەنگاوی تۆزاوی بکات، بەڵکو هەتا جوانی هەبێ لە خۆی دەئاڵێنێ و، خۆی پێ دەڕازێنێتەوە.

**زیرەکی و بەهرەداری:**

پێشەوا بوخاری خۆی دەفەرموێ: (سەد هەزار فەرموودەی صەحیحم لەبەرە، لەگەڵ دوو سەد هەزار فەرموودەی غەیری صەحیح (واتە: حەسەن و زەعیف و ...هتد).

**تێبینیەکی پێویست دەربارەی ژمارەی فەرموودەکانی لەبەری بوون:**

کاتێك دەخوێنینەوە زانایانی پێشوو ملیۆنێك، یان چەند ملیۆنێك، یان شەست هەزار، یان سەد هەزار فەرموودەیان لەبەر بووە، ئەوە مانای ئەوە نیە ئەوەندە مەتنە بونی هەبووبێ، نەخێر چونکە ژمارەی گشت فەرموودەکان ناگاتە (١٥) هەزار، بەڵام زانایانی پێشوو هەر سەنەدێکیان بە فەرموودەیەك ئەژمار دەکرد، بۆیە یەك فەرموودە دەیان و سەدان سەنەدی هەبووە، ئەوانیش ئەم سەدان سەنەدەیان بە سەدان فەرموودە ناو هێناوە، بۆیە دەبینین پێشەوا بوخاری دەفەرموێ: فەرموودەکانی کتێبی (الجامع الصحيح) واتە: فەرموودەکانی صەحیحی بوخاریم لە نێوان شەست

هەزار فەرموودەی صەحیح هەڵبژاردوە، واتە: ئەو فەرموودانەی ئێستا دەیانبینین لە صەحیحی بوخاری بوونیان هەیە، شەست هەزار سەنەدی جیاوازیان هەبووە، جا پێشەوا بوخاری تەنها چاكترین سەنەدەكانی هێناوە، كە بریتیە لەوەی لەبەر دەستمان دایە.

هەر لە باسی زیرەكی و بەهرەداری پێشەوا بوخاری دا، موحەممەدی كوڕی ئەبو حاتەمی وەڕڕاق دەڵێ:

گوێم لە حاشیدی كوڕی ئیسماعیل و یەكێكی دیكەش بوو دەیانگوت: پیشەوا بوخاری لەگەڵ ئێمە هاموشۆی زانایانی فەرموودەناسی بەصرەی دەكرد لە كاتێكدا مێردمنداڵ بوو، فەرموودەكانی نەدەنووسینەوە تا چەند ڕۆژێك تێپەڕ دەبوو، گوتمان: تۆ لەگەڵ ئێمە دێیت و ناشنووسیتەوە، چی دەكەیت؟ ئیدی ڕۆژێكیان دوای تێپەڕ بوونی شازدە ڕۆژ پێی گوتین: ئێوە زۆر زەخت و فشارم لێ دەكەن (بۆیە نهێنیەكە دەدركێنم)، ئا دەی پرسیارم لێ بكەن لەو فەرموودانەی ئێوە نوسیووتانە، دەڵێن: ئێمەش ئەو فەرموودانەمان بۆ دەرخست كە لامان بوو، هەموو فەرموودەكانی بە لەبەر خوێندەوە، تا وای لێهات ئێمە تەماشای نووسراوەكانی خۆمانمان دەكردو هەڵەكانمان ڕاست دەكردەوە كاتێ ئەو بە لەبەر دەیخوێندەوە (واتە: ئێمە دەشمان نووسیەوە، ئنجا هەڵەشمان كردبوو، ئەو نەشیدەنووسیەوەو هەڵەشی نەدەكرد)، دوایی گوتی: پێتان وایە من بێ هودە دێم و ڕۆژگارەكانم بە فیڕۆ دەدەم؟! دەڵێن: ئنجا زانیمان كەس ناتوانێ پێشی بكەوێتەوە.

پێشەوا ئیبنو كەثیر دەفەرموێ: (باسكراوە پێشەوا بوخاری یەك جار تەماشای نوسراوێكی دەكرد، ڕاستەوخۆ هەر بەو تەماشا كردنە لەبەری دەكرد).

لە سەمەرقەند چوارسەد كەس هەبوون كە زاناو فەرموودەناس بوون، حەوت ڕۆژ كۆبوونەوە، بۆ پێشەوا بوخاری دانیشتن تاكو تاقی بكەنەوەو هەڵەیەكی لێ بگرن، چونكە بیستبوویان كە چ شاخێكی پۆلایینە، جا سەنەدەكانی شامیان تێكەڵ كرد لەگەڵ سەنەدەكانی عێڕاق و، سەنەدەكانی یەمەنیشیان تێكەڵ كرد لەگەڵ سەنەدەكانی مەككە و مەدینە، سەرەنجام هەر هەمووی بۆ ڕێكخستن و جیاكردنەوەو نەیانتوانی تەنها یەك دانە هەڵەشی لێ بگرن، نە لە سەنەد و نە لە مەتن (واتە: سەنەدی هەموو فەرموودەكانی ڕێكدەخستەوە).

جارێكی دیكەش لە بەغدا زانایان بۆی كۆبوونەوەو سەنەدی سەد فەرموودەیان لێ تێكەڵ كرد، دوایی هەر دە فەرموودە تێیاندا درا بە زانایەك، جا بە نۆرە پرسیاریان لە پێشەوا بوخاری دەكردو فەرموودەكەیان دەخوێندەوە بە سەنەدەوە، پێشەوا بوخاریش هەر دەیگوت: ئەم فەرموودەیە ناناسم، ئەم فەرموودەیە ناناسم، جا كە هەر سەد فەرموودەكە تەواو بوو لە یەكەم

کەسیانەوە دەستی پێکردو فەرموودەکەی بۆ ڕاست کردنەوە تا کۆتا کەس و کۆتا فەرموودە، ئیدی زانایان سەریان سوڕما لەو بەهرە خواییەو، دانیان نا بە زیرەکی و تۆکمەیی زانستی پێشەوا بوخاری ڕەحمەتی خوا لە هەموو زانایان بێ.

**مەدح و ستایشی زانایان بۆ پێشەوا بوخاری:**

پێشەوا عەلی ئیبنو مەدینی گوتوویەتی: (بوخاری هیچ کەسێکی وەکو خۆی نەدیوە).

پێشەوا عەمرِی کوڕی عەلی فەلاس گوتوویەتی: (فەرموودەیەك بوخاری نەیزانێ فەرموودە نیە).

پێشەوا تیرمذی گوتوویەتی: (کەسم لە عێراق و خۆراسان نەبینی زاناترو شارەزاتر بێ لە بوخاری لە عیلەل و مێژوو و سەنەددا).

پێشەوا موسلیم کاتێ چوو بۆ لای پێشەوا بوخاری گوتی: «لێمگەڕێ با پێیەکانت ماچ بکەم ئەی مامۆستای گشت مامۆستایان و، گەورەی گشت فەرموودەناسان و، پزیشکی فەرموودەو عیلەلەکانی فەرموودە).

وە پێشەوا موسلیم فەرموویەتی: (کەس ڕقی لێت نابێتەوە تەنها حەسود نەبێت، وە شاهێدی دەدەم کە کەس لە دونیا هاوتای تۆ نیە).

پێشەوا ئەحمەد فەرموویەتی: (خۆراسان کەسی وەکو پێشەوا بوخاری لێ دەرنەچووە).

زانایانی بەصرە گوتوویانە: (لە دونیادا کەس هاوتای پێشەوا بوخاری نیە لە زانست و لە چاکیدا).

پێشەوا ئیبنو خوزەیمە گوتوویەتی: (لە ژێر ئاسماندا کەسم نەدیوە زاناترو لەبەرکارتر بێت بۆ فەرموودەی پێغەمبەری خوا لە موحەممەدی کوڕی ئیسماعیل).

پێشەوا ئیبنو کەثیر دەڵێ: (پێشەوا بوخاری لەوپەڕی حەیا و ئازایەتی و سەخاوەت و وەرع و زوهد و دونیانەویستی بوو لە دونیا، وە لەوپەڕی ڕەغبەت بوو بۆ دوارۆژ).

زۆر زانای دیکە مەدح و ستایشیان کردوە، بەڵام ئەوەندە بەسسە کە چەندین زانای گەورەی وەك: پێشەوا زەهەبی و، ئیبنو کەسیر و، ئیبنو حەجەرو ... هتد، کتێبی سەربەخۆیان داناوە لەسەر ژیاننامەی ئەم زاتە گەورەیە.

**هەندێ لە وتەکانی پێشەوا بوخاری:**

١- فەرموویەتی: (هیچ شتێك نازانم چاکتر و بە سوودتر بێ بۆ حیفز و لەبەرکردن، لە حەزلێبوونی پیاو بۆ زانست و بەردەوامی بە دواگەڕان و بیرلێکردنەوەو زۆر سەیر کردن).

٢- فەرموویەتی: (ناكرێ مسوڵمان بە شێوەیەك (پەیوەندی لەگەڵ خوادا لاواز بێ) كاتێ دوعای كرد، وەڵام نەدرێتەوە).

٣- فەرموویەتی: (نەمزانیوە هیچ شتێك هەبێت مرۆڤ پێویستی پێ بێت حەتمەن لە قورئان و سوننەتدا بوونی هەیە).

## گرینگترین كتێبەكانی

١- الجامع الصحيح.

٢- الجامع الصغير.

٣- الجامع الكبير.

٤- الأدب المفرد.

٥- أسامي الصحابة.

٦- الأشربة.

٧- التفسير الكبير.

٨- التاريخ الكبير.

٩- التاريخ الأوسط.

١٠- التاريخ الصغير.

١١- الضعفاء الصغير.

١٢- خلق أفعال العباد.

١٣- رفع اليدين في الصلاة.

١٤- العلل.

١٥- الفوائد.

١٦- القراءة خلف الإمام.

١٧- قضايا الصحابة والتابعين وأقاويلهم.

١٨- الكُنَى.

١٩- المبسوط.

٢٠- المسند الكبير.

## وەفاتی پێشەوا بوخاری

■ دوای ئەوەی پێشەوا بوخاری گەڕایەوە بۆ بوخارا، والی بوخارا کە ناوی خالیدی کوڕی ئەحمەدی زوهلی بوو داوای لێکرد بێتە ماڵەکەیان و کتێبە صەحیحەکەی لەگەڵ تاریخەکەی بۆ منالەکانی بخوێنێتەوە، پێشەوا بوخاریش ئەوەی ڕەت کردەوە، گوتی: من زانست سووك ناکەم و نایبەمە بەر دەرگای خەڵکی، هەر کەسێك زانستی دەوێ با بێتە مزگەوت و لە مەجلیسی من دابنیشێ، جا ئەوە بوو والی لێی تووڕە بوو و دەری کرد لە بوخارا، ئەویش چوو بۆ سەمەرقەند کە خزمەکانی لەوێ بوون، جا لەلای ئەوان چەندین ڕۆژ مایەوەو نەخۆش کەوت زۆر بە سەختی، جا گوێیان لێ ببوو شەوێکیان دوای تەواو کردنی شەونوێژ دەپاڕایەوە دەیفەرموو: ئەی خوای پەروەردگار من زەویم لەسەر تەسك بۆتەوە، بۆیە بمگەڕێنەوە لای خۆت). جا ئەو مانگە تەواو نەبوو ئەم خۆرە مەزنە ئاوا بوو، ڕووناکی دونیای زانست لە خۆیدا کەم کردوە.

جا ئەوە بوو پێشەوای پێشەوایان، لە شەوی شەممە کە هاوکات بوو لەگەڵ شەوی جەژن، لە دوای نوێژی عیشا، لە ساڵی دوو سەدو پەنجا (٢٥٠)دا لە تەمەنی شەست و دوو ساڵیدا کۆچی دوایی کردو، جەژن بە هۆیەوە بوو بە ماتەمینی و دڵتەنگی، جا لە ڕۆژی جەژن دوای نیوەڕۆ سپاردەی خوا کراو لە ژێر خاك دانرا.

هەزاران ڕەحمەت لەو خۆرە مەزنەی ئاسمانی ئیسلامەتی بێ، جێگەی فیردەوسی ئەعلا بێ، ئامین یا مجیب السائلین.

## دەربارەی: فەرمایشتی خوای بەرز: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حُسْنًا ﴾[1].

١- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ: أَيُّ الْعَمَلِ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ؟ قَالَ: «الصَّلَاةُ عَلَى وَقْتِهَا»، قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «ثُمَّ بِرُّ الْوَالِدَيْنِ»، قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «ثُمَّ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»، قَالَ: حَدَّثَنِي بِهِنَّ، وَلَوِ اسْتَزَدْتُهُ لَزَادَنِي»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد: کام کردەوە خۆشەویستترینە لە لای خوای زاڵی پایەدار؟ فەرمووی: نوێژ ئەنجامدان لە کاتی خۆیدا، گوتم: دوای ئەو؟ فەرمووی: پاشان چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك، گوتم: دوای ئەو؟ فەرمووی: پاشان تێکۆشان لە پێناوی خوا، (عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ) باسی ئەوانەی بۆ کردم، جا ئەگەر داوای زیاترم کردبایە، ئەوە بۆی زیاتر دەکردم!

تێبینی: بۆیە چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك گەورەترە لە تێکۆشان لە پێناوی خوا، چونکە تێکۆشان لە پێناوی خوا زۆربەی کات بە کۆمەڵە کەسێك ئەنجام دەدرێ، بەڵام چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك هەموو کات پێویستە، هەروەها لەبەر ئەوەی ئەگەر کەسێك فێر بکرێ لەگەڵ دایك و باوکی چاکەکاربێ و خۆشی بووێن، ئەوە فێری خۆشەویستی ئایین و نیشتمان و تێکۆشانیش دەبێ لە پێناوی شتە بە نرخەکان و، قەدریان دەزانێ «واللّٰه أعلم».

٢- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: رِضَا الرَّبِّ فِي رِضَا الْوَالِدِ، وَسَخَطُ الرَّبِّ فِي سَخَطِ الْوَالِدِ»[3].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: ڕەزامەندی خوا لە ڕەزامەندی دایك و باوك دایە، وە تووڕەیی خوا لە تووڕەیی دایك و باوك دایە.

(چونکە چاك بوون لەگەڵ دایك و باوك جێبەجێکردنی فەرمانی خوایەو، ئازاردانیشیان شکاندنی فەرمانی خوایە).

---

(١) العنكبوت: ٨.

(٢) صحيح: «الإرواء» (٨٩١١): [البخاري: ٩- مواقيت الصلاة، ٥- باب: فضل الصلاة لوقتها. مسلم: كتاب الإيمان ح ٧٣١].

(٣) حسن موقوفاً، وَصَحَّ مَرفوعاً: «السلسلة الصحيحة» (٥١٥).

## دەربارەی: چاکەکاری لەگەڵ دایك

٣- «عَنْ حَكِيمِ بْنِ مَعَاوِيَةَ بْنِ حَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَنْ أَبَرُّ؟ قَالَ: «أُمَّكَ»، قُلْتُ: مَنْ أَبَرُّ؟ قَالَ: «أُمَّكَ»، قُلْتُ: مَنْ أَبَرُّ؟ قَالَ: «أُمَّكَ»، قُلْتُ: مَنْ أَبَرُّ؟ قَالَ: «أَبَاكَ، ثُمَّ الْأَقْرَبَ فَالْأَقْرَبَ»»[1].

واتە: حەکیمی کوڕی موعاویەی کوڕی حەیدە (خوا لێی ڕازی بێ)، لە باوکی دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ کێ زۆرچاکەکاربم؟ فەرمووی: دایکت، گوتم: (دوای ئەو) لەگەڵ کێ زۆرچاکەکاربم؟ فەرمووی: دایکت، گوتم: (دوای ئەو) لەگەڵ کێ زۆرچاکەکاربم؟ فەرمووی: دایکت، گوتم: (دوای ئەو) لەگەڵ کێ زۆرچاکەکاربم؟ فەرمووی: باوکت، پاشان کەسانی نزیکترین و ئنجا نزیکترین (وەك: براو خوشك و مام و پوورو پلك و خاڵ ... هتد).

تێبینی: بۆیە دایك پێش باوك خراوە بە چەند جارێك، چونکە ماندوبوون و ئازاری دایك بە منداڵەکانیەوە زۆر زیاترە لە هی باوك، یانیش لەبەر ئەوەیە زۆر خەم لە منداڵەکانی دەخوات، بۆیە دەبێ منداڵیش زیاتر بە تەنگ چاکە لەگەڵ کردنیەوە بێ -واللّٰه أعلم-.

٤- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّهُ أَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: إِنِّي خَطَبْتُ امْرَأَةً، فَأَبَتْ أَنْ تَنْكِحَنِي، وَخَطَبَهَا غَيْرِي، فَأَحَبَّتْ أَنْ تَنْكِحَهُ، فَغِرْتُ عَلَيْهَا فَقَتَلْتُهَا، فَهَلْ لِي مِنْ تَوْبَةٍ؟ قَالَ: أُمُّكَ حَيَّةٌ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: تُبْ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَتَقَرَّبْ إِلَيْهِ مَا اسْتَطَعْتَ، فَذَهَبْتُ فَسَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ: لِمَ سَأَلْتَهُ عَنْ حَيَاةِ أُمِّهِ؟ فَقَالَ: إِنِّي لاَ أَعْلَمُ عَمَلاً أَقْرَبَ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ مِنْ بِرِّ الْوَالِدَةِ»[2].

واتە: پیاوێك هاتە لای عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، گوتی: من داخوازی ئافرەتێکم کرد، ڕازی نەبوو شووم پێبکات، وە کەسێکی دیکە داخوازی کردو پێی خۆش بوو هاوسەرگیری لەگەڵ ئەودا بکات، منیش غیرەم جووڵا لەسەری و ئافرەتەکەم کوشت، جا ئایا تەوبەم بۆ هەیە؟ عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس گوتی: ئایا دایکت زیندووە (ماوە لە ژیان)؟ (کابرا) گوتی: نەخێر، (ئیبنو عەبباس) گوتی: بگەڕێوە بۆ لای خوای زاڵی پایەدارو تەوبە بکە، وە بە هەرچی لە تواناتدا هەیە لێی نزیك ببەرەوە، (موجاهد) دەڵێ: منیش ڕۆیشتم بۆ لای ئیبنو عەبباس و پرسیارم لێکرد (گوتم): بۆ پرسیارت دەربارەی دایکی کرد؟ گوتی: من هیچ کردەوەیەکم پێ شك نایەت خاوەنەکەی لە خوای (عز وجل) نزیك بکاتەوە وەك چاکە کردن لەگەڵ دایك.

---

(١) حسن: «الإرواء» (٢٣٢٢، ٩٢٨): [الترمذي: ٥٢- كتاب البر والصلة، ١- باب: ما جاء في بر الوالدين، ح ٧٩٨١].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٩٩٧٢). وا پێدەچێ ئەم کارەی پێش مسوڵمان بوونی ئەنجام دابێ.

## دەربارەی: چاكەكاری لەگەڵ باوك

٥- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَنْ أَبَرُّ؟ قَالَ: «أُمَّكَ»، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «أُمَّكَ»، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «أُمَّكَ»، قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «أَبَاكَ»»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوترا: (واتە: یەكێك گوتی:) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ كێ زۆرچاكەكاربم؟ فەرمووی: دایكت، گوتی: دواتر كێ؟ فەرمووی: دایكت، گوتی: دواتر كێ؟ فەرمووی: دایكت، گوتی: دواتر كێ؟ فەرمووی: باوكت. (كەواتە: دایك سێ پلە لە پێش باوكەوەیە، بۆ چاكە لەگەڵ كردن).

٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَتَى رَجُلٌ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: مَا تَأْمُرُنِي؟ فَقَالَ: «بِرَّ أُمَّكَ»، ثُمَّ عَادَ، فَقَالَ: «بِرَّ أُمَّكَ»، ثُمَّ عَادَ، فَقَالَ: «بِرَّ أُمَّكَ»، ثُمَّ عَادَ الرَّابِعَةَ، فَقَالَ: «بِرَّ أَبَاكَ»»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: بە چی فەرمانم پێدەكەی؟ فەرمووی: چاكەكاربە لەگەڵ دایكت، دوایی پیاوەكە دووبارەی كردەوە، (پێغەمبەری خوا ﷺ) هەر فەرمووی: چاكەكاربە لەگەڵ دایكت، پاشان (پرسیارەكەی سێ بارە كردەوە) هەر فەرمووی: چاكەكاربە لەگەڵ دایكت، ئنجا بۆ جاری چوارەم كە پرسیاری لێكردەوە (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: چاكەكاربە لەگەڵ باوكت.

## دەربارەی: نەرم و نیان قسە كردن لەگەڵ دایك و باوك

٧- «عَنْ طَيْسَلَةَ بْنِ مَيَّاسٍ قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّجَدَاتِ، فَأَصَبْتُ ذُنُوباً، لاَ أَرَاهَا إِلاَّ مِنَ الْكَبَائِرِ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِابْنِ عُمَرَ قَالَ: مَا هِيَ؟ قُلْتُ: كَذَا وَكَذَا، قَالَ: لَيْسَتْ هَذِهِ مِنَ الْكَبَائِرِ، هُنَّ تِسْعٌ: الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَقَتْلُ نَسَمَةٍ، وَالْفِرَارُ مِنَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَةِ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، وَإِلْحَادٌ فِي الْمَسْجِدِ، وَالَّذِي يَسْتَسْخِرُ، وَبُكَاءُ الْوَالِدَيْنِ مِنَ الْعُقُوقِ، قَالَ لِي ابْنُ عُمَرَ: أَتَفْرَقُ النَّارَ، وَتُحِبُّ أَنْ تَدْخُلَ الْجَنَّةَ؟ قُلْتُ: إِي وَاللَّهِ، قَالَ: أَحَيٌّ وَالِدُكَ؟ قُلْتُ: عِنْدِي أُمِّي، قَالَ: فَوَاللَّهِ لَوْ أَلَنْتَ لَهَا الْكَلاَمَ، وَأَطْعَمْتَهَا الطَّعَامَ، لَتَدْخُلَنَّ الْجَنَّةَ مَا اجْتَنَبْتَ الْكَبَائِرَ»[3].

---

(١) صحيح: «الإرواء» (٧٣٨): [البخاري: ٨٧- كتاب الأدب، باب: من أحق الناس بحسن الصحبة. مسلم: ٥٤- كتاب البر والصلة والآداب، ح١، ٢، ٣].

(٢) صحيح: انظر ما قبله.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨٩٨٢).

واتە: طەیسەڵەی کوڕی مەییاس، دەڵێ: لەگەڵ کۆمەڵە خەڵکێکی خەواریج بووم، تووشی گوناهێك بووم، وە پێم وا بوو ئەوە لە گوناهە گەورەکانە (زۆر گوناهیان، بە هی گەورە دادەنا کە لە ئەصڵدا گوناهی بچوك بوون)، جا ئەوەم بۆ ئیبنو عومەر باسکرد (گوتم: تووشی گوناهێك بووم)، گوتی: تاوانەکە چیە؟ گوتم: ئەوەو ئەوەیە، فەرمووی: ئەوە لە نۆ گوناهە گەورەکان نیە، (کە بریتین لەوانە): هاوبەش بۆ خوا دانان، کوشتن و لە ناوبردنی ڕووحێك (بە ناهەق)، هەڵاتن لە جەنگ، بوختان هەڵبەستن بۆ کەسی داوێن پاك، خواردنی سوو، خواردنی ماڵی هەتیو، سەرپێچی و تاوان کردن لە مزگەوت و، کار بە یەکێك بکەیت و کرێکەی پێنەدەیت و، گریاندنی دایك و باوك بە هۆی خراپ بوون لەگەڵیان، (پاشان) ئیبنو عومەر پێی گوتم: دەتەوێ جیابیتەوەو دوورکەویتەوە لە ئاگرو پێشتخۆشە بچیتە بەهەشت؟ گوتم: ئەرێ وەڵڵا، فەرمووی: دایك و باوکت ماون؟ گوتم: دایکم ماوەو لەلامە، فەرمووی: وەڵڵاهی ئەگەر قسەی نەرم و نیانی لەگەڵ بکەی، خواردنی پێبدەی، ئەوە بە دڵنیایی دەتخاتە بەهەشت مادام خۆت لە گوناهە گەورەکان بپارێزی.

٨- «عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: ﴿وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ ﴿٣٤﴾﴾ الإسراء، قَالَ: لاَ تَمْتَنِعْ مِنْ شَيْءٍ أَحَبَّاهُ»[١].

واتە: هیشامی کوڕی عورِوە لە باوکی دەگێڕێتەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ ﴿٣٤﴾﴾ الإسراء، کە دەفەرموێ: (باڵی میهرەبانی خۆت بۆ دایك و باوکت ڕابخەو ملکەچبە بۆیان)، دەڵێ: (جێبەجێکردنی ئەم ئایەتە بەوە دەبێ): لە هیچ شتێك قەدەغەیان مەکە کە ئەوان پێیان خۆشە (لەکاتێکدا شتەکە لە شەرعدا حەڵاڵەو جێی دەبێتەوە).

## دەربارەی: پاداشت دانەوەی دایك و باوك

٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَجْزِي وَلَدٌ وَالِدَهُ، إِلاَّ أَنْ يَجِدَهُ مَمْلُوكاً فَيَشْتَرِيَهُ فَيُعْتِقَهُ»»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: منداڵ ناتوانێ پاداشتی دایکی، یان باوکی بداتەوە، مەگەر یەکێك لەوان ببینێت بە کۆیلەیی، جا بیکڕێتەوەو ئازادی بکات.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح: «الإرواء» (٧٤٧١): [مسلم: ٢٠- كتاب العتق، ح ٥٢، ٦٢].

تێبینی: ئەمە لەبەر ئەوەیە دایك و باوك تا ئەو كاتەی خوا فەرمانی لەسەرە وەك خزمەتكار خزمەتی منداڵەكانیان دەكەن، جا كاتێك منداڵێك دوای گەورە بوون ببینێ، دایك، یان باوكی بوونەتە خزمەتكارو كۆیلەو فەرمانبەرو خزمەتكاری كەسانێك، ئەویش بچێ و دەریان بێنێ لەو ماندوبوونەو بە خەرجیەكی تێروتەسەل بژیویان بۆ دابین بكات، ڕەنگە نزیك بێتەوە لە پاداشت دانەوەیان ـ واللّٰه أعلم ـ

١٠- «عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يُحَدِّثُ، أَنَّهُ شَهِدَ ابْنَ عُمَرَ وَرَجُلٌ يَمَانِيٌّ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ، حَمَلَ أُمَّهُ وَرَاءَ ظَهْرِهِ، يَقُولُ: إِنِّي لَهَا بَعِيرُهَا الْمُذَلَّلُ ... إِنْ أُذْعِرَتْ رِكَابُهَا لَمْ أُذْعَرِ. ثُمَّ قَالَ: يَا ابْنَ عُمَرَ أَتُرَانِي جَزَيْتُهَا؟ قَالَ: لاَ، وَلاَ بِزَفْرَةٍ وَاحِدَةٍ، ثُمَّ طَافَ ابْنُ عُمَرَ، فَأَتَى الْمَقَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: يَا ابْنَ أَبِي مُوسَى، إِنَّ كُلَّ رَكْعَتَيْنِ تُكَفِّرَانِ مَا أَمَامَهُمَا»[1].

واتە: سەعیدی كوڕی ئەبو بوردە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوێم لێ بوو باوكم دەیگێڕایەوە، دەیگوت: لەلای ئیبنو عومەر بووم لە كاتێكدا پیاوێكی یەمانی تەوافی دەكرد بە دەوری كەعبەدا «دایكی لەسەر پشتی هەڵگرتبوو»، دەیگوت: من وشترێكی ملكەچی (ژێر دەستی دایكمم) ئەگەر سوار بیترسێنن (لە كاتی سواربوون) من ناترسم (ناڕەومەوە لە هەر بارودۆخێك بێ، چونكە) ملكەچی ئەوم، دوایی گوتی: ئەی ئیبنو عومەر پێت وایە پاداشتی دایكمم دابێتەوە؟ (لە كاتێكدا بە قسەو كردار ئاوا خۆم زەلیلی بەردەستی كردوە)؟ (ئیبنو عومەر) گوتی: نەخێر، تەنانەت (هەموو ئەوەی كردت) ناكاتە پاداشتی یەك ژان (كە كاتی لە دایك بوون دەیچێژێت) دوایی ئیبنو عومەر تەوافی كردو چووە لای مەقام و دوو ڕكات نوێژی كردن، پاشان گوتی: ئەی ئیبنو ئەبی مووسا هەر دوو ڕكات نوێژێك گوناهەكانی پێش خۆیان دەسڕنەوە.

تێبینی: وەك هەندێك لە پزیشكان دەڵێن: ئازاری منداڵ بوون یەكسانە بە شكانی (٢٠) یان (٤٢) ئێسك لە لاشەدا، هەروەها بە دووەم ئازار دانراوە دوای سوتان بە زیندوویی، هەروەها مرۆڤی ئاسایی دەتوانێ بەرگەی (٤٥) ئازار بگرێ لە یەك كاتدا، كەچی دایك لە كاتی مناڵ بوون بەرگەی (٥٧) ئازار دەگرێ، كەواتە: هەر دایك شایستەی خەڵاتی ڕیكۆرد شكاندنە!

١١- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يُبَايِعُهُ عَلَى الْهِجْرَةِ، وَتَرَكَ أَبَوَيْهِ يَبْكِيَانِ، فَقَالَ: «ارْجِعْ إِلَيْهِمَا، وَأَضْحِكْهُمَا كَمَا أَبْكَيْتَهُمَا»»[2].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ تاوەكو پەیمانی پێبدا لەسەر كۆچ كردن، (بۆ ئەو مەبەستە) دایك و باوكی جێ هێشتبوو لە كاتێكدا

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح: [أبو داود: ٥١- كتاب الجهاد، ١٣- باب: في الرجل يغزو وأبواه كارهان. النسائي: ٩٣- كتاب البيعة على الجهاد، ٠١- باب: البيعة على الهجرة. إبن ماجه: ٤٣- كتاب الجهاد ٣١- باب: الرجل يغزو وله أبوان، ح٢٨٧٢].

هەردووكیان گریابوون (واتە: پێیان ناخۆش بوو كوڕەكەیان لێیان جیابێتەوە)، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بگەڕێوە بۆ لایان، بە پێكەنینیان بێنە (بە گەڕانەوەو مانەوەت لەلایان)، هەروەك چۆن گریاندوونتن.

تێبینی: تاوانی گریاندنی دایك و باوك، لە گەورەترین تاوانەكانی ئازاردانیانە، چونكە دایك و باوك ناگرین ئەگەر حاڵەتەكە زۆر ئازار گەیەنەر نەبێ.

١٢- «عَنْ أَبِي حَازِمٍ، أَنَّ أَبَا مُرَّةَ، مَوْلَى أُمِّ هَانِئٍ ابْنَةِ أَبِي طَالِبٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ رَكِبَ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ إِلَى أَرْضِهِ بِالْعَقِيقِ فَإِذَا دَخَلَ أَرْضَهُ صَاحَ بِأَعْلَى صَوْتِهِ: عَلَيْكِ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ يَا أُمَّتَاهُ، تَقُولُ: وَعَلَيْكَ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، يَقُولُ: رَحِمَكِ اللَّهُ رَبَّيْتِنِي صَغِيراً، فَتَقُولُ: يَا بُنَيَّ، وَأَنْتَ فَجَزَاكَ اللَّهُ خَيْراً وَرَضِيَ عَنْكَ كَمَا بَرَرْتَنِي كَبِيراً، قَالَ مُوسَى: كَانَ اسْمُ أَبِي هُرَيْرَةَ: عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو»(١).

واتە: ئەبو حازم دەڵێ: ئەبو موڕڕە خزمەتكاری ئوممو هانیئی كچی ئەبو تاڵیب هەواڵی پێداوە كە لەگەڵ ئەبو هوڕەیرە سواربووەو چووە بۆ زەویەكەی (ئەبو هوڕەیرە) كە لە عەقیق بوو، جا كە چووە ناو زەویەكەی بە هەموو دەنگی هاواری كردو (گوتی:) (عَلَيْكِ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ) ئەی دایكە گیان! دایكیشی دەیگوت: (وَعَلَيْكَ السَّلاَمُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ)، ئەبو هوڕەیرە گوتی: ڕەحمەتی خوات لێ بێ (دایكە) كە منت لە بچوكیەوە گەورە كرد، ئەویش گوتی: ئەی ڕۆڵەكەم خوا پاداشتی تۆش بداتەوەو لێت ڕازی بێ، وەك چۆن زۆر چاكەكاری لەگەڵم، مووسا دەڵێ: ئەبو هوڕەیرە ناوی عەبدوڵلای كوڕی عەمرە.

## دەربارەی: ئەزیەتدانی دایك و باوك

١٣- «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ؟» ثَلاَثاً، قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ «وَجَلَسَ وَكَانَ مُتَّكِئاً» أَلاَ وَقَوْلُ الزُّورِ» مَا زَالَ يُكَرِّرُهَا حَتَّى قُلْتُ: لَيْتَهُ سَكَتَ»(٢).

واتە: ئەبو بەكرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا هەواڵتان نەدەمێ دەربارەی گەورەترینی گوناهە گەورەكان؟ سێ جار ئەمەی دووبارە كردەوە، گوتیان: با، هەواڵمان پێبدە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی (ئەمانەن): هاوبەش دانان بۆ خواو، ئەزیەتدانی دایك و باوك، ئنجا (پێغەمبەر ﷺ لەبەر گرنگی قسەكە) دانیشت، لە كاتێكدا پێشتر ڕاكشاو بوو،

---

(١) حسن الاسناد.

(٢) صحيح: «غاية المرام» (٧٧٢): [البخاري: ٨٧- كتاب الأدب، ٦- باب: عقوق الوالدين من الكبائر. مسلم: كتاب الإيمان، ح ٣٤١].

فەرمووی: ئاگاداربن! هەروەها قسەی درۆ، ئیدی بەردەوام ئەمەی دووبارە دەكردەوە (قسەی درۆ، قسەی درۆ...)، هەتا گوتم: خۆزگە وازی دەهێناو بێدەنگ دەبوو، (هێندە خۆی ئەزیەت نەدابایە بە دووبارە كردنەوەی «ئەم ڕستەیە»!).

تێبینی: بۆیە قسەی درۆ ئەوەندە گەورەو ترسناكە، درۆ هەوێنی هەموو خراپەیەكە، بە پەردەی درۆ خراپەكاریەكان دەشاردرێنەوەو جێبەجێ دەكرێن.

١٤- «عَنْ وَرَّادٍ، كَاتِبِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، قَالَ: كَتَبَ مُعَاوِيَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) إِلَى الْمُغِيرَةِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): اكْتُبْ إِلَيَّ بِمَا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ وَرَّادٌ: فَأَمْلَى عَلَيَّ وَكَتَبْتُ بِيَدَيَّ: إِنِّي سَمِعْتُهُ يَنْهَى عَنْ كَثْرَةِ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةِ الْمَالِ، وَعَنْ قِيلَ وَقَالَ»[1].

واتە: وەڕرادی نووسەری موغیرەی كوڕی شوعبە، دەڵێ: موعاویە (خوا لێی ڕازی بێ) نامەیەكی نووسی بۆ موغیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، (گوتی:) چیت بیستوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆم بنووسە، وەڕراد دەڵێ: موغیرە (لە وەڵامدا) بۆی گوتم و، منیش بە دەستی خۆم نووسیم، (گوتی:) گوێم لێ بوو (پێغەمبەری خوا ﷺ) قەدەغەی دەكرد لە زۆر پرسیار كردن (واتە: پرسیاری بێ سوود، پرسیار كردن لە شتی كاروباری خەڵك و هەندێ بابەتی ئاینی كە پێویست نەبێ)، وە ماڵ بە فیڕۆ دان و، زۆر گوتراو گوتی كردن (واتە: هەر بڵێی: ئاوا گوترا، فڵان وای گوت، فیسار وا دەڵێ،...هتد).

## دەربارەی: خوا نەفرەتی كردوە لەو كەسەی نەفرەت دەكات لە دایك و باوكی

١٥- «عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: سُئِلَ عَلِيٌّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): هَلْ خَصَّكُمُ النَّبِيُّ ﷺ بِشَيْءٍ لَمْ يَخُصَّ بِهِ النَّاسَ كَافَّةً؟ قَالَ: مَا خَصَّنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِشَيْءٍ لَمْ يَخُصَّ بِهِ النَّاسَ، إِلاَّ مَا فِي قِرَابِ سَيْفِي، ثُمَّ أَخْرَجَ صَحِيفَةً، فَإِذَا فِيهَا مَكْتُوبٌ: «لَعَنَ اللَّهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللَّهِ، لَعَنَ اللَّهُ مَنْ سَرَقَ مَنَارَ الأَرْضِ، لَعَنَ اللَّهُ مَنْ لَعَنَ وَالِدَيْهِ، لَعَنَ اللَّهُ مَنْ آوَى مُحْدِثًا»»[2].

واتە: ئەبو طوفەیل (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پرسیار كرا لە عەلی (خوا لێی ڕازی بێ)، ئایا پێغەمبەر ﷺ هیچ شتێكی تایبەت كردبوو بە ئێوەو بۆ تێكڕای خەڵكی نەبووبێ؟ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ شتێكی تایبەت نەكردبوو بە ئێمەو جیا لە خەڵكی، تەنها ئەوە نەبێ كە لە بەرگی كاڵانی شمشێرەكەمدا هەیە، پاشان نووسراوێكی دەرهێنا (لە كاڵانی شمشێرەكەی)، كە تێیدا نووسرابوو، (پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی): نەفرەتی خوا لەو كەسە بێ كە بۆ جگە

---

[1] صحيح: «الضعيفة» تحت رقم (٨٩٥٥).

[2] صحيح: «المشكاة» (٤٠٧٠): [مسلم: ٥٣- كتاب الأضاحي، ح٤٤، ٥٤].

لە خوا شتێك سەردەبڕێ، نەفرەتی خوا لەو کەسە بێ کە سنووری زەویەکەی فراوان دەکات و، زەوی خەڵکی بۆ خۆی دادەبڕێ (سنوور دەبەزێنێ)، نەفرەتی خوا لەو کەسە بێ کە نەفرەت لە دایك و باوکی دەکات، نەفرەتی خوا لەو کەسە بێ کە کەسێك دەحەوێنێتەوە کە تاوان و شیرکی (لە مەدینە) ئەنجامداوە.

تێبینی: هەر کەسێك داڵدەی کەسی تاوانبار بدات کە تاوانێکی ئاشکرای کردوە ئەوە بەشدارە لە تاوانەکەی، بەڵام نەفرەت لێکراو نیە، بەڵام ئەگەر داڵدەی کەسێك بدات کە خراپەکاری لە مەدینەدا ئەنجامداوە، ئەوە جگە لەوەی بەشدارە لە تاوانەکەی و نەفرەت لێکراویشە.

## دەربارەی: گوێڕایەڵی دایك و باوکی دەکرێ مادام (داواکەیان) سەرپێچی خوا نەبێ

١٦- «عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أَوْصَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِتِسْعٍ: لاَ تُشْرِكْ بِاللَّهِ شَيْئاً؛ وَإِنْ قُطِّعْتَ أَوْ حُرِّقْتَ، وَلاَ تَتْرُكَنَّ الصَّلاَةَ الْمَكْتُوبَةَ مُتَعَمِّداً، وَمَنْ تَرَكَهَا مُتَعَمِّداً بَرِئَتْ مِنْهُ الذِّمَّةُ، وَلاَ تَشْرَبَنَّ الْخَمْرَ، فَإِنَّهَا مِفْتَاحُ كُلِّ شَرٍّ، وَأَطِعْ وَالِدَيْكَ، وَإِنْ أَمَرَاكَ أَنْ تَخْرُجَ مِنْ دُنْيَاكَ فَاخْرُجْ لَهُمَا، وَلاَ تُنَازِعَنَّ وُلاَةَ الأَمْرِ وَإِنْ رَأَيْتَ أَنَّكَ أَنْتَ، وَلاَ تَفْرُرْ مِنَ الزَّحْفِ، وَإِنْ هَلَكْتَ وَفَرَّ أَصْحَابُكَ، وَأَنْفِقْ مِنْ طَوْلِكَ عَلَى أَهْلِكَ، وَلاَ تَرْفَعْ عَصَاكَ عَنْ أَهْلِكَ، وَأَخِفْهُمْ فِي اللَّهِ عَزَّوَجَلَّ»[١].

واتە: ئەبو دەرداء (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە نۆ ڕاسپاردە ئامۆژگاری کردم، (فەرمووی): هیچ شتێك مەکە بە هاوبەشی خوا، هەرچەندە لەسەر ئەوە پارچە پارچە بکرێی، یان بسووتێنرێی، وە هەرگیز بە ئەنقەست نوێژی فەرز مەچوێنە، هەر کەسێك بە ئەنقەست واز لە نوێژی فەرز بێنێ، ئەوە لە زەمانەتی خوا نامێنێ، وە هەرگیز شەراب مەخۆرەوە، چونکە کلیلی هەموو خراپەیەکە، وە گوێڕایەڵی دایك و باوکت بکە، هەرچەندە داوای چوونە دەرت لێ بکەن لە خۆشیەکانی دونیاش (واتە: هەرچەندە داوای هەندێ شتت لێ بکەن کە ببێتە مایەی بەرتەسکبوونەوەی ژیانت)، (لەوەشدا) بە قسەیان بکەو بچۆ دەر (لە خۆشیەکان) لە پێناویاندا، وە ناکۆکی و دژایەتی لەگەڵ دەسەڵاتدار مەکە (مادام دەسەڵاتدارەکان بە حوکمی خوا ڕازیبن)، هەرچەند دەتزانی کە تۆش لەسەر هەقی و (ئەوان لەو شتە هەڵەن، چونکە دەبێتە مایەی فیتنەو پەرتەوازەیی مسوڵمانان و چەك بەرزکردنەوە لە یەکدی، ئەمەش خراپەکەی لەو خراپەیە گەورەترە کە تۆ پێی ناڕازی)، وە لە جەنگ کردن پشت هەڵمەکەو ڕامەکە، با بشزانی کە لە ناودەچی، وە هاوەڵانیشت ڕایان کردبێ، وە ماڵ و سامانت بۆ کەس و نزیکانت خەرج بکە، وە

---

(١) حسن: «الإرواء» (٢٠٢٦): [ إبن ماجە: ٣٦- كتاب الفتن، ٣٢- باب: الصبر على البلاء ح٤٠٣٤].

هەرگیز گۆچانت (یان دەستت) لە هاوسەرت بەرز مەکەرەوە، (بەڵکو لە جیاتی ئەوە) بە خوای زاڵی پایەدار بیانترسێنە (بە ئامۆژگاری شەریعەت ڕاستیان بکەوە).

١٧- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: جِئْتُ أُبَايِعُكَ عَلَى الْهِجْرَةِ، وَتَرَكْتُ أَبَوَيَّ يَبْكِيَانِ؟ قَالَ: «ارْجِعْ إِلَيْهِمَا، فَأَضْحِكْهُمَا كَمَا أَبْكَيْتَهُمَا»»[1].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، گوتی: هاتووم پەیمانت پێبدەم لەسەر کۆچ کردن، دایك و باوکیشم بەجێهێشتوون لە کاتێکدا هەردووکیان دەگریان، (پێغەمبەری خوا ﷺ) پێی فەرموو: بگەڕێوە بۆ لایان، بیانخەرە پێکەنین، وەك چۆن ئەوانت گریاند.

تێبینی: سبحان اللَّه! لەگەڵ ئەوەی جیهاد لە پێناوی خوا گەورەترین پلەو پایەی هەیە، کەچی پێغەمبەری خوا ﷺ چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوکی پێش تێکۆشان لە پێناوی خوا سبحانە و تعالی خستوە!

١٨- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يُرِيدُ الْجِهَادَ، فَقَالَ: «أَحَيٌّ وَالِدَاكَ؟» فَقَالَ: نَعَمْ، فَقَالَ: «فَفِيهِمَا فَجَاهِدْ»»[2].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ دەیویست جیهاد بکات لە پێناو خوادا، (پێغەمبەری خوا ﷺ) پێی فەرموو: ئایا دایك و باوکت زیندوون؟ گوتی: بەڵێ، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: تێبکۆشە لە خزمەتکردنی ئەواندا (واتە: ئەمە بۆ تۆ لە شوێنی تێکۆشان لە پێناوی خوا دایە).

تێبینی: ئەمە لە کاتێکدا دەبێ کە مسوڵمانی دیکە هەبن بۆ تێکۆشان و پێویست بەو کەسانە ناکات، دایك و باوکی ئەو کەسانەش پێویستیان بە خزمەتکردن هەبێ و، بێ منداڵەکانیان پێویستیان جێبەجێ نەکرێ، وە ئۆقرە نەگرن ـ واللَّه أعلم ـ

## دەربارەی: کەسێك بە دایك و باوکی ڕابگات و نەشچێتە بەهەشتەوە

١٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «رَغِمَ أَنْفُهُ، رَغِمَ أَنْفُهُ، رَغِمَ أَنْفُهُ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ؟ قَالَ: «مَنْ أَدْرَكَ وَالِدَيْهِ عِنْدَ الْكِبَرِ، أَوْ أَحَدَهُمَا، فَدَخَلَ النَّارَ»»[3].

---

(١) صحيح: «التعليق الترغيب» (٣/٣١٢).

(٢) صحيح: «الإرواء» (١١٩٩): [البخاري: ٦٥- كتاب الجهاد، ١٣٨- باب: الجهاد بإذن الوالدين. مسلم: ٥٤- كتاب البر والصلة والآداب ح ٥-٦].

(٣) صحيح: [مسلم: ٥٤- كتاب البر والآداب، ح ٩ و ١٠].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لووتی بە خۆڵدا بچێ، لووتی بە خۆڵدا بچێ، لووتی بە خۆڵدا بچێ! گوتیان: کێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ئەو کەسەی بە دایك و باوکی، یان بە یەکێکیان ڕادەگات کە پیرو بە تەمەن دەبن لە لای، کەچی چووەتە دۆزەخیش (واتە: بای ئەوەندە خزمەتی نەکردبن کە پێی بچێتە بەهەشت).

تێبینی: لێرەدا نەزانی و بەدبەختی ئەو کەسانە دەردەکەوێ کە بەهەشت دەکەوێتە ناو ماڵەکەیان کەچی نایقۆزنەوە، بەڵکو پشتگوێی دەخەن و لە دەستیان دەچێت!

## دەربارەی: داوای لێخۆش بوون (لە خوا ناکرێ) بۆ دایك و باوکی هاوبەش دانەر

٢٠- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) فِي قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا ﴿٢٣﴾﴾الإسراء، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيراً ﴿٢٤﴾﴾الإسراء، فَنَسَخَتْهَا الآيَةُ فِي بَرَاءَةَ: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُواْ أُوْلِي قُرْبَى مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾﴾التوبة»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: ئەم ئایەتەی خوای بەرز: ﴿إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيماً ﴿٢٣﴾﴾الإسراء، تا دەگاتە: ﴿كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيراً ﴿٢٤﴾﴾الإسراء، بەو ئایەتەی سوورەتی بەڕائە (تەوبە) نەسخ بوویەوە: ﴿مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُواْ أُوْلِي قُرْبَى مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿١١٣﴾﴾التوبة، واتە: هەرگیز بۆ پێغەمبەرو بڕواداران نەهاتوە داوای لێخۆشبوون لە خوا بۆ هاوبەش بڕیاردەران بکەن، هەرچەندە ئەوان خزمی نزیکیشیان بن، دوای ئەوەی بۆیان ڕوون بۆوە کە ئەوان «واتە: خزمەکانیان لەسەر بێبڕوایی و شیرك مردوون»و دانیشتوانی دۆزەخن». (واتە: ئایەتەکەی سوورەتی «ئیسڕاء» نەسخ بۆتەوەو کاری پێ ناکرێ، کە بە ڕەهایی داوای چاکەکردن دەکات لەگەڵ دایك و باوك کە دوعاو ئیستیغفار کردنیشیان بۆ دەگرێتەوە، بەڵام ئایەتەکەی سوورەتی تەوبە دەفەرموێ: نابێ داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکرێ).

## دەربارەی: چاکەکاری لەگەڵ دایك و باوکی هاوبەش دانەر

٢١- «عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: نَزَلَتْ فِيَّ أَرْبَعُ آيَاتٍ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ تَعَالَى: كَانَتْ أُمِّي حَلَفَتْ أَنْ لاَ تَأْكُلَ وَلاَ تَشْرَبَ حَتَّى أُفَارِقَ مُحَمَّداً ﷺ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا

---

(١) حسن الإسناد.

﴿١٥﴾ لقمان، وَالثَّانِيَةُ: أَنِّي كُنْتُ أَخَذْتُ سَيْفاً أَعْجَبَنِي فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ هَبْ لِي هَذَا فَنَزَلَتْ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ﴿١﴾﴾ الأنفال، وَالثَّالِثَةُ: أَنِّي مَرِضْتُ فَأَتَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَقْسِمَ مَالِي أَفَأُوصِي بِالنِّصْفِ فَقَالَ: لاَ، فَقُلْتُ: الثُّلُثُ فَسَكَتَ فَكَانَ الثُّلُثُ بَعْدَهُ جَائِزاً. وَالرَّابِعَةُ: إِنِّي شَرِبْتُ الْخَمْرَ مَعَ قَوْمٍ مِنَ الأَنْصَارِ، فَضَرَبَ رَجُلٌ مِنْهُمْ أَنْفِي بِلَحْيِ جَمَلٍ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَأَنْزَلَ اللَّه عَزَّ وَجَلَّ تَحْرِيمَ الْخَمْرِ»[1].

واتە: سەعدى كوڕى ئەبى وەقاص (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: چوار ئایەت دەربارەی من دابەزیون لە کتێبی خوای بەرزدا: **(یەکەمیان)** دایکم سوێندی خوارد (لە کاتێکدا دایکی ئەو کاتە کافر بووەو سوێندی بە بتەکان خواردوە) کە نە هیچ بخواو، نە هیچ بخواتەوە هەتا واز لە موحەممەد ﷺ دێنم، خوای زاڵی پایەدار ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿وَإِن جَـٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ﴿١٥﴾﴾ لقمان، واتە: (کاتێك دایك و باوکت بانگیان کردی و زۆریان لێکردی بۆ ئەوەی هاوبەش بۆ من بڕیار بدەی لەکاتێکدا تۆ هیچ بەڵگەیەك نازانیت لەسەر ئەوەی خوا هاوبەشی هەبێ، ئەوە تۆ هەرگیز بە قسەیان مەکەو بە شێوەیەکی باش لە دونیادا هاوەڵایەتیان بکەو مامەڵەیان لەگەڵدا بکە).

**دووەم:** (لە دەستکەوتی جەنگی) دەستم دایە شمشێرێك گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەم پێ ببەخشە، جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ﴿١﴾﴾ الأنفال. واتە: (داواو پرسیارت لێدەکەن دەربارەی دەستکەوتەکان، تۆش بڵێ: هەموو دەستکەوتەکان هی خواو پێغەمبەرن، «هەر ئەوان بۆیان هەیە بڕیاری چۆنیەتی دابەشکردنی بدەن»).

**سێیەم:** (ڕۆژێك) نەخۆشکەوتم، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە سەردانم و تەشریفی هێنا، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەمەوێ ماڵەکەم دابەش بکەم، وەسیەت بکەم نیوەی ببەخشرێ؟ فەرمووی: نەخێر، گوتم: سێ یەك، بێدەنگ بوو، جا دوای ئەمە وەسیەتکردن لەسەر بەخشینی یەك لەسەر سێی ماڵ ڕێگەی پێدرا.

**چوارەم:** لەگەڵ هەندێك لە پشتیوانەکان شەڕابم خواردەوە، پیاوێك لە ئەوان لە لەحەی جەمەل «کە شوێنێکە لە سەر ڕێگای مەککە» لە لوتی دام، هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، جا خوای زاڵی پایەدار ئایەتی حەڕامکردنی شەڕابی نارده خوارەوە.

٢٢- «عَنْ أَسْمَاءِ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: أَتَتْنِي أُمِّي رَاغِبَةً، فِي عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ، فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ: أَصِلُهَا؟ قَالَ: «نَعَمْ»، قَالَ ابْنُ عُيَيْنَةَ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِيهَا: ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ ﴿٨﴾﴾ الممتحنة»[2].

---

(١) صحيح: «المشكاة» (٣٧٠٣): [مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ٣٤، ٤٤].

(٢) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٤٦٨): [البخاري: ١٥- كتاب الهبة، ٢٩- باب: الهدية للمشركين. مسلم: ١٢- كتاب الزكاة، ح ٤٩، ٥٠].

واتە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ دایکم (کە هاوبەش دانەر بوو) هاتە لام پێی خۆش بوو پەیوەندی لەگەڵم هەبێ، منیش پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد ئایا چاکەی لەگەڵ بکەم و پەیوەندیم لەگەڵی هەبێ؟ فەرمووی: بەڵێ (چاکەکاربە لەگەڵی و پەیوەندی لەگەڵ مەپچڕێنە)، ئیبنو عویەینە دەڵێ: لەبارەیەوە خوای (عَزَّوَجَلَّ) ئەم ئایەتەی ناردە خوار: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ ﴿٨﴾ ﴾، (واتە: خوا قەدەغەتان ناکات کە چاك ڕەفتاری و دادپەروەری بکەن لەگەڵ ئەو کەسانەی کە جەنگیان دژ نەکردوون و دژایەتی ئایینیان نەکردوون...).

٢٣- «عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) يَقُولُ: رَأَى عُمَرُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) حُلَّةً سِيَرَاءَ تُبَاعُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ابْتَعْ هَذِهِ، فَالْبَسْهَا يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَإِذَا جَاءَكَ الْوُفُودُ، قَالَ: «إِنَّمَا يَلْبَسُ هَذِهِ مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ»، فَأُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْهَا بِحُلَلٍ، فَأَرْسَلَ إِلَى عُمَرَ بِحُلَّةٍ، فَقَالَ: كَيْفَ أَلْبَسُهَا وَقَدْ قُلْتَ فِيهَا مَا قُلْتَ؟ قَالَ: «إِنِّي لَمْ أُعْطِكَهَا لِتَلْبَسَهَا، وَلَكِنْ تَبِيعَهَا أَوْ تَكْسُوَهَا»، فَأَرْسَلَ بِهَا عُمَرُ إِلَى أَخٍ لَهُ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ قَبْلَ أَنْ يُسْلِمَ»[(١)].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: عومەر بینی (خوا لێی ڕازی بێ)، دەستە پۆشاکێکی پڕ لە حەریر دەفرۆشرا، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمە بکڕەو لە ڕۆژی هەینی لە کاتی هاتنی وەفدەکان بیپۆشە، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: بە دڵنیایی ئەو کەسە ئەمە لەبەر دەکات کە لە دواڕۆژدا هیچ پشك و بەشی نیە، جا هەندێك لەم پۆشاکە هێنرا بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش تاخمێکی بۆ عومەر نارد، عومەریش گوتی: من چۆن ئەمە بپۆشم، لە کاتێکدا تۆ ئەوەت فەرموو لەبارەیەوە کە پێشتر فەرمووت؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: من ئەوەم پێنەداوی تا خۆت بیپۆشی، بەڵکو بۆ ئەوەیە تاوەکو بیفرۆشی، یاخود بیکەیتە دیاری (بۆ کەسێکی غەیرە مسوڵمان، یان بیکەیتە بەر ئافرەتێك لە خزمانت)، عومەریش ناردی بۆ برایەکی خۆی لە خەڵکی مەککە بەر لەوەی مسوڵمان ببێ.

## دەربارەی: جوێن نەدان بە دایك و باوك

٢٤- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مِنَ الْكَبَائِرِ أَنْ يَشْتِمَ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ»، فَقَالُوا: كَيْفَ يَشْتِمُ؟ قَالَ: «يَشْتِمُ الرَّجُلَ، فَيَشْتُمُ أَبَاهُ وَأُمَّهُ»»[(٢)].

---

(١) صحيح: «صحيح أبي داود» (٧٨٩): [البخاري: ١١- كتاب الجمعة، ٧- باب: يلبس أحسن ما يجد. مسلم: ٧٣- كتاب اللباس والزينة، ح٦ و ٧ و ٩].

(٢) صحيح: [البخاري: ٨٧- كتاب الأدب، ٤- باب: لا يسب الرجل والديه. مسلم: كتاب الإيمان، ح ٦٤١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە گوناهە گەورەکانە کەسێك جوێن بدات بە دایك و باوکی خۆی، گوتیان: چۆن جوێنیان پێ دەدات؟ فەرمووی: جوێن دەدات بە دایك و باوکی کەسێکی دیکە، ئەویش جوێن بە دایك و باوکی ئەو دەداتەوە. (کەواتە: بوونە هۆکاری جوێن دان بە دایك و باوك ئەوەندە تاوانێکی گەورەیە، ئەی دەبێ جوێندان بە ڕاستەوخۆ پێیان چەندە تاوانێکی مەزن بێ!).

٢٥- «قَالَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا): مِنَ الْكَبَائِرِ عِنْدَ اللَّهِ تَعَالَى أَنْ يَسْتَسِبَّ الرَّجُلُ لِوَالِدِهِ»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: لە گوناهە گەورەکانە لە لای خوا: کەسێك ببێتە هۆکاری جوێندان بە باوکی (بەوەی جوێن بە دایك و باوکی خەڵك بدات، ئەوانیش لە بەرانبەردا جوێن بە دایك و باوکی ئەو بدەن، ئەی دەبێ تاوانی ئەو کەسە چەندە گەورە بێ، کە بە ڕاستەوخۆ جوێنیان پێ دەڵێ و سوکایەتی بە دایك و باوکی خۆی دەکات!).

## دەربارەی: سزای خراپ بوون لەگەڵ دایك و باوك

٢٦- «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَا مِنْ ذَنْبٍ أَجْدَرُ أَنْ يُعَجَّلَ لِصَاحِبِهِ الْعُقُوبَةُ مَعَ مَا يُدَّخَرُ لَهُ، مِنَ الْبَغِيِّ وَقَطِيعَةِ الرَّحِمِ»»[2].

واتە: ئەبو بەکرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هیچ گوناهێك نیە لە داوێنپیسی و پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی شایستەتر بێ کە سزاکەی بۆ پێش بخرێت (هەر لە دونیا)، سەرباری ئەوەش کە بۆی هەڵدەگیرێ لە (سزای سەختی) دواڕۆژ.

تێبینی: بە تایبەت خراپ بوون و بچڕاندنی پەیوەندی لەگەڵ دایك و باوك، کە پێشەوا بوخاریی لە باسی دایك و باوك ئەم فەرموودەی هێناوە، تاوانێکە، تەنها تەوبەی نەصوح و لێخۆشبوونی خوای لێبوردە بە هانایەوە دێ!

---

(١) حسن الإسناد.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٩١٨، ٩٧٨): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٤٣- باب: النهي عن البغي. الترمذي: ٣٥١- كتاب القيامة، ٥٧- باب: حدثنا علي بن حجر. إبن ماجه: ٣٧- كتاب الزهد، ٢٣- باب: البغي، ح ٤٢١١].

## دەربارەی: گریاندنی دایك و باوك

۲۷- «عَنْ طَيْسَلَةَ، أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، يَقُولُ: بُكَاءُ الْوَالِدَيْنِ مِنَ الْعُقُوقِ وَالْكَبَائِرِ»[1].

واتە: طەیسەڵە دەڵێ: گوێم لێ بوو ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەیگوت: گریاندنی دایك و باوك دەچێتە چوارچێوەی ئەزیەتدانیان، وە یەکێکە لە گوناهە گەورەکان (کەواتە: نابێ بە قسەی ڕەق، یان قسەی درۆ، یان هەواڵی ناخۆش، یان گاڵتە بیانخەینە گریان).

## دەربارەی: دوعاو پاڕانەوەی دایك و باوك

۲۸- «عَنْ أَبِي جَعْفَرٍ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: ثَلاَثُ دَعَوَاتٍ مُسْتَجَابَاتٌ لَهُنَّ، لاَ شَكَّ فِيهِنَّ: دَعْوَةُ الْمَظْلُومِ، وَدَعْوَةُ الْمُسَافِرِ، وَدَعْوَةُ الْوَالِدِ عَلَى وَلَدِهِ»[2].

واتە: ئەبو جەعفەر دەگێڕێتەوە، ئەو بیستوویەتی کە ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سێ دوعا هەن وەڵامدراوەن، هیچ گومانیان تێدانیە، (کە بریتین لەمانە): دوعای ستەم لێکراوو، دوعای گەشتیارو، دوعای دایك و باوك لەسەر منداڵەکانیان.

۲۹- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «مَا تَكَلَّمَ مَوْلُودٌ مِنَ النَّاسِ فِي مَهْدٍ إِلاَّ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ ﷺ، وَصَاحِبُ جُرَيْجٍ»، قِيلَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، وَمَا صَاحِبُ جُرَيْجٍ؟ قَالَ: «فَإِنَّ جُرَيْجاً كَانَ رَجُلاً رَاهِباً فِي صَوْمَعَةٍ لَهُ، وَكَانَ رَاعِيَ بَقَرٍ يَأْوِي إِلَى أَسْفَلِ صَوْمَعَتِهِ، وَكَانَتِ امْرَأَةٌ مِنْ أَهْلِ الْقَرْيَةِ تَخْتَلِفُ إِلَى الرَّاعِي، فَأَتَتْ أُمُّهُ يَوْماً فَقَالَتْ: يَا جُرَيْجُ، وَهُوَ يُصَلِّي، فَقَالَ فِي نَفْسِهِ وَهُوَ يُصَلِّي: أُمِّي وَصَلاَتِي؟ فَرَأَى أَنْ يُؤْثِرَ صَلاَتَهُ، ثُمَّ صَرَخَتْ بِهِ الثَّانِيَةَ، فَقَالَ فِي نَفْسِهِ: أُمِّي وَصَلاَتِي؟ فَرَأَى أَنْ يُؤْثِرَ صَلاَتَهُ، ثُمَّ صَرَخَتْ بِهِ الثَّالِثَةَ، فَقَالَ: أُمِّي وَصَلاَتِي؟ فَرَأَى أَنْ يُؤْثِرَ صَلاَتَهُ، فَلَمَّا لَمْ يُجِبْهَا قَالَتْ: لاَ أَمَاتَكَ اللَّهُ يَا جُرَيْجُ حَتَّى تَنْظُرَ فِي وَجْهِ الْمُومِسَاتِ، ثُمَّ انْصَرَفَتْ. فَأُتِيَ الْمَلِكُ بِتِلْكَ الْمَرْأَةِ وَلَدَتْ، فَقَالَ: مِمَّنْ؟ قَالَتْ: مِنْ جُرَيْجٍ، قَالَ: أَصَاحِبُ الصَّوْمَعَةِ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: اهْدِمُوا صَوْمَعَتَهُ، وَأْتُونِي بِهِ، فَضَرَبُوا صَوْمَعَتَهُ بِالْفُئُوسِ حَتَّى وَقَعَتْ. فَجَعَلُوا يَدَهُ إِلَى عُنُقِهِ بِحَبْلٍ، ثُمَّ انْطُلِقَ بِهِ، فَمَرَّ بِهِ عَلَى الْمُومِسَاتِ، فَرَآهُنَّ فَتَبَسَّمَ، وَهُنَّ يَنْظُرْنَ إِلَيْهِ فِي النَّاسِ، فَقَالَ الْمَلِكُ: مَا تَزْعُمُ هَذِهِ؟ قَالَ: مَا تَزْعُمُ؟ قَالَ: تَزْعُمُ أَنَّ وَلَدَهَا مِنْكَ، قَالَ: أَنْتِ تَزْعُمِينَ؟ قَالَتْ: نَعَمْ،

---

(۱) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (۲۸۹۸).

(۲) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٥٩٦): [أبو داود: كتاب الصلاة، ۲۹- باب: الدعاء بظهر الغيب. الترمذي: ۲٥- كتاب البر الصلة، ۷- باب: ما جاء في دعوة الوالدين. إبن ماجه: ۳٤- كتاب الدعاء، ۱۱- باب: دعوة الوالد ودعوة المظلوم، ح ۳۸٦۲].

قَالَ: أَيْنَ هَذَا الصَّغِيرُ؟ قَالُوا: هَذا هُوَ فِي حِجْرِهَا، فَأَقْبَلَ عَلَيْهِ فَقَالَ: مَنْ أَبُوكَ؟ قَالَ: رَاعِي الْبَقَرِ. قَالَ الْمَلِكُ: أَنَجْعَلُ صَوْمَعَتَكَ مِنْ ذَهَبٍ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: مِنْ فِضَّةٍ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَمَا نَجْعَلُهَا؟ قَالَ: رُدُّوهَا كَمَا كَانَتْ، قَالَ: فَمَا الَّذِي تَبَسَّمْتَ؟ قَالَ: أَمْراً عَرَفْتُهُ، أَدْرَكَتْنِي دَعْوَةُ أُمِّي، ثُمَّ أَخْبَرَهُمْ»»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: منداڵی هیچ کەسێك لە بێشکەو لانکەدا قسەی نەکردوە، جگە لە عیسای کوڕی مەریەم سەلامی خوای لێ بێ، وە هاوەڵەکەی جورەیج، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵەکەی جورەیج کێیە؟ فەرمووی: (بەسەرهاتەکەی ئاوایە): جورەیج یەکێك بوو لە زانایانی خواناس لە پەرستگاکەی خۆی بوو، وە گاوانێکی مانگا دەهاتە لای خوارەوەی پەرستگاکەی (مانگاکانی دەلەوەڕاند)، ئافرەتێکی خەڵکی گوندەکە هاموشۆی ئەو گاوانەی دەکرد. جا ڕۆژێك دایکی جورەیج هاتە لای (جورەیج)و، بانگی کرد، گوتی: ئەی جورەیج! لەوکاتەدا جورەیج نوێژی (سوننەتی) دەکرد، جورەیجیش لە دڵی خۆی گوتی: وەڵامی دایکم بدەمەوە، یان نوێژەکەم تەواو بکەم (ئنجا وەڵامی بدەمەوە)؟ جا ئەوەبوو بڕیاریدا نوێژەکەی تەواو بکات (ئنجا وەڵامی بداتەوە)، پاشان بۆ جاری دووەم (دایکی) هاواری کردو بانگی جورەیجی کردەوە، دیسان لە دڵی خۆی گوتی: وەڵامی دایکم بدەمەوە یان نوێژەکەم تەواو بکەم (ئنجا وەڵامی بدەمەوە)؟ جا ئەوەبوو بڕیاریدا نوێژەکەی تەواو بکات (ئنجا وەڵامی بداتەوە)؟ پاشان بۆ جاری سێیەم (دایکی) بە هاوار کردنەوە بانگی کرد، بە هەمان شێوە بیری کردەوە دایکم، یان نوێژەکەم؟ جا دیسان بڕیاریدا نوێژەکەی تەواو بکات و وەڵامی دایکی نەداتەوە، دایکی (دڵی شکاو لێی ڕەنجا) گوتی: ئەی جورەیج یارەبی خودا نەتمرێنێ، تا ئەو کاتەی سەیری ڕووی ئافرەتانی زیناکار دەکەیت، ئیتر دایکی ڕۆیشت، جا ئەو ئافرەتەی (کە هاموشۆی گاوانەکەی دەکرد) هێنرا بۆ لای پادشا کە منداڵی ببوو، (پادشا) پێی گوت: ئەم منداڵەت لە کێ بووە (کێ زینای لەگەڵ کردووی)؟ ئەویش گوتی: لە جورەیجم بووە، پادشا گوتی: ئایا ئەو جورەیجەی دەڵێی کە لە پەرستگایەکەیە؟ گوتی: بەڵێ، پادشا گوتی: پەرستگاکەی بڕوخێنن و بۆمی بێنن، ئەوانیش بە تەورو بیور لە پەرستگاکەیاندا تا ڕووخاندیان، دەستیشیان لە گەردنی بە پەتێك بەست، پاشان بردرا، جا لە ڕێگەدا بەلای کۆمەڵێك ئافرەتی زیناکاردا تێپەڕی، ئەوانی بینی و زەردەخەنەیەکی کرد، لە کاتێکدا ئەوان لە نێو خەڵکیدا سەیری جورەیجیان دەکرد، جا پادشا گوتی: ئەم ئافرەتە چی دەڵێ؟ جورەیج گوتی: چی دەڵێ؟ پادشا گوتی: دەڵێ: ئەم منداڵەی لە تۆیە، جورەیج (ڕووی کردە ئافرەتەکەو) گوتی: تۆ دەڵێی ئەم منداڵەی لە تۆ بووە، هی منە؟ ئافرەتەکە گوتی: بەڵێ، جورەیجیش گوتی: منداڵەکە لە کوێیە؟ گوتیان: ئەوەی کۆشی ئافرەتەکە هەوە، جورەیج ڕوویکردە منداڵەکەو گوتی: کێ باوکتە؟ منداڵەکە گوتی: گاوانی مانگاکان باوکمە، پادشا (کە ئەو کەرامەتەی بینی) بە جورەیجی گوت: ئایا پەرستگاکەت بۆ لە

---

(١) صحيح: [البخاري: ٦٠- كتاب الأنبياء، ٤٨- باب: {وَاذْكُرْ فِي الْكِتَبِ مَرْيَمَ} مريم: ١٦، مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٧، ٨].

زێڕ دروست بکەینەوە؟ گوتی: نەخێر، گوتی: ئەی لە زیو؟ گوتی: نەخێر، پاشا گوتی: ئەی لە چی بۆت دروستبکەینەوە؟ گوتی: وەك خۆی لێبکەنەوە، پادشا گوتی: ئەی ئەو زەردەخەنەیەت مانای چی بوو (کە بەرانبەر ئافرەتە زیناکارەکان کردت)؟ گوتی: ئەوە شتێك بوو ناسیمەوە، نزای دایکم بوو گیرا بوو (کە گوتی: یاخوا ڕووی زیناکاران ببینی)، پاشان بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕانەوە.

## دەربارەی: داواکردن لە دایکێك کە مەسیحیە، تا ببێتە مسوڵمان

٣٠- «عَنْ أَبُو كَثِيرٍ السُّحَيْمِيُّ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: مَا سَمِعَ بِي أَحَدٌ، يَهُودِيٌّ وَلاَ نَصْرَانِيٌّ، إِلاَّ أَحَبَّنِي، إِنَّ أُمِّي كُنْتُ أُرِيدُهَا عَلَى الإِسْلاَمِ فَتَأْبَى، فَقُلْتُ لَهَا، فَأَبَتْ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ: ادْعُ اللَّهَ لَهَا، فَدَعَا، فَأَتَيْتُهَا «وَقَدْ أَجَافَتْ عَلَيْهَا الْبَابَ» فَقَالَتْ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ إِنِّي أَسْلَمْتُ، فَأَخْبَرْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ: ادْعُ اللَّهَ لِي وَلأُمِّي، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ، عَبْدُكَ أَبُو هُرَيْرَةَ وأُمُّهُ، أَحِبَّهُمَا إِلَى النَّاسِ»»[١].

واتە: ئەبو کەثیری سوحەیمی دەڵێ: بیستم ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەیگوت: هیچ جوولەکەو نەصرانییەك نەبووە ناوی منی بیستبێت حەتمەن خۆشی ویستووم، (هۆکاری ئەمەش لەو بەسەرهاتە دایە): من دەمویست دایکم مسوڵمان بێ مسوڵمان نەدەبوو، وە داوام لێکرد ڕەتیکردەوە، جا هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گوتم: (ئەی پێغەمبەر ﷺ) دوعای بۆ بکە (ئیمان بێنێ)، ئەویش دوعای بۆ کرد، جا (گەڕامەوەو) چوومەوە لای لە کاتێکدا دەرگاکەی لەسەر خۆی داخستبوو، گوتی: ئەی ئەبو هورەیرە مسوڵمان بووم، منیش هەواڵمدا بە پێغەمبەر ﷺ، گوتم: دوعا بۆ من و دایکم بکە، فەرمووی: ئەی خوایە بەندەی خۆت ئەبو هورەیرەو دایکی خۆشەویست بکە لە لای خەڵکی.

تێبینی: کەواتە هەوڵدان بۆ هیدایەتی دایك و باوك گەورەترین چاکەیەو، بەختەوەری دونیاو دوارۆژی لە دواوەیە، بۆیە دەبێ ئەو بابەتە خەمی هەرە گەورەی منداڵەکان بێت، ئەگەر دایك، یان باوکیان لەسەر هیدایەت نەبوون.

## دەربارەی: چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوك دوای مردنیان

٣١- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: تُرْفَعُ لِلْمَيِّتِ بَعْدَ مَوْتِهِ دَرَجَتُهُ، فَيَقُولُ: أَيْ رَبِّ، أَيُّ شَيْءٍ هَذِهِ؟ فَيُقَالُ: وَلَدُكَ اسْتَغْفَرَ لَكَ»[٢].

---

(١) حسن: «المشكاة» (٥٨٩٥).

(٢) حسن لإسناد.

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: کەسی وا هەیە دوای مردنی پلەی بەرز دەکرێتەوە، ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگارا! ئەو پلە بەرزبوونەوەیە بە هۆی چیەوەیە؟ پێی دەگوترێ: منداڵەکەت داوای لێخۆشبوونی بۆ کردووی.

٣٢- «قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ سِيرِينَ: كُنَّا عِنْدَ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) لَيْلَةً، فَقَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِأَبِي هُرَيْرَةَ، وَلِأُمِّي، وَلِمَنِ اسْتَغْفَرَ لَهُمَا، قَالَ لِي مُحَمَّدٌ: فَنَحْنُ نَسْتَغْفِرُ لَهُمَا حَتَّى نَدْخُلَ فِي دَعْوَةِ أَبِي هُرَيْرَةَ»[1].

واتە: موحەممەدی کوڕی سیرین دەڵێ: ئێمە شەوێکیان لە خزمەت ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) بووین، ئەویش (دوعای کرد) گوتی: ئەی خوایە لە ئەبو هورەیرەو دایکم خۆشبە، وە ئەو کەسەش خۆشبە کە داوای لێخۆشبوونیان بۆ دەکات، (ڕاویەکە دەڵێ): موحەممەدی کوڕی سیرین پێی گوتم: جا ئێمە هەموومان داوای لێخۆشبوونمان بۆ کردن، تا بکەوینە بەر دوعاکەی ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ).

٣٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا مَاتَ الْعَبْدُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلَّا مِنْ ثَلَاثٍ: صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر بەندە مرد هەموو کردەوەکانی دەپچڕێن و کۆتاییان پێ دێ، جگە لە سێ شت: چاکەیەکی بەردەوام (وەك: دروست کردنی مزگەوتێك یان لێدانی بیرێکی ئاو ... هتد)، یان زانیارییەك کە سوودی لێ ببینرێ (خەڵکی فێر کردبێ، یان پەرتوکی تێدا نووسیبێ)، یان منداڵێك دوعای خێری بۆ بکات.

٣٤- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أُمِّي تُوُفِّيَتْ وَلَمْ تُوصِ فَيَنْفَعُهَا أَنْ أَتَصَدَّقَ عَنْهَا؟ قَالَ: «نَعَمْ»»[3].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دایکم وەفاتی کردووەو وەسیەتیشی نەکردوە (بە هیچ شتێك)، ئایا ئەگەر خێرو چاکەی بۆ بکەم پێی دەگات؟ فەرمووی: بەڵێ.

(کەواتە: نابێ لەسەر وەسیەتی دایك و باوك بوەستین، بەڵکو دەبێ وەکو وەفاییێك خێرو صەدەقەی زۆریان بۆ بکەین).

---

(١) صحيح لإسناد.

(٢) صحيح: «الإرواء» (١٥٨٠): [مسلم: ٢٥- كتاب الوصية، ح ١٤].

(٣) صحيح: «صحيح أبي دواود» (٢٥٦٦): [البخاري: كتاب الوصايا، باب: إذا قال أرضي أو بستاني صدقة لله عن أمي..].

## دەربارەی: چاكەكاری لەگەڵ خزم و دۆستانی باوك

٣٥- « عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا): مَرَّ أَعْرَابِيٌّ فِي سَفَرٍ، فَكَانَ أَبُو الأَعْرَابِيِّ صَدِيقاً لِعُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، فَقَالَ لِلأَعْرَابِيِّ: أَلَسْتَ ابْنَ فُلاَنٍ؟ قَالَ: بَلَى، فَأَمَرَ لَهُ ابْنُ عُمَرَ بِحِمَارٍ كَانَ يَسْتَعْقِبُ، وَنَزَعَ عِمَامَتَهُ عَنْ رَأْسِهِ فَأَعْطَاهُ. فَقَالَ بَعْضُ مَنْ مَعَهُ: أَمَا يَكْفِيهِ دِرْهَمَانِ؟ فَقَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «احْفَظْ وُدَّ أَبِيكَ، لاَ تَقْطَعْهُ فَيُطْفِئَ اللَّهُ نُورَكَ»»[1].

واتە: لە عەبدوڵلای كوڕی عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، گێڕدراوەتەوە (جارێكیان): ئەعڕابیەك كە باوكەكەی هاوەڵی عومەر بوو (خوا لێی ڕازی بێ)، لە سەفەرێكدا بە لای عەبدوڵلای كوڕی عومەردا تێپەڕی، عەبدوڵلای كوڕی عومەر بە ئەعڕابیەكەی گوت: ئایا تۆ كوڕی فڵان كەس نیت؟ گوتی: با، جا عەبدوڵلای كوڕی عومەر فەرمانی كرد گوێدرێژێكی بۆ بێنن و لە دواوەی دەڕواند (تاوەكو ئەگەر ئەعڕابیەكە بێزارو ماندوو بوو لەسەر پشتی وشترەكەی، ئەوە سواری گوێدرێژ بێ و بۆی ببێتە پشووێك)، وە مێزەرەكەی خۆی لەسەركردەوەو دای بە ئەعڕابیەكە، جا هەندێ لەوانەی لەگەڵی بوون گوتیان: بەس نەبوو ئەگەر دوو درهەمت پێدابووایە؟ گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆشەویستانی باوكت بپارێزەو مەیپچڕێنە، ئەگەر وانەكەی ئەوە خوا نوورەكەت دەكوژێنێتەوە (كە پێی داوی).

٣٦- « عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «إِنَّ أَبَرَّ الْبِرِّ أَنْ يَصِلَ الرَّجُلُ أَهْلَ وُدِّ أَبِيهِ»»[2].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە، كە فەرموویەتی: لە باشترینی كردەوە چاكەكان ئەوەیە: پیاو پەیوەندی لەگەڵ ئەو كەسە هەبێ كە هاوەڵی خۆشەویستی باوكی بووە (بەوەی هامۆشۆیان بكات، لە حاڵیان بپرسێ، ڕێزیان لێ بنێ).

## دەربارەی: باوك بە ناوی خۆی ناونابرێ، نابێ لەپێشی دابنیشی و پێشی بكەویەوە لە ڕۆیشتن

٣٧- « عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ أَبْصَرَ رَجُلَيْنِ، فَقَالَ لِأَحَدِهِمَا: مَا هَذَا مِنْكَ؟ فَقَالَ: أَبِي، فَقَالَ: لاَ تُسَمِّهِ بِاسْمِهِ، وَلاَ تَمْشِ أَمَامَهُ، وَلاَ تَجْلِسْ قَبْلَهُ»[3].

---

(١) صحيح: [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة، ح١١- ١٣].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة»: (١٤٣٢، ٣٠٦٣): [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ١١و ١٢ و ١٣].

(٣) صحيح الإسناد.

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دوو پیاوی بینی، بە یەكێكیانی فەرموو: ئەوە چی تۆیە؟ گوتی: باوكمە، ئەبو هورەیرە گوتی: بە ناوی خۆی ناوی مەهێنە، هەروەها پێشی مەكەوە لە ڕۆیشتن، وە لە پێش ئەو دامەنیشە.

تێبینی: ئەم ڕەوشتانە دەبێ جێبەجێ بكرێن لە هەموو شوێنێك بە گشتی، وە بە تایبەتیش لە ناو كۆڕو مەجلیسدا.

## دەربارەی: ئایا بە باوكی فڵان بانگی باوك دەكرێ؟

٣٨- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: لَكِنْ أَبُو حَفْصٍ عُمَرُ قَضَى»[١].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتویەتی: بەڵام باوكی حەفص عومەر بڕیاریداوە.

(مەبەست لێرەدا ئەوەیە عەبدوڵڵا كە كوڕی ئیمامی عومەرە، باسی بابەتێكی كردوە كە ویستویەتی باسی باوكی بكات و ناوی بهێنێ بڵێ: ئەو ئاوا بڕیاری داوە، گوتویەتی: «باوكی حەفص» چونكە شاردنەوەی ناوی كەسەكان لە ژێر پەردەیتر سونەتەو جوانترە، تاوەكو ناوی بە ڕووتی و بەبێ شكۆ دەرنەكەوێ).

## دەربارەی: پەیوەندی خزمایەتی واجب بوون

٣٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ٢١٤﴾الشعراء، قَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَنَادَى: «يَا بَنِي كَعْبِ بْنِ لُؤَيٍّ، أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ. يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ، أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ. يَا بَنِي هَاشِمٍ، أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ. يَا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، أَنْقِذُوا أَنْفُسَكُمْ مِنَ النَّارِ. يَا فَاطِمَةُ بِنْتَ مُحَمَّدٍ، أَنْقِذِي نَفْسَكِ مِنَ النَّارِ، فَإِنِّي لَا أَمْلِكُ لَكِ مِنَ اللَّهِ شَيْئاً، غَيْرَ أَنَّ لَكُمْ رَحِماً سَأَبُلُّهَا بِبِلَالِهَا»»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: كاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوار: ﴿وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ٢١٤﴾ پێغەمبەر ﷺ هەڵساو بانگی كرد: ئەی بەنی كەعبی كوڕی لوئەی! خۆتان ڕزگار بكەن لە ئاگر، ئەی بەنی عەبدولمەناف! خۆتان ڕزگار بكەن لە ئاگر، ئەی بەنی هاشم!

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة»: (٣١٧٧): [البخاري: ٥٥- كتاب الوصايا، ١١- باب: يدخل النساء والولد في الأقارب؟ مسلم: ١- كتاب الإيمان، ح ٣٤٨] ليس عند البخاري بهذا اللفظ.

خۆتان ڕزگار بکەن لە ئاگر، ئەی بەنی عەبدولموتەڵیب! خۆتان ڕزگار بکەن لە ئاگر، ئەی فاتیمەی کچی موحەممەد! خۆت ڕزگار بکە لە ئاگر، بەڕاستی من لە لای خوا هیچ شتێکم بۆ ئێوە پێ ناکرێ، تەنها ئەوەندە هەیە کە من پەیوەندی خزمایەتیم هەیە لەگەڵتاندا، من لە دونیا ئەو پەیوەندیە دەگەیەنم (ناپیچڕێنم).

## دەربارەی: پەیوەندی خزمایەتی

٤٠- «عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ أَعْرَابِيًّا عَرَضَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فِي مَسِيرِهِ، فَقَالَ: أَخْبِرْنِي مَا يُقَرِّبُنِي مِنَ الْجَنَّةِ، وَيُبَاعِدُنِي مِنَ النَّارِ؟ قَالَ: «تَعْبُدُ اللَّهَ وَلاَ تُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمُ الصَّلاَةَ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصِلُ الرَّحِمَ»»[1].

واتە: ئەبو ئەیوبی ئەنصاری (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: لە کاتی ڕۆیشتن ئەعرابیەك عەرزی پێغەمبەری خوای ﷺ کردو گوتی: هەواڵم پێبدە بەوەی نزیکم دەخاتەوە لە بەهەشت، وە بەوەش کە دوورم دەخاتەوە لە ئاگر؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: خوا بپەرستەو هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار مەدە، وە نوێژ بەرپا بکەو، زەکاتی ماڵی خوا بدەو، پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنە.

٤١- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: خَلَقَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ الْخَلْقَ، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْهُ قَامَتِ الرَّحِمُ، فَقَالَ: مَهْ، قَالَتْ: هَذَا مَقَامُ الْعَائِذِ بِكَ مِنَ الْقَطِيعَةِ، قَالَ: أَلاَ تَرْضَيْنَ أَنْ أَصِلَ مَنْ وَصَلَكِ، وَأَقْطَعَ مَنْ قَطَعَكِ؟ قَالَتْ: بَلَى يَا رَبِّ، قَالَ: فَذَلِكِ لَكِ، ثُمَّ قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: اقْرَؤُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ ﴾محمد»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دوای ئەوەی خوای زاڵی پایەدار دروستکراوەکانی دروست کرد، جا کاتێك لێبویەوە پەیوەندی خزمایەتی و بەزەیی هەڵسا، پەروەردگاریش فەرمووی: وازبێنە (مەجوڵێ)؟ ڕەحم گوتی: ئەم هەڵسانەم هەڵسانی پەناگرتنە بە تۆ لە پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی، خوا فەرمووی: ئایا ڕازی نابی کە هەر کەسێك تۆی بەجێگەیاند بیگەیەنم (بەوەی لەگەڵی بە بەزەیی بم)، وە هەر کەسێك تۆی پچڕاند بیپچڕێنم (بەوەی لەگەڵی بە بەزەیی نەبم)؟ پەیوەندی خزمایەتیش گوتی: با (ڕازیم)، ئەی پەروەردگار، (خوا ﷻ) فەرمووی: تۆ ئەو مافەت هەیە، (کە هەر کەسێك خزمایەتی پچڕاند، خوا بەزەیی خۆی لێ بپچڕێنێ، وە هەر کەسێك خزمایەتی گەیاند خوا بەزەیی خۆی پێ بگەیەنێ)، پاشان ئەبو هورەیرە گوتی: ئەگەر دەتانەوێ (زیاتر لەوە تێبگەن) ئەم ئایەتە بخوێننەوە: ﴿ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ ﴾محمد.

---

(١) صحيح: «الترغيب» (٧٤٣): [البخاري: ٢٤- كتاب الزكاة، ١- باب: وجوب الزكاة. مسلم: ١- كتاب الإيمان ح ١٢].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٧٤١): [البخاري: ٦٥- كتاب التفسير، ٤٧- سورة محمد ﷺ. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح١٣].

## دەربارەی: گەورەیی پێگەی پەیوەندی خزمایەتی

٤٢- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أَتَى رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي قَرَابَةً أَصِلُهُمْ وَيَقْطَعُونَ، وَأُحْسِنُ إِلَيْهِمْ وَيُسِيئُونَ إِلَيَّ، وَيَجْهَلُونَ عَلَيَّ وَأَحْلُمُ عَنْهُمْ، قَالَ: «لَئِنْ كَانَ كَمَا تَقُولُ كَأَنَّمَا تُسِفُّهُمُ الْمَلَّ، وَلاَ يَزَالُ مَعَكَ مِنَ اللَّهِ ظَهِيرٌ عَلَيْهِمْ مَا دُمْتَ عَلَى ذَلِكَ»»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! من خزمی نزیکم هەن پەیوەندی خزمایەتیان لەگەڵ جێبەجێ دەکەم ئەوان دەیپچڕێنن، وە من چاکەیان لەگەڵ دەکەم کەچی ئەوان خراپەم لەگەڵ دەکەن، وە ئەوان زۆر نەزانانە قسەی خراپم لەسەر دەکەن، منیش زۆر پەرۆشیانم چاوپۆشیان لێدەکەم، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەگەر وابێت کە دەیڵێی، ئەوە وەك ئەوە وایە کە لمی گەرمیان دەرخوارد بدەی (واتە: شەرمەزارت دەبن و، سزای خواش تەنها ئەوان دەگرێتەوە)، وە بەردەوام پشتیوانێکت لەلایەن خواوە لەگەڵدا دەبێ، هەتا لەسەر ئەو حاڵەتە بەردەوام بیت.

٤٣- «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: أَنَا الرَّحْمَنُ، وَأَنَا خَلَقْتُ الرَّحِمَ، وَاشْتَقَقْتُ لَهَا مِنَ اسْمِي، فَمَنْ وَصَلَهَا وَصَلْتُهُ، وَمَنْ قَطَعَهَا بَتَتُّهُ»[2].

واتە: عەبدورڕەحمانی کوڕی عەوف (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتوویەتی کە: گوێی لێ بووە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای زاڵی پایەدار فەرموویەتی: من بەزەییم (واتە: یەکێك لە ناوەکانم بەزەییە)، وە خۆشم بەزەییم دروست کردوە لەو ناوەی خۆمەوە، هەر کەس (ئەو بەزەییە) بگەیەنێ منیش دەیگەیەنم، وە هەر کەسیش بیپچڕێنێ، منیش (بەزەیی خۆمی) لێ دەپچڕێنم.

٤٤- «عَنْ أَبِي الْعَنْبَسِ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) فِي الْوَهْطِ «يَعْنِي أَرْضاً لَهُ بِالطَّائِفِ، فَقَالَ: عَطَفَ لَنَا النَّبِيُّ ﷺ إِصْبَعَهُ، فَقَالَ: «الرَّحِمُ شُجْنَةٌ مِنَ الرَّحْمَنِ، مَنْ يَصِلْهَا يَصِلْهُ، وَمَنْ يقْطَعْهَا يَقْطَعْهُ، لَهَا لِسَانٌ طَلْقٌ ذَلْقٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»»[3].

واتە: ئەبو عەنبەس دەڵێ: چوومە لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ (خوا لێیان ڕازی بێ) لە (وهط) کە پارچە زەوییەکی خۆی بوو لە طائیف، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی پەنجەی لە ئێمە کرد، فەرمووی: پەیوەندی خزمایەتی ڕەگێکە لە بەزەیی و ڕەزامەندی خوای ڕەحمان، هەر کەسێك پەیوەندی خزمایەتی بهێڵێتەوەو جێبەجێی بکات، ئەوە خوا ئەو کەسە دەگەیەنێ (بە

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٥٩٧): [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٢٢].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٢٠): [أبو داود: ٩- كتاب الزكاة، ٤٥- باب: في صلة الرحم، الترمذي: ٢٥- كتاب البر والصلة، ٩- باب: ماجاء في قطيعة الرحم]

(٣) صحيح: «غاية المرام» (٤٠٦).

ڕەزامەندی خۆی و، بەزەیی لەگەڵ دەکات)، وە هەر کەسێك بیپچڕێنێ ئەوە خوا ئەو دەپچڕێنێ (لە بەزەیی خۆی)، (ڕەحم) لە ڕۆژی دواییدا زمانێکی پاراوو تیژی هەیەو قسە دەکات (سکاڵا لەو کەسانە دەکات کە پچڕاندویانە).

٤٥- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الرَّحِمُ شُجْنَةٌ مِنَ اللَّهِ، مَنْ وَصَلَهَا وَصَلَهُ اللَّهُ، وَمَنْ قَطَعَهَا قَطَعَهُ اللَّهُ»»[1].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پەیوەندی خزمایەتی ڕەگێکە لە بەزەیی و ڕەزامەندی خوا، هەر کەسێك پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنێ، ئەوە خوا ئەو کەسە دەگەیەنێ (بە ڕەزامەندیی و بەزەیی خۆی)، هەر کەسێك بیپچڕێنێ، ئەوە خوا ئەو دەپچڕێنێ (لە بەزەیی خۆی).

## دەربارەی: پەیوەندی خزمایەتی تەمەن درێژ دەکات

٤٦- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُبْسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، وَأَنْ يُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ»»[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك حەز دەکات خوا ڕزق و ڕۆزی بۆ فراوان بکات، وە تەمەنیشی بۆ درێژ بکاتەوە (لە دوای خۆی ستایش کردنی بەردەوام بێ)، ئەوە با پەیوەندی خزمایەتی جێبەجێ بکات.

٤٧- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُبْسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، وَأَنْ يُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ»»[3].

واتە: ئەبو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێك حەز دەکات خوا ڕزق و ڕۆزی بۆ فراوان بکات، وە تەمەنیشی بۆ درێژ بکاتەوە (لە دوای خۆی ستایش کردنی بەردەوام بێ)، ئەوە با پەیوەندی خزمایەتی جێبەجێ بکات.

٤٨- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: مَنِ اتَّقَى رَبَّهُ، وَوَصَلَ رَحِمَهُ، نُسِّئَ فِي أَجَلِهِ، وَثَرَى مَالُهُ، وَأَحَبَّهُ أَهْلُهُ»[4].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٩٢٥): [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح١٧].

(٢) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٤٨٦): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١٢- باب: من بسط له في الرزق بصلة الرحم، ح ٥٦٤٠. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٢١، أبو داود: ٩- كتاب الزكاة، ٤٥- باب: في صلة الرحم].

(٣) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٤٨٦): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١٢- من بسط له في الرزق بصلة الرحم].

(٤) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٢٧٦).

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: هەر کەسێك پارێز لە پەروەردگاری بکات، وە پەیوەندی خزمایەتی جێبەجێ بکات، ئەوە ئەجەلی بۆ دوادەخرێت، وە ماڵەکەی زۆر دەبێت، خزم و خانەوادەکەشی خۆشیان دەوێ.

تێبینی: کاتێ لەو فەرموودانەدا هاتوە دەفەرموێ: ئەجەل دوادەخرێ، یان تەمەن درێژ دەبێتەوە بە هۆی گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی، ئەوە یەکێك لەو چوار ئەگەرانەی هەیە:

١- یان مەبەستی بە درێژبوونەوەی تەمەن ئەوەیە: کە خوا بەرەکەتێکی ئەوەندە زۆر بخاتە تەمەنیەوە کە ئەو کارو پاداشتانەی خوا بۆی ڕەخساندووە، هی کەسێکی هاوتەمەنی ئەو نیە، بۆ نمونە: (٦٠) ساڵ ژیاوە، بەڵام کارو پاداشتی وەك کەسێکی سەد (١٠٠) ساڵی کۆکردۆتەوە، بەوەی خوا بەرەکەتی بۆ تێخستووە بە هۆی گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی.

٢- یانیش مەبەستی ئەوەیە: خوا بەخششێکی پێ دەبەخشێ، کە دوای مردنی ببێتە خێرێکی بەردەوام و نەبڕاوەو ڕێنموینی دەکات بۆ پڕۆژەی نەبڕاوەی دوارۆژ، بۆیە دوای مردنیشی هەر پاداشتەکەی پێدەگات.

٣- یانیش مەبەستی ئەوەیە: خوا خۆشەویستی دەخاتە دڵی خەڵکی، بە شێوەیەك چەندین ساڵ و دەیەو سەدە باسی چاکەو پیاوەتی و گەورەیی ئەو کەسە دەکرێ و لە یاد ناکرێ، وەك کەسێك کە بەردەوام لە نێویان مابێ و زیندوو بێ.

٤- یانیش مەبەستی ئەوەیە: بۆ هەر مرۆڤێك دوو ئەجەل هەیە: ئەجەلێکی نەگۆڕ کە لە لەوحی مەحفوز نووسراوە، وە ئەجەلێکی گۆڕاو کە لە ئوممول کیتاب نوسراوە، ڕوونکردنەوەکەشی بەو شێوەیە:

کاتێك خوای پەروەردگار دەیەوێ ئەجەل بۆ کەسێك دابنێت، ئەوە ئەجەلی بۆ دادەنێ بەو شێوەیەی خۆی بە شایستەی دەزانێت بۆ وێنە: (٦٠) ساڵ دادەنێ، بەڵام هەر لەگەڵ ئەو ژمارەیە خۆی دەکات بە (٨٠) ساڵ، چونکە دەزانێت کاتێ دروستی دەکات و گەورە دەبێ پەیوەندی خزمایەتی بەجێ دەگەیەنێ، بۆیە تەمەنە نەگۆڕەکەی بە (٨٠) ساڵ بۆ دەنوسرێ لە لەوحی مەحفوز، بەڵام جارێکی دیکە، کاتێ تەمەن تۆمار دەکرێتەوە لە نێو سکی دایك و لە ئوممول کیتاب، ئەو کات ئەو تەمەنە دەنوسرێت کە شایستەی خۆیەتی بەبێ زیادەکە کە بریتیە لە ٦٠) ساڵەکە، جا کاتێ گەورە دەبێ و پەیوەندی خزمایەتی بەجێ دەگەیەنێ فریشتەکان دەڵێن: پەروەردگارا تۆ بەڵێنت داوە کە تەمەنی کەسێك زیاد بکەیت کە پەیوەندی خزمایەتی بەجێ دەگەیەنێ، جا ئەوە فلان پەیوەندیەکە بەجێ دەگەیەنێ تەمەنەکەی بۆ بکەین بە چەند؟ خوای پەروەردگاریش فەرمان دەکات (٢٠) ساڵی بۆ زیاد بکرێت، جا دەبێتە (٨٠) ساڵ، بەوەش هەردوو

وتەی خوای پەروەردگار دێتەجێ کە دەفەرموێ: ﴿لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ اللَّهِ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٦٤﴾﴾يونس، وتەکان و بڕیارەکانی خوا ناگۆڕێن، وە ئەوەش دێتەدی کە دەفەرموێ: ﴿يَمْحُو اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُ أُمُّ الْكِتَابِ ﴿٣٩﴾﴾الرعد، هەرچی مەبەستی بێت دەیسڕێتەوەو شتێکی دیکە جێگیر دەکات.

## دەربارەی: هەر کەس پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنێ خوا خۆشی دەوێ

٤٩- «قَالَ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا): مَنِ اتَّقَى رَبَّهُ، وَوَصَلَ رَحِمَهُ، أُنْسِئَ لَهُ فِي عُمْرِهِ، وَثَرَى مَالُهُ، وَأَحَبَّهُ أَهْلُهُ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: هەر کەسێك پارێز لە پەروەردگاری بکات (خۆی لە سزای بپارێزێ)، وە پەیوەندی خزمایەتی جێبەجێ بکات، ئەوە تەمەنی بۆ درێژ دەکرێ، وە ماڵەکەی زۆر دەبێ، خزم و خانەوادەکەشی خۆشییان دەوێ.

## دەربارەی: چاکەکردن لەگەڵ خزمی نزیکتر ئنجا نزیك

٥٠- «عَنِ المِقْدَامِ بْنِ مَعْدِي كَرِبَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ يُوصِيكُمْ بِأُمَّهَاتِكُمْ، ثُمَّ يُوصِيكُمْ بِأُمَّهَاتِكُمْ، ثُمَّ يُوصِيكُمْ بِآبَائِكُمْ، ثُمَّ يُوصِيكُمْ بِالأَقْرَبِ فَالأَقْرَبِ»»[٢].

واتە: میقدامی کوڕی مەعدی کەریب (خوا لێی ڕازی بێ)، گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە دەیفەرموو: بێگومان خوا فەرمانتان پێدەکات بە چاك بوون لەگەڵ دایکانتان، پاشان دووبارە فەرمانتان پێدەکات چاکە لەگەڵ دایکانتان بکەن، ئنجا فەرمانتان پێدەکات چاکە لەگەڵ باوکانتان بکەن، ئنجا چاکە لەگەڵ کەسانی نزیکترو نزیکدا بکەن.

## دەربارەی: گوناهی پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی

٥١- «عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَاطِعُ رَحِمٍ»»[٣].

---

(١) حسن: انظر ما قبله.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٦٦٦).

(٣) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٤٨٨)، «غاية المرام» (٤٠٧): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١١- باب: إثم القاطع. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ١٨، ١٩].

واتە: جوبەیری کوڕی موتعیم (خوا لێی ڕازی بێ)، گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە دەیفەرموو: (لە سەرەتاوە) ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنێ (تاوەکو سزای سەختی پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی پێ نەچێژرێ).

٥٢- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الرَّحِمَ شُجْنَةٌ مِنَ الرَّحْمنِ، تَقُولُ: يَا رَبِّ، إِنِّي ظُلِمْتُ، يَا رَبِّ، إِنِّي قُطِعْتُ، يَا رَبِّ، إِنِّي إِنِّي، يَا رَبِّ، يَا رَبِّ. فَيُجِيبُهَا: أَلاَ تَرْضَيْنَ أَنْ أَقْطَعَ مَنْ قَطَعَكِ، وَأَصِلَ مَنْ وَصَلَكِ؟!»»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە، فەرموویەتی: بەزەیی ڕەگێکی لە ناوی (الرحمن)ـەوەیە، (رحم: پەیوەندی خزمایەتی) دەڵێ: ئەی پەروەردگار! من ستەمم لێکراوە، ئەی پەروەردگار من پچڕێنراوم، ئەی پەروەردگار من واو من وا، پەروەردگارا پەروەردگارا، (جا خوای پەروەردگاریش) وەڵامی دەداتەوە (دەفەرموێ): ئایا ڕازی نابی هەر کەسێك بتپچڕێنێ، بیپچڕێنم (لە بەزەیی خۆم)، وە هەر کەس بتگەیەنێ، بیگەیەنم بە (بەزەیی خۆم)؟!

٥٣- «عَنْ سَعِيدِ بْنِ سَمْعَان، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَتَعَوَّذُ مِنْ إِمَارَةِ الصِّبْيَانِ وَالسُّفَهَاءِ»[٢].

واتە: سەعیدی کوڕی سەمعان، دەڵێ: بیستم ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، پەنای بە خوا دەگرت لە دەسەڵاتی مێردمندااڵن و نەفامان.

## دەربارەی: سزای پەیوەندی پچڕاندن لە دونیادا

٥٤- «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ ذَنْبٍ أَحْرَى أَنْ يُعَجِّلَ اللَّهُ لِصَاحِبِهِ الْعُقُوبَةَ فِي الدُّنْيَا، مَعَ مَا يَدَّخِرُ لَهُ فِي الْآخِرَةِ، مِنْ قَطِيعَةِ الرَّحِمِ وَالْبَغْيِ»»[٣].

واتە: ئەبو بەکرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ گوناهێك نیە کە شایستەتر بێت خوا زوو تۆڵە لە خاوەنەکەی بکاتەوەو سزای بدات لە دونیا، سەرباری ئەوەش کە لە دوارۆژدا سزای بۆ هەڵدەگرێ، لە پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی و دەستدرێژیی.

---

(١) حسن: أخرجه أيضاً إبن حبان: ح ٤٤٤، قال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣١٩١).

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٩١٨، ٩٧٨): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٤٣- باب: في النهي عن البغي، إبن ماجه: ٣٧- كتاب الزهد، ٢٣- باب: البغي، ح ٤٢١١].

## دەربارەی: پەیوەندی گەیەنەر ئەو كەسە نیە سەردانی ئەو كەسە بكات، كە سەردانی دەكات[1]

٥٥- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ الْوَاصِلُ بِالْمُكَافِئِ، وَلَكِنَّ الْوَاصِلَ الَّذِي إِذَا قُطِعَتْ رَحِمُهُ وَصَلَهَا»»[2].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: ئەو كەسە گەیەنەری پەیوەندی خزمایەتی نیەو (كارەكەی هونەری تێدانیە) كە سەردانی ئەو خزم و كەسانە بكات كە سەردانی دەكەن، بەڵكو ئەو كەسە گەیەنەری پەیوەندی خزمایەتیە كە كاتێ پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ دەپچڕێنن، ئەو پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنێ و نەیپچڕێنێ.

## دەربارەی: گەورەیی بەردەوامی پەیوەندی خزمایەتی لەگەڵ خزمی ستەمكار

٥٦- «عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، عَلِّمْنِي عَمَلاً يُدْخِلُنِي الْجَنَّةَ، قَالَ: «لَئِنْ كُنْتَ أَقْصَرْتَ الْخُطْبَةَ لَقَدْ أَعْرَضْتَ الْمَسْأَلَةَ، أَعْتِقِ النَّسَمَةَ، وَفُكَّ الرَّقَبَةَ» قَالَ: أَوَ لَيْسَتَا وَاحِدَاً؟ قَالَ: «لاَ، عِتْقُ النَّسَمَةِ أَنْ تَعْتِقَ النَّسَمَةَ، وَفَكُّ الرَّقَبَةِ أَنْ تُعِينَ عَلَى الرَّقَبَةِ، وَالْمَنِيحَةُ الرَّغُوبُ، وَالْفَيْءُ عَلَى ذِي الرَّحِمِ، فَإِنْ لَمْ تُطِقْ ذَلِكَ، فَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ، وَانْهَ عَنِ الْمُنْكَرِ، فَإِنْ لَمْ تُطِقْ ذَلِكَ، فَكُفَّ لِسَانَكَ إِلاَّ مِنْ خَيْرٍ»»[3].

واتە: بەڕاء (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: دەشتەكیەك هات و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ كردەوەیەكم فێر بكە بمخاتە بەهەشت، فەرمووی: ئەگەرچی داواكاریەكەت بە وشەیەكی كورت دەربڕی، بەڵام بابەت و داوایەكەت فراوان كرد (واتە: وتەو داواكاریەكەت كورتە، بەڵام پاداشتی زۆر هەڵدەگرێ)، خەڵك ئازاد بكەو، بەندەش ئازاد بكە، (كابرا دەشتەكیەكە گوتی): مەگەر هەردووكیان (واتە: عتق و فك) وەك یەكدی نین و یەك مانایان نیە (كە بریتین لە ئازادكردن)؟ (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: نەخێر، (عِتْقُ النَّسَمَةِ) واتە: كەسێك ئازاد بكەیت (بە ڕاستەوخۆ، كە بەندەی خۆت بێت)، وە (فَكُّ الرَّقَبَةِ) واتە: یارمەتی كەسێك بدەیت (پارەی پێ بدەیت) تا خۆی بكڕێتەوەو ئازاد بێت، هەروەها خەڵات و بەخشینی چاك و بەرچاو ببەخشیت بەسەر خزم

---

(١) بەڵكو ئەو كەسەیە كە سەردانی ناكرێ و ئەو هەر سەردانیان دەكات.

(٢) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٤٨٩)، «غاية المرام» (٤٠٨): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١٥- باب: ليس الواصل بالمكافئ].

(٣) صحيح: «المشكاة» (٣٣٨٤).

و کەسی نزیك، جا ئەگەر ئەوەت پێ نەکرا، ئەوە فەرمان بە چاکە بکەو قەدەغەی خراپە بکە، جا ئەگەر ئەوەت پێ نەکرا، ئەوە زارت ببەستەو قسە مەکە تەنها لە چاکە نەبێ.

## دەربارەی: ئەو کەسەی پەیوەندی خزمایەتی نەپچڕاندوە لەسەردەمی نەزانیداو دوایش مسوڵمان بووە

٥٧- «عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُما)، أَنَّ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: أَرَأَيْتَ أُمُوراً كُنْتُ أَتَحَنَّثُ بِهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ، مِنْ صِلَةٍ، وَعَتَاقَةٍ، وَصَدَقَةٍ، فَهَلْ لِي فِيهَا أَجْرٌ؟ قَالَ حَكِيمٌ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَسْلَمْتَ عَلَى مَا سَلَفَ مِنْ خَيْرٍ»»[١].

واتە: عورِوەی کوڕی زوبەیر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: حەکیمی کوڕی حیزام (خوا لێی ڕازی بێ) پێی ڕاگەیاندوە، کە بە پێغەمبەری ﷺ گوتوە، دەبینی دەربارەی ئەوەی کە لە سەردەمی نەزانی هەندێ کردەوە هەبوون ئەنجامم دەدان، لە پەیوەندی خزمایەتی و ئازاد کردنی کۆیلەو خێرو چاکە کردن، ئایا لەو شتانەدا من پاداشتم بۆ هەن؟ حەکیم گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مسوڵمان بووی لەسەر کردەوە چاکەکانی پێشترت (واتە: بەڵێ پاداشتی ئەوانیشت بۆ هەیە، وە هەر ئەو کردەوە چاکانەبوون وایان کردوە ئیسلام و هەق قبووڵ بکەیت و مسوڵمان ببیت).

## دەربارەی: پەیوەندی هەبوون لەگەڵ کەسی هاوبەشدانەرو دیاری پێدانی

٥٨- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، رَأَى عُمَرُ حُلَّةً سِيَرَاءَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوِ اشْتَرَيْتَ هَذِهِ، فَلَبِسْتَهَا يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَلِلْوُفُودِ إِذَا أَتَوْكَ، فَقَالَ: «يَا عُمَرُ، إِنَّمَا يَلْبَسُ هَذِهِ مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ» ثُمَّ أُهْدِيَ لِلنَّبِيِّ ﷺ مِنْهَا حُلَلٌ، فَأَهْدَى إِلَى عُمَرَ مِنْهَا حُلَّةً، فَجَاءَ عُمَرُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بَعَثْتَ إِلَيَّ هَذِهِ، وَقَدْ سَمِعْتُكَ قُلْتَ فِيهَا مَا قُلْتَ، قَالَ: «إِنِّي لَمْ أُهْدِهَا لَكَ لِتَلْبَسَهَا، إِنَّمَا أَهْدَيْتُهَا إِلَيْكَ لِتَبِيعَهَا أَوْ لِتَكْسُوَهَا»، فَأَهْدَاهَا عُمَرُ لِأَخٍ لَهُ مِنْ أُمِّهِ مُشْرِكٍ»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: عومەر دەستە پۆشاکێکی پڕ حەریری بینی (دەفرۆشرا) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (زۆر چاك دەبوو) ئەگەر ئەمەت بکڕیباو لە ڕۆژی

---

١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٤٨): [البخاري: ٢٤- كتاب الزكاة، باب: من تصدق في الشرك ثم أسلم، مسلم: ١-كتاب الإيمان، ح ١٩٤، ١٩٥، ١٩٦].

٢) صحيح: «صحيح أبي داود» (٩٨٧): [البخاري: ١١- كتاب الجمعة، ٧- باب: يلبس أحسن ما يجد. مسلم: ٣٧- كتاب اللباس والزينة، ح٦، ٧، ٨، ٩].

جومعەو، بۆ (چاوپێکەوتنی) وەفدەکان بتپۆشیبایە کاتێ دەهاتن بۆ لات، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: ئەی عومەر! بە دڵنیایی ئەو کەسە ئەمە لەبەر دەکات کە لە دوارۆژدا هیچ پشك و بەشی بۆ نیە، پاشان (دوای ماوەیەك) چەند دەستە پۆشاکێکی لەمە کرا بە دیاری بۆ پێغەمبەر ﷺ، (پێغەمبەری خواش ﷺ) دەستە پۆشاکێکی لە پۆشاکەکان بە دیاری نارد بۆ عومەر، جا عومەر هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ ئەمەت بۆ من ناردووە، (جا چۆن ئەمە بکەمە بەرم) لە کاتێکدا گوێم لێ بوو ئەوەت فەرموو کە فەرمووت (دەربارەی ئەو پۆشاکە)؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: من ئەوەم نەکردۆتە دیاری بۆت تا لەبەری بکەیت، بەڵکو تەنها لەبەر ئەوە بۆم کردیتە دیاری تاوەکو بیفرۆشی، یاخود بیکەیتە دیاری (بۆ کەسێك کە لەبەرکردنی حەریری بۆ دروست بێ، وەك ئافرەتان و خزمانی کافر) جا عومەریش ناردی بۆ برایەکی خۆی لە دایکی، لە خەڵکی مەککە بەر لەوەی مسوڵمان ببێ.

## دەربارەی: فێری ڕەچەڵەکی خۆتان ببن، لەوەی دەتانگەیەنێ بە خزمەکانتان

٥٩- «عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ سَمِعَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ: «تَعَلَّمُوا أَنْسَابَكُمْ، ثُمَّ صِلُوا أَرْحَامَكُمْ، وَاللَّهِ إِنَّهُ لِيَكُونُ بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ أَخِيهِ الشَّيْءُ، وَلَوْ يَعْلَمُ الَّذِي بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ مِنْ دَاخِلَةِ الرَّحِمِ، لَأَوْزَعَهُ ذَلِكَ عَنِ انْتِهَاكِهِ»»[1].

واتە: جوبەیری کوڕی موتعیم (خوا لێی ڕازی بێ) گوێی لە عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ) بووە، لەسەر مینبەر گوتوویەتی: فێری ڕەچەڵەکی خۆتان بن، هەروەها پەیوەندی خزمایەتیتان بگەیەنن، سوێند بە خوا لە نێوان کەسێك و هاوەڵەکەیدا جار هەیە شتێك (ناخۆشیەك) ڕوودەدات، ئەگەر بزانێت چ پەیوەندییەکی خزمایەتی لە نێوانیاندایە، ئەوە ئەم پەیوەندیە ڕێگر دەبوو لەوەی کەسایەتی ئەو بشکێنێ و لەکەداری بکات.

٦٠- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّهُ قَالَ: احْفَظُوا أَنْسَابَكُمْ، تَصِلُوا أَرْحَامَكُمْ، فَإِنَّهُ لاَ بُعْدَ بِالرَّحِمِ إِذَا قَرُبَتْ، وَإِنْ كَانَتْ بَعِيدَةً، وَلَا قُرْبَ بِهَا إِذَا بَعُدَتْ، وَإِنْ كَانَتْ قَرِيبَةً، وَكُلُّ رَحِمٍ آتِيَةٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَمَامَ صَاحِبِهَا، تَشْهَدُ لَهُ بِصِلَةٍ إِنْ كَانَ وَصَلَهَا، وَعَلَيْهِ بِقَطِيعَةٍ إِنْ كَانَ قَطَعَهَا»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ڕەچەڵەك (ناوی باوك و باپیرانتان پشت بە پشت لەبەر بکەن و بیزانن)، بە هۆیانەوە ئێوە دەگەنەوە خزمەکانتان، چونکە بە هۆی گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی دووری نامێنێ، ئەگەر دووریش بێ، وە بە هۆی نەگەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی نزیکی نامێنێ، هەرچەندە خزمی نزیکیش بێت (واتە: ئەگەر سەردانی نەکەی دوورە

(١) حسن الإسناد، وصح مرفوعاً، «السلسلة الصحيحة» (٢٧٧).
(٢) حسن الإسناد، وصح مرفوعاً، «السلسلة الصحيحة» (٢٧٧).

با خزمی نزیکیش بێ)، هەموو ڕەحمێك له ڕۆژی دواییدا دێ، لەبەردەم خاوەنەکەی شایەتی بۆ دەدات بە گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی، ئەگەر پەیوەندیەکەی گەیاندبێ، وە شایەتی لەسەر دەدات بە پچڕاندنی پەیوەندی ئەگەر پچڕاندبێتی.

## دەربارەی: کۆیلەی ئازادکراوی کۆمەڵێك، بەشێکە لە خۆیان

٦١- «عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِعُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): «اجْمَعْ لِي قَوْمَكَ»، فَجَمَعَهُمْ، فَلَمَّا حَضَرُوا بَابَ النَّبِيِّ ﷺ دَخَلَ عَلَيْهِ عُمَرُ، فَقَالَ: قَدْ جَمَعْتُ لَكَ قَوْمِي، فَسَمِعَ ذَلِكَ الْأَنْصَارُ فَقَالُوا: قَدْ نَزَلَ فِي قُرَيْشٍ الْوَحْيُ، فَجَاءَ الْمُسْتَمِعُ وَالنَّاظِرُ مَا يُقَالُ لَهُمْ، فَخَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَامَ بَيْنَ أَظْهُرِهِمْ فَقَالَ: «هَلْ فِيكُمْ مِنْ غَيْرِكُمْ؟»، قَالُوا: نَعَمْ، فِينَا حَلِيفُنَا وَابْنُ أُخْتِنَا وَمَوَالِينَا، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: حَلِيفُنَا مِنَّا، وَابْنُ أُخْتِنَا مِنَّا، وَمَوَالِينَا مِنَّا، وَأَنْتُمْ تَسْمَعُونَ: إِنَّ أَوْلِيَائِي مِنْكُمُ الْمُتَّقُونَ، فَإِنْ كُنْتُمْ أُولَئِكَ فَذَاكَ، وَإِلاَّ فَانْظُرُوا، لَا يَأْتِي النَّاسُ بِالْأَعْمَالِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَتَأْتُونَ بِالأَثْقَالِ، فَيُعْرَضَ عَنْكُمْ ثُمَّ نَادَى فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ! وَرَفَعَ يَدَيْهِ يَضَعُهُمَا عَلَى رُءُوسِ قُرَيْشٍ أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّ قُرَيْشاً أَهْلُ أَمَانَةٍ، مَنْ بَغَى بِهِمْ «قَالَ زُهَيْرٌ: أَظُنُّهُ قَالَ: الْعَوَاثِرَ» كَبَّهُ اللَّهُ لِمَنْخِرَيْهِ»، يَقُولُ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ»[1].

واتە: ڕیفاعەی کوڕی ڕافیع (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە عومەری (خوا لێی ڕازی بێ)، فەرموو: قەومەکەتم بۆ کۆبکەرەوە، ئەویش کۆی کردنەوە، جا کە هەموو ئامادەبوون لە پێش دەرگای پێغەمبەر ﷺ، عومەر چووە ژوورو گوتی: قەومەکەمم بۆت کۆکردۆتەوە، جا پشتیوانەکان ئەمەیان بیست، گوتیان: بە دڵنیایی سروش دابەزیوە دەربارەی قوڕەیش، ئیدی ئەوانەی توانای بیستن و بینینیان هەبوو هاتن بۆ ئەوەی بزانن چیان پێ دەگوترێ، پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرو لە نێوانیان ڕاوەستا، فەرمووی: ئایا غەیری خۆتانتان تێدایە؟ گوتیان: بەڵێ، لە نێوماندا کەسانی هاوپەیمانمان و کوڕی خوشك و خزمەتکاری ئازادکراومان لەناودایە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هاوپەیمانەکانمان لە ئێمەن، کوڕی خوشکمان لە ئێمەیە، خزمەتکاری ئازادکراو لە لایەن ئێمەوە لە ئێمەیە، ئێوە دەبیستن (جوان ئاگاتان لێبێ): دۆستانی من لە نێو ئێوەدا ئەوانەن کە پارێزکارن، ئەگەر ئێوە لە ئەوان بوون ئەوە باشە، ئەگەرنا چاوەڕێ بکەن (خۆتان بگەیەننە ئەو پلەیە)، نابێت خەڵك لە ڕۆژی دوایی کردەوەیان هەبێ و ئێوەش بە باری گرانەوە بێن و ڕووتان لێ وەربگێردرێ، پاشان بانگی کردو فەرمووی: ئەی خەڵکینە! لە کاتێکدا هەردوو دەستی بەرزکردەوە، لەسەر سەری قوڕەیشیەکانی داناو (فەرمووی): ئەی خەڵکینە! قوڕەیش خەڵکانێکن ئەهلی ئەمانەتن، هەرکەسێك ستەمیان لێبکات «زوهەیر دەڵێ: وا دەزانم فەرمووی:

---

[1] حسن: «السلسلة الصحيحة» (١٦٨٨).

ئەوەی چاڵیان بۆ لێبدات» یا ڕەببی خوا بەسەر لووتیاندا (لەپەوڕوو) بیانخات، سێ جار ئەمەی فەرمووە.

## دەربارەی: هەر کەسێك دوو کچ، یان کچێك بەخێو بکات

٦٢- «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ كَانَ لَهُ ثَلاَثُ بَنَاتٍ، وَصَبَرَ عَلَيْهِنَّ، وَكَسَاهُنَّ مِنْ جِدَتِهِ، كُنَّ لَهُ حِجَاباً مِنَ النَّارِ»»[١].

واتە: عوقبەی کوڕی عامر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: هەر کەسێك سێ کچی هەبن ئارامیان لەسەر بگرێ، وە پۆشاکیان بۆ بکات لەوەی خوا پێیداوە، ئەوە بۆی دەبن بە پەرژین لە ئاگری (دۆزەخ).

٦٣- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ تُدْرِكُهُ ابْنَتَانِ، فَيُحْسِنُ صُحْبَتَهُمَا، إِلاَّ أَدْخَلَتَاهُ الْجَنَّةَ»»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ مسوڵمانێك نیە کە دوو کچی هەبن، چاکەکار بێ لەگەڵیان، حەتمەن دەیخەنە بەهەشتەوە (واتە: کچەکانی دەبنە هۆکاری چوونە بەهەشتی دایك و باوکیان، ئەگەر بە پێی شەریعەت گەورەیان بکەن).

٦٤- «عَنْ مُحَمَّد بْنِ الْمُنْكَدِرِ، أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) حَدَّثَهُمْ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَانَ لَهُ ثَلاَثُ بَنَاتٍ، يُؤْوِيهِنَّ، وَيَكْفِيهِنَّ، وَيَرْحَمُهُنَّ، فَقَدْ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ الْبَتَّةَ»، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ بَعْضِ الْقَوْمِ: وَثِنْتَيْنِ، يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «وَثِنْتَيْنِ»»[٣].

واتە: موحەممەدی کوڕی مونکەدیر، دەڵێ: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) بۆی باسکردوون کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێك سێ کچی هەبن، بیانحەوێنێتەوەو خەرجیان دابین بکات، وە بەسۆزو میهرەبان بێ لەگەڵیاندا، ئەوە بەهەشتی بۆ مسۆگەرە، جا پیاوێك لە نێو خەڵکەکەدا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر دوو کچیش بن بەهەمان شێوەیە؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەگەر دوو کچیش بن هەر بە هەمان شێوەیە.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٩٤، ١٠٢٧): [إبن ماجه: ٣٣- كتاب الأدب، ٣- باب: بر الولدين والإحسان إلى البنات، ح ٣٦٦٩].

(٢) حسن لغيره: «السلسلة الصحيحة» (٢٧٧٦).

(٣) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٢٩٤ و ٢٤٩٢).

## دەربارەی: هەر کەسێك سێ خوشك بەخێو بكات

٦٥- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لاَ يَكُونُ لِأَحَدٍ ثَلاَثُ بَنَاتٍ، أَوْ ثَلاَثُ أَخَوَاتٍ، فَيُحْسِنُ إِلَيْهِنَّ، إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ»»[1].

واتە: لە ئەبو سەعیدی خودریەوە (خوا لێی ڕازی بێ) گێڕدراوەتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێك نیە کە سێ کچ، یان سێ خوشکی هەبن، چاکەکاربێ لەگەڵیان (مامەڵەی باشیان لەگەڵدا بکات)، حەتمەن بە دڵنیاییەوە دەچێتە بەهەشت.

٦٦- «عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِي كَرِبَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا أَطْعَمْتَ نَفْسَكَ فَهُوَ لَكَ صَدَقَةٌ، وَمَا أَطْعَمْتَ وَلَدَكَ فَهُوَ لَكَ صَدَقَةٌ، وَمَا أَطْعَمْتَ زَوْجَكَ فَهُوَ لَكَ صَدَقَةٌ، وَمَا أَطْعَمْتَ خَادِمَكَ فَهُوَ لَكَ صَدَقَةٌ»»[2].

واتە: میقدامی کوڕی مەعدی کەریب (خوا لێی ڕازی بێ)، گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە دەیفەرموو: ئەوەی خۆت دەیخۆیت بۆت بە خێر دەنووسرێ، ئەوەی دەیدەیت بە منداڵەکەت بۆت بە خێر دەنووسرێ، ئەوەی دەیدەیت بە خێزانەکەت بۆت بە خێر دەنووسرێ، ئەوەی دەیدەیت بە خزمەتکارەکەت بۆت بە خێر دەنووسرێ.

## دەربارەی: منداڵ هۆکاری ڕەزیلی و ترسنۆکییە

٦٧- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَوْماً: وَاللَّهِ مَا عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ رَجُلٌ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ عُمَرَ، فَلَمَّا خَرَجَ رَجَعَ فَقَالَ: كَيْفَ حَلَفْتُ أَيْ بُنَيَّةُ؟ فَقُلْتُ لَهُ، فَقَالَ: أَعَزُّ عَلَيَّ، وَالْوَلَدُ أَلْوَطُ»[3].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ڕۆژێك ئەبو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: سوێند بە خوا لەسەر ڕووی زەوی هیچ پیاوێك نیە هێندەی عومەر لەلام خۆشەویستتر بێ، جا کاتێ (لە ماڵ) چووە دەرەوە گەڕایەوە، گوتی: چۆن سوێندێکم خوارد ئەی کیژۆڵەکەم؟! منیش پێمگوت

---

(١) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٢٩٤): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ١٢١- باب: فضل من عال يتيما. الترمذي: ٢٥١- كتاب البر والصلة، ١٣- باب: ما جاء في النفقة على البنات والأخوات].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٤٥٢).

(٣) حسن الإسناد.

(سوێندەكەی چۆن خوارد)، ئەویش گوتی: زۆر لام خۆشەویستە (عومەر)، منداڵیش پەیوەسترە بە دڵەوەو خۆشەویسترە.

٦٨- «عَنِ ابْنِ أَبِي نُعْمٍ قَالَ: كُنْتُ شَاهِداً ابْنَ عُمَرَ إِذْ سَأَلَهُ رَجُلٌ عَنْ دَمِ الْبَعُوضَةِ؟ فَقَالَ: مِمَّنْ أَنْتَ؟ فَقَالَ: مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ، فَقَالَ: انْظُرُوا إِلَى هَذَا، يَسْأَلُنِي عَنْ دَمِ الْبَعُوضَةِ، وَقَدْ قَتَلُوا ابْنَ النَّبِيِّ ﷺ، سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «هُمَا رَيْحَانَيَّ مِنَ الدُّنْيَا»»[1].

واتە: ئیبنو ئەبی نوعم دەڵێ: لای ئیبنو عومەر بووم كاتێك پیاوێك پرسیاری لێكرد دەربارەی خوێنی مێشوولە (كە ئایا گوناهبار دەبن كە مێشوولە بكوژن!)، (ئیبنو عومەر) گوتی: تۆ خەڵكی كوێی؟ گوتی: خەڵكی عێراق، گوتی: تەماشای ئەوە بكەن، نەوەی پێغەمبەریان ﷺ كوشتوە، كەچی پرسیارم لێدەكات دەربارەی خوێنی مێشوولە، من گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو (دەربارەی ئەو حەسەن و حوسەینەی خەڵكی عێراق كوشتیانن) دەیفەرموو: ئەوان دوو ڕەیحانەی منن لە بەهەشتدا.

## دەربارەی: هەڵگرتنی منداڵی بچووك لەسەر شان

٦٩- «عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَالْحَسَنُ صَلَوَاتُ اللَّهِ عَلَيْهِ عَلَى عَاتِقِهِ، وَهُوَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ، إِنِّي أُحِبُّهُ فَأَحِبَّهُ»»[2].

واتە: بەڕاء (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەرم ﷺ بینی لە كاتێكدا حەسەنی لەسەر شانی خۆی دانابوو، دەیفەرموو: خوایە من حەسەنم خۆشدەوێ، تۆش خۆشتبوێ.

## دەربارەی: منداڵ چاو ڕۆشنییە

٧٠- «عَنْ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ، قَالَ: جَلَسْنَا إِلَى الْمِقْدَادِ بْنِ الأَسْوَدِ يَوْماً، فَمَرَّ بِهِ رَجُلٌ فَقَالَ: طُوبَى لِهَاتَيْنِ الْعَيْنَيْنِ اللَّتَيْنِ رَأَتَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَاللَّهِ لَوَدِدْنَا أَنَّا رَأَيْنَا مَا رَأَيْتَ، وَشَهِدْنَا مَا شَهِدْتَ. فَاسْتُغْضِبَ، فَجَعَلْتُ أَعْجَبُ، مَا قَالَ إِلاَّ خَيْراً، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْهِ فَقَالَ: «مَا يَحْمِلُ الرَّجُلُ عَلَى أَنْ يَتَمَنَّى مُحْضَراً غَيَّبَهُ اللَّهُ عَنْهُ؟ لاَ يَدْرِي لَوْ شَهِدَهُ كَيْفَ يَكُونُ فِيهِ؟ وَاللَّهِ، لَقَدْ حَضَرَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَقْوَامٌ كَبَّهُمُ اللَّهُ عَلَى مَنَاخِرِهِمْ فِي جَهَنَّمَ، لَمْ يُجِيبُوهُ وَلَمْ يُصَدِّقُوهُ، أَوَلاَ تَحْمَدُونَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ إِذْ أَخْرَجَكُمْ لاَ تَعْرِفُونَ إِلاَّ رَبَّكُمْ، فَتُصَدِّقُونَ بِمَا جَاءَ بِهِ نَبِيُّكُمْ ﷺ قَدْ كُفِيتُمُ الْبَلاَءَ بِغَيْرِكُمْ، وَاللَّهِ لَقَدْ بُعِثَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٤٩٤).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٧٨٩): [البخاري: ٦٢- كتاب فضائل أصحاب النبي ﷺ، ٢٢- باب: مناقب الحسن والحسين. مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ٥٨، ٥٩].

أَشَدِّ حَالٍ بُعِثَ عَلَيْهَا نَبِيٌّ قَطُّ، فِي فَتْرَةٍ وَجَاهِلِيَّةٍ مَا يَرَوْنَ أَنَّ دِيناً أَفْضَلُ مِنْ عِبَادَةِ الأَوْثَانِ، فَجَاءَ بِفُرْقَانٍ فَرَّقَ بِهِ بَيْنَ الْحَقِّ وَالْبَاطِلِ، وَفَرَّقَ بِهِ بَيْنَ الْوَالِدِ وَوَلَدِهِ، حَتَّى إِنْ كَانَ الرَّجُلُ لَيَرَى وَالِدَهُ أَوْ وَلَدَهُ أَوْ أَخَاهُ كَافِراً، وَقَدْ فَتَحَ اللَّهُ قُفْلَ قَلْبِهِ بِالإِيمَانِ، وَيَعْلَمُ أَنَّهُ إِنْ هَلَكَ دَخَلَ النَّارَ، فَلاَ تَقَرُّ عَيْنُهُ، وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّ حَبِيبَهُ فِي النَّارِ». وَأَنَّهَا لِلَّتِي، قَالَ اللَّهُ عَزَّوَجَلَّ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ ﴿٧٤﴾ ﴾الفرقان»(١).

واتە: جوبەیری کوڕی نوفەیر دەڵێ: ڕۆژێك لە لای میقدادی کوڕی ئەسوەد دانیشتبووین، پیاوێك بەلایدا تێپەڕی، گوتی: خۆشبەختی بۆ ئەو دوو چاوەی تۆ، کە پێغەمبەری خوایان ﷺ بینیوە، سوێند بە خوا ئێمە خۆزگەمان دەخواست بەوەی ئەوە ببینین، کە تۆ بینیوتە، هەروەها لەو شوێنەدا ئامادە بین کە تۆ لێی ئامادە بوویت، جا میقدادی کوڕی ئەسوەد تووڕە بوو، (جوبەیری کوڕی نوفەیر دەڵێ): منیش پێم سەیر بوو، ئەو تەنها قسەی باشی کرد، پاشان میقدادی کوڕی ئەسوەد ڕووی تێکردو گوتی: چ وا لە پیاوێك دەکات کە ئاواتی ئەوە بخوازێت لە شوێنێکدا ئامادە بێت کە خوا لە ئەوی پەنهان کردوە، ئەم پیاوە چوزانێ کە ئاخۆ ئەگەر ئەویش لەوێدا ئامادە بووایە چۆن دەبوو؟ سوێند بە خوا خەڵکانێك لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ بوون، خوا (بە هۆی خراپی ئەوان) لەسەر ڕوویان ڕایکێشاون بۆ نێو دۆزەخ، ئەوان (هیدایەتیان وەرنەگرت) نە وەڵامی پێغەمبەریان ﷺ دایەوەو، نە بە ڕاستیان زانی (لە کاتێکدا پێغەمبەری خواشیان بینی بوو)، بۆچی سوپاسی خوا ناکەن لە کاتێکدا لەو ڕۆژەی دەرهاتوون (لە سکی دایکتان) تەنها پەروەردگارتان دەناسن و، ئەوەی پێغەمبەرەکەتان ﷺ هێناویەتی بەڕاستی دەزانن، لە یەخەتان بۆتەوە کە بە هۆی جگە لە خۆتان تووشی بەڵاو فیتنە ببن، سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا ﷺ لە توندترین بارودۆخدا هات، هیچ پێغەمبەرێکی دیکە ئەو بارودۆخەی نەبووە، لە سەردەمێکی وادا هات کە پەیامی پێغەمبەرایەتی نەمابوو، خەڵك لە نەفامیدا بوون، نەیاندەزانی کە ئاینێك هەیە باشترە لە بتپەرستی، پێغەمبەر ﷺ ئاینی جیاکەرەوەی لە نێوان ڕاستی و ناڕاستی لەلایەن خواوە هێنا، بە هۆیەوە کوڕی مسوڵمانی لە باوکی بێبڕوای جیاکردەوە، وای لێهات پیاو هەبوو باوکی خۆی، یانیش کوڕەکەی خۆی دەبینی، یان براکەی خۆی دەبینی کە بێبڕوایە، لە کاتێکدا خوا قوفڵی دڵی ئەوی بە بڕوا کردبۆوە، (کابرای بڕوادار) چاك دەیزانی ئەگەر ئەو (کەسە نزیکانەی) بە بێبڕوا بمرن ئەوە دەچنە نێو ئاگری دۆزەخ، جا چاوی بەرایی نەدەدا، لە کاتێکدا کە دەیزانی خۆشەویستەکەی لە نێو ئاگر دایە، ئەمە بۆ (ئەو کەسە بوو) کە خوای (عَزَّوَجَلَّ) لەبارەیەوە فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ ﴿٧٤﴾ ﴾ الفرقان.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٨٢٣).

## دەربارەی: ئەو کەسەی دوعا دەکات بۆ هاوەڵەکەی تا ماڵ و منداڵی زۆربێ

٧١- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ يَوْمًا، وَمَا هُوَ إِلاَّ أَنَا وَأُمِّي وَأُمُّ حَرَامٍ خَالَتِي، إِذْ دَخَلَ عَلَيْنَا فَقَالَ لَنَا: «أَلاَ أُصَلِّي بِكُمْ؟» وَذَاكَ فِي غَيْرِ وَقْتِ صَلاَةٍ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: فَأَيْنَ جَعَلَ أَنَسًا مِنْهُ؟ فَقَالَ: جَعَلَهُ عَنْ يَمِينِهِ ثُمَّ صَلَّى بِنَا، ثُمَّ دَعَا لَنَا «أَهْلَ الْبَيْتِ» بِكُلِّ خَيْرٍ مِنْ خَيْرِ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، فَقَالَتْ أُمِّي: يَا رَسُولَ اللَّهِ، خُوَيْدِمُكَ، ادْعُ اللَّهَ لَهُ، فَدَعَا لِي بِكُلِّ خَيْرٍ، كَانَ فِي آخِرِ دُعَائِهِ أَنْ قَالَ: «اللَّهُمَّ أَكْثِرْ مَالَهُ وَوَلَدَهُ، وَبَارِكْ لَهُ»»[1].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ڕۆژێك چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، کەسی لەلا نەبوو، تەنها من و دایکم و ئوممو حەڕامی پورم بووین، لە ناکاو پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە بۆ لامان، پێی فەرمووین: ئایا نوێژتان بۆ نەکەم؟ جا ئەو کاتە کاتی نوێژ نەبوو، پیاوێك لە نێو خەڵکەکە (لە کاتی گێڕانەوەی ئەم فەرمووده) گوتی: پێغەمبەر ﷺ ئەنەسی لە کوێی خۆی دانا؟ گوتی: لە لای ڕاستی خۆی داینا، پاشان نوێژی بۆ کردین، پاشان پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ بنەماڵەی ئێمە کرد، داوای هەموو باشەیەکی دونیاو دوارۆژی بۆ لە خوا کردین، دایکم گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوعا بۆ خزمەتکارۆکەکەت (ئەنەس) بکە، پێغەمبەر ﷺ داوای هەموو باشەیەکی بۆ لە خوا کردم و، لە کۆتایی دوعاکەی فەرمووی: خوایە ماڵ و سامان و منداڵی زۆر بکە، بەرەکەتی خۆتی بۆ بخەرە نێوی.

## دەربارەی: دایکان بە سۆزو میهرەبانن

٧٢- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، فَأَعْطَتْهَا عَائِشَةُ ثَلاَثَ تَمَرَاتٍ، فَأَعْطَتْ كُلَّ صَبِيٍّ لَهَا تَمْرَةً، وَأَمْسَكَتْ لِنَفْسِهَا تَمْرَةً، فَأَكَلَ الصِّبْيَانُ التَّمْرَتَيْنِ وَنَظَرَا إِلَى أُمِّهِمَا، فَعَمَدَتْ إِلَى التَّمْرَةِ فَشَقَّتْهَا، فَأَعْطَتْ كُلَّ صَبِيٍّ نِصْفَ تَمْرَةٍ، فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ فَأَخْبَرَتْهُ عَائِشَةُ فَقَالَ: «وَمَا يُعْجِبُكِ مِنْ ذَلِكَ؟ لَقَدْ رَحِمَهَا اللَّهُ بِرَحْمَتِهَا صَبِيَّيْهَا»»[2].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئافرەتێك هاتە لای عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، (دایکمان) عائیشە سێ دەنکە خورمای پێدا، ئەویش (دوو منداڵی خۆی لەگەڵ بوو) هەر دەنکەی دا بە منداڵێك و، دانەیەکی بۆ خۆی هەڵگرت، منداڵەکان دوو خورماکەی خۆیان خواردو،

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٤٠، ١٤١، ٢٢٤١): [مسلم: ٥- كتاب المساجد ح ٢٦٨].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣١٤٣): [بمعناه في مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب ح ١٤٨]، قلت: والبخاري في الزكاة وغيره (٣ / ٢٨٣).

تەماشای دایكیان دەكرد (ویستوویانە دانەكەی ئەویش بخۆن)، دایكیشیان خورماكەی بۆ پارچە كردن و، هەر یەكەو لەتێكی پێدان، كە پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە (ماڵ، دایكمان) عائیشە هەواڵی پێدا (بەوەی بینیویەتی)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە چ شتێكی ئەوە سەرت سووڕماوە؟ خوا ڕەحمی بەو ئافرەتە كردوە بە هۆی ڕەحم كردنی بە منداڵەكانییەوە (واتە: بەڵكو ڕەحمی خوا جێگەی سەرسووڕمانە كە لەو ئافرەتە خۆشبووە، بەوەی لەتە خورمایەكی داوەتە منداڵەكانی خۆی).

## دەربارەی: ماچ كردنی منداڵان

٧٣- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: أَتُقَبِّلُونَ صِبْيَانَكُمْ؟ فَمَا نُقَبِّلُهُمْ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَوَ أَمْلِكُ لَكَ أَنْ نَزَعَ اللَّهُ مِنْ قَلْبِكَ الرَّحْمَةَ؟»»(١).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: دەشتەكیەك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ (دیارە لەو كاتە خۆشەویستی خوا ﷺ منداڵی ماچ كردوون) كابرای دەشتەكی گوتی: ئایا ئێوە منداڵەكانیشتان ماچ دەكەن؟ ئێمە (منداڵەكانمان) ماچ ناكەین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من دەسەڵاتی ئەوەم نیە بەزەیی بخەمە دڵتەوە، كە خوا لە دڵتی دەرهێناوە.

٧٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَبَّلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ، وَعِنْدَهُ الأَقْرَعُ بْنُ حَابِسٍ التَّمِيمِيُّ جَالِسٌ، فَقَالَ الأَقْرَعُ: إِنَّ لِي عَشَرَةً مِنَ الْوَلَدِ مَا قَبَّلْتُ مِنْهُمْ أَحَدًا، فَنَظَرَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: «مَنْ لاَ يَرْحَمُ لاَ يُرْحَمُ»»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ حەسەنی كوڕی عەلی ماچ كردو، ئەقرەعی كوڕی حابیسی تەمیمیش لەلای دانیشتبوو، ئەقرەع گوتی: لە ڕاستیدا من دە منداڵم هەن و، تا ئێستا یەك منداڵیشم ماچ نەكردوون، پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای كرد! پاشان فەرمووی: هەر كەس بەزەیی نەنوێنێ، بەزەیی لەگەڵ نانوێنرێ.

## دەربارەی: ڕاستكردنەوەی هەڵسوكەوتی باوك و چاكەكردنی لەگەڵ منداڵەكانی

٧٥- «عَنْ عَامِرٍ، أَنَّ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) حَدَّثَهُ، أَنَّ أَبَاهُ انْطَلَقَ بِهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَحْمِلُهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أُشْهِدُكَ أَنِّي قَدْ نَحَلْتُ النُّعْمَانَ كَذَا وَكَذَا، فَقَالَ: «أَكُلَّ وَلَدِكَ

---

(١) صحيح: [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١٨- باب: رحمة الولدين تقبيله ومعانقته. مسلم: ٤٣- كتاب الفضائل، ح ٦٤].

(٢) صحيح: «غاية المرام» (٧٠- ٧١): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١٨- باب: رحمة الولد تقبيله ومعانقته. مسلم: ٤٣- كتاب الفضائل، ح ٦٥].

نَحَلْتَ؟» قَالَ: لاَ، قَالَ: «فَأَشْهِدْ غَيْرِي»، ثُمَّ قَالَ: «أَلَيْسَ يَسُرُّكَ أَنْ يَكُونُوا فِي الْبِرِّ سَوَاءً؟» قَالَ: بَلَى، قَالَ: «فَلاَ إِذاً»»[١].

واتە: عامرِ دەڵێ: نوعمانی کوڕی بەشیر (خوا لێیان ڕازی بێ) گێڕاویەتیەوە کە باوکی هەڵیگرتووەو بردوویەتی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من تۆ دەکەم بە شایەد کە ئەوەو ئەوەم لە ماڵی خۆم داوە بە نوعمان، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بە هەموو منداڵەکانی دیکەت داون؟ گوتی: نەخێر، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: کەواتە کەسێکی دی غەیری من بکە بە شایەد، پاشان فەرمووی: ئایا پێتخۆش نیە (منداڵەکانت) لە چاکەکاری لەگەڵتدا هەموو وەك یەك بن؟ گوتی: با، فەرمووی: مادام تۆ وامەکە (یانی: کەواتە تۆش جیاوازی مەکە لە نێوانیان).

## دەربارەی: کەسی بێ بەزەیی، بەزەیی لەگەڵ نانوێنرێ

٧٦- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ لاَ يَرْحَمُ لاَ يُرْحَمُ»»[٢].

واتە: ئەبو سەعید (خوا لێی ڕازی بێ)، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی: هەر کەس بەزەیی نەنوێنێ، بەزەیی لەگەڵ نانوێنرێ.

٧٧- «عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ يَرْحَمُ اللَّهُ مَنْ لاَ يَرْحَمُ النَّاسَ»»[٣].

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا بەزەیی نایەتەوە بەو کەسەی بەزەیی نایەتەوە بە خەڵك.

٧٨- «عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ لاَ يَرْحَمُ النَّاسَ لاَ يَرْحَمُهُ اللَّهُ»[٤].

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بەزەیی نەیەتەوە بە خەڵك، خوا بەبەزەیی نابێت لەگەڵیدا.

---

(١) صحيح: «الإرواء» (٦/ ٤٢)، «غاية المرام» (١٦٩/ ٢٧٤): [البخاري: ٥١- كتاب الهبة، ١٢- باب: الهبة للولد. مسلم: ٢٤- كتاب الهبات، ح ١٧]. وأقول: ليس عند البخاري قوله: «أليس يسرك....».

(٢) صحيح بما بعده: «تخريج المشكلة» (١٠٨).

(٣) صحيح: «تخريج المشكلة» أيضاً: [البخاري: ٩٧- كتاب التوحيد، ٢- باب: قول الله تعالى: (قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَنَ) (الإسراء: ١١٠). مسلم: ٤٣- كتاب الفضائل، ح ٦٦].

(٤) صحيح: انظر ما قبله.

٧٩- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ نَاسٌ مِنَ الأَعْرَابِ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ مِنْهُمْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتُقَبِّلُونَ الصِّبْيَانَ، فَوَاللَّهِ مَا نُقَبِّلُهُمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَوَ أَمْلِكُ إِنْ كَانَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ نَزَعَ مِنْ قَلْبِكَ الرَّحْمَةَ؟»»[1].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: کۆمەڵێك خەڵکی دەشتەکی هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، جا پیاوێك لەوان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێوە منداڵان ماچ دەکەن؟ سوێند بە خوا ئێمە ماچیان ناکەین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مەگەر چیم لە دەست دێ، لە کاتێکدا خوای زاڵی پایەدار سۆزو میهرەبانی لە دڵی تۆ دەرهێناوە؟

٨٠- «عَنْ أَبِي عُثْمَانَ، أَنَّ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) اسْتَعْمَلَ رَجُلاً، فَقَالَ الْعَامِلُ: إِنَّ لِي كَذَا وَكَذَا مِنَ الْوَلَدِ، مَا قَبَّلْتُ وَاحِداً مِنْهُمْ، فَزَعَمَ عُمَرُ، أَوْ قَالَ عُمَرُ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لاَ يَرْحَمُ مِنْ عِبَادِهِ إِلاَّ أَبَرَّهُمْ»[2].

واتە: ئەبو عوسمان دەگێڕێتەوە کە عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، پیاوێکی خستە سەر کارێکی دەوڵەت، پیاوە فەرمانبەرەکە گوتی: من ئەوەندەو ئەوەندە منداڵەم هەیە، هیچ یەکێك لەوانم ماچ نەکردوە، عومەر گوتی: خوای زاڵی پایەدار میهرەبان نابێ لەگەڵ بەندەکانی، تەنها لەگەڵ چاکترینیان نەبێ.

## دەربارەی: بەزەیی (خوا) سەد بەشە

٨١- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «جَعَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ الرَّحْمَةَ مِائَةَ جُزْءٍ، فَأَمْسَكَ عِنْدَهُ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ، وَأَنْزَلَ فِي الأَرْضِ جُزْءاً وَاحِداً، فَمِنْ ذَلِكَ الْجُزْءِ يَتَرَاحَمُ الْخَلْقُ، حَتَّى تَرْفَعَ الْفَرَسُ حَافِرَهَا عَنْ وَلَدِهَا، خَشْيَةَ أَنْ تُصِيبَهُ»»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوای زاڵی پایەدار بەزەیی خۆی کردوە بە سەد بەش، نەوەدو نۆی لای خۆی گرتۆتەوە، یەك بەشیشی دابەزاندۆتە سەر زەوی، لەم تاکە بەشەوە دروستکراوەکان بەزەیی دەنوێنن لەگەڵ یەکدی، تەنانەت (هەر بە هۆی ئەو یەك بەشەی میهرەبانیەیە) کە ئەسپ سمی لەسەر بەچکەکەی لادەدات، لە ترسی ئەوەی بەری بکەوێ.

---

(١) صحيح: [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١٨- باب: رحمة الولدين تقبيله ومعانقته. مسلم: ٤٣- كتاب الفضائل، ح ٦٤].

(٢) حسن الإسناد.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٦٣٤): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١٩- جعل الله الرحمة مائة جزء. مسلم: ٤٩- كتاب التوبة، ح ١٧].

## دەربارەی: وەسیەت کردن (ی باش بوون) بۆ دراوسێ

٨٢- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «مَا زَالَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ يُوصِينِي بِالْجَارِ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ»»(١).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی: بەردەوام جبریل (عَلَيْهِ السَّلَام) ئامۆژگاری دەکردم، بە (چاك بوون لەگەڵ) دراوسێ، هەتا وا گومانم برد کە دراوسێ میرات لە دراوسێ دەگرێ.

٨٣- «عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْخُزَاعِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُحْسِنْ إِلَى جَارِهِ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْراً أَوْ لِيَصْمُتْ»»(٢).

واتە: ئەبو شورەیحی خوزاعی (خوا لێی ڕازی بێ)، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی: هەر کەسێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با چاکە بکات لەگەڵ دراوسێکەی، هەر کەسێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە میوانی بگرێ، وە هەر کەسێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با قسەی چاك بکات، یان بێدەنگ بێ.

## دەربارەی: مافی دراوسێیەتی

٨٤- «عَنِ الْمِقْدَادِ بْنِ الأَسْوَدِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: سَأَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَصْحَابَهُ عَنِ الزِّنَا؟ قَالُوا: حَرَامٌ، حَرَّمَهُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ، فَقَالَ: «لِأَنْ يَزْنِيَ الرَّجُلُ بِعَشْرِ نِسْوَةٍ، أَيْسَرُ عَلَيْهِ مِنْ أَنْ يَزْنِيَ بِامْرَأَةِ جَارِهِ»، وَسَأَلَهُمْ عَنِ السَّرِقَةِ؟ قَالُوا: حَرَامٌ، حَرَّمَهَا اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَرَسُولُهُ، فَقَالَ: «لِأَنْ يَسْرِقَ مِنْ عَشَرَةِ أَهْلِ أَبْيَاتٍ، أَيْسَرُ عَلَيْهِ مِنْ أَنْ يَسْرِقَ مِنْ بَيْتِ جَارِهِ»»(٣).

واتە: میقدادی کوڕی ئەسوەد (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لە هاوەڵەکانی کرد لە بارەی زینا؟ گوتیان: ئەمە حەڕامێکە، خواو پێغەمبەری خوا حەڕامیان کردوە، (جا پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئەگەر پیاو زینا لەگەڵ دە ئافرەتدا بکات ئەوە (سزاکەی) سوکترە لەسەری لەوەی زینا لەگەڵ هاوسەری دراوسێکەیدا بکات، هەروەها پرسیاری لێکردن

---

(١) صحيح: «الإرواء» (٨٩١): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٢٨- باب الوصاة بالجار. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ١٤٠].

(٢) صحيح: «الإرواء» (٢٥٢٥): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٣٢- من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلا يؤذ جاره. مسلم: ٣١- كتاب اللقطة، ح١٤].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٦٥).

لەبارەی دزی؟ گوتیان: دزی حەرامێکە خوای زاڵی پایەدارو پێغەمبەری خوا حەرامیان کردوە، (جا پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەگەر کەسێك لە دە ماڵ دزی بکات (سزاکەی) سوکترە لەسەری، لەوەی دزی لە ماڵی دراوسێکەی بکات.

## دەربارەی: لە دراوسێوە دەست پێدەکرێ

٨٥- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالْجَارِ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ»»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەردەوام جبریل ئامۆژگاری دەکردم، بە (چاك بوون لەگەڵ) دراوسێ، هەتا وا گومانم برد کە دراوسێ میرات لە دراوسێ دەگرێ.

٨٦- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّهُ ذُبِحَتْ لَهُ شَاةٌ، فَجَعَلَ يَقُولُ لِغُلَامِهِ: أَهْدَيْتَ لِجَارِنَا الْيَهُودِيِّ؟ أَهْدَيْتَ لِجَارِنَا الْيَهُودِيِّ؟ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالْجَارِ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ»»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ)، مەڕێکی بۆ سەربڕا، جا هەر بە خزمەتکارەکەی دەگوت: بردت بۆ جوولەکەکەی دراوسێمان؟ بردت بۆ جوولەکەکەی دراوسێمان؟ من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: بەردەوام جبریل ئامۆژگاری دەکردم، ئەوەندە ڕایسپاردم دەربارەی دراوسێ هەتا گومانم برد دراوسێ میرات لە دراوسێ دەگرێ.

٨٧- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، تَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالْجَارِ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ لَيُوَرِّثُهُ»»[٣].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوێم لـێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: بەردەوام جبریل ئامۆژگاری دەکردم، ئەوەندە ڕایسپاردم دەربارەی دراوسێ هەتا گومانم برد دراوسێ میرات لە دراوسێ دەگرێ.

---

(١) صحيح: «الإرواء» (٨٩١): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب ٢٨- باب: الوصاة بالجار. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة ولآداب، ح ١٤١].

(٢) صحيح: «الإرواء» (٨٩١): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ١٢٣- باب: في حق الجوار. الترمذي: ٢٥- كتاب البر والصاة، ٢٨- باب: ما جاء في حق الجوار].

(٣) صحيح.

## دەربارەی: دیاری دەدرێ بەو دراوسێیەی دەرگای نزیکترە

٨٨- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي جَارَيْنِ، فَإِلَى أَيِّهِمَا أُهْدِي؟ قَالَ: «إِلَى أَقْرَبِهِمَا مِنْكِ بَابَاً»»(١).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! من دوو دراوسێم هەن، ئایا (چێشت و خواردن و) دیاری بۆ کامیان ببەم؟ فەرمووی: بۆ ئەو دراوسێیەی کە دەرگاکەی لێت نزیکترە.

٨٩- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي جَارَيْنِ، فَإِلَى أَيِّهِمَا أُهْدِي؟ قَالَ: «إِلَى أَقْرَبِهِمَا مِنْكِ بَابَاً»»(٢).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! من دوو دراوسێم هەن، ئایا (چێشت و خواردن و) دیاری بۆ کامیان ببەم؟ فەرمووی: بۆ ئەو دراوسێیەی کە دەرگاکەی لێت نزیکترە.

## دەربارەی: لە دراوسێیەتیدا نزیکتر، دوایی نزیکتر (ڕەچاو دەکرێ)

٩٠- «عَنِ الْحَسَنِ، أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ الْجَارِ، فَقَالَ: أَرْبَعِينَ دَاراً أَمَامَهُ، وَأَرْبَعِينَ خَلْفَهُ، وَأَرْبَعِينَ عَنْ يَمِينِهِ، وَأَرْبَعِينَ عَنْ يَسَارِهِ»(٣).

واتە: پرسیار کراوە لە حەسەنی (بەصڕیی) دەربارەی دراوسێ (ئایا کێ بە دراوسێ هەژمار دەکرێ)؟ ئەویش گوتی: چل خانوو لە پێشیەوەو، چل خانوو لە دواوەو، چل خانوو لە لای ڕاستەوەو، چل خانووش لە لای چەپەوە (هەمووی بە دراوسێ دادەنرێن).

## دەربارەی: ئەو کەسەی دەرگای دادەخات لەسەر دراوسێ

٩١- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: لَقَدْ أَتَى عَلَيْنَا زَمَانٌ «أَوْ قَالَ: حِينٌ» وَمَا أَحَدٌ أَحَقُّ بِدِينَارِهِ وَدِرْهَمِهِ مِنْ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ، ثُمَّ الآنَ الدِّينَارُ وَالدِّرْهَمُ أَحَبُّ إِلَى أَحَدِنَا مِنْ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ، سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ، يَقُولُ: «كَمْ مِنْ جَارٍ مُتَعَلِّقٌ بِجَارِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَقُولُ: يَا رَبِّ، هَذَا أَغْلَقَ بَابَهُ دُونِي، فَمَنَعَ مَعْرُوفَهُ»»(٤).

---

(١) صحيح: «المشكاة» (١٩٣٦): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٣٢- باب: حق الجوار قرب الأبواب].

(٢) صحيح: انظر ما قبله.

(٣) حسن الإسناد.

(٤) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٤٩).

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: بێگومان سەردەمێك بوو ئێمە خۆمان پێ شایستەتر نەبوو لە برای مسوڵمانمان لەمەڕ ئەو دینارو درهەمەی هەر یەکێك لە ئێمە هەیبوو، کەچی ئێستا دینارو درهەم خۆشەویستترە بەلای هەر یەکێك لە ئێمەوە لە برای مسوڵمانی، گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: چەندین دراوسێ هەیە کە لە ڕۆژی دوایی بەرۆکی دراوسێکەی دەگرێ و دەڵێ: ئەی پەروەردگارا ئەمە دەرگاکەی بەڕووی مندا داخست، چاکەی خۆی لێگرتمەوە (یارمەتی نەدام).

## دەربارەی: (مرۆڤ) نابێ خۆی تێرو دراوسێکەی (برسی بێ)

٩٢- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْمُسَاوِرِ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) يُخْبِرُ ابْنَ الزُّبَيْرِ يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لَيْسَ الْمُؤْمِنُ الَّذِي يَشْبَعُ وَجَارُهُ جَائِعٌ»»[(١)].

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی موساویرەوە گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: گوێم لە ئیبنو عەبباس بوو، (خوا لێیان ڕازی بێ)، هەواڵی بە ئیبنو زوبەیر دەدا، دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: ئیماندار نیە ئەو کەسەی خۆی تێر بێ و دراوسێکەشی برسی بێ.

## دەربارەی: ئاوی شلە زیاد دەکرێ (بۆ ئەوەی) دابەش بکرێ لە نێو دراوسێ

٩٣- «عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي ﷺ بِثَلَاثٍ: أَسْمَعُ وَأُطِيعُ وَلَوْ لِعَبْدٍ مُجَدَّعِ الْأَطْرَافِ، وَإِذَا صَنَعْتَ مَرَقَةً فَأَكْثِرْ مَاءَهَا، ثُمَّ انْظُرْ أَهْلَ بَيْتٍ مِنْ جِيرَانِكَ، فَأَصِبْهُمْ مِنْهُ بِمَعْرُوفٍ، وَصَلِّ الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا، فَإِنْ وَجَدْتَ الإِمَامَ قَدْ صَلَّى، فَقَدْ أَحْرَزْتَ صَلَاتَكَ، وَإِلاَّ فَهِيَ نَافِلَةٌ»[(٢)].

واتە: ئەبو زەڕ (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: خۆشەویستەکەم (پێغەمبەری خوا ﷺ) سێ وەسیەتی بۆ کردووم: داوای لێکردم کە گوێڕایەڵی فەرمانڕەوا بم ئەگەرچی ئەو سەرکردەیە بەندەیەك بێ پەلەکانی بڕابنەوە (گرنگ ئەوەیە مسوڵمان و دادگەر بێ)، وە (فەرمووی:) کاتێك شلەت دروستکرد لەماڵەوە ئەوە ئاوەکەی زیاد بکە، پاشان سەیری خاووخێزانی دراوسێکەت بکە (بزانە کامیان شایستەترە تا بۆی ببەیت) جا بە شێوەیەکی چاك پێیان بدە، وە نوێژ لە کاتی خۆیدا بکە (چاوەڕێی ئەو خەڵکانەی زەمانی خۆت مەکە کە بە تێکڕا نوێژ دوادەخەن)، جا ئەگەر بینیت پێشنوێژخوێن لە نوێژەکەی تەواو بووە، ئەوە نوێژەکەی خۆت کردوە تۆ پێشتر، ئەگەرنا (ئەگەر بە جەماعەتیش ڕاگەیشتی دوای ئەوەی نوێژەکەت کردبوو، ئەوە دووبارە نوێژ کردنەوەکەت لەگەڵ ئەوان) بۆت دەبێت بە سوننەت.

---

(١) حسن لغيره: «السلسلة الصحيحة» (٢٦٤٦)، أخرجه أبو يعلى ٢٦٩٩، قال حسين سليم أسد: إسناده حسن.

(٢) صحيح: «ظلال الجنة» (١٠٥٢)، «السلسلة الصحيحة» (١٣٦٨): [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح١٤٢، ١٤٣. مسلم: ٥ كتاب المساجد، ح ٢٣٩].

٩٤- «عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا أَبَا ذَرٍّ، إِذَا طَبَخْتَ مَرَقَةً فَأَكْثِرْ مَاءَ الْمَرَقَةِ، وَتَعَاهَدْ جِيرَانَكَ، أَوِ اقْسِمْ فِي جِيرَانِكَ»»[١].

واتە: ئەبو زەڕ (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەی ئەبو زەڕ! کاتێك شلەت لێنا ئەوە ئاوی زیاد بکەو، دراوسێکەت بەشداری پێ بکە، یان دابەشی بکە بەسەر دراوسێکانت.

## دەربارەی: باشترین دراوسێ

٩٥- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «خَيْرُ الْأَصْحَابِ عِنْدَ اللَّهِ تَعَالَى خَيْرُهُمْ لِصَاحِبِهِ، وَخَيْرُ الْجِيرَانِ عِنْدَ اللَّهِ تَعَالَى خَيْرُهُمْ لِجَارِهِ»»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە، فەرموویەتی: باشترین برادەرو هاوەڵ لە لای خوای بەرز ئەو کەسەیە: کە بۆ هاوەڵەکانی باشتربێ، وە باشترین دراوسێ لەلای خوای بەرز ئەو دراوسێیەیە کە لەگەڵ دراوسێکانی باشتر بێ.

## دەربارەی: دراوسێی چاك

٩٦- «عَنْ نَافِعِ بْنِ عَبْدِ الْحَارِثِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مِنْ سَعَادَةِ الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ: الْمَسْكَنُ الْوَاسِعُ، وَالْجَارُ الصَّالِحُ، وَالْمَرْكَبُ الْهَنِيءُ»[٣].

واتە: نافیعی کوڕی عەبدولحاریس (خوا لێی ڕازی بێ)، لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: لە بەختەوەری مرۆڤی مسوڵمان ئەوەیە: خانووێکی فراوان و، دراوسێیەکی چاك و، سواریەکی چاکی هەبێ.

## دەربارەی: دراوسێی خراپ

٩٧- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ مِنْ دُعَاءِ النَّبِيِّ ﷺ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ جَارِ السُّوءِ فِي دَارِ الْمُقَامِ، فَإِنَّ جَارَ الدُّنْيَا يَتَحَوَّلُ»»[٤].

---

(١) صحيح: انظر ما قبله.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٠٣): [الترمذي: ٢٥، كتاب البر والصلة: ٢٨، باب: ما جاء في حق الجوار].

(٣) صحيح لغيره: «السلسلة الصحيحة» (٢٨٢).

(٤) حسن: «السلسلة الصحيحة» (١٤٤٣): [النسائي: كتاب الإستعاذة، ٤٢- باب: الإستعاذة من جار السوء، ح ٥٥٠٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: یەکێ لە دوعاکانی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو (دەیفەرموو): خوایە پەنا بە تۆ دەگرم لە دراوسێی خراپ لە دواڕۆژ (یان لە نێو گۆڕ)، چونکە دراوسێی دونیا دەگۆڕێ و نامێنێ، (بەڵام هی دواڕۆژ هەر لەگەڵتە، هی گۆڕیش ماوەیەکی یەکجار زۆر لەگەڵت دەمێنێتەوە).**

٩٨- «عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَقْتُلَ الرَّجُلُ جَارَهُ وَأَخَاهُ وَأَبَاهُ»»[١].

**واتە: ئەبو مووسا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: قیامەت هەڵناستێ هەتا پیاو دراوسێ و براو باوکی خۆی دەکوژێ (جا کاتێ مرۆڤەکان گەیشتنە ئەو ئاستە نیشانەی ئەوپەڕی خراپەکارییەو کاتی بەرپابوونی دونیا تێکچوون و قیامەت هەڵسانە).**

## دەربارەی: نابێ ئازاری دراوسێ بدرێ

٩٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قِيلَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ فُلاَنَةً تَقُومُ اللَّيْلَ وَتَصُومُ النَّهَارَ، وَتَفْعَلُ، وَتَصَّدَّقُ، وَتُؤْذِي جِيرَانَهَا بِلِسَانِهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ خَيْرَ فِيهَا، هِيَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ»، قَالُوا: وَفُلاَنَةٌ تُصَلِّي الْمَكْتُوبَةَ، وَتَصَّدَّقُ بِأَثْوَارٍ، وَلاَ تُؤْذِي أَحَدًا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هِيَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ»»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازیبێ) دەڵێ: بە پێغەمبەر ﷺ گوترا، ئەی پێغەمبەری خوا فلأن ئافرەت شەوان شەونوێژ دەکات و، بە ڕۆژیش ڕۆژوو دەگرێ و، کردەوەی چاك دەکات و دەبەخشێ، لەگەڵ ئەوەش ئازاری دراوسێکانی دەدات بە زمانی و (بە خراپە باسیان دەکات)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ خێری تێدانیەو ئەو ئەهلی ئاگرە، (دوایی باسی کەسێکی دیکەیان بۆ کرد) گوتیان: فلأنە ئافرەتیش نوێژە فەڕزەکان دەکات و کەشك دەکات بە خێرو صەدەقە، بەڵام ئازاری هیچ کەسێك نادات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو لە ئەهلی بەهەشتە.**

١٠٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ لاَ يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَائِقَهُ»»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی دراوسێکەی لە زەرەرو زیانی ئەمین و سەلامەت نەبێ.**

---

(١) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٣١٨٥).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٩٠).

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٤٩): [مسلم: ١- كتاب الإيمان، ح ٧٣].

## دەربارەی: دراوسێ پێی کەم نەبێ لەوەی دەیدات بە دراوسێکەی ئەگەر ئێسکی کەم گۆشتی مەڕێکیش بێ

١٠١- «عَنْ عَمْرِو بْنِ مُعَاذٍ الأَشْهَلِيِّ، عَنْ جَدَّتِهِ، أَنَّهَا قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا نِسَاءَ الْمُؤْمِنَاتِ، لاَ تَحْقِرَنَّ امْرَأَةٌ مِنْكُنَّ لِجَارَتِهَا، وَلَوْ كُرَاعُ شَاةٍ مُحَرَّقٍ»»(١).

واتە: عەمری کوڕی موعازی ئەشهەلی لە داپیری دەگێڕێتەوە (حەووائی کچی یەزیدی کوڕی ئەسکەن) گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ئەی ئافرەتانی ئیماندار، با هیچ یەکێك لە ئێوە (لە چاکەکردن) بە کەم نەزانێ (لەوەی ببیەخشێ بە دراوسێکەی یان لێی قبووڵ بکات ئەگەر دراوسێکەی پێی بەخشی)، هەرچەندە گۆشتی سووتاوی پێی مەڕێکیش بێ.

١٠٢- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا نِسَاءَ الْمُسْلِمَاتِ! يَا نِسَاءَ الْمُسْلِمَاتِ! لاَ تَحْقِرَنَّ جَارَةٌ لِجَارَتِهَا وَلَوْ فِرْسِنُ شَاةٍ»»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەی ئافرەتانی مسوڵمانان! ئەی ئافرەتانی مسوڵمانان! بە کەمی مەزانن (شتێك لە بەخشین و چاکەکردنی دراوسێ لەگەڵ دراوسێکەیدا ئەگەر گۆشتی سمی مەڕیش بێ.

## دەربارەی: سکاڵای دراوسێ (لە دراوسێ)

١٠٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي جَاراً يُؤْذِينِي، فَقَالَ: «انْطَلِقْ فَأَخْرِجْ مَتَاعَكَ إِلَى الطَّرِيقِ»، فَانْطَلَقَ فَأَخْرَجَ مَتَاعَهُ، فَاجْتَمَعَ النَّاسُ عَلَيْهِ، فَقَالُوا: مَا شَأْنُكَ؟ قَالَ: لِي جَارٌ يُؤْذِينِي، فَذَكَرْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «انْطَلِقْ فَأَخْرِجْ مَتَاعَكَ إِلَى الطَّرِيقِ»، فَجَعَلُوا يَقُولُونَ: اللَّهُمَّ الْعَنْهُ، اللَّهُمَّ أَخْزِهِ. فَبَلَغَهُ، فَأَتَاهُ فَقَالَ: ارْجِعْ إِلَى مَنْزِلِكَ، فَوَاللَّهِ لاَ أُؤْذِيكَ»(٣).

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێك بە پێغەمبەری ﷺ گوت: دراوسێیەکم هەیە ئەزیەتم دەدات، (جا بە زمان ئەزیەتی دەدات، یان بە دەست ئەزیەتی دەدات؟ جیاوازی نیە، پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: کەل و پەل و پێویستی ماڵەکەت (بێنە دەرەوە)، لەسەر ڕێگە دایبنێ، ئەویش ڕۆیشت کەل و پەلەکەی لە دەرەوە دانا، جا خەڵك لێی کۆبوونەوە، گوتیان:

---

(١) صحيح بما بعده.

(٢) صحيح: «صحيح الجامع» (٧٨٦٦): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٣٠- باب: لا تخون جارة لجارتها. مسلم: ١٢- كتاب الزكاة، ح ٩٠].

(٣) حسن صحيح: «التعليق الرغيب» (٣ / ٢٣٥).

ئەوە چیت بەسەرهاتوە؟ گوتی: دراوسێیەکم هەیە ئەزیەتم دەدات (ناوی دراوسێیەکەی ئاشکرا نەکرد)، منیش بۆ پێغەمبەرم ﷺ باس کرد، ئەویش فەرمووی: برۆ کەل و پەلی ماڵەکەت بخە دەرەوە، لەسەر ڕێگە داینێ، (خەڵکەکەش کە کۆببوونەوە) دەیانگوت: خوایە نەفرەتی لێ بکە، خوایە شەرمەزاری بکە، (ئاوا دوعایان لە دراوسێکەی دەکرد کە ئەزیەتی دەدا)[١]، دوایی (کابرای) کە دراوسێکەی خۆی ئەزیەت دەدا گوتی: بگەڕێوە ماڵی خۆت (کەل و پەلەکانت بێنەوە ماڵ)، سوێند بە خوا لەمەودوا ئەزیەتت نادەم.

١٠٤- «عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: شَكَا رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ جَارَهُ، فَقَالَ: «احْمِلْ مَتَاعَكَ فَضَعْهُ عَلَى الطَّرِيقِ، فَمَنْ مَرَّ بِهِ يَلْعَنُهُ»، فَجَعَلَ كُلُّ مَنْ مَرَّ بِهِ يَلْعَنُهُ، فَجَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: مَا لَقِيتُ مِنَ النَّاسِ؟ فَقَالَ: «إِنَّ لَعْنَةَ اللَّهِ فَوْقَ لَعْنَتِهِمْ»، ثُمَّ قَالَ لِلَّذِي شَكَا: «كُفِيتَ» أَوْ نَحْوَهُ»[٢].

واتە: ئەبی جوحەیفە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك هات لە لای پێغەمبەر ﷺ سکاڵای لە دراوسێکەی کرد، (پێغەمبەریش ﷺ) پێی فەرموو: کەل و پەلی ماڵەکەت بێنە دەرەوەو، لەسەر ڕێگە داینێ، هەر کەس بەلایدا تێپەڕ بوو نەفرین (لە دراوسێ خراپەکە) دەکات، ئەویش کەل و پەلەکەی لە دەرەوە دانا، هەر کەسێك بەلایدا تێپەڕ دەبوو نەفرینی (لە دراوسێکەی) دەکرد، جا هاتەوە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: بە هەر کەسێك گەیشتووم لە خەڵکی (نەفرینیان لێکردوە، پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بێگومان نەفرینی خوا لەسەرووی نەفرینی ئەوانەوەیە، پاشان بەو کەسەی فەرموو کە سکاڵای کردبوو: ئەوەندەت بەسە (لەمەودوا پارێزراویت)، یان وێنەی ئەوەی پێ فەرموو.

## دەربارەی: ئەو کەسەی ئازاری دراوسێکەی دەدات تا لە ماڵ دەریدەکات

١٠٥- «عَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: مَا مِنْ رَجُلَيْنِ يَتَصَارَمَانِ فَوْقَ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ، فَيَهْلِكُ أَحَدُهُمَا، فَمَاتَا وَهُمَا عَلَى ذَلِكَ مِنَ الْمُصَارَمَةِ، إِلاَّ هَلَكَا جَمِيعاً، وَمَا مِنْ جَارٍ يَظْلِمُ جَارَهُ وَيَقْهَرُهُ، حَتَّى يَحْمِلَهُ ذَلِكَ عَلَى أَنْ يَخْرُجَ مِنْ مَنْزِلِهِ، إِلاَّ هَلَكَ»[٣].

واتە: ثەوبان (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هەر دوو پیاوێك لە سێ ڕۆژ زیاتر قسەیان لەگەڵ یەکدی نەبێ و یەکێك لەوان بمرێت لە کاتێکدا هەر لەسەر ئەو قسە لەگەڵ یەکدی نەکردنە بن، ئەوە هەردووکیان بەهیلاك دەچن، وە هەر دراوسێیەك ستەم لە دراوسێکەی بکات، تا وای لێبکات لە ماڵەکەی خۆی بچێتە دەرو (خانووەکەی بگۆڕێت) ئەوە بەهیلاك دەچێت و تێدەچێت (لە دواڕۆژدا).

---

(١) دیارە ئەمە لێرەدا بە کورتی باسکراوە، ئەگەرنا دەبێ ئەو کەسەی ماڵەکەی بردۆتە دەرێ بەڵگەیەکی ئاشکراو ڕوونی پێ بووبێ، وە سەلماندبێ کە دراوسێیەکەی ئەزیەتی دەدات ئەگەرنا هەر کەسێك گوتی: دراوسێم ئەزیەتم دەدات مەرج نیە ڕاست بکات.

(٢) حسن صحيح: «التعليق الرغيب» (٣ / ٢٣٥).

(٣) صحيح الإسناد.

## دەربارەی: دراوسێی جوولەكە

١٠٦- «عَنْ مُجَاهِدٍ، قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)»وَغُلَامُهُ يَسْلُخُ شَاةً» فَقَالَ: يَا غُلَامُ، إِذَا فَرَغْتَ فَابْدَأْ بِجَارِنَا الْيَهُودِيِّ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: الْيَهُودِيُّ أَصْلَحَكَ اللَّهُ؟ قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُوصِي بِالْجَارِ، حَتَّى خَشِينَا أَوْ رُئِينَا أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ»[١].

واتە: موجاهید دەڵێ: لە لای عەبدوڵلای كوڕی عەمرِ بووم (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە كاتێكدا خزمەتكارەكەی مەڕێكی كەوڵ دەكرد، (عەبدوڵلای كوڕی عەمریش) گوتی: ئەی ڕۆڵە! ئەگەر تەواو بووی سەرەتا بیدە بەو دراوسێ جوولەكەمان، پیاوێك كە لە نێو كۆمەڵەكە بوو، گوتی: جوولەكە! خوا حاڵت چاك بكات (چۆن دەبێ)؟ ئەویش گوتی: من گوێم لێ بووە پێغەمبەری خوا ﷺ هێندە ڕایسپاردوەو ئامۆژگاری كردوە بە چاك بوون لەگەڵ دراوسێ، تا وای لێهات ترساین و وای بۆ چووین كە دراوسێ میرات لە دراوسێ دەگرێ.

## دەربارەی: ڕێزداری (كێ زۆر ڕێزدارە)

١٠٧- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَيُّ النَّاسِ أَكْرَمُ؟ قَالَ: «أَكْرَمُهُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاهُمْ»، قَالُوا: لَيْسَ عَنْ هَذَا نَسْأَلُكَ، قَالَ: «فَأَكْرَمُ النَّاسِ يُوسُفُ نَبِيُّ اللَّهِ ابْنُ نَبِيِّ اللَّهِ ابْنِ خَلِيلِ اللَّهِ»، قَالُوا: لَيْسَ عَنْ هَذَا نَسْأَلُكَ، قَالَ: «فَعَنْ مَعَادِنِ الْعَرَبِ تَسْأَلُونِي؟» قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: «فَخِيَارُكُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُكُمْ فِي الإِسْلَامِ إِذَا فَقِهُوا»»[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پرسیار كرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەوەی ئایا بەڕێزترینی خەڵكی كێیە؟ فەرمووی: بەڕێزترینیان لە لای خوا پارێزكارترینیانە، گوتیان: دەربارەی ئەمە پرسیارت لێ ناكەین، فەرمووی: بەڕێزترینی خەڵكی یوسفی پێغەمبەری خوایە كوڕی پێغەمبەری خوا (یەعقووبی) كوڕی دۆست و خۆشەویستی خوا (ئیبراهیم علیه السلام)، گوتیان: دەربارەی ئەمە پرسیارت لێ ناكەین، فەرمووی: كەواتە دەربارەی ئەصڵ و بنچینەی عەرەب پرسیارم لێدەكەن؟ گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: خاوەن ڕەوشت و بەها پەسندەكان لە پێش ئیسلام باشترینتانن لە نێو ئیسلام ئەگەر (هەوڵبدەن) شارەزایی و زانیاریی پەیدابكەن (لە ئەحكامە شەرعیەكان و، لە دین تێبگەن).

---

(١) صحيح: «الإرواء» (٨٩١): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ١٢٣- باب: في حق الجوار. الترمذي: ٢٥- كتاب البر والصلة، ٢٨- باب: ما جاء في حق الجوار].

(٢) صحيح: [البخاري: ٦٠- كتاب الأنبياء، ٨- باب: قول الله تعالى: {واتخذ الله إبراهيم خليلا}. مسلم: ٤٣- كتاب الفضائل، ح ١٦٨].

## دەربارەی: چاکەکردن لەگەڵ مرۆڤی چاکەکارو خراپەکار

١٠٨- «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ بْنِ الْحَنَفِيَّةِ: ﴿هَلْ جَزَاءُ الإِحْسَانِ إِلاَّ الإِحْسَانُ ۝٦٠﴾ الرحمن، قَالَ: هِيَ مُسَجَّلَةٌ لِلْبَرِّ وَالْفَاجِرِ، قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: قَالَ أَبُو عُبَيْدٍ: مُسَجَّلَةٌ مُرْسَلَةٌ»[١].

واتە: موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حەنەفییە لەبارەی ئەم ئایەتە (کە خوا دەفەرموێ): ﴿هَلْ جَزَاءُ الإِحْسَانِ إِلاَّ الإِحْسَانُ ۝٦٠﴾ الرحمن (ئایا پاداشتی چاکە هەر چاکە نیە)، دەڵێ: ئەمە بۆ باش و خراپ تۆمار کراوە (واتە: پاداشتی چاکە بە چاکە بدەرەوەو، وەڵامی خراپەش هەر بە چاکە بدەرەوە)، ئەبو عەبدوڵڵا دەڵێ: ئەبو عوبەید گوتی: تۆمارکراوەو نێردراوە (بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ هەردوولا).

## دەربارەی: گەورەیی سەرپەرشتی کردنی هەتیو

١٠٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «السَّاعِي عَلَى الأَرْمَلَةِ وَالْمَسَاكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَكَالَّذِي يَصُومُ النَّهَارَ وَيَقُومُ اللَّيْلَ»»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی کە کۆشش دەکات بۆ خزمەت و سەرپەرشتی بێوەژن و کەسانی نەدار، ئەوە (پاداشتی) وەك ئەو موجاهیدەیە کە لە ڕێی خوادا جیهاد دەکات، هەروەها وەك ئەو کەسەش وایە کە بە شەو شەونوێژ دەکات و، بە ڕۆژیش ڕۆژوو دەگرێ.

١١٠- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: جَاءَتْنِي امْرَأَةٌ مَعَهَا ابْنَتَانِ لَهَا، فَسَأَلَتْنِي فَلَمْ تَجِدْ عِنْدِي إِلاَّ تَمْرَةً وَاحِدَةً، فَأَعْطَيْتُهَا، فَقَسَمَتْهَا بَيْنَ ابْنَتَيْهَا، ثُمَّ قَامَتْ فَخَرَجَتْ، فَدَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ فَحَدَّثْتُهُ، فَقَالَ: «مَنْ يَلِي مِنْ هَذِهِ الْبَنَاتِ شَيْئاً، فَأَحْسَنَ إِلَيْهِنَّ، كُنَّ لَهُ سِتْراً مِنَ النَّارِ»»[٣].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: ئافرەتێك هات بۆ لام دوو کچی خۆی لەگەڵدا بوون، داوای (خواردنی) لێکردم منیش هیچ شتێکم لەلای خۆم دەست نەکەوت جگە لە یەك دەنکە خورماو پێمدا، ئەویش لێی وەرگرتم، دابەشی کرد لە نێوان دوو کچەکەو خۆی (کردی بە دوو لەت و دای بە کچەکانی) هیچ شتێکی لێ نەخوارد، دوایی هەڵساو لەگەڵ دوو کچەکەی ڕۆیشتن، پاشان پێغەمبەر ﷺ هاتەوە لام، منیش ڕووداوەکەم بۆ باسکرد، (پێغەمبەر

---

(١) حسن الإسناد.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٨٨١): [البخاري: ٦٩- كتاب النفقات، ١- باب: فضل النفقة على الأهل. مسلم: ٥٣- كتاب الزهد، ح ٤١].

(٣) صحيح: [البخاري: ٢٤- كتاب الزكاة، ١٠- باب: اتقوا النار ولو بشق تمرة. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ١٤٧].

ﷺ) فەرمووی: هەر کەسێك ببێتە سەرپەرشتیاری دوو کچان، ئەویش لەگەڵیان چاکەکار بوو، ئەوە بۆی دەبنە بەربەست لە ئاگرو دەیپارێزن.

١١١- «عَنْ أُمِّ سَعِيدٍ بِنْتِ مُرَّةَ الْفِهْرِيِّ، عَنْ أَبِيهَا (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ فِي الْجَنَّةِ كَهَاتَيْنِ، أَوْ كَهَذِهِ مِنْ هَذِهِ». شَكَّ سُفْيَانُ فِي الْوُسْطَى وَالَّتِي تَلِي الْإِبْهَامَ»(١).

واتە: ئوممو سەعیدی کچی مورەی فیهری (خوا لێی ڕازی بێ)، لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من و سەرپەرشتیاری هەتیو (جا هەتیوەکە خزمی خۆی بێ، یان بێگانە) لە بەهەشتدا ئاواین ئاماژەی بۆ پەنجەی شایەتمانی و پەنجەی نێوەڕاستی کرد، (واتە: وەك ئەو دوو پەنجەیە لە یەك نزیکین).

١١٢- «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ فِي الْجَنَّةِ هَكَذَا»، وَقَالَ بِإِصْبَعَيْهِ السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى»(٢).

واتە: سەهلی کوڕی سەعد (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: من و سەرپەرشتیاری هەتیو لە بەهەشتدا ئاواین، وە ئاماژەی بۆ پەنجەی شایەتمانی و پەنجەی نێوەڕاستی کرد.

١١٣- «عَنْ أَبُو بَكْرِ بْن حَفْصٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ كَانَ لاَ يَأْكُلُ طَعَاماً إِلاَّ وَعَلَى خِوَانِهِ يَتِيمٌ»(٣).

واتە: ئەبو بەکری کوڕی حەفص دەڵێ: عەبدوڵڵای (کوڕی مەسعوود) نانی نەدەخوارد، مەگەر لەسەر خوانەکەی هەتیوێك هەبووایە.

١١٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ فِي الْجَنَّةِ كَهَاتَيْنِ» يُشِيرُ بِإِصْبَعَيْهِ»(٤).

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من و سەرپەرشتیاری هەتیو لە بەهەشتدا ئاواین ئاماژەی بە پەنجەکانی کرد.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨٠٠).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨٠٠): [البخاري: كتاب الأدب، ٢٤- باب: فضل من يعول يتيما].

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح: [الترمذي: ٢٨- كتاب البر والصلة، ١٤- باب ما جاء في رحمة اليتيم وكفالته، ح ١٩١٨].

## دەربارەی: وەك باوكێكی بە بەزەیی بە بۆ هەتیو

١١٥- «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلَامَ: كُنْ لِلْيَتِيمِ كَالأَبِ الرَّحِيمِ، وَاعْلَمْ أَنَّكَ كَمَا تَزْرَعُ كَذَلِكَ تَحْصُدُ، مَا أَقْبَحَ الْفَقْرَ بَعْدَ الْغِنَى، وَأَكْثَرُ مِنْ ذَلِكَ أَوْ أَقْبَحُ مِنْ ذَلِكَ الضَّلَالَةُ بَعْدَ الهُدَى، وَإِذَا وَعَدْتَ صاحِبَك فَأَنْجِزْ لَهُ مَا وَعَدْتَهُ، فَإِنْ لاَ تَفْعَل يُوْرِثُ بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ، وَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْ صَاحِبٍ إِنْ ذكرتَ لَمْ يُعِنْك وَإِنْ نَسِيْتَ لَمْ يُذَكِّرك»[١].

**واتە: عەبدورڕەحمانی كوڕی ئەبزا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ، داوود (عَلَيْهِ السَّلَام)، گوتوویەتی: بۆ هەتیو وەكو باوكێكی بەسۆز وابە، وە بزانە تۆ هەروەكو چۆن دەچێنی ئاواش دەدووریەوە (چی بچێنی ئەوە دەدووریەوە)، ئای هەژاری چەندە خراپ و دزێوە لە دوای دەوڵەمەندی، ئەوە خراپتر بریتیە لە گومڕابوون دوای وەرگرتنی ڕێنمایی، وە ئەگەر پەیمانێكت بە هاوەڵەكەتدا ئەوە پەیمانەكەی بۆ بەرە سەر، چونكە ئەگەر ئەمە نەكەی ئەوە لە نێوان تۆو ئەودا دوژمنایەتی پەیدا دەبێ، پەنا بە خوا بگرە لە هاوەڵێك كە كاتێك یادی (خوا)ت كرد یارمەتیت نەدات و، وەك تۆ یادی خوا نەكات، هەروەها ئەگەر یادی (خوا)ت بیرچۆوە یارمەتیت نەدات.**

١١٦- «عَنْ أَسْمَاءَ بْنِ عُبَيْدٍ قَالَ: قُلْتُ لابْنِ سِيرِينَ: عِنْدِي يَتِيمٌ، قَالَ: اصْنَعْ بِهِ مَا تَصْنَعُ بِوَلَدِك، اضْرِبْهُ مَا تَضْرِبُ وَلَدَكَ»[٢].

**واتە: ئەسمای كوڕی عوبەید دەڵێ: بە ئیبن سیرینم گوت: هەتیوێكم لەلایە! (چۆن مامەڵەی لەگەڵ بكەم) گوتی: ئەوەی بۆ بكە كە بۆ منداڵەكەتی دەكەی، ئەوەندەشی لێبدە كە لە منداڵەكەتی دەدەی (بە یاسای باوكێكی بە بەزەیی).**

## دەربارەی: پەروەردە كردنی هەتیو

١١٧- «عَنْ شُمَيْسَةَ الْعَتَكِيَّةِ قَالَتْ: ذُكِرَ أَدَبُ الْيَتِيمِ عِنْدَ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، فَقَالَتْ: إِنِّي لأَضْرِبُ الْيَتِيمَ حَتَّى يَنْبَسِطَ[٣]»[٤].

---

١) صحيح الإسناد.
٢) صحيح الإسناد.
٣) أي: يعتدل، (أي يمتد على الأرض).
٤) صحيح الإسناد.

واتە: شومەیسەی عەتەكی دەڵێ: باسی پەروەردەی منداڵی هاتیو كرا لە لای عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتی: من لێیدەدەم هەتا هاوسەنگ دەبێ (پێشەوا ئەحمەد دەڵێ: منداڵی هەتیو لێی دەدرێ، بەڵام بە سووكی، ئەوەش لە پێناو پەروەردەكردن و فێرە ئەدەب كردنی).

## دەربارەی: گەورەیی پاداشتی ئەو كەسەی منداڵی دەمرێ

١١٨- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ يَمُوتُ لِأَحَدٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ثَلاَثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ، فَتَمَسُّهُ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ مسوڵمانێك نیە سێ منداڵی بمرێ، (ئاگری دۆزەخی) بەریكەوێ.

١١٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ امْرَأَةً أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ بِصَبِيٍّ فَقَالَتِ: ادْعُ لَهُ، فَقَدْ دَفَنْتُ ثَلاَثَةً، فَقَالَ: «احْتَظَرْتِ بِحِظَارٍ شَدِيدٍ مِنَ النَّارِ»»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ منداڵێكی پێبوو، گوتی: دوعای بۆ بكە، من سێ منداڵم ناشتووە (لێم مردوون)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: كەوابێ تۆ بە پەرژینێكی قایم خۆت لە ئاگر پاراستووە (بەهۆی ئەوەی سێ منداڵت مردوون).

١٢٠- «عَنْ خَالِدٍ الْعَبْسِيِّ قَالَ: مَاتَ ابْنٌ لِي، فَوَجَدْتُ عَلَيْهِ وَجْدًا شَدِيداً، فَقُلْتُ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، مَا سَمِعْتَ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ شَيْئاً تُسَخِّي بِهِ أَنْفُسَنَا عَنْ مَوْتَانَا؟ قَالَ: سَمِعْتُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ يَقُولُ: «صِغَارُكُمْ دَعَامِيصُ الْجَنَّةِ»»[٣].

واتە: خالیدی عەبەسی دەڵێ: كوڕێكم مردبوو، بە هۆیەوە زۆر نیگەران و دڵتەنگ بووم، گوتم: ئەی ئەبو هورەیرە! ئایا هیچ شتێكت لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەبیستووە ببێتە مایەی ئەوەی دەروونمان ئاسوودەو ئارام بكات لە بەرانبەر مردووانمان؟ گوتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بووە فەرموویەتی: منداڵەكانتان هۆگرانی بەهەشتن و لێی جیانابنەوە.

١٢١- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ مَاتَ لَهُ ثَلاَثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ فَاحْتَسَبَهُمْ دَخَلَ الْجَنَّةَ»، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاثْنَانِ؟ قَالَ: «وَاثْنَانِ»، قُلْتُ لِجَابِرٍ: وَاللَّهِ، أَرَى لَوْ قُلْتُمْ وَاحِدٌ لَقَالَ. قَالَ: وَأَنَا أَظُنُّهُ وَاللَّهِ»[٤].

---

(١) صحيح: «تخريج السنة» (٨٦٢): [البخاري: ٢٣- كتاب الجنائز، ٦- باب: فضل من مات له ولد. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ١٥٠].

(٢) صحيح: [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ١٥٥].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٤٣١): [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ١٥٤].

(٤) حسن.

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەرکەسێك سێ منداڵی بمرێت و ئومێدی پاداشت بخوازێ (لە خوا) ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر دووانیش بن؟ فەرمووی: ئەگەر دووانیش بن، (مەحمودی کوڕی لەبید) دەڵێ، بە جابرم گوت: سوێند بە خوا پێموایە ئەگەر بتان گوتبایە: ئەگەر یەکێکیش بمرێت هەر دەبێتە مایەی چوونە بەهەشت؟ پێغەمبەر ﷺ وای دەفەرموو، جابر گوتی: سوێند بە خوا منیش گومانم وایە.

١٢٢- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ امْرَأَةً أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ بِصَبِيٍّ فَقَالَتِ: ادْعُ اللَّهَ لَهُ، فَقَدْ دَفَنْتُ ثَلَاثَةً، فَقَالَ: «احْتَظَرْتِ بِحِظَارٍ شَدِيدٍ مِنَ النَّارِ»»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ منداڵێکی پێبوو، گوتی: دوعای بۆ لە خوا بکات، من سێ منداڵم ناشتووە (سێم لێ مردوون)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کەوابێ تۆ بە پەرژینێکی قایم خۆت لە ئاگر پاراستووە (بە هۆی ئەوەی سێ منداڵت مردوون).

١٢٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا لَا نَقْدِرُ عَلَيْكَ فِي مَجْلِسِكَ، فَوَاعِدْنَا يَوْماً نَأْتِكَ فِيهِ، فَقَالَ: «مَوْعِدُكُنَّ بَيْتُ فُلَانٍ»، فَجَاءَهُنَّ لِذَلِكَ الْوَعْدِ، وَكَانَ فِيمَا حَدَّثَهُنَّ: «مَا مِنْكُنَّ امْرَأَةٌ يَمُوتُ لَهَا ثَلَاثٌ مِنَ الْوَلَدِ، فَتَحْتَسِبَهُمْ، إِلاَّ دَخَلَتِ الْجَنَّةَ»، فَقَالَتِ امْرَأَةٌ: أَوِ اثْنَانِ؟ قَالَ: «أَوِ اثْنَانِ»»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە ناتوانین بێینە کۆڕی تۆ (لەبەر پیاوان)، بۆیە ڕۆژێکمان بۆ دابنێ دێین بۆ لات، فەرمووی: (باشە) با بڕیارمان ماڵی فڵان بێت، ئەوانیش لەو کاتەدا هاتن کە پێغەمبەر ﷺ بۆیانی دیاریکردبوون، جا یەکێك لەو قسانەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوانی فەرموو ئەوەبوو، فەرمووی: هەر ئافرەتێك لە ئێوە سێ منداڵی بمرێت، لەکاتێکدا پاداشت بخوازێت لە خوا، مسۆگەر خوا دەیخاتە بەهەشتەوە، ئافرەتێك گوتی: ئەگەر دووانیش بن؟ فەرمووی: ئەگەر دووانیش بن.

١٢٤- «عَنْ أُمِّ سُلَيْمٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) قَالَتْ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «يَا أُمَّ سُلَيْمٍ مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَمُوتُ لَهُمَا ثَلَاثَةُ أَوْلَادٍ، إِلاَّ أَدْخَلَهُمَا اللَّهُ الْجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمْ»، قُلْتُ: وَاثْنَانِ؟ قَالَ: «وَاثْنَانِ»»[3].

---

(١) صحيح: [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب ح ١٥٥].

(٢) صحيح: «التعليق الرغيب» (٣/ ٩٠١)، «السلسلة الصحيحة» (٢٣٠٢): [هذا الحديث رواه أبو سعيد الخدري، ووفقة عليه أبو هريرة. البخاري: كتاب العلم، ٣٦- باب: هل يجعل للنساء يوم على حدة؟ مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ١٥٢، ١٥٣].

(٣) صحيح: «الروض النضير» (٩٥١).

واتە: دایكی سولەیم (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بووم، فەرمووی: ئەی دایكی سولەیم، هەر دوو مسوڵمانێك (واتە: هەر دوو هاوسەرێك) سێ منداڵیان بمرێت، مسۆگەر خوا بە بەزەیی خۆی دەیانخاتە بەهەشتەوە، گوتم: ئەی ئەگەر دووان بوون؟ فەرمووی: دووانیش بن بەهەمان شێوەیە.

١٢٥- «عَنْ أَبي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَمُوتُ لَهُ ثَلاَثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ لَمْ يَبْلُغوا الْحِنْثَ، إلاَّ أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمْ، وَمَا مِنْ رَجُلٍ أَعْتَقَ مُسْلِماً إِلاَّ جَعَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ كُلَّ عُضْوٍ مِنْهُ، فِكَاكَهُ لِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهُ»»[1].

واتە: ئەبو زەڕ (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر مسوڵمانێك سێ منداڵی لێ بمرێ كە باڵغ نەبووبن، حەتمەن خوا بە سۆزو میهرەبانی خۆی دەیانخاتە بەهەشتەوە، وە هەر كەسێك مسوڵمانێك لە كۆیلایەتی ڕزگار بكات، ئەوە خوا هەر ئەندامێكی لاشەی ئەو كۆیلە ئازادكراوە دەكاتە مایەی ڕزگاربوونی ئازادكەرەكە لە ئاگری دۆزەخ.

١٢٦- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ مَاتَ لَهُ ثَلاَثَةٌ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ، أَدْخَلَهُ اللَّهُ وَإِيَّاهُمْ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ الْجَنَّةَ»»[2].

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر كەسێك سێ منداڵی لێ بمرێت كە باڵغ نەبووبن، ئەوە خوا بە بەزەیی خۆی دەیانخاتە بەهەشتەوە.

## دەربارەی: هەر كەسێك منداڵی لەبەر بچێت

١٢٧- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيُّكُمْ مَالُ وَارِثِهِ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ مَالِهِ؟» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا مِنَّا مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ مَالُهُ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ مَالِ وَارِثِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اعْلَمُوا أَنَّهُ لَيْسَ مِنْكُمْ أَحَدٌ إِلاَّ مَالُ وَارِثِهِ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ مَالِهِ، مَالُكَ مَا قَدَّمْتَ، وَمَالُ وَارِثِكَ مَا أَخَّرْتَ»»[3].

واتە: عەبدوڵڵا (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كامەتان ماڵی میراتگرەكەی لە ماڵی خۆی خۆشتر دەوێت؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ یەكێك لە ئێمە نیە مەگەر ماڵ و سامانی خۆی لە ماڵ و سامانی میراتگرەكەی خۆشتر دەوێ، فەرمووی: بزانن هیچ یەكێك لە

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٦٧ و ٢٢٦٠): [النسائي: ٢١- ٢٥- باب: من يتوفى له ثلاثة].

(٢) صحيح: «الروض» (٩٥١): [٢٣- كتاب الجنائز، ٩٢- باب: ما قيل في أولاد المسلمين].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٤٨٦): [ليس في شيء من الكتب الستة] أخرجه المصنف في كتاب الرقائق، باب: ١٢. والنسائي القطعة الأولى منه فقط. ومسلم في الأدب المفرد القطعة الثانية والثالثة (١٥٤-١٥٥) فقط وابو داود القطعة الثالثة منه (١٥٥) فقط.فضل الله الصمد.

ئێوە نیە حەتمەن ماڵی میراتگرەکەی لە هی خۆی خۆشتر دەوێت، ماڵ و سامانی تۆ ئەوەیە کە لە پێش خۆتدا بۆ دوارۆژت بەرێکردوە، ماڵ و سامانی میراتگرەکەشت ئەوەیە کە هەڵتگرتووەو کۆتکردۆتەوە (دوای خۆت جێی دەهێڵی بۆ میراتگران، کەواتە ئەگەر ماڵی میراتگرانتان خۆش ناوێ ئەوە ببەخشن تا ببێتە ماڵی ئێوە لە دوارۆژ).

١٢٨- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا تَعُدُّونَ فِيكُمُ الرَّقُوبَ؟» قَالُوا: الرَّقُوبُ الَّذِي لاَ يُولَدُ لَهُ، قَالَ: «لاَ، وَلَكِنَّ الرَّقُوبَ الَّذِي لَمْ يُقَدِّمْ مِنْ وَلَدِهِ شَيْئاً»»[١].

واتە: عەبدوڵلا (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کێ لە نێوتاندا بە وەجاغ کوێرو نەزۆك ئەژمار دەکەن؟ گوتیان: ئەوەیە کە منداڵی نیە، فەرمووی: بەڵکو وەجاغ کوێرو نەزۆك ئەوەیە کە هیچ منداڵێکی پێش خۆی نەمردوە.

١٢٩- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا تَعُدُّونَ فِيكُمُ الصُّرَعَةَ؟» قَالُوا: هُوَ الَّذِي لَا تَصْرَعُهُ الرِّجَالُ، فَقَالَ: «لاَ، وَلَكِنَّ الصُّرَعَةَ الَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ»»[٢].

واتە: عەبدوڵلا (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کێ بە پیاوبەزێن دادەنێن لە خۆتان؟ گوتیان: ئەوەی کە هیچ پیاوێك پشتی لە زەوی نەدات، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: نەخێر، بەڵکو ئازایەتی و بەزێنەر ئەو کەسەیە کە خۆی دەگرێت لە کاتی تووڕەییدا.

## دەربارەی: جوان ڕەفتارکردن لەگەڵ ژێردەستە

١٣٠- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَجِيبُوا الدَّاعِيَ، وَلاَ تَرُدُّوا الْهَدِيَّةَ، وَلاَ تَضْرِبُوا الْمُسْلِمِينَ»»[٣].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: وەڵامی ئەو کەسە بدەنەوە کە بۆ خواردن داوەتتان دەکات، وە دیاری ڕەت مەکەنەوە، وە لە مسوڵمانان مەدەن (مەگەر حەددێکیان لەسەر بێ، لەوە زیاتر ئازاردانی مسوڵمان بە هەموو شێوەیەك حەرامە).

١٣١- «عَنْ عَلِيٍّ صَلَوَاتُ اللَّهِ عَلَيْهِ، قَالَ: كَانَ آخِرُ كَلاَمِ النَّبِيِّ ﷺ: «الصَّلاَةَ، الصَّلاَةَ، اتَّقُوا اللَّهَ فِيمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ»»[٤].

---

(١) صحيح: [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ١٠٦].

(٢) صحيح: [المسند للإمام أحمد: ٣٦٢٦، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين].

(٣) صحيح: «الإرواء» (١٦١٦): [ليس في شيء من الكتب الستة].

(٤) صحيح: «الإرواء» (٢١٧٨): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ١٢٤- باب: في حق المملوك. إبن ماجه: ٢٢- كتاب الوصايا، ١- باب: هل أوصى رسول الله ﷺ؟ ح ٢٦٩٨].

واتە: عەلی صەڵاتی خوای لەسەر، دەڵێ: دوا فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ (لە کۆتایی ژیانیدا لە سەرەمەرگ) ئەوە بوو دەیفەرموو: نوێژ (بپارێزن)، نوێژ (بپارێزن)، پارێز لە خوا بکەن لە (مامەڵەتان) لەگەڵ ئەوانەی بەندەو خزمەتکارو ژێردەستەتانن (نەکەن بە خراپە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن).

## دەربارەی: خراپ ڕەفتارکردن لەگەڵ ژێردەستە

١٣٢- «عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ لِلنَّاسِ: نَحْنُ أَعْرَفُ بِكُمْ مِنَ الْبَيَاطِرَةِ بِالدَّوَابِّ، قَدْ عَرَفْنَا خِيَارَكُمْ مِنْ شِرَارِكُمْ. أَمَّا خِيَارُكُمْ: الَّذِي يُرْجَى خَيْرُهُ، وَيُؤْمَنُ شَرُّهُ. وَأَمَّا شِرَارُكُمْ: فَالَّذِي لاَ يُرْجَى خَيْرُهُ، وَلاَ يُؤْمَنُ شَرُّهُ، وَلاَ يُعْتَقُ مُحَرَّرُهُ»[١].

واتە: ئەبو دەرداء (خوا لێی ڕازی بێ)، لە نێو خەڵکدا دەیگوت: ئێمە بە ئێوە شارەزاترین لە شارەزایی پزیشکانی بێتەری بە ئاژەڵان، ئێمە دەزانین کامتان چاکەکانتانن، وە کامتان خراپەکانتانن، چاکەکانتان ئەوانەن کە ئومێدی خێریان لێ دەکرێ و، خەڵك لە خراپەیان ئەمینە، خراپترینتان ئەوانەن کە ئومێدی خێریان لێ ناکرێ و، خەڵك لە خراپەیان پارێزراونین و، ئەوەی شایستەی ئازادکردنە لە بەندەکانی ئازاد ناکرێن (واتە: خاوەنی ئەم سێ سیفەتە خراپترین کەسن).

## دەربارەی: فرۆشتنی خزمەتکار بە عەرەبە دەشتەکیەکان

١٣٣- «عَنْ عَمْرَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) دَبَّرَتْ أَمَةً لَهَا، فَاشْتَكَتْ عَائِشَةُ، فَسَأَلَ بَنُو أَخِيهَا طَبِيباً مِنَ الزُّطِّ، فَقَالَ: إِنَّكُمْ تُخْبِرُونِي عَنِ امْرَأَةٍ مَسْحُورَةٍ، سَحَرَتْهَا أَمَةٌ لَهَا، فَأُخْبِرَتْ عَائِشَةُ، قَالَتْ: سَحَرْتِينِي؟ فَقَالَتْ: نَعَمْ، فَقَالَتْ: وَلِمَ؟ لاَ تَنْجَيْنَ أَبَداً، ثُمَّ قَالَتْ: بِيعُوهَا مِنْ شَرِّ الْعَرَبِ مَلَكَةً»[٢].

واتە: عەمرەی ئەنصاریی دەگێڕێتەوە، کە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، کەنیزەکێکی خۆی ئازاد کرد، بەو مەرجەی دوای مردنی خۆی ئازاد ببێ، پاش ماوەیەك عائیشە نەخۆش کەوت، جا برازاکانی پرسیاریان لە دکتۆرێکی سودانی ـ یان هیندی ـ کرد، (پزیشکەکە) گوتی: ئێوە لەبارەی ئافرەتێك قسەم بۆ دەکەن کە سیحری لێکراوە، کەنیزەکێکی سیحری لێکردوە (بە هۆی ئەوەوە نەخۆش کەوتووە)، جا هەواڵەکە بە عائیشە گوترا، ئەویش (پرسیاری لە کەنیزەکەکە کردو) گوتی: ئایا تۆ سیحرت لێکردووم؟ ئەویش گوتی: بەڵێ، گوتی: بۆچی؟! دە کەواتە تۆ هەرگیز ڕزگارت نابێ (لە بەندایەتی)، ئنجا گوتی: بیفرۆشن بە خراپترینی ئەو عەرەبانەی کە خراپە لایان بۆتە خوو (مادام کەسێکی ئاوا خراپەکارە هەر شایەنی کەسی خراپە).

---

(١) صحيح الإسناد موقوفا، وقد صح منه مرفوعا جملة الخيار والشرار دون العتق، «تخريج المشكاة» (٤٩٩٣).

(٢) صحيح الإسناد.

## دەربارەی: لێبوردن لە خزمەتكار

١٣٤- «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَقْبَلَ النَّبِيُّ ﷺ مَعَهُ غُلَامَانِ، فَوَهَبَ أَحَدُهُمَا لِعَلِيٍّ صَلَوَاتُ اللَّهِ عَلَيْهِ، وَقَالَ: «لاَ تَضْرِبْهُ، فَإِنِّي نُهِيتُ عَنْ ضَرْبِ أَهْلِ الصَّلاَةِ، وَإِنِّي رَأَيْتُهُ يُصَلِّي مُنْذُ أَقْبَلْنَا»، وَأَعْطَى أَبَا ذَرٍّ غُلَامَاً، وَقَالَ: «اسْتَوْصِ بِهِ مَعْرُوفَاً»، فَأَعْتَقَهُ، فَقَالَ: «مَا فَعَلَ؟» قَالَ: أَمَرْتَنِي أَنْ أَسْتَوْصِي بِهِ خَيْرَاً، فَأَعْتَقْتُهُ»[١].

واتە: ئەبو ئومامە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەرەو ڕوومان هات دوو خزمەتكاری گەنجی لەگەڵ بوون، یەكێكیانی بە دیاری بەخشی بە عەلی (خوا لێی ڕازی بێ)، وە فەرمووی: لێی نەدەی، چونكە من ڕێگریم لێكراوە لە لێدانی خەڵكی نوێژكەر، من بینیومە لەو كاتەوەی كە هاتووین نوێژ دەكات، وە ئەوەی دیكەیانیشی بەخشی بە ئەبو زەڕ، وە پێی فەرمووی: ئامۆژگاریت دەكەم دەربارەی بە چاكە (مامەڵە لەگەڵ كردنی)، ئەویش ئازادی كرد، (پێغەمبەر ﷺ هەواڵی ئەو كۆیلەی پرسی و) فەرمووی: چیت لێكرد؟ گوتی: فەرمانت پێكردم بە وەرگرتنی ئامۆژگاریت بە چاك مامەڵە لەگەڵ كردنی، منیش ئازادم كرد (ئەوەی بە چاكترین ڕێگە زانیوە بۆ جێبەجێ كردنی ئامۆژگاریەكە).

١٣٥- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ وَلَيْسَ لَهُ خَادِمٌ، فَأَخَذَ أَبُو طَلْحَةَ بِيَدِي، فَانْطَلَقَ بِي حَتَّى أَدْخَلَنِي عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، إِنَّ أَنَسَاً غُلَامٌ كَيِّسٌ لَبِيبٌ، فَلْيَخْدُمْكَ. قَالَ: فَخَدَمْتُهُ فِي السَّفَرِ وَالْحَضَرِ، مَقْدَمَهُ الْمَدِينَةَ حَتَّى تُوُفِّيَ ﷺ، مَا قَالَ لِي لِشَيْءٍ صَنَعْتُ: لِمَ صَنَعْتَ هَذَا هَكَذَا؟ وَلَا قَالَ لِي لِشَيْءٍ لَمْ أَصْنَعْهُ: أَلاَ صَنَعْتَ هَذَا هَكَذَا؟» [٢].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هاتە مەدینە خزمەتكاری نەبوو، ئەبو تەڵحە دەستی گرتم و ڕۆیشتین هەتا بردمیە لای پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەنەس منداڵێكی عاقڵ و زیرەكە با خزمەتت بكات، (ئەنەس دەڵێ): جا خزمەتم دەكرد چ لە كاتی سەفەر بووایە، وە چ لە ماڵی خۆی بووایە لە مەدینە، هەتا ئەو كاتەی وەفاتی فەرموو ﷺ، جا شتێكم ئەنجام دابووایە، هەرگیز پێی نەدەفەرمووم: بۆچی ئەوەت ئەوها كرد؟ وە هەرگیز بۆ شتێك كە ئەنجامم نەدابووایە پێی نەدەفەرمووم: بۆچی ئەوەو ئەوەت ئەنجام نەداوە؟

---

[١] حسن: «تخريج المشكاة» (٣٣٦٥).

[٢] صحيح: «مختصر الشمائل» (٢٩٦): [البخاري: ٥٥- كتاب الوصايا، ٢٥- باب: استخدم اليتيم في السفر والحضر. مسلم: ٤٣- كتاب الفضائل، ح ٥٢].

## دەربارەی: باش بوون لەگەڵ خێزان و ئازار نەدانی[1]

١٣٦- «عَنْ عَاصِمِ بْنِ لَقِيطِ بْنِ صَبِرَةَ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: انْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَدَفَعَ الرَّاعِي فِي الْمُرَاحِ سَخْلَةً، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لاَ تَحْسِبَنَّ «وَلَمْ يَقُلْ: لا تَحْسَبَنَّ»، إِنَّ لَنَا غَنَماً مِائَةً لاَ نُرِيدُ أَنْ تَزِيدَ، فَإِذَا جَاءَ الرَّاعِي بِسَخْلَةٍ ذَبَحْنَا مَكَانَهَا شَاةً، فَكَانَ فِيمَا، قَالَ: «لاَ تَضْرِبْ ظَعِينَتَكَ كَضَرْبِكَ أَمَتَكَ، وَإِذَا اسْتَنْشَقْتَ فَبَالِغْ، إِلاَّ أَنْ تَكُونَ صَائِمَةً»»[2].

واتە: عاصیمی کوڕی لەقیتی کوڕی صەبیرە لە باوکی دەگێڕێتەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، کە گوتوویەتی: هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، شوانەکە بەرخێکی هێنا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پێت وا نەبێ (ئەم مەڕە تەنها لەبەر میوانداری تۆ سەردەبڕین و خۆتی پێ ئەزیەت بدەیت بەوەی ئێمەت خستبێتە زەحمەت)، بەڵکو لەبەر ئەوەیە ئێمە سەد مەڕمان هەیەو نامانەوێ زیاد بکات، کاتێك شوانەکە بەرخێکی ساوا دێنێ (کە بەرهەمی مەڕەکانەو تازە لە دایك بووە) ئەوە لە بری ئەوە مەڕێك سەردەبڕین، جا (عاصیمی کوڕی لەقیت دەڵێ:) یەکێك لە قسەکانی ئەو کاتەی (پێغەمبەری خوا ﷺ) ئەوەبوو فەرمووی: لە خێزانت مەدە هەروەکو چۆن لە کەنیزەکەکەت دەدەیت (واتە: وەك کۆیلە مامەڵەی لەگەڵ مەکە)، وە کاتێك ئاوت کردە نێو دەم و لووتت، ئەوە زۆر جار دووبارەی بکەوە، مەگەر بەڕۆژوو بی، ئەوکاتە با زۆر نەبێ.

## دەربارەی: ئەوەی مۆری داوە لەو شتەی ڕەوانی دەکات بە خزمەتکاری لە ترسی گومانی خراپ

١٣٧- «عَنْ أَبِي الْعَالِيَةِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا نُؤْمَرُ أَنْ نَخْتِمَ عَلَى الْخَادِمِ، وَنَكِيلَ، وَنَعُدَّهَا، كَرَاهِيَةَ أَنْ يَتَعَوَّدُوا خُلُقَ سُوءٍ، أَوْ يَظُنَّ أَحَدُنَا ظَنَّ سُوءٍ»[3].

واتە: ئەبو عالیە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئێمە فەرمانمان پێدەکرا بەوەی کە مۆر بدەین (لەسەر ئەو توورەکە پارەیەی دەماندایە دەست خزمەتکار)، وە (ئەگەر شتێتر بووایە) ئەوە دەمانپێوا (قەپانمان دەکردو دەمانکێشا)و دەمان ژمارد، لە ترسی ئەوەی نەبادا ڕابێن لەسەر ڕەوشتی خراپ (وەك دزی و خواردنی ئەمانەتەکە)، یان نەوەك یەکێك لە ئێمە گومانی خراپی پێ ببەین.

---

(١) لە ئەسڵدا ئەوە ناونیشانی فەرموودەکەیە: (دەربارەی: خزمەتکار کە گوناح ئەنجام دەدات)، بەڵام لەبەر ئەوەی لەگەڵ نێوەڕۆکی فەرموودەکەی ژێری جیاواز بوون، خۆم ئەم ناونیشانەم بۆ دانا.

(٢) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٣٠، ١٣١): [أبو داود: ١- كتاب الطهارة، ٥٦- باب: في الاستنشاق].

(٣) صحيح الإسناد.

## دەربارەی: شت ئەژمار كردن پێش ناردن بۆ كەسێكی دیكە[١]

١٣٨- «عَنْ حَارِثَةَ بْنِ مُضَرِّبٍ، عَنْ سَلْمَانَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنِّي لَأَعُدُّ الْعُرَاقَ عَلَى خَادِمِي ـخَافَةَ الظَّنِّ»[٢].

**واتە: حاریسەی كوڕی موزەڕڕیب، لە سەلمانەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە، كە گوتوویەتی: من ئەو ئێسقانە گۆشتانەم دەژمارد كە دەمدایە دەست خزمەتكارەكەم (تا بیبات بۆ كەسێك، یان شوێنێك)، بۆ ئەوەی گومانی خراپی پێ نەبەم.**

١٣٩- «عَنْ حارِثَة بْن مُضَرِّبٍ قَالَ: سَمِعْتُ سَلْمَانَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ): إِنِّي لَأَعُدُّ الْعُرَاقَ خَشْيَةَ ظَنِّ»[٣].

**واتە: حاریسەی كوڕی موزەڕڕیب دەڵێ: گوێم لێ بوو سەلمان (خوا لێی ڕازی بێ)، دەیگوت: من ئەو ئێسقانە گۆشتانەم دەژمارد (كە دەمدایە دەست خزمەتكارەكەم تا بیبات بۆ كەسێكی دیكە، یان شوێنێكی دیكە)، بۆ ئەوەی گومانی خراپی پێ نەبەم.**

## دەربارەی: تەمبێكردنی خزمەتكار

١٤٠- «عَنْ يَزِيدِ بْنِ عَبْدِ اللّهِ بْنِ قُسَيْطٍ قَالَ: أَرْسَلَ عَبْدُ اللّهِ بْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) غُلاَمَاً لَهُ ـذَهَبٍ أَوْ بِوَرِقٍ، فَصَرَفَهُ، فَأَنْظَرَ بِالصَّرْفِ، فَرَجَعَ إِلَيْهِ فَجَلَدَهُ جَلْداً وَجِيعاً، وَقَالَ: اذْهَبْ، فَخُذِ الَّذِي ـي، وَلاَ تَصْرِفْهُ»[٤].

**واتە: یەزیدی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی قوسەیت دەڵێ: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) خزمەتكارێكی خۆی نارد بۆ ئەوەی زێڕ یان زیوی بۆ بگۆڕێتەوە، ئەویش گۆڕیەوە، بەڵام دەستبەجێ وەرینەگرت (بەڵكو دوای خست، لە كاتێكدا بەم شێوەیە دروست نیەو دەبێتە ڕیبا، دیارە ئەویش زانیویەتی دەبێتە ڕیبا، بەڵام هەر گوێی پێ نەداوە)، جا كاتێ گەڕایەوە جەلدی لێدا بە جەلد كردنێكی بە ئێش، گوتی: بڕۆ ئەوەی هی منە وەریبگرەوەو مەیگۆڕەوە.**

---

١) ئەو كەسانەی شتە ڕەوانكراوەكانی خۆیان ئەژمار دەكرد كاتێ بە خزمەتكارەكانیان ڕەوانەیان دەكرد لە ترسی دروست بوونی گومانی خراپ.

٢) صحيح الإسناد.

٣) صحيح الإسناد.

٤) حسن الإسناد.

١٤١- «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ أَضْرِبُ غُلاَمَاً لِي، فَسَمِعْتُ مِنْ خَلْفِي صَوْتَاً: «اعْلَمْ أَبَا مَسْعُودٍ، لَلَّهُ أَقْدَرُ عَلَيْكَ مِنْكَ عَلَيْهِ»، فَالْتَفَتُّ فَإِذَا هُوَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَهُوَ حُرٌّ لِوَجْهِ اللَّهِ، فَقَالَ: «أَمَا لَوْ لَمْ تَفْعَلْ لَمَسَّتْكَ النَّارُ»، أَوْ «لَلَفَحَتْكَ النَّارُ»»[١].

واتە: ئەبو مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: من خزمەتكارێكی كۆیلەم هەبوو داركارییم كرد (لێمدا)، جا گوێم لە دەنگێك بوو لە دوامەوە (فەرمووی): ئەبا مەسعوود باش بزانە خوا دەسەڵاتی زیاترە لە دەسەڵاتی تۆ بەسەر ئەو (خزمەتكار)ـە، منیش ئاوڕمدایەوە، بینم ئەوە پێغەمبەری خوایە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە ئازادم كرد بە مەبەستی ڕەزامەندی خوا، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەگەر ئازادت نەكردبا ئاگرت دەگەیشتێ، یان ئاگر دەیسوتاندی.

## دەربارەی: نەگوتنی خوا ڕووی ڕەش بكات

١٤٢- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ تَقُولُوا قَبَّحَ اللَّهُ وَجْهَهُ»»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: هەرگیز (باسی كەس مەكەن و پێی) مەڵێن خوا ڕووی ڕەش بكات.

١٤٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: «لاَ تَقُولَنَّ: قَبَّحَ اللَّهُ وَجْهَكَ وَوَجْهَ مَنْ أَشْبَهَ وَجْهَكَ، فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ خَلَقَ آدَمَ عليه السلام عَلَى صُورَتِهِ»»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هەرگیز (بە كەس) مەڵێن: خوا ڕووی تۆو ڕووی ئەو كەسەش ڕەش بكات، كە بە ڕووی تۆ دەچێ، چونكە خوا مرۆڤی لەسەر ئەو شێوە دروست كردوە كە ئادەم (علیه السلام)ی لەسەر بەدیهێناوە، (واتە: جوێنە خراپەكەت دەگەڕێتەوە بۆ ئادەم كە خوای پەروەردگار بە فەرمانێكی زۆر تایبەت دروستی كردو ئەو ڕووەی بۆ دانا).

## دەربارەی: خۆدوورگرتن لە لێدانی ڕووخسارو دەم و چاو

١٤٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا ضَرَبَ أَحَدُكُمْ خَادِمَهُ فَلْيَجْتَنِبِ الْوَجْهَ»»[٤].

---

(١) صحيح: «التخريج الرغيب» (٣ / ١٦٠): [مسلم: ٢٧- كتاب الأيمان، ح ٣٤، ٣٥].

(٢) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٨٦٢).

(٣) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٨٦٢).

(٤) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨٦٢): [البخاري: ٤٩- كتاب العتق، ٢٠- باب: إذا ضرب العبد فليجب الوجه. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والاداب، ح ١١٢، ١١٦].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان لە خزمەتکارەکەیدا، ئەوە با خۆی دوور بگرێ لە لێدانی ڕووخساری.

١٤٥- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بِدَابَّةٍ قَدْ وُسِمَ يُدَخِّنُ مَنْخِرَاهُ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَعَنَ اللَّهُ مَنْ فَعَلَ هَذَا، لاَ يَسِمَنَّ أَحَدٌ الْوَجْهَ وَلاَ يَضْرِبَنَّهُ»»[١].

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بەلای وڵاخێکدا تێپەڕی کە کونە لوتەکانی نیشانەکرابوون (داغ کرابوون بۆ نیشانە کردن)، دووکەڵ لە کونە لوتەکانی دەهاتە دەرەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەفرەتی خوا لەوەی ئەم کارەی کردوە، ئاگاداربن نابێ هیچ کەسێك نیشانە لەسەر دەموچاو بکات، هەروەها نابێ لە دەموچاو بدات.

## دەربارەی: هەر کەسێك زللە لە کۆیلەکەی بدات دەبێ ئازادی بکات

١٤٦- «عَنْ حُصَيْن، قَالَ: سَمِعْتُ هِلاَلَ بْنَ يَسَافٍ، يَقُولُ: كُنَّا نَبِيعُ الْبَزَّ[٢] فِي دَارِ سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ، فَخَرَجَتْ جَارِيَةٌ فَقَالَتْ لِرَجُلٍ شَيْئاً، فَلَطَمَهَا ذَلِكَ الرَّجُلُ، فَقَالَ لَهُ سُوَيْدُ بْنُ مُقَرِّنٍ: أَلَطَمْتَ وَجْهَهَا؟ لَقَدْ رَأَيْتُنِي سَابِعَ سَبْعَةٍ وَمَا لَنَا إِلاَّ خَادِمٌ، فَلَطَمَهَا بَعْضُنَا، فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُعْتِقُهَا»[٣].

واتە: حوصەین دەڵێ: گوێم لە هیلالی کوڕی یەساف بوو، دەیگوت: ئێمە لە ماڵی سوەیدی کوڕی موقەڕڕین قوماشی بەززمان دەفرۆشت، ئافرەتێکی جاریە هاتەدەرو شتێکی بە پیاوێك گوت، پیاوەکەش زللـەیەکی لە ڕوخساریدا، سوەیدی کوڕی موقەڕین گوتی: ئایا زللـەت لە ڕوخساریدا؟ (دە بزانە) من حەوتەمینی حەوت (کەسەکەی بنەماڵەکەمان بووم) کە تەنیا یەك خزمەتکارمان هەبوو، یەکێکمان ئازاری (خزمەتکارەکەی)داو، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد ئازادی بکات (ئا ئەوە کەفارەتی زللـە لێدانیەتی).

١٤٧- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ لَطَمَ عَبْدَهُ أَوْ ضَرَبَهُ حَدّاً لَمْ يَأْتِهِ، فَكَفَّارَتُهُ عِتْقُهُ»»[٤].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێك لە کۆیلەکەی بدات، یان سزای تاوانێکی لەسەر جێبەجێ بکات کە ئەنجامی نەدابێ، ئەوە کەفارەت و پاکبوونەوەی (ئەو تاوانەی) بریتیە لە ئازاد کردنی کۆیلەکە.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢١٤٩).

(٢) والبز: بالباء والزاي نوع من القماش بين الحرير والقطن، أو مختلط منهما.

(٣) صحيح: [مسلم: ٢٧- كتاب الأيمان، ح ٣١- ٣٣].

(٤) صحيح: «الإرواء» (٢١٧٣): [مسلم: كتاب الأيمان، ح ٣٠].

١٤٨- «عَنْ مُعَاوِيَة بْن سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: لَطَمْتُ مَوْلى لَنَا فَفَرَّ، فَدَعَانِي أَبِي فَقَالَ لَهُ: اقْتَصَّ، كُنَّا وَلَدَ مُقَرِّنٍ سَبْعَةً، لَنَا خَادِمٌ، فَلَطَمَهَا أَحَدُنَا، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «مُرْهُمْ فَلْيُعْتِقُوهَا»، فَقِيلَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: لَيْسَ لَهُمْ خَادِمٌ غَيْرَهَا، قَالَ: «فَلْيَسْتَخْدِمُوهَا، فَإِذَا اسْتَغْنَوْا خَلُّوا سَبِيلَهَا»»[1].

**واتە: موعاویەی كوڕی سوەیدی موقەڕڕین (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: زللەم لە خزمەتكارێكمدا، ئەویش هەڵهات، باوكم بانگی كردم، بە خزمەتكارەكەی گوت: تۆڵەی خۆت بكەوە، جا ئێمە حەوت كوڕەكەی موقەررین بووین، یەك خزمەتكارمان هەبوو، یەكێك لە ئێمە زللەیەكی لێدا، ئەمە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسكرا، فەرمووی: فەرمانیان پێبكە ئازادی بكەن، بە پێغەمبەریان ﷺ گوت: لەم خزمەتكارە زیاتریان نیە، فەرمووی: دەبا جارێ بەكاری بێنن، ئەگەر پێویستیان پێی نەما با لێی گەڕێن.**

**(بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی كرد دەبێ كۆیلەكە ئازاد بكرێ، چونكە لێدان لە دەموچاو ڕووخسار بێ ڕێزیەكی گەورەیە) .**

١٤٩- «عَنْ سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ الْمُزَنِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، وَرَأَى رَجُلاً لَطَمَ غُلَامَهُ، فَقَالَ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ الصُّورَةَ مُحَرَّمَةٌ؟ رَأَيْتُنِي وَإِنِّي سَابِعُ سَبْعَةِ إِخْوَةٍ، عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَا لَنَا إِلاَّ خَادِمٌ، فَلَطَمَهُ أَحَدُنَا، فَأَمَرَنَا النَّبِيُّ ﷺ أَنْ نُعْتِقَهُ»[2].

**واتە: سوەیدی كوڕی مەقەڕڕینی موزەنی (خوا لێی ڕازی بێ)، پیاوێكی بینی زللە لە خزمەتكارەكەی دەدات، گوتی: دیارە نەتزانیوە ئەم شێوە لێدانە حەرامە؟ من حەوتەمینی حەوت براكان بووم، لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، یەك خزمەتكاریشمان هەبوو، یەكێك لە ئێمە زللەی لێدا، جا ئەمە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسكرا، ئەویش فەرمانی پێكردین كە دەبێ ئەو كۆیلەیە ئازاد بكەین.**

١٥٠- «عَنْ زَاذَانَ أَبِي عُمَرَ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، فَدَعَا بِغُلَامٍ لَهُ كَانَ ضَرَبَهُ فَكَشَفَ عَنْ ظَهْرِهِ فَقَالَ: أَيُوجِعُكَ؟ قَالَ: لاَ. فَأَعْتَقَهُ، ثُمَّ رَفَعَ عُوداً مِنَ الأَرْضِ فَقَالَ: مَالِي فِيهِ مِنَ الأَجْرِ مَا يَزِنُ هَذَا الْعُودَ، فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، لِمَ تَقُولُ هَذَا؟ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ «أَوْ قال»: «مَنْ ضَرَبَ مَمْلُوكَهُ حَدّاً لَمْ يَأْتِهِ، أَوْ لَطَمَ وَجْهَهُ، فَكَفَّارَتُهُ أَنْ يُعْتِقَهُ»»[3].

**واتە: زازان كە ئەبو عومەرە دەڵێ: ئێمە لە لای ئیبنو عومەر بووین (خوا لێیان ڕازی بێ)، گەنجێكی خزمەتكاری هەبوو، بانگی كرد كە (پێشتر كەمێكی لێدابوو) جا پشتی هەڵكردو، پێی گوت: ئایا ئازارت هەیە؟ گوتی: نەخێر، ڕزگاری كرد، پاشان چیلكە دارێكی لەسەر زەوی**

---

(١) صحيح: [مسلم: ٢٧- كتاب الإيمان، باب: صحبة المماليك وكفارة من لطم عبده ح ٣١- ٣٢].

(٢) صحيح: [مسلم: ٢٧- كتاب الإيمان، باب: صحبة المماليك وكفارة من لطم عبده، ح ٣٣].

(٣) صحيح: «الإرواء» (٢١٧٣): [مسلم: ٢٧- كتاب الأيمان، باب: صحبة المماليك وكفارة من لطم عبده، ٣٠].

١٤٨- «عَنْ مُعَاوِيَة بْن سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: لَطَمْتُ مَوْلى لَنَا فَفَرَّ، فَدَعَانِي أَبِي فَقَالَ لَهُ: اقْتَصَّ، كُنَّا وَلَدَ مُقَرِّنٍ سَبْعَةً، لَنَا خَادِمٌ، فَلَطَمَهَا أَحَدُنَا، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «مُرْهُمْ فَلْيُعْتِقُوهَا»، فَقِيلَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: لَيْسَ لَهُمْ خَادِمٌ غَيْرَهَا، قَالَ: «فَلْيَسْتَخْدِمُوهَا، فَإِذَا اسْتَغْنَوْا خَلُّوا سَبِيلَهَا»»[١].

واتە: موعاویەی کوڕی سوەیدی موقەڕڕین (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: زللەم لە خزمەتکارێکمدا، ئەویش هەڵهات، باوکم بانگی کردم، بە خزمەتکارەکەی گوت: تۆڵەی خۆت بکەوە، جا ئێمە حەوت کوڕەکەی موقەررین بووین، یەك خزمەتکارمان هەبوو، یەکێك لە ئێمە زللەیەکی لێدا، ئەمە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرا، فەرمووی: فەرمانیان پێبکە ئازادی بکەن، بە پێغەمبەریان ﷺ گوت: لەم خزمەتکارە زیاتریان نیە، فەرمووی: دەبا جارێ بەکاری بێنن، ئەگەر پێویستیان پێی نەما با لێی گەڕێن.

(بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد دەبێ کۆیلەکە ئازاد بکرێ، چونکە لێدان لە دەموچاو ڕووخسار بێ ڕێزیەکی گەورەیە) .

١٤٩- «عَنْ سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ الْمُزَنِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، وَرَأَى رَجُلاً لَطَمَ غُلَامَهُ، فَقَالَ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ الصُّورَةَ مُحَرَّمَةٌ؟ رَأَيْتُنِي وَإِنِّي سَابِعُ سَبْعَةِ إِخْوَةٍ، عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَا لَنَا إِلاَّ خَادِمٌ، فَلَطَمَهُ أَحَدُنَا، فَأَمَرَنَا النَّبِيُّ ﷺ أَنْ نُعْتِقَهُ»[٢].

واتە: سوەیدی کوڕی مەقەڕڕینی موزەنی (خوا لێی ڕازی بێ)، پیاوێکی بینی زللـە لە خزمەتکارەکەی دەدات، گوتی: دیارە نەتزانیوە ئەم شێوە لێدانە حەڕامە؟ من حەوتەمینی حەوت براکان بووم، لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، یەك خزمەتکاریشمان هەبوو، یەکێك لە ئێمە زللەی لێدا، جا ئەمە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرا، ئەویش فەرمانی پێکردین کە دەبێ ئەو کۆیلەیە ئازاد بکەین.

١٥٠- «عَنْ زَاذَانَ أَبِي عُمَرَ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، فَدَعَا بِغُلَامٍ لَهُ كَانَ ضَرَبَهُ فَكَشَفَ عَنْ ظَهْرِهِ فَقَالَ: أَيُوجِعُكَ؟ قَالَ: لاَ. فَأَعْتَقَهُ، ثُمَّ رَفَعَ عُوداً مِنَ الأَرْضِ فَقَالَ: مَالِي فِيهِ مِنَ الأَجْرِ مَا يَزِنُ هَذَا الْعُودَ، فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، لِمَ تَقُولُ هَذَا؟ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ «أَوْ قال»: «مَنْ ضَرَبَ مَمْلُوكَهُ حَدّاً لَمْ يَأْتِهِ، أَوْ لَطَمَ وَجْهَهُ، فَكَفَّارَتُهُ أَنْ يُعْتِقَهُ»»[٣].

واتە: زازان کە ئەبو عومەرە دەڵێ: ئێمە لە لای ئیبنو عومەر بووین (خوا لێیان ڕازی بێ)، گەنجێکی خزمەتکاری هەبوو، بانگی کرد کە (پێشتر کەمێکی لێدابوو) جا پشتی هەڵکردو، پێی گوت: ئایا ئازارت هەیە؟ گوتی: نەخێر، ڕزگاری کرد، پاشان چیلکە دارێکی لەسەر زەوی

---

(١) صحيح: [مسلم: ٢٧- كتاب الإيمان، باب: صحبة المماليك وكفارة من لطم عبده ح ٣١- ٣٢].

(٢) صحيح: [مسلم: ٢٧- كتاب الإيمان، باب: صحبة المماليك وكفارة من لطم عبده، ح ٣٣].

(٣) صحيح: «الإرواء» (٢١٧٣): [مسلم: ٢٧- كتاب الأيمان، باب: صحبة المماليك وكفارة من لطم عبده، ٣٠].

هەڵگرتەوە، گوتی: ئەم ئازادکردنەی من سەنگی ئەم چیلکە دارەی نیە (واتە: هیچ پاداشتم بۆ نیە)، گوتم: ئەی باوکی عەبدوڕڕەحمان بۆ وا دەڵێی؟ گوتی: لەبەر ئەوەی گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو، یان گوتی: هەر کەسێك سزایەك لەسەر کۆیلەکەی جێبەجێ بکات (لەسەر تاوانێك) کە نەیکردوە، یان زللـە لە دەموچاوی بدات ئەوە کەفارەتەکەی ئەوەیە ئازادی بکات.

## دەربارەی: تۆڵەسەندنەوەی کۆیلە

١٥١- «عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: لاَ يَضْرِبُ أَحَدٌ عَبْدَاً لَهُ «وَهُوَ ظَالِمٌ لَهُ» إلاَّ أُقِيدَ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[١].

**واتە: عەممارى کوڕی یاسر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: هیچ کەسێك نیە کە کۆیلە (و خزمەتکار)ێکی هەبێ و لێی بدات و ستەمی لێبکات، ئەوە بە دڵنیایی لە ڕۆژی دواییدا تۆڵەی لێدەکرێتەوە.**

١٥٢- «عَنْ أَبِي لَيْلَى قَالَ: خَرَجَ سَلْمَانُ فَإِذَا عَلَفُ دَابَّتِهِ يَتَسَاقَطُ مِنَ الآرِيِّ، فَقَالَ لِخَادِمِهِ: لَوْلاَ أَنِّي أَخَافُ الْقِصَاصَ لَأَوْجَعْتُكَ»[٢].

**واتە: ئەبو لەیلا دەڵێ: سەلمان هاتەدەر بینی ئالیکی ئاژەڵەکەی لە ئاخوڕەکەیەوە دەڕژێ، بە خزمەتکارەکەی گوت: لەبەر ئەوە نەبووایە کە دەترسم تۆڵەم لێبکرێتەوە (لە دوارۆژ) ئەوە ئازارم دەدایت.**

١٥٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «**لَتُؤَدُّنَّ الْحُقُوقَ إِلَى أَهْلِهَا، حَتَّى يُقَادَ** لِلشَّاةِ الْجَمَّاءِ مِنَ الشَّاةِ الْقَرْنَاءِ»»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خاوەن مافەکان مافیان بۆ دەگێڕدرێتەوە، هەتا مەڕی بێ شاخ تۆڵەی بۆ لە مەڕی شاخدار وەردەگیرێتەوە.**

**(ئەمە وێنەیەکی کرداری بەلاغیە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەنجام دەدرێ، لەسەر ستەمی نێوان دوو بزن، یان هەر جۆرە ئاژەڵێکی دیکە جێبەجێ دەکرێ، بۆ ئەوەی مرۆڤەکان بزانن هیچ ستەمێك ون نابێ و، تۆڵەکەی وەردەگیرێتەوەو باش ترس و بیمیان لێ بنیشێ).**

١٥٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ ضَرَبَ ضَرْبَاً اقْتُصَّ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»»[٤].

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٥٨٨): [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ١٥- باب: تحريم الظلم، ح ٦٠].

(٤) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٣٥١).

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك یەك لێدان بوەشێنێ (بە شێوەیەکی ناڕەوا) ئەوە لە ڕۆژی دوایی تۆڵەی لێ دەکرێتەوە.

١٥٥- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ ضَرَبَ ضَرْبَاً ظُلْمَاً اقْتُصَّ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك یەك لێدان بوەشێنێ (بە شێوەیەکی ناڕەوا) ئەوە لە ڕۆژی دوایی تۆڵەی لێ دەکرێتەوە.

## دەربارەی: لە پۆشاکی خۆتان پۆشاکیان بۆ بکەن

١٥٦- «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: خَرَجْتُ أَنَا وَأَبِي نَطْلُبُ الْعِلْمَ فِي هَذَا الْحَيِّ فِي الْأَنْصَارِ، قَبْلَ أَنْ يَهْلِكُوا، فَكَانَ أَوَّلَ مَنْ لَقِينَا أَبُو الْيَسَرِ صَاحِبُ النَّبِيِّ ﷺ وَمَعَهُ غُلامٌ لَهُ، وَعَلَى أَبِي الْيَسَرِ بُرْدَةٌ وَمَعَافِرِيٌّ، وَعَلَى غُلَامِهِ بُرْدَةٌ وَمَعَافِرِيٌّ، فَقُلْتُ لَهُ: يَا عَمِّي، لَوْ أَخَذْتَ بُرْدَةَ غُلَامِكَ وَأَعْطَيْتَهُ مَعَافِرِيَّكَ، أَوْ أَخَذْتَ مَعَافِرِيَّهُ وَأَعْطَيْتَهُ بُرْدَتَكَ، كَانَتْ عَلَيْكَ حُلَّةٌ أَوْ عَلَيْهِ حُلَّةٌ، فَمَسَحَ رَأْسِي وَقَالَ: اللَّهُمَّ بَارِكْ فِيهِ، يَا ابْنَ أَخِي، بَصَرُ عَيْنَيَّ هَاتَيْنِ، وَسَمْعُ أُذُنَيَّ هَاتَيْنِ، وَوَعَاهُ قَلْبِي «وَأَشَارَ إِلَى نِيَاطِ قَلْبِهِ» النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «أَطْعِمُوهُمْ مِمَّا تَأْكُلُونَ، وَاكْسُوهُمْ مِمَّا تَلْبَسُونَ»، وَكَانَ أَنْ أُعْطِيَهُ مِنْ مَتَاعِ الدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَيَّ مِنْ أَنْ يَأْخُذَ مِنْ حَسَنَاتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ»[٢].

واتە: عوبادەی کوڕی صامت (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من و باوکم چووینە دەر بۆ ئەوەی داوای زانست بکەین لەم ناوچەیەی ئەنصار، بەر لەوەی بمرن و (زانستەکەمان لە کیس بچێ)، جا یەکەم کەس کە پێمان گەیشت ئەبو یەسەر بوو کە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بوو، خزمەتکارێکیشی لەگەڵدا بوو، ئەبو یەسەرو خزمەتکارەکەی کەوایەکی مەعافیریان لەبەر بوو، جا گوتم: ئەی مامە! ئەگەر تۆ کەواکەی خزمەتکارەکەت وەرگرتبایەو پۆشاکی مەعافیریەکەی خۆت بە ئەو دابایە، یان مەعافیری ئەوت وەرگرتبایەو کەواکەی خۆت پێی دابایە (تاوەکو جیاواز دەربکەوتنایە)، ئەو کات تۆ پۆشاکێکت لەبەردا دەبوو ئەویش پۆشاکێکی دیکەی لەبەردا دەبوو، جا دەستی بەسەریدا هێنام و، گوتی: خوایە بەرەکەتداری بکەی، (دوایی گوتی): ئەی کوڕی برام! بە بینینی ئەو دوو چاوەم و، بە بیستنی ئەو دوو گوێچکانەم و، دڵیشم حاڵی بوو، «وە ئاماژەی بۆ شادەماری دڵی کرد»، لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەیفەرموو: ئەو خۆراکە بدەن بە خزمەتکارو کۆیلەکانتان کە خۆتان دەیخۆن، وە ئەوەشیان پێ بپۆشن کە خۆتان دەیپۆشن. جا من کاڵای دونیا بدەم بە خزمەتکارەکەم لەلام ئاسانترە، لەوەی چاکەکانم لە ڕۆژی دواییدا ببات.

---

(١) صحيح: انظر ما قبله.

(٢) صحيح: [مسلم: ٥٣- كتاب الزهد والرقائق، ١٨- باب: حديث جابر الطويل في قصة أبي اليسر، ح ٧٤].

١٥٧- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُوصِي بِالْمَمْلُوكِينَ خَيْرَاً، وَيَقُولُ: «أَطْعِمُوهُمْ مِمَّا تَأْكُلُونَ، وَأَلْبِسُوهُمْ مِنْ لَبُوسِكُمْ، وَلاَ تُعَذِّبُوا خَلْقَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ»»[1].

**واته: جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە خەڵك دەكرد لەگەڵ خزمەتكارو كۆیلەكانیان باشبن، وە دەیفەرموو: لەو خواردنەی خۆتان دەیخۆن دەرخواردیان بدەن، وە لەو پۆشاكەی دەیپۆشن پۆشتەیان بكەن، وە بە هیچ جۆرێك دروستكراوی خوای زاڵی پایەدار سزا مەدەن.**

## دەربارەی: جوێندان بە كۆیلە و خزمەتكار

١٥٨- «عَنِ الْمَعْرُورِ بْنِ سُوَيْدٍ يَقُولُ: رَأَيْتُ أَبَا ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، وَعَلَيْهِ حُلَّةٌ وَعَلَى غُلاَمِهِ حُلَّةٌ، فَسَأَلْنَاهُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: إِنِّي سَابَبْتُ رَجُلاً فَشَكَانِي إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ لِيَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَعَيَّرْتَهُ بِأُمِّهِ؟» قُلْتُ: نَعَمْ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ إِخْوَانَكُمْ خَوَلُكُمْ، جَعَلَهُمُ اللَّهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ، فَمَنْ كَانَ أَخُوهُ تَحْتَ يَدَيْهِ فَلْيُطْعِمْهُ مِمَّا يَأْكُلُ، وَلْيُلْبِسْهُ مِمَّا يَلْبَسُ، وَلاَ تُكَلِّفُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ، فَإِنْ كَلَّفْتُمُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ فَأَعِينُوهُمْ»»[2].

**واته: مەعروری كوڕی سوەید دەڵێ: ئەبو زەڕم بینی (خوا لێی ڕازی بێ)، دەستە پۆشاكێكی جوانی لەبەردا بوو، دەستە پۆشاكێكی جوانیش لەبەر خزمەتكارو كۆیلەكەیدا بوو، جا پرسیارمان لێكرد دەربارەی ئەوە، گوتی: (جارێكیان) من جوێنم بە پیاوێكدا، ئەویش سكاڵای لێكردم لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: ئایا بە دایكی عەیبت لێ گرتووە (و قسەی نارێكت پێ گوتوە)؟ گوتم: بەڵێ، پاشان (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەوانە (واتە: خزمەتكارو بەندە) براتانن، خوا خستوونیەتیە بەر دەستی ئێوە، هەر كەسێك برا (یان خوشكە مسوڵمانەكەی) لەبەر دەستی دابوو، با ئەو خواردنەی پێ بدات كە خۆی دەیخوات، وە ئەو پۆشاكەی بۆ بپۆشێت كە خۆی دەیپۆشێ، وە كارێكیان پێ مەسپێرن كە لە توانایاندا نیە، وە ئەگەر هەر كارێكتان پێ سپاردن لە توانایاندا نەبوو بە تەنیا ئەنجامی بدەن، ئەوە ئێوە هاوكاریان بكەن!!**

## دەربارەی: ئایا مسوڵمان یارمەتی كۆیلەو خزمەتكارەكەی دەدات؟

١٥٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ قَالَ: أَعِينُوا الْعَامِلَ مِنْ عَمَلِهِ، فَإِنَّ عَامِلَ اللَّهِ لاَ يَخِيبُ، يَعْنِي: الْخَادِمَ»[3].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٤٧٠).

(٢) صحيح: «الإرواء» (٢١٧٦): [البخاري: ١- كتاب الإيمان، ٢٢- باب: المعاصي من أمر الجاهلية. مسلم: ٢٧- كتاب الأيمان، ١٠- باب: إطعام المملوك مما يأكل، ح ٣٨، ٣٩، ٤٠].

(٣) صحيح الإسناد.

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: یارمەتی کرێکارو (خزمەتکار) بدەن لەسەر کارەکەی، چونکە ئەوەی خزمەتکاری خوا بێ (واتە: خزمەت بکات لە ئەرکێکی شەرعی و حەڵاڵ) هەرگیز خوا ڕەنج بەخەسارو مایەپووچی ناکات.

## دەربارەی: خزمەتکار زیاد لە توانای خۆی کاری پێ ناسپێردرێ

١٦٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لِلْمَمْلُوكِ طَعَامُهُ وَكِسْوَتُهُ، وَلاَ يُكَلَّفُ مِنَ الْعَمَلِ مَا لاَ يُطِيقُ»»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خزمەتکارەکان خواردن و پۆشاکیان بۆ هەیە (لەسەر خاوەنەکانیان)، وە کارێکیان پێ ناسپێردرێ کە لە توانایاندا نیە.

١٦١- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لِلْمَمْلُوكِ طَعَامُهُ وَكِسْوَتُهُ، وَلاَ يُكَلَّفُ إِلاَّ مَا يُطِيقُ»»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خزمەتکارەکان خواردن و پۆشاکیان بۆ هەیە (لەسەر خاوەنەکانیان)، وە داوای هیچ کارێکیان لێ ناکرێ تەنها ئەو کارانە نەبێ کە لە توانایاندا هەیە.

١٦٢- «قَالَ مَعْرُورٌ: مَرَرْنَا بِأَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) وَعَلَيْهِ ثَوْبٌ، وَعَلَى غُلاَمِهِ حُلَّةٌ، فَقُلْنَا: لَوْ أَخَذْتَ هَذَا وَأَعْطَيْتَ هَذَا غَيْرَهُ، كَانَتْ حُلَّةٌ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِخْوَانُكُمْ جَعَلَهُمُ اللَّهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ، فَمَنْ كَانَ أَخُوهُ تَحْتَ يَدِهِ، فَلْيُطْعِمْهُ مِمَّا يَأْكُلُ، وَلْيُلْبِسْهُ مِمَّا يَلْبَسُ، وَلاَ يُكَلِّفْهُ مَا يَغْلِبُهُ، فَإِنْ كَلَّفَهُ مَا يَغْلِبُهُ فَلْيُعِنْهُ عَلَيْهِ»»[٣].

واتە: مەعرور دەڵێ: ئەبو زەڕم بینی (خوا لێی ڕازی بێ) بەلاماندا تێپەڕ بوو، دەستە پۆشاکێکی جوانی لەبەردا بوو، دەستە پۆشاکێکی جوانیش لەبەر خزمەتکارو بەندەکەیدا بوو، جا گوتمان: ئەگەر ئەم پۆشاکەت لێوەرگرتبایەوەو، یەکێکی دیکەت پێ بدایە (چونکە) پۆشاکێکی جوان و بەبەها بوو، (ئەبو زەڕ خوا لێی ڕازی بێ)، گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوانە براتانن، خوا خستوونیە ژێر دەستی ئێوە، هەر کەسێك برایەکەی لەبەر دەستی دابوو، با بە خۆی لە چ خواردنێك دەخوات لەو خواردنەی بداتێ، وە ئەو پۆشاکەش بکاتە بەر ئەو کە خۆی دەیپۆشێ،

---

(١) صحيح: «الإرواء» (٢١٧٢): [مسلم: كتاب الأيمان، ١٠- باب: إطعام المملوك مما يأكل، ح ٤١].

(٢) صحيح: انظر ما قبله.

(٣) صحيح: «الإرواء» (٢١٧٦).

وە کارێکیان پێ مەسپێرن کە لە توانایاندا نیە، وە ئەگەر هەر کارێکتان پێ سپاردن لە توانایاندا نەبوو بە تەنیا ئەنجامی بدەن، ئەوە ئێوە لەسەر کارەکە هاوکاریان بکەن!.

## دەربارەی: خەرجی مرۆڤ بۆ خزمەتکارەکەی دەبێتە خێرو چاکە بۆی

١٦٣- «عَنِ الْمِقْدَامِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَا أَطْعَمْتَ نَفْسَكَ فَهُوَ صَدَقَةٌ، وَمَا أَطْعَمْتَ وَلَدَكَ وَزَوْجَتَكَ وَخَادِمَكَ فَهُوَ صَدَقَةٌ»»[١].

واتە: میقدام (خوا لێی ڕازی بێ)، لە پێغەمبەری ﷺ بیستووە دەیفەرموو: ئەو خواردنەی خۆت دەیخۆی بە خێر بۆت دەنووسرێ، وە ئەوەی دەرخواردی منداڵ و هاوسەرو خزمەتکارەکەتی دەدەی، هەمووی بە خێر بۆت دەنووسرێ (مادام حەڵاڵ بێ).

١٦٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: خَيْرُ الصَّدَقَةِ مَا بَقَّى غِنًى، وَالْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ، تَقُولُ امْرَأَتُكَ: أَنْفِقْ عَلَيَّ أَوْ طَلِّقْنِي، وَيَقُولُ مَمْلُوكُكَ: أَنْفِقْ عَلَيَّ أَوْ بِعْنِي، وَيَقُولُ وَلَدُكَ: إِلَى مَنْ تَكِلُنَا»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین خێرکردن ئەوەیە هەندێك لە ماڵەکە بمێنێتەوە (هەمووی نەبەخشرێ و خاوەنەکەی) بە دەوڵەمەندی بهێڵێتەوە، ئەو دەستەی بەرزە (کە بریتیە لە دەستی بەخشەر) باشترە لەو دەستەی کە نزمە (کە بریتیە لە دەستی وەرگر)، (بەخشین) لەو کەسەوە دەستپێبکە کە تۆ خەرجیان دەکێشی، هاوسەرەکەت دەڵێ: خەرجیم دابین بکە، یان لێم جیابەرەوە، خزمەتکارەکەت دەڵێ: خەرجیم دابین بکە، یان بمفرۆشە، منداڵەکەت دەڵێ: دەماندەیە دەست کێ؟ (واتە: ئەگەر خەرجیان نەکێشی ئەوە قسەو حەقیقەتی حاڵیانە).

١٦٥- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِصَدَقَةٍ، فَقَالَ رَجُلٌ: عِنْدِي دِينَارٌ، قَالَ: «أَنْفِقْهُ عَلَى نَفْسِكَ»، قَالَ: عِنْدِي آخَرُ، قَالَ: «أَنْفِقْهُ عَلَى زَوْجَتِكَ» قَالَ: عِنْدِي آخَرُ، قَالَ: «أَنْفِقْهُ عَلَى خَادِمِكَ، ثُمَّ أَنْتَ أَبْصَرُ»»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە خێرو بەخشین کرد، جا پیاوێك گوتی: من دینارێکم هەیە (بۆ بەخشین، پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بۆ خۆت خەرجی

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٤٥٢).

(٢) صحيح: دون زيادة: «تقول امرأتك: ... » فهي مدرجة «الإرواء» (٨٣٤): [البخاري: ٩٦- كتاب النفقات، ٢- باب: وجوب النفقة على الأهل والعيال].

(٣) حسن: «صحيح أبي داود» (١٤٨٤)، «الإرواء» (٨٩٥): [النسائي: ٢٣- كتاب الزكاة، ٥٣ ٥٤- باب: الصدقة على ظهر غنى].

بكە، گوتی: دینارێكی دیكەشم هەیە، فەرمووی: بۆ ماڵ و منداڵت خەرجی بكە، گوتی: دینارێكی دیكەشم هەیە، فەرمووی: بۆ خزمەتكارەكەت خەرجی بكە، پاشان چاوكراوەبە (بزانە كێ شایستەی ئەوەیە پێی ببەخشیت، لە خزم و دراوسێ و دۆست و هاوەڵانت).

## دەربارەی: كاتێك كەسێك پێی ناخۆشبوو لەگەڵ خزمەتكارەكەی بخوات

١٦٦- «عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ سَمِعَ رَجُلاً يَسْأَلُ جَابِراً (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ خَادِمِ الرَّجُلِ، إِذَا كَفَاهُ الْمَشَقَّةَ وَالْحَرَّ، أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَدْعُوهُ؟ قَالَ: «نَعَمْ، فَإِنْ كَرِهَ أَحَدُكُمْ أَنْ يَطْعَمَ مَعَهُ فَلْيُطْعِمْهُ أُكْلَةً فِي يَدِهِ»»[١].

واتە: ئەبو زوبەیر دەگێڕێتەوە كە گوێی لە پیاوێك بووە پرسیاری لە جابر (خوا لێی ڕازی بێ) دەكرد لەبارەی خزمەتكار، كاتێك نارەحەتی و گەرمای لەسەر لادەبات (واتە: خزمەتی دەكات و گوێڕایەڵە)، ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیكردوە كە بانگی بكات (بۆ خواردن لەگەڵ خۆی)؟ گوتی: بەڵێ، جا ئەگەر یەكێك لە ئێوە پێی ناخۆشبوو خواردنی لەگەڵدا بخوات (لەبەر هەر هۆكارێك)، ئەوە با خواردنەكەی بخاتە دەستی (تا بۆ خۆی لە شوێنێكی دیكە بیخوات).

## دەربارەی: كۆیلەو خزمەتكار ئەو خواردنە دەخوات كە خاوەن ماڵ دەیخوات

١٦٧- «عَنِ الْفَضْلِ بْنِ مُبَشِّرٍ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُوصِي بِالْمَمْلُوكِينَ خَيْراً، وَيَقُولُ: «أَطْعِمُوهُمْ مِمَّا تَأْكُلُونَ، وَأَلْبِسُوهُمْ مِنْ لَبُوسِكُمْ، وَلاَ تُعَذِّبُوا خَلْقَ اللَّهِ»»[٢].

واتە: فەزڵی كوڕی موبەشیر دەڵێ: گوێم لە جابری كوڕی عەبدوڵڵا بوو (خوا لێیان ڕازی بێ) دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ وەسێتی بۆ خەڵك دەكرد لەگەڵ خزمەتكارو كۆیلەكانیان باشبن، وە دەیفەرموو: لەو خواردنەی خۆتان دەیخۆن دەرخواردیان بدەن، وە لەو پۆشاكەی دەیپۆشن پۆشتەیان بكەن، وە دروستكراوی خوا سزا مەدەن.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٣٩٩، ٢٥٦٩).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٧٤٠).

## دەربارەی: ئایا خزمەتكار لەگەڵ خاوەن ماڵ دادەنیشێ كاتێ نان دەخوات؟

١٦٨- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا جَاءَ أَحَدَكُمْ خَادِمُهُ بِطَعَامِهِ فَلْيُجْلِسْهُ، فَإِنْ لَمْ يَقْبَلْ فَلْيُنَاوِلْهُ مِنْهُ»»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر یەكێك لە ئێوە خزمەتكارەكەی بە خواردنەوە هاتە لای، با لەگەڵ خۆی دایبنیشێنی، جا ئەگەر (خزمەتكارەكە) قبووڵی نەكرد، با لە خواردنەكەی پێبدات.**

١٦٩- «عَنِ ابْنِ أَبِي مُلَيْكَةَ قَالَ: قَالَ أَبُو مَحْذُورَةَ: كُنْتُ جَالِسَاً عِنْدَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، إِذْ جَاءَ صَفْوَانُ بْنُ أُمَيَّةَ بِجَفْنَةٍ يَحْمِلُهَا نَفَرٌ فِي عَبَاءَةٍ، فَوَضَعُوهَا بَيْنَ يَدَيْ عُمَرَ، فَدَعَا عُمَرُ نَاسَاً مَسَاكِينَ وَأَرِقَّاءَ مِنْ أَرِقَّاءِ النَّاسِ حَوْلَهُ، فَأَكَلُوا مَعَهُ، ثُمَّ قَالَ عِنْدَ ذَلِكَ: فَعَلَ اللَّهُ بِقَوْمٍ أَوْ قَالَ: لَحَا اللَّهُ قَوْمَاً يَرْغَبُونَ عَنْ أَرِقَّائِهِمْ أَنْ يَأْكُلُوا مَعَهُمْ، فَقَالَ صَفْوَانُ: أَمَا وَاللَّهِ، مَا نَرْغَبُ عَنْهُمْ، وَلَكِنَّا نَسْتَأْثِرُ عَلَيْهِمْ، لاَ نَجْدُ وَاللَّهِ مِنَ الطَّعَامِ الطَّيِّبِ مَا نَأْكُلُ وَنُطْعِمُهُمْ»[٢].

**واتە: ئیبنو ئەبی مولەیكە دەڵێ: ئەبو مەحزورە گوتی: لە لای عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) دانیشتبووم، لە ناكاو صەفوانی كوڕی ئومەییە بە قاپێكەوە هات، چەند كەسێك قاپەكەیان بە عەبایەك هەڵگرتبوو، لە بەردەمی عومەر دایاننا، عومەریش بانگی كۆمەڵێك خەڵكی هەژارو كۆیلەی كرد كە لە دەورەی بوون، لەگەڵیدا خواردیان، پاشان لەو كاتەدا گوتی: خوا ئاوا بكات لە خەڵكانێك ـ یان گوتی: خوا ڕووی خەڵكانێك ڕیسوا بكات ـ كە پێیان ناخۆشەو ناهێڵن بەندەو خزمەتكارەكانیان لەگەڵیان نان بخۆن، صەفوان گوتی: سوێند بە خوا پێمان ناخۆش نیە، بەڵام ئێمە خۆمان پێشدەخەین (لەوەندە خواردنەی هەمانە)، سوێند بە خوا خواردنی چاكی وامان دەستناكەوێت خۆمان بیخۆین و بیدەین بە ئەوانیش (بەڵكو خواردنە چاكەكە ئەگەر بەشی خۆشمان بكات باشە، بۆیە ئەویان بە خۆمان دەخۆین و خواردنی دیكە بەوان دەدەین).**

## دەربارەی: كاتێك كۆیلە باش و گوێڕایەڵ بوو بۆ گەورەو خاوەن ماڵەكەی

١٧٠- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا نَصَحَ لِسَيِّدِهِ، وَأَحْسَنَ عِبَادَةَ رَبِّهِ، لَهُ أَجْرُهُ مَرَّتَيْنِ»»[٣].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٩٢٧): [البخاري: ٤٩- كتاب العتق، ١٨- باب: إذا أتاه خادمه بطعام. مسلم: ٢٧- كتاب الأيمان، ١٠ إطعام المملوك مما يأكل، ح ٤٢].

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٦١٦): [البخاري: ٤٩- كتاب العتق، ١٦- باب: العبد إذا أحسن عبادة ربه ونصح سيده.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێك کۆیلە دڵسۆز بوو بۆ گەورەکەی و، بە جوانی پەروەردگاری پەرست، ئەوە دوو جار پاداشت وەردەگرێ (کە بریتیە لە پاداشتی هەردوو گوێڕایەڵیەکە).

١٧١- «عَنْ عَامِرٍ: قَالَ حَدَّثَنِي أَبُو بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: ثَلَاثَةٌ لَهُمْ أَجْرَانِ: رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمَنَ بِنَبِيِّهِ، وَآمَنَ بِمُحَمَّدٍ ﷺ فَلَهُ أَجْرَانِ. وَالْعَبْدُ الْمَمْلُوكُ إِذَا أَدَّى حَقَّ اللَّهِ وَحَقَّ مَوَالِيهِ. وَرَجُلٌ كَانَتْ عِنْدَهُ أَمَةٌ يَطَأُهَا، فَأَدَّبَهَا فَأَحْسَنَ تَأْدِيبَهَا، وَعَلَّمَهَا فَأَحْسَنَ تَعْلِيمَهَا، ثُمَّ أَعْتَقَهَا فَتَزَوَّجَهَا، فَلَهُ أَجْرَانِ»[1].

واتە: عامر دەڵێ: ئەبو بوردە لە باوکیەوە (خوا لێی ڕازی بێ) بۆی گێڕامەوە گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: سێ جۆرە کەس دووجار پاداشتیان هەیە (لای خوا): (یەکەمیان): پیاوێك ئەهلی کتێب بێ، بڕوای بە پێغەمبەری خۆی هێنابێ، پاشان بڕوای بە موحەممەدیش ﷺ هێنابێ، ئەوە دوو پاداشتی هەیە، (دووەمیان): کۆیلەیەك کاتێك مافی خواو مافی گەورەکانی جێبەجێ بکات، (سێیەمیان): پیاوێك کەنیزەکێکی هەبێ و سەرجێیی لەگەڵ بکات، بە جوانترین شێوە پەروەردەی بکات و فێری بکات، پاشان ڕزگاری بکات و هاوسەرگیری لەگەڵدا بکات، ئەوەش دوو پاداشتی بۆ هەیە.

١٧٢- «عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمَمْلُوكُ الَّذِي يُحْسِنُ عِبَادَةَ رَبِّهِ، وَيُؤَدِّي إِلَى سَيِّدِهِ الَّذِي فُرِضَ، الطَّاعَةُ وَالنَّصِيحَةُ، لَهُ أَجْرَانِ»»[2].

واتە: ئەبو مووسا (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کۆیلەو خزمەتکارەی پەروەردگاری چاك بپەرستێ، وە پێداویستیەکانی گەورەکەی بە گوێڕایەڵی و دڵسۆزیەوە جێبەجێ بکات کە لەسەری پێویست کراوە، ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەن.

١٧٣- «عَنْ أَبَا بُرْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: الْمَمْلُوكُ لَهُ أَجْرَانِ إِذَا أَدَّى حَقَّ اللَّهِ فِي عِبَادَتِهِ، (أَوْ قَالَ): فِي حُسْنِ عِبَادَتِهِ وَحَقَّ مَلِيكِهِ الَّذِي يَمْلِكُهُ»[3].

واتە: ئەبو بوردە لە باوکی (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کۆیلە دوو پاداشتی هەیە، ئەگەر مافی خوایدا لە پەرستنی (یان گوتی): لە جوان پەرستنی، هەروەها مافی ئەو خاوەنەشیدا کە دەبێتە خاوەنی.

---

مسلم: ٢٧- كتاب الأيمان، ١١- باب: ثواب العبد وأجره إذا نصح لسيده ح ٤٣].

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١١٥٣): [البخاري: ٥٦- كتاب الجهاد، ١٤٥- باب: فضل من أسلم من أهل الكتابين. مسلم: ١- كتاب الإيمان، ٦٨- باب: وجوب الإيمان برسالة نبينا محمد ﷺ ح ٢٤٠].

(٢) صحيح: [البخاري: ٤٩- كتاب العتق، ١٧- باب: كراهية التطاول على الرقيق].

(٣) صحيح.

## دەربارەی: کۆیلەو خزمەتکار چاودێرە

١٧٤- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «كُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْؤولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، فَالأَمِيرُ الَّذِي عَلَى النَّاسِ رَاعٍ، وَهُوَ مَسْؤولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ، وَهُوَ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَعَبْدُ الرَّجُلِ رَاعٍ عَلَى مَالِ سَيِّدِهِ، وَهُوَ مَسْؤُولٌ عَنْهُ، أَلَا كُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ»»[1].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەمووتان چاودێرن، وە هەمووتان لێپرسراون (لە ڕۆژی دواییدا) دەربارەی ئەوانەی لە ژێر دەستتانن، ئەو کەسەی سەرکردەو ئەمیرە بەسەر خەڵکیەوە ئەوە چاودێرەو لێپرسراوەو پرسیاری لێ دەکرێت، دەربارەی ژێردەستەکانی (کە هاوڵاتیانن)، وە پیاو چاودێرە بەسەر ئەندامانی خێزانەکەی و لێپرسراوە دەربارەی ژێردەستەکانی، وە بەندە چاودێرە بەسەر موڵك و ماڵی گەورەکەی و لێپرسراوە دەربارەی، ئاگاداربن هەمووتان چاودێرن و هەمووشتان لێپرسراون لەوانەی لە ژێر دەستتانە.**

## دەربارەی: ئەو کەسەی حەز دەکات کۆیلە بووایە

١٧٥- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْعَبْدُ الْمُسْلِمُ إِذَا أَدَّى حَقَّ اللَّهِ وَحَقَّ سَيِّدِهِ، لَهُ أَجْرَانِ»، وَالَّذِي نَفْسُ أَبِي هُرَيْرَةَ بِيَدِهِ، لَوْلاَ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَالْحَجُّ، وَبِرُّ أُمِّي، لَأَحْبَبْتُ أَنْ أَمُوتَ مَمْلُوكًا»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کۆیلەی مسوڵمان ئەگەر مافی خواو مافی گەورەکەی بدات، دوو پاداشتی بۆ هەن، وە سوێند بەو کەسەی گیانی ئەبو هورەیرەی بە دەستە، ئەگەر تێکۆشان لە پێناوی خوا نەبووایەو، حەج کردن نەبووایەو، چاکەکردن لەگەڵ دایکم نەبووایە، حەزم دەکرد بە کۆیلەیی بمردبام (لەبەر زۆری پاداشت، بەڵام ئەو پاداشتانەی ئێستا پێی دەگەم زیاترە لەو پاداشتەو بەدیلەکەم لەبەر دەستە).**

---

(١) صحيح: «غاية المرام» (٢٦٨)، «صحيح أبي داود» (٢٦٠٠): [البخاري: ١١- كتاب الجمعة، ١٤١- الجمعة في القرى والمدن. مسلم: ٣٣- كتاب الإمارة، ٥- باب: فضيلة الإمام العادل، ح ٢٠].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨٧٧): [البخاري: ٤٩- كتاب العتق، ١٦- باب: العبد إذا أحسن عبادة وبه ونصح سيده. مسلم: ٢٧- كتاب الأيمان، ١١- باب: ثواب العبد وأجره إذا نصح لسيده، ح ٤٤].

## دەربارەی: (فەرموودەی) مەڵێن: بەندەکەم

١٧٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ: عَبْدِي، أَمَتِي، كُلُّكُمْ عَبِيدُ اللَّهِ، وَكُلُّ نِسَائِكُمْ إِمَاءُ اللَّهِ، وَلْيَقُلْ: غُلاَمِي، جَارِيَتِي، وَفَتَايَ، وَفَتَاتِي»»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: با یەکێك لە ئێوە نەڵێ: (عَبْدِي، أَمَتِي) (کە مانای بەندەی ژن و پیاو دەگەیەنێ)، هەموو پیاوەکانتان بەندەی خوان، وە هەموو ئافرەتەکانتان بەندەی خوان، بەڵکو با، بڵێ: (غُلاَمي، جَارِيَتي، فَتَايَ، فَتَاتي) کە مانای: کوڕەکەم و کچەکەم دەگەیەنێ.

## دەربارەی: ئایا کۆیلەو خزمەتکار بە خاوەنەکەی دەڵێ: گەورەم؟

١٧٧- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: عَبْدِي وَأَمَتِي، وَلاَ يَقُولَنَّ الْمَمْلُوكُ: رَبِّي وَرَبَّتِي، وَلْيَقُلْ: فَتَايَ وَفَتَاتِي، وَسَيِّدِي وَسَيِّدَتِي، كُلُّكُمْ مَمْلُوكُونَ، وَالرَّبُّ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ»»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: با یەکێك لە ئێوە نەڵێ: (عَبدي، أَمَتِي) کە مانای بەندە دەگەیەنێ بۆ ژن و پیاو، وە با هیچ کۆیلەیەکیش بە خاوەنەکەی نەڵێ: (رَبِّي وَرَبَّتِي) کە مانای خاوەن و سەرپەرشتیار دەگەیەنێ، (بەڵام وشەکە بۆ خواش بەکاردێ، بۆیە با وا نەڵێ) بەڵکو با (گەورەکە بە خزمەتکارەکانی) بڵێ: کوڕەکەم، کچەکەم، (خزمەتکارەکەش بە گەورەکەی بڵێ): گەورەم، (چونکە) ئێوە هەمووتان بەندەی خوان، وە پەروەردگاریش خوای زاڵی پایەدارە.

١٧٨- «عَنْ مُطَرِّفٍ قَالَ: قَالَ أَبِي (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): انْطَلَقْتُ فِي وَفْدِ بَنِي عَامِرٍ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالُوا: أَنْتَ سَيِّدُنَا، قَالَ: «السَّيِّدُ اللَّهُ»، قَالُوا: وَأَفْضَلُنَا فَضْلاً، وَأَعْظَمُنَا طَوْلاً، قَالَ: فَقَالَ: «قُولُوا بِقَوْلِكُمْ، وَلاَ يَسْتَجْرِيَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ»»[3].

واتە: موتەڕڕیف دەڵێ: باوکم (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: من لەگەڵ وەفدی بەنی عامرِ چوومە لای پێغەمبەر ﷺ جا (خەڵکەکە بە پێغەمبەریان) گوت: تۆ گەورەی ئێمەی، فەرمووی: گەورە

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨٠٣): [البخاري: كتاب العتق، ١٧- باب كراهية التطاول على الرقيق. مسلم: ٤٠- كتاب الألفاظ من الأدب، ٣- باب حكم إطلاق لفظة العبد والأمة، ح ١٣- ١٥].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨٠٣).

(٣) صحيح: «إصلاح المساجد» (١٣٩): [أبو داود: ٤٠- كتاب الدب، ٩- باب: في كراهية التمادح].

هەر خوایە، گوتیان: تۆ لە هەموومان پایەدارتری، وە لە هەمووومان خاوەن منەتتری، (ئنجا باوکم) گوتی: (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: وەکو خەڵکی خۆتان بانگم بکەن و ناوم بێنن، (خوا ناوی ناوم رسول، نەبی، ئێوەش بەوە ناوم بێنن)، با شەیتان نەتانکاتە ڕاسپاردەی خۆی (بەوەی بچن ناوێکم بۆ دابنێن کە تەنها لە پەروەردگار بوەشێتەوەو خۆتان تووشی تاوان بکەن).

## دەربارەی: پیاو چاودێرە لە ماڵی خۆی

١٧٩- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «كُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْؤولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، فَالْأَمِيرُ رَاعٍ وَهُوَ مَسْؤُولٌ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِهِ وَهُوَ مَسْؤُولٌ، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ عَلَى بَيْتِ زَوْجِهَا وَهِيَ مَسْؤُولَةٌ، أَلَا وَكُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ»»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەمووتان چاودێرن، وە هەمووشتان لێپرسراون (لە ڕۆژی دواییدا) دەربارەی ژێر دەستەکانتان، ئەو کەسەی سەرکردەو ئەمیرە لێپرسراوەو پرسیاری لێ دەکرێ دەربارەی ژێردەستەکانی (کە هاوڵاتیانن)، وە پیاو چاودێرە بەسەر ئەندامانی خێزانەکەی و لێپرسراوە، وە ئافرەت چاودێرە بەسەر ماڵی مێردی و لێپرسراوە، ئاگاداربن هەمووتان چاودێرن و هەمووشتان لێپرسراون لەوانەی لە ژێر دەستانە.

١٨٠- «عَنْ أَبِي سُلَيْمَانَ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَيْنَا النَّبِيَّ ﷺ **وَنَحْنُ شَبَبَةٌ** مُتَقَارِبُونَ، فَأَقَمْنَا عِنْدَهُ عِشْرِينَ لَيْلَةً، فَظَنَّ أَنَّا اشْتَهَيْنَا أَهْلِينَا، فَسَأَلَنَا عَنْ مَنْ **تَرَكْنَا فِي أَهْلِينَا؟** فَأَخْبَرْنَاهُ «وَكَانَ رَفِيقاً رَحِيماً» فَقَالَ: «ارْجِعُوا إِلَى أَهْلِيكُمْ فَعَلِّمُوهُمْ وَمُرُوهُمْ، وَصَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي، فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ، فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أَحَدُكُمْ، وَلْيَؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ»»[٢].

واتە: باوکی سولەیمان کە دەکاتە مالیکی کوڕی حوەیریث (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هاتینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئێمە کۆمەڵە گەنجێکی نزیکەی هاوتەمەنی یەکدی بووین، بیست شەو لە لای ماینەوە، جا هەستی کرد ئێمە حەز دەکەین بچینەوە بۆ لای خێزانەکانمان، جا پرسیاری لێ کردین دەربارەی ئەوانەی بە جێمان هێشتوون لە کەسوکارمان، ئێمەش هەواڵمان پێدا، «پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی زۆر بەبەزەیی و دڵ نەرم بوو»، فەرمووی: بگەڕێنەوە بۆ نێو کەسوکارتان، لەلایان بمێننەوەو فێریان بکەن فەرمانیان پێ بکەن (بە شتە شەرعیەکان)، نوێژ بکەن وەك چۆن من دەبینن نوێژ دەکەم، جا ئەگەر کاتی نوێژ هات با یەکێکتان بانگ بدات، با گەورەترینیشتان پێشنوێژیتان بۆ بکات.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح: «الإرواء» (٢٠٣): [البخاري: ١٠- كتاب الأذان، ١٨- بالأذان للمسافر إذا كانوا جماعة،: ٥- كتاب المساجد، ٥٣- باب: من أحق بالإمامة؟، ح ٢٩٢].

## دەربارەی: ئافرەت چاودێرە (لە ماڵی پیاوەکەی)

١٨١- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «كُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، الْإِمَامُ رَاعٍ وَهُوَ مَسْؤُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ فِي أَهْلِهِ، وَالْمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ فِي بَيْتِ زَوْجِهَا، وَالْخَادِمُ فِي مَالِ سَيِّدِهِ» سَمِعْتُ هَؤُلَاءِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ وَأَحْسَبُ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «وَالرَّجُلُ فِي مَالِ أَبِيهِ»»[١].

**واتە:** ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیستوویەتی دەیفەرموو: هەمووتان چاودێرن، وە هەمووتان لێپرسراون دەربارەی ژێردەستەکەی، پێشەوا چاودێرەو لێپرسراوە دەربارەی ژێردەستەکانی، پیاویش چاودێرە لە نێو ماڵ و منداڵەکەی، ئافرەتیش چاودێرە لە ماڵی مێردەکەی، خزمەتکاریش (چاودێرە) لە ماڵی گەورەکەی، (ئیبنو عومەر دەڵێ): هەموو ئەوانەم لە پێغەمبەر ﷺ بیست، وە پێم وابێ پێغەمبەر ﷺ ئەوەشی فەرموو: پیاویش چاودێرو لێپرسراوە لە ماڵی باوکی.

## دەربارەی: هەر کەسێك چاکەی لەگەڵ کرا، با پاداشتی چاکەکار بداتەوە

١٨٢- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ صُنِعَ إِلَيْهِ مَعْرُوفٌ فَلْيُجزِهِ، فَإِنْ لَمْ يَجِد مَا يُجْزِيهِ فَلْيُثْنِ عَلَيْهِ، فَإِنَّهُ إِذَا أَثْنَى فَقَدْ شَكَرَهُ، وَإِنْ كَتَمَهُ فَقَدْ كَفَرَهُ، وَمَنْ تَحَلَّى بِمَا لَم يُعْطَ فَكَأَنَّمَا لَبِسَ ثَوبَيْ زُورٍ»»[٢].

**واتە:** جابری کوڕی عەبدوڵڵای ئەنصاریی (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك چاکەی لەگەڵ کرا، با پاداشتی (چاکەکار) بداتەوە، جا ئەگەر هیچی دەست نەکەوت پاداشتی پێبداتەوە، با ستایشی بکاو مەدحی بکات، چونکە ئەگەر ستایشی بکات ئەوە سوپاسی کردوە، وە ئەگەر بیشارێتەوەو باسی نەکات ئەوە سپڵەیی بەرانبەر کردوە، وە هەر کەسێك خۆی وا پێشان بدات شتێکی بەخشیوەو نەشی بەخشی بێ، وەك ئەوە وایە دوو پارچە لە پۆشاکی درۆی پۆشیبێ. (چونکە کارەکەی دوو درۆی تیایە، درۆیەکیان خۆی کردۆتە بەخشەر، درۆیەکەی دیکەش ئەوەیە کەسێکی کردۆتە پێبەخشراوی خۆی، کە هیچیان حەقیقەتیان نیە).

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح: «تخريج الترغيب» (٢/ ٥٥)، «السلسلة الصحيحة» (٦١٧): [الترمذي: ٢٥- كتاب البر والصلة ٨٧- باب: ما جاء في المتشبع بما لم يعطه].

١٨٣- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنِ اسْتَعَاذَ بِاللَّهِ فَأَعِيذُوهُ، وَمَنْ سَأَلَ بِاللَّهِ فَأَعْطُوهُ، وَمَنْ أَتَى إِلَيْكُمْ مَعْرُوفاً فَكَافِئُوهُ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فَادْعُوا لَهُ، حَتَّى يَعْلَمَ أَنْ قَدْ كَافَأْتُمُوهُ»»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك پەنای بە خوا گرت (گوتی: لەبەر خاتری خوا پەنام بدەن) ئەوە پەنای بدەن، وە هەر کەسێك بە ناوی خوا داوای کرد (گوتی: موحتاجم و لەبەر خوا پێم بدەن) ئەوە پێی بدەن، وە هەر کەسێك چاکەی لەگەڵدا کردن ئەوە پاداشتی بدەنەوە، جا ئەگەر هیچتان نەبوو (تا پاداشتی پێ بدەنەوە) ئەوە دوعای بۆ بکەن، تا بزانێ کە پاداشتتان داوەتەوە.**

تێبینی: **مەدح کردن و پاداشت دانەوەی کەسی چاکەکار بۆ ئەوەیە لە چاکەکردن بەردەوام بێ، وە خەڵك هان بدرێ لەسەر بەردەوام بوون لە خێرو چاکەکاریی.**

## دەربارەی: کەسێك نەیتوانی پاداشتی (چاکەکار) بداتەوە، با دوعای بۆ بکات

١٨٤- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ الْمُهَاجِرِينَ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ذَهَبَ الأَنْصَارُ بِالأَجْرِ كُلِّهِ؟ قَالَ: «لاَ، مَا دَعَوْتُمُ اللَّهَ لَهُمْ، وَأَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِمْ بِهِ»»[٢].

**واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: کۆچکەرەکان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پشتیوانەکان هەموو پاداشتەکانیان بردن (ئێمەیان حەواندەوەو پێیان بەخشین، جێگایان بۆ کردینەوە)، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: نەخێر، مادام ئێوە دوعایان بۆ دەکەن، وە بە دوعاکانتان مەدحیان دەکەن (ئەوە دوعاکانی ئێوە دەبێتە مایەی ئەوەی پاداشتەکانیان بۆ ئێوەش بێ، بێ ئەوەی لە پاداشتی ئەوان کەم بێتەوە).**

## دەربارەی: ئەو کەسەی سوپاسی خەڵك نەکات

١٨٥- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَشْكُرُ اللَّهُ مَنْ لاَ يَشْكُرُ النَّاسَ»»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: سوپاسی خوا ناکات، ئەو کەسەی سوپاسی خەڵك نەکات.**

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٥٤): [أبو داود: ٩- كتاب الزكاة ٣٨- باب: عطية من سأل بالله].

(٢) صحيح: «التعليق الرغيب» (٢/ ٥٦): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ١١- باب: في شكر المعروف. الترمذي: ٣٥- كتاب القيامة، ٤٤- باب: حدثنا الحسين بن الحسن].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٤١٦): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ١١- باب: في شكر المعروف. الترمذي: ٢٥- كتاب البر والصلة، ٣٥- باب ما جاء في الشكر لمن أحسن إليك. «المسند» للإمام أحمد: رقم ٧٤٩٥، ٧٩٢٦، ٨٠٠٦، ثم في ٢: الطبعة الأولى].

١٨٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ اللَّهُ تَعَالَى لِلنَّفَسِ: اخْرُجِي، قَالَتْ: لاَ أَخْرُجُ إِلاَّ كَارِهَةً»»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: خوای بەرز بە نەفسی فەرمووی: بڕۆ دەرەوە (لە جەستە لە کاتی مردن)، گوتی: ناچمە دەرەوە تەنها بە پێناخۆش بوون نەبێ.

(واتە: ڕووحی مرۆڤ پێی ناخۆشە بچێتە دەرەوە، چونکە هۆگری جەستە بووە، بەڵام بە پێناخۆشیش بێ هەر دەچێتە دەرەوەو فەرمانی خوا بەجێ دەگەیەنێ، بەمەش ئازارێکی زۆر دەبەخشێ).

## دەربارەی: هاوکاری کردنی برای (مسوڵمان)

١٨٧- «عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قِيلَ: أَيُّ الأَعْمَالِ خَيْرٌ؟ قَالَ: «إِيمَانٌ بِاللَّهِ، وَجِهَادٌ فِي سَبِيلِهِ»، قِيلَ: فَأَيُّ الرِّقَابِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «أَغْلاهَا ثَمَناً، وَأَنْفَسُهَا عِنْدَ أَهْلِهَا»، قَالَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ لَمْ أَسْتَطِعْ بَعْضَ الْعَمَلِ؟ قَالَ: «فَتُعِينُ ضَائِعاً، أَوْ تَصْنَعُ لِأَخْرَقَ»، قَالَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ ضَعُفْتُ؟ قَالَ: «تَدَعُ النَّاسَ مِنَ الشَّرِّ، فَإِنَّهَا صَدَقَةٌ تَصَدَّقُ بِهَا عَلَى نَفْسِكَ»»[2].

واتە: ئەبو زەڕ (خوا لێی ڕازی بێ) وتویەتی، پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا: کام کردەوە باشترینە؟ فەرمووی: بڕوا بوون بە خواو تێکۆشان لە پێناویدا، پاشان گوترا: ئەدی چ جۆرە ئازاد کردنێك (ی کۆیلە) باشترینە؟ فەرمووی: ئەوەی کە نرخی گرانەو لە لای خاوەنەکەی بە بەهایە، (جا ئەو کەسەی پرسیاری دەکرد) گوتی: ئەدی ئەگەر نەمتوانی یەك لەم کردەوانە ئەنجام بدەم، فەرمووی: یارمەتی کەسێکی هەژار بدە، یان شتێك بۆ کەسێك دروست بکە کە پێویستیەتی و، خۆی ناتوانێ دروستی بکات، گوتی: ئەدی ئەگەر بێ توانا بووم (ئەوەشم پێ نەکرا)؟ فەرمووی: با خەڵکی لە شەڕو خراپەت دوور بن، چونکە ئەویش چاکەیەکە بۆ خودی خۆت ئەنجامی دەدەی.

## دەربارەی: چاکەکاران لە دونیا، چاکەکارانن لە دواڕۆژدا

١٨٨- «عَنْ قَبِيصَةَ بْنَ بُرْمَةَ الأَسَدِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «أَهْلُ الْمَعْرُوفِ فِي الدُّنْيَا هُمْ أَهْلُ الْمَعْرُوفِ فِي الآخِرَةِ، وَأَهْلُ الْمُنْكَرِ فِي الدُّنْيَا هُمْ أَهْلُ الْمُنْكَرِ فِي الآخِرَةِ»»[3].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٠١٣).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٧٥): [البخاري: ٤٩- كتاب العتق، ٢- باب: أي الرقاب أفضل؟ مسلم: ١- كتاب الإيمان، ٣٤- باب: كون الإيمان بالله أفضل الأعمال، ح ١٣٦].

(٣) صحيح لغيره: «الروض النضير» (١٠٣١- ١٠٨٢): [قبيصة بن برمة الأسدي ليس له شيء في الكتب الستة].

واتە: قەبیزەی کوڕی بورمەی ئەسەدی (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: من لەلای پێغەمبەر ﷺ بووم و گوێم لێ بوو دەیفەرموو: چاکەکاران لە دونیا، چاکەکارانن لە دواڕۆژدا، وە خراپەکاران لە دونیا، خراپەکانن لە دواڕۆژدا (واتە: مەدح و زەمی دونیا لە دواڕۆژ کاری خۆی دەکات).

١٨٩- «عَنْ سَلْمَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ قَالَ: «إِنَّ أَهْلَ الْمَعْرُوفِ فِي الدُّنْيَا هُمْ أَهْلُ الْمَعْرُوفِ فِي الْآخِرَةِ»»[١].

واتە: لە سەلمانەوە (خوا لێی ڕازی بێ) گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: چاکەکاران لە دونیا، چاکەکارانن لە دواڕۆژدا.

## دەربارەی: بە دڵنیایی هەموو چاکەیەك پاداشتی هەیە

١٩٠- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ»»[٢].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: هەموو چاکەیەك خێرەو پاداشتی لەسەرە.

١٩١- «عَنْ أَبِي مُوسى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ صَدَقَةٌ»، قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَجِدْ؟ قَالَ: «فَيَعْتَمِلُ بِيَدَيْهِ، فَيَنْفَعُ نَفْسَهُ، وَيَتَصَدَّقُ»، قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ، أَوْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قَالَ: «فَيُعِينُ ذَا الْحَاجَةِ الْمَلْهُوفَ»، قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قَالَ: «فَيَأْمُرُ بِالْخَيْرِ، أَوْ يَأْمُرُ بِالْمَعْرُوفِ»، قَالُوا: فَإِنْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قَالَ: «فَيُمْسِكُ عَنِ الشَّرِّ، فَإِنَّهُ لَهُ صَدَقَةٌ»»[٣].

واتە: ئەبو مووسا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەموو مسوڵمانێك چاکەیەکی لەسەر پێویستە، گوتیان: ئەگەر هیچی دەست نەکەوت؟ فەرمووی: بە دەستەکانی خۆی کار دەکات، وە سوود بە خۆی دەگەیەنێ و خێر دەکات، گوتیان: ئەگەر نەیتوانی، یان ئەگەر نەیکرد؟ فەرمووی: یارمەتی خاوەن پێداویستیەکی بێ چارە دەدات، گوتیان: ئەگەر ئەوەی نەکرد؟ فەرمووی: با فەرمان بە چاکە بکات، گوتیان: ئەگەر ئەوەشی نەکرد، فەرمووی: با خراپەی خۆی بگرێتەوە، ئەمە بۆ ئەو خێرو صەدەقەو چاکەیە.

١٩٢- «عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: أَيُّ الْعَمَلِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «إِيمَانٌ بِاللَّهِ، وَجِهَادٌ فِي سَبِيلِهِ»، قَالَ: فَأَيُّ الرِّقَابِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «أَغْلَاهَا ثَمَناً، وَأَنْفَسُهَا عِنْدَ أَهْلِهَا»، قَالَ: أَرَأَيْتَ

---

(١) صحيح موقوفاً، وصحيح لغيره مرفوعاً، «الروض النضير» (١٠٣١- ١٠٨٢).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٠٤٠): [البخاري ٧٨- كتاب الأدب، ٣٣- باب: كل معروف صدقة- ويأتي بأتم منه ٣٠٤].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٧٣): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٣٣- باب: كل معروف صدقة. مسلم: ١٢- كتاب الزكاة، ١٦- باب: بيان أن اسم الصدقة يقع على كل نوع من المعروف، ح ٥٥].

إنْ لَمْ أَفْعَلْ؟ قَالَ: «تُعِينُ ضَائِعاً، أَوْ تَصْنَعُ لِأَخْرَقَ» ، قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ لَمْ أَفْعَلَ؟ قَالَ: «تَدَعُ النَّاسَ مِنَ الشَّرِّ، فَإِنَّهَا صَدَقَةٌ تَصَدَّقُ بِهَا عَنْ نَفْسِكَ»»[١].

**واتە: ئەبو زەڕ (خوا لێی ڕازی بێ)، پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، کام کردەوە باشترینە؟ فەرمووی: بڕوا بوون بە خواو تێکۆشان لە پێناویدا، پاشان گوتی: ئەدی چ جۆرە ئازاد کردنێکی کۆیلە باشترینە؟ فەرمووی: ئەوەی کە نرخی گرانەو لە لای خاوەنەکەی بە بەهایە، گوتی: ئەدی ئەگەر نەمتوانی (هیچ یەکێك) لەم کردەوانە ئەنجام بدەم؟ فەرمووی: یارمەتی کەسێکی هەژار بدە، یان حاجەتێك و شتێك بۆ کەسێك دروست بکە کە پێویستیەتی و ناتوانێ خۆی دروستی بکات، گوتی: ئەدی ئەگەر (نەمتوانی) ئەوە بکەم؟ فەرمووی: با خەڵکی لە شەڕو خراپەت دوور بن، چونکە ئەویش چاکەیەکە بۆ خودی خۆت ئەنجامی دەدەی.**

١٩٣- «عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ذَهَبَ أَهْلُ الدُّثُورِ بِالْأُجُورِ، يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّي، وَيَصُومُونَ كَمَا نَصُومُ، وَيَتَصَدَّقُونَ بِفُضُولِ أَمْوَالِهِمْ، قَالَ: «أَلَيْسَ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ مَا تَصَدَّقُونَ؟ إِنَّ بِكُلِّ تَسْبِيحَةٍ وَتَحْمِيدَةٍ صَدَقَةً، وَبُضْعُ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ»، قِيلَ: فِي شَهْوَتِهِ صَدَقَةٌ؟ قَالَ: «لَوْ وُضِعَ فِي الْحَرَامِ، أَلَيْسَ كَانَ عَلَيْهِ وِزْرٌ؟ ذَلِكَ إِنْ وَضَعَهَا فِي الْحَلَالِ كَانَ لَهُ أَجْرٌ»»[٢].

**واتە: ئەبو زەڕ (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەوڵەمەندەکان پاداشتەکانیان هەموو برد، نوێژ دەکەن، وەك چۆن ئێمە نوێژ دەکەین، ڕۆژوو دەگرن، وەك چۆن ئێمە ڕۆژوو دەگرین، وە خێرو چاکە دەکەن لەو زیادە ماڵەی هەیانە، (واتە: ئێمە ماڵ و سامانی زۆرمان نیە بیکەینە خێرو بگەینە پلەی ئەوان)، (پێغەمبەر ﷺ) پێی فەرموون: ئەدی ئەوە نیە خوا شتێکی بۆ داناون کە ببێتە خێرو صەدەقە بۆتان؟ بە گوتنی: هەر (سبحان اللّه) و (الحمدلله)یەك چاکەیەکتان بۆ دەنووسرێ، وە یەکێك لە ئێوە دەچێتە لای خێزانی خۆی پاداشتی هەیەو، بە چاکە بۆی دەنووسرێ، گوترا: لە ئارەزووی جێبەجێ کردنی پاداشتی هەیە؟! فەرمووی: ئەگەر ئەو ئارەزووەی لە حەڕامدا جێبەجێ بکات مەگەر گوناهی ناگاتێ؟ (ڕوونە وەڵامەکەی، کە بەڵێ گوناهبارە)، فەرمووی: جا ئەگەر لە حەڵاڵیشدا جێبەجێی بکات پاداشتی بۆ هەیە.**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٤٥٤): [مسلم: ١٢-كتاب الزكاة ١٦- باب: بيان أن اسم الصدقة يقع على كل نوع من المعروف، ح ٥٣].

## دەربارەی: لادانی ئازارو سەغڵەتیی

١٩٤- «عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الأَسْلَمِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ يُدْخِلُنِي الْجَنَّةَ، قَالَ: «أَمِطِ الْأَذَى عَنْ طَرِيقِ النَّاسِ»»[1].

**واتە: ئەبو بەرزەی ئەسلەمی (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێنماییم بکە بۆ کردەوەیەك بمخاتە بەهەشتەوە؟ فەرمووی: ئازار لە ڕێگەی خەڵکی لابدە (جا ڕێگەکە ڕێگەی حەقیقی بێ وەك شەقام، یانیش ڕێگەی مەجازی بێ وەك ڕێگەی بژیوو و ژیان).**

١٩٥- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَرَّ رَجُلٌ مُسْلِمٌ بِشَوْكٍ فِي الطَّرِيقِ، فَقَالَ: لَأُمِيطَنَّ هَذَا الشَّوْكَ، لاَ يَضُرُّ رَجُلاً مُسْلِمَاً، فَغُفِرَ لَهُ»»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: پیاوێك لە ڕێگەدا بە لای دڕکێکدا تێپەڕ بوو، گوتی: ئەم دڕکە لادەبەم بۆ ئەوەی هیچ مسوڵمانێك زیانی پێنەگات، جا بە هۆیەوە خوا لێی خۆش بوو.**

١٩٦- «عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عُرِضَتْ عَلَيَّ أَعْمَالُ أُمَّتِي، حَسَنُهَا وَسَيِّئُهَا، فَوَجَدْتُ فِي مَحَاسِنِ أَعْمَالِهَا أَنَّ الْأَذَى يُمَاطُ عَنِ الطَّرِيقِ، وَوَجَدْتُ فِي مَسَاوِئِ أَعْمَالِهَا: النُّخَاعَةَ فِي الْمَسْجِدِ لاَ تُدْفَنُ»»[3].

**واتە: ئەبو زەڕ (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کردەوەکانی ئۆممەتەکەمم پێشان درا، (کردەوە) باشەکان و خراپەکانیان، جا بینیم لە نێو کردەوە چاکەکانیان (یەکێکیان لە کردەوەکان بریتی بوو) لە لادانی ئازار لە ڕێگای خەڵك، وە لە نێو کردەوە خراپەکانیاندا (یەکێکیان بریتی بوو) لە بەڵغەم فڕێدان لە مزگەوت و نەشاردنەوەی.**

## دەربارەی: قسەی چاك

١٩٧- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ يَزِيدَ الْخَطْمِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ»»[4].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٥٥٨): [مسلم: ٤٥-كتاب البر والصلة والآداب، ٣٦-باب فضل إزالة الأذى عن الطريق، ح١٣١].

(٢) صحيح: التعليق الرغيب» (٣٦/٤): [البخاري: ١٠- كتاب الأذان، ٣٢- باب: فضل التهجير إلى الظهر. مسلم: كتاب البر والصلة والآداب، ٣٦- باب: فضل إزالة الأذى عن الطريق، ح ١٢٧].

(٣) صحيح: «التعليق الرغيب» (٣٤/٣): [مسلم: ٥- كتاب المساجد ومواضع الصلاة، ١٤- باب: النهي عن البصاق في المسجد، ح٥٧].

(٤) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٠٤٠)، مضى عن جابر.

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی یەزیدی خەتمی (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەموو چاكەكردنێك خێرەو پاداشتی لەسەرە.

١٩٨- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أُتِيَ بِالشَّيْءِ يَقُولُ: «اذْهَبُوا بِهِ إِلَى فُلاَنَةٍ، فَإِنَّهَا كَانَتْ صَدِيقَةَ خَدِيجَةَ، اذْهَبُوا بِهِ إِلَى بَيْتِ فُلاَنَةٍ، فَإِنَّهَا كَانَتْ تُحِبُّ خَدِيجَةَ»»[١].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ شتێكی بۆ هاتبا دەیفەرموو: ببەن بۆ فلانە ئافرەت ئەوە دەستە خوشكی خەدیجە بوو، ببەن بۆ ماڵی فلان ئافرەتیش، چونكە ئەو خەدیجەی خۆشدەویست.

١٩٩- «عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ نَبِيُّكُمْ ﷺ: «كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ»»[٢].

واتە: حوزەیفە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەرەكەتان ﷺ فەرموویەتی: هەموو چاكەكردنێك خێرەو پاداشتی لەسەرە.

## دەربارەی: دەرچوون بۆ زەوی پاقلەو شت هەڵگرتن بە كۆڵ بۆ ماڵەوە بە زەنبیل[٣]

٢٠٠- «عَنْ عَمْرِو بْنِ أَبِي قُرَّةَ الْكِنْدِيِّ قَالَ: عَرَضَ أَبِي عَلَى سَلْمَانَ أُخْتَهُ، فَأَبَى وَتَزَوَّجَ مَوْلاَةً لَهُ، يُقَالُ لَهَا: بُقَيْرَةُ، فَبَلَغَ أَبَا قُرَّةَ أَنَّهُ كَانَ بَيْنَ حُذَيْفَةَ وَسَلْمَانَ شَيْءٌ، فَأَتَاهُ يَطْلُبُهُ، فَأُخْبِرَ أَنَّهُ فِي مَبْقَلَةٍ لَهُ، فَتَوَجَّهَ إِلَيْهِ، فَلَقِيَهُ مَعَهُ زَبِيلٌ فِيهِ بَقْلٌ، قَدْ أَدْخَلَ عَصَاهُ فِي عُرْوَةِ الزَّبِيلِ «وَهُوَ عَلَى عَاتِقِهِ» فَقَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ اللَّهِ، مَا كَانَ بَيْنَكَ وَبَيْنَ حُذَيْفَةَ؟ قَالَ: يَقُولُ سَلْمَانُ: ﴿وَكَانَ الإِنسَانُ عَجُولاً ﴿١١﴾﴾ الإسراء، فَانْطَلَقَا حَتَّى أَتَيَا دَارَ سَلْمَانَ، فَدَخَلَ سَلْمَانُ الدَّارَ فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ، ثُمَّ أَذِنَ لأَبِي قُرَّةَ، فَدَخَلَ، فَإِذَا نَمَطٌ مَوْضُوعٌ عَلَى بَابٍ، وَعِنْدَ رَأْسِهِ لَبِنَاتٌ، وَإِذَا قُرْطَاطٌ، فَقَالَ: اجْلِسْ عَلَى فِرَاشِ مَوْلاَتِكَ الَّتِي تُمَهِّدُ لِنَفْسِهَا، ثُمَّ أَنْشَأَ يُحَدِّثُهُ فَقَالَ: إِنَّ حُذَيْفَةَ كَانَ يُحَدِّثُ بِأَشْيَاءَ، كَانَ يَقُولُهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي غَضَبِهِ لِأَقْوَامٍ، فَأُوتَى فَأُسْأَلُ عَنْهَا؟ فَأَقُولُ: حُذَيْفَةُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُ، وَأَكْرَهُ أَنْ تَكُونَ ضَغَائِنُ بَيْنَ أَقْوَامٍ، فَأُتِيَ حُذَيْفَةُ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ سَلْمَانَ لاَ يُصَدِّقُكَ وَلاَ يُكَذِّبُكَ بِمَا تَقُولُ، فَجَاءَنِي حُذَيْفَةُ، فَقَالَ: يَا سَلْمَانُ ابْنَ أُمِّ سَلْمَانَ، فَقُلْتُ يَا حُذَيْفَةُ ابْنَ أُمِّ حُذَيْفَةَ، لَتَنْتَهِيَنَّ، أَوْ لأَكْتُبَنَّ فِيكَ إِلَى عُمَرَ، فَلَمَّا خَوَّفْتُهُ بِعُمَرَ تَرَكَنِي، وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مِنْ وَلَدِ آدَمَ أَنَا، فَأَيُّمَا عَبْدٌ مِنْ أُمَّتِي لَعَنْتُهُ لَعْنَةً، أَوْ سَبَبْتُهُ سَبَّةً، فِي غَيْرِ كُنْهِهِ، فَاجْعَلْهَا عَلَيْهِ صَلاَةً»»[٤].

---

(١) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٢٨١٨): ق- عائشة نحوه.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٠٤٠): [مسلم: ١٢- كتاب الزكاة ١٦- باب: بيان ان اسم. الصدقة يقع على كل نوع من المعروف، ح ٥٢].

(٣) واتە: خاكی و سادە بوون.

(٤) حسن: «السلسلة الصحيحة» (١٧٥٨): [أبو داود: ٣٩- كتاب السنة، ١٠- باب: النهي عن سب أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ].

واتە: عەمری کوڕی ئەبو قوڕەی کیندی دەڵێ: باوکم خوشکی خۆی پێشنیار کرد بۆ سەلمان ئەویش ڕازی نەبوو، (لە جیاتی ئەو) کەنیزەکێکی خۆی مارە کرد، کە پێی دەگوترا: بوقەیرە، ئیدی هەواڵ گەیشت بە ئەبو قوڕەی کیندی کە ناخۆشییەك هەیە لە نێوان حوزەیفەو سەلماندا، جا هات بۆ لای و بەدوایدا دەگەڕا، وە هەواڵی زانی کە ئەو لە نێو زەویە پاقلەکەی خۆیدایە، جا ڕۆیشت بۆ لای، کاتێ پێی گەیشت بینی زەنبیلەیەکی پێیە پاقلەی تێدایە، جا گۆچانەکەی خستە ناو دەسکی زەنبیلەکە، لە کاتێکدا زەنبیلەکەی لەسەر شان بوو، گوتی: ئەی باوکی عەبدوڵڵا چی هەیە لە نێوان تۆو حوزەیفە؟ دەڵێ: سەلمان گوتی: ﴿وَكَانَ الإِنسَانُ عَجُولاً ﴿١١﴾﴾الإسراء، جا هەردووکیان ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە ماڵی سەلمان، سەلمان چووە ماڵەوە، گوتی: سڵاوی خواتان لێ بێ (سڵاوی لە خانەوادەکەی کرد)، پاشان مۆڵەتیدا بە ئەبو قوڕە، ئەویش چووە ژوورەوە، جا شتێك لەسەر دەرگاکە دانرابوو چەند خشتێکی لەسەر بوو، دەرچوو بەرگی کورتانە، جا گوتی: دانیشە لەسەر جێگای خزمەتکارەکەت کە بۆ خۆی ڕێکی خستووە (واتە: لە شوێنی خۆی داینیشاند)، پاشان دەستی کردە باسکردن و گوتی: بەڕاستی حوزەیفە کۆمەڵە شتێکی باس دەکرد، پێغەمبەر ﷺ لەکاتی تووڕەییدا بە خەڵکانێکی دەفەرموو (جاری وا هەبوو قسەیەکی ڕەقی بە کەسێك دەفەرموو)، جا خەڵکی دەهاتن پرسیاریان لێ دەکردم (کە ئاخۆ ڕاستە ئەوەی حوزەیفە دەیڵێ)؟ منیش دەمگوت: حوزەیفە شارەزاترە بەوەی چی دەڵێ، وە حەزم نەدەکرد ڕق و کینە بکەوێتە نێوان خەڵکیەوە، جا خەڵکانێك ڕۆیشتن بە حوزەیفەیان گوت: سەلمان نە بەڕاستت دادەنێ و نە بە درۆت دەخاتەوە لەوەی کە دەیڵێی، پاشان حوزەیفە هات بۆ لام و، گوتی: ئەی سەلمانی کوڕی دایکی سەلمان، منیش گوتم: ئەی حوزەیفەی کوڕی دایکی حوزەیفە، یان وازدەهێنی، یان نووسراوێك لەبارەی تۆوە بدەم بە عومەر (بۆچی یەخەی منت گرتووە بە قسەی خەڵکی)، جا کاتێ بە عومەر ترساندم وازی لێم هێنا، وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: من لە نەوەی ئادەمم، جا هەر بەندەیەك لە ئوممەتەکەم نەفرینێکم لێ کردبێ، یان قسەیەکم پێ گوتبێ، بەبێ خەتا، ئەوە بیکە بە ڕەحمەت بۆی).

## دەربارەی: دەرچوون بۆ شوێنی کار

٢٠١- «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أَتَيْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ «وَكَانَ لِي صَدِيقًا»، فَقُلْتُ: أَلاَ تَخْرُجُ بِنَا إِلَى النَّخْلِ؟ فَخَرَجَ وَعَلَيْهِ خَمِيصَةٌ لَهُ»[1].

واتە: ئەبی سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: چوومە لای ئەبو سەعیدی خودری، کە هاوڕێم بوو، گوتم: ئەرێ نەچینە نێو دار خورمایان (بۆ کارکردن)؟ جا هاتەدەرو پۆشاکێکی بە نەخشی لەبەر بوو.

---

(١) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٢٥١).

٢٠٢- «عَنْ مُغِيرَةَ، عَنْ أُمِّ مُوسَى قَالَتْ: سَمِعْتُ عَلِيّاً (صَلَوَاتُ اللَّهِ عَلَيْهِ) يَقُولُ: أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ أَنْ يَصْعَدَ شَجَرَةً فَيَأْتِيَهُ مِنْهَا بِشَيْءٍ، فَنَظَرَ أَصْحَابُهُ إِلَى سَاقِ عَبْدِ اللَّهِ فَضَحِكُوا مِنْ حُمُوشَةِ سَاقَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا تَضْحَكُونَ؟ لَرِجْلُ عَبْدِ اللَّهِ أَثْقَلُ فِي الْمِيزَانِ مِنْ أُحُدٍ »»[1].

واته: موغیره دەڵێ: ئوممو مووسا گوتی: گوێم لە عەلی (صَلَوَاتُ اللَّهِ عَلَيْهِ) بوو، دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود کرد بچێتە سەر دارێك (كە داری ئەڕاك بوو) تا بەشێك لە دارەكە لێبكاتەوەو بۆی بهێنێت (كە بریتی بوو لە برینی سیواكێك)، لەوكاتە هاوەڵەكانی تەماشای قاچی عەبدوڵڵایان كردو، پێكەنین لەبەر زۆر لاوازی و بێ گۆشتی (قاچەكانی)، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموون: بە چی پێدەكەنن؟ پێیەكانی عەبدوڵڵا لە تەرازووی خوا لە چیای ئوحود قورس و گرانترە.

## دەربارەی: مسوڵمان ئاوێنەی براكەیەتی

٢٠٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: الْمُؤْمِنُ مَرْآةُ أَخِيهِ، إِذَا رَأَى فِيهَا عَيْباً أَصْلَحَهُ »[2].

واته: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئیماندار ئاوێنەی براكەیەتی، ئەگەر كەم و كوڕیەكی لێ ببینێ بۆی چاك دەكاتەوە.

٢٠٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْمُؤْمِنُ مَرْآةُ أَخِيهِ، وَالْمُؤْمِنُ أَخُو الْمُؤْمِنِ، يَكُفُّ عَلَيْهِ ضَيْعَتَهُ، وَيَحُوطُهُ مِنْ وَرَائِهِ »»[3].

واته: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئیماندار ئاوێنەی براكەیەتی، ئیماندار برای ئیمانداره، قەدەغەی دەكات لە فەوتان و خەسارەتمەندیی و، دەیپارێزێ و پشتی دەگرێت.

٢٠٥- «عَنِ الْمُسْتَوْرِدِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَكَلَ بِمُسْلِمٍ أُكْلَةً، فَإِنَّ اللَّهَ يُطْعِمُهُ مِثْلَهَا مِنْ جَهَنَّمَ، وَمَنْ كُسِيَ بِرَجُلٍ مُسْلِمٍ، فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَكْسُوهُ مِنْ جَهَنَّمَ، وَمَنْ قَامَ بِرَجُلٍ مَقَامَ رِيَاءٍ وَسُمْعَةٍ، فَإِنَّ اللَّهَ يَقُومُ بِهِ مَقَامَ رِيَاءٍ وَسُمْعَةٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ »[4].

واته: موستەورید (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك پارووە نانێك بە مسوڵمانێكەوە بخوات (جاسوسی لەسەر بكات، یان بە پەنهان باسی مسوڵمانێك بكات،

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣١٩٢): [ليس في شيء من الكتب الستة].

(٢) حسن الإسناد.

(٣) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٩٢٣/٦): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٤٩- باب: في النصيحة].

(٤) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٥٥٨): [أبو داود: ٤٠ كتاب الأدب، ٣٥- باب: في الغيبة].

یان قسە لەسەر نامووسی بکات و ئازاری بدات لەلای نەیارەکانی، تا تیکە نانێکی دەست بکەوێ)، ئەوە خوا ئاگری دۆزەخی دەرخوارد دەدات، وە هەر کەسێك پۆشاکێکی پێ بپۆشرێت و پێی ببەخشرێ لە پاداشتی لۆمەی کەسێکی مسوڵمان (لەلای نەیاری کەسە مسوڵمانەکە)، ئەوە خوا (عَزَّ وَجَلَّ) بەرگی ئاگری دۆزەخی دەکاتە بەر، وە هەر کەسێك هەڵبستێ و خۆی بە پیاوچاك پێشان بدات، تاکو سەرەنجی کەسێکی خاوەن پایەو سەروەت ڕابکێشێ و دونیا بەدەست بهێنێ، ئەوە خوا ڕیسوای دەکات و، لە قیامەت دەریدەخات کە ئەو کەسە کارەکانی بۆ ڕیایی بووەو بۆ خوای نەبووە.

## دەربارەی:ئەو یاری و گاڵتەیەی دروست نین

٢٠٦- « عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ « يَعْنِي» يَقُولُ:« لاَ يَأْخُذُ أَحَدُكُمْ مَتَاعَ صَاحِبِهِ لاَعِباً وَلاَ جَاداً، فَإِذَا أَخَذَ أَحَدُكُمْ عَصَا صَاحِبِهِ فَلْيَرُدُّهَا إِلَيْهِ» [١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سائیب لە باوکی ئەویش لە باپیری (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست، واتە: دەیفەرموو: با هیچ یەکێك لە ئێوە کەل و پەلی براکەی نەبات و نەیشارێتەوە نە بە گاڵتەو نە بەڕاستی، بۆیە ئەگەر یەکێك لە ئێوە گۆپاڵی برادەرەکەی بردوە، با بۆی بگەڕێنێتەوە (ئەو جۆرە گاڵتەوگەپانە مەکەن).

## دەربارەی:ڕێنمایی کردن بۆ چاکە

٢٠٧- « عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي أُبْدِعَ بِي فَاحْمِلْنِي، قَالَ:« لاَ أَجِدُ، وَلَكِنِ ائْتِ فُلاَنًا، فَلَعَلَّهُ أَنْ يَحْمِلَكَ » ، فَأَتَاهُ فَحَمَلَهُ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَأَخْبَرَهُ، فَقَالَ:« مَنْ دَلَّ عَلَى خَيْرٍ فَلَهُ مِثْلُ أَجْرِ فَاعِلِهِ» [٢].

واتە: ئەبو مەسعوودی ئەنصاڕیی (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: من وڵاخەکەم مردو وڵاخێکم پێ بدە تا هەڵم بگرێ، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: نیمە، بەڵام بڕۆ بۆ لای فڵان بەڵکو وڵاخێکی هەبێ و پێت بدات، جا چوو بۆ لای، ئەویش پێیداو

---

(١)حسن: «الإرواء»: [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٨٥- باب: من يأخذ الشئ على المزاح. الترمذي: ٣١- ما جاء لا يحل لمسلم أن يروع مسلماً].

(٢)صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٥٥٨): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ١١٥- باب: في الدال على الخير. الترمذي: ٣٩- كتاب العلم، ١٤- باب: ماجاء أن الدال على الخير كفاعله، مسلم في الجهاد].

هەڵیگرت، هاتەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ هەواڵەکەی پێدا، فەرمووی: هەر کەسێك ببێتە هۆی کارێکی چاك، ئەوە پاداشتی بۆ هەیە هەروەك چۆن پاداشت بۆ بکەری کارە چاکەکە هەیە.

## دەربارەی: لێبوردن و چاوپۆشی لە خەڵك

۲۰۸- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ يَهُودِيَّةً أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ بِشَاةٍ مَسْمُومَةٍ، فَأَكَلَ مِنْهَا، فَجِيءَ بِهَا، فَقِيلَ: أَلاَ نَقْتُلُهَا؟ قَالَ: «لاَ»، قَالَ: فَمَا زِلْتُ أَعْرِفُهَا فِي لَهَوَاتِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[1].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئافرەتێکی جوولەکە مەڕێکی ژەهراوی هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ، ئەویش لێی خوارد، پاشان ئافرەتەکەیان هێنا، گوتیان: ئایا بیکوژین؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: نەخێر مەیکوژن، (ئەنەس) دەڵێ: هەتا ئێستاش هەر شوێنەواری ئەم ژەهرە دەناسمەوە بە زمانە بچکۆڵەی پێغەمبەری خواوە ﷺ.

۲۰۹- «عَنْ وَهْبِ بْنِ كَيْسَانَ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ: ﴿خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ ﴿١٩٩﴾﴾ الأعراف، قَالَ: وَاللَّهِ مَا أَمَرَ بِهَا أَنْ تُؤْخَذَ إِلاَّ مِنْ أَخْلاَقِ النَّاسِ، وَاللَّهِ لآخُذَنَّهَا مِنْهُمْ مَا صَحِبْتُهُمْ»[2].

واتە: وەهبی کوڕی کەیسان دەڵێ: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر بوو (خوا لێیان ڕازی بێ)، لەسەر مینبەر ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ ﴿١٩٩﴾﴾ الأعراف، دەیگوت: وەڵڵاهی تەنها لەبەر ئەوە فەرمانی بەمە کردووە تا لە ڕەوشتی خەڵك وەربگیرێ (سوود لە ڕەوشتی یەکدی ببین)، جا سوێند بە خوا عەفوو ڕەوشتی چاك لەو خەڵکانە وەردەگرین هەتا هاوەڵایەتیان بکەم.

۲۱۰- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَلِّمُوا وَيَسِّرُوا وَلَا تُعَسِّرُوا، وَإِذَا غَضِبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْكُتْ»»[3].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵك فێری ئایین بکەن، وە ئاسانکاربن و، سەغڵەتیی دروست مەکەن (لە دینداریی دا)، وە کاتێك یەکێك لە ئێوە تووڕە بوو با بێ دەنگ بێ.

---

(۱) صحيح: [البخاري: ٥١- كتاب الهبة، ٢٨- باب: قبول الهدية من المشركين. مسلم: ٣٩- كتاب السلام، ١٧- باب: السحر، ح ٤٥].

(۲) صحيح الإسناد.

(۳) صحيح لغيره: «السلسلة الصحيحة» (١٣٧٥): [ليس في شيء من الكتب الستة].

## دەربارەی: کرانەوەو ڕووخۆشی لەگەڵ خەڵك

٢١١- «عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ قَالَ: لَقِيتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) فَقُلْتُ: أَخْبِرْنِي عَنْ صِفَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي التَّوْرَاةِ، قَالَ: فَقَالَ: أَجَلْ وَاللَّهِ، إِنَّهُ لَمَوْصُوفٌ فِي التَّوْرَاةِ بِبَعْضِ صِفَتِهِ فِي الْقُرْآنِ: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِداً وَمُبَشِّراً وَنَذِيراً ﴿٤٥﴾ ﴾الأحزاب، وَحِرْزاً لِلْأُمِّيِّينَ، أَنْتَ عَبْدِي وَرَسُولِي، سَمَّيْتُكَ الْمُتَوَكِّلَ، لَيْسَ بِفَظٍّ وَلاَ غَلِيظٍ، وَلا صَخَّابٍ فِي الأَسْوَاقِ، وَلاَ يَدْفَعُ بِالسَّيِّئَةِ السَّيِّئَةَ، وَلَكِنْ يَعْفُو وَيَغْفِرُ، وَلَنْ يَقْبِضَهُ اللَّهُ تَعَالَى حَتَّى يُقِيمَ بِهِ الْمِلَّةَ الْعَوْجَاءَ، بِأَنْ يَقُولُوا: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَيَفْتَحُوا بِهَا أَعْيُناً عُمْياً، وَآذَاناً صُمّاً، وَقُلُوباً غُلْفاً»[1].

**واتە: عەطائی کوڕی یەسار دەڵێ: گەیشتم بە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (خوا لێی ڕازی بێ) گوتم: هەواڵم پێبدە دەربارەی سیفەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەوڕات، دەڵێ: گوتی: باشە، سوێند بە خوا لە تەوڕات بە هەندێك سیفەت باسکراوە، کە لە قوڕئاندا هاتوە: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِداً وَمُبَشِّراً وَنَذِيراً ﴿٤٥﴾ ﴾الأحزاب، (واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ! ئێمە تۆمان ناردوە شایەدو موژدەدەرو ترسێنەر بیت)، وە پارێزەری نەخوێنەوارەکان بیت (واتە: ببیتە هۆی هیدایەتی عەڕەبە نەخوێندەوارەکان پێشی خەڵکانی دیکە، تا پارێزراوبن لە ئاگر)، تۆ بەندەو پێغەمبەری منی، ناوم ناوی موتەوەکیل، نە قسە ڕەق و نە دڵڕەقە، نە هاوار دەکات لە بازاڕدا، هەرگیز بە خراپە وەڵامی خراپە ناداتەوە، بەڵکو لێدەبورێت، خوای بەرز ڕووحی نەکێشا تاکو ئوممەتی لاڕێی پێ ڕاست کردەوە، بەوەی کە بڵێن: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ)، بە هۆی ئەوەوە چاوانێك کە کوێرن، گوێچکانێك کە کەڕن، دڵانێك کە داخراوو داپۆشراون بە گومڕایی، کردنیەوەو ڕۆشنی کردن (وای لێکردن هەق ببینن و ببیستن و دڵیان بۆی بکرێتەوە).**

٢١٢- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: إِنَّ هَذِهِ الآيَةَ الَّتِي فِي الْقُرْآنِ: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِداً وَمُبَشِّراً وَنَذِيراً ﴿٤٥﴾ ﴾الأحزاب، فِي التَّوْرَاةِ نَحْوَهُ»[2].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕ (خوا لێیان ڕازی بێ)، فەرموویەتی: بە دڵنیایی ئەو ئایەتەی لە قوڕئاندا دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِداً وَمُبَشِّراً وَنَذِيراً ﴿٤٥﴾ ﴾الأحزاب، (واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بە دڵنیایی ئێمە تۆمان ناردوە تاکو شایەدو موژدەدەرو وریاکەرەوەو ترسێنەر بیت)، بە هەمان شێوە لە تەوڕات و هاوشێوەکانیدا (واتە: لە کتێبە ئاسمانیەکانی دیکەش) هاتوە.**

---

(١) صحيح: [البخاري: كتاب التفسير، ٤٨- سورة الفتح، ٣- باب: إنا ارشلنك شهداً ومبشراً ونذيراً].

(٢) صحيح: انظر ما قبله.

٢١٣- «عَنْ مُعَاوِيَة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: سَمِعْتُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ كَلَامَاً نَفَعَنِي اللَّهُ بِهِ، سَمِعْتُهُ يَقُولُ أَوْ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّكَ إِذَا اتَّبَعْتَ الرِّيبَةَ فِي النَّاسِ أَفْسَدْتَهُمْ» فَإِنِّي لاَ أَتَّبِعُ الرِّيبَةَ فِيهِمْ فَأُفْسِدَهُمْ» (١).

واتە: موعاویە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: چەند قسەیەکم بیست لە پێغەمبەر ﷺ بە هۆیانەوە خوا سوودی پێگەیاندم، گوێم لێبوو دەیگوت، یان گوتی: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: دڵنیابە ئەگەر تۆ بە دوای گومان (کەم و کوڕیی) بکەوی لە نێو خەڵکیدا، ئەوە تێکیان دەدەی (عەیب و کەم و کوڕییەکان ئاشکرا دەبن، فەسادو خراپەکاریی دەبێتە شتێکی ئاشکراو سادە)، من هەرگیز بە دوای گومان ناکەوم لە نێو خەڵکیدا بۆ ئەوەی تێکیان بدەم.

## دەربارەی:زەردەخەنە

٢١٤- «عَنْ قَيْسٍ قَالَ: سَمِعْتُ جَرِيراً (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: مَا رَآنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُنْذُ أَسْلَمْتُ إِلاَّ تَبَسَّمَ فِي وَجْهِي. وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَدْخُلُ مِنْ هَذَا الْبَابِ رَجُلٌ مِنْ خَيْرِ ذِي يَمَنٍ، عَلَى وَجْهِهِ مَسْحَةُ مَلَكٍ»، فَدَخَلَ جَرِيرٌ» (٢).

واتە: قەیس دەڵێ: گوێم لێ بوو جەریر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەیگوت: لەو کاتەوەی بومەتە مسوڵمان تاکو ئێستا هیچ جارێك نەبووە پێغەمبەری خوا ﷺ بمبینێ، حەتمەن زەردەخەنەی بەڕوودا کردووم (چونکە ئەوەندە شیرین و جوان و خۆشەویست بووە، پێغەمبەری خوا شوبهاندوویەتی بە فریشتە). وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لەم دەرگایە پیاوێك دێتە ژوورەوە لە چاکترینی خەڵکی یەمەنە شوێنەواری فریشتەی لەسەر ڕووخساری دیارە (ئەوەندە شیرین و جوانە)، جا لەوکاتەدا جەریر هاتە ژوورەوە.

٢١٥- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ضَاحِكاً قَطُّ حَتَّى أَرَى مِنْهُ لَهَوَاتِهِ، إِنَّمَا كَانَ يَتَبَسَّمُ ﷺ قَالَتْ: وَكَانَ إِذَا رَأَى غَيْماً أَوْ رِيحاً عُرِفَ فِي وَجْهِهِ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوُا الْغَيْمَ فَرِحُوا، رَجَاءَ أَنْ يَكُونَ فِيهِ الْمَطَرُ، وَأَرَاكَ إِذَا رَأَيْتَهُ عُرِفَتْ فِي وَجْهِكَ الْكَرَاهَةُ؟ فَقَالَ: يَا عَائِشَةُ، مَا يُؤْمِنِّي أَنْ يَكُونَ فِيهِ عَذَابٌ؟ عُذِّبَ قَوْمٌ بِالرِّيحِ، وَقَدْ رَأَى قَوْمٌ الْعَذَابَ مِنْهُ فَقَالُوا: ﴿قَالُوا هَذَا عَارِضٌ مُمْطِرُنَا﴾ (٢٤) ﴿الأحقاف» (٣).

---

(١) صحيح: «تخريج السنة» (١٠٧٣): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٣٧- باب: في النهي عن التجس].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣١٩٣).

(٣) صحيح: [البخاري: ٦٥- كتاب التفسير، ٤٦- سورة الأحقاف، ٢- باب: فلما رأوه عارضا مستقبل أوديهم). مسلم: ٩- كتاب الاستسقاء، ٣- باب: التعوذ عند رؤية الريح والغيم وح ١٦].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: هیچ کاتێك پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە پێبکەنێ تا ئەو ئەندازەیەی زمانە بچکۆڵەی نێو دەمی ببینم، بەڵکو ئەو تەنها زەردەخەنەی دەکرد، وە دەڵێ: ئەگەر (ئاسمان) تەم و هەور بووایە، یان بایەك بهاتایە، لە ڕووخساریەوە دەزانرا (ناموڕتاحە)، جا (عائیشە) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵك کاتێك دەبینن ئاسمان هەورو تاریکە دڵخۆش دەبن، بە ئومێدی ئەوەی بارانی تێدابێ، وە من تۆ دەبینم لە ڕووخسارتەوە دیارە کە پێت ناخۆشە؟ ئەویش فەرمووی: ئەی عائیشە! چ شتێك دڵنیاییم پێ دەدات کە ئەمە سزای خوای تێدانیە؟ گەلانی وا هەبوو بە بـا سزادراون، کەچی کە خەڵکەکە (سەرەتا بـاو هەورەکەیان) بینیوە گوتوویانە: ﴿قَالُوا هَذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا ﴿٢٤﴾﴾ الأحقاف ، واتە: ئەمە هەورەو بارانمان بەسەردا دەبارێنێ.

## دەربارەی: پێکەنین

٢١٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَقِلَّ الضَّحِكَ، فَإِنَّ كَثْرَةَ الضَّحِكِ تُمِيتُ الْقَلْبَ »»[١].

واتە: ئەبو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کەم پێبکەنە، چونکە بە دڵنیایی زۆر پێکەنین دڵ دەمرێنێ.

٢١٧- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لا تُكْثِرُوا الضَّحِكَ، فَإِنَّ كَثْرَةَ الضَّحِكِ تُمِيتُ الْقَلْبَ »»[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: زۆر پێمەکەنن، چونکە بە دڵنیایی زۆر پێکەنین دڵ دەمرێنێ.

٢١٨- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى رَهْطٍ مِنْ أَصْحَابِهِ يَضْحَكُونَ وَيَتَحَدَّثُونَ، فَقَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً، وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيراً» ثُمَّ انْصَرَفَ وَأَبْكَى الْقَوْمَ، وَأَوْحَى اللَّهُ عَزَّوَجَلَّ إِلَيْهِ: «يَا مُحَمَّدُ! لِمَ تُقَنِّطُ عِبَادِي؟» فَرَجَعَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «أَبْشِرُوا، وَسَدِّدُوا، وَقَارِبُوا »»[٣].

واتە: ئەبو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ لای کۆمەڵێ لە هاوەڵانی، لەکاتێکدا پێدەکەنین و قسەیان دەکرد، فەرمووی: سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی

---

(١) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٥٠٦، ٩٣٠): [الترمذي: ٣٤- كتاب الزهد، ٢- باب: من اتقى المحارم فهو أعبد الناس. إبن ماجه: ٣٧١- كتاب الزهد، ٢٤- باب: الورع والتقوى، ٤٢١٧].

(٢) حسن: انظر ما قبله.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣١٩٣).

بە دەستە، ئەگەر ئێوە ئەوە بزانن کە من دەیزانم، کەم پێدەکەنین و زۆر دەگریان، پاشان ڕووی وەرگێڕاو ڕۆیشت، کۆمەڵە هاوەڵەکەش دەستیان کرد بە گریان، جا خوای زاڵی پایەدار وەحی بۆ نارد (فەرمووی): ئەی موحەممەد! بۆچی بەندەکانم تووشی بێ ئومێدی دەکەی؟ جا لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە لایان و فەرمووی: موژدەتان لێ بێ (بە کردەوەی کەم پاداشتی زۆرتان بۆ هەیە)، وە لەسەر ڕاستە شەقام بڕۆن (کە ئیسلامە)، وە ناوەندگیربن (نە کەمتەرخەم بن، نە زێدەڕۆیی بکەن، لە دینداریيدا).

## دەربارەی: کە ڕووی لە کەسێك کردبا، یان پشتی تێکردبا جەستەی هەموو دەسووڕاند

٢١٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ رُبَّمَا حَدَّثَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، فَيَقُولُ: حَدَّثَنِيهِ أَهْدَبُ الشُّفْرَيْنِ، أَبْيَضُ الْكَشْحَيْنِ، إِذَا أَقْبَلَ أَقْبَلَ جَمِيعاً، وَإِذَا أَدْبَرَ، أَدْبَرَ جَمِيعاً، لَمْ تَرَ عَيْنٌ مِثْلَهُ، وَلَنْ تَرَاهُ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، هەندێ جار کە فەرموودەی دەگێڕایەوە دەیگوت: بۆی باسکردووم برژانگ درێژیی، تەرۆك سپی، کە کاتێ ڕووی دەکردە لایەك بە هەموو جەستەی ڕووی تێدەکرد، (واتە: تەنها بە سەر ئاوڕی نەدەدایەوە)، وە کاتێ پشتی لەلایەك دەکرد بە هەموو جەستەی پشتی تێدەکرد، هیچ چاوێك وەك ئەوی نەبینیوەو ناشیبینێ. (ئنجا باسی فەرموودەکەی دەکرد کە لەوەوە گوێی لێ بووە).

## دەربارەی: ڕاوێژ پێکراو باوەڕپێکراوە

٢٢٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِأَبِي الْهَيْثَمِ: «هَلْ لَكَ خَادِمٌ؟» قَالَ: لاَ، قَالَ: «فَإِذَا أَتَانَا سَبْيٌ فَأْتِنَا» فَأُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِرَأْسَيْنِ لَيْسَ مَعَهُمَا ثَالِثٌ، فَأَتَاهُ أَبُو الْهَيْثَمِ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اخْتَرْ مِنْهُمَا»، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اخْتَرْ لِي، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ الْمُسْتَشَارَ مُؤْتَمَنٌ، خُذْ هَذَا، فَإِنِّي رَأَيْتُهُ يُصَلِّي، وَاسْتَوْصِ بِهِ خَيْراً». فَقَالَتِ امْرَأَتُهُ: مَا أَنْتَ بِبَالِغٍ مَا قَالَ فِيهِ النَّبِيُّ ﷺ إِلاَّ أَنْ تُعْتِقَهُ، قَالَ: فَهُوَ عَتِيقٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّ اللَّهَ لَمْ يَبْعَثْ نَبِياً وَلاَ خَلِيفَةً، إِلاَّ وَلَهُ بِطَانَتَانِ: بِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَاهُ عَنِ الْمُنْكَرِ، وَبِطَانَةٌ لاَ تَأْلُوهُ خَبَالاً، وَمَنْ يُوقَ بِطَانَةَ السُّوءِ فَقَدْ وُقِيَ»[٢].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣١٩٥).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٥٥٨): [الترمذي: ٣٤- كتاب الزهد، ٣٩- باب: ما جاء في معيشة أصحاب النبي ﷺ].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە ئەبو هەیسەمی فەرموو: خزمەتکارت هەیە؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی: ئەگەر سەبیمان بۆ هات دەنێرم بەدوات، دوو سەبیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا، سێیەمیانی لەگەڵ نەبوو، ئەویش ناردی بە دوای ئەبو هەیسەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەم دووانە یەکێکیان هەڵبژێرە، ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ بۆم هەڵبژێرە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕاوێژپێکراو کراوەتە ئەمانەت پارێز (کەواتە: دەبێ چاکەت بۆ هەڵبژێرم و، تۆش باوەڕ بە بۆچوونی من بکەی کە ئەوە چاکترە)، ئەمەیان ببە، من بینیوومە نوێژ دەکات، مامەڵەی باشیشی لەگەڵدا بکە، جا خێزانەکەی گوتی: ناگەی بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەیەوە ئامۆژگاری کردی (کە فەرمووی مامەڵەی باشی لەگەڵدا بکە)، مەگەر ئازادی بکەیت، ئەبو هەیسەمیش گوتی: ئەوە ئازادم کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان خوا هیچ پێغەمبەرێك و جێنشینێکی ڕەوانە نەکردوە حەتمەن دوو کۆمەڵ و پۆلی لە دەورەنە: پۆلێکیان فەرمانی پێ دەکات بە چاکەو قەدەغەی دەکات لە خراپە، پۆلێکیشیان درێخی ناکات لە تێکدانی و بەرەو خراپەبردنی، جا هەر کەسێك خۆی بپارێزێ لە پۆلە خراپەکە، ئەوە پارێزراو بووە.

## دەربارەی: پرس و ڕاوێژکردن

٢٢١- «عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، قَالَ: قَرَأَ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا): «وَشَاوِرْهُمْ فِي بَعْضِ الْأَمْرِ»»[١].

واتە: عەمری کوڕی دینار، دەڵێ: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ ﴾النساء: ١٥٩، ئاوا خوێندەوە: وە ڕاوێژیان پێبکە لە هەندێك کاروباردا (واتە: وشەی هەندێکی بۆ زیاد کرد، وەك ڕوونکردنەوە بۆ ئایەتەکە).

٢٢٢- «عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: وَاللَّهِ مَا اسْتَشَارَ قَوْمٌ قَطُّ إِلاَّ هُدُوا لِأَفْضَلِ مَا بِحَضْرَتِهِمْ، ثُمَّ تَلاَ: ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾ ﴾الشورى»[٢].

واتە: حەسەن دەڵێ: وەڵڵاهی هیچ کۆمەڵێك نیە پرس و ڕاوێژ بە یەکدی بکەن، حەتمەن ڕێنمایی دەکرێن بۆ باشترینی ئەوەی کە لەبەردەمیانە (لە کاروبار)، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾ ﴾الشورى.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح الإسناد.

## دەربارەی:گوناهی کەسێك کە ڕێگەی ناڕاست بە براکەی پیشان دەدات

٢٢٣- « عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ:« مَنْ تَقَوَّلَ عَلَيَّ مَا لَمْ أَقُلْ، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ، وَمَنِ اسْتَشَارَهُ أَخُوهُ الْمُسْلِمُ، فَأَشَارَ عَلَيْهِ بِغَيْرِ رُشْدٍ فَقَدْ خَانَهُ، وَمَنْ أُفْتِيَ فُتْيَا بِغَيْرِ ثَبْتٍ، فَإِثْمُهُ عَلَى مَنْ أَفْتَاهُ» [(١)].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك قسەیەك بە ناوی منەوە بڵێت، منیش نەمگوتبێ، ئەوە با شوێنێك بۆ خۆی ئامادە بکات لە نێو ئاگر، وە هەر کەسێك برایەکی مسوڵمانی ڕاوێژی پێبکات، ئەویش ڕێنمایی بکات بە جگە لە ڕێیەکی ڕاست (بە ئەنقەست ڕێگەی هەڵەی پێ پێشان بدات، یان بە نەزانی قسەی لەسەر بکات)، ئەوە خیانەتی لێکردوە، وە هەر کەسێك فەتوا بدات بەبێ زانست و بەڵگەو دڵنیایی، ئەوە گوناهەکە لە ئەستۆی ئەو کەسەیە کە فەتوای داوە.

## دەربارەی:خۆشەویستی نێوان خەڵك

٢٢٤- « عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُسْلِمُوا، وَلاَ تُسْلِمُوا حَتَّى تَحَابُّوا، وَأَفْشُوا السَّلاَمَ تَحَابُّوا، وَإِيَّاكُمْ وَالْبُغْضَةَ، فَإِنَّهَا هِيَ الْحَالِقَةُ، لاَ أَقُولُ لَكُمْ: تَحْلِقُ الشَّعْرَ، وَلَكِنْ تَحْلِقُ الدِّينَ» [(٢)].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە ناچنە بەهەشت تا نەبنە مسوڵمان (و ملکەچ نەبن بە چاکی)، وە نابنە مسوڵمانیش (بە چاکی) تاوەکو یەکدیتان خۆش نەوێ، وە سڵاو بڵاو بکەنەوە یەکدیتان خۆشدەوێ (لای یەکدی خۆشەویست دەبن بەوە)، وە خۆتان بپارێزن لە بوغزاندنی یەکتری، چونکە بەڕاستی (بوغزاندنی یەکدی) تاشەرە، مەبەستیشم ئەوە نیە بڵێم موو دەتاشێ، بەڵکو دین دەتاشێ.

٢٢٥- « عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: النِّعَمُ تُكْفَرُ، وَالرَّحِمُ تُقْطَعُ، وَلَمْ نَرَ مِثْلَ تَقَارُبِ الْقُلُوبِ» [(٣)].

---

(١)صحيح لغيره: دون زيادة: «ومن استشاره ...» «السلسلة الصحيحة» (٣١٠٠): وأما زيادة: «ومن استشاره» فهي ضعيفة.

(٢)حسن لغيره: «التعليق الرغيب» (٣/٢٢٦، ١٢/٤» غاية المرام (٤١٤) مشكلة الفقر (٢٠): [مسلم: ١- كتاب الإيمان، ٢٢- باب: بيان أنه لا يدخل الجنة إلا المؤمنون، ح ٩٣، إلى قوله: أفشوا السلام بينكم، وما بعده ليس في شيء من الكتب الستة].

(٣)صحيح الإسناد.

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: نیعمەت سپڵەیی بەرانبەر دەکرێ، پەیوەندیەکانیش دەپچڕێنرێن، هیچ شتێکیشمان نەبینیوە وەك لێك نزیکبوونەوەی دڵەکان (کاریگەر بێت و، پاداشتی زۆر بێ).

## دەربارەی: گەمەو گاڵتە کردن

٢٢٦- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أَتَى النَّبِيُّ ﷺ عَلَى بَعْضِ نِسَائِهِ «وَمَعَهُنَّ أُمُّ سُلَيْمٍ» فَقَالَ: «يَا أَنْجَشَةُ، رُوَيْداً سَوْقَكَ بِالْقَوَارِيرِ» قَالَ أَبُو قِلاَبَةَ: فَتَكَلَّمَ النَّبِيُّ ﷺ بِكَلِمَةٍ لَوْ تَكَلَّمَ بِهَا بَعْضُكُمْ لَعِبْتُمُوهَا عَلَيْهِ، قَوْلُهُ: «سَوْقَكَ بِالْقَوَارِيرِ»»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چووە لای هەندێ لە هاوسەرەکانی (کاتێ بۆ خۆشی ڕاکردنیان دەکرد لەسەر پشتی وشترەکان) کە ئەممو سولەیمیشیان لەگەڵ بوو، جا (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەنجەشە هێواش و لەسەرخۆبە لە لیخوڕینی وشتری شووشەکان (کە مەبەستی بە شووشەکان ئافرەتەکانیەتی)، ئەبو قیلابەش دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ وشەیەکی بەکارهێنا لە قسەکانی ئەگەر یەکێك لە ئێوە بەکاری بێنێ بە عەیبەو کەم و کوڕی لەسەر دەگرن، ئەویش ئەوەبوو کە گوتی: لێخوڕینت بۆ شووشەکان (چونکە ئێوە لاتان عەیبەیە قەدری ئافرەتان بگرن لە نێو خەڵکیدا).

٢٢٧- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّكَ تُدَاعِبُنَا؟ قَالَ: «إِنِّي لاَ أَقُولُ إِلاَّ حَقّاً»»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جەنابت گاڵتەو گەپمان لەگەڵ دەکەی (واتە: قسەی خۆش و سوعبەتمان لەگەڵ دەکەی کەچی پێغەمبەریشی)؟ فەرمووی: لە ڕاستییدا من جگە لە هەق هیچ قسەیەکی دیکە نالێم.

٢٢٨- «عَنْ بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، قَالَ: كَانَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ يَتَبَادَحُونَ بِالْبِطِّيخِ، فَإِذَا كَانَتِ الْحَقَائِقُ كَانُوا هُمُ الرِّجَالَ»[3].

واتە: بەکری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ (گاڵتەیان لەگەڵ یەکدی دەکردو) (پەلکی) شوفتیان بۆ یەکدی دەهاوێشت، وە ئەگەر کارو مەسەلە بهاتبایە سەر ڕاستی و جددی بوون، ئەوە ئەوان پیاوی تەواو بوون.

---

١) صحيح: [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٩٠ باب ما يجوز من الشعر والرجز والحداء. مسلم: ٤٣- كتاب الفضائل، ١٨- باب: من رحمة النبي ﷺ للنساء، ح ٧١].

٢) صحيح: «تخريج المشكاة» (٤٨٨٥): [الترمذي: ٢٥- كتاب البر والصلة، ٥٧- باب: ما جاء في المزاح].

٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٤٣٥).

٢٢٩- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يَسْتَحْمِلُهُ، فَقَالَ: «أَنَا حَامِلُكَ عَلَى وَلَدِ نَاقَةٍ»، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا أَصْنَعُ بِوَلَدِ نَاقَةٍ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَهَلْ تَلِدُ الإِبِلَ إِلاَّ النُّوقُ»»[١].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ داوای سواریەکی لێ کرد بۆ سواریی و بار، جا پێغەمبەر ﷺ (هەر بۆ گاڵتە) پێی فەرموو: من بۆ ئەمە منداڵی وشترێکت پێدەدەم، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من چی لە منداڵی وشتر بکەم (وشتری کامڵ نەبێ چۆن خۆی ڕادەگرێ)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مەگەر وشتری کامڵ هەر لە وشتری مێ نابێ؟ (واتە: هەموو وشترێکی کامڵیش منداڵی وشترە).**

## دەربارەی: گاڵتەو گەپ لەگەڵ منداڵ

٢٣٠- «عَنْ أَبُو التَّيَّاحِ، قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ لَيُخَالِطُنَا، حَتَّى يَقُولَ لِأَخٍ لِي صَغِيرٍ: «يَا أَبَا عُمَيْرٍ، مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ؟»»[٢].

**واتە: ئەبو تەییاح دەڵێ: لە ئەنەسی کوڕی مالیکم بیست (خوا لێی ڕازی بێ)، دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ تێکەڵاومان دەبوو، تا ئەو ئەندازەی من برایەکی بچووکم هەبوو (بێچوە باڵندەیەکی هەبوو لێی مرد، جا پێغەمبەری خوا) پێی دەفەرموو: ئەی ئەبو عومەیر! بێچووە باڵندەکە چی لێهات؟**

٢٣١- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أَخَذَ النَّبِيُّ ﷺ بِيَدِ الحَسنِ أَوِ الحُسَينِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، ثُمَّ وَضَعَ قَدَمَيهِ عَلَى قَدَمَيهِ، ثُم قَالَ: «تَرَقَّ»»[٣].

**واتە: ئەبو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستی حەسەن، یان حوسەینی گرت (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێ)، پاشان پێیەکانی (حەسەن، یان حوسەینی) لەسەر پێیەکانی خۆی داناو، ئنجا فەرمووی: بەرز بەوە (واتە: یاری لەگەڵ دەکردو دڵخۆشی دەکرد).**

---

(١) صحيح: «المشكاة» (٤٨٨٤): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٨٤- باب: ما جاء في المزاح. الترمذي: ٢٥- كتاب البر والصلة، ٥٧- باب: ما جاء في المزاح].

(٢) صحيح: «المشكاة» (٤٨٨٤): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١٨، باب: الانبساط إلى الناس. مسلم: ٣٨- كتاب الآداب، ٥- باب: استحباب تحنيك المولود، ح ٣٠].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨٧٦).

## دەربارەی: ڕەوشت جوانی

٢٣٢- «عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «مَا مِنْ شَيْءٍ فِي الْمِيزَانِ أَثْقَلُ مِنْ حُسْنِ الْخُلُقِ»»[١].

**واتە: ئەبو دەرداء (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ شتێك نیە لە تەرازووی (کردەوە چاکەکاندا) قورستربێ لە ڕەوشت جوانی.**

٢٣٣- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ ﷺ فَاحِشاً وَلاَ مُتَفَحِّشاً، وَكَانَ يَقُولُ: «خِيَارُكُمْ أَحَاسِنُكُمْ أَخْلاَقاً»»[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: بە هیچ جۆرێك پێغەمبەر ﷺ زمان شڕو جنێو فرۆش نەبووە، وە هەمیشە دەیفەرموو: باشترینتان ڕەوشت جوانترینتانە.**

٢٣٤- «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «أُخْبِرُكُمْ بِأَحَبِّكُمْ إِلَيَّ، وَأَقْرَبِكُمْ مِنِّي مَجْلِساً يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟» فَسَكَتَ الْقَوْمُ، فَأَعَادَهَا مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثاً، قَالَ الْقَوْمُ: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «أَحْسَنُكُمْ خُلُقاً»»[٣].

**واتە: عەمرِی کوڕی شوعەیب لە باوکی ئەویش لە باپیریەوە (عەمرِی کوڕی عاص) دەگێڕێتەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، کە بیستوویەتی لە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ئایا هەواڵتان بدەمێ بە خۆشەویستترینتان لە لای من، وە بە نیزیکترینتان لە کۆڕو مەجلیسی من لە ڕۆژی قیامەت؟ جا خەڵکەکە بێ دەنگ بوون، دووجار، یان سێ جار فەرموویەوە، خەڵکەکە گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەو کەسەتان کە لە هەمووتان ڕەوشتی جوانترە.**

٢٣٥- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا بُعِثْتُ لِأُتَمِّمَ صَالِحَ الأَخْلاَقِ»»[٤].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی من ڕەوانەکراوم بۆ ئەوەی ڕەوشتە چاکەکان تەواو بکەم.**

٢٣٦- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) أَنَّهَا قَالَتْ: مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ أَمْرَيْنِ إِلاَّ اخْتَارَ أَيْسَرَهُمَا، مَا لَمْ يَكُنْ إِثْماً، فَإِذَا كَانَ إِثْماً كَانَ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنْهُ، وَمَا انْتَقَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِنَفْسِهِ، إِلاَّ أَنْ تُنْتَهَكَ حُرْمَةُ اللَّهِ تَعَالَى، فَيَنْتَقِمُ لِلهِ عَزَّوَجَلَّ بِهَا»[٥].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨٧٦).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٨٦): [البخاري: ٧٨- كتاب الآدب، ٣٩- باب: حسن الخلق والسخاء وما يكره من البخل. مسلم: ٤٣- كتاب الفضائل، ١٦ كثرة حيائه ﷺ، ح ٦٨].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٧٩٦).

(٤) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٤٥).

(٥) صحيح: «مختصر الشمائل» (٣٠٠) [البخاري: ٦١- كتاب المناقب، ٢٣- باب: صفة النبي ﷺ. مسلم: ٤٣١- كتاب الفضائل،

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: هەرکاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشك کرابێ لە نێوانی دوو شتاندا حەتمەن کامەی ئاسانە ئەوەی هەڵبژاردوە مادەم گوناح نەبووبێ، وە ئەگەریش گوناح بووبێ، ئەوە لە هەموو خەڵکی لێی دوورتر بووە، وە هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ نەفسی خۆی تۆڵەی نەسەندۆتەوە، تەنها ئەگەر سنوورو حەرامکراوەکانی خوا بەزێنرابن، ئەو کات تۆڵەی وەرگرتۆتەوە بۆ خوای زاڵی پایەدار.

٢٣٧- «عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنَّ اللّٰهَ تَعَالَى قَسَمَ بَيْنَكُمْ أَخْلاَقَكُمْ، كَمَا قَسَمَ بَيْنَكُمْ أَرْزَاقَكُمْ، وَإِنَّ اللّٰهَ تَعَالَى يُعْطِي الْمَالَ مَنْ أَحَبَّ وَمَنْ لاَ يُحِبُّ، وَلاَ يُعْطِي الإِيمَانَ إِلاَّ مَنْ يُحِبُّ، فَمَنْ ضَنَّ بِالْمَالِ أَنْ يُنْفِقَهُ، وَخَافَ الْعَدُوَّ أَنْ يُجَاهِدَهُ، وَهَابَ اللَّيْلَ أَنْ يُكَابِدَهُ، فَلْيُكْثِرْ مِنْ قَوْلِ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ، وَسُبْحَانَ اللّٰهِ، وَالْحَمْدُ لِلهِ، وَاللّٰهُ أَكْبَرُ »[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: بێگومان خوای بەرز ڕەوشتی لە نێوان ئێوە دابەش کردوە، هەروەك چۆن ڕزق و ڕۆزی لە نێوانتان دابەش کردوە، وە بە دڵنیایی خوای بەرز ماڵ و سامان دەبەخشێ بە هەر کەسێك کە خۆشی بووێ، یان خۆشی نەوێ (جیاوازی ناکات)، بەڵام ئیمان تەنها دەبەخشێت بەو کەسانەی کە خۆشی دەوێن، جا هەر کەس چرووکی کرد بەوەی ماڵ ببەخشێ، وە ترسا لە دوژمن لەوەی جیهادی بەرانبەر بکات، وە ترسا لە شەو، کە شەونخونی تێدا بکات (جا بۆ عیبادەت بێ، یان بۆ کاری چاك، یان تێشکگری)، ئەوە با زۆر ئەم زیکرانە بکات:(لاَ إِلهَ إِلاَّ اللّٰهُ، وَسُبْحَانَ اللّٰهِ، وَالحَمدُ للهِ، وَاللّٰهُ أَكْبَرُ).

## دەربارەی: سەخاوەتی دڵ و دەروون

٢٣٨- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ الْغِنَى عَنْ كَثْرَةِ الْعَرَضِ، وَلَكِنَّ الْغِنَى غِنَى النَّفْسِ »»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دەوڵەمەندی بە زۆری ماڵ و سامان نیە، بەڵکو دەوڵەمەندی ئەوەیە دڵت دەوڵەمەندبێ و خاوەن قەناعەت بیت.

٢٣٩- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: خَدَمْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَشْرَ سِنِينَ، فَمَا قَالَ لِي: أُفٍّ، قَطُّ، وَمَا قَالَ لِي لِشَيْءٍ لَمْ أَفْعَلْهُ: أَلَا كُنْتَ فَعَلْتَهُ؟ وَلَا لِشَيْءٍ فَعَلْتُهُ: لِمَ فَعَلْتَهُ؟ »[٣].

---

٢٠- باب: مباعدته ﷺ للآثام، ح ٧٧].

(١) صحيح موقوف في حكم المرفوع: «السلسلة الصحيحة» «٢٧١٤».

(٢) صحيح: «تخريج المشكاة» (١٦): [البخاري: ٨١- كتاب الرقاق، ١٥- باب: الغني غنى النفس. مسلم: ١٢ كتاب الزكاة، ٤٠- ليس الغنى عن كثرة العرض، ح ١٢٠].

(٣) صحيح: «مختصر الشمائل» (٢٩٦): [البخاري: ٩٨- كتاب الأدب، ٣٩- باب: حسن الخلق والسخاء وما يكره من البخل.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: دە ساڵان خزمەتی پێغەمبەرم ﷺ کرد، هەرگیز پێی نەگوتم: ئۆف! وە بۆ هیچ شتێك کە نەمکردبێ پێی نەفەرمووم: بۆ نەتکردووە؟ وە بۆ هیچ شتێك کە کردبێتم نەیفەرمووە: بۆ وات کردووە؟

٢٤٠- « عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ رَحِيماً، وَكَانَ لاَ يَأْتِيهِ أَحَدٌ إلاَّ وَعَدَهُ، وَأَنْجَزَ لَهُ إِنْ كَانَ عِنْدَهُ، وَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، وَجَاءَهُ أَعْرَابِيٌّ فَأَخَذَ بِثَوْبِهِ فَقَالَ: إِنَّمَا بَقِيَ مِنْ حَاجَتِي يَسِيرَةٌ، وَأَخَافُ أَنْسَاهَا، فَقَامَ مَعَهُ حَتَّى فَرَغَ مِنْ حَاجَتِهِ، ثُمَّ أَقْبَلَ فَصَلَّى» [(١)].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە بەزەیی بوو، هیچ کەسێك نەهاتووە بۆ لای مەگەر بەڵێنی شتێکی پێداوەو، بۆی جێبەجێ کردوە ئەگەر شتەکەی لەلا هەبووایە، (جا جارێکیان) قامەت بۆ نوێژ کرا، کابرایەکی دەشتەکیش هات، پۆشاکەکەی پێغەمبەری گرت و گوتی: تەنها کەمێك پێویستیم ماوەو دەترسم لە بیرم بچێتەوە (بۆیە ئێستا پێت دەڵێم و بۆم جێبەجێ بکە)، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵی هەڵساو (ڕۆیشت) تا کارەکەی بۆ جێبەجێ کرد، دواتر گەڕایەوەو نوێژی کرد.

٢٤١- « عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: مَا سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ شَيْئاً فَقَالَ: لاَ» [(٢)].

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ داوای هیچ شتێکی لێنەکراوە، فەرموبێتی: نا، یان نەخێر (بەڵکو بەردەوام بەخشیویەتی).

٢٤٢- « عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: مَا رَأَيْتُ امْرَأَتَيْنِ أَجْوَدَ مِنْ عَائِشَةَ، وَأَسْمَاءَ، وَجُودُهُمَا مُخْتَلِفٌ، أَمَّا عَائِشَةُ فَكَانَتْ تَجْمَعُ الشَّيْءَ إِلَى الشَّيْءِ، حَتَّى إِذَا كَانَ اجْتَمَعَ عِنْدَهَا قَسَمَتْ، وَأَمَّا أَسْمَاءُ فَكَانَتْ لاَ تُمْسِكُ شَيْئاً لِغَدٍ» [(٣)].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: هیچ دوو ئافرەتێکم نەبینوە بەخشندەتربن لە عائیشەو ئەسماء، سەخاوەتیەکەشیان جیاواز بوو، عائیشە شتەکانی دەخستنە پاڵ یەکدی، هەتا کۆدەبوونەوە لە لای، جا دابەشی دەکرد (بەسەر هەژاران)، بەڵام ئەسماء هیچ شتێکی لە لای خۆی نەدەهێشتەوە بۆ بەیانی.

مسلم: ٤٣- كتاب الفضائل، ١٣- باب: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أحسن الناس خلقاً، ح ٥١].

(١)حسن: «السلسلة الصحيحة» (٢٠٩٤).

(٢)صحيح: «مختصر الشمائل» (٣٠٢) [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٣٩- باب: حسن الخلق واسخاء وما يكره من البخل.

مسلم: ٤٣- كتاب الفضائل، ١٤- باب: ما سئل رسول الله ﷺ شيئاً قط فقال: لا، ح ٥٦]..

(٣)صحيح الإسناد.

## دەربارەی: چرووكی و ڕەزیلی

٢٤٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ يَجْتَمِعُ غُبَارٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَدُخَانُ جَهَنَّمَ فِي جَوْفِ عَبْدٍ أَبَداً، وَلاَ يَجْتَمِعُ الشُّحُّ وَالإِيمَانُ فِي قَلْبِ عَبْدٍ أَبَداً»»[1].

واتە: ئەبو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرگیز تۆزو خۆڵی تێكۆشان لە پێناوی خواو، دووكەڵی دۆزەخ پێكەوە لە ناخی بەندەدا كۆنابنەوە، هەروەها ڕەزیلی و ئیمان لە یەك كاتدا لە دڵی بەندەدا كۆنابنەوە.

٢٤٤- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ رَبِيعَةَ، قَالَ: كُنَّا جُلُوساً عِنْدَ عَبْدِ اللَّهِ، فَذَكَرُوا رَجُلاً، فَذَكَرُوا مِنْ خُلُقِهِ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: أَرَأَيْتُمْ لَوْ قَطَعْتُمْ رَأْسَهُ أَكُنْتُمْ تَسْتَطِيعُونَ أَنْ تُعِيدُوهُ؟ قَالُوا: لاَ، قَالَ: فَيَدُهُ؟ قَالُوا: لاَ، قَالَ: فَرِجْلُهُ؟ قَالُوا: لاَ، قَالَ: فَإِنَّكُمْ لاَ تَسْتَطِيعُونَ أَنْ تُغَيِّرُوا خُلُقَهُ حَتَّى تُغَيِّرُوا خَلْقَهُ، إِنَّ النُّطْفَةَ لَتَسْتَقِرُّ فِي الرَّحِمِ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً، ثُمَّ تَنْحَدِرُ دَماً، ثُمَّ تَكُونُ عَلَقَةً، ثُمَّ تَكُونُ مُضْغَةً، ثُمَّ يَبْعَثُ اللَّهُ مَلَكاً فَيُكْتَبُ رِزْقَهُ وَخُلُقَهُ، وَشَقِيّاً أَوْ سَعِيداً»[2].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی ڕەبیعە دەڵێ: ئێمە دانیشتبووین لە لای عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود، باسی ڕەوشتی پیاوێكیان كرد، عەبدوڵڵاش گوتی: ئایا ئێوە ئەگەر سەری لە لاشەی جیابكەنەوە دەتوانن دووبارە بۆی بگەڕێننەوە؟ گوتیان: نەخێر، گوتی: ئەدی دەستەكانی؟ گوتیان: نەخێر، گوتی: ئەدی پێیەكانی؟ گوتیان: نەخێر، گوتی: ئێوە ناتوانن خووڕەوشتی بگۆڕن، چ جای گۆڕینی بونیادو ئەندامەكانی لاشەی (ئەمە كاری دەستی قودرەتی خوایە هەر بە ئەو دەكرێ)، لە ڕاستییدا مەنی پیاو چل شەو لە نێو منداڵدان جێگیر دەبێ، پاشان دەبێتە خوێن، ئنجا دەبێتە (پارچە گۆشتێكی هەڵواسراو)، پاشان دەبێ بە گۆشتپارە (وەك پارچە گۆشتێكی لێدێ كە جوراو بێ و شوێنەواری ددانی پێوەبێ)، ئنجا خوا فریشتەیەك دەنێرێ (ئەوانەی) بۆ دەنووسێ: ڕزق و ڕەوشت و، بەدبەختیی و بەختەوەر بوونی.

## دەربارەی: ڕەوشت جوانی ئەگەر تێگەیشتنی لەگەڵ بێ

٢٤٥- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الرَّجُلَ لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ خُلُقِهِ دَرَجَةَ الْقَائِمِ بِاللَّيْلِ»»[3].

---

(١) صحيح: «تخريج المشكاة» (٣٨٢٨): [النسائي: ٢٥- كتاب الجهاد، ٨- باب: فضل من عمل في سبيل الله على قدمه. إبن ماجه: ٢٤- كتاب الجهاد، ٩- باب: الخروج في النفير، ح ٢٧٧٤].

(٢) حسن الإسناد موقوفاً، لكن قوله: «إن النطفة..» إلخ في حكم المرفوع، وقد صح مرفوعاً، «الإرواء» (٢١٤٣).

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٧٩٤-٧٩٥): [جاء هذا الحديث عن عائشة في سنن أبي داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٧- باب:

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی مرۆڤ بە هۆی ڕەوشت جوانیەوە پلەی دەگاتە پلەی ئەو کەسەی شەونوێژ دەکات.

٢٤٦- «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا الْقَاسِمِ ﷺ يَقُولُ: «خَيْرُكُمْ إِسْلَاماً أَحَاسِنُكُمْ أَخْلَاقاً إِذَا فَقِهُوا»»[1].

واتە: موحەممەدی کوڕی زیاد، دەڵی: گوێم لە ئەبو هورەیرە بوو (خوا لێی ڕازی بێ)، دەیگوت: گوێم لە ئەبو قاسم بوو (واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ) دەیفەرموو: باشترینتان لە دوای ئیسلام بوون ئەوانەتانن ڕەوشتیان زۆر جوانە، ئەگەر لە ئایین تێبگەن و شارەزابن.

٢٤٧- «عَنْ ثَابِتِ بْنِ عُبَيْدٍ، قَالَ: مَا رَأَيْتُ أَحَداً أَجَلَّ إِذَا جَلَسَ مَعَ الْقَوْمِ، وَلاَ أَفْكَهَ فِي بَيْتِهِ، مِنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ» [2].

واتە: سابتی کوڕی عوبەید دەڵێ: هیچ کەسێکم نەبینیوە گران و سەنگینتر بێ کاتێ دادەنیشت لەگەڵ خەڵکی لە کۆڕو مەجلیس و، کراوەترو قسەخۆشترو گاڵتەچی تر بێت لەگەڵ خانەوادەکەی، لە زەیدی کوڕی سابیت.

٢٤٨- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ: أَيُّ الأَدْيَانِ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ؟ قَالَ: «الْحَنِيفِيَّةُ السَّمْحَةُ»»[3].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا: ئایا خۆشەویسترین جۆری دینداری کامەیە لە لای خوا؟ فەرمووی: دینداری ئیبراهیمی بێ، کە دینداریەکە لادانی تەواوی تێدایە لە شیرك و کوفرو ڕووکردنی تەواویشی تێدایە بۆ یەکتاپەرستی و، ئاسانیش بێ.

٢٤٩- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: أَرْبَعُ خِلَالٍ إِذَا أُعْطِيتَهُنَّ فَلَا يَضُرُّكَ مَا عُزِلَ عَنْكَ مِنَ الدُّنْيَا: حُسْنُ خَلِيقَةٍ، وَعَفَافُ طُعْمَةٍ، وَصِدْقُ حَدِيثٍ، وَحِفْظُ أَمَانَةٍ»[4].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەفەرموێ: چوار خەسڵەت هەن، ئەگەر پێت ببەخشرێن، ئەوە هەر شتێکت لە دونیا لێ بسەنرێتەوە زیانت پێناگەیەنێ، (چوار خەسڵەتەکانیش ئەمانەن): ڕەوشتی جوان و، خواردنی حەڵاڵ و، ڕاستگۆیی لە قسە کردن و، پاراستنی ئەمانەت و سپاردە.

---

في حسن الخلق].

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٨٤٦).

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح لغيره: «السلسلة الصحيحة» (٨٨١).

(٤) صحيح موقوفاً، وصح مرفوعاً «السلسلة الصحيحة» (٧٣٣).

٢٥٠- « عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ:« تَدْرُونَ مَا أَكْثَرُ مَا يُدْخِلُ النَّارَ؟» قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: الأَجْوَفَانِ: الْفَرْجُ وَالْفَمُ، وَأَكْثَرُ مَا يُدْخِلُ الْجَنَّةَ؟ تَقْوَى اللَّهِ وَحُسْنُ الْخُلُقِ» [١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەزانن چ شتێك زۆرترین هۆكارە كە خەڵك دەخاتە ئاگرەوە؟ گوتیان: خواو پێغەمبەری خوا زاناترن، فەرمووی: دوو بۆشاییەكان: داوێن و دەم، هەروەها ئایا دەزانن چ شتێك زۆرترین هۆكارە كە خەڵكی دەخاتە بەهەشتەوە؟ پارێزكاری لە سنوورەكانی خواو، ڕەوشت جوانی.

٢٥١- « عَنْ أُسَامَةَ بْنِ شَرِيكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ وَجَاءَتِ الأَعْرَابُ، نَاسٌ كَثِيرٌ مِنْ هَاهُنَا وَهَاهُنَا، فَسَكَتَ النَّاسُ لاَ يَتَكَلَّمُونَ غَيْرَهُمْ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَعَلَيْنَا حَرَجٌ فِي كَذَا وَكَذَا؟ فِي أَشْيَاءَ مِنْ أُمُورِ النَّاسِ، لاَ بَأْسَ بِهَا، فَقَالَ:« يَا عِبَادَ اللَّهِ، وَضَعَ اللَّهُ الْحَرَجَ، إِلَّا امْرَءاً اقْتَرَضَ امْرَءاً ظُلْماً فَذَاكَ الَّذِي حَرِجَ وَهَلَكَ» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَتَدَاوَى؟ قَالَ:« نَعَمْ يَا عِبَادَ اللَّهِ تَدَاوَوْا، فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَمْ يَضَعْ دَاءً إِلَّا وَضَعَ لَهُ شِفَاءً، غَيْرَ دَاءٍ وَاحِدٍ» ، قَالُوا: وَمَا هِيَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: « الْهَرَمُ» قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا خَيْرُ مَا أُعْطِيَ الإِنْسَانُ؟ قَالَ:« خُلُقٌ حَسَنٌ»» [٢].

واتە: ئوسامەی كوڕی شەریك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: لە لای پێغەمبەر ﷺ بووم، خەڵكی دەشتەكی (ئەعرابەكان) لێرەو لەوێ هاتنە خزمەتی، هەموو خەڵك بێ دەنگ دەبوون، جگە لەوان كەس قسەی نەدەكرد، دەیانگوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئێمە گوناهبار نابین لەسەر ئەوەو ئەوە؟ دەربارەی چەند شتێك پرسیاریان دەكرد كە پەیوەندی بە كاروباری خەڵكەوە هەبوو، وە هیچ گرفتێكیان تێدانەبوو (لە ڕووی شەرعەوە)، فەرمووی: ئەی بەندەكانی خوا، خوا تاوانی لەسەر لابردوون، مەگەر كەسێك بە ستەم قەرزێكی وەرگرتبێ لە خەڵك (بیەوێ نەیداتەوە خاوەنەكەی)، ئا ئەوە گوناهو لە ناوچوونە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا چارەسەر بەكاربێنین (لە كاتی نەخۆشیدا)؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەی بەندەكانی خوا چارەسەر بەكاربێنن، چونكە دڵنیابن خوای زاڵی پایەدار هیچ دەردێكی دانەناوە، حەتمەن چارەسەریشی بۆ داناوە، تەنها یەك دەرد نەبێ، گوتیان: ئەم دەردە چیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: پیربوون، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین شتێك بە ئینسان بەخشرابێ چییە؟ فەرمووی: ڕەوشتی جوان.

٢٥٢- « عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَجْوَدَ النَّاسِ بِالْخَيْرِ، وَكَانَ أَجْوَدَ مَا يَكُونُ فِي رَمَضَانَ، حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلاَم، وَكَانَ جِبْرِيلُ يَلْقَاهُ فِي كُلِّ لَيْلَةٍ مِنْ رَمَضَانَ،

---

(١)حسن: (تخريج الترغيب» (٣/٢٥٦): [إبن ماجه: ٣٧- كتاب الزهد، ٢٩- باب: ذكر الذنوب، ح ٤٢٤٦].

(٢)صحيح: «تخريج الترغيب» (٣/٢٥٩) «غاية المرام» (٢٩٢): [إبن ماجه: ٣١ كتاب الطب، ١- باب: ما أنزل داء إلا أنزل له شفاء، ح ٣٤٣٦].

يَعْرِضُ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْقُرْآنَ، فَإِذَا لَقِيَهُ جِبْرِيلُ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَجْوَدَ بِالْخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ »[1].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەخشندەترینی خەڵكی بوو لە خێرو چاكە كردن، وە بەخشندەییەكەی زۆر زیاتر دەبوو لە ڕەمەزاندا كاتێ جبریل پێی دەگەیشت، جا لە هەموو شەوێكی مانگی ڕەمەزان جبریل (عَلَيْهِ السَّلاَم) پێی دەگەیشت و، پێغەمبەری خوا قوڕئانی بەسەر ڕادەنواندو بەسەریدا دەخوێندەوە، بۆیە كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەیشتە جبریل تینی بەخشندەییەكەی و ماڵ بەخشینی زیاتر دەبوو لەو بایەی كە بەردەوام هەڵدەكات.

٢٥٣- «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: حُوسِبَ رَجُلٌ مِمَّنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، فَلَمْ يُوجَدْ لَهُ مِنَ الْخَيْرِ إِلاَّ أَنَّهُ كَانَ رَجُلاً يُخَالِطُ النَّاسَ وَكَانَ مُوسِراً، فَكَانَ يَأْمُرُ غِلْمَانَهُ أَنْ يَتَجَاوَزُوا عَنِ الْمُعْسِرِ، قَالَ اللَّهُ عَزَّوَجَلَّ: فَنَحْنُ أَحَقُّ بِذَلِكَ مِنْهُ، فَتَجَاوَزَ عَنْهُ »[2].

واتە: ئەبو مەسعوودی ئەنصاریی (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لێپرسینەوە كرا لەگەڵ پیاوێك لە ئوممەتانی پێش ئێوە، جا هیچ چاكەیەكی نەبینرا، جگە لەوەی ئەو پیاوە كەسێك بووە تێكەڵاوی خەڵكی دەبوو، وە كەسێكی دەوڵەمەند بوو (قەرزی بە خەڵك دەدا)، جا (كە كاتی وەرگرتنەوەی قەرزەكەی دەهات) فەرمانی بە خزمەتكارەكانی دەكرد كە لە كەسی هەژارو نەدار خۆش بن (یان قەرزەكەی بۆ سووك بكەن)، جا خوای زاڵی پایەدار فەرمووی: ئێمە لەو شایستەترو لە پێشترین بە لێخۆشبوون، جا لێی خۆش بوو.

٢٥٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَا أَكْثَرُ مَا يُدْخِلُ الْجَنَّةَ؟ قَالَ: «تَقْوَى اللَّهِ، وَحُسْنُ الْخُلُقِ » قَالَ: وَمَا أَكْثَرُ مَا يُدْخِلُ النَّارَ؟ قَالَ: «الأَجْوَفَانِ: الْفَمُ وَالْفَرْجُ »»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پرسیار كرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شتە چیە كە زۆرترین هۆكارەو خەڵكی دەخاتە بەهەشتەوە؟ فەرمووی: پارێزكاری لە سنوورەكانی خواو، ڕەوشت جوانییە، وە فەرمووی: (ئەی دەزانن) زۆرترین هۆكار چیە كە خەڵكی دەخاتە ئاگرەوە؟ فەرمووی: دوو بۆشاییەكان: دەم و داوێن.

---

(١) صحيح: «الإرواء» (٨٨٨): [البخاري: ١- كتاب بدء الخلق، ٥- باب: حدثنا عبدان. مسلم: ٤٣- كتاب الفضائل، ١٢- باب كان النبي ﷺ أجود الناس، ح ٥٠].

(٢) صحيح: [مسلم: ٢٢- كتاب المساقاة، ح ٣٠].

(٣) حسن: [إبن ماجه: ٣٧- كتاب الزهد، ٢٩- باب: ذكر الذنوب، ح٤٢٤٦. الترمذي: ٢٥- كتاب البر والصلة، ٦٢- باب ماجاء في حسن الخلق].

٢٥٥- «عَنْ نَوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْبِرِّ وَالإِثْمِ؟ قَالَ: «الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ، وَالإِثْمُ مَا حَكَّ فِي نَفْسِكَ، وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ»»[١].

واتە: نەوواسی کوڕی سەمعانی ئەنصاڕیی (خوا لێی ڕازی بێ)، پرسیاری کردوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی چاکەو خراپە؟ ئەویش فەرموویەتی: چاکە: ڕەوشت جوانیە، خراپەش: بریتیە لەو شتەی کە لە دڵ و دەروونت دێت و دەچێت و دوودڵی لێی و پێت ناخۆشە خەڵك پێی بزانێ.

## دەربارەی: ڕەزیلی و چرووکی

٢٥٦- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَيِّدُكُمْ يَا بَنِي سَلَمَةَ؟» قُلْنَا: جُدُّ بْنُ قَيْسٍ، عَلَى أَنَّا نُبَخِّلُهُ، قَالَ: «وَأَيُّ دَاءٍ أَدْوَى مِنَ الْبُخْلِ؟ بَلْ سَيِّدُكُمْ عَمْرُو بْنُ الْجَمُوحِ»»[٢].

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی بەنی سەلەمە کێ گەورەی ئێوەیە؟ گوتمان: جوددی کوڕی قەیس، بەڵام ئەوەندە هەیە ئێمە بە ڕەزیل و چرووکی دادەنێین، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: جا چ نەخۆشییەك لە نەخۆشی ڕەزیلی خراپترە؟ فەرمووی: بەڵکو عەمری کوڕی جەموح گەورەتانە (واتە ڕەزیلی ڕێگرە ئەم پیاوە گەورەی ئێوە بێ، گەورە دەبێ سەخی بێ، ئەگەرنا چۆن یارمەتی ژێردەستەکانی دەدات).

٢٥٧- «عَنْ وَرَّاد كَاتِبُ الْمُغِيرَةِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَتَبَ مُعَاوِيَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) إِلَى الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ: أَنِ اكْتُبْ إِلَيَّ بِشَيْءٍ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ الْمُغِيرَةُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَنْهَى عَنْ قِيلَ وَقَالَ، وَإِضَاعَةِ الْمَالِ، وَكَثْرَةِ السُّؤَالِ، وَعَنْ مَنْعٍ وَهَاتِ، وَعُقُوقِ الأُمَّهَاتِ، وَعَنْ وَأْدِ الْبَنَاتِ»[٣].

واتە: لە وەڕرادەوە کە نووسەری موغیرە بوو (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: موعاویە (خوا لێی ڕازی بێ) نووسراوێکی بۆ موغیرەی کوڕی شوعبە نووسی (تێیدا گوتبووی): شتێکم بۆ بنووسە کە گوێت لێ بووە لە پێغەمبەری خواوە، جا موغیرە بۆی نووسی: (گوێم لێ بوو) پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی دەکرد لە: گوتراو گوتی (واتە: لەوەی مرۆڤ هەر بڵێ: گوێم لێ بوو ئاوا گوترا، فڵان ئاوای گوت، فەیسبوك ئاوای گوت، هەرچی کەوتە بەر گوێی بیکاتە هەواڵ)، وە نەهی کردوە لە ماڵ بە فیڕۆدان و، زۆر پرسیار کردن، وە پێنەدانی هەق بەوەی کە دەبێ پێی ببەخشێت وە بەخشین و نزیکخستەوەی کەسانێك کە هەق نیە پێیان ببەخشێت، وە ئازاردانی دایکان، وە لە

---

(١) صحيح: [مسلم: ٤٥-كتاب البر واصلة والآداب، ح ٤١، ١٥].

(٢) صحيح: «الروض النضير» (٤٨٤).

(٣) صحيح: [البخاري: ٨١- كتاب الرقاق، ٢٣- باب: ما يكره من قيل وقال. مسلم: ٣٠- كتاب الأقضية، ح ١٢، ١٤].

**زیندەبەچاڵ كردنی كچان (بە هۆی هەست كردن بە سووكیەوە، كە ئەمە لەسەردەمی نەفامیی باو بووە، دوای هاتنی ڕەحمەتی جیهانییان ﷺ كۆتایی پێهێنرا).**

**٢٥٨-** «عَن جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، مَا سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ شَيْءٍ قَطُّ فَقَالَ: لاَ»[١].

**واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ داوای هیچ شتێكی لێنەكراوە، فەرمووبێتی: نا، یان نەخێر (بەڵكو حەتمەن بەخشیویەتی).**

## دەربارەی: ماڵی چاك بۆ پیاوی چاك

**٢٥٩-** «عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: بَعَثَ إِلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ فَأَمَرَنِي أَنْ آخُذَ عَلَيَّ ثِيَابِي وَسِلاَحِي، ثُمَّ آتِيهِ، فَفَعَلْتُ فَأَتَيْتُهُ وَهُوَ يَتَوَضَّأُ، فَصَعَّدَ إِلَيَّ الْبَصَرَ ثُمَّ طَأْطَأَ، ثُمَّ قَالَ: «يَا عَمْرو! إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَبْعَثَكَ عَلَى جَيْشٍ فَيُغْنِمُكَ اللَّهُ، وَأَرْغَبُ لَكَ رَغْبَةً مِنَ الْمَالِ صَالِحَةً»، قُلْتُ: إِنِّي لَمْ أُسْلِمْ رَغْبَةً فِي الْمَالِ، إِنَّمَا أَسْلَمْتُ رَغْبَةً فِي الإِسْلَامِ فَأَكُونُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «يَا عَمْرُو! نِعْمَ الْمَالُ الصَّالِحِ لِلْمَرْءِ الصَّالِحِ»»[٢].

**واتە: عەمری كوڕی عاص (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە دوایدا ناردم و فەرمانی پێكردبووم پۆشاك و چەكم هەڵبگرم و بچمە خزمەتی، منیش وام كردو، چوومە خزمەتی، لە كاتێكدا دەستنوێژی هەڵدەگرت، چاوی بەرز كردەوە بۆ لای من (تەماشای كردم)، دواتر سەری داخست، پاشان فەرمووی: ئەی عەمر! من دەمەوێ بتنێرم بۆ سەر سوپایەك، وە خوا دەستكەوتی جەنگت پێبدات، وە پێم خۆشە ماڵێكی چاكت دەستبكەوێ، دەڵێ: منیش گوتم: من بۆ ئەوە مسوڵمان نەبووم ماڵ و سامانم دەست بكەوێ، بەڵكو من لە خۆشی ئەوە هاتمە نێو ئیسلام و مسوڵمان بووم تاوەكو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بم، فەرمووی: ئەی عەمر! باشترین (نیعمەت) ماڵی چاكە، بۆ پیاوی چاك.**

## دەربارەی: هەر كەسێك بەیانی بكاتەوە بە سەلامەتی لە دڵ و دەروونەوە

**٢٦٠-** «عَنْ سَلَمَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ مِحْصَنٍ الْأَنْصَارِيِّ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَصْبَحَ آمِناً فِي سِرْبِهِ، مُعَافًى فِي جَسَدِهِ، عِنْدَهُ طَعَامُ يَوْمِهِ، فَكَأَنَّمَا حِيزَتْ لَهُ الدُّنْيَا»»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح: المشكاة (٣٧٥٦/ التحقيق الثاني).

(٣) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٢٣١٨): [الترمذي: ٣٤- كتاب الزهد، ٣٤- باب: حدثنا عمرو بن مالك. إبن ماجه: ٣٧- كتاب الزهد، ٩- باب: القناعة، ح ٤١٤١].

واتە: سەلەمەی كوڕی عوبەیدوڵڵای كوڕی میحصەنی ئەنصاڕیی لە باوكیەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر كەسێك بەیانی كردەوە لە جێگاو ڕێگای خۆیدا لە خۆی دڵنیابێ و ترسی لەسەر نەبێ، وە لە جەستەیدا سەلامەت بێ و بێ دەردو بەڵا بێ، وە نان و بژێوی ئەو ڕۆژەی هەبێت، (واتە: نان و ئەمان و لەش ساغیی هەبێ)، ئەمە وەك ئەوە وایە هەموو دونیای بۆ كۆكرابێتەوەو پێی بەخشرابێ.

## دەربارەی: دڵخۆش بوون

٢٦١- «عَنْ مُعَاذَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ خُبَيْبٍ الْجُهَنِيَّ يُحَدِّثُ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَمِّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ عَلَيْهِمْ وَعَلَيْهِ أَثَرُ غُسْلٍ، وَهُوَ طَيِّبُ النَّفْسِ، فَظَنَنَّا أَنَّهُ أَلَمَّ بِأَهْلِهِ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، نَرَاكَ طَيِّبَ النَّفْسِ؟ قَالَ: «أَجَلْ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ» ثُمَّ ذُكِرَ الْغِنَى، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّهُ لاَ بَأْسَ بِالْغِنَى لِمَنِ اتَّقَى، وَالصِّحَّةُ لِمَنِ اتَّقَى خَيْرٌ مِنَ الْغِنَى، وَطِيبُ النَّفْسِ مِنَ النِّعَمِ »»[١].

واتە: موعازی كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی خوبەیبی جوهەنی دەگێڕێتەوە، لە باوكیەوە، ئەویش لە مامی (خوا لێی ڕازی بێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ لایان لە كاتێكدا شوێنەواری خۆ شۆردنی پێوە دیار بوو و دڵخۆش بوو، جا پێمان وابوو چۆتە لای خێزانەكانی، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبینین دڵخۆشی؟ فەرمووی: بەڵێ سوپاس بۆ خوا، پاشان باسی دەوڵەمەندی كرا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هیچ گرفتێك لە دەوڵەمەندیدا نیە بۆ كەسی پارێزكارو، لەشساغی بۆ كەسی پارێزكار چاكترە لە دەوڵەمەندی، وە دڵخۆشی یەكێكە لە نازو نیعمەتەكان.

٢٦٢- «عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْبِرِّ وَالْإِثْمِ؟ فَقَالَ: «الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ، وَالإِثْمُ مَا حَكَّ فِي نَفْسِكَ وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ »»[٢].

واتە: نەوواسی كوڕی سەمعانی ئەنصاڕیی (خوا لێی ڕازی بێ) پرسیاری كردوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی چاكەو خراپە؟ ئەویش فەرموویەتی: چاكە: ڕەوشت جوانیە، خراپەش: بریتیە لەو شتەی كە لە دڵ و دەروونت دێ و دەچێت و دڵە خورپەتە تیایداو پێت ناخۆشەو حەزناكەی خەڵك پێی بزانێ.

٢٦٣- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَحْسَنَ النَّاسِ، وَأَجْوَدَ النَّاسِ، وَأَشْجَعَ النَّاسِ، وَلَقَدْ فَزِعَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَانْطَلَقَ النَّاسُ قِبَلَ الصَّوْتِ، فَاسْتَقْبَلَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ سَبَقَ النَّاسَ إِلَى الصَّوْتِ وَهُوَ يَقُولُ: «لَنْ تُرَاعُوا، لَنْ تُرَاعُوا» وَهُوَ عَلَى فَرَسٍ لِأَبِي طَلْحَةَ عُرْيٍ، مَا عَلَيْهِ سَرْجٌ، وَفِي عُنُقِهِ السَّيْفُ، فَقَالَ: «لَقَدْ وَجَدْتُهُ بَحْرًا، أَوْ إِنَّهُ لَبَحْرٌ »»[٣].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٧٤): [إبن ماجه: ١٢- كتاب التجارات ١- باب: الحض على المكاسب، ح ٢١٤١].

(٢) صحيح.

(٣) صحيح الإسناد: [البخاري: ٥٦- كتاب الجهاد، ٢٤- باب: الشجاعة في الحرب والجبن. مسلم: ٤٣- كتاب الفضائل، ح ٤٨].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چاكترین و جوانترینی خەڵكی بوو، وە سەخیترینی خەڵكی بوو، وە ئازاترینی خەڵكی بوو، لە شەوێكدا خەڵكی مەدینە ڕاچڵەكین و ترسان (بە هۆی دەنگێكەوە)، خەڵكەكەش بەرەو لای دەنگەكە ڕۆیشتن، جا بینیان وا پێغەمبەر ﷺ بەرەو ڕوویان دەگەڕێتەوە، پێش خەڵكەكە بەرەو لای دەنگەكە ڕۆیشتبوو، وە دەیفەرموو: مەترسن، مەترسن، لە كاتێكدا لەسەر ئەسپی ئەبو تەڵحە بوو بەبێ كورتان، شمشێریشی بە گەردن و شانیەوە بوو، وە فەرمووی: من دەنگەكەم دۆزیەوە ئەسپ بوو.

٢٦٤- « عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:« كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ، إِنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ، وَأَنْ تُفْرِغَ مِنْ دَلْوِكَ فِي إِنَاءِ أَخِيكَ»» [١].

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو چاكەیەك خێرو صەدەقەیەكە، جا یەكێك لە چاكەكان ئەوەیە تۆ بگەیە برای خۆت بە ڕوویەكی گەش و خۆشەوە، یاخود لە دۆلكەو مەتارەی خۆت (ئاو، یان هەر شتێكی دیكە) بخەیتە نێو جامەكەی برای مسوڵمانت و پێی ببەخشی.

## دەربارەی:ئەوەی پێویستە لە یارمەتی دانی لێقەوماو

٢٦٥- « عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ: أَيُّ الأَعْمَالِ خَيْرٌ؟ قَالَ:« إِيمَانٌ بِاللَّهِ، وَجِهَادٌ فِي سَبِيلِهِ» ، قَالَ: فَأَيُّ الرِّقَابِ أَفْضَلُ؟ قَالَ:« أَغْلاَهَا ثَمَناً، وَأَنْفَسُهَا عِنْدَ أَهْلِهَا» ، قَالَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ لَمْ أَسْتَطِعْ بَعْضَ الْعَمَلِ؟ قَالَ:« تُعِينُ ضَائِعاً، أَوْ تَصْنَعُ لأَخْرَقَ» ، قَالَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ ضَعُفْتُ؟ قَالَ:« تَدَعُ النَّاسَ مِنَ الشَّرِّ، فَإِنَّهَا صَدَقَةٌ تَصَدَّقُهَا عَلَى نَفْسِكَ»» [٢].

واتە: ئەبو زەڕ (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە كە پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ كرا: كام كردەوە باشترینە؟ فەرمووی: بڕوا بوون بە خواو تێكۆشان لە پێناویدا، پاشان (پرسیاركەرەكە) گوتی: ئەدی چ جۆرە ئازاد كردنێكی كۆیلە باشترینە؟ فەرمووی: ئەوەی كە نرخی گرانەو لە لای خاوەنەكەی بە بەهایە، گوتی: ئەدی ئەگەر نەمتوانی هەندێ لەم كردەوانە بكەم، فەرمووی: یارمەتی كەسێكی هەژارو پەككەوتە بدە، یانیش شتێك ساز بكەی بۆ كەسێك كە پێویستیەتی و خۆی نازانێت و ناتوانێت سازی بكات، گوتی: ئەدی ئەگەر نەمتوانی و بێهێز بووم؟ فەرمووی: با خەڵكی لە شەڕو خراپەت دوور بن، چونكە ئەویش چاكەیەكە بۆ خودی خۆت ئەنجامی دەدەی.

---

(١)حسن: «تخريج الترغيب» (٢٦٤/٣): [الترمذي: ٢٥- كتاب البر والصلة، ٤٥-باب: ما جاء في طلاقة الوجه].
(٢)صحيح.

٢٦٦- «عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي بُرْدَةَ، سَمِعْتُ أَبِي يُحَدِّثُ، عَنْ جَدِّي (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ صَدَقَةٌ»، قَالَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ لَمْ يَجِدْ؟ قَالَ: «فَلْيَعْمَلْ، فَلْيَنْفَعْ نَفْسَهُ، وَلْيَتَصَدَّقْ»، قَالَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ، أَوْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قَالَ: «لِيُعِنْ ذَا الْحَاجَةِ الْمَلْهُوفَ»، قَالَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ، أَوْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قَالَ: «فَلْيَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ»، قَالَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ، أَوْ لَمْ يَفْعَلْ؟ قَالَ: «يُمْسِكُ عَنِ الشَّرِّ، فَإِنَّهَا لَهُ صَدَقَةٌ»»(١).

**واته: سەعیدی كوڕی ئەبو بوردە دەڵێ: گوێم لە باوكم بوو، لە باپیرمی (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕایەوە، كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ڕۆژانە) لەسەر هەموو مسوڵمانێك چاكەیەك واجبە، (كەسێك) گوتی: ئەگەر نەیتوانی؟ فەرمووی: با كارێك بكات سوود بە خۆی بگەیەنێ و پارە پەیدا بكات و چاكەیەكی پێبكات، گوتی: ئەگەر نەیتوانی؟ یان نەیكرد؟ فەرمووی: با یارمەتی كەسێك بدات كە پێویستیەكی هەیەو داوای یارمەتی دەكات، گوتی: ئەگەر نەیتوانی؟ یان نەیكرد؟ فەرمووی: با فەرمان بە چاكە بكات، گوتی: ئەگەر ئەوەشی نەتوانی، یان نەیكرد؟ فەرمووی: با خراپەی خۆی لێیان بگرێتەوە، ئەوە بۆ ئەو خێرەو چاكەی بۆ دەنووسرێ.**

## دەربارەی: بڕوادار نەفرینكار نیە

٢٦٧- «عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: مَا سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ لاَعِناً أَحَداً قَطُّ، لَيْسَ إِنْسَاناً، وَكَانَ سَالِمٌ يَقُولُ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ يَنْبَغِي لِلْمُؤْمِنِ أَنْ يَكُونَ لَعَّاناً»»(٢).

**واتە: سالمی كوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هەرگیز نەمبیستوە عەبدوڵڵا نەفرینی لە هیچ شتێك كردبێ، تەنانەت ئەگەر مرۆڤیش نەبووبێ، وە سالم دەیگوت: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بۆ ئیماندار ناگونجێ و نابێ كەسێكی نەفرینكار بێ.**

٢٦٨- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ يَهُوداً أَتَوُا النَّبِيَّ ﷺ فَقَالُوا: السَّامُ عَلَيْكُمْ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: وَعَلَيْكُمْ، وَلَعَنَكُمُ اللَّهُ، وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ، قَالَ: «مَهْلاً يَا عَائِشَةُ، عَلَيْكِ بِالرِّفْقِ، وَإِيَّاكِ وَالْعُنْفَ وَالْفُحْشَ»، قَالَتْ: أَوَ لَمْ تَسْمَعْ مَا قَالُوا؟ قَالَ: «أَوَ لَمْ تَسْمَعِي مَا قُلْتُ؟ رَدَدْتُ عَلَيْهِمْ، فَيُسْتَجَابُ لِي فِيهِمْ، وَلاَ يُسْتَجَابُ لَهُمْ فِيَّ»»(٣).

---

(١) حسن صحيح: «تخريج السنة» (١٠١٤) «السلسلة الصحيحة» (٢٦٣٦): [ليس في شيء من الكتب الستة] الحديث ٣٠٩- أخرجه الترمذي في البر باب ماجاء في الطعن واللعن.

(٢) حسن صحيح.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٣٧/ التحقيق الثاني): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٣٨- باب: لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ ﷺ فاحشاً

واتە: (دایکمان) عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: کۆمەڵێك جوولەکە هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ گوتیان: (السَّامُ عَلَيْكُمْ) واتە: مردنتان لەسەر بێت (بە جۆرێك دەریان دەبڕی تا بە سەلام بچێت بۆ گاڵتە کردن بە پێغەمبەری خواو مسوڵمانان)، عائیشە دەڵێ: منیش گوتم: (وَعَلَيْكُمْ، وَلَعَنَكُمُ اللَّهُ، وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ)، واتە: لەسەر ئێوە بێت، خوا نەفرینتان لێ بدات و، تووڕەبوونی خواتان لەسەر بێ (جا دەڵێ) پێغەمبەر ﷺ گوتی: لەسەرخۆبە ئەی عائیشە، دەست بە نەرمونیانیەوە بگرە (نەرم و لەسەرخۆبە)و دوور بکەوە لە توندی و قسەی خراپ، دەڵێ: منیش گوتم: ئاخر ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ نەتبیست ئەوان چیان گوت؟! ئەویش فەرمووی: تۆش نەتبیست منیش چیم گوت؟ گەڕاندمەوە بۆ خۆیان (گوتم: وعلیکم)، جا هی من دەربارەی ئەوان وەڵام دەدرێتەوە (خوا لە بەینیان دەبات)، هی ئەوانیش دەربارەی من وەڵام نادرێتەوە (واتە: قسەی زیاترم پێ نەگوتن هەر خۆشیان زەرەریان کرد خوا هی من قبووڵ دەکات، نەك هی ئەوان).

٢٦٩- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِالطَّعَّانِ، وَلاَ اللَّعَانِ، وَلاَ الْفَاحِشِ وَلا الْبَذِيءِ»»[١].

واتە: عەبدوڵڵا (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئیماندار تانەدەرو، نەفرینکارو، قسە ناشیرین و، زمان شڕو جنێو فرۆش نیە، (لەگەڵ هیچ کەسێکدا).

٢٧٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَنْبَغِي لِذِي الْوَجْهَيْنِ أَنْ يَكُونَ أَمِيناً»»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، فەرموویەتی: نابێ و ناگونجێ کەسی دووڕوو (دوو زمان) ببێتە ئەمیندارو سپاردەی بدرێتە دەست.

٢٧١- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: «أَلأَمُ أَخْلاَقِ الْمُؤْمِنِ الْفُحْشُ»»[٣].

واتە: عەبدوڵڵا دەڵێ: خراپترین و قێزەونترین ڕەوشت بۆ کەسی بڕوادار بریتیە لە زمان پیسی و جنێوفرۆشی.

---

ولا متفحشاً. مسلم: ٣٩- كتاب السلام، ح ١٠].

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣٢٠): [الترمذي: كتاب البر والصلة، ٤٨- باب: ما جاء في اللعنة].

(٢) حسن صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣١٩٧): [لا يوجد في الكتب الستة].

(٣) صحيح الإسناد.

## دەربارەی: نەفرەت کردن

٢٧٢- «عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ اللَّعَّانِينَ لاَ يَكُونُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُهَدَاءَ، وَلاَ شُفَعَاءَ »»[١].

واتە: ئەبو دەرداء (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوانەی کە نەفرینکارن لە ڕۆژی دواییدا نەدەکرێنە شایەد (بەسەر ئوممەتانی دیکەوە، کە پلەو ڕێزێکی گەورەیە لەم ڕۆژەدا)، وە نە دەکرێنە تکاکار (کاتێك ئیمانداران تکا بۆ یەکدی دەکەن و، بە هۆیەوە خەڵك لە سزا نەجاتیان دەبێ).

٢٧٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا يَنْبَغِي لِلصِّدِّيقِ أَنْ يَكُونَ لَعَّاناً »»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نابێ و ناگونجێ کەسی ڕاستگۆ نەفرینکار بێ.

٢٧٤- «عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: مَا تَلَاعَنَ قَوْمٌ قَطُّ إِلاَّ حُقَّ عَلَيْهِمُ اللَّعْنَةُ »[٣].

واتە: حوزەیفە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: هیچ کۆمەڵێك نیە نەفرین لە یەکدی بکەن، حەتمەن نەفرەت لەسەریان دەچەسپێ.

## دەربارەی: هەر کەسێك نەفرەت بکات لە کۆیلەکەی دەبێ ئازادی بکات

٢٧٥- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ لَعَنَ بَعْضَ رَقِيقِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا أَبَا بَكْرٍ، اللَّعَّانِينَ وَالصِّدِّيقِينَ؟ كَلاَّ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ » مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثاً، فَأَعْتَقَ أَبُو بَكْرٍ يَوْمَئِذٍ بَعْضَ رَقِيقِهِ، ثُمَّ جَاءَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: لاَ أَعُودُ »[٤].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئەبو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ)، نەفرینی کرد لە هەندێك لە کۆیلەکانی، بۆیە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئەی ئەبو بەکر ڕاستگۆییان و نەفرینکردنیان گوتوە؟! (واتە: چۆن دەکرێ هەردوو سیفەت کۆبکەیتەوە)؟! نەخێر بە پەروەردگاری کەعبە (ئەم دوو سیفەتە بەیەکەوە کۆنابنەوە)، دووجار، یان سێ جار ئەمەی فەرموو، بۆیە ئەبو بەکر

---

(١) صحيح: [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٨٥].

(٢) صحيح: «التعليق الرغيب» (٣/٢٨٦): [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة، ح ٨٤].

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح: «تخريج الترغيب» (٣/٢٨٦).

هەر لەو ڕۆژەدا هەندێ لە کۆیلەکانی ئازاد کردن (کە نەفرینی لێکردبوون) پاشان پێغەمبەر ﷺ هات: (ئەبو بەکریش) گوتی: ناگەڕێمەوە سەر ئەم کارە (واتە: لەم ڕۆژە بەولاوە نەفرین کردنی واز لێهێنا).

## دەربارەی:نەفرین کردنی کافر

٢٧٦- « عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ، قَالَ: « إِنِّي لَمْ أُبْعَثْ لَعَّاناً، وَلَكِنْ بُعِثْتُ رَحْمَةً»» [١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ دوعاو نەفرین لە هاوبەش دانەران ناکەی؟! فەرمووی: من نەنێردراوم تاکو نەفرینکاربم، بەڵکو بە ڕەحمەت و بەزەیی بۆ خەڵك نێردراوم.

## دەربارەی:قسە هێنان و بردنی نێوان خەڵك

٢٧٧- « عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ:« لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ»» [٢].

واتە: حوزەیفە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: بیستم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: (هەرگیز لە سەرەتاوە) ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی قسە دێنێ و دەبات لە نێوان خەڵکدا (بۆ ئەوەی کێشەو ئاشووب بنێتەوە).

تێبینی: سیفەتی (قتات) لەبەر گەورەیی تاوانەکەی، خوای دادگەر ئەم سزایە سەختەی بۆ خاوەنەکەی داناوە، چونکە ئەم سیفەتە ئەو واتایانە دەگرێتە خۆی:

١-ڕەنگە ئەو کەسە بچێ لە پشت دەرگا گوێ لەو قسانە بگرێت و بە خراپترین شێوە بیگێڕێتەوە.

٢-یان بە ئامرازێك، قسەکان تۆمار بکات و بیگوازێتەوەو بیگۆڕێ.

٣- یاخود نامەی مۆبایل، یان هەر ئامێرێکی دیکە دەدزێ و، بۆ مەبەستی ئاشووب بە کاری دێنێ.

بە داخەوە، ئەوانە ئێستا لە هەموو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی زۆر زۆر بوو ون.

---

(١)صحيح: [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة ح ٨٧].

(٢)صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٠٣٤): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٥٠- باب: ما يكره من النميمة. مسلم: ١- كتاب الإيمان، ح ١٦٩، ١٧٠].

٢٧٨- «عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها)، قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِخِيَارِكُمْ؟» قَالُوا: بَلَى، قَالَ: «الَّذِينَ إِذَا رُؤُوا ذُكِرَ اللَّهُ، أَفَلَا أُخْبِرُكُمْ بِشِرَارِكُمْ؟» قَالُوا: بَلَى، قَالَ: «الْمَشَّاؤُونَ بِالنَّمِيمَةِ، الْمُفْسِدُونَ بَيْنَ الأَحِبَّةِ، الْبَاغُونَ الْبُرَآءَ الْعَنَتَ»»[1].

**واتە: ئەسمائی کچی یەزید (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا هەواڵتان پێ نەدەم بە باشترینتان؟ گوتیان: با، فەرمووی: (باشترینتان) ئەوانەتانن کاتێ دەبینرێن خوا دێتەوە یاد (واتە: کە خەڵك دەیانبینێ، ڕاستەوخۆ خوایان دێتەوە یادو، وەك ڕەمزی خواپەرستیان لێهاتووەو، هەست دەکرێ دۆستانی خوان)، (وە فەرمووی): ئایا هەواڵتان پێ نەدەم بە خراپترینتان؟ گوتیان: با، فەرمووی: (خراپترینتان) ئەوانەن کە قسە دێنن و دەبەن، تێکدەری نێوانی خۆشەویستانن، سنووریان بەزاندووە لە بەری بوون و لە ئاشووب و لەبەینچوون (واتە: زێدەڕۆییان کردوە لە دوورکەوتنەوە لە سیفەتی مسوڵمانەتی).**

## دەربارەی: ئەو کەسەی شتی خراپ دەبیستێ و بڵاوی دەکاتەوە

٢٧٩- «عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: الْقَائِلُ الْفَاحِشَةَ، وَالَّذِي يُشِيعُ بِهَا، فِي الإِثْمِ سَوَاءٌ»[2].

**واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئەو کەسەی بە خراپە دەدوێ و، ئەو کەسەش کە بڵاوی دەکاتەوە، هەردووکیان لە گوناهو تاوان یەکسانن (پێکەوە بەشدارن وەك یەك).**

٢٨٠- «عَنْ شُبَيْلِ بْنِ عَوْفٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ يُقَالُ: مَنْ سَمِعَ بِفَاحِشَةٍ فَأَفْشَاهَا، فَهُوَ فِيهَا كَالَّذِي أَبْدَاهَا»[3].

**واتە: شوبەیلی کوڕی عەوف (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: دەگوترا: هەر کەس گوێبیستی خراپەیەك بێت و بڵاوی بکاتەوە، وەك ئەو کەسەیە کە سەرەتا قسە خراپەکەی کردوە.**

٢٨١- «عَنْ عَطَاءٍ، أَنَّهُ كَانَ يَرَى النَّكَالَ عَلَى مَنْ أَشَاعَ الزِّنَا، يَقُولُ: أَشَاعَ الْفَاحِشَةَ»[4].

**واتە: عەطاء پێی وابوو تەمبێ کردن هەیە بۆ ئەو کەسەی ئەو شتانە بڵاو دەکاتەوە کە پەیوەندی بە زیناوە هەیە، دەیگوت: کردەوەو گوفتاریی قێزەون و خراپی بڵاو کردۆتەوە.**

---

(١) حسن: «تخريج الترغيب» (٣/٢٩٥)، وللشطر الأول منه شاهد صحيح به مخرج في «السلسلة الصحيحة» (١٦٤٦)، ثم حسنت تمامه في «التعليق الرغيب» (٣/٢٦٠، ٢٩٥).

(٢) حسن الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح الإسناد.

## دەربارەی: ئەوەی زۆر عەیب و ڕەخنە لە خەڵك دەگرێ

٢٨٢- «عَنْ حَكِيمِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيّاً (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: لاَ تَكُونُوا عُجُلاً مَذَايِيعَ بُذُراً[١]، فَإِنْ مِنْ وَرَائِكُمْ بَلاَءً مُبَرِّحاً مُكْلِحاً[٢]، وَأُمُوراً مُتَمَاحِلَةً[٣] رُدُحاً»[٤].

**واتە: حەكیمی كوڕی سەعد دەڵێ: گوێم لە عەلی بوو (خوا لێی ڕازی بێ)، دەیگوت: زۆر بە پەلەپەل مەبن و، مەبنە ئەو كەسەی خراپە بڵاودەكاتەوەو خۆی بۆ ناگیرێ نهێنیان ئاشكرا دەكات، چونكە لە دوای ئێوە زۆر بەڵای توندو سەخت و خراپ و، كۆمەڵێك بابەتی دورودرێژو قورس بەڕێوەنە (وەك ئەوەی لە حاڵی ئێستامان بدوێ، لە ڕۆژگاری فەیسبوك!!).**

٢٨٣- «عَنْ عَامِرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو جَبِيرَةَ بْنُ الضَّحَّاكِ، قَالَ: فِينَا نَزَلَتْ، فِي بَنِي سَلِمَةَ: ﴿ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ ﴿١١﴾ ﴾الحجرات، قَالَ: قَدِمَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَلَيْسَ مِنَّا رَجُلٌ إِلاَّ لَهُ اسْمَانِ، فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «يَا فُلاَنُ»، فَيَقُولُونَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهُ يَغْضَبُ مِنْهُ»[٥].

**واتە: عامر دەڵێ: ئەبو جەبیرەی كوڕی ضەححاك بۆی گێڕامەوە، گوتی: ئەم ئایەتە دەربارەی ئێمەی بەنی سەلەمە هاتە خوارەوە: ﴿ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ ﴿١١﴾ ﴾الحجرات (واتە: ناوو ناتۆرە لە یەكدی مەنێن)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لامان، هیچ پیاوێكمان نەبوو مەگەر دوو ناوی هەبوون (ناوی گاڵتەجاڕیمان بۆ یەكدی دانابوون)، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: فڵان كەس، یەكسەر دەیانگوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەو ناوە تووڕە دەبێ، (چونكە كە خەڵكەكە ئەو ناوەیان لێنابوو مەبەستێكی خراپی لە پشت هەبوو، پێغەمبەری خواش ﷺ نەیزانی بوو چیان كردوە، جا ئایەتەكە دابەزی و نەهی كرد لەو بابەتە).**

٢٨٤- «عَنِ الْحَكَمِ، قَالَ: سَمِعْتُ عِكْرِمَةَ يَقُولُ: لاَ أَدْرِي أَيُّهُمَا جَعَلَ لِصَاحِبِهِ طَعَاماً، ابْنُ عَبَّاسٍ أَوِ ابْنُ عَمِّهِ، فَبَيْنَا الْجَارِيَةُ تَعْمَلُ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ، إِذْ قَالَ أَحَدُهُمْ لَهَا: يَا زَانِيَةُ، فَقَالَ: مَهْ، إِنْ لَمْ تَحُدَّكَ فِي الدُّنْيَا تَحُدُّكَ فِي الآخِرَةِ، قَالَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ كَذَاكَ؟ قَالَ: ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): إِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْفَاحِشَ الْمُتَفَحِّشَ»[٦].

---

(١) جمع مذياع، من اذاع الشيء صيغة مبالغة، والمراد ها هنا الذين يشيعون الفاحشة. والبذر الذي لا يستطيع ان يكتم سره.

(٢) أي يكلح الناس لشدته.

(٣) أي فتنا طويلة الدة.

(٤) صحيح الإسناد.

(٥) صحيح: «التعليق على ابن ماجه» (٣٧٤١): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٦٣- باب: في الألقاب. الترمذي: ٤٤- كتاب التفسير، ٤٩- سورة الحجرات، ح ٣].

(٦) حسن الإسناد.

واتە: حەكەم دەڵێ: گوێم لە عیكریمە بوو، دەیگوت: نازانم كامیان خواردنی بۆ ئەوی دی دروست كرد بوو، ئیبنو عەبباس، یان كوڕە مامەكەی (گرنگ ئەوەیە یەكێكیان خواردنی بۆ ئەوەیتریان دروست كردبوو)، جا لەوكاتەدا ئافرەتێكی خزمەتكار لە ژێر دەستیان كاری دەكرد، لە ناكاو یەكێكیان (واتە: كوڕە مامەكەی ئیبنو عەبباس) بە خزمەتكارەكەی گوت: ئەی زیناكەر، (جا ئەوی دیكەیان) گوتی: وا مەڵێ، ئەگەر ئەو لە دونیا بەرانبەرت نەوەستێ و بێ دەسەڵات بێ، ئەوە لە قیامەت بەرانبەرت دەوەستێتەوە، ئەویش گوتی: ئەدی ئەگەر ئەوەی دەیڵێم وا بوو؟ ئیبنو عەبباس (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: (با واش بێ) خوا كەسی دەم پیس و خراپە بڵاوكەرەوەی خۆشناوێ (ئەوە قسەی خراپ بڵاوكردنەوەیە).

٢٨٥- « عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ:« لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِالطَّعَّانِ، وَلاَ اللَّعَانِ، وَلاَ الْفَاحِشِ، وَلاَ الْبَذِيءِ»» (١).

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئیماندار تانە لێدەرو نەفرین لێكەرو قسە ناشیرین و زمان شڕو جنێو فرۆش نیە (لەگەڵ هیچ كەسێكدا).

## دەربارەی:ستایش و پێداهەڵگوتن

٢٨٦- « عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَجُلاً ذُكِرَ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَأَثْنَى عَلَيْهِ رَجُلٌ خَيْرًا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ:« وَيْحَكَ قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ» ، يَقُولُهُ مِرَارًا،« إِنْ كَانَ أَحَدُكُمْ مَادِحًا لاَ مَحَالَةَ فَلْيَقُلْ: أَحْسَبُ كَذَا وَكَذَا« إِنْ كَانَ يَرَى أَنَّهُ كَذَلِكَ» وَحَسِيبُهُ اللَّهُ، وَلاَ يُزَكِّي عَلَى اللَّهِ أَحَدًا»» (٢).

واتە: ئەبو بەكرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك لە لای پێغەمبەر ﷺ ناوی هێنرا جا پیاوێك (لەوێ بوو) زۆر ستایشی پیاوە ناوهێنراوەكەی كرد (ڕووبەڕوو)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هاوار بە حاڵت، ملی هاوەڵەكەت بڕی، چەند جارێك ئەمەی دووبار دەكردەوە، (فەرمووی:) ئەگەر یەكێك هیچ چارەی نەبوو هەر دەبووا مەدحی بەرانبەرەكەی بكات، ئەوە با بڵێ: من پێم وایە ئاواو ئاوایە، ئەوە لە حاڵەتێكدا ئەگەر بینی ئاوایە، وە بۆ لای خوا بیگێڕێتەوە (بڵێ: خوا زاناترە بە حەقیقەتەكەی)، با كەس تەزكیە نەكات بەسەر خواوە (چونكە هەر خوا بەندە ناسە).

٢٨٧- « عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: سَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلاً يُثْنِي عَلَى رَجُلٍ وَيُطْرِيهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ:« أَهْلَكْتُمْ، أَوْ قَطَعْتُمْ ظَهْرَ الرَّجُلِ»» (٣).

---

(١)صحيح.

(٢)صحيح: [البخاري: ٥٢- كتاب الشهادات، ١٦- باب: إذا ذكر رجل رجلًا].

(٣)صحيح: [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٥٤- باب: ما يكره من التمادح. مسلم: ٥٣- كتاب الزهد، ح ٦٧].

واتە: ئەبو مووسا (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ گوێی لێ بوو پیاوێك بەسەر پیاوێكی دیكەی هەڵدەداو زێدەڕۆیی دەكرد لە مەدح كردنی، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە ناوتان برد، یان پشتی ئەو پیاوەتان شكاند.

٢٨٨- «عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ عُمَرَ، فَأَثْنَى رَجُلٌ عَلَى رَجُلٍ فِي وَجْهِهِ، فَقَالَ: عَقَرْتَ الرَّجُلَ، عَقَرَكَ اللَّهُ »[١].

واتە: ئیبراهیمی تەیمی لە باوكی دەگێڕێتەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتوویەتی: دانیشتبووین لە لای عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، جا پیاوێك ڕووبەڕوو مەدحی پیاوێكی كرد، عومەر گوتی: سەرت بڕی، هەی خوا سەرت ببڕێ (واتە: تووشی هیلاكەتت كرد، ڕەنگە خۆی لێ بگۆڕێ).

٢٨٩- «عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: «الْمَدْحُ ذَبْحٌ » قَالَ مُحَمَّدٌ: يَعْنِي إِذَا قَبِلَهَا »[٢].

واتە: زەیدی كوڕی ئەسلەم لە باوكی دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوێم لە عومەر بوو (خوا لێی ڕازی بێ)، دەیگوت: مەدح كردن سەر بڕینە، موحەممەد (كە یەكێكە لە ڕاویەكان) دەڵێ: واتە: ئەگەر مەدح كردنەكە ڕووبەڕوو بێ.

## دەربارەی: مەدح كردنی كەسێك، ئەگەر بزانی بە خۆی سەرسام نابێ

٢٩٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «نِعْمَ الرَّجُلُ أَبُو بَكْرٍ، نِعْمَ الرَّجُلُ عُمَرُ، نِعْمَ الرَّجُلُ أَبُو عُبَيْدَةَ، نِعْمَ الرَّجُلُ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ، نِعْمَ الرَّجُلُ ثَابِتُ بْنُ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ، نِعْمَ الرَّجُلُ مُعَاذُ بْنُ عَمْرِو بْنِ الْجَمُوحِ، نِعْمَ الرَّجُلُ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ » قَالَ: «وَبِئْسَ الرَّجُلُ فُلَانٌ، وَبِئْسَ الرَّجُلُ فُلَانٌ »حَتَّى عَدَّ سَبْعَةً »[٣].

واتە: ئەبو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: باشترین پیاو ئەبو بەكرە، باشترین پیاو عومەرە، باشترین پیاو ئەبو عوبەیدەیە، باشترین پیاو ئوسەیدی كوڕی حوزەیرە، باشترین پیاو سابتی كوڕی قەیسی كوڕی شەمماسە، باشترین پیاو موعازی كوڕی عەمری كوڕی جەموحە، باشترین پیاو موعازی كوڕی جەبەلە، وە فەرمووی: خراپترین پیاو فڵانە، وە خراپترین پیاو فڵانە، هەتا حەوتی ژماردن.

---

(١) حسن الإسناد.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨٧٥): [لم أجده في شيء من الكتب الستة] رواه الترمذي والنسائي والحاكم وابن حبان.

٢٩١- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَت: اسْتَأْذَنَ رَجُلٌ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بِئْسَ ابْنُ الْعَشِيرَةِ»، فَلَمَّا دَخَلَ هَشَّ لَهُ وَانْبَسَطَ إِلَيْهِ، فَلَمَّا خَرَجَ الرَّجُلُ اسْتَأْذَنَ آخَرُ، قَالَ: «نِعْمَ ابْنُ الْعَشِيرَةِ»، فَلَمَّا دَخَلَ لَمْ يَنْبَسِطْ إِلَيْهِ كَمَا انْبَسَطَ إِلَى الآخَرِ، وَلَمْ يَهِشَّ إِلَيْهِ كَمَا هَشَّ لِلآخَرِ، فَلَمَّا خَرَجَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قُلْتَ لِفُلاَنٍ مَا قُلْتَ، ثُمَّ هَشَشْتَ إِلَيْهِ، وَقُلْتَ لِفُلاَنٍ مَا قُلْتَ وَلَمْ أَرَكَ صَنَعْتَ مِثْلَهُ؟ قَالَ: «يَا عَائِشَةُ! إِنَّ مِنْ شَرِّ النَّاسِ مَنِ اتُّقِيَ لِفُحْشِهِ»»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك داوای مۆڵەتی هاتنە لای پێغەمبەری خوای ﷺ کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە لە خراپترین کەسی هۆزەکەیەتی، جا کە هاتە ژوورەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی گەش و خۆش کرد بۆی، وە کاتێك ئەو پیاوە چووە دەرەوە پیاوێکی دیکە داوای مۆڵەتی هاتنە ژووری لێکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە باشترین کەسی هۆزەکەیەتی، بەڵام کە هاتە ژوورەوە وەك کەسی یەکەم ڕووی بەرانبەر گەش و خۆش نەکرد، جا کاتێك کە چووەدەر گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوەی بە فڵانت فەرموو فەرمووت، دەربارەی کەسی یەکەم، پاشان ڕووت گەش و خۆش کرد بەرانبەری؟! ئەوەش بە فڵانت فەرموو فەرمووت، بەڵام نەمبینی هاوشێوەی کەسی یەکەم ڕووت گەش و خۆش بکەی بەرانبەری؟! فەرمووی: ئەی عائیشە! لە خراپترینی خەڵکی ئەو کەسانەن خۆیان لێ بپارێزرێ لەبەر خراپەکاریی و زمان شڕییان (واتە: من خۆم پاراست لەوەی یەکەمیان و پێشوازی چاکم لێکرد، ئەوەی دووەمیشیان بۆ ئەوەی بە خۆی سەرسام نەبێ، بۆیە وا مامەڵەم کرد).

## دەربارەی: خۆڵ دەکرێتە ڕووخساری زۆر ستایشکاران

٢٩٢- «عَنْ أَبِي مَعْمَرٍ قَالَ: قَامَ رَجُلٌ يُثْنِي عَلَى أَمِيرٍ مِنَ الأُمَرَاءِ، فَجَعَلَ الْمِقْدَادُ يَحْثِي فِي وَجْهِهِ التُّرَابَ، وَقَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَحْثِيَ فِي وُجُوهِ الْمَدَّاحِينَ التُّرَابَ»[٢].

واتە: ئەبو مەعمەڕ دەڵێ: پیاوێك هەڵسا ستایش و سەنای یەکێك لە کاربەدەستانی کرد، میقدادیش خۆڵی بە دەم و چاوی داکرد، وە فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردووین، کە خۆڵ بکەینە ڕووخساری ئەوانەی ستایش و مەدحی (کاربەدەستان) دەکەن؟

٢٩٣- «عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ، أَنَّ رَجُلاً كَانَ يَمْدَحُ رَجُلاً عِنْدَ ابْنِ عُمَرَ فَجَعَلَ ابْنُ عُمَرَ يَحْثُو التُّرَابَ نَحْوَ فِيهِ، وَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا رَأَيْتُمُ الْمَدَّاحِينَ فَاحْثُوا فِي وُجُوهِهِمُ التُّرَابَ»»[٣].

---

(١) ضعيف دون قصة الرجل الأول، فإنها صحيحة مع قوله: «يا عائشة....» وسيأتي برقم «١٣١١»: [البخاري في ٧٨- كتاب الأدب، ٣٨- لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ ﷺ فاحشاً ولا متفحشاً. مسلم في ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٧٣].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٩١٢): [مسلم: ٥٣- كتاب الزهد، ح ٦٨].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٩١٢).

واتە: عەتائی كوڕی ئەبی ڕەباح دەڵێ: پیاوێك ستایش و مەدحی پیاوێكی دیكەی دەكرد لەلای ئیبنو عومەر، ئیبنو عومەریش خۆڵی ئاڕاستەی دەمی كرد، وە گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئەو كەسانەتان بینی كە مەدحی خەڵك دەكەن، ئەوە خۆڵ بەرەو ڕووخساریان ئاڕاستە بكەن.

٢٩٤- «عَنْ مِحْجَنٍ الأَسْلَمِيِّ قَالَ رَجَاءٌ: أَقْبَلْتُ مَعَ مِحْجَنٍ ذَاتَ يَوْمٍ حَتَّى انْتَهَيْنَا إِلَى مَسْجِدِ أَهْلِ الْبَصْرَةِ، فَإِذَا بُرَيْدَةُ الأَسْلَمِيُّ عَلَى بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ جَالِسٌ، قَالَ: وَكَانَ فِي الْمَسْجِدِ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ: سُكْبَةُ، يُطِيلُ الصَّلاَةَ. فَلَمَّا انْتَهَيْنَا إِلَى بَابِ الْمَسْجِدِ، وَعَلَيْهِ بُرْدَةٌ، وَكَانَ بُرَيْدَةُ صَاحِبَ مُزَاحَاتٍ، فَقَالَ: يَا مِحْجَنُ أَتُصَلِّي كَمَا يُصَلِّي سُكْبَةُ؟ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ مِحْجَنٌ، وَرَجَعَ، قَالَ: قَالَ مِحْجَنٌ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَخَذَ بِيَدِي، فَانْطَلَقْنَا نَمْشِي حَتَّى صَعِدْنَا أُحُداً، فَأَشْرَفَ عَلَى الْمَدِينَةِ فَقَالَ: «وَيْلُ أُمِّهَا مِنْ قَرْيَةٍ، يَتْرُكُهَا أَهْلُهَا كَأَعْمَرَ مَا تَكُونُ، يَأْتِيهَا الدَّجَّالُ، فَيَجِدُ عَلَى كُلِّ بَابٍ مِنْ أَبْوَابِهَا مَلَكاً، فَلاَ يَدْخُلُهَا»»[1].

واتە: میحجەنی ئەسلەمی دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ڕەجاء گوتی: لەگەڵ میحجەندا ڕۆژێك دەرچووین هەتا گەیشتین بە مزگەوتێكی خەڵكی بەصرە، جا لەوێ بورەیدەی ئەسلەمی لەبەر دەرگایەك لە دەرگاكانی مزگەوت دانیشتبوو دەڵێ: جا پیاوێك لە مزگەوتەكەدا هەبوو پێی دەگوترا سوكبە، نوێژی درێژ دەكردەوە، كاتێ گەیشتینە بەر دەرگای مزگەوتەكەو (بە بورەیدە گەیشتین) عەبایەكی لەبەردا بوو، وە كەسێك بوو گاڵتەی زۆر دەكرد، گوتی: ئەی میحجەن وەكو سوكبە نوێژ دەكەیت (گاڵتەی پێكرد)؟ میحجەنیش وەڵامی نەدایەوەو گەڕایەوە، دەڵێ: میحجەن گوتی: پێغەمبەر ﷺ دەستی گرتم پێكەوە كەوتینە ڕێ هەتا سەركەوتین بەسەر كێوی ئوحوددا تا ڕوانیە سەر مەدینەو فەرمووی: هاوار بۆ ئەو شارەی كە خەڵكەكەی جێی دەهێڵن، بە پڕ بەروبوومەوە، جا دەجال دێت دەبینێ لەسەر هەر دەرگایەك لە دەرگاكانی فریشتەیەك وەستاوە، ناتوانێ بچێتە نێویەوە (كە مەبەستی شاری مەدینەیە).

## دەربارەی: ڕێز لە هاوەڵەكەت مەگرە بەو شتەی بۆی دەبێتە بار قورسی

٢٩٥- «عَنْ مُحَمَّدٍ، قَالَ: كَانُوا يَقُولُونَ: لاَ تُكْرِمْ صَدِيقَكَ بِمَا يَشُقُّ عَلَيْهِ»[2].

واتە: موحەممەد دەڵێ: پێش ئێمە دەیانگوت: ڕێز لە هاوەڵەكەت مەگرە بەشتێك، كە بۆی دەبێتە بار قورسی.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٦٣٥).

(٢) صحيح الإسناد موقوف.

لێرەدا مەبەست ئەوەیە: بە جۆرێك مەدحی هاوڕێکەت مەکە لە دونیا ڕووبەڕوو (نەوەك خۆی لێ بگۆڕێ)و، لە دواڕۆژدا ئەم مەدح و ستایش کردنە بۆی ببێتە بار قورسی بەسەریەوە.

## دەربارەی: سەردانی کردن

٢٩٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِذَا عَادَ الرَّجُلُ أَخَاهُ أَوْ زَارَهُ، قَالَ اللَّهُ لَهُ: طِبْتَ وَطَابَ مَمْشَاكَ، وَتَبَوَّأْتَ مَنْزِلاً فِي الْجَنَّةِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێك سەردانی برایەکی بکات بەهۆی نەخۆشکەوتنی، یان هەر سەردانی ئاسایی بکات، خوا پێی دەفەرموێ: خۆشی بۆ خۆت و، سەردانەکەت چاك و پاك بوو (بووە هۆی خۆشبەختی دواڕۆژت)، شوێنێکیشت لە بەهەشت بۆ خۆت مسۆگەر کرد.

٢٩٧- «عَنْ أُمِّ الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا) قَالَتْ: زَارَنَا سَلْمَانُ مِنَ الْمَدَائِنِ إِلَى الشَّامِ مَاشِياً، وَعَلَيْهِ كِسَاءٌ وَانْدَرْوَرْدُ، «قَالَ: يَعْنِي سَرَاوِيلَ مُشَمَّرَةً» قَالَ ابْنُ شَوْذَبٍ: رُؤِيَ سَلْمَانُ وَعَلَيْهِ كِسَاءٌ مَطْمُومُ الرَّأْسِ سَاقِطُ الْأُذُنَيْنِ، يَعْنِي أَنَّهُ كَانَ أَرْفَشَ. فَقِيلَ لَهُ: شَوَّهْتَ نَفْسَكَ، قَالَ: إِنَّ الْخَيْرَ خَيْرُ الْآخِرَةِ»[٢].

واتە: ئوم دەرداء (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: سەلمان سەردانی کردین، لە مەدائین تا شام بە پێهاتبوو، وە پۆشاکێك و شەرواڵێکی کورتی (وەك سێچارەکی) لەبەردا بوو، ئیبنو شەوذەب دەڵێ: سەلمان بینرا لە کاتێکدا پۆشاکێکی یەخە کراوەی لەبەردابوو تەنیشتەکانی کەوتبوونە خوارەوە (کراسەکە بۆی گەورە بوو)، جا پێی گوترا: خۆت نارێك و شێواندوە، سەلمانیش گوتی: چاکە چاکەی دواڕۆژە. (واتە: گرنگ ئەوەیە پاداشتی سەردانی هاوەڵانم بەدەست هێناوە، کە ئەوە خێر و چاکەی ڕاستەقینەیە نەك قیتوقۆزی و کەشخەیی).

## دەربارەی: کەسێك سەردانی کۆمەڵێك بکاو نانیان لەلا بخوات

٢٩٨- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ زَارَ أَهْلَ بَيْتٍ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَطَعِمَ عِنْدَهُمْ طَعَاماً، فَلَمَّا خَرَجَ أَمَرَ بِمَكَانٍ مِنَ الْبَيْتِ، فَنُضِحَ لَهُ عَلَى بِسَاطٍ، فَصَلَّى عَلَيْهِ، وَدَعَا لَهُمْ»[٣].

---

(١) حسن: «تخريج المشكاة» (٥٠١٥) «السلسلة الصحيحة» (٢٦٣٢): [الترمذي: ٢٥- كتاب البر والصلة، ٦٤- باب: ما جاء في زيارة الإخوان. إبن ماجه: ٦- كتاب الجنائز، ٢- باب: ما جاء في ثواب من عاد مريضاً، ح ١٤٤٣].

(٢) حسن: دون قول ابن شوذب فإنه معضل، لكنه قول سلمان: (إن الخير ... ) صح مرفوعا، «السلسلة الصحيحة» (٣١٩٨).

(٣) صحيح الإسناد: [البخاري: ٧٨- الأدب، ٦٥- باب: الزيارة].

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانیماڵێكی كرد لە پشتیوانەكان و، خواردنی لەلا خواردن، جا كاتێ ویستی بڕواتە دەرەوە، داوای كرد لە شوێنێك لە ماڵەكە شتێكی بۆ ڕابخەن، جا نوێژی لەسەر كردو دوعای بۆ كردن.

٢٩٩- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ مَوْلَى أَسْمَاءَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: أَخْرَجَتْ إِلَيَّ أَسْمَاءُ جُبَّةً مِنْ طَيَالِسَةٍ عَلَيْهَا لَبِنَةُ شِبْرٍ مِنْ دِيبَاجٍ، وَإِنَّ فَرْجَيْهَا مَكْفُوفَانِ بِهِ، فَقَالَتْ: هَذِهِ جُبَّةُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، كَانَ يَلْبَسُهَا لِلْوُفُودِ، وَيَوْمَ الْجُمُعَةِ»[١].

واتە: عەبدوڵڵا كە خزمەتكاری ئەسمائە (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: ئەسماء جوببەیەكی طەیالیسەی بۆ دەرهێنام (كە پۆشاكێكی سەوزی تایبەتە، دوورمانی تێدانیە)، بە ئەندازەی بستێكی لاكێشە لە جوببەكە لە دیباج دروستكرابوو (كە جۆرە حەریرێكە)، نێوان هەردوو كونەكانی بە دیباجەكە گیرابوو، جا گوتی: ئەم جوببەیە هی پێغەمبەری خوایە ﷺ لە كاتی پێشوازی كردنی لە هاتنی وەفدەكان و لە ڕۆژانی هەینیدا دەیپۆشی.

٣٠٠- «عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: وَجَدَ عُمَرُ حُلَّةَ إِسْتَبْرَقٍ، فَأَتَى بِهَا النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: اشْتَرِ هَذِهِ، وَالْبَسْهَا عِنْدَ الْجُمُعَةِ، أَوْ حِينَ تَقْدِمُ عَلَيْكَ الْوُفُودُ، فَقَالَ ﷺ: «إِنَّمَا يَلْبَسُهَا مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ فِي الآخِرَةِ»، وَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِحُلَلٍ، فَأَرْسَلَ إِلَى عُمَرَ بِحُلَّةٍ، وَإِلَى أُسَامَةَ بِحُلَّةٍ، وَإِلَى عَلِيٍّ بِحُلَّةٍ، فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرْسَلْتَ بِهَا إِلَيَّ، لَقَدْ سَمِعْتُكَ تَقُولُ فِيهَا مَا قُلْتَ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «تَبِيعُهَا، أَوْ تَقْضِي بِهَا حَاجَتَكَ»»[٢].

واتە: سالمی كوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: گوێم لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەر بوو (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەیگوت: عومەر پۆشاكێكی جوان و ڕێكی ئیستەبرەقی بینی (كە جۆرێكی حەریرە)، جا هێنایە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەم پۆشاكە بكڕەو ڕۆژانی هەینی لەبەری بكە، یان لە كاتی هاتنی وەفدەكان و پێشوازی كردنیان بیپۆشە، ئەویش ﷺ فەرمووی: ئەم پۆشاكە تەنها ئەوانە لەبەری دەكەن كە لە ڕۆژی دواییدا هیچ بەشێكیان نیە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشاكێكی سێ پارچەی گرانبەهای بۆ هات، ئەویش یەكێكیانی بۆ عومەر نارد، یەكێكیانیشی بۆ ئوسامە نارد، ئەوی دیكەشی بۆ عەلی نارد، عومەر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! تۆ ئەم پۆشاكەت بۆ ناردووم، كەچی پێشتر لەبارەیەوە ئەوەت فەرموو كە فەرمووت؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بۆ ئەوە ناردوومە كە) بیفرۆشیت، یاخود پێداویستی خۆتی پێ دابین بكەی (وەك ئەوەی بیدەی بە ئافرەتێكی دەوروبەرت، یان خزمێكی كافرت).

---

(١) حسن: أخرجه مسلم في (اللباس) (٦/١٣٩- ١٤٠).

(٢) صحيح: «غاية المرام» (٧٩): [البخاري: ١١- كتاب الجمعة، ٧- باب: يلبس أحسن ما يجد. مسلم: ٣٧- كتاب اللباس والزينة، ح ٦-٩. وفيه أن أسامة لبس الحلة فأنكرها ﷺ].

## دەربارەی: گەورەیی سەردانی كردن لە پێناوی خوا

٣٠١- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: زَارَ رَجُلٌ أَخاً لَهُ فِي قَرْيَةٍ، فَأَرْصَدَ اللَّهُ لَهُ مَلَكاً عَلَى مَدْرَجَتِهِ، فَقَالَ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قَالَ: أَخاً لِي فِي هَذِهِ الْقَرْيَةِ، فَقَالَ: هَلْ لَهُ عَلَيْكَ مِنْ نِعْمَةٍ تَرُبُّهَا؟ قَالَ: لاَ، إِنِّي أُحِبُّهُ فِي اللَّهِ، قَالَ: فَإِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكَ، أَنَّ اللَّهَ أَحَبَّكَ كَمَا أَحْبَبْتَهُ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پیاوێك سەردانی برایەكی (ئاینی) خۆی كرد لە گوندێكدا، جا خوا فریشتەیەكی ناردە سەر ڕێگاكەی، فریشتەكە پێی گوت: بۆ كوێ دەچی؟ گوتی: دەچم بۆ لای برایەكم لەو گوندە، (فریشتەكە) پێی فەرموو: ئایا هیچ چاكەیەكی لەسەر تۆ هەیە تا بە سەردانەكەت بتەوێ سوپاسی بكەیت (یان هیچ مەصڵەحەتێك لە نێوانتاندا هەیە) تا پەرەی پێ بدەیت؟ دەڵێ: نەخێر، (تەنیا ئەوە نەبێ) خۆشم دەوێ لەبەر خوا، (فریشتەكە) گوتی: دە دڵنیابە من نێردراوی خوام بۆ لای تۆ، (تا پێت بڵێم): خواش تۆی خۆشدەوێ، چونكە تۆ ئەو برادەرەت لەبەر خوا خۆشدەوێ.

## دەربارەی: پیاوێك كۆمەڵێكی خۆشبوێ و پێیان نەگاتەوە

٣٠٢- «عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، الرَّجُلُ يُحِبُّ الْقَوْمَ وَلاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَلْحَقَ بِعَمَلِهِمْ؟ قَالَ: «أَنْتَ يَا أَبَا ذَرٍّ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ»، قُلْتُ: إِنِّي أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، قَالَ: «أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ يَا أَبَا ذَرٍّ»»[٢].

واتە: ئەبو زەڕ (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوی وا هەیە كۆمەڵێكی خۆشدەوێ، بەڵام ناتوانێ بگات بە كردەوەكانی ئەوان (وەك ئەوان چاكەی پێ ناكرێ)، فەرمووی: ئەی ئەبو زەڕ تۆ لەگەڵ ئەو كەسەی كە خۆشت دەوێ، گوتم: من خواو پێغەمبەری خوام خۆشدەوێ، فەرمووی: تۆ لەگەڵ ئەو كەسەی خۆشت دەوێ ئەی ئەبو زەڕ.

٣٠٣- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، مَتَى السَّاعَةُ؟ فَقَالَ: «وَمَا أَعْدَدْتَ لَهَا؟» قَالَ: مَا أَعْدَدْتُ مِنْ كَبِيرٍ، إِلاَّ أَنِّي أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ، فَقَالَ: «الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ»، قَالَ أَنَسٌ: فَمَا رَأَيْتُ الْمُسْلِمِينَ فَرِحُوا بَعْدَ الإِسْلاَمِ أَشَدَّ مِمَّا فَرِحُوا يَوْمَئِذٍ»[٣].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٠٤٤): [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٣٨].

(٢) صحيح.

(٣) صحيح: «الروض النضير» (١٠٤): [الترمذي: ٣٧- كتاب الزهد، ٥٠- باب: ما جاء أن المرء مع من أحب] متفق عليه.

**واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ كرد، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ كەی دونیا تێكدەچێ؟ فەرمووی: چیت بۆ ئامادە كردوە؟ گوتی: شتی زۆر گەورەم بۆ ئامادە نەكردوە، تەنها ئەوەندە نەبێ خواو پێغەمبەری خوام خۆشدەوێ، فەرمووی: مرۆڤ لەگەڵ ئەو كەسە دایە كە خۆشی دەوێ، ئەنەس دەڵێ: نەمبینی بوو مسوڵمانان ئەوەندە زۆر دڵخۆشبن پاش هاتنی ئیسلام، ئەوەندەی ئەم ڕۆژە دڵخۆش بوون.**

## دەربارەی: پلەو پایەی كەسی بە ساڵاچوو

٣٠٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنَا، وَيَعْرِفْ حَقَّ كَبِيرِنَا، فَلَيْسَ مِنَّا»»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر كەسێك بەزەیی نەنوێنێ بەرانبەر بچووكەكانمان، وە مافی گەورەكانمان نەزانێ، ئەوە لە ئێمە نیە (لەم سیفەت و ڕەوشتانە).**

٣٠٥- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنَا، وَيَعْرِفْ حَقَّ كَبِيرِنَا، فَلَيْسَ مِنَّا»»[2].

**واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەمرِی كوڕی عاص (خوا لێی ڕازی بێ)، پێی گەیشتوە لە پێغەمبەر ﷺ كە فەرموویەتی: هەر كەسێك بەزەیی نەنوێنێ بەرانبەر بچووكەكانمان، وە مافی گەورەكانمان نەزانێ، ئەوە لە ئێمە نیە (لەو سیفەتانە).**

٣٠٦- «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَعْرِفْ حَقَّ كَبِيرِنَا، وَيَرْحَمْ صَغِيرَنَا»»[3].

**واتە: عەمرِی كوڕی شوعەیب لە باوكی و، لە باپیری (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ئێمە نیە هەر كەسێك كە مافی گەورەكانمان نەزانێ، وە بەزەیی نەنوێنێ لەگەڵ بچووكەكانمان.**

٣٠٧- «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنَا، وَيُجِلَّ كَبِيرَنَا، فَلَيْسَ مِنَّا»»[4].

---

(١) صحيح: «صحيح الترغيب» (٩٧/١١٧/١): [ليس في شيء من الكتب الستة].

(٢) صحيح: «التعليق الرغيب» (٥/٦٦/١): [أبو داود في: ٤٠- كتاب الأدب، ٥٨- باب الرحمة. الترمذي في: ٢٥- كتاب البر والصلة، ١٥- باب ما جاء في رحمة الصبيان].

(٣) صحيح: أنظر ما قبله.

(٤) حسن صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢١٩٦).

واتە: ئەبو ئومامە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بەزەیی نەنوێنێ بەرانبەر بچووکەکانمان، وە ڕێز لە گەورەکانمان نەگرێ، ئەوە لە ئێمە نیە.

## دەربارەی: ڕێزگرتنی کەسی بەساڵاچوو

۳۰۸- «عَنِ الأَشْعَرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: إِنَّ مِنَ إِجْلاَلِ اللَّهِ إِكْرَامَ ذِي الشَّيْبَةِ الْمُسْلِمِ، وَحَامِلِ الْقُرْآنِ، غَيْرِ الْغَالِي فِيهِ، وَلاَ الْجَافِي عَنْهُ، وَإِكْرَامَ ذِي السُّلْطَانِ الْمُقْسِطِ»[1].

واتە: ئەبو مووسای ئەشعەریی (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتوویەتی: بێگومان لە ڕێزگرتنی خوایە کە ڕێزی مسوڵمانێکی پیری موو سپی بگیرێ، وە ڕێزی کەسێك بگیرێ کە هەڵگری قورئانە (لەبەریەتی و کاری پێدەکات)، زێدەڕۆیی تێدا ناکات و کەمتەرخەمیشی تێدا ناکات، وە ڕێزگرتنی خاوەن دەسەڵاتی دادگەریش (ئەمانە گشتیان بەشێکن لە ڕێزگرتنی خوا، چونکە خوا فەرمانی کردوە بە ڕێزگرتنی ئەمانە، جا جێبەجێ کردنی فەرمانی خوا ڕێزگرتنی خوایە).

۳۰۹- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنَا، وَيُوَقِّرْ كَبِيرَنَا»»[2].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەمڕی کوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ئێمە نیە (لەو سیفەتانە) ئەو کەسەی بەزەیی نەنوێنێ لەگەڵ بچووکەکانمان، وە ڕێز نەگرێ لە گەورەکانمان.

## دەربارەی: سەرەتا کەسی گەورە دەست بە قسە کردن و پرسیار کردن دەکات

۳۱۰- «عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، وَسَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ، أَنَّهُمَا حَدَثَا، أَوْ حَدَّثَاهُ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ، وَمُحَيِّصَةَ بْنَ مَسْعُودٍ، أَتَيَا خَيْبَرَ فَتَفَرَّقَا فِي النَّخْلِ، فَقُتِلَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ سَهْلٍ، فَجَاءَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ، وَحُوَيِّصَةُ وَمُحَيِّصَةُ ابْنَا مَسْعُودٍ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَتَكَلَّمُوا فِي أَمْرِ صَاحِبِهِمْ، فَبَدَأَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ، وَكَانَ أَصْغَرَ الْقَوْمِ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «كَبِّرِ الْكِبَرَ» «قَالَ يَحْيَى: لِيَلِيَ الْكَلاَمَ الأَكْبَرُ» فَتَكَلَّمُوا فِي أَمْرِ صَاحِبِهِمْ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: اسْتَحِقُّوا قَتِيلَكُمْ «أَوْ قَالَ: صَاحِبَكُمْ» بِأَيْمَانِ خَمْسِينَ مِنْكُمْ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَمْرٌ لَمْ نَرَهُ، قَالَ: «فَتُبْرِئُكُمْ يَهُودُ بِأَيْمَانِ خَمْسِينَ مِنْهُمْ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَوْمٌ كُفَّارٌ. فَفَدَاهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ قِبَلِهِ قَالَ سَهْلٌ: فَأَدْرَكْتُ نَاقَةً مِنْ تِلْكَ الإِبِلِ، فَدَخَلْتُ مِرْبَداً لَهُمْ، فَرَكَضَتْنِي بِرِجْلِهَا»[3].

---

(۱) حسن: «تخريج المشكاة» (٤٩٧٢)، «التعليق الرغيب» (٦٦/١): أبو داود مرفوعا.

(۲) صحيح.

(۳) صحيح: «الإرواء» (١٦٤٦): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ح ٨٩، باب: إكرام الكبير. مسلم: ٧٨- كتاب القسامة، زاد مسلم:

واتە: ڕافعی کوڕی خەدیج و سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە هەردووکیان دەگێڕنەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی سەهل و موحەییصەی کوڕی مەسعوود هاتن بۆ خەیبەر، لە نێو دار خورماکاندا لە یەك جیابوونەوە، جا عەبدوڵڵای کوڕی سەهل کوژرا، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەهل و حوەییصەو موحەییصە هەردوو کوڕەکەی مەسعوود هاتن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، قسەیان کرد لەبارەی هاوەڵەکەیانەوە (کە کوژرابوو)، سەرەتا عەبدوڕڕەحمان دەستی پێکرد کە ئەو بچوکترینیان بوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووی: (گەورە بە گەورە بگرە) یەحیا گوتی (واتە): با سەرەتا گەورە دەست پێ بکات، ئەوانیش لە بارەی هاوەڵەکەیانەوە قسەیان کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مافی کوژراوەکەتان «یان هاوەڵەکەتان» وەربگرن بەوەی پەنجا کەس لە ئێوە سوێند بخوات، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووداوێکە ئێمە نەمانبینیوە (ناتوانین سوێند لەسەر هیچ کەسێك بخۆین)، فەرمووی: جوولەکەکانیش (کە ئێوە گومانتان لێ هەن) خۆیان بەری دەکەن بە سوێند خواردنی پەنجا کەس لەوان، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانە خەڵکانێکی بێبڕوان (باوەڕ بە سوێندەکانیان ناکەین)، جا پێغەمبەر ﷺ لە لایەن خۆیەوە خوێن باییەکەیدا، سەهل گوتی: چوومە نێو مۆڵگای وشترەکان، یەکێك لەم وشترانە لەقەیەکی لێدام.

## دەربارەی: ئەگەر گەورە قسەی نەکرد، ئایا بچووك بۆی هەیە دەست بە قسان بکات؟

٣١١- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَخْبِرُونِي بِشَجَرَةٍ مَثَلُهَا مَثَلُ الْمُسْلِمِ، تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ بِإِذْنِ رَبِّهَا، لاَ تَحُتُّ وَرَقَهَا»، فَوَقَعَ فِي نَفْسِي النَّخْلَةُ، فَكَرِهْتُ أَنْ أَتَكَلَّمَ، وَثَمَّ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فَلَمَّا لَمْ يَتَكَلَّمَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هِيَ النَّخْلَةُ»، فَلَمَّا خَرَجْتُ مَعَ أَبِي قُلْتُ: يَا أَبَتِ، وَقَعَ فِي نَفْسِي النَّخْلَةُ، قَالَ: مَا مَنَعَكَ أَنْ تَقُولَهَا؟ لَوْ كُنْتَ قُلْتَهَا كَانَ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ كَذَا وَكَذَا، قَالَ: مَا مَنَعَنِي إِلاَّ لَمْ أَرَكَ، وَلاَ أَبَا بَكْرٍ تَكَلَّمْتُمَا، فَكَرِهْتُ»[1].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەواڵم پێبدەن بە درەختێك کە وێنەی وەك وێنەی مسوڵمان بێ، هەمیشە بەرهەمی هەبێ بە ئیزنی خواو، پەلکەکانیشی نەوەرێن، (ئیبنو عومەر) دەڵێ: کەوتە نێو دڵم ئەم درەختە خورمایە، (بەڵام) پێشم باش نەبوو قسە بکەم لە کاتێکدا کە ئەبو بەکرو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) لەوێ بوون، (جا کەس نەیزانی و) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە دارخورمایە، جا کاتێك کە لەگەڵ باوکم لەوێ

فكره رسول الله ﷺ أن يبطل جمه، فوداه مائة من إبل الصدقة].

(١) صحيح: [البخاري: ٦٥- كتاب التفسير، ١٤- سورة إبراهيم، ١- حدثني عبيد بن إسماعيل. مسلم: ٥٠- كتاب صفات المنافقين وأحكامهم، ح ٦٣، ٦٤].

ڕۆیشتین و چووینە دەرەوە، گوتم: بابە گیان! کەوتە نێو دڵم ئەو درەختە خورمایە، باوکیشم گوتی: چ شتێك ڕێگربوو لەوەی بیڵێی، (کوڕەکەم) ئەگەر بتگوتبا زۆر لام خۆشتر بوو لە ئەوەو ئەوە (واتە: لە ماڵی دونیا لام خۆشەویستتر بوو)، ئیبنو عومەریش گوتی: هیچ شتێك ڕێگر نەبوو، جگە لەوەی کە بینیم تۆو ئەبو بەکر قسەتان نەکرد، منیش پێم باش نەبوو قسان بکەم.

## دەربارەی: کەسانی بە تەمەن کردنە سەرکردە

٣١٢- «عَنْ حَكِيمِ بْنِ قَيْسِ بْنِ عَاصِمٍ، أَنَّ أَبَاهُ أَوْصَى عِنْدَ مَوْتِهِ بَنِيهِ فَقَالَ: اتَّقُوا اللَّهَ وَسَوِّدُوا أَكْبَرُكُمْ، فَإِنَّ الْقَوْمَ إِذَا سَوَّدُوا أَكْبَرَهُمْ خَلَفُوا أَبَاهُمْ، وَإِذَا سَوَّدُوا أَصْغَرَهُمْ أَزْرَى بِهِمْ ذَلِكَ فِي أَكْفَائِهِمْ. وَعَلَيْكُمْ بِالْمَالِ وَاصْطِنَاعِهِ، فَإِنَّهُ مَنْبَهَةٌ لِلْكَرِيمِ، وَيُسْتَغْنَى بِهِ عَنِ اللَّئِيمِ، وَإِيَّاكُمْ وَمَسْأَلَةَ النَّاسِ، فَإِنَّهَا مِنْ آخِرِ كَسْبِ الرَّجُلِ، وَإِذَا مُتُّ فَلاَ تَنُوحُوا، فَإِنَّهُ لَمْ يُنَحْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَإِذَا مُتُّ فَادْفِنُونِي بِأَرْضٍ لاَ يَشْعُرُ بِدَفْنِي بَكْرُ بْنُ وَائِلٍ، فَإِنِّي كُنْتُ أُغَافِلُهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ»[1].

واتە: لە حەکیمی کوڕی قەیسی کوڕی عاصیم گێڕدراوەتەوە کە باوکی لە کاتی مردنیدا وەسێتی کردوەو گوتوویەتی: پارێز لە خوا بکەن و گەورەکانتان بکەن بە سەرکردەتان، چونکە ئەگەر کۆمەڵێك گەورەکانیان کردن بە سەرکردە ئەوە جێگەی باوك و باپیرانیان گرتۆتەوە، وە ئەگەر بچوکەکانیان کرد بە سەرکردە، ئەوە کەسە شایستەکان سوکایەتیان پێکراوە، وە دەست بە ماڵ و سەروەتەوە بگرن و کاری پێبکەن، چونکە ناوبانگە بۆ کەسی ڕێزدارو، خۆی پێ بێ نیاز دەکات لە کەسی بێ ڕێزو سووك، وە خۆتان بپارێزن لە داواکردن لە خەڵکی، چونکە ئەوە کۆتا کاسبیە (کاتێ هیچ چارەو ڕێگایەکت نەما ئەو کات دەتوانی داوا لە کەسانی شایستە بکەی)، وە ئەگەر مردم ئەوە دەنگتان بە گریان بەرز مەکەنەوە، چونکە دەنگی گریان بەسەر پێغەمبەری خوا بەرز نەکرایەوە، وە ئەگەر مردم ئەوە لە شوێنێك بمشارنەوە کە بەکری کوڕی وائیل پێی نەزانێ، چونکە من لە سەردەمی نەزانیدا لە فرسەتی بێ ئاگایی ئەوان دەگەڕام تا زەبریان لێ بدەم.

تێبینی: لە سەردەمی نەزانی دوژمنایەتیان لەگەڵ یەکدی هەبووە، جا ترساوە کەسێك لەوان بێت و گۆڕەکەی هەڵبکەنێ و، سووکایەتی بە لاشەکەی بکات، جا هەر چەندە هەردوولا مسوڵمان ببوون، بەڵام ترساوە کەسێك بێت و لە بن گوێیان قسەی خراپ بکات و، دەماری سەردەمی جاهیلیان بخاتەوەگەڕو هەڵیانبخەڵەتێنێ.

---

(١) صحيح: [البخاري: ٦٥- كتاب التفسير، ١٤- سورة إبراهيم، ١- حدثني عبيد بن إسماعيل. مسلم: ٥٠- كتاب صفات المنافقين وأحكامهم، ٦٣، ٦٤].

## دەربارەی: پێدانی بەروبووم بە بچووكترین منداڵ كە ئامادەیە

۳۱۳- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أُتِيَ بِالزَّهْوِ قَالَ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي مَدِينَتِنَا وَمُدِّنَا، وَصَاعِنَا، بَرَكَةً مَعَ بَرَكَةٍ»، ثُمَّ نَاوَلَهُ أَصْغَرَ مَنْ يَلِيهِ مِنَ الْوِلْدَانِ»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر خورمای تازە پێگەیشتووی بۆ هێنرابا (واتە: یەكەم بەرهەمی ساڵی بۆ هاتبا)، دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي مَدِينَتِنَا وَمُدِّنَا، وَصَاعِنَا، بَرَكَةً مَعَ بَرَكَةٍ) واتە: ((خوایە بەرەكەت بخەیتە شارەكەمان و موددو صاع و (پێوانەكانمان) بەرەكەت لەسەر بەرەكەت)) پاشان دەیدا بە بچووكترین منداڵ كە لێوەی نزیك بووایە.**

## دەربارەی: بەزەیی هاتنەوە بە بچووك

۳۱٤- «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنَا، وَيَعْرِفْ حَقَّ كَبِيرِنَا»»[2].

**واتە: عەمری كوڕی شوعەیب لە باوكیەوە، ئەویش لە باپیریەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ئێمە نیە ئەو كەسەی بەزەیی نەنوێنێ بەرانبەر بچووكەكانمان، وە مافی گەورەكانمان نەزانێ.**

## دەربارەی: لە باوەش گرتنی منداڵ

۳۱٥- «عَنْ يَعْلَى بْنِ مُرَّةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَدُعِينَا إِلَى طَعَامٍ فَإِذَا حُسَيْنٌ يَلْعَبُ فِي الطَّرِيقِ، فَأَسْرَعَ النَّبِيُّ ﷺ أَمَامَ الْقَوْمِ، ثُمَّ بَسَطَ يَدَيْهِ، فَجَعَلَ يَمُرُّ مَرَّةً هَا هُنَا وَمَرَّةً هَا هُنَا، يُضَاحِكُهُ حَتَّى أَخَذَهُ، فَجَعَلَ إِحْدَى يَدَيْهِ فِي ذَقْنِهِ وَالأُخْرَى فِي رَأْسِهِ، ثُمَّ اعْتَنَقَهُ فَقَبَّلَهُ، ثُمَّ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «حُسَيْنٌ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ، أَحَبَّ اللَّهُ مَنْ أَحَبَّ الْحَسَنَ وَالْحُسَيْنَ، سِبطَانِ مِنَ الأَسْبَاطِ»»[3].

**واتە: یەعلای كوڕی موڕڕە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین كە بانگهێشت كرابووین بۆ خواردنێك، وە لە ڕێگەدا حوسەین یاری دەكرد، جا پێغەمبەر ﷺ بە پەلە**

---

(۱) صحيح: «الروض النضير» (٤٣٦) [إبن ماجه: ٢٩- كتاب الأطعمة، ٣٩- باب: إذا أتي بأول لاثمرة، ح ٣٣٢٩].

(۲) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (۱۲۲۷).

(۳) صحيح.

پێش خەڵکەکە کەوتەوەو دەستەکانی درێژ کردن و، جارێك بەملاو جارێك بەولادا دەڕۆیشت، وای لێدەکرد پێبکەنێ و دڵخۆش بێت، وە گرتی و دەستێکی لە ژێر چەناگەی داناو دەستەکەی دیکەشی لە ژێر سەری دانا، دواتر لەباوەشی گرت و ماچی کرد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: حوسەین لە منەو، منیش لە حوسەینم، خوا ئەو کەسەی خۆشدەوێ کە حەسەن و حوسەینی خۆشدەوێ، دووانن لە نەوەکان (واتە: منداڵی منداڵ).

## دەربارەی: ماچکردنی کچۆڵەی بچووك

٣١٦- «عَنْ مَخْرَمَة بْن بُكَيْرٍ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ رَأَى عَبْدَ اللَّهِ بْنَ جَعْفَرٍ يُقَبِّلُ زَيْنَبَ بِنْتَ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ، وَهِيَ ابْنَةُ سَنَتَيْنِ، أَوْ نَحْوَهُ»[١].

واتە: مەخرەمەی کوڕی بوکەیر لە باوکی دەگێڕێتەوە کە ئەو بینیویەتی عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر زەینەبی کچی عومەری کوڕی ئەبو سەلەمەی ماچ دەکرد، لە کاتێکدا دوو ساڵان بوو، یان نزیك دوو ساڵان بوو.

٣١٧- «عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: إِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ لاَ تَنْظُرَ إِلَى شَعْرِ أَحَدٍ مِنْ أَهْلِكَ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ أَهْلَكَ أَوْ صَبِيَّةً، فَافْعَلْ»[٢].

واتە: حەسەن دەڵێ: ئەگەر توانیت تەماشای قژی هیچ کەسێك لە خاووخێزانەکەت مەکە، تەنها ئەگەر خێزانت بێ، یان بچووك بێ، ئەو کات سەیری بکە.

## دەربارەی: دەست هێنان بەسەری منداڵ

٣١٨- «عَنْ يُوسُف بْن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلاَّمٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: سَمَّانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُوسُفَ، وَأَقْعَدَنِي عَلَى حِجْرِهِ، وَمَسَحَ عَلَى رَأْسِي»[٣].

واتە: یوسفی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی سەلام (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی ناوم یوسف، وە لە کۆشی خۆی داینیشاندووم، وە دەستی بەسەرمدا هێناوە.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد: «المسند» للإمام أحمد: ج ٦، ص ٦ (الطبعة الأولى).

٣١٩- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كُنْتُ أَلْعَبُ بِالْبَنَاتِ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ وَكَانَ لِي صَوَاحِبُ يَلْعَبْنَ مَعِي، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا دَخَلَ يَنْقَمِعْنَ مِنْهُ، فَيُسَرِّبُهُنَّ إِلَيَّ، فَيَلْعَبْنَ مَعِي»[١].

**واته: عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من بە بوكەڵەكانم یارییم دەكرد لەلای پێغەمبەر ﷺ، وە چەند دەستەخوشكێكم هەبوون، یاریان لەگەڵدا دەكردم، جا هەر كات پێغەمبەری خوا ﷺ بهاتبایە ماڵەوە، ئەوان خۆیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەشاردەوەو، دواتر دەهاتنەوە لام و، یاریان لەگەڵ دەكردم.**

## دەربارەی: ئەوە بە منداڵی بچووك بڵێ: ئەی ڕۆڵە، ئەی كوڕی خۆم

٣٢٠- «عَنْ أَبِي الْعَجْلَانِ الْمُحَارِبِيِّ قَالَ: كُنْتُ فِي جَيْشِ ابْنِ الزُّبَيْرِ، فَتُوُفِّيَ ابْنُ عَمٍّ لِي، وَأَوْصَى بِجَمَلٍ لَهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَقُلْتُ لِابْنِهِ: ادْفَعْ إِلَيَّ الْجَمَلَ، فَإِنِّي فِي جَيْشِ ابْنِ الزُّبَيْرِ، فَقَالَ: اذْهَبْ بِنَا إِلَى ابْنِ عُمَرَ حَتَّى نَسْأَلَهُ، فَأَتَيْنَا ابْنَ عُمَرَ، فَقَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنَّ وَالِدِي تُوُفِّيَ، وَأَوْصَى بِجَمَلٍ لَهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَهَذَا ابْنُ عَمِّي، وَهُوَ فِي جَيْشِ ابْنِ الزُّبَيْرِ، أَفَأَدْفَعُ إِلَيْهِ الْجَمَلَ؟ قَالَ ابْنُ عُمَرَ: يَا بُنَيَّ، إِنَّ سَبِيلَ اللَّهِ كُلُّ عَمَلٍ صَالِحٍ، فَإِنْ كَانَ وَالِدُكَ إِنَّمَا أَوْصَى بِجَمَلِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، فَإِذَا رَأَيْتَ قَوْماً مُسْلِمِينَ يَغْزُونَ قَوْماً مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَادْفَعْ إِلَيْهِمُ الْجَمَلَ، فَإِنْ هَذَا وَأَصْحَابَهُ فِي سَبِيلِ غِلْمَانِ قَوْمٍ، أَيُّهُمْ يَضَعُ الطَّابَعَ»[٢].

**واته: ئەبو عەجلانی موحاریبی دەڵێ: من لە سوپای ئیبنو زوبەیر بووم، كوڕە مامەكەم وەفاتی كرد، وەسیەتی كردبوو كە وشترەكەی لە پێناوی خوا ببەخشرێ، منیش بە كوڕەكەیم گوت: وشترەكە بدە بە من، من لە سوپای ئیبنو زوبەیرم، ئەویش گوتی: وەرە با بچین پرسیار لە ئیبنو عومەر بكەین، جا چووین بۆ لای ئیبنو عومەر (بە ئیبنو عومەری) گوت: ئەی باوكی عەبدوڕڕەحمان من باوكم وەفاتی كردوەو، وەسیەتی بۆ كردووم كە وشترەكەی لە پێناوی خوادا ببەخشم، وە ئەوەش كوڕی ماممە لە سوپای ئیبنو زوبەیرە، ئایا وشترەكەی پێبدەم؟ ئیبنو عومەر گوتی: كوڕی خۆم! لە پێناوی خوا، هەموو كردەوەیەكی چاك دەگرێتەوە، جا ئەگەر باوكت وەسیەتی كردوە وشترەكەی ببەخشرێ لە پێناوی خوا (عَزَّ وَجَلَّ)، وە ئەگەر تۆش بینیت كۆمەڵێك لە مسوڵمانان دەجەنگن لەگەڵ كۆمەڵێك لە هاوبەشدانەران وشترەكەیان پێبدە، جا ئەوەو (واتە: ئیبنو عەجلان)و هاوەڵەكانی لە پێناو كەسێكی قەومەكە (دەجەنگن، كە بریتیە لە: ئیبنو زوبەیر) تا بیكەن بە سەركردەو بڕیارەكانی جێبەجێ بكرێ (بۆ ئەوان ناشێ، دیار نیە خوا قبووڵی دەكات یان نا).**

---

(١) صحيح: «آداب الزفاف» [البخاري: ٧٨- كتاب الآداب، ٨١- باب: الانبساط إلى الناس، مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ٨١].

(٢) يعني: أيهم يكون رئيساً ينفذ أحكامه. (فضل الله الصمد).

٣٢١- «عَنْ جَرِير (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ لاَ يَرْحَمِ النَّاسَ لاَ يَرْحَمْهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ»»(١).

**واتە: جەریر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بەزەیی نەیەتەوە بە خەڵکدا، ئەوە خوای زاڵی پایەدار بەزەیی لەگەڵ نانوێنێ.**

٣٢٢- «عَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: مَنْ لاَ يَرْحَمُ لاَ يُرْحَمُ، وَلاَ يُغْفَرُ مَنْ لاَ يَغْفِرُ، وَلاَ يُعْفَ عَمَّنْ لَمْ يَعْفُ، وَلاَ يُوقَّ مَنْ لاَ يَتَوَقَّ»(٢).

**واتە: عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: هەر کەس بەزەیی نەنوێنێ، بەزەیی لەگەڵ نانوێنرێ، هەر کەس لە خەڵك خۆش نەبێ و تاوانیان دانەپۆشێ، ئەوە لێی نابوردرێ و تاوانی ناپۆشرێ، وە هەر کەسێك تاوانی خەڵكی نەسڕێتەوە لەلای خۆی، ئەوە تاوانی ناسڕێتەوە، وە هەر کەسێك پارێز نەکات، ناپارێزرێ.**

## دەربارەی: بە بەزەیی بوون لەگەڵ دروستکراوەکانی زەوی

٣٢٣- «عَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: لاَ يُرْحَمُ مَنْ لاَ يَرْحَمُ، وَلاَ يُغْفَرُ لِمَنْ لاَ يَغْفِرُ، وَلا يُتَابُ عَلَى مَنْ لاَ يَتُوبُ، وَلاَ يُوقَّ مَنْ لاَ يُتَوَقَّ»(٣).

**واتە: عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: هەر کەس بەزەیی نەنوێنێ، بەزەیی لەگەڵ نانوێنرێ، وە هەر کەس لە خەڵك خۆش نەبێ و تاوانیان دانەپۆشێ، ئەوە لێی نابوردرێ و تاوانی ناپۆشرێ، وە تاوانی لەسەر لاناچێ ئەو کەسەی تەوبە نەکات، وە هەر کەس پارێز نەکات، ناپارێزرێ.**

٣٢٤- «عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي لَأَذْبَحُ الشَّاةَ فَأَرْحَمُهَا، أَوْ قَالَ: إِنِّي لَأَرْحَمُ الشَّاةَ أَنْ أَذْبَحَهَا، قَالَ: «وَالشَّاةُ إِنْ رَحِمْتَهَا، رَحِمَكَ اللَّهُ» مَرَّتَيْنِ»(٤).

**واتە: موعاویەی کوڕی قوڕڕە لە باوکی (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ڕۆژێك پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من کە مەڕ سەردەبڕم بەزەییم پێیدا دێتەوە، یان گوتی: من بەزەییم بە مەڕدا دێتەوەو لەوەی سەری ببڕم؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: جا ئەگەر تۆ جارێك بەزەییت بە مەڕدا بێتەوە، ئەوە خوا دوو جار بەزەیی بە تۆدا دێتەوە.**

---

(١) صحيح: «تخريج مشكلة الفقر» (ص: ٧٠): [البخاري: ٩٧- كتاب التوحيد، ٢- باب: قول اللّه تعالى: قل أدعوا اللّه أو ادعوا الرحمن. مسلم: ٤٣- كتاب الفضائل، ح ٦٦].

(٢) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٤٨٣).

(٣) حسن: انظر ما قبله.

(٤) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٦).

٣٢٥- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ الصَّادِقَ الْمَصْدُوقَ أَبَا الْقَاسِمِ ﷺ يَقُولُ: «لاَ تُنْزَعُ الرَّحْمَةُ إِلاَّ مِنْ شَقِيٍّ»»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری ڕاستبێژو بەڕاست دانراو باوكی قاسم ﷺ بوو دەیفەرموو: بەزەیی لە دڵی هیچ كەسێك دەرناهێنرێ، مەگەر (دڵی) كەسێكی بەدبەخت نەبێ.

٣٢٦- «عَنْ جَرِيرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ لاَ يَرْحَمُ النَّاسَ لاَ يَرْحَمُهُ اللَّهُ»»[2].

واتە: جەریر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك بەزەیی نەیەتەوە بە خەڵك، ئەوە خوا بەزەیی پێ نایەتەوە.

## دەربارەی: بەزەیی هاتنەوە بە خاوو خێزان

٣٢٧- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَرْحَمَ النَّاسِ بِالْعِيَالِ، وَكَانَ لَهُ ابْنٌ مُسْتَرْضَعٌ فِي نَاحِيَةِ الْمَدِينَةِ، وَكَانَ ظِئْرُهُ قَيْنًا، وَكُنَّا نَأْتِيهِ، وَقَدْ دَخَنَ الْبَيْتُ بِإِذْخِرٍ، فَيُقَبِّلُهُ وَيَشُمُّهُ»[3].

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە هەموو خەڵكی بە بەزەییتر بوو بۆ خاووخێزانەكەی، جا كوڕێكی خۆی (كە ناوی ئیبراهیم بوو) شیری پێ دەدرا (دایەنی بۆ گیرا بوو) لە چواردەوری مەدینە، مێردی شیردەرەكە دوكانی شت چاككردنەوەی هەبوو، ئێمە دەچووین بۆ لای لەكاتێكداماڵەكە دوكەڵاوی بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ (لەوێدا) منداڵەكەی ماچ دەكردو بۆنی دەكرد، (بەوپەڕی سۆزو خۆشەویستی و تاسەوە).

٣٢٨- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ وَمَعَهُ صَبِيٌّ، فَجَعَلَ يَضُمُّهُ إِلَيْهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَتَرْحَمُهُ؟» قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «فَاللَّهُ أَرْحَمُ بِكَ مِنْكَ بِهِ، وَهُوَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ»»[4].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ منداڵێكیشی لەگەڵدا بوو، جا هەر منداڵەكەی بە خۆیەوە دەگوشی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بەزەییت پێیدا دێتەوە؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: (باش بزانە) خوا زۆر بە بەزەییترە بە تۆ، لە بەزەییت بۆ ئەو منداڵە، وە خوا بە بەزەییترینی بە بەزەییانە.

---

(١) حسن: «تخريج المشكاة» (٤٩٦٨): [الترمذي: ٢٥- كتاب البر والصلة، ١٦- باب: ما جاء في رحمة المسلمين].

(٢) صحيح.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٠٨٩): [مسلم: ٤٣ كتاب الفضائل، ح ٦٣].

(٤) صحيح الإسناد.

## دەربارەی: بەزەیی هاتنەوە بە ئاژەڵان

٣٢٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ اشْتَدَّ بِهِ الْعَطَشُ، فَوَجَدَ بِئْراً فَنَزَلَ فِيهَا، فَشَرِبَ ثُمَّ خَرَجَ، فَإِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ، يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: لَقَدْ بَلَغَ هَذَا الْكَلْبَ مِنَ الْعَطَشِ مِثْلُ الَّذِي كَانَ بَلَغَنِي، فَنَزَلَ الْبِئْرَ فَمَلأَ خُفَّهُ، ثُمَّ أَمْسَكَهَا بِفِيهِ، فَسَقَى الْكَلْبَ، فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَإِنَّ لَنَا فِي الْبَهَائِمِ أَجْراً؟ قَالَ: «فِي كُلِّ ذَاتِ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ»»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە کاتێکدا کە پیاوێك بە ڕێگەدا دەڕۆیشت تینوێتیەکی توند زۆری بۆ هێنا، جا بیرێکی دۆزیەوەو، چووە نێویەوەو، ئاوی خواردەوە، دواتر هاتە دەرەوە، لەو کاتەدا سەگێکی بینی زۆری تینوو بوو، خۆڵی دەخوارد لە تینوویەتی، پیاوەکە (لە دڵی خۆی) گوتی: ئەم سەگە ڕاددەی تینوویەتی گەیشتۆتە ڕاددەی تینوویەتی من، جا چووە نێو بیرەکەو پێڵاوەکانی پڕ ئاو کردو بە دەمی گرتی (تا هاتە سەرەوە)، جا ئاوەکەی دا بە سەگەکە، خوا پاداشتی ئەو کارەی دایەوەو لێی خۆش بوو، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا لە باش مامەڵە کردنمان لەگەڵ ئاژەڵەکانیش پاداشتمان بۆ هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ: لە هەموو خاوەن جەرگێکی تەڕ پاداشتتان بۆ هەیە (واتە: ئەو شتەی چاکەی بەرانبەر دەکەن هەر ئەوەندەیە ڕووحی تێدابێ، یان ژیاندار بێ پاداشتتان بۆ هەیە لەسەر چاکە کردنتان لەگەڵی).**

٣٣٠- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: عُذِّبَتِ امْرَأَةٌ فِي هِرَّةٍ حَبَسَتْهَا حَتَّى مَاتَتْ جُوعاً، فَدَخَلَتْ فِيهَا النَّارَ، يُقَالُ، وَاللَّهُ أَعْلَمُ: لاَ أَنْتِ أَطْعَمْتِيهَا، وَلاَ سَقِيتِيهَا حِينَ حَبَسْتِيهَا، وَلاَ أَنْتِ أَرْسَلْتِيهَا، فَأَكَلَتْ مِنْ خَشَاشِ الأَرْضِ»[2].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئافرەتێك سزا درا بە هۆی ئەوەی پشیلەیەکی زیندانی کرد تاکو لە برسان مرد، بە هۆیەوە فڕێ درایە دۆزەخەوە، دەگوترێ: «خواش زاناترە» نە خواردنت پێداو، نە خواردنەوەت پێدا کاتێك کە حەپست کرد، وە نە ڕێگەشت دا بڕوات بۆ خۆی لە زیندەوەرانی زەوی بخوات.**

٣٣١- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «ارْحَمُوا تُرْحَمُوا، وَاغْفِرُوا يَغْفِرُ اللَّهُ لَكُمْ، وَيْلٌ لأَقْمَاعِ الْقَوْلِ، وَيْلٌ لِلْمُصِرِّينَ الَّذِينَ يُصِرُّونَ عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ»»[3].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٩): [البخاري: ٤٢- كتاب المساقاة، ٩- باب: فضل سقي الماء. مسلم: ٣٩- كتاب السلام، ح ١٥٣].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٨)، «الإرواء» (٢١٨٢): [البخاري: ٣٢- كتاب المساقاة ٩- باب: فضل سقي الماء. مسلم: ٣٩- كتاب السلام، ح ١٥١].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٤٨٢).

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەمڕی کوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە بەزەیی بن بەزەییتان لەگەڵ دەنوێنرێ، وە لە خەڵك ببوورن، خوا لێتان دەبوورێ، سزای سەخت بۆ ئەو کەسانەی زۆر گوێ بۆ قسان دەگرن و کاری پێ ناکەن، وە سزای سەخت بۆ ئەوانەی گوناهان دەکەن و سووریشن لەسەر ئەوەی ئەنجامی دەدەن و دەشزانن (کە گوناهو تاوانە).

٣٣٢- «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ رَحِمَ وَلَوْ ذَبِيحَةً، رَحِمَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»»[١].

واتە: ئەبو ئومامە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بە بەزەیی بێ هەتا ئەگەر بەرانبەر سەربڕینی ئاژەڵێکیش بێ، ئەوە خوا بەزەیی پێیدا دێتەوە لە ڕۆژی دواییدا.

## دەربارەی: هەڵگرتن و بردنی هێلکەی باڵندە

٣٣٣- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَزَلَ مَنْزِلاً فَأَخَذَ رَجُلٌ بَيْضَ حُمَّرَةٍ، فَجَاءَتْ تَرِفُّ عَلَى رَأْسِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «أَيُّكُمْ فَجَعَ هَذِهِ بِبَيْضَتِهَا؟» فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَا أَخَذْتُ بَيْضَتَهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ارْدُدْ، رَحْمَةً لَهَا»»[٢].

واتە: عەبدوڵلا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە شوێنێك گیرسایەوەو، پیاوێك چوو هێلکەی باڵندەیەکی هەڵگرت و دەریهێنا، جا باڵندەکە هات لەسەر سەری پێغەمبەری خوا ﷺ باڵەفرکێی دەکرد، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: کێ لە ئێوە ئازاری بەم باڵندەیە گەیاندووە بەهۆی هێلکەکەیەوە؟ پیاوێکیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من هێلکەکەیم بردووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بیگەڕێنەوە، لەبەر سۆز پێداهاتنەوەی (واتە: سۆزت پێدا بێتەوە).

٣٣٤- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ فَرَأَى ابْنَاً لِأَبِي طَلْحَةَ يُقَالُ لَهُ: أَبُو عُمَيْرٍ، وَكَانَ لَهُ نُغَيْرٌ يَلْعَبُ بِهِ، فَقَالَ: «يَا أَبَا عُمَيْرٍ، مَا فَعَلَ أَوْ أَيْنَ النُّغَيْرُ؟»»[٣].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوەو، کوڕێکی ئەبو تەڵحەی بینی، کە پێی دەگوترا: ئەبو عومەیر، کە چۆلەکەیەکی هەبوو یاری لەگەڵ دەکرد، جا پێی فەرموو: ئەی ئەبو عومەیر، چۆلەکەکەت چ دەکات؟ یان کوا چۆلەکەکەت لە کوێیە؟

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٤٨٢).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٥): [أبو داود: ١٥- كتاب الجهاد، ١١٢- باب: في كراهية حرق العدو بالنار].

(٣) صحيح: «مختصر الشمائل» (٢٠١): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب: ١١٢- باب: الكنية للصبية قبل أن يولد للرجل. مسلم: ٣٨- كتاب الآداب، ح ٣٠].

## دەربارەی: قسەی چاكە كردن لە نێوان خەڵك

٣٣٥- «عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ أُمَّهُ أُمَّ كُلْثُومِ ابْنَةَ عُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْطٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) أَخْبَرَتْهُ، أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَيْسَ الْكَذَّابُ الَّذِي يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ، فَيَقُولُ خَيْرًا، أَوْ يَنْمِي خَيْرًا»، قَالَتْ: وَلَمْ أَسْمَعْهُ يُرَخِّصُ فِي شَيْءٍ مِمَّا يَقُولُ النَّاسُ مِنَ الْكَذِبِ إِلاَّ فِي ثَلاَثٍ: الإِصْلاَحِ بَيْنَ النَّاسِ، وَحَدِيثِ الرَّجُلِ امْرَأَتَهُ، وَحَدِيثِ الْمَرْأَةِ زَوْجَهَا»[١].

واتە: ئیبنو شیهاب دەڵێ: حومەیدی كوڕی عەبدوڕڕەحمان هەواڵی پێداوم كە دایكی واتە: ئوم كەلسومی كچی عوقبەی كوڕی ئەبو موعەیت (خوا لێی ڕازی بێ) هەواڵی پێداوە، خۆی بیستوویەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ كە دەیفەرموو: بە درۆزن دانانرێ ئەو كەسەی قسە ڕێك دەخاو نێوانی خەڵكی چاك دەكاتەوە، قسەی چاك دەكات، یان قسەی چاكە دێنێ و دەبات، وە ئوم كەلسوم دەڵێ: نەمبیستوە پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دابێ لەوەی خەڵك لە درۆ دەیڵێن جگە لە سێ (حاڵەت): ئاشتكردنەوەی نێوان خەڵك، وە قسەی پیاو بۆ خێزانەكەی (بۆ ئەوەی دڵی ڕابگرێ و خۆشەویستی بۆ دەرببڕێ)، وە قسەی ئافرەت بۆ پیاوەكەی (بۆ ئەوەی دڵی ڕابگرێ و خۆشەویستی بۆ دەرببڕێ).

## دەربارەی: نەگونجانی درۆ (بۆ مسوڵمان)

٣٣٦- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ، فَإِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ، وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ يَصْدُقُ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ صِدِّيقًا، وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ، فَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَالْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَكْذِبُ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ كَذَّابًا»»[٢].

واتە: عەبدوڵڵا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەست بگرن بە ڕاستگۆییەوە، بێگومان ڕاستگۆیی ڕێنمایی و ڕێ پێشاندەرە بۆ (هەموو كردارو گوفتارێكی) چاكە، وە چاكەش ڕێنمایی و ڕێ پێشاندەرە بۆ بەهەشت! وە پیاوی وا هەیە هێندە ڕاستبێژە هەتا لە لای خوا بە ڕاستگۆ دەنووسرێ، وە خۆتان بپارێزن لە درۆكردن، چونكە بێگومان درۆكردن ڕێنمایی و ڕێ

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٤٥): [البخاري: ٥٣- كتاب الصلح، ٢- باب: ليس الكاذب الذي يصلح بين الناس. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ١٠١].

(٢) صحيح: [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٦٩- باب: قول الله تعالى: يأيها الذين ءامنوا اتقوا الله وكونوا مع الصدقين. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ١٠٣، ١٠٤، ١٠٥].

پێشاندەرە بۆ خراپەکاریی و لادان لە ڕێی ڕاست، وە خراپەکارییش سەرەنجامی بۆ ئاگرە، وە پیاوی وا هەیە هێندە درۆ دەکات هەتا لەلای خوا ناوی بە درۆزن دەنووسرێ.

٣٣٧- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: لاَ يَصْلُحُ الْكَذِبُ فِي جِدٍّ وَلاَ هَزْلٍ، وَلاَ أَنْ يَعِدَ أَحَدُكُمْ وَلَدَهُ شَيْئاً ثُمَّ لاَ يُنْجِزُ لَهُ»[1].

واتە: عەبدوڵلا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: درۆ کردن ناگونجێ نە بۆ حاڵەتی جددیی و نە بۆ حاڵەتی گاڵتەو گەپ، وە بۆ ئەوەش ناگونجێ کە یەکێك لە ئێوە بەڵێن بدات بە منداڵەکەی (بەوەی شتێکی جوان، یان خۆشی بۆ بکڕێ) دواتر بۆی جێبەجێ نەکات.

## دەربارەی: ئەو کەسەی ئارام دەگرێ لەسەر ئازاردرانی لەلایەن خەڵك

٣٣٨- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْمُؤْمِنُ الَّذِي يُخَالِطُ النَّاسَ، وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ، خَيْرٌ مِنَ الَّذِي لاَ يُخَالِطُ النَّاسَ، وَلاَ يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ»»[2].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو بڕوادارەی کە تێکەڵی خەڵکی دەبێ و لەسەر ئەزیەت و ئازارەکانیشیان ئارام دەگرێ، باشترە لەو بڕوادارەی کە تێکەڵی خەڵکی نابێ و بەرگەی ئەزیەت و ئازاریشیان ناگرێ.

## دەربارەی: ئارامگرتن لەسەر ئازاردران

٣٣٩- «عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ أَحَدٌ «أَوْ لَيْسَ شَيْءٌ» أَصْبَرَ عَلَى أَذًى يَسْمَعُهُ مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَإِنَّهُمْ لَيَدَّعُونَ لَهُ وَلَداً، وَإِنَّهُ لَيُعَافِيهِمْ وَيَرْزُقُهُمْ»»[3].

واتە: ئەبوو مووسای ئەشعەریی (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێك نیە، یان هیچ شتێك نیە ئارامگرتر بێ لەسەر ئەو ئازاردانەی دەیبیستێ وەك خوای زاڵی پایەدار، (خەڵکی کافرو بێ دین) دەڵێن: خوا منداڵی هەیە، لەگەڵ ئەوەش خوای بەخشندە ساغ و سەلامەتیان دەکات و ڕزق و ڕۆزیشیان پێدەدات.

---

(١) صحيح: المصدر نفسه.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٩٣٩): [الترمذي: ٣٥- كتاب القيامة، ٥٥- باب: حدثنا أبو مؤسى إبن ماجه: ٣٦- كتاب الفتن، ٢٣- باب: الصبر على البلاء، ٤٠٣٢].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٢٤٩): [البخاري: ٩٧- كتاب التوحيد، ٣- باب: قول الله تعالى: إن الله هو الرزاق ذو القوة المتين. مسلم: ٥٠ كتاب صفات المنافقين وأحكامهم، ح ٤٩، ٥٠].

٣٤٠- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَسَمَ النَّبِيُّ ﷺ قِسْمَةً، كَبَعْضِ مَا كَانَ يَقْسِمُ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: وَاللَّهِ، إِنَّهَا لَقِسْمَةٌ مَا أُرِيدَ بِهَا وَجْهَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، قُلْتُ أَنَا: لَأَقُولَنَّ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَأَتَيْتُهُ، وَهُوَ فِي أَصْحَابِهِ، فَسَارَرْتُهُ، فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَيْهِ ﷺ وَتَغَيَّرَ وَجْهُهُ، وَغَضِبَ، حَتَّى وَدِدْتُ أَنِّي لَمْ أَكُنْ أَخْبَرْتُهُ، ثُمَّ قَالَ: «قَدْ أُوذِيَ مُوسَى بِأَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ فَصَبَرَ»»[١].

**واتە: عەبدوڵڵا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستکەوتی دابەش کرد، وەك هەندێ لەوانەی پێشتر دابەش کرابوون، جا پیاوێك لە پشتیوانەکان گوتی: سوێند بە خوا ئەم دابەشکردنە مەبەستی ڕەزامەندی خوای زاڵی پایەداری تێدانیە، منیش گوتم: دڵنیابە دەبێ ئەمە بە پێغەمبەر ﷺ بڵێم، بۆیە چوومە خزمەتی لە کاتێکدا لە نێو هاوەڵانیدا بوو، جا بە چپەو شاراوەیی پێمگوت، زۆر لەسەری قورس بوو، زۆری پێناخۆش بوو و ڕووخساری گۆڕاو، تووڕە بوو، (تووڕەبوونەکە بە شێوەیەك بوو)، هەتا ئاواتەخواز بووم پێم نەگوتبایە، پاشان فەرمووی: بە دڵنیایی مووسا زۆر لەوەش زیاتر ئەزیەت درا، کەچی ئارامی گرت.**

## دەربارەی: ئاشتکردن و چاککردنەوەی نێوانی خەڵك

٣٤١- «عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِدَرَجَةٍ أَفْضَلَ مِنَ الصَّلاَةِ وَالصِّيَامِ وَالصَّدَقَةِ؟» قَالُوا: بَلَى، قَالَ: «صَلاَحُ ذَاتِ الْبَيْنِ، وَفَسَادُ ذَاتِ الْبَيْنِ هِيَ الْحَالِقَةُ»»[٢].

**واتە: ئەبوو دەرداء (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئایا هەواڵتان پێنەدەم بە پلەیەك کە باشترو چاکتربێ لە نوێژو ڕۆژوو و صەدەقەی (سوننەت)؟! گوتیان: با، (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ)، فەرمووی: ئاشتکردنەوەی نێوان خەڵکی، وە ئاشووب نانەوە لە نێوان خەڵکی ئایین دەتاشێ! (چونکە دینداریيەکەتان بێ هێز دەکات و لە بەین دەبات).**

٣٤٢- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ ۝١﴾ الأَنْفَال، قَالَ: هَذَا تَحْرِيجٌ مِنَ اللَّهِ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَنْ يَتَّقُوا اللَّهَ وَأَنْ يُصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِهِمْ»[٣].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەربارەی ئەم فەرموودەی خوای بەرز کە دەفەرموێ: ﴿فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ ۝١﴾ الأَنْفَال، گوتوویەتی: ئەمە قەدەغەکردنێکە لەلایەن خواوە لەسەر بڕواداران، بۆ ئەوەی پارێز لە خوا بکەن و نێوانی خۆیان چاك بکەن.**

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣١٧٥): [البخاري: ٦٠- كتاب الأنبياء، ٢٨- باب: حدثني إسحاق بن نصر. مسلم: ١٢- كتاب الزكاة، ح ١٤٠، ١٤١].

(٢) صحيح: «الحلال والحرام» (٤٠/٨): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٥٠- باب: في إصلاح ذات البين. الترمذي: ٣٥- باب: حدثنا أبو يحيى].

(٣) صحيح الإسناد موقوفاً، وروي نحوه مرفوعاً من حديث أنس، «التعليق الرغيب» (٣/ ٤١٠).

## دەربارەی: تانەدان لە ڕەچەڵەكەكان

٣٤٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «شُعْبَتَانِ لاَ تَتْرُكُهُمَا أُمَّتِي: النِّيَاحَةُ وَالطَّعْنُ فِي الأَنْسَابِ»»[1].

واتە: ئەبو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دوو شت هەن ئۆممەتەكەم وازیان لێ ناهێنن، (ئەوانیش بریتین لە): شین و ڕۆڕۆ كردن و سینگ داڕنین لەسەر مردوو و، تانەدان لە ڕەچەڵەك.

## دەربارەی: دابڕین و قسە نەكردن لەگەڵ كەسێك

٣٤٤- «عَنْ عَوْفِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ الطُّفَيْلِ، وَهُوَ ابْنُ أَخِي عَائِشَةَ لِأُمِّهَا، أَنَّ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) حُدِّثَتْ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ فِي بَيْعٍ «أَوْ عَطَاءٍ» أَعْطَتْهُ عَائِشَةُ: وَاللَّهِ لَتَنْتَهِيَنَّ عَائِشَةُ أَوْ لَأَحْجُرَنَّ عَلَيْهَا، فَقَالَتْ: أَهُوَ قَالَ هَذَا؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَهُوَ لِلَّهِ نَذْرٌ أَنْ لاَ أُكَلِّمَ ابْنَ الزُّبَيْرِ كَلِمَةً أَبَداً، فَاسْتَشْفَعَ ابْنُ الزُّبَيْرِ بِالْمُهَاجِرِينَ حِينَ طَالَتْ هِجْرَتُهَا إِيَّاهُ، فَقَالَتْ: وَاللَّهِ، لاَ أُشَفِّعُ فِيهِ أَحَداً أَبَداً، وَلاَ أُحَنِّثُ نَذْرِي الَّذِي نَذَرْتُ أَبَداً. فَلَمَّا طَالَ عَلَى ابْنِ الزُّبَيْرِ كَلَّمَ الْمِسْوَرَ بْنَ مَخْرَمَةَ وَعَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الْأَسْوَدِ بْنِ يَغُوثَ، وَهُمَا مِنْ بَنِي زُهْرَةَ، فَقَالَ لَهُمَا: أَنْشُدُكُمَا بِاللَّهِ إِلاَّ أَدْخَلْتُمَانِي عَلَى عَائِشَةَ، فَإِنَّهَا لاَ يَحِلُّ لَهَا أَنْ تَنْذِرَ قَطِيعَتِي، فَأَقْبَلَ بِهِ الْمِسْوَرُ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ مُشْتَمِلَيْنِ عَلَيْهِ بِأَرْدِيَتِهِمَا، حَتَّى اسْتَأْذَنَا عَلَى عَائِشَةَ فَقَالاَ: السَّلاَمُ عَلَيْكِ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، أَنَدْخُلُ؟ فَقَالَتْ عَائِشَةُ: ادْخُلُوا، قَالاَ: كُلُّنَا يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، ادْخُلُوا كُلُّكُمْ. وَلاَ تَعْلَمُ عَائِشَةُ أَنَّ مَعَهُمَا ابْنَ الزُّبَيْرِ، فَلَمَّا دَخَلُوا دَخَلَ ابْنُ الزُّبَيْرِ فِي الْحِجَابِ، وَاعْتَنَقَ عَائِشَةَ وَطَفِقَ يُنَاشِدُهَا يَبْكِي، وَطَفِقَ الْمِسْوَرُ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ يُنَاشِدَانِ عَائِشَةَ إِلاَّ كَلَّمَتْهُ وَقَبِلَتْ مِنْهُ، وَيَقُولاَنِ: قَدْ عَلِمْتِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَمَّا قَدْ عَلِمْتِ مِنَ الْهِجْرَةِ، وَأَنَّهُ لاَ يَحِلُّ لِلرَّجُلِ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ. قَالَ: فَلَمَّا أَكْثَرُوا التَّذْكِيرَ وَالتَّحْرِيجَ طَفِقَتْ تُذَكِّرُهُمْ وَتَبْكِي وَتَقُولُ: إِنِّي قَدْ نَذَرْتُ وَالنَّذْرُ شَدِيدٌ، فَلَمْ يَزَالُوا بِهَا حَتَّى كَلَّمَتِ ابْنَ الزُّبَيْرِ، ثُمَّ أَعْتَقَتْ بِنَذْرِهَا أَرْبَعِينَ رَقَبَةً، ثُمَّ كَانَتْ تَذْكُرُ بَعْدَ مَا أَعْتَقَتْ أَرْبَعِينَ رَقَبَةً فَتَبْكِي حَتَّى تَبُلَّ دُمُوعُهَا خِمَارَهَا»[2].

واتە: عەوفی كوڕی حارثی كوڕی طوفەیل، كە برازای عائیشەیە لە دایكیەوە، دەڵێ: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) بۆی گێڕدرایەوە كە عەبدوڵلای كوڕی زوبەیر (خوا لێی ڕازی بێ) «لە كڕین و

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٨٩٦): [مسلم: في: ١- كتاب الإيمان ح ١٢١].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٠٢٩) [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٦٢- باب: الهجرة وقول النبي ﷺ «لا يحل، لرجل أن يهجر أخاه فوق ثلاث»].

فرۆشتنێك یان لە بەخشینێكدا كە عائیشە پێی بەخشی بوو» گوتوویەتی: سوێند بە خوا عائیشە یان واز لەمە دێنێ، یان لێی قەدەغە دەكەم، عائیشەش گوتی: ئایا ئەو ئەم قسەیەی كردوە؟ گوتیان: بەڵێ، عائیشە گوتی: دە نەزر بێ كە هەرگیز یەك وشەش قسە لەگەڵ ئیبنو زوبەیردا نەكەم، جا ئیبنو زوبەیر كاتێ كە ماوەیەكی زۆر عائیشە قسەی لەگەڵدا نەكرد موهاجیرەكانی كردە تكاكار بۆ لای تا قسەی لەگەڵدا بكات، (عائیشەش) گوتی: سوێند بە خوا تكای هیچ كەسێك وەرناگرم و ئەو نەزرەشی كە كردوومە نایشكێنم، جا كاتێ كە درێژەی خایاند ئیبنو زوبەیر قسەی لەگەڵ میسوەری كوڕی مەخرەمەو عەبدوڕڕەحمانی كوڕی ئەسوەدی یەغوثدا كرد، كە هەردووكیان لە بنەماڵەی بەنی زەهرە بوون، پێیانی گوت: سوێندتان دەدەم بە خوا دەبێ بمبەن بۆ لای عائیشە، چونكە حەڵاڵ نیە بۆ ئەو نەزر بكات بەوەی پەیوەندی لەگەڵ مندا بپچڕێنێ، میسوەرو عەبدوڕڕەحمان لەگەڵ خۆیاندا بردیان عەباكەیان دابوو بە سەریدا، هەتا مۆڵەتیان لە عائیشە وەرگرت، گوتیان: سەلام و ڕەحمەت و بەرەكەتی خوات لەسەر بێ ئایا بێینە ژوورەوە؟ عائیشە گوتی: وەرنە ژوورەوە، گوتیان: هەموومان ئەی دایكی ئیمانداران؟ گوتی: بەڵێ هەمووتان، عائیشە نەیزانی ئیبنو زوبەیریان لەگەڵدایە، جا كاتێ چوونە ژوورەوە ئیبنو زوبەیر پەردەكەی لاداو باوەشی كرد بە عائیشەدا (كە پوری بوو)و دەستی كرد بە گریان، میسوەرو عەبدوڕڕەحمانیش قسەیان لەگەڵ عائیشەدا دەكرد كە دەبێ قسەی لەگەڵدا بكەیت و ئاشت ببنەوە، وە دەیانگوت: تۆ چاك دەزانی پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی كردوە لەو دابڕانە (لە نێوان مسوڵمانان)، كە بێگومان حەڵاڵ نیە بۆ هیچ كەسێك سێ ڕۆژ زیاتر قسە لەگەڵ مسوڵمانێكدا نەكات، گوتی: جا كاتێ زۆر یادیان خستەوەو قسەیان بۆ كرد، ئەویش دەستی كرد بە گریان و گوتی: من نەزرم كردوەو نەزریش سەختە، بەردەوام بوون و وازیان لێ نەهێنا هەتا قسەی لەگەڵ ئیبنو زوبەیردا كرد، پاشان چل كۆیلەی ئازاد كرد، پاشان دوای ئەوەی چل كۆیلەی ئازاد كرد گریا هەتا فرمێسكەكانی سەرپۆشەكەی تەڕ كرد.

## دەربارەی: دابڕین و قسە نەكردن لەگەڵ مسوڵمان

٣٤٥- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا، وَلاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ»»[١].

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەكدی مەبوغزێنن، وە ئیرەیی بە یەكدی مەبەن و، پشت لە یەكدی مەكەن، بەندەی خوابن و، پێكەوە برابن، وە حەڵاڵ نیە بۆ هیچ مسوڵمانێك لە سێ شەو زیاتر قسە لەگەڵ برای مسوڵمانی نەكات.

---

(١) صحيح: «غاية المرام» (٤٠٤): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٥٧- باب: ما ينهى عن التحاسد والتدابر مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٢٣].

٣٤٦- «عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَزِيدَ اللَّيْثِيِّ ثُمَّ الْجُنْدَعِيِّ، أَنَّ أَبَا أَيُّوبَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ يَحِلُّ لِأَحَدٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ، يَلْتَقِيَانِ فَيَصُدُّ هَذَا وَيَصُدُّ هَذَا، وَخَيْرُهُمَا الَّذِي يَبْدَأُ بِالسَّلامِ»»[1].

**واتە: عەطائى كوڕى يەزيدى لەيسى جوندەعى دەڵێ: ئەبو ئەييوب (خوا لێی ڕازی بێ) هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێداوە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دروست نیە بۆ هیچ كەسێك بۆ ماوەی زیاتر لە سێ شەو پەیوەندی لەگەڵ براكەی ببڕێ، بە شێوەیەك بگەنە یەكدی ئەم ڕووی لەولا بكات و ئەویتر ڕووی لەولا بكات، وە باشترینیشیان ئەو كەسەیانە كە سەرەتا دەست بە سڵاوكردن دەكاتەوە.**

٣٤٧- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَنَافَسُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَاناً»»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: یەكدی مەبوغزێنن، پێشبڕكێ و مونافەسەی ناپەسندی یەكدی مەكەن، ببنە بەندەی خواو برابن.**

٣٤٨- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا تَوَادَّ اثْنَانِ فِي اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ أَوْ فِي الإِسْلاَمِ، فَيُفَرِّقُ بَيْنَهُمَا إِلاَّ بِذَنْبٍ يُحْدِثُهُ أَحَدُهُمَا»»[3].

**واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ دوو كەسێك نیە یەكدیان خۆش بوێ لە پێناوی خوای (عَزَّ وَجَلَّ)، یان لە پێناوی ئیسلام و دواتریش لێك جیاببنەوە (خۆشەویستیەكەیان نەمێنێ) ئەوە بێگومان بە هۆی تاوانێكەوە بووە كە یەكێكیان ئەنجامی داوە.**

٣٤٩- «عَنْ هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ الأَنْصَارِيِّ، ابْنَ عَمِّ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، وَكَانَ قُتِلَ أَبُوهُ يَوْمَ أُحُدٍ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يُصَارِمَ مُسْلِماً فَوْقَ ثَلاَثٍ، فَإِنَّهُمَا نَاكِبَانِ عَنِ الْحَقِّ مَا دَامَا عَلَى صِرَامِهِمَا، وَإِنَّ أَوَّلَهُمَا فَيْئاً يَكُونُ كَفَّارَةً عَنْهُ سَبْقُهُ بِالْفَيْءِ، وَإِنْ مَاتَا عَلَى صِرَامِهِمَا لَمْ يَدْخُلاَ الْجَنَّةَ جَمِيعًا أَبَداً، وَإِنْ سَلَّمَ عَلَيْهِ فَأَبَى أَنْ يَقْبَلَ تَسْلِيمَهُ وَسَلاَمَهُ، رَدَّ عَلَيْهِ الْمَلَكُ، وَرَدَّ عَلَى الآخَرِ الشَّيْطَانُ»»[4].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٢٤٦)، «الإرواء» (٢٠٢٩) [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب ٦٢- باب: الهجرة ....، مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٢٥].

(٢) صحيح: «غاية المرام» (٤٠٤): [البخاري: ٥٧- باب: ما ينهى عن التحاسد والتدابر. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٣١].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٦٣٧).

(٤) صحيح: «الإرواء» (٧/ ٩٥)، «السلسلة الصحيحة» (١٢٤٦).

واتە: هیشامی کوڕی عامڕی ئەنصاڕی، کوڕە مامی ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لە هەردووکیان ڕازی بێ)، ئەوەی باوکی لە ڕۆژی ئوحود کوژرا، گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، فەرموویەتی: دروست نیە بۆ هیچ مسوڵمانێك پەیوەندی لەگەڵ مسوڵمانیکی دیکەدا بپچڕێنێ لە سێ ڕۆژ زیاتر، (ئەگەر دوو کەس وایان کرد) هەردووکیان لە هەق لایانداوە، مادام لەسەر پچڕاندنی پەیوەندی نێوانیان بمێننەوە، جا ئەوەی زووتر دەگەڕێتەوە، زوو گەڕانەوەکەی دەبێتە هۆی سڕینەوەی گوناهەکانی، وە ئەگەر لەسەر ئەم پەیوەندی پچڕاندنە بمرن ئەوە ناچنە بەهەشت (تا سزای ئەو کارەیان نەچێژن)، وە ئەگەر یەکێکیان سەلامەت بوو بەرانبەر ئەوی دیکەو سڵاوی لێکرد، بەڵام ئەوەی دیکە ڕەتی کردەوە (وەڵامی سڵاوەکەی و ئاشتەواییەکەی بداتەوە)، ئەوە فریشتە وەڵامی سڵاوەکەی دەدەنەوە، ئەوەی دیکەش (کە وەڵامی سڵاوەکەی نەداوەتەوە)، شەیتان وەڵامی دەداتەوە.

٣٥٠- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي لَأَعْرِفُ غَضَبَكِ وَرِضَاكِ»، قَالَتْ: قُلْتُ: وَكَيْفَ تَعْرِفُ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: إِنَّكِ إِذَا كُنْتِ رَاضِيَةً قُلْتِ: بَلَى، وَرَبِّ مُحَمَّدٍ، وَإِذَا كُنْتِ سَاخِطَةً قُلْتِ: لاَ، وَرَبِّ إِبْرَاهِيمَ، قَالَتْ: قُلْتُ: أَجَلْ، لَسْتُ أُهَاجِرُ إِلاَّ اسْمَكَ»[1].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: بەڕاستی من دەزانم کاتێك لێم ڕازی و کاتێك لێم تووڕەی، دەڵێ: منیش گوتم: چۆن ئەوە دەزانی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: تۆ کاتێ کە ڕەزامەندیی (دەتەوێ سوێند بۆ شتێك بخۆی) دەڵێی: با، سوێند بە پەروەردگاری موحەممەد، وە ئەگەر تووڕەبی دەڵێی: نا، سوێند بە پەروەردگاری ئیبڕاهیم، دەڵێ: منیش گوتم: بەڵێ ڕاستە من تەنها لەگەڵ ناوەکە نێوانم تێکدەدەم (لە جیاتی موحەممەد ئیبڕاهیم بەکاردێنم لە سوێندەکانم لە کاتی تووڕەبوون لە تۆ، تووڕەبوونەکەشم بەس لەوەندەیە).

## دەربارەی: کەسێك یەك ساڵ پەیوەندی بپچڕێنێ لەگەڵ براکەی

٣٥١- «عَنْ أَبِي خِرَاشٍ السُّلَمِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ هَجَرَ أَخَاهُ سَنَةً، فَهُوَ كَسَفْكِ دَمِهِ»»[2].

واتە: ئەبو خیراشی سولەمی (خوا لێی ڕازی بێ)، لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستووە کە دەیفەرموو: هەر کەسێك بۆ ماوەی ساڵێك نێوانی لەگەڵ براکەی دابڕێ ئەوە وەك خوێن ڕشتنی وایە. (واتە: دەبێ کەسەکە سزا بدرێ و سزای بۆ هەیە، هەر وەك چۆن سزا بۆ کوشتن هەیە، ئاواش سزایەك هەیە بۆ ئەو کەسەی ماوەیەکی ئاوا زۆر پەیوەندی بپچڕێنێ).

---

(١) صحيح: [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٦٣- باب: ما يجوز من الهجران لمن عصى. مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ٨٠].
(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٩٢٨): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٤٧- باب: فيمن يهجر أخاه المسلم].

٣٥٢- «عَنْ عِمْرَان بْن أَبِي أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَسْلَمَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ حَدَّثَهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «هِجْرَةُ الْمُسْلِمِ سَنَةً كَدَمِهِ»»[1].

واتە: عیمرانی کوڕی ئەبی ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێکی ئەسلەمی لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بۆی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پچڕاندنی پەیوەندی ماوەی ساڵێك لەگەڵ مسوڵمان، وەك ڕشتنی خوێنیەتی. (واتە: دەبێ کەسەکە سزا بدرێت و سزای بۆ هەیە، هەر وەك چۆن سزا بۆ کوشتن هەیە، ئاواش سزایەك هەیە بۆ ئەو کەسەی ماوەیەکی ئاوا زۆر پەیوەندی بپچڕێنێ).

## دەربارەی: دوو کەس کە پشت لە یەکدی دەکەن

٣٥٣- «عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ، يَلْتَقِيَانِ فَيُعْرِضُ هَذَا وَيُعْرِضُ هَذَا، وَخَيْرُهُمَا الَّذِي يَبْدَأُ بِالسَّلاَمِ»»[2].

واتە: ئەبو ئەییوبی ئەنصاری (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نیە بۆ هیچ مسوڵمانێك زیاتر لە سێ ڕۆژ قسە لەگەڵ برای مسوڵمانی ببـڕێتەوەو قسەی لەگەڵدا نەکات، (بە شێوەیەك) بگەن بە یەکدی ئەوەیان پشت هەڵبکاو ئەوەی دیکەشیان هەر پشت هەڵبکاو قسە لەگەڵ یەکتری نەکەن، وە باشترینیان ئەو کەسەیە کە سەرەتا دەست دەکات بە سڵاوکردن (دەست پێشخەری دەکات بۆ ئاشتبوونەوە).

٣٥٤- «عَنْ مُعَاذَةَ، أَنَّهَا سَمِعَتْ هِشَامَ بْنَ عَامِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يُصَارِمَ مُسْلِماً فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ، فَإِنَّهُمَا مَا صَارَمَا فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ، فَإِنَّهُمَا نَاكِبَانِ عَنِ الْحَقِّ مَا دَامَا عَلَى صِرَامِهِمَا، وَإِنَّ أَوَّلَهُمَا فَيْئاً يَكُونُ كَفَّارَةً لَهُ سَبْقُهُ بِالْفَيْءِ، وَإِنْ هُمَا مَاتَا عَلَى صِرَامِهِمَا لَمْ يَدْخُلاَ الْجَنَّةَ جَمِيعاً»»[3].

واتە: موعازە گوێی لە هیشامی کوڕی عامر بووە (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتوویەتی گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی: حەڵاڵ نیە بۆ مسوڵمان زیاتر لە سێ شەوان پەیوەندی لەگەڵ مسوڵمانێکی دیکەدا بپچڕێنێ، جا مادام ئەوان زیاتر لە سێ شەوان پەیوەندیان پچڕاندوە، بەو پەیوەندی پچڕاندنە لایانداوە لە هەق مادام لەسەر پچڕاندنی پەیوەندی نێوانیان بمێننەوە، جا ئەوەی زووتر دەگەڕێتەوە، زوو گەڕانەوەکەی دەبێتە هۆی سڕینەوەی گوناهەکانی، وە ئەگەر لەسەر ئەم پەیوەندی پچڕاندنە بمرن ئەوە هەردووکیان ناچنە بەهەشت (تا سزای ئەو کارەیان نەچێژن).

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٩٢٨).

(٢) صحيح: «الإرواء» (٢٠٢٩).

(٣) صحيح.

## دەربارەی: ڕق و کینەو گومانی خراپ

٣٥٥- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَحَاسَدُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَاناً»»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکدی مەبوغزێنن، وە ئێرەیی و حەسوودی بە یەکدی مەبەن، بەندەی خوابن و، پێکەوە برابن.**

٣٥٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «تَجِدُ مِنْ شَرِّ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِنْدَ اللَّهِ ذَا الْوَجْهَيْنِ، الَّذِي يَأْتِي هَؤُلَاءِ بِوَجْهٍ، وَهَؤُلَاءِ بِوَجْهٍ»»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەت خراپترین کەس کە دەیبینی کەسی دووڕووە، ئەو کەسەی کە دەچێتە لای خەڵکانێك بە ڕوویێك و، لای خەڵکانێکی دیکە بە ڕوویێکی دیکە.**

٣٥٧- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ، فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ، وَلاَ تَنَاجَشُوا، وَلاَ تَحَاسَدُوا، وَلاَ تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَنَافَسُوا، وَلاَ تَدَابَرُوا وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَاناً»»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە گومان (واتە: گومانی خراپ بردن)، چونکە گومانی خراپ درۆترین قسەیە (لە دڵدا دێت و دەڕوات)، وە (لە کاتی کڕین و فرۆشتندا) نرخ لەسەر یەکتر زیاد مەکەن[٤]، هەروەها حەسوودی بە یەکتر مەبەن و، لە یەکتر تووڕە مەبن و یەکدی مەبوغزێنن و، پێشبڕکێی نارەواو خۆزاڵکردن بەسەر یەکتریدا مەکەن، پشت لە یەکدی مەکەن و، بەندەی خوا بن و برا بن.**

٣٥٨- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: تُفْتَحُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ يَوْمَ الإِثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ، فَيُغْفَرُ لِكُلِّ عَبْدٍ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئاً، إِلاَّ رَجُلٌ كَانَتْ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَخِيهِ شَحْنَاءُ، فَيُقَالُ: أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا»[٥].

---

(١) صحيح: «غية المرام» (٤٠٤): [البخاري: ٦٧- كتاب النكاح، ٤٥- باب: لا يخطب على خطبة أخيه. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٣٠].

(٢) صحيح: [البخاري: ٩٣- كتاب الأحكام، ٢٧- باب: ما يكره من ثناء السلطان. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب،ح ٩٨].

(٣) صحيح: «غاية المرام» (١٧٤): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٥٧- باب: ما ينهى من التحاسد والتدابر. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٢٨].

(٤) بە فێڵ نیازی کڕینتان نەبێ، تاوەکو خەڵکی ڕووی تێبکەون.

(٥) صحيح: «الإرواء» (٩٤٨-٩٤٩): [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب،، ح ٣٥].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژانی دوو شەممەو پێنج شەممە دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە، لە هەموو بەندەیەك دەبوردرێ کە هاوبەشی بۆ خوا بڕیار نەدابێ، مەگەر پیاوێك کە لە نێوانی خۆی و برا مسوڵمانەکەی ڕق و کینەیەك هەبێ (بە هۆیەوە بەینیان نەبێ)، جا دەگوترێ: چاوەڕێی ئەو دووانە بکەن (جارێ لێخۆشبوونیان بۆ نیە) تاکو ئاشت دەبنەوە.

٣٥٩- «عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: أَلاَ أُحَدِّثُكُمْ بِمَا هُوَ خَيْرٌ لَكُمْ مِنَ الصَّدَقَةِ وَالصِّيَامِ؟ صَلاَحُ ذَاتِ الْبَيْنِ، أَلاَ وَإِنَّ الْبُغْضَةَ هِيَ الْحَالِقَةُ»[1].

واتە: ئەبو دەرداء (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتوویەتی: ئایا شتێکتان پێ بڵێم: بۆتان باشتر بێ لە ئەنجامدانی نوێژو ڕۆژوو گرتن؟ (ئەوانیش گوتوویانە: بەڵێ) گوتی: چاککردنی پەیوەندی نێوانتان، وە ئاگاداربن یەکتری بوغزاندن تاشەری دینە (دینتان دەتاشێ و لە بەینی دەبات).

## دەربارەی: ئەو کەسەی ئامۆژگاری برای مسوڵمانی دەکات، بێ ئەوەی ڕاوێژی پێ کردبێ

٣٦٠- «عَنِ ابْنِ عَجْلاَنَ، أَنَّ وَهْبَ بْنَ كَيْسَانَ أَخْبَرَهُ «وَكَانَ وَهْبٌ أَدْرَكَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ رَأَى رَاعِياً وَغَنَماً فِي مَكَانٍ قَبِيحٍ وَرَأَى مَكَاناً أَمْثَلَ مِنْهُ، فَقَالَ لَهُ: وَيْحَكَ، يَا رَاعِي، حَوِّلْهَا، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «كُلُّ رَاعٍ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ»»[2].

واتە: ئیبنو عەجلان دەڵێ: وەهبی کوڕی کەیسان هەواڵی پێداوە (وەهب عەبدوڵڵای کوڕی عومەری بینیوە)، دەڵێ: ئیبنو عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، شوانێکی بینی لەگەڵ مەڕەکانی لە شوێنێکی خراپ و ناشایستە بۆ لەوەڕ، وە شوێنێکی گونجاوتری بۆ لەوەڕاندنی مەڕەکانی بینی، جا بە شوانەکەی گوت: هاوار بە حاڵت ئەی شوان شوێنی مەڕەکان بگۆڕە، من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، فەرموویەتی: هەموو چاودێرێك بەرپرسە لەسەر ئەوەی لە ژێر چاودێریەتی (لە شوێنی چاك لەوەڕیان پێ بکە).

---

(١) صحيح الإسناد، صح مرفوعاً.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١/ ٣٦) [البخاري: ٤٣- كتاب الاستقراض، ٢٠- باب: العبد راع في سيده. مسلم: ٣٣- كتاب الإمارة، ح ٢٠].

## دەربارەی: ئەو کەسەی وێنەی خراپی پێناخۆشە

٣٦١- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ لَنَا مَثَلُ السَّوْءِ، الْعَائِدُ فِي هِبَتِهِ، كَالْكَلْبِ يَرْجِعُ فِي قَيْئِهِ»»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بۆ ئێمە نیە وێنەی خراپ، (بەڵام) ئەو کەسەی پەشێمان دەبێتەوە لە خەڵات بەخشین، وەك سەگ وایە کە بگەڕێتەوە بۆ سەر ڕشانەوەکەی (بۆیە وامەکەن ئەو سیفەت و نمایشە خراپەتان لێ بێتەجێ).

تێبینی: مەبەست ئەوە ئێمەی کۆمەڵی ئیمانداران نابێ شتێکی وا بکەین وەسف بکرێین بە سیفەتی خراپ و پەست، کە ئەویش وەسف کرانە بە یەکێك لە خراپترین و پیسترینی ئاژەڵان لە خراپترین حاڵەتیدا، کە ڕشانەوەیە، وە هۆکاری سەرەکی لەم وێنە هێنانەوەش ترساندنی ئیماندارانە بەوەی ئەم کارە حەڕامە بکەن، دوای بەخشینی خێرو صەدەقە، یان دیاری، بچن داوای بکەنەوەو وەری بگرنەوە.

## دەربارەی: ئەوەی باسکراوە لە فێڵ و هەڵخەڵەتاندن

٣٦٢- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُؤْمِنُ غِرٌّ كَرِيمٌ، وَالْفَاجِرُ خَبٌّ لَئِيمٌ»»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بڕوادار سادەو بەڕێزە، کەسی خراپیش فێڵبازو سووك و بێڕێزە.

## دەربارەی: جوێن گوتن

٣٦٣- «عَنْ أُمِّ الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) أَنَّ رَجُلاً أَتَاهَا فَقَالَ: إِنَّ رَجُلاً نَالَ مِنْكِ عِنْدَ عَبْدِ الْمَلِكِ، فَقَالَتْ: إِنْ نُؤْبَنَ[٣] بِمَا لَيْسَ فِينَا، فَطَالَمَا زُكِّينَا بِمَا لَيْسَ فِينَا»[٤].

---

(١) صحيح: «الإرواء» (١٦٢٢): [البخاري: ٥١- كتاب الهبة، ٣٠- باب: لا يحل لأحد أن يرجع في هبته وصدقته. مسلم: ٢٤- كتاب الهبات، ح ٥].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٩٣٥): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٥- باب: في حسن العشرة. الترمذي: ٢٥- كتاب البر والصلة، ٤١- باب: ما جاء في البخيل].

(٣) أي نُعَب، يقال: أَبَنَه، وأَبَّنه تأبيناً: عابه في وجهه.

(٤) حسن الإسناد.

واتە: ئوم دەرداء (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای و گوتی: پیاوێك لە لای عەبدولمەلیك قسەی پێگوتووی (بە خراپی باسی کردووی)، ئوم دەرداء گوتی: ئەگەر عەیبدار کراین بە شتانێك کە تێماندا نەبوو، ئەوە زۆر جاریش مەدح و تەزکیە کراوین بە شتانێك کە تێماندا نەبووە (کەواتە من گوێی پێ نادەم).

٣٦٤- «عَنْ قَيْسٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّه (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): إِذَا قَالَ الرَّجُلُ لِصَاحِبِهِ: أَنْتَ عَدُوِّي، فَقَدْ خَرَجَ أَحَدُهُمَا مِنَ الإِسْلاَمِ، أَوْ بَرِئَ مِنْ صَاحِبِهِ قَالَ قَيْسٌ: وَأَخْبَرَنِي بَعْدُ أَبُو جُحَيْفَةَ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ قَالَ: إِلاَّ مَنْ تَابَ»[1].

واتە: قەیس دەڵێ: عەبدوڵلا (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: ئەگەر پیاوێك بە هاوەڵەکەی گوت تۆ دوژمنی منی، ئەوە یەکێکیان لە بازنەی ئیسلام چۆتە دەرەوە (چونکە هەر مسوڵمان و کافر دوژمنی یەکترن، مەگەر دەبێ دوو مسوڵمان دوژمنایەتی یەکتر بکەن؟!)، یانیش خۆی بێ بەری کردوە لە هاوەڵەکەی، قەیس دەڵێ: دوای ئەمە ئەبو جوحەیفە هەواڵی پێدام کە عەبدوڵلا گوتوویەتی: مەگەر ئەو کەسەی وای گوتووە دواتر تەوبە بکات.

## دەربارەی: ئاو بەخشین

٣٦٥- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: فِي ابْنِ آدَمَ سِتُّونَ وَثَلاَثُمِائَةِ سُلاَمَى «أَوْ عَظْمٍ، أَوْ مَفْصِلٍ» عَلَى كُلِّ وَاحِدٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ صَدَقَةٌ، كُلُّ كَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ صَدَقَةٌ، وَعَوْنُ الرَّجُلِ أَخَاهُ صَدَقَةٌ، وَالشَّرْبَةُ مِنَ الْمَاءِ يَسْقِيهَا صَدَقَةٌ، وَإِمَاطَةُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ»[2].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: لە نەوەی ئادەم (واتە: لە هەموو مرۆڤێکدا)، سێ سەدو شەست (٣٦٠) ئێسك، یان جومگە هەیە، جا (بۆ سوپاسگوزاری) لەسەر هەر یەکێکیان هەموو ڕۆژێك چاکەیەك پێویستە، هەموو قسەیەکی خۆش چاکەیەکە، وە پیاو یارمەتی برای (مسوڵمانی) خۆی بدات چاکەیەکە، ئاو بدات بە کەسێك چاکەیەکە، وە شتێکی زیانبەخش لەسەر ڕێگای خەڵکی لابدات چاکەیەکە، (واتە: ئەو ڕۆژەی ئەم کارانە بکات ئەوە مافی ئەو (٣٦٠) جومگەی داوە).

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح لغيره: «السلسلة الصحيحة» (٥٧٣- ٥٧٣-٥٧٧).

## دەربارەی: دوو کەس کە جوێن دەڵێن بە یەکدی، یەکەمیان گوناهبارە

٣٦٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْمُسْتَبَّانِ مَا قَالاَ فَعَلَى الْبَادِئِ، مَا لَمْ يَعْتَدِ الْمَظْلُومُ»»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو دوو کەسەی کە جوێن بە یەکدی دەڵێن، گوناهی جوێنەکەیان دەکەوێتە سەر ئەوەیان کە دەستپێشخەری کردوە، بە مەرجێ ئەوەی دووەمیان کە ستەم لێکراوە سنوور نەبەزێنێ لە وەڵامدانەوە.**

٣٦٧- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْمُسْتَبَّانِ مَا قَالاَ، فَعَلَى الْبَادِئِ، حَتَّى يَعْتَدِيَ الْمَظْلُومُ»»[٢].

**واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو دوو کەسەی کە جوێن بە یەکدی دەڵێن، گوناهی جوێنەکەیان دەکەوێتە سەر ئەوەیان کە دەستپێشخەری کردوە، هەتا کەسی دووەمیان سنوور دەبەزێنێ لە جوێندان (ئەو کات ئەویش گوناهبار دەبێ).**

٣٦٨- «وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَتَدْرُونَ مَا الْعَضْهُ؟» قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «نَقْلُ الْحَدِيثِ مِنْ بَعْضِ النَّاسِ إِلَى بَعْضٍ، لِيُفْسِدُوا بَيْنَهُمْ»»[٣].

**واتە: وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئایا دەزانن (الْعَضْه) چیە؟ گوتیان: خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: گواستنەوەی قسەیە لەلای خەڵکانێك بۆ لای خەڵکانێکی دیکە، تاوەکو نێوانیان تێکبدەن.**

٣٦٩- «وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ أَوْحَى إِلَيَّ أَنْ تَوَاضَعُوا، وَلاَ يَبْغِ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ»»[٤].

**واتە: وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی خوا (عَزَّ وَجَلَّ) سرووشی بۆ کردووم کە دەبێ خاکی و سادەبن، وە کەسیش دەستدرێژی نەکاتە سەر ئەوانی دیکە.**

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٨٠): [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٦٨].

(٢) حسن صحيح: «السلسلة الصحيحة» أيضاً.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨٤٥)، {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «أَتَدْرُونَ مَا الْعَضْهُ؟»، قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «نَقْلُ الْحَدِيثِ مِنْ بَعْضِ النَّاسِ إِلَى بَعْضٍ لِيُفْسِدَ بَيْنَهُمْ»} (أخرجه البيهقي في الكبرى: ٢١٦٩١).

(٤) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٧٠).

## دەربارەی: ئەو دووانەی جوێن بە یەکدی دەڵێن: شەیتانن، هەر یەکەیان ئەوی دیکەی پێ درۆزنە

۳۷۰- «عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، الرَّجُلُ يَسُبُّنِي؟ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الْمُسْتَبَّانِ شَيْطَانَانِ يَتَهَاتَرَانِ وَيَتَكَاذَبَانِ»»[1].

**واتە: عیاضی کوڕی حیمار (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاو هەیە جوێنم پێ دەڵێ، (حوکمەکەی چۆنە)؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو دووانەی جوێن بە یەکدی دەڵێن شەیتانن، وە هەر یەکەیان بانگەشەی ناڕەوا بەسەر ئەوەی دیکە دەکەن و، یەکدی بە درۆزن دادەنێن.**

۳۷۱- «عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ أَوْحَى إِلَيَّ أَنْ تَوَاضَعُوا، حَتَّى لاَ يَبْغِيَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ، وَلاَ يَفْخَرَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ»»[2].

**واتە: عیاضی کوڕی حیمار (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا سروشی بۆ کردووم کە خاکی و سادەبن، تاوەکو هیچ کەسێك دەستدرێژی و ستەم لە یەکێکی دیکە نەکات، وە تاوەکو هیچ کەسێك شانازی بەسەر یەکێکی دیکەدا نەکات.**

۳۷۲- «عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ رَجُلاً سَبَّنِي فِي مَلأٍ هُمْ أَنْقُصُ مِنِّي، فَرَدَدْتُ عَلَيْهِ، هَلْ عَلَيَّ فِي ذَلِكَ جُنَاحٌ؟ قَالَ: «الْمُسْتَبَّانِ شَيْطَانَانِ يَتَهَاتَرَانِ وَيَتَكَاذَبَانِ» قَالَ عِيَاضٌ: وَكُنْتُ حَرْباً لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَهْدَيْتُ إِلَيْهِ نَاقَةً، قَبْلَ أَنْ أُسْلِمَ، فَلَمْ يَقْبَلْهَا وَقَالَ: «إِنِّي أَكْرَهُ زَبْدَ الْمُشْرِكِينَ»»[3].

**واتە: عیاضی کوڕی حیمار (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی دەڵێی ئەگەر پیاوێك لە نێو خەڵك جوێنم پێ بدات، لە کەسایەتیم کەم بکاتەوە، ئایا ئەگەر وەڵامی بدەمەوە گوناهبار دەبم؟ فەرمووی: ئەو دووانەی جوێن بە یەکدی دەڵێن شەیتانن، وە هەر یەکەیان ئەوی دیکەی پێ درۆزنە، عیاض دەڵێ: من کافری جەنگی بووم بۆ پێغەمبەری خوا، جا وشترێکم کردە دیاری بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ پێش ئەوەی مسوڵمان ببم، ئەویش قبووڵی نەکرد، فەرمووی: من دیاری و خەڵاتی هاوبەشدانەرانم پێ خۆش نیە.**

---

(۱) صحيح.

(۲) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٧٠) [مسلم: ٥١- كتاب الجنة، ح ٦٤، دون فقرة السابقة].

(۳) صحيح: «صحيح أبي داود» (٢٦٩٠): [أبو داود: ١٩- كتاب الخراج، ٣٥- باب: في الإمام يقبل هدايا المشركين. الترمذي: ١٩- كتاب السير، ٢٤- باب: في كراهية هدايا المشركين].

## دەربارەی: جوێن گوتن بە مسوڵمان دەرچوونە (لە ڕەوشتی مسوڵمانان)

٣٧٣- «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سَعْدِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ»»[١].

**واتە: موحەممەدی کوڕی سەعدی کوڕی مالیك لە باوکی (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: جوێن گوتن بە مسوڵمان فاسق بوون و دەرچوونە (لە ڕەوشتی مسوڵمانان).**

٣٧٤- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَاحِشاً، وَلاَ لَعَّاناً، وَلاَ سَبَّاباً، كَانَ يَقُولُ عِنْدَ الْمَعْتَبَةِ: «مَا لَهُ تَرِبَ جَبِينُهُ»»[٢].

**واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەکردارو گوفتاری قێزەون بوون، نە نەفرینکار بوو، نە جوێن فرۆش بوو، لە کاتی سەرزەنشت کردندا (جنێوی نەدەدا، بەڵکو) دەیفەرموو: بۆ وای کردوە نێوچەوانی بە خۆڵدا بچێ.**

٣٧٥- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ»»[٣].

**واتە: عەبدوڵڵا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: جوێن گوتن بە مسوڵمان دەرچوونە (لە ڕەوشتی مسوڵمانان)، وە جەنگ لەگەڵ کردنی (لە سیفەتی) کوفرە.**

٣٧٦- «عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لاَ يَرْمِي رَجُلٌ رَجُلاً بِالْفُسُوقِ، وَلاَ يَرْمِيهِ بِالْكُفْرِ، إِلاَّ ارْتَدَّتْ عَلَيْهِ، إِنْ لَمْ يَكُنْ صَاحِبُهُ كَذَلِكَ»»[٤].

**واتە: ئەبو زەڕ (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: با هیچ پیاوێك هێرش نەکاتە سەر پیاوێکی دی بە قسە پێگوتن و پێی نەڵێ: ئەی فاسق، وە با هێرشی نەکاتە سەرو پێی نەڵێ: کافر، ئەگەرنا حەتمەن ئەم دوو سیفەتە (فاسق و کافر) بۆ خۆی دەگەڕێتەوە ئەگەر ئەم هاوەڵەی وا نەبوو.**

---

(١) صحيح: [النسائي: ٣٧- كتاب تحريم الدم، ٢٧- باب: قتال المسلم. إبن ماجه ٣٦- كتاب الفتن، ٤- باب: سباب المسلم فسوق، ح ٣٩٤١].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٨٦): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٣٨- باب: لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ ﷺ فاحشاً].

(٣) صحيح: [البخاري: ٢- كتاب الإيمان، ٣٦- باب: خوف المؤمن من ان يحبط عمله. مسلم: ١- كتاب الإيمان، ح ١١٦].

(٤) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٨٩١): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٣٨- باب: لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ ﷺ فاحشاً].

۳۷۷- «عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنِ ادَّعَى لِغَيْرِ أَبِيهِ وَهُوَ يَعْلَمُ فَقَدْ كَفَرَ، وَمَنِ ادَّعَى قَوْمًا لَيْسَ هُوَ مِنْهُمْ فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ، وَمَنْ دَعَا رَجُلًا بِالْكُفْرِ، أَوْ قَالَ: عَدُوُّ اللَّهِ، وَلَيْسَ كَذَلِكَ إِلَّا حَارَتْ عَلَيْهِ»»[۱].

**واتە: لە ئەبو زەڕ (خوا لێی ڕازی بێ)، گێڕدراوەتەوە گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بووە، کە دەیفەرموو: هەرکەس بانگەشەی جگە لە باوکی خۆی بکات و بشزانێ (ئەوە باوکی نیە)، ئەوە گەورەترین کوفری نیعمەتی کردوە، وە هەر کەسێك بانگەشەی گەل و کۆمەڵێك بکات و (بڵێت لەوانم) لەوانیش نەبێ، ئەوە با شوێنێك بۆ خۆی لە ئاگر ئامادە بکات، وە هەر کەسێك بانگەشەی کافربوونی کەسێکی دیکە بکات و (پێی بڵێت: ئەی کافر)، یان پێی بڵێ: دوژمنی خوا، لە کاتێکدا کەسەکەش وانەبێ، ئەوە حەتمەن بۆ خۆی دەگەڕێتەوە.**

۳۷۸- «عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ، قَالَ: سَمِعْتُ سُلَيْمَانَ بْنَ صُرَدٍ «رَجُلًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ» قَالَ: اسْتَبَّ رَجُلَانِ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَغَضِبَ أَحَدُهُمَا، فَاشْتَدَّ غَضَبُهُ حَتَّى انْتَفَخَ وَجْهُهُ وَتَغَيَّرَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنِّي لَأَعْلَمُ كَلِمَةً لَوْ قَالَهَا لَذَهَبَ عَنْهُ الَّذِي يَجِدُ»، فَانْطَلَقَ إِلَيْهِ الرَّجُلُ، فَأَخْبَرَهُ بِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ وَقَالَ: تَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، وَقَالَ: أَتَرَى بِي بَأْسًا، أَمَجْنُونٌ أَنَا؟ اذْهَبْ»[۲].

**واتە: عەدی کوڕی سابیت دەڵێ: گوێم لە سولەیمانی کوڕی صورەد بوو (کە یەکێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ) گوتی: دوو پیاو جوێنیان بە یەکتردا لە لای پێغەمبەر ﷺ، جا یەکێکیان زۆر تووڕە بوو، تا وای لێهات هەڵچوو و ڕووخساری گۆڕا، بۆیە لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من وشەیەك دەزانم ئەگەر بیگوتبا، تووڕەیەکەی دەڕۆیشت، جا پیاوێك چووە لای (پیاوە تووڕەکەو) فەرموودەکەی پێغەمبەری ﷺ پێ ڕاگەیاند، گوتی: پەنا بە خوا بگرە لە شەیتان، پیاوەکە گوتی: بۆچی ئایا هیچ شتێکی نەشیاوم لێ بەدی دەکەی؟ ئایا من شێتم؟ بڕۆ (وازم لێبێنە).**

## دەربارەی: ئەو کەسانەی ڕووبەڕووی خەڵکی نابنەوە بە قسەکانیان

۳۷۹- «عَنْ مَسْرُوقٍ، قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها): صَنَعَ النَّبِيُّ ﷺ شَيْئًا، فَرَخَّصَ فِيهِ، فَتَنَزَّهَ عَنْهُ قَوْمٌ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ فَخَطَبَ، فَحَمِدَ اللَّهَ، ثُمَّ قَالَ: «مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَتَنَزَّهُونَ عَنِ الشَّيْءِ أَصْنَعُهُ؟ فَوَاللَّهِ إِنِّي لَأَعْلَمُهُمْ بِاللَّهِ، وَأَشَدُّهُمْ لَهُ خَشْيَةً»»[۳].

---

(۱) صحيح: «غاية المرام» (۲٦٦-۲٦۷): [البخاري: ٦۱- كتاب المناقب ٥- باب: حدثنا أبو معمر. مسلم: ۱- كتاب الإيمان، ح ۱۱۲].

(۲) صحيح: [البخاري: ۷۸- كتاب الأدب، ٤٤- باب: ما ينهى من السباب واللعن. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ۱۰۹].

(۳) صحيح: [البخاري: ۷۸- كتاب الأدب، ۷۲- باب: من لم يواجه الناس بالعتاب. مسلم: ٤۳- كتاب الفضائل، ح ۱۲۷].

واتە: مەسروق دەڵێ: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتی: پێغەمبەر ﷺ شتێکی کرد کە مۆڵەتی تێدا درابوو، جا خەڵکانێك خۆیان لـە شتەکە بە دوور گرت (بە بۆچوونی خۆیان پێیان باش نەبوو)، جا ئەو خۆ بەدوورگرتنە گەیشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ وتارێکی داو ستایشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: ئەمە چیانە کۆمەڵە کەسانێك خۆیان بە دوور دەگرن لە شتێك کە من ئەنجامی دەدەم؟ دە بە خوا من لەوان باشتر خوا دەناسم، وە لەوانیش زیاتر لێی دەترسم (جا پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕاستەوخۆ ناوی نەهێنان، تا نەشکێنەوە).

## دەربارەی: ئەگەر یەکێك بە کەسێك بڵێ: ئەی مونافیق!

٣٨٠- «عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ السُّلَمِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيّاً (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) يَقُولُ: بَعَثَنِي النَّبِيُّ ﷺ وَالزُّبَيْرَ بْنَ الْعَوَّامِ، وَكِلاَنَا فَارِسٌ، فَقَالَ: «انْطَلِقُوا حَتَّى تَبْلُغُوا رَوْضَةَ كَذَا وَكَذَا، وَبِهَا امْرَأَةٌ مَعَهَا كِتَابٌ مِنْ حَاطِبٍ إِلَى الْمُشْرِكِينَ، فَأْتُونِي بِهَا»، فَوَافَيْنَاهَا تَسِيرُ عَلَى بَعِيرٍ لَهَا حَيْثُ وَصَفَ لَنَا النَّبِيُّ ﷺ فَقُلْنَا: الْكِتَابُ الَّذِي مَعَكِ؟ قَالَتْ: مَا مَعِي كِتَابٌ، فَبَحَثْنَاهَا وَبَعِيرَهَا، فَقَالَ صَاحِبِي: مَا أَرَى، فَقُلْتُ: مَا كَذَبَ النَّبِيُّ ﷺ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَأُجَرِّدَنَّكِ أَوْ لَتُخْرِجِنَّهُ، فَأَهْوَتْ بِيَدِهَا إِلَى حُجْزَتِهَا وَعَلَيْهَا إِزَارٌ صُوفٌ، فَأَخْرَجَتْ، فَأَتَيْنَا النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ عُمَرُ: خَانَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالْمُؤْمِنِينَ، دَعْنِي أَضْرِبْ عُنُقَهُ، وَقَالَ: «مَا حَمَلَكَ؟» فَقَالَ: مَا بِي إِلاَّ أَنْ أَكُونَ مُؤْمِناً بِاللَّهِ، وَأَرَدْتُ أَنْ يَكُونَ لِي عِنْدَ الْقَوْمِ يَدٌ، قَالَ: صَدَقَ يَا عُمَرُ، أَوَ لَيْسَ قَدْ شَهِدَ بَدْراً، لَعَلَّ اللَّهَ اطَّلَعَ إِلَيْهِمْ، فَقَالَ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ وَجَبَتْ لَكُمُ الْجَنَّةُ، فَدَمَعَتْ عَيْنَا عُمَرَ، وَقَالَ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ»[١].

واتە: ئەبو عەبدوڕڕەحمانی سولەمی دەڵێ: گوێم لێ بوو عەلی (خوا لێی ڕازی بێ)، دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ من و زوبەیری کوڕی عەوامی نارد کە هەردووکمان سوارچاك بووین، فەرمووی: بڕۆن هەتا دەگەن بە فڵانە باخچەو فڵانە باخچە، ئافرەتێکی تێدایە نامەو (نووسراوێك)ی حاطەبی پێیە، ناردوویەتی بۆ لای هاوبەشدانەران، بۆم بێنن، جا پێی گەیشتین بە سەر وشترێکەوە بوو دەڕۆیشت، بەو شێوە بوو کە پێغەمبەر ﷺ وەسفی کردبوو، گوتمان: ئەو نووسراوەمان پێبدە کە لەلاتە، گوتی: هیچ نووسراوێکم لەلا نیە، ئێمەش خۆی و وشترەکەیمان پشکنی (نەماندۆزیەوە)، هاوەڵەکەم گوتی: پێم وانیە هیچی لەلابێ، گوتم: سوێند بە خوا پێغەمبەر ﷺ قسەی ناڕاست دەرناچێ، گوتم: سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، یان ڕووتت دەکەمەوە، یان دەبێ نووسراوەکە دەربێنی، ئەویش دەستی نەوی کرد بۆ نیفۆی[٢] کەلاکەی کە دەرپێیەکی صوفی لەبەردا بوو و نامەکەی

---

(١) صحيح: «صحيح أبي داود» (٢٣٨١): [البخاري: ٥٦- كتاب الجهاد، ١٤١- باب: الجاسوس. مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ١٦١].

(٢) بە کوردی: کونی دۆخین شەرواڵ و بیجامەیە، کە لاستیك، یان پارچە پەڕۆکێك بە کاردەهێنرێ بۆ ئەوەی بە نێو قەدەوە بیوەستێنێ.

دەرهێنا، ئێمەیش هێنامان بۆ پێغەمبەر ﷺ، عومەر گوتی: حاطەب خیانەتی لە خواو پێغەمبەرو بڕواداران کردوە ڕێگەم بدە با بدەم لە گەردنی، (پێغەمبەریش) فەرمووی: ئەی حاطەب چی وای لێکردی ئەو کارە بکەی؟ گوتی: من هیچم نیە (نە موشریکم و نە یارمەتی ئەوانیشم دەوێ) تەنها ئەوە نەبێ بڕوام بە خوا هەیە، وە ویستم لە نێو ئەو خەڵکەدا دەستێکم هەبێ (چونکە ماڵ و منداڵ و مەصڵەحەتم لەوێیە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ڕاستی کرد ئەی عومەر، ئەی نازانی ئەو بەشداری جەنگی بەدری کردوە، بێگومان خوا لێیان خۆش بووەو فەرموویەتی: چی دەکەن بە ویستی خۆتان بیکەن، بەڕاستی بەهەشتتان بۆ پێویست بووە، عومەر چاوەکانی فرمێسکی لێ دەهاتە خوارەوە، گوتی: خواو پێغەمبەرەکەی دەزانن.

## دەربارەی: ئەگەر کەسێك بە براکەی بڵێ: ئەی کافر!

٣٨١- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَيُّمَا رَجُلٌ قَالَ لِأَخِيهِ: كَافِرٌ، فَقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُمَا»[1].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بە براکەی بڵێ: کافر، ئەوە ئەو کوفرە بۆ یەکێکیان دەگەڕێتەوە.**

٣٨٢- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَر (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِذَا قَالَ لِلْآخَرِ: كَافِرٌ، فَقَدْ كَفَرَ أَحَدُهُمَا، إِنْ كَانَ الَّذِي قَالَ لَهُ كَافِراً فَقَدْ صَدَقَ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ كَمَا قَالَ لَهُ فَقَدْ بَاءَ الَّذِي قَالَ لَهُ بِالْكُفْرِ»[2].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کەسێك بە یەکێکی دیکەی گوت: ئەی کافر، ئەوە یەکێکیان کافر بووە، ئەگەر کەسەکە کافر بوو، ئەوە قسەکەی ڕاست دەرچووە، ئەگەر وا نەبوو کە ئەو گوتوویەتی، ئەوە کوفرەکە بۆ ئەو کەسە دەگەڕێتەوە کە پێی گوت کافر.**

## دەربارەی: (پەناگرتن بە خوا لە) دڵ پێخۆشبوونی دوژمن

٣٨٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَعَوَّذُ مِنْ سُوءِ الْقَضَاءِ، وَشَمَاتَةِ الأَعْدَاءِ»[3].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٨٩١):] البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٧٣- باب: من كفر أخاه بغير تأويل. مسلم: ١- كتاب الإيمان، ح ١١١].

(٢) صحيح: «المصدر نفسه»: مسلم: [وهو معنى الحديث السابق].

(٣) صحيح: «الظلال» (٣٨٢،٣٨٣): [البخاري: ٨٠- كتاب الدعوات، ٢٨- باب: التعوذ من جهد البلاء. مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء، ح ٥٣].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پەنای دەگرت لە خراپی بەڵاو ناڕەحەتیەك كە بەسەریدا بێ، وە لەوەی كە دوژمن پێی دڵخۆشبێ.

## دەربارەی: زێدەڕۆیی لە ماڵ و سامان

٣٨٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ يَرْضَى لَكُمْ ثَلاَثاً، وَيَسْخَطُ لَكُمْ ثَلاَثاً، يَرْضَى لَكُمْ: أَنْ تَعْبُدُوهُ وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً، وَأَنْ تَعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعاً، وَأَنْ تَنَاصَحُوا مَنْ وَلاَّهُ اللَّهُ أَمْرَكُمْ، وَيَكْرَهُ لَكُمْ: قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بێگومان خوا بە سێ شتان لێتان ڕازیەو بە سێ شتانیش لێتان تووڕەیە، بەوانە لێتان ڕازیە تەنها ئەو بپەرستن و هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەن، وە دەست بگرن بە حەبلی پەتەوی خوا (كە قورئانە)، وە دڵسۆزی ئەو كەسە بن كە كاروباریان بەڕێوەدەبات، وە پێی ناخۆشە بڵێن: گوتراو گوتی (هەموو شتێك بكەن بە هەواڵ و بڵاوی بكەنەوە)، وە زۆر پرسیار كردن، وە ماڵ بە فیڕۆدان.

٣٨٥- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، فِي قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَىْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٣٩﴾﴾ سبأ، قَالَ: فِي غَيْرِ إِسْرَافٍ، وَلاَ تَقْتِيرٍ»[2].

واتە: لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، گێردراوەتەوە دەربارەی ئەم ئایەتەی خوا (عَزَّ وَجَلَّ): ﴿وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَىْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٣٩﴾﴾ سبأ، فەرموویەتی: بێ زێدەڕۆیی و ڕژدو ڕەزیلی كردن.

## دەربارەی: زێدەڕۆییكاران لە ناهەقی

٣٨٦- «عَنْ أَبِي الْعُبَيْدَيْنِ، قَالَ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنْ: ﴿ٱلْمُبَذِّرِينَ ﴿٢٧﴾﴾ الإسراء، قَالَ: الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي غَيْرِ حَقٍّ»[3].

واتە: ئەبو عوبەیدەین دەڵێ: پرسیارم كرد لە عەبدوڵڵا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەربارەی: ﴿ٱلْمُبَذِّرِينَ ﴿٢٧﴾﴾ الإسراء؟ گوتی: ئەوانەن كە خەرجی و مەسرەفی زێدە دەكەن لە ناهەقیدا.

٣٨٧- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) : ﴿ٱلْمُبَذِّرِينَ ﴿٢٧﴾﴾ الإسراء، قَالَ: الْمُبَذِّرِينَ فِي غَيْرِ حَقٍّ»[4].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٦٨٥) [مسلم: ٣٠- كتاب الأقضية، ح ١٠].

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) حسن الإسناد: والجملة الأخيرة منه صحت مرفوعة «المشكاة / التحقيق الثني» (٤١٣٩).

واتە: لە ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، گێڕدراوەتەوە دەربارەی ئایەتی: ﴿ٱلْمُبَذِّرِينَ﴾ ﴿٢٧﴾ الإسراء، فەرموویەتی: ئەوانەن کە زێدەڕۆیی و مەسرەف دەکەن لە ناهەقی دا.

## دەربارەی: چاککردن و نۆژەن کردنەوەی خانوو و ماڵ

٣٨٨- «عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَ عُمَرُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ! أَصْلِحُوا عَلَيْكُمْ مَثَاوِيكُمْ، وَأَخِيفُوا هَذِهِ الْجِنَّانَ قَبْلَ أَنْ تُخِيفَكُمْ، فَإِنَّهُ لَنْ يَبْدُوَ لَكُمْ مُسْلِمُوهَا، وَإِنَّا وَاللَّهِ مَا سَالَمْنَاهُنَّ مُنْذُ عَادَيْنَاهُنَّ»[1].

واتە: زەیدی کوڕی ئەسلەم لە باوکی دەگێڕێتەوە، دەڵێ: عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) لەسەر مینبەر فەرمووی: ئەی خەڵکینە! داواتان لێدەکەم جێگەو ڕێگەی (قیامەتی) خۆتان چاك بکەن، وە بترسن لەوەی (نەچنە) ئەو بەهەشتە، پێش ئەوەی بەهەشت بتانترسێنێ (بەوەی نەچنە نێوی)، لەبەر ئەوەی پێش ئێوەی مسوڵمان کەس ناچێتە نێوی، وە سوێند بە خوا ئێمە هیچ یەکێکمان لێی دڵنیانین لەو ڕۆژەی کە مسوڵمان بووینەو بەڵێنمان داوە.

## دەربارەی: خەرجی کردن لە دروستکردنی باڵەخانە

٣٨٩- «عَنْ خَبَّابٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ لَيُؤْجَرُ فِي كُلِّ شَيْءٍ، إِلاَّ الْبِنَاءَ»[2].

واتە: خەبباب (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاو لەسەر هەموو شتێك پاداشتی دەدرێتەوە، تەنها خانوو و باڵەخانە دروست کردن نەبێ، (چونکە لە زۆربەی کات ئیسراف و زێدەڕۆیی تێدەکەوێت و لە پێویست زۆر زیاترە).

## دەربارەی: کارکردن و یارمەتی دانی مرۆڤ لەگەڵ کرێکارەکانی

٣٩٠- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، قَالَ لاِبْنِ أَخٍ لَهُ خَرَجَ مِنَ الْوَهْطِ: أَيَعْمَلُ عُمَّالُكَ؟ قَالَ: لاَ أَدْرِي، قَالَ: أَمَا لَوْ كُنْتَ ثَقَفِيًّا لَعَلِمْتَ مَا يَعْمَلُ عُمَّالُكَ، ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَيْنَا فَقَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا عَمِلَ مَعَ عُمَّالِهِ فِي دَارِهِ «وَقَالَ أَبُو عَاصِمٍ مَرَّةً: فِي مَالِهِ» كَانَ عَامِلاً مِنْ عُمَّالِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ»[3].

---

(١) حسن الإسناد: والجملة الأخيرة منه صحت مرفوعة، «المشكاة» (٤١٣٩).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٨٣١).

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٩).

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) گێڕدراوەتەوە کە بە برازایەکی خۆی گوتوە کاتێ لە وەهط دەرچوو (گوتی): ئایا کرێکارەکانت کارت بۆ دەکەن؟ ئەویش گوتی: نازانم، ئەویش پێی گوت: بەڵام ئەگەر تۆ سەقەفی بووایە، دەتزانی کرێکارەکانت کار دەکەن یان نا، دوایی ئاوڕی دایەوە بۆ لای ئێمەو گوتی: بە ڕاستی ئەگەر پیاو لەگەڵ کرێکارەکەی کاری کرد لە خانووەکەی «یان لە ماڵەکە» ئەوە دەبێتە یەکێك لە کرێکارەکانی خوا (عَزَّ وَجَلَّ).

## دەربارەی: پێشبڕکێ کردن لە بەرزکردنەوەی باڵەخانەدا

٣٩١- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَتَطَاوَلَ النَّاسُ فِي الْبُنْيَانِ»»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دونیا تێکناچێ هەتا خەڵك دەست دەکەن بە پێشبڕکێ کردن لە بەرزکردنەوەی بیناو باڵەخانەدا.

٣٩٢- «عَنِ الْحَسَنِ يَقُولُ: كُنْتُ أَدْخُلُ بُيُوتَ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ فِي خِلاَفَةِ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ فَأَتَنَاوَلُ سُقُفَهَا بِيَدِي»(٢).

واتە: حەسەن دەڵێ: من لە سەردەمی جێنشینایەتی عوسماندا، چوومە ژوورەکانی خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ دەستم دەدا لە سەقفەکانی (ئەوەندە نزم و سادە بوو).

٣٩٣- «عَنْ دَاوُدُ بْنُ قَيْسٍ قَالَ: رَأَيْتُ الْحُجُرَاتِ مِنْ جَرِيدِ النَّخْلِ مَغْشِيّاً مِنْ خَارِجٍ بِمُسُوحِ الشَّعْرِ، وَأَظُنُّ عَرْضَ الْبَيْتِ مِنْ بَابِ الْحُجْرَةِ إِلَى بَابِ الْبَيْتِ نَحْواً مِنْ سِتِّ أَوْ سَبْعِ أَذْرُعٍ، وَأَحْزِرُ الْبَيْتَ الدَّاخِلَ عَشْرَ أَذْرُعٍ، وَأَظُنُّ سُمْكَهُ بَيْنَ الثَّمَانِ وَالسَّبْعِ نَحْوَ ذَلِكَ، وَوَقَفْتُ عِنْدَ بَابِ عَائِشَةَ فَإِذَا هُوَ مُسْتَقْبِلُ الْمَغْرِبَ»(٣).

واتە: داوودی کوڕی قەیس دەڵێ: ژوورەکانی (واتە: خانووەکانی ماڵی پێغەمبەری خوام ﷺ)م بینی لە لقی دار خورما دروست کرابوون لە دەرەوە داپۆشرابوو بە موو، پێم وابێ پانی ماڵەکە لە دەرگای ژوورەکانەوە بۆ دەرگای دەرەوە شەش تا حەوت باڵ پان بوو، درێژیەکەیشی لە ناوەوە دە باڵ پان بوو، وە بەرزیەکەشی لە نێوانی هەشت بۆ حەوت دەبوو، لە دەرگای عائیشەدا وەستام دەرگاکە ڕووی لە خۆرئاوا بوو.

---

(١) صحيح: «الإرواء» (٣/٣٢/١): [البخاري في: ٩٢- كتاب الفتن، ٢٥- باب حدثنا مسدد].

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد.

٣٩٤- «عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى خَبَّابٍ نَعُودُهُ، وَقَدِ اكْتَوَى سَبْعَ كَيَّاتٍ، فَقَالَ: إِنَّ أَصْحَابَنَا الَّذِينَ سَلَفُوا مَضَوْا وَلَمْ تُنْقِصْهُمُ الدُّنْيَا، وَإِنَّا أَصَبْنَا مَا لاَ نَجِدُ لَهُ مَوْضِعاً إِلَّا التُّرَابَ، وَلَوْلَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَانَا أَنْ نَدْعُوَ بِالْمَوْتِ لَدَعَوْتُ بِهِ»[1].

واتە: قەیسی كوڕی ئەبو حازم دەڵێ: چووینە سەردانی خەبباب (بە هۆی نەخۆش كەوتنی)، حەوت جار كەوی (داغ) كرابوو، دەیگوت: هاوەڵانی پێشوومان ڕۆیشتن و دونیا نەیتوانی تووشی كەموكوڕیان بكات، ئێمەش شتانێكمان دەستكەوتوە، شوێنمان نیە بۆی، جێگای نابێتەوە (ئەوەندە دونیامان كۆكردۆتەوە) تەنیا خۆڵ نەبێ (واتە: تەنها بە مردن لە كۆڵ ئەم شتانە دەبینەوەو چاومان پڕ دەبێتەوە)، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی كردوە دوعای مردن لە خۆمان بكەین، ئەوە داوای مردن و گیان كێشانم دەكرد.

٣٩٥- «عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: ثُمَّ أَتَيْنَاهُ مَرَّةً أُخْرَى، وَهُوَ يَبْنِي حَائِطاً لَهُ، فَقَالَ: إِنَّ الْمُسْلِمَ يُؤْجَرُ فِي كُلِّ شَيْءٍ يُنْفِقُهُ إِلاَّ فِي شَيْءٍ يَجْعَلُهُ فِي التُّرَابِ»[2].

واتە: قەیسی كوڕی ئەبو حازم دەڵێ: پاشان جارێكی دیكە چووینەوە لای (خەبباب)، لەوكاتەدا دیواری بۆ خۆی دروست دەكرد، فەرمووی: بەڕاستی مسوڵمان لەسەر هەموو شتێك پاداشت دەدرێتەوە، تەنها لەسەر شتێك نەبێ كە لە خۆڵدا خەرجی دەكات (واتە: لە خانوو دروستكردن).

٣٩٦- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ، وَأَنَا أُصْلِحُ خُصّاً لَنَا، فَقَالَ: «مَا هَذَا؟» قُلْتُ: أُصْلِحُ خُصَّنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: «الأَمْرُ أَسْرَعُ مِنْ ذَلِكَ»»[3].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەمرِ (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی (بە لای مندا، لەو كاتەدا) من خەریكی چاككردنی كەپرێك بووم لە دار، فەرمووی: ئەمە چییە؟ گوتم: كەپرەكەمان چاك دەكەم، فەرمووی: كارەكە لەوە خێراترە (واتە: هیوای درێژ مەخوازن مردن كات و ساتی دیار نیە).

## دەربارەی: خانوو و مەنزڵی فراوان

٣٩٧- «عَنْ نَافِعِ بْنِ عَبْدِ الْحَارِثِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مِنْ سَعَادَةِ الْمَرْءِ الْمَسْكَنُ الْوَاسِعُ، وَالْجَارُ الصَّالِحُ، وَالْمَرْكَبُ الْهَنِيءُ»»[4].

---

(١) صحيح: «صحيح أبي داود» (٢٧٢١): [البخاري: ٧٥- كتاب المرضى، ١٩- باب: تمني المريض الموت . مسلم: ٤٨- كالذكر والدعاء، ح ١٢].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٨٣١) أخرجه البخاري، وقد تقدم بنحوه.

(٣) صحيح: «التعليق الرغيب» (١٣٢/٤): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ١٥٧- باب: ما جاء في البناء. الترمذي: ٣٤- كتاب الزهد، ٢٥- باب: ما جاء في قصر الأمل].

(٤) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٨٢).

واتە: نافیعی كوڕی عەبدولحاریس (خوا لێی ڕازی بێ)، لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: لە بەختەوەری مرۆڤی مسوڵمان ئەوەیە: خانووێكی فراوان و، دراوسێیەكی باش و، سواریەكی چاكی هەبێت.

## دەربارەی: دروستكردنی نەقش و نیگاری خانوو باڵەخانە

٣٩٨- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَبْنِيَ النَّاسُ بُيُوتاً، يُشَبِّهُونَهَا بِالْمَرَاحِلِ»، قَالَ إِبْرَاهِيمُ: يَعْنِي الثِّيَابَ الْمُخَطَّطَةَ»[١].

واتە: ئەبو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دونیا تێكناچێ هەتا خەڵك باڵەخانەی هاوشێوەی جلی نەخشێنراوو خەتخەت دروست دەكەن، (واتە: چەندین خانووی چەندین قات دروست دەكەن و، زیاد لە پێویست دەینەخشێنن و باق و بریقی بۆ دەكەن)، ئیبراهیم دەڵێ: واتە: هاوشێوەی پۆشاكی خەتخەت.

٣٩٩- «عَنْ وَرَّادٍ كَاتِبِ الْمُغِيرَةِ قَالَ: كَتَبَ مُعَاوِيَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) إِلَى الْمُغِيرَةِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): اكْتُبْ إِلَيَّ مَا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَكَتَبَ إِلَيْهِ: إِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ»، وَكَتَبَ إِلَيْهِ: إِنَّهُ كَانَ يَنْهَى عَنْ قِيلَ وَقَالَ، وَكَثْرَةِ السُّؤَالِ، وَإِضَاعَةِ الْمَالِ. وَكَانَ يَنْهَى عَنْ عُقُوقِ الأُمَّهَاتِ، وَوَأْدِ الْبَنَاتِ، وَمَنْعٍ وَهَاتِ»»[٢].

واتە: وەڕڕاد نووسەری موغیرە دەڵێ: موعاویە (خوا لێی ڕازی بێ) نامەیەكی نووسی بۆ موغیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، پێی گوت: چیت بیستوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆم بنووسە، ئەویش بۆی نووسی: پێغەمبەری خوا ﷺ كە لە نوێژ دەبۆوە سەلامی دەدایەوە دەیفەرموو: جگە لە خوا هیچ پەرستراوێكی بە هەق نیە، تاكەو هاوبەشی نیە، موڵك هەر هی ئەوە، ستایش هەر بۆ ئەوە، وە ئەو لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، ئەی خوایە! هەر شتێك تۆ ببەخشی كەس ناتوانێ ڕێی لێ بگرێ، ڕێگری نیە لەوەی كە تۆ ببەخشی، وە هیچ كەسێك نیە شتێك ببەخشێت كە تۆ مەنعی بكەیت و نەیبەخشیت، وە خاوەن سامان ماڵ و سامانەكەی لە بەرانبەر تۆدا سوودی پێناگەیەنێ، هەروەها بۆی نووسی (پێغەمبەری خوا): قەدەغەی كردوە لە: گوتراو گوتی، وە زۆر پرسیار كردن، وە ماڵ بە فیڕۆدان، هەروەها قەدەغەی كردوە ئازاری دایك بدرێ، وە كچان

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٧٩).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٩٦): [البخاري: ٨١- كتاب الرقاق، ٢٢- باب: ما يكره من قيل وقال. مسلم: ٣٠- كتاب الأقضية، ح١٢، ١٣. مسلم: ٥- كتاب المساجد، ح ١٣٧].

زیندەبەچاڵ بکرێن، وە ئەوانەی شایستەی پێ بەخشینن پێیان نەبەخشرێ و ناشایستە بانگ بکرێن و پێیان ببەخشرێ.

٤٠٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَنْ يُنَجِّي أَحَداً مِنْكُمْ عَمَلٌ»، قَالُوا: وَلاَ أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «وَلاَ أَنَا، إِلاَّ أَنْ يَتَغَمَّدَنِي اللَّهُ مِنْهُ بِرَحْمَةٍ، فَسَدِّدُوا وَقَارِبُوا وَاغْدُوا وَرُوحُوا، وَشَيْءٌ مِنَ الدُّلْجَةِ، وَالْقَصْدَ الْقَصْدَ تَبْلُغُوا»»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هیچ کام لە ئێوە کردەوەکەی خۆی نایخاتە بەهەشتەوە! گوتیان: تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟! فەرمووی: منیش، مەگەر خوا بە بەزەیی خۆی دامپۆشێ، هەوڵبدەن ڕێی ڕاست بگرن، وە خۆتان نزیك بخەنەوە لە خواو (صەواب)، وە نوێژو پەرستش بکەن لە بەیانیان و ئێواران و بەشێك لە شەوو، هەروەها ناوەندگیرو میانڕەوبن دەگەن (بە ڕەزامەندی خواو بەهەشتەکەی).**

## دەربارەی: نەرم و نیانی

٤٠١- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنها) زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: دَخَلَ رَهْطٌ مِنَ الْيَهُودِ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالُوا: السَّامُ عَلَيْكُمْ، قَالَتْ عَائِشَةُ فَفَهِمْتُهَا فَقُلْتُ: عَلَيْكُمُ السَّامُ وَاللَّعْنَةُ، قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَهْلاً يَا عَائِشَةُ، إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الرِّفْقَ فِي الأَمْرِ كُلِّهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَوَ لَمْ تَسْمَعْ مَا قَالُوا؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: قَدْ قُلْتُ: وَعَلَيْكُمْ»[2].

**واتە: عائیشەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: کۆمەڵێك جوولەکە هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتیان: (السَّامُ عَلَيْكُمْ) واتە: مردن لەسەر ئێوە بێت (بەشێوەیەك دەریان دەبڕی تا وابزانین سەلامیان کردوە)، دەڵێ: منیش تێگەیشتم و، گوتم: (عَلَيْكُم السَّامُ وَاللَّعْنَة) واتە: مردن بۆ ئێوەو نەفرینتان لەسەر بێ، جا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەسەرەخۆ بە ئەی عائیشە، بێگومان خوا نەرم و نیانی لە هەموو شتێکدا پێ خۆشە، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! مەگەر تۆ نەتبیست ئەوان چیان گوت؟! دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (با گوێم لێ بوو چیان گوت) منیش گوتم: (وعَلَيْكُم) واتە: وە لەسەر خۆشتان بێت (واتە: چیتان بە ئێمە گوت، ئەوەش بۆ ئێوە).**

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٦٠٢): [البخاري: ٨١- كتاب الرقاق، ١٨- باب: القصد والمداومة على العمل. مسلم: ٥٠- كتاب صفات المنافقين وأحكامهم، ح ٧١- ٧٦].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٣٧) [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب ٣٥- باب: الرفق في الأمر كله . مسلم: ٣٩- كتاب السلام، ح ١٠، ١١].

٤٠٢- «عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ يُحْرَمُ الرِّفْقَ يُحْرَمُ الْخَيْرَ»»[١].

واته: جەریری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەس بێ بەش بکرێ لە نەرم و نیانی، ئەوە بێ بەشکراوە لە خێرو چاکە.

٤٠٣- «عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ أُعْطِيَ حَظَّهُ مِنَ الرِّفْقِ فَقَدْ أُعْطِيَ حَظَّهُ مِنَ الْخَيْرِ، وَمَنْ حُرِمَ حَظَّهُ مِنَ الرِّفْقِ، فَقَدْ حُرِمَ حَظَّهُ مِنَ الْخَيْرِ، أَثْقَلُ شَيْءٍ فِي مِيزَانِ الْمُؤْمِنِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حُسْنُ الْخُلُقِ، وَإِنَّ اللَّهَ لَيُبْغِضُ الْفَاحِشَ الْبَذِيَّ»»[٢].

واته: ئەبو دەرداء (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بەشە نەرم و نیانی خۆی پێدرابێ، ئەوە بەشە خێری خۆی پێدراوە، وە هەر کەسێك لە بەشە نەرم و نیانی خۆی بێ بەش کرابێ ئەوە لە بەشە خێری خۆی بێ بەش کراوە، وە قورسترین و بەسەنگترین شت لە تای تەرازووی ئیماندار لە ڕۆژی دواییدا ڕەوشت جوانییە، وە بە دڵنیایی خوا ڕقی لە بەد ڕەوشتی و زمان شڕیی و جوێن فرۆشی دەبێتەوە.

٤٠٤- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَقِيلُوا ذَوِي الْهَيْئَاتِ عَثَرَاتِهِمْ»»[٣].

واته: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کەم و کوڕی و هەڵەکانی کەسانی خاوەن پێگە بە کەم بگرن. (تا سووك نەبن لەبەر چاوی خەڵك، چونکە ئەو کات پێشەنگی و ڕێبەرایەتی نامێنێ و شیرازەی کۆمەڵگای مسوڵمانان تێکدەچێ).

٤٠٥- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَكُونُ الْخُرْقُ فِي شَيْءٍ إِلاَّ شَانَهُ، وَإِنَّ اللَّهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ»»[٤].

واته: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەزانی لە هەر شتێکدا هەبێ حەتمەن ناشیرینی دەکات، وە خوا نەرم و نیانە نەرم و نیانیشی خۆشدەوێ.

٤٠٦- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَشَدَّ حَيَاءً مِنَ الْعَذْرَاءِ فِي خِدْرِهَا، وَكَانَ إِذَا كَرِهَ شَيْئاً عَرَفْنَاهُ فِي وَجْهِهِ»[٥].

---

(١) صحيح: «التعليقات الحسان» (٥٤٩): [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٧٤، ٨٥].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥١٩و ٨٧٦) [الترمذي: ٣٥- كتاب البر والصلة، ٦٧- باب: ماجاء في الرفق].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٦٣٨) [أبو داود: ٣٧- كتاب الحدود، ٥- باب: الستر على أهل الحدود].

(٤) صحيح: «التعليق الرغيب» (٢٦٢/٣) [الترمذي: ٢٥- كتاب البر والصلة، ٤٧- باب: ما جاء في الفحش والتفاحش. إبن ماجه: ٣٧- كتاب الزهد، ١٧- باب: الحياء، ح ٤١٨٥].

(٥) صحيح: «مختصر الشمائل»: [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٧٦ – باب: من لم يواجه الناس بالعتاب. مسلم: ٤٣- كتاب الفضائل، ح ٦٧].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە شەرم و حەیاتر بوو لەو کچە تازە پێگەیشتووەی کە (لەبەر شەرم و حەیا) خۆی لە کونجێکی ماڵ قەتیس دەکات، وە ئەگەر شتێکی پێناخۆش بووایە بە ڕووخساری دەمانزانی (ئەوەندە بە شەرم و نەرمونیان بوو دەری نەدەبڕی، ئەگەر شتەکە پەیوەندی بە شەریعەتەوە نەبووایە).

٤٠٧- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) قَالَتْ: كُنْتُ عَلَى بَعِيرٍ فِيهِ صُعُوبَةٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «عَلَيْكِ بِالرِّفْقِ، فَإِنَّهُ لَا يَكُونُ فِي شَيْءٍ إِلاَّ زَانَهُ، وَلاَ يُنْزَعُ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ شَانَهُ»»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لەسەر وشترێکی چەمووش و بە زەحمەت بووم (منیش لێم دەدا)، بۆیە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: تکایە نەرم و نیان بە، چونکە نەرم و نیانی لە هەر شتێکدا هەبێ حەتمەن جوانی دەکات، وە لە هەر شتێکدا دەربهێنرێ حەتمەن ناشرینی دەکات.

٤٠٨- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِيَّاكُمْ وَالشُّحَّ، فَإِنَّهُ أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، سَفَكُوا دِمَاءَهُمْ، وَقَطَعُوا أَرْحَامَهُمْ، وَالظُّلْمُ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە ڕەزیلی و چرووکی، چونکە ڕەزیلی و چرووکی ئەوانەی پێش ئێوەی بە هیلاك برد، (بە هۆی ڕەزیلیەوە) خوێنی یەکدیان ڕشت و، پەیوەندی خزمایەتیان پچڕاند (ئەمانەش هەمووی ستەمن)، ستەمیش تاریکایی لەسەر تاریکاییە لە ڕۆژی دواییدا.

## دەربارەی: نەرم و نیانی لە ژیان و گوزەرانی ڕۆژانەدا

٤٠٩- «عَنْ سَعِيدِ بْنِ كَثِيرِ بْنِ عُبَيْدٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، فَقَالَتْ: أَمْسِكْ حَتَّى أَخِيطَ نَقْبَتِي فَأَمْسَكْتُ فَقُلْتُ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، لَوْ خَرَجْتُ فَأَخْبَرْتُهُمْ لَعَدُّوهُ مِنْكِ بُخْلاً، قَالَتْ: أَبْصِرْ شَأْنَكَ، إِنَّهُ لاَ جَدِيدَ لِمَنْ لاَ يَلْبَسُ الْخَلَقَ»[٣].

واتە: سەعیدی کوڕی کەثیری کوڕی عەبید لە باوکی دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: چوومە ژوورەوە بۆ لای عائیشە دایکی ئیمانداران (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتی: (ئەم پۆشاکەم) بۆ بگرە با کونی پۆشاکەکەم بدوورمەوە، منیش گرتم، گوتم: ئەی دایکی ئیمانداران ئەگەر بچمە دەرەوەو هەواڵ بدەم بە خەڵکی ئەوە وا تێدەگەن کە تۆ ڕەزیلی (کە ئەو جلە دەدوریتەوە)، گوتی: چاو کراوەبە لە کاروبارەکانت، بە دڵنیایی پۆشاکی تازە بوونی نیە بۆ کەسێك پۆشاکی کۆن نەکاتەبەری.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٢٤): [مسلم: كتاب البر والصلة والآداب، ح ٧٩].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨٥٨) [ليس في شيء من الكتب الستة، ولكنه عن جابر في مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٥٦].

(٣) حسن الإسناد.

تێبینی: مەبەست ئەوەیە: ئەو کەسەی هەموو کات لە دوای پۆشاکی نوێ و مۆدیلات بێ، ڕۆژێك دێ ئیسراف و دەستبڵاوی ئیفلاسی پێ دێنێ، ئیتر ناتوانێ پۆشاکی نوێ لەبەر بکات، یاخود مەبەستی ئەوەیە: ئەو کەسەی پۆشاکی کۆن نەکاتەبەری پۆشاکی نوێ بۆ ئەو بوونی نیە، چونکە پۆشاکی کۆنی نەبینیوە تا چێژ لە پۆشاکی نوێ بکات و پۆشاکی نوێ بۆ ئەو نوێ بێ، جوانی و خۆشیەکان بە دژەکەیان دەردەکەون و مانا دەبەخشن.

## دەربارەی: ئەوەی مرۆڤ پێی دەبەخشرێ لەسەر نەرم و نیانی

٤١٠- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ، وَيُعْطِي عَلَيْهِ مَا لاَ يُعْطِي عَلَى الْعُنْفِ»»[١].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی موغەففەل (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ، فەرموویەتی: بە دڵنیایی خوا نەرم و نیانەو، نەرم و نیانیشی خۆشدەوێ، وە ئەو شتە چاکانەی لەسەر نەرم و نیانی دەیبەخشێ لەسەر توندی نایبەخشێ.

## دەربارەی: هێورکردنەوە

٤١١- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا، وَسَكِّنُوا وَلاَ تُنَفِّرُوا»»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئاسانکاربن و سەغڵەتی و گرانی دروست مەکەن (لە دینداری و دونیاداریدا)، وە خەڵك ئارام بکەنەوەو دووریان مەخەنەوە.

## دەربارەی: هەڵچوون و زوو تووڕە بوون

٤١٢- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) تَقُولُ: كُنْتُ عَلَى بَعِيرٍ فِيهِ صُعُوبَةٌ، فَجَعَلْتُ أَضْرِبُهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «عَلَيْكِ بِالرِّفْقِ، فَإِنَّ الرِّفْقَ لاَ يَكُونُ فِي شَيْءٍ إِلاَّ زَانَهُ، وَلاَ يُنْزَعُ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ شَانَهُ»»[٣].

---

(١) صحيح: «الروض النضير» (٣٦-٧٦٤) [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٥٠- باب: في الرفق].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١١٥١)، [البخاري: ٨- كتاب الأدب، ٨٠- باب: قول النبيُّ ﷺ (يَسِّرُوا وَلاَ تعسروا». مسلم: ٧٢- كتاب الجهاد والسير، ح٨].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٢٤): [مسلم: كتاب البر والصلة والآداب، ح ٧٩].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لەسەر پشتی وشترێکی چەمووش و بە زەحمەت بووم، منیش لێم دەدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: داوات لێدەکەم نەرم و نیان و لەسەرخۆبی، بەڕاستی نەرم و نیانی لە هەر شتێکدا هەبێ جوانی دەکات، وە لە هەر شتێك دەربهێنرێ حەتمەن ناشرینی دەکات.

٤١٣- «عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الأَشَرَةُ شَرٌّ»»[1].

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوپاس نەکردنی نیعمەتەکان کارێکی خراپ و دزێوە.

## دەربارەی: ماڵ و سەروەت پەیداکردن بۆ ئاینده

٤١٤- «عَنْ حَنَشِ بْنِ الْحَارِثِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ مِنَّا تُنْتَجُ فَرَسُهُ فَيَنْحَرُهَا فَيَقُولُ: أَنَا أَعِيشُ حَتَّى أَرْكَبَ هَذَا؟! فَجَاءَنَا كِتَابُ عُمَرَ: أَنْ أَصْلِحُوا مَا رَزَقَكُمُ اللَّهُ، فَإِنَّ فِي الأَمْرِ تَنَفُّسًا»[2].

واتە: حەنەشی کوڕی حاریس لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: هەر پیاوێك لە ئێمە کاتێك ئەسپەکەی بێچووی دەبوو، سەری دەبڕی، دەیگوت: ئایا من ئەوەندە دەژیم تا سواری پشتی ئەم بێچووە ببم (ئایا قیامەت دانایێ)؟! جا نووسراوی عومەرمان بۆ هات، (تێیدا نووسرابوو): چاکسازی بکەن لەو ڕزق و ڕۆزیەی خوا پێی داون، چونکە دەربارەی هاتنی دواڕۆژ بەینێکی باش هەیە (چونکە پاشی هاتنی نیشانە گەورەکانیش تا ماوەیەك ژیان هەر بەردەوام دەبێ).

٤١٥- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنْ قَامَتِ السَّاعَةُ وَفِي يَدِ أَحَدِكُمْ فَسِيلَةٌ، فَإِنِ اسْتَطَاعَ أَنْ لاَ تَقُومَ حَتَّى يَغْرِسَهَا فَلْيَغْرِسْهَا»»[3].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: ئەگەر دونیا تێکچوون هات و بڕکە خورمایەکی بچکۆڵە لە دەستی یەکێکتان دابوو، ئەگەر توانی پێش دونیا تێکچوون ڕووبدات بیڕوێنێ، ئەوە با بیڕوێنێ (واتە: هەموو کات بە هیوابن لەوپەڕی حاڵەت خراپی و نالەباریشدا).

---

(١) حسن: «السلسلة الصحيحة» (١٤٩٣): [انظر «المسند» للإمام أحمد (٤: ٢٨٦) الطبعة الأولى].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٩).

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٩).

## دەربارەی: دوعای ستەم لێكراو

٤١٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: ثَلَاثُ دَعَوَاتٍ مُسْتَجَابَاتٍ: دَعْوَةُ الْمَظْلُومِ، وَدَعْوَةُ الْمُسَافِرِ، وَدَعْوَةُ الْوَالِدِ عَلَى وَلَدِهِ»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ كە فەرموویەتی: سێ دوعاو پاڕانەوە هەن وەڵامدراوەن (خوا قبووڵیان دەكات): دوعای ستەم لێكراو، دوعای گەشتیار (ئەو كەسەی لە سەفەرێكی موباح دایەو بۆ تاوانكاری سەفەری نەكردوە)، وە دوعای دایك و باوك لەسەر منداڵەكەی.**

## دەربارەی: ستەم تاریكایی زۆرە

٤١٧- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اتَّقُوا الظُّلْمَ، فَإِنَّ الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَاتَّقُوا الشُّحَّ، فَإِنَّ الشُّحَّ أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، وَحَمَلَهُمْ عَلَى أَنْ سَفَكُوا دِمَاءَهُمْ، وَاسْتَحَلُّوا مَحَارِمَهُمْ»»[٢].

**واتە: جابری كوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە ستەم كردن، چونكە ستەم تاریكاییەكانی ڕۆژی دواییە، وە خۆتان بپارێزن لە ڕەزیلی و چرووكی، چونكە ڕەزیلی و چرووكی ئۆممەتەكانی پێش ئێوەی لە نێو برد، وە وای لێكردن خوێنی یەكدیان ڕژاندو قەدەغەراوەكانی یەكدیان حەڵاڵ كرد.**

٤١٨- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الظُّلْمُ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»»[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ستەم كردن تاریكییەكانی ڕۆژی دواییە.**

٤١٩- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا خَلَصَ الْمُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ حُبِسُوا بِقَنْطَرَةٍ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، فَيَتَقَاصُّونَ مَظَالِمَ بَيْنَهُمْ فِي الدُّنْيَا، حَتَّى إِذَا نُقُّوا وَهُذِّبُوا، أُذِنَ لَهُمْ بِدُخُولِ الْجَنَّةِ، فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَأَحَدُهُمْ بِمَنْزِلِهِ أَدَلُّ مِنْهُ فِي الدُّنْيَا»»[٤].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٩): [إبن ماجه: ٣٤- كتاب الدعاء، ١١- باب: دعوة الوالد ودعوة المظلوم، ح ٣٨٦٢].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨٥٨): [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٥٦].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨٥٨) [البخاري: ٤٦- كتاب المظالم، ٨- باب: الظلم ظلمات يوم القيامة. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٥٧].

(٤) صحيح: «الظلال» (٨٧٥): [البخاري: ٤٦- كتاب المظلم، ١- باب: قصاص المظالم].

واتە: ئەبو سەعید (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێك ئیمانداران ڕزگاریان دەبێ لە ئاگری دۆزەخ، قەتیس دەکرێن لە پردێك کە دەکەوێتە نێوان بەهەشت و دۆزەخ، لەوێ تۆڵەکانی دونیا وەردەگیرێنەوە (ئەوانەی ستەمیان کردو، تۆڵەیان لێوەردەگیرێتەوە)، هەتا پاك و پوخت و پاڵفتە دەکرێنەوە، جا مۆڵەت دەدرێن بچنە بەهەشت، جا سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بە دەستە، هەر یەکێکیان باشتر لە دونیا شوێن و ماڵی خۆی پێ دەزانێ (لە بەهەشتدا).

٤٢٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِيَّاكُمْ وَالظُّلْمَ، فَإِنَّ الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْفُحْشَ، فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يُحِبُّ الْفَاحِشَ الْمُتَفَحِّشَ، وَإِيَّاكُمْ وَالشُّحَّ، فَإِنَّهُ دَعَا مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ فَقَطَعُوا أَرْحَامَهُمْ، وَدَعَاهُمْ فَاسْتَحَلُّوا مَحَارِمَهُمْ»»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە ستەم کردن، چونکە ستەم تاریکاییەکانی ڕۆژی دواییە، وە خۆتان بپارێزن لە کرداو گوفتاری ناشرین و قێزەون، چونکە بە دڵنیایی خوا کردارو گوفتاریی ناشرین و کەسی کردارو گوفتار ناشرینی خۆشناوێ، وە خۆتان بپارێزن لە ڕەزیلی و چرووکی، چونکە ڕەزیلی و چرووکی وای لە ئۆممەتانی پێش ئێوە کرد پەیوەندی خزمایەتیان بپچڕێنن، وە وای لێکردن (دەستدرێژی بکەنە سەر یەکدی و) قەدەغەکراوی یەکدی حەڵاڵ بکەن (بۆ خۆیان).

٤٢١- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِيَّاكُمْ وَالظُّلْمَ، فَإِنَّ الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَاتَّقُوا الشُّحَّ، فَإِنَّهُ أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، وَحَمَلَهُمْ عَلَى أَنْ سَفَكُوا دِمَاءَهُمْ، وَاسْتَحَلُّوا مَحَارِمَهُمْ»»[2].

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە ستەم کردن، چونکە ستەم تاریکایی زۆرە لە ڕۆژی دواییدا، وە خۆتان بپارێزن لە ڕەزیلی و چرووکی، چونکە ڕەزیلی و چرووکی ئۆممەتەکانی پێش ئێوەی لە بەین برد، وە وای لێکردن خوێنی یەکدیان ڕژاندو قەدەغەکراوەکانی یەکدیان حەڵاڵ کرد.

٤٢٢- «عَنْ أَبِي الضُّحَى قَالَ: اجْتَمَعَ مَسْرُوقٌ وَشُتَيْرُ بْنُ شَكَلٍ فِي الْمَسْجِدِ، فَتَقَوَّضَ إِلَيْهِمَا حِلَقُ الْمَسْجِدِ، فَقَالَ مَسْرُوقٌ: لاَ أَرَى هَؤُلاَءِ يَجْتَمِعُونَ إِلَيْنَا إِلاَّ لِيَسْتَمِعُوا مِنَّا خَيْرًا، فَإِمَّا أَنْ تُحَدِّثَ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ فَأُصَدِّقَكَ أَنَا، وَإِمَّا أَنْ أُحَدِّثَ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ فَتُصَدِّقَنِي؟ فَقَالَ: حَدِّثْ يَا أَبَا عَائِشَةَ، قَالَ: هَلْ سَمِعْتَ عَبْدَ اللَّهِ يَقُولُ: الْعَيْنَانِ يَزْنِيَانِ، وَالْيَدَانِ يَزْنِيَانِ، وَالرِّجْلاَنِ يَزْنِيَانِ، وَالْفَرْجُ يُصَدِّقُ ذَلِكَ أَوْ يُكَذِّبُهُ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، قَالَ: وَأَنَا سَمِعْتُهُ، قَالَ: فَهَلْ سَمِعْتَ عَبْدَ اللَّهِ يَقُولُ: مَا فِي الْقُرْآنِ آيَةٌ

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

أَجْمَعَ لِحَلاَلٍ وَحَرَامٍ وَأَمْرٍ وَنَهْيٍ، مِنْ هَذِهِ الآيَةِ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاء ذِي الْقُرْبَى ﴾النحل: ٩٠؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: وَأَنَا قَدْ سَمِعْتُهُ، قَالَ: فَهَلْ سَمِعْتَ عَبْدَ اللَّهِ يَقُولُ: مَا فِي الْقُرْآنِ آيَةٌ أَسْرَعَ فَرَجاً مِنْ قَوْلِهِ: ﴿ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجاً ﴾الطلاق: ٢؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: وَأَنَا قَدْ سَمِعْتُهُ، قَالَ: فَهَلْ سَمِعْتَ عَبْدَ اللَّهِ يَقُولُ: مَا فِي الْقُرْآنِ آيَةٌ أَشَدَّ تَفْوِيضاً مِنْ قَوْلِهِ: ﴿ قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ ﴾الزمر: ٥٣؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: وَأَنَا سَمِعْتُهُ»[١].

**واته: له ئەبو ضوحاوە گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: مەسروق و شوتەیر لە مزگەوت کۆببوونەوە، خەڵكی لە حەلقەكانی مزگەوت پەرت بوون (وازیان لە مەجلیسەكانی خۆیان هێنا)و هاتن بۆ لای ئەوان، مەسروقیش گوتی: پێم وانیە ئەمانە بۆ هیچ شتێك كۆببنەوە لەلامان مەگەر بۆ ئەوە شتێكی چاكمان لێ ببیستن، جا یان تۆ لە عەبدوڵلا بگێڕەوەو منیش پاڵپشتیت دەكەم (لەو فەرموودانەی هەردووكمان گوێمان لێ بووە لە عەبدوڵلا)، یانیش من لە عەبدوڵلاوە دەگێرمەوەو تۆ پاڵپشتیم بكە، شوتەیریش گوتی: تۆ بیگێڕەوە ئەی ئەبو عائیشە (ئەی مەسروق)، مەسروقیش گوتی: ئایا گوێت لە عەبدوڵلا بووە كە دەیگوت: دوو چاوەكان زینا دەكەن (بە نەزەر)، وە دوو دەستەكان زینا دەكەن (بە دەست لێدانی نامەحرەم)، وە دوو قاچەكان زینا دەكەن بە چوونە شوێنی گوناهو تاوانكردن)، جا داوێن زیناكە جێبەجێ دەكات (بە حەقیقی) یانیش بە درۆی دەخاتەوەو (جێبەجێی ناكات)؟ (شوتەیر) گوتی: بەڵێ (منیش گوێم لێ بووە)، جا (مەسروق) گوتی: ئایا گوێت لە عەبدوڵلا بوو كە دەیگوت: لە قورئاندا هیچ ئایەتێك نیە گشتگیرو كۆكەرەوەتر بێ بۆ حەڵاڵ و حەرام و فەرمان و قەدەغەكردن لە ئایەتی:** ﴿ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاء ذِي الْقُرْبَى ﴾النحل: ٩٠، **گوتی: بەڵێ منیش گوێم لێ بووە، (مەسروق) گوتی: ئایا گوێت لە عەبدوڵلا بووە كە دەیگوت: هیچ ئایەتێك لە قورئاندا نیە زووتر بەهانای مرۆڤەوە بێت و دەرگەی نەجاتی بۆ بكاتەوە لە ئایەتی:** ﴿ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا ﴾الطلاق: ٢، **(شوتەیر) گوتی: بەڵێ منیش گوێم لێی بووە، (مەسروق) گوتی: ئایا گوێت لە عەبدوڵلا بووە كە دەیگوت: هیچ ئایەتێك نیە لە قورئاندا زیاتر مرۆڤەكان تەسلیمی ڕەحمی خوا بكات لەم ئایەتە:** ﴿ قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ ﴾الزمر: ٥٣، **(شوتەیر) گوتی: بەڵێ منیش گوێم لێ بووە.**

٤٢٣- «عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ عَنِ اللَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى قَالَ:

«يَا عِبَادِي، إِنِّي قَدْ حَرَمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي، وَجَعَلْتُهُ مُحَرَّمًا بَيْنَكُمْ فَلاَ تَظَالَمُوا.

يَا عِبَادِي، إِنَّكُمُ الَّذِينَ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ، وَلاَ أُبَالِي، فَاسْتَغْفِرُونِي أَغْفِرْ لَكُمْ.

يَا عِبَادِي، كُلُّكُمْ جَائِعٌ إِلاَّ مَنْ أَطْعَمْتُهُ، فَاسْتَطْعِمُونِي أُطْعِمْكُمْ.

---

(١) **حسن الإسناد.**

يَا عِبَادِي، كُلُّكُمْ عَارٍ إِلاَّ مِنْ كَسَوْتُهُ، فَاسْتَكْسُونِي أَكْسُكُمْ.

يَا عِبَادِي، لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ، وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ، كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ عَبْدٍ مِنْكُمْ، لَمْ يَزِدْ ذَلِكَ فِي مُلْكِي شَيْئاً، وَلَوْ كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ، لَمْ يَنْقُصْ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئاً، وَلَوِ اجْتَمَعُوا فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ فَسَأَلُونِي فَأَعْطَيْتُ كُلَّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ مَا سَأَلَ، لَمْ يَنْقُصْ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئاً، إِلاَّ كَمَا يَنْقُصُ الْبَحْرُ أَنْ يُغْمَسَ فِيهِ الْخَيْطُ غَمْسَةً وَاحِدَةً.

يَا عِبَادِي، إِنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ أَجْعَلُهَا عَلَيْكُمْ، فَمَنْ وَجَدَ خَيْراً فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلاَ يَلُومُ إِلاَّ نَفْسَهُ»»[١].

**واتە: ئەبو زەڕ (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە خوای (تبارك وتعالى) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:**

**ئەی بەندەکانم! من ستەمم لەسەر خۆم قەدەغە کردوەو لە نێو ئێوەشدا قەدەغەم کردوە، کەواتە: ستەم لە یەکدی مەکەن.**

**ئەی بەندەکانم! ئێوە بە شەوو ڕۆژ هەڵە دەکەن و گوناهان دەکەن، منیش لە هەموو گوناهان دەبورم و لاریم نیە، جا داوای لێبوردنم لێ بکەن بۆ ئەوەی لێتان ببورم.**

**ئەی بەندەکانم! هەمووتان برسین، تەنها ئەو کەسە نەبێ کە من خواردنی پێدەدەم، جا داوای خواردنم لێ بکەن، بۆ ئەوەی خواردنتان پێ بدەم.**

**ئەی بەندەکانم! هەموتان ڕووت و بێ پۆشاکن، تەنها ئەو کەسە نەبێ کە من پۆشتەی بکەم، جا داوای پۆشاکم لێ بکەن، بۆ ئەوەی پۆشاکتان بکەمە بەر.**

**ئەی بەندەکانم! ئەگەر ئەوانەی پێشینانتان و ئەوانەی دواییتان، هەموو مرۆڤەکان و جنۆکەکان لەسەر دڵی پارێزکارترین پیاو بن لە ئێوە (واتە: هەمووتان پاکترین بەندە بن)، هیچ لە موڵکی من زیاد ناکات، وە ئەگەر هەمووتان بە پێی دڵی تاوانبارترین پیاو بن، ئەوە هیچ لە موڵکی من کەم ناکات (چونکە موڵکی خوا جێگیرە، زیادو کەم ناکات و منەتی بە مەخلوقات نیە).**

**وە ئەگەر هەموویان لە شوێنێك کۆببنەوەو هەموویان داوام لێ بکەن (لەو شتانەی کە پێویستیانەو پێیان خۆشە پێی بگەن)و، منیش داواکراوەکە بە هەر یەکێکتان ببەخشم، ئەوە هیچ لە موڵکی من کەم ناکات، تەنها ئەو ئەندازەیە نەبێ کە دەرزیەك جارێك بخرێتە نێو ئاوی دەریاوە چەندی لێ کەم دەکات (ئەوەندەش کەم ناکات، ئەمە تەنها نمونەیەکی بەلاغیە دەیەوێ بفەرموێ: چۆن ئاوی دەریا ناتوانرێ هەست بە کەمبوونەوەی بکرێ بە هیچ پێوەرێك، کاتێك دەرزیەك بخرێتە نێوی و دەربهێنرێ، ئاواش بە هیچ جۆرێك موڵکی خوا کەم ناکات).**

---

(١) صحيح: «التعليقات الحسان» (٦١٨/٨/٢) [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٥٥].

ئەی بەندەکانم! تەنیا کردەوەکانی خۆتانتان بۆ دادەنێم، (واتە: دوایی پاداشتتان دەدەمەوە، یان سزاتان دەدەم بە پێی کردەوەکانتان)، جا هەر کەسێك چاکەی بینی با ستایشی خوا بکات، وە هەر کەسێك جیا لەوەی بینی، (واتە: سزای بینی، خراپەی بینی) با جگە لە خۆی لۆمەی کەس نەکات.

## دەربارەی: کەفارەتی نەخۆش

٤٢٤- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا يُصِيبُ الْمُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ، وَلاَ وَصَبٍ، وَلاَ هَمٍّ، وَلاَ حَزَنٍ، وَلاَ أَذىً، وَلاَ غَمٍّ، حَتَّى الشَّوْكَةُ يُشَاكُهَا، إلاَّ كَفَّرَ اللَّهُ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ»»[١].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری و ئەبو هورەیرە (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: هیچ شتێك نیە کە تووشی مسوڵمان دەبێ، لە ماندوویێتی و نەخۆشیی و خەفەت و دڵتەنگیی و ئازارو هەر ناخۆشییەك، تەنانەت دڕکێك کە (بە دەستی، یان بە شوێنێکی) دادەچێ، حەتمەن بە هۆی ئەوەوە خوا گوناهەکانی لێ دەسڕێتەوەو پاکی دەکاتەوە.

٤٢٥- «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كُنْتُ مَعَ سَلْمَانَ، وَعَادَ مَرِيضاً فِي كِنْدَةَ، فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهِ قَالَ: أَبْشِرْ، فَإِنَّ مَرَضَ الْمُؤْمِنِ يَجْعَلُهُ اللَّهُ لَهُ كَفَّارَةً وَمُسْتَعْتَباً، وَإِنَّ مَرَضَ الْفَاجِرِ كَالْبَعِيرِ عَقَلَهُ أَهْلُهُ ثُمَّ أَرْسَلُوهُ، فَلاَ يَدْرِي لِمَ عُقِلَ وَلِمَ أُرْسِلَ»[٢].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەعید لە باوکیەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: من لەگەڵ سەلماندا بووم سەردانی نەخۆشێکی کرد لە ناوچەیەك بە ناوی (کِندةَ)، کە چووە ژوورەوە بۆ لای، گوتی: موژدەت لێ بێ، چونکە خوا نەخۆشکەوتنی ئیماندار دەکاتە پاك بوونەوە لە گوناهی و مایەی ڕەزامەندی، وە نەخۆش کەوتنی کەسی خراپەکاریش وەك وشترێك وایە خاوەنەکەی بەستبێتیەوە، پاشان بەڕەڵڵای کردبێ، نازانێ بۆچی بەسترایەوەو بۆچی بەڕەڵڵا کرا (چونکە عیبرەت و حیکمەتی نەخۆشیەکەی نازانێ و سوودی لێ نابینێ)!

٤٢٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَزَالُ الْبَلاَءُ بِالْمُؤْمِنِ وَالْمُؤْمِنَةِ، فِي جَسَدِهِ وَأَهْلِهِ وَمَالِهِ، حَتَّى يَلْقَى اللَّهَ عَزَّوَجَلَّ وَمَا عَلَيْهِ خَطِيئَةٌ»»، «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو مِثْلَهُ، وَزَادَ: «فِي وَلَدِهِ»» [٣].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٥٠٣) [البخاري: ٧٥- كتاب المرضى، ١- باب: ماجاء في كفرة المرض. مسلم: ٤٥ ت كتاب البر والصلة والآداب، ح ٥٢].

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٢٨٠) [الترمذي: ٣٤- كتاب الزهد، ٥٧- باب: ما جاء في الصبر على البلاء].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵاو گرفتاری بەردەوام تووشی پیاو و ئافرەتی ئیماندار دەبێ، لە لاشەو، خانەوادەو، ماڵی، تا وای لێ دێت کە دەگاتەوە خوای زاڵی پایەدار هیچ گوناهێکی لەسەر نەماوە.

موحەممەدی کوڕی عەمرِ هەمان فەرموودەی گێڕاوەتەوە، تەنها وشەی «لە منداڵی» لێ زیاد کردوە (واتە: فەرموودەکەی ئەو ئەم ڕستەیەشی تێدایە «هەروەها بەڵا منداڵەکانیشی دەگرێتەوە».

٤٢٧- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هَلْ أَخَذَتْكَ أُمُّ مِلْدَمٍ؟» قَالَ: وَمَا أُمُّ مِلْدَمٍ؟ قَالَ: «حَرٌّ بَيْنَ الْجِلْدِ وَاللَّحْمِ»، قَالَ: لاَ، قَالَ: «فَهَلْ صُدِعْتَ؟» قَالَ: وَمَا الصُّدَاعُ؟ قَالَ: «رِيحٌ تَعْتَرِضُ فِي الرَّأْسِ، تَضْرِبُ الْعُرُوقَ»، قَالَ: لاَ، قَالَ: فَلَمَّا قَامَ قَالَ: «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ النَّارِ» أَيْ: فَلْيَنْظُرْهُ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: دەشتەکیەك هات، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئایا نەخۆشی (أُم مِلْدَم)ـت گرتوە؟ گوتی: (أُم مِلْدَم) چیە؟ فەرمووی: گەرمیەکە لە نێوان پێست و گۆشتدا، گوتی: نەخێر، فەرمووی: ئایا سەر ئێشەت تووش بووە؟ گوتی: سەر ئێشە چیە؟ فەرمووی: ئازارێکە بە نێو سەردا دێ و دەدا لە دەمارەکان، گوتی: نەخێر، جا کاتێ پیاوەکە هەڵسا، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: کێ پێی خۆشەو حەز دەکات تەماشای پیاوێك بکات لە ئەهلی دۆزەخ (واتە: با تەماشای ئەمە بکات، چونکە تاوانەکانی نەوەراون بە نەخۆشی و ناخۆشی و سزای تاوانەکانی لەسەر ماون).

٤٢٨- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا اشْتَكَى الْمُؤْمِنُ أَخْلَصَهُ اللَّهُ كَمَا يُخَلِّصُ الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ»»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێك ئیماندارێك تووشی نەخۆشییەك دەبێ، ئەوە خوا لە گوناهان پاکی دەکاتەوە، وەك چۆن ئاسن لە ژەنگ و ژاڵ پاك دەکرێتەوە.

٤٢٩- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصَابُ بِمُصِيبَةٍ «وَجَعٍ أَوْ مَرَضٍ» إِلاَّ كَانَ كَفَّارَةَ ذُنُوبِهِ، حَتَّى الشَّوْكَةُ يُشَاكُهَا، أَوِ النَّكْبَةُ»»[٣].

---

(١) حسن صحيح: «التعليقات الحسان على الإحسان» (٢٩٠٥) [ليس في شيء من الكتب الستة].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٢٥٧).

(٣) صحيح: «الروض النضير» (٨١٩): [البخاري: ٧٥- كتاب المرضى، ١- باب: ماجاء في كفارة المرض. مسلم: كتاب ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٤٩].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر مسوڵمانێك تووشی بەڵاو گرفتارییەك بێ، جا ئازار، یان نەخۆشی بێ، ئەوە حەتمەن بۆی دەبێتە هۆی لێخۆشبوونی گوناهی، هەتا ئەگەر دڕکێکیش بێ و بە لاشەیدا چووبێ، یان ڕووداوێك بێ، تووشی بووبێ.

٤٣٠- «عَنْ عَائِشَةَ بِنْتِ سَعْدٍ، أَنَّ أَبَاهَا قَالَ: اشْتَكَيْتُ بِمَكَّةَ شَكْوَى شَدِيدَةً، فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ يَعُودُنِي، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَتْرُكُ مَالاً، وَإِنِّي لَمْ أَتْرُكْ إِلاَّ ابْنَةً وَاحِدَةً، أَفَأُوصِي بِثُلُثَيْ مَالِي، وَأَتْرُكُ الثُّلُثَ؟ قَالَ: «لاَ»، قَالَ: أُوصِي النِّصْفَ، وَأَتْرُكُ لَهَا النِّصْفَ؟ قَالَ: «لاَ»، قَالَ: فَأَوْصِي بِالثُّلُثِ، وَأَتْرُكُ لَهَا الثُّلُثَيْنِ؟ قَالَ: «الثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ»، ثُمَّ وَضَعَ يَدَهُ عَلَى جَبْهَتِي، ثُمَّ مَسَحَ وَجْهِي وَبَطْنِي، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ اشْفِ سَعْدًا، وَأَتِمَّ لَهُ هِجْرَتَهُ»، فَمَا زِلْتُ أَجِدُ بَرْدَ يَدِهِ عَلَى كَبِدِي فِيمَا يَخَالُ إِلَيَّ حَتَّى السَّاعَةِ»[1].

واتە: عائیشەی کچی سەعد (خوا لێی ڕازی بێ)، لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: لە مەککە نەخۆش کەوتم و نەخۆشییەکی توندم گرت، جا پێغەمبەر ﷺ هاتە سەردانم، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵ و سامانم هەیە دوای خۆم جێی دێڵم، وە جگە لە تاکە کچێك کەس دوای خۆم جێناهێڵم (کەسی دیکەم نیە)، جا ئایا دوو لەسەر سێی ماڵ و سامانەکەم بکەمە وەسیەت، یەك لەسەر سێش (بۆ کچەکەم) جێبێڵم؟ فەرمووی: نەخێر، گوتم: ئەدی نیوەی بکەمە وەسیەت، وە نیوەشی بۆ جێبێڵم؟ فەرمووی: نەخێر، گوتم: کەواتە: سێیەکی بکەمە وەسیەت، وە دوو لەسەر سێشی بۆ جێبێڵم؟ فەرمووی: سێیەك، سێیەکیش زۆرە (بەڵام دروستە)، پاشان دەستی دانا لەسەر نێوچەوانم، ئنجا دەستی بە ڕووخسارم و سکم داهێنا، دوایی فەرمووی: خوایە شیفای سەعد بدە، کۆچەکەی بۆ تەواو بکەو بگەڕێتەوە مەدینە، سەعد دەڵێ: تا ئێستا هەست بە ساردی دەست پێداهێنانەکەی دەکەم لەسەر جەرگم.

## دەربارەی: مرۆڤ لە کاتی لەش ساغی چ چاکەیەکی کردوە، کە نەخۆشە هەر بۆی دەنووسرێ

٤٣١- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ أَحَدٍ يَمْرَضُ، إِلاَّ كُتِبَ لَهُ مِثْلُ مَا كَانَ يَعْمَلُ وَهُوَ صَحِيحٌ»»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێك نیە کاتێ نەخۆش دەکەوێ، حەتمەن پاداشتی ئەو کردەوانەی بۆ دەنووسرێ کە ئەنجامی داوە، لەکاتێکدا کە لەش ساغ بووە.

---

(١) صحيح: «صحيح أبي داود» (٢٧١٨): [البخاري: ٥٥- كتاب الوصايا، ٢- باب: أن يترك ورثته أغنياء خير ... إلخ. مسلم: ٢٥- كتاب الحج، ح ٥- ٩].

(٢) صحيح: «الإرواء» (٣٤٦/٢) (٣٤٦/٢)، التعليق الرغيب (٤/ ١٥٠) [ليس في شيء من الكتب الستة].

٤٣٢- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ ابْتَلَاهُ اللَّهُ فِي جَسَدِهِ إِلاَّ كُتِبَ لَهُ مَا كَانَ يَعْمَلُ فِي صِحَّتِهِ، مَا كَانَ مَرِيضاً، فَإِنْ عَافَاهُ أُرَاهُ قَالَ: عَسَلَهُ[١]، وَإِنْ قَبَضَهُ غَفَرَ لَهُ»»[٢].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ مسوڵمانێك نیە کە خوا تاقیکردبێتەوە لە جەستەی خۆی و (توشی نەخۆشی کردبێ)، حەتمەن پاداشتی ئەو کردەوانەی بۆ دەنووسرێ کە ئەنجامی دەدا لە کاتی لەش ساغی، مادەم نەخۆشە، جا ئەگەر خوا چاکی کردەوە (ئەوە دەرگای ئەنجامدانی کردەوەی چاکی بە ڕوودا کردۆتەوەو، دەتوانێ بۆ خۆی کردەوەی چاك زیاتر بکات)، وە ئەگەر بردیشیەوەو مراندی ئەوە لێی خۆش دەبێ.**

٤٣٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: جَاءَتِ الْحُمَّى إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: ابْعَثْنِي إِلَى آثَرِ أَهْلِكَ عِنْدَكَ، فَبَعَثَهَا إِلَى الْأَنْصَارِ، فَبَقِيَتْ عَلَيْهِمْ سِتَّةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيهِنَّ، فَاشْتَدَّ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ، فَأَتَاهُمْ فِي دِيَارِهِمْ، فَشَكَوْا ذَلِكَ إِلَيْهِ، فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَدْخُلُ دَاراً دَاراً، وَبَيْتاً بَيْتاً، يَدْعُو لَهُمْ بِالْعَافِيَةِ، فَلَمَّا رَجَعَ تَبِعَتْهُ امْرَأَةٌ مِنْهُمْ فَقَالَتْ: وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ إِنِّي لَمِنَ الْأَنْصَارِ، وَإِنَّ أَبِي لَمِنَ الْأَنْصَارِ، فَادْعُ اللَّهَ لِي كَمَا دَعَوْتَ لِلأَنْصَارِ، قَالَ: «مَا شِئْتِ، إِنْ شِئْتِ دَعَوْتُ اللَّهَ أَنْ يُعَافِيَكِ، وَإِنْ شِئْتِ صَبَرْتِ وَلَكِ الْجَنَّةُ»، قَالَتْ: بَلْ أَصْبِرُ، وَلاَ أَجْعَلُ الْجَنَّةَ خَطَراً»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: نەخۆشی تا، هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ڕەوانم بکە بۆ لای خۆشەویستترینی قەومەکەت، ئەویش ناردی بۆ لای پشتیوانەکان، جا شەش ڕۆژو شەو لە نێویاندا مایەوەو، تەواو بێ تاقەتی کردن (لەسەریان زۆر قورس بوو)، پێغەمبەر ﷺ دەچووە لایان لە شوێنەکانی خۆیان و، ئەوانیش سکاڵای ئەو نەخۆشیەیان لەلا دەکرد، پێغەمبەری خوا ماڵ ماڵ و، ژوور ژوور دەچووە لایان و سەردانی دەکردن و دوعای چاکبوونەوەی بۆ دەکردن، جا کاتێك گەڕایەوە، لە ڕێگەدا ئافرەتێك لەوان شوێنی کەوت و گوتی: سوێند بەو خوایەی تۆی بە هەق ناردوە، من لە پشتیوانەکانم و باوکیشم لە پشتیوانەکانە، وەك چۆن دوعات بۆ پشتیوانەکان کرد، دەبێ ئاواش دوعا بۆ من بکەی، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: با بە ویستی تۆ بێ، ئەگەر دەتەوێ دوعای چاك بوونەوەت بۆ دەکەم، وە ئەگەریش دەتەوێ ئارام بگرەو بەهەشتت بۆ هەیە، (ئافرەتەکە) گوتی: بەڵکو ئارام دەگرم، با بەهەشتەکەم نەکەوێتە مەترسییەوە (چونکە ئێستا گرێنتی هەیە، بەڵام ئەگەر چاك ببمەوە ئەوە بابەتەکە لەسەر کردەوەی داهاتووی خۆم دەوەستێت و ناشزانم مۆفەق دەبم یان نا).**

---

(١) أي: طيب ثناءه في الناس. وفي رواية «جعل له عملا صالحا».

(٢) صحيح: «الإرواء» أيضاً و «التعليق» [ليس في شيء من الكتب الستة].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٥٠٢) [ليس في شيء من الكتب الستة].

٤٣٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: مَا مِنْ مَرَضٍ يُصِيبُنِي أَحَبَّ إِلَيَّ مِنَ الْحُمَّى، لِأَنَّهَا تَدْخُلُ فِي كُلِّ عُضْوٍ مِنِّي، وَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُعْطِي كُلَّ عُضْوٍ قِسْطَهُ مِنَ الأَجْرِ»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتویەتی: هیچ نەخۆشیەك نیە كە تووشم ببێ، پێم خۆشتر بێ لە نەخۆشی تا، لەبەر ئەوەی تا دەچێتە نێو هەموو ئەندامەكانی جەستەمەوە، وە خوا (عَزَّ وَجَلَّ) بۆ هەر ئەندامێك پشكی خۆی پێ دەبەخشێت لە پاداشت.**

٤٣٥- «عَنْ أَبِي نُحَيْلَةَ، قِيلَ لَهُ: ادْعُ اللَّهَ، قَالَ: اللَّهُمَّ انْقُصْ مِنَ الْمَرَضِ، وَلَا تَنْقُصْ مِنَ الأَجْرِ، فَقِيلَ لَهُ: ادْعُ، ادْعُ. فَقَالَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ الْمُقَرَّبِينَ، وَاجْعَلْ أُمِّي مِنَ الْحُورِ الْعِينِ»[2].

**واتە: ئەبو نوحەیلە پێی گوترا: بپاڕێوە لە خوا، گوتی: خوایە لە نەخۆشی كەم بكەیتەوە، (بەڵام) لە پاداشت كەم نەكەیتەوە، پێی گوترا: بپاڕێوە، بپاڕێوە، گوتی: خوایە لە نزیكەكانی خۆتم بگێڕی و دایكم بكەی بە یەكێك لە حۆریەكان (حور العین).**

٤٣٦- «عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ، قَالَ: قَالَ لِيَ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا): أَلَا أُرِيكَ امْرَأَةً مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟ قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: هَذِهِ الْمَرْأَةُ السَّوْدَاءُ أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَتْ: إِنِّي أُصْرَعُ، وَإِنِّي أَتَكَشَّفُ، فَادْعُ اللَّهَ لِي، قَالَ: «إِنْ شِئْتِ صَبَرْتِ وَلَكِ الْجَنَّةُ، وَإِنْ شِئْتِ دَعَوْتُ اللَّهَ أَنْ يُعَافِيَكِ»، فَقَالَتْ: أَصْبِرُ، فَقَالَتْ: إِنِّي أَتَكَشَّفُ، فَادْعُ اللَّهَ لِي أَنْ لَا أَتَكَشَّفَ، فَدَعَا لَهَا»[3].

**واتە: عەطائی كوڕی ئەبی ڕەباح دەڵێ، ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) پێی گوتم: ئەرێ ئافرەتێكی بەهەشتیت پێشان نەدەم؟ گوتم: با (پێشانمان بدە)، گوتی: ئەو ئافرەتە ڕەش پێستە (كە دەیبینی) هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: من پەركەمم تووش دەبێ و، لاشەی خۆم دەردەخەم (دەبوورێمەوە)، داوام بۆ لە خوا بكە (تا چاك ببمەوە)، ئەویش فەرمووی: ئەگەر دەتەوێ ئارام بگرەو، بەهەشتت بۆ هەیە، وە ئەگەریش دەتەوێ داوات بۆ لە خوا دەكەم كە شیفات بدات و چاك ببیەوە، (ئافرەتەكەش) گوتی: ئارام دەگرم، بەڵام كە ئەم حاڵەتەم بەسەر دێ، لاشەم دەردەخەم، جا لە خوا داوا بكە لاشەم دەرنەخەم، (پێغەمبەری خواش ﷺ) بۆی پاڕایەوە لە خوا (جا چیتر لاشەی دەرنەدەكەوت).**

٤٣٧- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) أَنَّ النبيَ ﷺ كَان يَقولُ: «مَا أَصَابَ المُؤمنُ مِن شَوْكَةٍ فَمَا فَوقَها فَهُو كَفارةٌ»»[4].

---

(١) صحيح الإسناد، وكذا قال الحافظ (١١٠/١٠).

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح: «الحجاب» (ص٣٣)، «السلسلة الصحيحة» (٢٥٠٢): [البخاري: ٧٥- كتاب المرضى، ٦- باب: فضل من يصرع من الريح. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٤٣].

(٤) صحيح الإسناد: [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصبلة والآداب، ح ٤٦- ٤٧، ٤٨].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ بڕوادارێك نیە تووشی (ئازارێك ببێ بە هۆی) دڕكێكەوە، یان لە سەرووی ئەویشەوە بۆی دەبێتە هۆكاری لێخۆشبوون لە گوناهەكانی.

٤٣٨- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُشَاكُ شَوْكَةً فِي الدُّنْيَا يَحْتَسِبُهَا، إِلاَّ قُصَّ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»»[١].

واتە: ئەبو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ مسوڵمانێك نیە دڕكێك پێیدا بچێ لە دونیاداو ئەویش چاوەڕێی پاداشت بكات، حەتمەن بە هۆیەوە گوناهی لەسەر لادەبرێ و كەم دەكرێتەوە لە ڕۆژی دواییدا.

٤٣٩- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ مُؤْمِنٍ وَلاَ مُؤْمِنَةٍ، وَلاَ مُسْلِمٍ وَلاَ مَسْلَمَةٍ، يَمْرَضُ مَرَضاً إِلاَّ قَصَّ اللَّهُ بِهِ عَنْهُ مِنْ خَطَايَاهُ»»[٢].

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: هیچ بڕوادارێك نیە لە پیاوان و ئافرەتان، وە هیچ مسوڵمانێك نیە لە پیاوان و ئافرەتان كە تووشی نەخۆشییەك ببێت، حەتمەن بە هۆی ئەو نەخۆشیەوە گوناهی لەسەر لادەبرێ و كەم دەكرێتەوە.

## دەربارەی: ئایا قسەی نەخۆش كە دەڵێ: ئازارم هەیە، دەبێتە سكاڵا؟

٤٤٠- «عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ الزُّبَيْرِ عَلَى أَسْمَاءَ، قَبْلَ قَتْلِ عَبْدِ اللَّه بِعَشْرِ لَيَالٍ، وَأَسْمَاءُ وَجِعَةٌ، فَقَالَ لَهَا عَبْدُ اللَّهِ: كَيْفَ تَجِدِينَكِ؟ قَالَتْ: وَجِعَةٌ، قَالَ: إِنِّي فِي الْمَوْتِ، فَقَالَتْ: لَعَلَّكَ تَشْتَهِي مَوْتِي، فَلِذَلِكَ تَتَمَنَّاهُ؟ فَلَا تَفْعَلْ، فَوَاللَّهِ مَا أَشْتَهِي أَنْ أَمُوتَ حَتَّى يَأْتِيَ عَلَيَّ أَحَدُ طَرَفَيْكَ، أَوْ تُقْتَلَ فَأَحْتَسِبَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَظْفُرَ فَتَقَرَّ عَيْنِي، فَإِيَّاكَ أَنْ تُعْرَضَ عَلَيْكَ خُطَّةٌ، فَلَا تُوَافِقُكَ، فَتَقْبَلُهَا كَرَاهِيَةَ الْمَوْتِ. وَإِنَّمَا عَنَى ابْنُ الزُّبَيْرِ لِيُقْتَلَ فَيُحْزِنُهَا ذَلِكَ»[٣].

واتە: هیشام لە باوكی دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: من و عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیر چووینە سەردانی ئەسماء، دە شەو پێش ئەوەی عەبدوڵڵا بكوژرێ، لەوكاتەدا ئەسماء نەخۆش بوو، ئازاری هەبوو، عەبدوڵڵا گوتی: حاڵت چۆنە؟ گوتی: ئازارم هەیە، (عەبدوڵڵا) گوتی: من لە نێو مردندام، (نزیكم لە مردن)، (ئەسماء كە دایكیەتی) گوتی: دیارە حەز دەكەی من بمرم (دەتەوێ پێشی تۆ بمرم، تاوەكو مردنی تۆ نەبینم و خەمبار نەبم بە درێژایی ژیان)؟ بۆیە ئاواتی پێ دەخوازی؟ شتی

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٥٠٣): [ليس في شيء من الكتب الستة].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٥٠٣): [ليس في شيء من الكتب الستة].

(٣) صحيح الإسناد.

وا نەكەی، سوێند بە خوا ئارەزووی مردن ناكەم هەتا لایێك لە دوو لایەكانی (حاڵی) تۆم بۆ دێت: یان ئەوەتا دەكوژرێیت و چاوەڕێی پاداشت دەكەم بە هۆی تۆوە، وە یانیش سەركەوتن بەدەست دێنی و چاوم ڕۆشن دەبێتەوە، جا نەكەی خوتتەو پلانێكت بۆ پێشنیاز بكرێت و لەگەڵ تۆ تێكنەكاتەوە (شایستەی تۆ نەبێ، بەڵام لەبەر ئەوەی مردنی تێدا نیە) تۆش قبووڵی بكەیت لەبەر پێناخۆشی مردن.

جا ئیبنو زوبەیر تەنها مەبەستی ئەوە بوو نەوەك بكوژرێت و ئەوە دایكی خەفەتبار بكات، كەچی دایكی بەم شێوە وەڵامی دایەوە!

٤٤١- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ مَوْعُوكٌ، عَلَيْهِ قَطِيفَةٌ، فَوَضَعَ يَدَهُ عَلَيْهِ، فَوَجَدَ حَرَارَتَهَا فَوْقَ الْقَطِيفَةِ، فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: مَا أَشَدَّ حُمَّاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «إِنَّا كَذَلِكَ، يَشْتَدُّ عَلَيْنَا الْبَلَاءُ، وَيُضَاعَفُ لَنَا الْأَجْرُ»، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ النَّاسِ أَشَدُّ بَلَاءً؟ قَالَ: الْأَنْبِيَاءُ، ثُمَّ الصَّالِحُونَ، وَقَدْ كَانَ أَحَدُهُمْ يُبْتَلَى بِالْفَقْرِ حَتَّى مَا يَجِدُ إِلاَّ الْعَبَاءَةَ يَجُوبُهَا فَيَلْبَسُهَا، وَيُبْتَلَى بِالْقُمَّلِ حَتَّى يَقْتُلَهُ، وَلَأَحَدُهُمْ كَانَ أَشَدَّ فَرَحاً بِالْبَلَاءِ مِنْ أَحَدِكُمْ بِالْعَطَاءِ»»[1].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری (خوا لێی ڕازی بێ)، چۆتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەكاتێكدا تای لێ بوو، سەرچەفێكی بەسەردا درابوو، ئەویش دەستی لەسەر داناوە، هەستی بە گەرمیەكەی كرد لەسەر سەرچەفەكە، ئەبو سەعید گوتی: (تا)یەكەت چەندە گەرمە ئەی پێغەمبەری خوا؟! (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: ئێمە(ی پێغەمبەران) ئاواین، بەڵاو گرفتاری و نەخۆشیەكان لەسەرمان زۆر توندن، وە پاداشتیشمان چەند بەرانبەرە، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا كێ لە هەموو كەس تاقیكردنەوەكانی قورسترن؟ فەرمووی: پێغەمبەران، دواتر پیاوچاكان، یەكێكیان لەوان (واتە: لە پیاوچاكان، یان پێغەمبەران) بە هەژاری و نەداری تاقیكراوەتەوە تا وای لێ هاتووە هیچی دەست نەكەوتووە تەنها عەبایەك نەبێ، كە كردوویەتیە بەری و خۆی پێ داپۆشیوە، وە هی وا هەبووە بە ئەسپێ تاقیكراوەتەوە تا كوشتوویەتی، وە هەر یەكێكیان كاتێك كە تاقیكراوەتەوە بە ناڕەحەتی و گرفتاری، زیاتر دڵخۆش بووە بە تاقیكردنەوەكە لە دڵخۆشی ئێوە بە پێبەخشین.

## دەربارەی: سەردانی كردنی بێهۆش (ئەو كەسەی لەبەر نەخۆشی بوراوەتەوە)

٤٤٢- «عَنِ ابْنِ الْمُنْكَدِرِ، سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) يَقُولُ: مَرِضْتُ مَرَضاً، فَأَتَانِي النَّبِيُّ ﷺ يَعُودُنِي وَأَبُو بَكْرٍ وَهُمَا مَاشِيَانِ، فَوَجَدَانِي أُغْمِيَ عَلَيَّ، فَتَوَضَّأَ النَّبِيُّ ﷺ ثُمَّ صَبَّ وَضُوءَهُ

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٤٤) [إبن ماجه ٣٦- كتاب الفتن، ٢٣- باب: الصبر على البلاء].

عَلَيَّ، فَأَفَقْتُ فَإِذَا النَّبِيُّ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ أَصْنَعُ فِي مَالِي؟ كَيْفَ أَقْضِي فِي مَالِي؟ فَلَمْ يُجِبْنِي بِشَيْءٍ حَتَّى نَزَلَتْ آيَةُ الْمِيرَاثِ»[1].

**واتە: موحەممەدی کوڕی مونکەدیر گوێی لە جابری کوڕی عەبدوڵلا بووە (خوا لێیان ڕازی بێ)، کە دەیگوت: نەخۆش کەوتم، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەبو بەکر هاتن سەردانیان کردم، لە کاتێکدا بە پیادە بوون، وە بینیان بوورایمەوە، جا پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژێکی هەڵگرت، پاشان ئاوەکەی دەستنوێژی پرژاندە سەرم، منیش بە ئاگاهاتمەوە، دەبینم ئەوە پێغەمبەرە ﷺ، جا گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵەکەم چی لێبکەم؟ چۆن بڕیار بدەم دەربارەی سەروەتەکەم؟ هیچ وەڵامێکی نەدامەوە هەتا ئایەتی میرات دابەزی.**

## دەربارەی: سەردانی کردنی منداڵ لە کاتی نەخۆشی دا

**٤٤٣-** «عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ صَبِيّاً لابْنَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثَقُلَ، فَبَعَثَتْ أُمُّهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ وَلَدِي فِي الْمَوْتِ، فَقَالَ لِلرَّسُولِ: «اذْهَبْ فَقُلْ لَهَا: إِنَّ لِلَّهِ مَا أَخَذَ، وَلَهُ مَا أَعْطَى، وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى، فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ»، فَرَجَعَ الرَّسُولُ فَأَخْبَرَهَا، فَبَعَثَتْ إِلَيْهِ تُقْسِمُ عَلَيْهِ لَمَا جَاءَ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ فِي نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، مِنْهُمْ: سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ، فَأَخَذَ النَّبِيُّ ﷺ الصَّبِيَّ فَوَضَعَهُ بَيْنَ ثَنْدُوَتَيْهِ[2]، وَلِصَدْرِهِ قَعْقَعَةٌ كَقَعْقَعَةِ الشَّنَّةِ[3]، فَدَمَعَتْ عَيْنَا رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ سَعْدٌ: أَتَبْكِي وَأَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ؟ فَقَالَ: «إِنَّمَا أَبْكِي رَحْمَةً لَهَا، إِنَّ اللَّهَ لَا يَرْحَمُ مِنْ عِبَادِهِ إِلَّا الرُّحَمَاءَ»»[4].

**واتە: ئوسامەی کوڕی زەید (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: کچێکی پێغەمبەری خوا ﷺ منداڵەکەی نەخۆش کەوت، دایکیشی (کەسێکی) نارد بەدوای پێغەمبەردا ﷺ، (تا هەواڵی پێ بدات) کە منداڵەکەم لەسەر مردنە، پێغەمبەریش ﷺ بە نێردراوەکەی فەرموو: بڕۆ پێی بڵێ: ئەوەی خوا وەری دەگرێتەوە هی خۆیەتی، وە ئەوەی دەیبەخشێ هەر هی خۆیەتی، وە هەموو شتێك لە لای ئەو ماوەیەکی دیاری کراوی هەیە، ئارامبگرەو چاوەڕێی پاداشت بکە، جا کەسەکەش گەڕاوەو هەواڵەکەی پێدا، جا (کچەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دووبارە نێردراوەکەی) ناردەوەو سوێندی لەسەر خوارد کە دەبێ (پێغەمبەری خوا) بێ، جا پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هەندێك لە هاوەڵان هەڵسان چوون، کە یەکێکیان: سەعدی کوڕی عوبادە بوو، (جا کە گەیشتن) پێغەمبەر ﷺ منداڵەکەی وەرگرت و لەسەر سینگی موبارەکی خۆی دانا، سینگی خشەو خیزەی کوڵان و**

---

(١) صحيح: «صحيح أبي داود» [البخاري: ٧٥ كتاب المرضى، ٢١- باب: وضوء العائد للمريض. مسلم: ٢٣- الفرائض، ح ٥- ٨].

(٢) الثدوتان للرجل كالثديين للمرأة.

(٣) «قعقة الشنة»: اضطراب وحكاية صوت الشئ اليابس إذا حرك. والشنة: القربة الخلقة اليابسة.

(٤) صحيح: «أحكام الجنائز» [البخاري: ٢٣- كتاب الجنائز، ٣٢- باب: قول النبي ﷺ (يقذب الميت) مسلم: ١١- كتاب الجنائز، ح ١١].

**گریانی لێوە دەهات وەك خشەو خیزەی كونیەی كۆن، چاوەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ فرمێسكیان لێ تكا، سەعد گوتی: دەگریەی تۆ كەچی پێغەمبەری خوای؟! ئەویش فەرمووی: بەڵێ من دەگریم لەبەر بەزەیی و سۆز، خوا لە نێو بەندەكاندا بەزەیی بە كەسدا نایەتەوە تەنها ئەوانە نەبن كە بە بەزەیی و سۆزن.**

٤٤٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يَقُولُ اللَّهُ: اسْتَطْعَمْتُكَ فَلَمْ تُطْعِمْنِي، قَالَ: فَيَقُولُ: يَا رَبِّ، وَكَيْفَ اسْتَطْعَمْتَنِي وَلَمْ أُطْعِمْكَ، وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟ قَالَ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ عَبْدِي فُلَانًا اسْتَطْعَمَكَ فَلَمْ تُطْعِمْهُ؟ أَمَا عَلِمْتَ أَنَّكَ لَوْ كُنْتَ أَطْعَمْتَهُ لَوَجَدْتَ ذَلِكَ عِنْدِي؟ ابْنَ آدَمَ، اسْتَسْقَيْتُكَ فَلَمْ تَسْقِنِي، فَقَالَ: يَا رَبِّ، وَكَيْفَ أَسْقِيكَ وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟ فَيَقُولُ: إِنَّ عَبْدِي فُلَانًا اسْتَسْقَاكَ فَلَمْ تَسْقِهِ، أَمَا عَلِمْتَ أَنَّكَ لَوْ كُنْتَ سَقَيْتَهُ لَوَجَدْتَ ذَلِكَ عِنْدِي؟ يَا ابْنَ آدَمَ، مَرِضْتُ فَلَمْ تَعُدْنِي، قَالَ: يَا رَبِّ، كَيْفَ أَعُودُكَ، وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟ قَالَ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ عَبْدِي فُلَانًا مَرِضَ، فَلَوْ كُنْتَ عُدْتَهُ لَوَجَدْتَ ذَلِكَ عِنْدِي؟ أَوْ وَجَدْتَنِي عِنْدَهُ؟»»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوا دەفەرموێ: (ئەی بەندەكەم) داوای خواردنم لێكردی خواردنت پێنەدام، فەرموویەتی: (بەندەكەش) دەڵێ: ئەی پەروەردگار جا چۆن داوای خواردنت لە من كردووە پێم نەداوی، لە كاتێكدا تۆ پەروەردگاری جیهانیانی (پێویستت پێی نیە)؟! (خوا) دەفەرموێ: ئایا نەتزانی فڵان بەندەم داوای خواردنی لێكردی خواردنت پێنەدا، ئایا نازانی كە ئەگەر خواردنت پێدابایە، ئەوە پاداشتەكەت لای من دەبینیەوە؟ نەوەی ئادەم داوای ئاوم لێكردی پێت نەدام، (بەندەكەش) دەڵێ: ئەی پەروەردگار جا چۆن ئاوت پێبدەم، لە كاتێكدا تۆ پەروەردگاری جیهانیانی (كوا پێویستت پێی هەیە)؟! (خوا) دەفەرموێ: ئایا نەتزانی فڵان بەندەم داوای ئاوی لێكردی ئاوت پێنەدا، ئایا نازانی كە ئەگەر ئاوت پێدابایە، ئەوە پاداشتەكەت لای من دەبینیەوە؟ ئەی نەوەی ئادەم نەخۆش كەوتم سەردانت نەكردم، (بەندەكەش) دەڵێ: ئەی پەروەردگار جا چۆن سەردانت بكەم، لە كاتێكدا تۆ پەروەردگاری جیهانیانی (خۆ نەخۆش ناكەوی)؟! (خوا) دەفەرموێ: ئایا نەتزانی فڵان بەندەم نەخۆشكەوت ئەگەر سەردانت كردبا، ئەوە پاداشتەكەت لای من دەبینیەوە؟ یان منت لە لای ئەو دەبینیەوە.**

٤٤٥- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «عُودُوا الْمَرِيضَ، وَاتَّبِعُوا الْجَنَائِزَ، تُذَكِّرُكُمُ الْآخِرَةَ»»[2].

**واتە: ئەبو سەعید (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سەردانی نەخۆش بكەن، وە بە شوێن مردوودا بڕۆن، دواڕۆژتان بیر دەخەنەوە (بەوەی دەزانن هەر ساغ و زیندوو نامێنن).**

---

(١) صحيح: «التعليق الرغيب» (٤٨/٤) [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٤٣].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٩٨١ «أحكام الجنائز» (٧٧-٦٧).

٤٤٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «ثَلاثٌ كُلُّهُنَّ حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ: عِيَادَةُ الْمَرِيضِ، وَشُهُودُ الْجَنَازَةِ، وَتَشْمِيتُ الْعَاطِسِ إِذَا حَمِدَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ»»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سێ شت هەن هەمووی مافن لەسەر مسوڵمان: سەردانی کردنی نەخۆش، وە ئامادەبوون لەسەر تەرمی مردوو، وە وەڵامدانەوەی ئەو کەسەی دەپژمێ ئەگەر ستایشی خوا (عَزَّوَجَلَّ) بکات و (بڵێ: الحمد لله).**

## دەربارەی: دوعای چاك بوونەوە بۆ نەخۆش لەلایەن ئەو کەسەی سەردانی دەکات

٤٤٧- «عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: حَدَّثَنِي ثَلاثَةٌ مِنْ بَنِي سَعْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ) كُلُّهُمْ يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ عَلَى سَعْدٍ يَعُودُهُ بِمَكَّةَ، فَبَكَى، فَقَالَ: «مَا يُبْكِيكَ»؟ قَالَ: خَشِيتُ أَنْ أَمُوتَ بِالأَرْضِ الَّتِي هَاجَرْتُ مِنْهَا كَمَا مَاتَ سَعْدٌ(٢)، قَالَ: «اللَّهُمَّ اشْفِ سَعْداً ثَلاثاً»، فَقَالَ: لِي مَالٌ كَثِيرٌ، يَرِثُنِي ابْنَتِيْ، أَفَأُوصِي بِمَالِي كُلِّهِ؟ قَالَ: «لا»، قَالَ: فَبِالثُّلُثَيْنِ؟ قَالَ: «لاَ»، قَالَ: فَالنِّصْفُ؟ قَالَ: «لاَ»، قَالَ: فَالثُّلُثُ؟ قَالَ: «الثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، إِنَّ صَدَقَتَكَ مِنْ مَالِكَ صَدَقَةٌ، وَنَفَقَتَكَ عَلَى عِيَالِكَ صَدَقَةٌ، وَمَا تَأْكُلُ امْرَأَتُكَ مِنْ طَعَامِكَ لَكَ صَدَقَةٌ، وَإِنَّكَ أَنْ تَدَعَ أَهْلَكَ بِخَيْرٍ، أَوْ قَالَ: بِعَيْشٍ، خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَدَعَهُمْ يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ، وَقَالَ بِيَدِهِ»»[3].

**واتە: حومەیدی کوڕی عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: سێ کەس لە بەنی سەعد بۆیان گێڕاوەتەوە لە بابیانەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی سەعدی کرد لە مەککە، ئیدی سەعد گریا، (پێغەمبەریش) فەرمووی: چی دەتگریێنێ؟ گوتی: دەترسم لەو خاکە بمرم کە کۆچم تێداکرد، وەك چۆن سەعد (ی کوڕی خەولە) مرد، (پێغەمبەریش ﷺ) سێ جاران فەرمووی: خوایە شیفای سەعد بدە، (پاشان سەعد) گوتی: من ماڵ و سامانی زۆرم هەیە، تەنیا کچێکیشم هەیە میراتم لێ بگرێ (دیارە ئەو کاتە هەر ئەو کچەی هەبووە)، ئایا هەموو ماڵ و سامانەکەم بکەمە وەسیەت؟ فەرمووی: نەخێر، گوتی: ئایا دوو لەسەر سێی بکەمە وەسیەت؟ فەرمووی: نەخێر، گوتی: ئەدی نیوەی بکەمە وەسیەت؟ فەرمووی: نەخێر، گوتی: ئەدی سێیەك؟ فەرمووی: سێیەك (دروستە)، سێیەکیش زۆرە، (ئنجا حیکمەتەکەی بۆ ڕوون کردەوەو فەرمووی): بەخشینت لە ماڵ و سامانت بۆ بە چاکە دەنووسرێ، وە خەرجی ماڵ و منداڵت بۆت بە چاکە دەنووسرێ، خێزانەکەت لە هیچ خواردنێکی تۆ ناخوات، حەتمەن بۆت بە چاکە دەنووسرێ، وە تۆ ئەگەر ماڵ و منداڵەکەت**

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٨٠٠).

(٢) هو سعد بن خولة زوج سبيعة الأسلمية «فضل الله الصمد».

(٣) صحيح.

بە چاكی، یان بە خۆشگوزەرانی جێ بهێڵی باشترە لەوەی هەژار بكەون و، داوا لە خەڵك بكەن، جا ئاماژەی بە دەستی كرد (واتە: با دەست لەبەر خەڵكی پان نەكەنەوە).

## دەربارەی: پلەو پایەی سەردانی كردنی نەخۆش

٤٤٨- «عَنْ أَبِي أَسْمَاءَ قَالَ: مَنْ عَادَ أَخَاهُ كَانَ فِي خُرْفَةِ الْجَنَّةِ، قُلْتُ لِأَبِي قِلَابَةَ: مَا خُرْفَةُ الْجَنَّةِ؟ قَالَ: جَنَاهَا، قُلْتُ لِأَبِي قِلَابَةَ: عَنْ مَنْ حَدَّثَهُ أَبُو أَسْمَاءَ؟ قَالَ: عَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[١].

واتە: ئەبو ئەسماء دەڵێ: هەر كەس سەردانی براكەی بكات ئەوە لە نێو خوڕفەی بەهەشت دایە، (ڕاویەكە دەڵێ:) بە ئەبو قیلابەم گوت: ئایا خوڕفەی بەهەشت چیە؟ گوتی: بەربوومەكەیەتی، وە دەڵێ: بە ئەبو قیلابەم گوت: ئایا كێ ئەوەی بۆ ئەبو ئەسماء باسكردوە؟ گوتی: ثەوبان، ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ.

## دەربارەی: نەخۆش و ئەو كەسەی سەردانی نەخۆش دەكات

٤٤٩- «عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ عَادَ مَرِيْضاً خَاضَ فِي الرَّحْمَةِ، حَتَّى إِذَا قَعَدَ اسْتَقَرَّ فِيهَا»[٢].

واتە: جابری كوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: بیستم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: هەر كەسێك سەردانی نەخۆشێك بكات لە نێو ڕەحم و بەزەیی خوادا ڕۆدەچێ، جا كە دانیشت ئەوە لە ناو ڕەحمەتەكە جێگیر بووە (كە بریتیە لە بەهەشتی خوا).

## دەربارەی: ئەوەی نوێژ دەكات لە لای نەخۆش

٤٥٠- «عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: عَادَ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) ابْنَ صَفْوَانَ، فَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ، فَصَلَّى بِهِمُ ابْنُ عُمَرَ رَكْعَتَيْنِ، وَقَالَ: إِنَّا سَفْرٌ»[٣].

واتە: عەطاء دەڵێ: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) سەردانی ئیبنو صەفوانی كرد، جا كاتی نوێژ هات، ئیبنو عومەر دوو ڕكات نوێژی بۆ كردن و، فەرمووی: ئێمە گەشتیارین (واتە: بۆیە نوێژ كورت دەكەینەوە).

---

(١) صحيح: «صحيح أبي داود» (٢٧١٤) [مسلم: كتاب البر والصلة والآداب، ح ٤٠].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٩٢٩)، «صحيح أبي داود» (٢٧١٤): [ليس في شيئ من الكتب الستة].

(٣) صحيح الإسناد.

## دەربارەی: سەردانی کردنی هاوبەشدانەرێکی نەخۆش

٤٥١- «عَنْ أَنَسٍ، أَنَّ غُلاَمَاً مِنَ الْيَهُودِ كَانَ يَخْدُمُ النَّبِيَّ ﷺ فَمَرِضَ، فَأَتَاهُ النَّبِيُّ ﷺ يَعُودُهُ، فَقَعَدَ عِنْدَ رَأْسِهِ فَقَالَ: «أَسْلِمْ، فَنَظَرَ إِلَى أَبِيهِ، وَهُوَ عِنْدَ رَأْسِهِ، فَقَالَ لَهُ: أَطِعْ أَبَا الْقَاسِمِ ﷺ، فَأَسْلَمَ، فَخَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ وَهُوَ يَقُولُ: «الْحَمْدُ لِلهِ الَّذِي أَنْقَذَهُ مِنَ النَّارِ»»[1].

**واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: منداڵێکی جوولەکە خزمەتی پێغەمبەری ﷺ دەکرد، کاتێك نەخۆش کەوت، پێغەمبەر ﷺ سەردانی کردو لە لای سەریەوە دانیشت، پێی فەرموو: مسوڵمان ببە، منداڵەکەش تەماشای باوکی کرد، کە لە لای سەریەوە دانیشتبوو، جا (باوکی) پێی گوت: گوێڕایەڵی ئەبو قاسم بکە ﷺ، منداڵەکە (ئیمانی هێنا) مسوڵمان بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ کە چووە دەرەوە، دەیگوت: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ڕزگاری کرد لە ئاگر.**

## دەربارەی: ئەوەی دەگوترێ بۆ نەخۆش

٤٥٢- «عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا قَالَتْ: لَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ وُعِكَ أَبُو بَكْرٍ وَبِلاَلٌ، قَالَتْ: فَدَخَلْتُ عَلَيْهِمَا، قُلْتُ: يَا أَبَتَاهُ، كَيْفَ تَجِدُكَ؟ وَيَا بِلاَلُ، كَيْفَ تَجِدُكَ؟ قَالَ: وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ إِذَا أَخَذَتْهُ الْحُمَّى يَقُولُ:

كُلُّ امْـرِئٍ مُصَبَّحٌ فِـي أَهْـلِـهِ ... وَالْمَوْتُ أَدْنَى مِنْ شِرَاكِ نَعْلِهِ

وَكَانَ بِلاَلٌ إِذَا أُقْلِعَ عَنْهُ يَرْفَعُ عَقِيرَتَهُ[2]، فَيَقُولُ:

أَلاَ لَيْتَ شِـعْرِي هَـلْ أَبِيتَنَّ لَيْلَةً ... بِـوَادٍ وَحَـوْلِي إِذْخِـرٌ وَجَلِيلُ

وَهَـلْ أَرِدَنْ يَوْمـاً مِيَاهَ مَجَنَّةٍ[3] ... وَهَلْ يَبْدُوَنْ لِي شَامَةٌ وَطَفِيلُ[4].

قَالَتْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا): فَجِئْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الْمَدِينَةَ كَحُبِّنَا مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ، وَصَحِّحْهَا وَبَارِكْ لَنَا فِي صَاعِهَا وَمُدِّهَا، وَانْقُلْ حُمَّاهَا فَاجْعَلْهَا بِالْجُحْفَةِ»[5].

---

(١) صحيح: «الإرواء» (١٢٧٢): [البخاري: ٢٣- كتاب الجنائز، ٨٠- باب: إذا أسلم الصبي فمات].

(٢) أي صوته.

(٣) موضع على اميال من مكة بناصية مر الظهران. وكان به سوق.

(٤) «شامة» وطفيل» جبلان بقرب مكة.

(٥) صحيح: «تخريج فقه السيرة» (١٧٣) الطبعة الجديدة، [البخاري: ٢٩- كتاب فضائل المدينة، ١٢- باب: حدثنا مسدد. مسلم: ١٥- كتاب الحج، ح ٤٨٠].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە مەدینە، ئەبو بەكرو بیلال (خوا لێیان ڕازی بێ) نەخۆش کەوتن، دەڵێ: چوومە لایان، گوتم: باوکە ئێستا چۆنی؟ ئەدی بیلال تۆ چۆنی؟ دەڵێ: کە ئەبو بەکر تای دەیگرت، دەیگوت:

هەر مرۆڤێك لە نێو ماڵ و منداڵی بەیانی دەکاتەوە

مـردنیش نزیکترە لێـی لە قەیتـانی نەعـلەکانی

وە کاتێك بیلال هۆشی دەهاتەوەبەر، دەنگی خۆی بەرز دەکردەوەو دەیگوت:

ئایا دەبێ تا بەیانی بمێنم و شـەو بە زیندوویی بکەمەوە

لەدۆڵی مەککەو ئیزخیر[1] (چیای) جەلیلم لەدەورە بێ

ئـایـــا ڕۆژێ دێ بچمـە سـەر ئاوی مـــەجەننە

وە ئایا چیای شامـــەو طەفیلــم بــۆ دەردەکەوێ؟

(دایە) عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: منیش کە هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بینیبووم (لە ئەبو بەکرو بیلال)، بۆم باسکرد، دەڵێ: (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: خوایە مەدینەمان لەلا خۆشەویست بکە، وەك خۆشەویستیمان بۆ مەککەو زیاتریش، (خوایە مەدینەمان) بۆ باش بکە، وە بەرەکەت بخەرە نێو صاع و مشتەکانی (واتە: بەرەکەت بخەیتە کێشانەو پێوانەمان)، وە (نەخۆشی) تایەکە بگوازەوە بۆ جوحفە.

## دەربارەی: سەردانی کردنی پیاوێکی ئەعرابی

٤٥٣- «عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَى أَعْرَابِيٍّ يَعُودُهُ، قَالَ: وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا دَخَلَ عَلَى مَرِيضٍ يَعُودُهُ، قَالَ: «لاَ بَأْسَ طَهُورٌ إِنْ شَاءَ اللَّهُ»، قَالَ: ذَاكَ طَهُورٌ، كَلاَّ بَلْ هِيَ حُمَّى تَفُورُ، أَوْ تَثُورُ، عَلَى شَيْخٍ كَبِيرٍ، تُزِيرُهُ الْقُبُورَ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «فَنَعَمْ إِذاً»»[2].

واتە: عیکریمە لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چووە لای پیاوێکی دەشتەکی بە هۆی نەخۆشیەوە سەردانی کرد، جا پێغەمبەر ﷺ عادەتی وابوو هەر کاتێك سەردانی نەخۆشی بکردایە، دەیفەرموو: «لاَ بَأْسَ طَهُورٌ إِنْ شَاءَ اللَّهُ»، واتە: هیچ نیە پاك و پاککەرەوەیە (بە ویستی خوا دەبێتە هۆی پاکبوونەوە لە گوناهان)، (پیاوەکە) گوتی: نەخێر، ئایا ئەمە پاکە،

---

(١) جۆرە گیایەکە لەسەر مردوو دادەنرا لە نێو گۆڕدا.

(٢) صحيح: [البخاري: ٦١- كتاب المناقب، ٢٥- باب: علامات النبوة في الإسلام].

نەخێر، بەڵكو ئەمە تایەكی گڕدارو بڵێسەدارە لەسەر پیاوێكی پیر، دەبێتە هۆی ئەوەی كە سەردانی گۆڕەكانی پێبكات (واتە: بە هۆیەوە دەمرێ و دەچێتە گۆڕستان)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: كەواتە بەڵێ بەم شێوەیە دەبێ. (لە ڕیوایەتی دیكەدا هاتوە، كە پیاوەكە بۆ بەیانی مرد).

تێبینی: پێویستە لەسەر مسوڵمانان، ژیانیان تەواوی ڕەنگدانەوەی ناوەكەیان بێ كە بریتیە لە ملكەچی بۆ خواو پێغەمبەرەكەی و گوێڕایەڵ كردنیان و پابەندبوون بە فەرمایشتەكانیان و بە ڕاست دانانیان، ئەوەی لەم فەرمووده دەبینرێ و هەستی پێ دەكرێ، وە جێی پەندو ئامۆژگاریە، ئەوەیە: ئەم پیاوە هەم گومانی خراپی بە خوا هەبووەو، هەم بڕوای نەبووە بەم فەرمایشتەی پێغەمبەری پایەدارو خۆشەویست ﷺ كە پێی فەرمووە، خوا وەعدی خۆی هەر لە زووەوە جێبەجێ كردوە كە فەرموویەتی: ««أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي، وَأَنَا مَعَهُ إِذَا دَعَانِي»»[1]، واتە: بە پێی گومانی بەندەكەمم (چۆن لە من ڕاببینێ ئاوا مامەڵەی لەگەڵ دەكەم)، وە من لەگەڵیم ئەگەر داوام لێبكات و بانگم بكات تا لەگەڵی بم.

## دەربارەی: سەردانی كردنی نەخۆش

٤٥٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَصْبَحَ الْيَوْمَ مِنْكُمْ صَائِمًا؟» قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا، قَالَ: «مَنْ عَادَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ مَرِيضًا؟» قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا، قَالَ: «مَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ جَنَازَةً؟» قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا، قَالَ: «مَنْ أَطْعَمَ الْيَوْمَ مِسْكِينًا؟» قَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَنَا. قَالَ مَرْوَانُ: بَلَغَنِي أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَا اجْتَمَعَ هَذِهِ الْخِصَالُ فِي رَجُلٍ فِي يَوْمٍ، إِلَّا دَخَلَ الْجَنَّةَ»»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: كێ لە ئێوە ئەمڕۆ بە ڕۆژوو بووە؟ ئەبو بەكر گوتی: من، فەرمووی: ئەدی كێ لە ئێوە ئەمڕۆ سەردانی نەخۆشێكی كردوە؟ ئەبو بەكر گوتی: من، فەرمووی: ئەدی كێ لە ئێوە ئەمڕۆ بە دوای جەنازەی مردووێك كەوتوە؟ ئەبو بەكر گوتی: من، فەرمووی: ئەدی كێ لە ئێوە ئەمڕۆ نەدارێكی نان داوە؟ ئەبو بەكر گوتی: من، مەڕوان (ڕاوی فەرمووده) دەڵێ: پێمگەیشتوە، (دوای ئەوە) پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: ئەم سیفەتانە هەموو پێكەوە لە پیاوێك كۆنابنەوە مەگەر دەیخەنە بەهەشت.

٤٥٥- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى أُمِّ السَّائِبِ، وَهِيَ تُزَفْزِفُ، فَقَالَ: «مَا لَكِ؟» قَالَتِ: الْحُمَّى، أَخْزَاهَا اللَّهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَهْ، لَا تَسُبِّيهَا، فَإِنَّهَا تُذْهِبُ خَطَايَا الْمُؤْمِنِ، كَمَا يُذْهِبُ الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ»»[3].

---

(١) صحيح: ]البخاري: ٩٧- كتاب التوحيد، ١٥- باب: قول اللّٰه تعالى: يحذركم اللّٰه نفسه. مسلم: ٤٨- الذكر والدعاء، ح ٢، ١٩].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨٨): [مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ١٢].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٧١٥-١٢١٥): [مسلم: ٤٥-كتاب البر والصلة والأداب، ح ٥٣].

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چووە سەردانی ئوممو سائیب (دیارە نەخۆش بووە) دەیناڵاندو کەمێك دەلەرزی، فەرمووی: ئەوە چیتە؟ گوتی: تا، خوا ڕیسوای بکات، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: نەکەی، سوێند بە تا مەڵێ، چونکە تا گوناهەکانی بڕوادار لادەبات، وەك چۆن ئاگر ژەنگی ئاسن لادەبات.

## دەربارەی: ئەوەی نەخۆش وەڵامی دەداتەوە

٤٥٦- «عَن إِسْحَاق بْن سَعِيدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ سَعِيدٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: دَخَلَ الْحَجَّاجُ عَلَى ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، وَأَنَا عِنْدهُ، فَقَالَ: كَيْفَ هُوَ؟ قَالَ: صَالِحٌ، قَالَ: مَنْ أَصَابَكَ؟ قَالَ: أَصَابَنِي مَنْ أَمَرَ بِحَمْلِ السِّلاَحِ فِي يَوْمٍ لاَ يَحِلُّ فِيهِ حَمْلُهُ، يَعْنِي: الْحَجَّاجَ»[١].

واتە: ئیسحاقی کوڕی سەعیدی کوڕی عەمڕی کوڕی سەعید لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: حەججاج چووە لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، (لەبەر نەخۆشی سەردانی کرد)، لەو کاتەدا منیش لە لای (عەبدوڵڵا) بووم، جا (حەججاج) گوتی: نەخۆشیەکەت ئێستا چۆنە؟ گوتی: چاکە، گوتی: کێ تۆی پێکاووە (چیت بەرکەوتووە، بە چی وات لێهاتووە)، گوتی: ئەو کەسە منی پێکاوە، کە فەرمانی کردوە بە هەڵگرتنی چەك، لە ڕۆژێکدا کە حەڵاڵ نیە چەکی تێدا هەڵبگیرێ، مەبەستی لەم قسەیە حەججاج بوو، (چونکە ئەو چەکی هەڵگرتبوو).

تێبینی: کەواتە چاك وایە لە کاتی نەخۆشی ئارامگر بین و بڵێین باشین، وەك شوکرانەو سەبر گرتن، وە خۆمان دور بخەینەوە لە ناشوکری و گازاندە کردن و بۆڵەبۆڵ کردن.

## دەربارەی: ئەوەی پێی دروست نیە میوان زێدەڕۆیی بکات لە سەیر کردنی نێوماڵەکەدا

٤٥٧- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي الْهُذَيْلِ قَالَ: دَخَلَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَلَى مَرِيضٍ يَعُودُهُ، وَمَعَهُ قَوْمٌ، وَفِي الْبَيْتِ امْرَأَةٌ، فَجَعَلَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ يَنْظُرُ إِلَى الْمَرْأَةِ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ: لَوْ انْفَقَأَتْ عَيْنُكَ كَانَ خَيْراً لَكَ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی هوزەیل دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) چووە لای نەخۆشێك و سەردانی کرد، کۆمەڵێك کەسیشی لەگەڵ بوون، لە ماڵەکەدا ئافرەتێکیش هەبوو،

---

(١) صحيح الإسناد: [البخاري: ١٣- كتاب العيدين، ٩- باب: ما يكره من حمل السلاح في العيد والحرم].
(٢) صحيح الإسناد.

جا پیاوێك لە کۆمەڵە کەسەکە هەر تەماشای ئافرەتەکەی دەکرد، ئیبنو مەسعوود پێیگوت: ئەگەر چاوەکانت دەرهاتبان باشتر بوو بۆت (لەوەی تەماشای ئەو ئافرەتە بکەیت، لەکاتێکدا کە میوانی).

## دەربارەی: کەسێك کە بە دوو چاوەکانی تاقی دەکرێتەوە

٤٥٨- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: إِذَا ابْتَلَيْتُهُ بِحَبِيبَتَيْهِ، «يُرِيدُ عَيْنَيْهِ»، ثُمَّ صَبَرَ عَوَّضْتُهُ الْجَنَّةَ»» [١].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: خوا (عَزَّ وَجَلَّ) فەرموویەتی: ئەگەر بەندەی خۆم تاقیکردەوە بە دوو خۆشەویستەکەی، «کە مەبەست پێی چاوەکانیەتی»، پاشان ئارامی گرت، ئەوە بۆی قەرەبوو دەکەمەوە بە بەهەشت.

٤٥٩- «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «يَقُولُ اللَّهُ: يَا ابْنَ آدَمَ، إِذَا أَخَذْتُ كَرِيمَتَيْكَ، فَصَبَرْتَ عِنْدَ الصَّدْمَةِ وَاحْتَسَبْتَ، لَمْ أَرْضَ لَكَ ثَوَابًا دُونَ الْجَنَّةِ»» [٢].

واتە: ئەبو ئومامە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا دەفەرموێ: ئەی نەوەی ئادەم، ئەگەر دوو چاوەکەتم لێوەرگرتیەوە، تۆش ئارامت گرت لە یەکەم ساتداو چاوەڕێی پاداشتت هەبوو، ئەوە بە هیچ پاداشتێك ڕازی نابم بۆت جگە لە بەهەشت.

## دەربارەی: ئەو کەسەی سەردانی نەخۆش دەکات، لە کوێ دادەنیشێت؟

٤٦٠- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا عَادَ الْمَرِيضَ جَلَسَ عِنْدَ رَأْسِهِ، ثُمَّ قَالَ سَبْعَ مِرَارٍ: «أَسْأَلُ اللَّهَ الْعَظِيمَ، رَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، أَنْ يَشْفِيَكَ، فَإِنْ كَانَ فِي أَجَلِهِ تَأْخِيرٌ عُوفِيَ مِنْ وَجَعِهِ» [٣].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێك پێغەمبەر ﷺ سەردانی نەخۆشێکی دەکرد، لە لای سەریەوە دادەنیشت، پاشان حەوت جاران دەیفەرموو: (أَسْأَلُ اللَّهَ الْعَظِيمَ رَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ أَنْ يَشْفِيَكَ)، واتە: داوا دەکەم لە خوای مەزن، کە پەروەردگاری عەرشی مەزن و گەورەیە شیفات بدات، (وە دەیفەرموو:) ئەگەر ماوەی مابێ لە ژیاندا، لەم نەخۆشیە چاك دەبێتەوە (بەم پاڕانەوە).

---

(١) صحيح «الروض النضير» (١٥١) [البخاري: ٧٥- كتاب المرضى، ٧- باب: فضل من ذهب بصره].

(٢) حسن صحيح: «المشكاة» (١٧٥٨) [ابن ماجه: ٦- كتاب الجنائز، ٥٥- بماجاء في الصبر على المصيبة].

(٣) صحيح: «صحيح أبي داود» (٢٧١٩): [أبو داود: ٢- كتاب الجنائز، ٨- باب: الدعاء للمريض عند العيادة. الترمذي: ٢٦- كتاب الطب، ٣٢- باب: حدثنا محمد بن المثنى].

٤٦١- «عَنِ الرَّبِيعِ بْن عَبْدِ اللَّهِ، قَالَ: ذَهَبْتُ مَعَ الْحَسَنِ إِلَى قَتَادَةَ نَعُودُهُ، فَقَعَدَ عِنْدَ رَأْسِهِ، فَسَأَلَهُ، ثُمَّ دَعَا لَهُ، قَالَ: اللَّهُمَّ اشْفِ قَلْبَهُ، وَاشْفِ سَقَمَهُ»[١].

واته: ڕەبیعی کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: لەگەڵ حەسەن چووینە لای قەتادەو سەردانمان کرد بە هۆی نەخۆشیەوە، (حەسەن) لە لای سەری دانیشت و، لە ئەحواڵی پرسی، پاشان دوعای بۆ کرد، گوتی: ئەی خوایە شیفای دڵی بدە، وە شیفای نەخۆشیەکەی بدەو چاکی بکەوە.

## دەربارەی: ئەو کارەی پیاو دەیکات لە ماڵی خۆیدا

٤٦٢- «عَنِ الأَسْوَدِ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا): مَا كَانَ يَصْنَعُ النَّبِيُّ ﷺ فِي أَهْلِهِ؟ فَقَالَتْ: كَانَ يَكُونُ فِي مِهْنَةِ أَهْلِهِ، فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلَاةُ خَرَجَ»[٢].

واته: ئەسوەد دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) کرد: لە بارەی ئەو کارەی کە پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەکەیدا بۆ خێزانەکەی دەیکرد؟ گوتی: پێغەمبەر ﷺ کاری لەگەڵ هاوسەرەکەیدا دەکردو یارمەتی دەدا، جا ئەگەر کاتی نوێژ هاتبایە، دەچووە دەر بۆ نوێژ کردن.

٤٦٣- «عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، مَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَعْمَلُ فِي بَيْتِهِ؟ قَالَتْ: يَخْصِفُ نَعْلَهُ، وَيَعْمَلُ مَا يَعْمَلُ الرَّجُلُ فِي بَيْتِهِ»[٣].

واته: هیشامی کوڕی عوروە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) کرد: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێو ماڵ چ ئیش و کارێکی دەکرد؟ گوتی: پێڵاوی خۆی دەدوریەوەو پینەی دەکرد، هەروەها ئەو کارەی دەکرد کە پیاو لە نێو ماڵەکەی خۆیدا دەیکات.

٤٦٤- «عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، مَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَصْنَعُ فِي بَيْتِهِ؟ قَالَتْ: مَا يَصْنَعُ أَحَدُكُمْ فِي بَيْتِهِ، يَخْصِفُ النَّعْلَ، وَيَرْقَعُ الثَّوْبَ، وَيَخِيطُ»[٤].

واته: هیشامی کوڕی عوروە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) کرد: ئایا پێغەمبەر ﷺ، چ ئیشێکی دەکرد لە ماڵەکەیدا؟ گوتی: ئەو کارەی دەکرد کە پیاو لە نێو ماڵەکەی خۆیدا دەیکات، پێڵاوی خۆی دەدوریەوەو پینەی دەکرد، هەروەها پۆشاکی خۆشی پینە دەکردو دەیدوریەوە.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح: «آداب الزفاف» (٢٩٠): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٤٠- باب: كيف يكون الرجل في أهله].

(٣) صحيح: «المشكاة» (٥٨٢٢).

(٤) صحيح: «المشكاة» (٥٨٢٢): [ليس في شيء من الكتب الستة].

٤٦٥- «عَنْ عَمْرَةَ، قِيلَ لِعَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، مَاذَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعْمَلُ فِي بَيْتِهِ؟ قَالَتْ: كَانَ بَشَراً مِنَ الْبَشَرِ، يَفْلِي ثَوْبَهُ[١]، وَيَحْلِبُ شَاتَهُ»[٢].

واته: عەمرە دەڵێ: بە (دایکە) عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) گوترا: پێغەمبەری خوا ﷺ چ ئیش و کارێکی دەکرد لە ماڵەکەیدا؟ گوتی: مرۆڤێك بوو لە مرۆڤەکان، پۆشاکەکەی خۆی خاوێن دەکردەوە (لە کێچ و شت)، مەڕەکەی خۆشی دەدۆشی.

## دەربارەی: ئەگەر کەسێك برا مسوڵمانەکەی خۆشویست با پێی بڵێ

٤٦٦- «عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِي كَرِبَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا أَحَبَّ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيُعْلِمْهُ أَنَّهُ أَحَبَّهُ»»[٣].

واته: میقدامی کوڕی مەعدی کەریب (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان هاوەڵەکەی خۆشویست، ئەوە با پێی ڕابگەیەنێ، کە ئەم ئەوی خۆشدەوێ.

٤٦٧- «عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: لَقِيَنِي رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ فَأَخَذَ بِمَنْكِبِي مِنْ وَرَائِي، قَالَ: أَمَا إِنِّي أُحِبُّكَ[٤]، قَالَ: أَحَبَّكَ الَّذِي أَحْبَبْتَنِي لَهُ، فَقَالَ: لَوْلَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَحَبَّ الرَّجُلُ الرَّجُلَ فَلْيُخْبِرْهُ أَنَّهُ أَحَبَّهُ» مَا أَخْبَرْتُكَ، قَالَ: ثُمَّ أَخَذَ يَعْرِضُ عَلَيَّ الْخِطْبَةَ قَالَ: أَمَا إِنَّ عِنْدَنَا جَارِيَةً، أَمَا إِنَّهَا عَوْرَاءُ»[٥].

واته: موجاهید دەڵێ: پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پێم گەیشت و، شانی لە دواوە گرتم، گوتی: من تۆم خۆشدەوێ، منیش گوتم: ئەو کەسە تۆی خۆشبوێ کە منت لەبەر ئەو خۆشدەوێ، هاوەڵەکە گوتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێك پیاوێك پیاوێکی خۆشویست با پێی بڵێ: کە خۆشی دەوێ، ئەوە من هەرگیز پێم ڕانەدەگەیاندی، گوتی: پاشان دەستی کرد بە باسی داخوازی، گوتی: کچێکمان لەلایە (ئەگەر دەتەوێ)، بەڵام بزانە چاوێکی کوێرە.

٤٦٨- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا تَحَابَّا الرَّجُلَانِ إِلاَّ كَانَ أَفْضَلُهُمَا أَشَدَّهُمَا حُبّاً لِصَاحِبِهِ»»[٦].

---

(١) يفلي ثوبه: أي: ياخذ القمل عنه.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٦٧١)، (مختصر الشمائل» (٢٩٣).

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٤١٧، ٢٥١٥): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ١١٣- باب: إخبار الرجل الرجل بمحبته له. الترمذي: ٣٤- كتاب الزهد، باب: ما جاء في إعلام الحب].

(٤) لعلها: قلت.

(٥) حسن صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٤١٨).

(٦) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٤٥٠).

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر دوو کەسێك کاتێك یەکدیان خۆشدەوێ، ئەوە باشترینیان لای خوا ئەوەیانە کە خۆشەویستی زیاتری هەیە بۆ هاوڕێکەی.

## دەربارەی: ئەگەر کەسێك کەسێکی خۆشویست با موناقەشەو زێدە پرسیاری لەبارەوە نەکات

٤٦٩- «عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: إِذَا أَحْبَبْتَ أَخاً فَلاَ تُمَارِهِ، وَلاَ تُشَارِّهِ[١]، وَلاَ تَسْأَلْ عَنْهُ، فَعَسَى أَنْ تُوَافِيَ لَهُ عَدُوّاً فَيُخْبِرَكَ بِمَا لَيْسَ فِيهِ، فَيُفَرِّقَ بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ»[٢].

واتە: موعازی کوڕی جەبەل (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: کاتێك برایەکت خۆشویست، ئەوە دەمەتەقێی لەگەڵدا مەکە، وە زیانێکی وای لێ مەدە ناچاری بکەی هەمان کارت لە بەرانبەردا بکاتەوە (سەرەنجام خۆشەویستی بۆ دوژمنکاری بگۆڕێت)، وە لە کەسایەتیەکەی مەپێچەوە (لە دوو نهێنی ژیانی ڕابردووی مەبە)، چونکە ڕەنگە (بۆ پرسیار کردن لە ژیانی ئەو) بگەیت بە دوژمنێکی ئەو، جا هەواڵت پێ بدات بە شتێك کە لەودا نەبێ (بوختانی بۆ هەڵدەبەستێ و تۆش بە حەقیقەت تێدەگەیت و نازانیت دوژمنی ئەوە)، ئەوەش دەبێتە مایەی ئەوەی لێکتان جیابکاتەوە.

## دەربارەی: (ئەوەی دەڵێ:) عەقڵ لە دڵدایە

٤٧٠- «عَنْ عِيَاضِ بْنِ خَلِيفَةَ، عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ سَمِعَهُ بِصِفِّينَ يَقُولُ: إِنَّ الْعَقْلَ فِي الْقَلْبِ، وَالرَّحْمَةَ فِي الْكَبِدِ، وَالرَّأْفَةَ فِي الطِّحَالِ، وَالنَّفَسَ فِي الرِّئَةِ»[٣].

واتە: عیازی کوڕی خەلیفە، لە عەلیەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، کە لە صیففین گوێی لێی بووە گوتویەتی: ژیری (مرۆڤ) لە نێو دڵ دایە، سۆزو میهرەبانیش لە ناو جەرگ دایە (بۆیە لە کوردەواری دەڵێن جەرگی سوتاوە)، بەزەییش لە سپڵدایە، هەناسەش لە سیدایە.

---

(١) «ولا تشاره» بتشديد الراء وهي المضارة، أي لا تفعل معه شرا تحوجه إلى فعل مثله معك. وروي مخففا من الشراء أي لا تعامله «مناوي» وفي- النهاية- لا تجارّ أخاك ولا تسارّه أي لا تجن عليه وتلحق به جريرة وقيل لا تماطله من «الجر» وهوأن تلويه بحقه وأنت تجره من محله إلى موضع آخر. ويروى بتخفيف الراء من الجري والمسابقة أي لا تطاوله ولا تغالبه.

(٢) صحيح الإسناد موقوفاً، وروي عنه مرفوعاً.

(٣) حسن الإسناد.

## دەربارەی: خۆ بە گەورەزانین

٤٧١- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كُنَّا جُلُوساً عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ عَلَيْهِ جُبَّةٌ سِيجَانٍ، حَتَّى قَامَ عَلَى رَأْسِ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ صَاحِبَكُمْ قَدْ وَضَعَ كُلَّ فَارِسٍ، أَوْ قَالَ: يُرِيدُ أَنْ يَضَعَ كُلَّ فَارِسٍ، وَيَرْفَعَ كُلَّ رَاعٍ، فَأَخَذَ النَّبِيُّ ﷺ بِمَجَامِعِ جُبَّتِهِ فَقَالَ: «أَلَا أَرَى عَلَيْكَ لِبَاسَ مَنْ لَا يَعْقِلُ»، ثُمَّ قَالَ: ««إِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ نُوحاً (عليه السلام) لَمَّا حَضَرَتْهُ الْوَفَاةُ قَالَ لِابْنِهِ: إِنِّي قَاصٌّ عَلَيْكَ الْوَصِيَّةَ، آمُرُكَ بِاثْنَتَيْنِ، وَأَنْهَاكَ عَنِ اثْنَتَيْنِ: آمُرُكَ بِلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَإِنَّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعَ وَالْأَرَضِينَ السَّبْعَ، لَوْ وُضِعْنَ فِي كِفَّةٍ وَوُضِعَتْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ فِي كِفَّةٍ لَرَجَحَتْ بِهِنَّ، وَلَوْ أَنَّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعَ وَالْأَرَضِينَ السَّبْعَ كُنَّ حَلْقَةً مُبْهَمَةً لَقَصَمَتْهُنَّ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، فَإِنَّهَا صَلَاةُ كُلِّ شَيْءٍ، وَبِهَا يُرْزَقُ كُلُّ شَيْءٍ، وَأَنْهَاكَ عَنِ الشِّرْكِ وَالْكِبْرِ»، فَقُلْتُ، أَوْ قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا الشِّرْكُ قَدْ عَرَفْنَاهُ، فَمَا الْكِبْرُ؟ هُوَ أَنْ يَكُونَ لِأَحَدِنَا حُلَّةٌ يَلْبَسُهَا؟ قَالَ: «لَا»، قَالَ: فَهُوَ أَنْ يَكُونَ لِأَحَدِنَا نَعْلَانِ حَسَنَتَانِ، لَهُمَا شِرَاكَانِ حَسَنَانِ؟ قَالَ: «لَا»، قَالَ: فَهُوَ أَنْ يَكُونَ لِأَحَدِنَا دَابَّةٌ يَرْكَبُهَا؟ قَالَ: «لَا»، قَالَ: فَهُوَ أَنْ يَكُونَ لِأَحَدِنَا أَصْحَابٌ يَجْلِسُونَ إِلَيْهِ؟ قَالَ: «لَا»، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَمَا الْكِبْرُ؟ قَالَ: «سَفَهُ الْحَقِّ، وَغَمْطُ النَّاسِ»»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین، پیاوێکی دەشتەکی هاتە خزمەتی، جوببەیەکی سیجانی لەبەر دابوو، هات لە لای سەری پێغەمبەر ﷺ ڕاوەستا، گوتی: هاوەڵەکەتان پلەی هەموو سوارچاکێکی دابەزاندوە، یان گوتی: دەیەوێ هەموو سوارچاکێك دابەزێنێ و هەموو شوانێك بەرز بکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ لایەکان و لیچکەکانی جوببەکەی کۆکردەوەو فەرمووی: ئاگاداربە! من پۆشاکی نەزانیت بەبەردا دەبینم، پێغەمبەری خوا نووح (علیه السلام) کاتێك مردنی نزیك بووەوە، بە کوڕەکەی فەرموو: من ڕاسپاردەو وەسیەت و ئامۆژگاری خۆمت بەسەردا دەخوێنمەوە، فەرمانت پێدەکەم بە ئەنجامدانی دوو شت و، وازهێنان لە دوو شت: فەرمانت پێدەکەم بە (لا إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ)، چونکە ئەگەر هەر حەوت ئاسمانەکان و هەر حەوت زەویەکان بخرێنە نێو تای تەرازوویەك و، (لا إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ) بخرێتە تاکەی دیکە، ئەوە ئەو (لا إِلَهَ إلاَّ اللَّه)یە قورستر دەبێ، ئەگەر حەوت ئاسمانەکان و زەویەکان ئاڵقەیەکی نادیاربن (لا إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ) دەیانشکێنێ، هەروەها (شتی دووەم بریتیە لە): (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ)، کە پاڕانەوەو نوێژی هەموو شتێکە، بە هۆیەوە هەموو شتێك ڕزق و ڕۆزی دەدرێ، وە هاوبەش دانان و خۆ بە گەورەزانینت لەسەر قەدەغە دەکەن، (دەڵێ:) گوتم، یان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە دەزانین هاوبەش دانان چیە، ئەدی خۆ بەگەورەزانین چیە؟ ئایا ئەوەیە کە ئێمە پۆشاکێکی جوان بپۆشین؟ فەرمووی: نەخێر،

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٣٤).

گوتیان: ئەدی ئەوەیە کە یەکێکمان دوو نەعل و (پێڵاو)ی جوانی هەبێ و قەیتانی جوانیان پێوە بێ؟ فەرمووی: نەخێر، گوتیان: ئەدی ئەوەیە کە یەکێکمان وڵاخێکی هەبێ و بیەوێ هەڵیبگری (لەسەر پشتی دابنیشێ)؟ فەرمووی: نەخێر، گوتیان: ئەدی ئەوەیە کە یەکێکمان هاوەڵی هەبن و لە لایان دابنیشێ؟ فەرمووی: نەخێر، جا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەدی خۆ بە گەورەزانین چیە؟ فەرمووی: خۆ بە گەورەزانین ئەوەیە: کە هەق قبووڵ نەکەی، وە بە سووك تەماشای خەڵك بکەی.

٤٧٢- «عَنْ عِكْرِمَةَ بْنِ خَالِدٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ تَعَظَّمَ فِي نَفْسِهِ، أَوِ اخْتَالَ فِي مِشْيَتِهِ، لَقِيَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ وَهُوَ عَلَيْهِ غَضْبَانُ»»[١].

واتە: عیکریمەی کوڕی خالید، دەڵێ: لە ئیبنو عومەرم (خوا لێیان ڕازی بێ) بیست، گوتی: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: هەر کەس لە دڵی خۆیدا خۆی پێ گەورە بێ، یان لە ڕۆیشتندا کەشخەو فیز بکات، ئەوە دەگاتەوە بە خوا لە کاتێکدا لێی توورەیە.

٤٧٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا اسْتَكْبَرَ مَنْ أَكَلَ مَعَهُ خَادِمُهُ، وَرَكِبَ الْحِمَارُ بِالأَسْوَاقِ، وَاعْتَقَلَ الشَّاةَ فَحَلَبَهَا»»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسە خۆی بە گەورە نەزانیوە کە خزمەتکارەکەی لەگەڵیدا بخوات، هەروەها سواری گوێدرێژەکەی ببێ لە نێو بازاڕەکاندا، هەروەها مەڕەکەی ببەستێتەوەو (بە دەستی خۆی) بیدۆشێ.

تێبینی: مرۆڤ بەو کارانە ڕادێت لەسەر خاکی بوون و سادەیی، خۆی پێ لە خەڵك زیاد نابێ و وەك ئەوان خۆی دێتە پێش چاو.

٤٧٤- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْعِزُّ إِزَارِي، وَالْكِبْرِيَاءُ رِدَائِي، فَمَنْ نَازَعَنِي بِشَيْءٍ مِنْهُمَا عَذَّبْتُهُ»»[٣].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری و ئەبو هورەیرە (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (خوا فەرموویەتی:) دەسەڵات و هێز سیفەتی منە (تایبەتە بە من)، وە خۆبەگەورەزانی سیفەتی منە (تایبەتە بە من)، جا هەر کەسێك کێشەم لەگەڵدا بکات لەسەر شتێك لەوانە، ئەوە سزای دەدەم.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٤٣).

(٢) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٢٢١٨).

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٤١) كتاب البر والصلة والآداب، ح ١٣٦.

٤٧٥- «عَنِ الْهَيْثَمِ بْنِ مَالِكٍ الطَّائِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ، قَالَ: إِنَّ لِلشَّيْطَانِ مَصَالِيَاً وَفُخُوخاً، وَإِنَّ مَصَالِيَ الشَّيْطَانِ وَفُخُوخَهُ: الْبَطَرُ بِأَنْعُمِ اللَّهِ، وَالْفَخْرُ بِعَطَاءِ اللَّهِ، وَالْكِبْرِيَاءُ عَلَى عِبَادِ اللَّهِ، وَاتِّبَاعُ الْهَوَى فِي غَيْرِ ذَاتِ اللَّهِ»»[١].

واته: هەیسەمی کوڕی مالیکی طائی، دەڵێ: لە نوعمانی کوڕی بەشیرم (خوا لێی ڕازی بێ) بیست لەسەر مینبەر دەیگوت: بە دڵنیایی شەیتان کۆمەڵێ فرت و فێڵ و تەڵەی هەنە، فرت و فێڵ و تەڵەی شەیتان بریتیە لە: سپڵەیی بە نیعمەتەکانی خواو، کەشخەو فیز بەخۆ کردن بە بەخششەکانی خواو، خۆ بە گەورەزانین لەسەر بەندەکانی خوا، هەروەها شوێنکەوتنی ئارەزووو نەفس، لە (شتانێك) جگە لە پێناوی خوا.

٤٧٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «احْتَجَّتِ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ، قَالَتِ النَّارُ: يَلِجُنِي الْجَبَّارُونَ، وَيَلِجُنِي الْمُتَكَبِّرُونَ، وَقَالَتِ الْجَنَّةُ: يَلِجُنِي الضُّعَفَاءُ، وَيَلِجُنِي الْفُقَرَاءُ. قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى لِلْجَنَّةِ: أَنْتِ رَحْمَتِي أَرْحَمُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ، ثُمَّ قَالَ لِلنَّارِ: أَنْتِ عَذَابِي أُعَذِّبُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ، وَلِكُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْكُمَا مِلْؤُهَا»»[٢].

واته: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەهەشت و دۆزەخ بووە گفتوگۆیان، ئاگر گوتی: ئەوانەی دەسەڵاتدارو ستەمکارو خۆبەزلزانن دێنە نێو من، بەهەشتیش گوتی: بێهێزو هەژاران دێنە نێو من، خوا (تَبَارَكَ وَتَعَالَى) بە بەهەشتی فەرموو: تۆ بەزەیی منی، بە هۆی تۆوە بەزەییم دەنوێنم بە هەر کەسێك کە بمەوێ، پاشان بە ئاگری فەرموو: تۆ سزای منی بە هۆی تۆوە هەرکەسێك سزا دەدەم کە بمەوێ (و شایستەی سزا بێ)، بۆ هەر یەکێکتان ئەوەندە هەیە کە پێی پڕبن (هەردووکتان پڕ دەکەم بە ئەهلی خۆتان).

٤٧٧- «عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمْ يَكُنْ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مُتَحَزِّقِينَ[٣] وَلاَ مُتَمَاوِتِينَ[٤]، وَكَانُوا يَتَنَاشَدُونَ الشِّعْرَ فِي مَجَالِسِهِمْ، وَيَذْكُرُونَ أَمْرَ جَاهِلِيَّتِهِمْ، فَإِذَا أُرِيدَ أَحَدٌ مِنْهُمْ عَلَى شَيْءٍ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ، دَارَتْ حَمَالِيقُ[٥] عَيْنَيْهِ كَأَنَّهُ مَجْنُونٌ»[٦].

واته: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕڕەحمان (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەزیل نەبوون و خۆیان لاوازو کزۆڵ نیشان نەدەدا، لە نێو کۆڕەکانیاندا شیعریان دەگوت،

---

(١) حسن موقوف.

(٢) صحيح: «ظلال الجنة» (٥٢٨): [البخاري: ٦٥- كتاب التفسير، ٥٠- سورة ق ١- باب: وتقول: هل من مزيد. مسلم: ٥١- كتاب الجنة وصفة نعيمها وأهلها، ح ٣٢، ٥٣ و ٣٦].

(٣) أي متقبضين ومجتمعين.

(٤) تماوت الرجل.

(٥) جمع حملاق العين وهو ما يسوده الكحل من باطن أجفانها، وهو كناية عن فتح العينين والنظر بشدة.

(٦) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٤٣٤).

باسی سەردەمی نەفامیان دەكرد، جا كاتێك یەكێكیان فەرمانێكی خوای جێبەجێ دەكرد، چاوەكانی زەق و بە تەركیز دەسوورِا وەك شێت وابوو (واتە: ئەوەندە بەتاسەوە بوون لەسەر پەرستشی خوا، لەگەڵ ئەوەشدا قسەو باسی خۆشیان هەبووە).

٤٧٨- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، وَكَانَ جَمِيلاً، فَقَالَ: حُبِّبَ إِلَيَّ الْجَمَالُ، وَأُعْطِيتُ مَا تَرَى، حَتَّى مَا أُحِبُّ أَنْ يَفُوقَنِي أَحَدٌ، إِمَّا قَالَ: بِشِرَاكِ نَعْلٍ، وَإِمَّا قَالَ: بِشِسْعٍ أَحْمَرَ، الْكِبْرُ ذَاكَ؟ قَالَ: «لَا، وَلَكِنَّ الْكِبْرَ مَنْ بَطَرَ الْحَقَّ، وَغَمَطَ النَّاسَ»»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، (دەڵێ): پیاوێكی جوان (ڕێك و پێك) هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: من زۆر جوانیم لەلا خۆشەویستەو، ئەوەم پێم دراوە كە دەیبینی (مەبەستی جوانیەكەی بوو)، (بە شێوەیەك جوانیم پێ خۆشە) تەنانەت پێم خۆش نیە هیچ كەس پێش من بكەوێتەوە لەم جوانیە، پیاوەكە نەعلەكەی، یاخود قەیتانە سورەكەی نەعلەكەی بەرزكردەوە، گوتی: ئایا ئەمە خۆبەزلزانیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر، بەڵكو خۆبەزلزانی قبووڵ نەكردنی هەق و بە سووك دانانی خەڵكە.

٤٧٩- «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يُحْشَرُ الْمُتَكَبِّرُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَمْثَالَ الذَّرِّ فِي صُورَةِ الرِّجَالِ، يَغْشَاهُمُ الذُّلُّ مِنْ كُلِّ مَكَانٍ، يُسَاقُونَ إِلَى سِجْنٍ مِنْ جَهَنَّمَ يُسَمَّى: بُولَسَ[2] تَعْلُوهُمْ نَارُ الْأَنْيَارِ، وَيُسْقَوْنَ مِنْ عُصَارَةِ أَهْلِ النَّارِ، طِينَةَ الْخَبَالِ»»[3].

واتە: عەمرِی كوڕی شوعەیب، لە باوك و باپیرەیەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوانەی خۆبەلزانن لە ڕۆژی دواییدا كۆدەكرێنەوەو بە ئەندازەی گەردیلەی ورد لە شێوەی مرۆڤ، زەلیلی لە هەموو لایەكەوە دەورەی داون، ڕاپێچ دەكرێن بۆ زیندانێك لە ناو دۆزەخ كە پێی دەگوترێ: بولەس (واتە: بێ ئومێد بوون لە دەرچوون لە دۆزەخ)، لە نێویدا گڕی ئاگرەكان دێتە سەریان، خواردنەوەیان لە كێماوی دۆزەخ پێشان دەدرێ و دەرخوارد دەدرێن.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٤/١٦٨) [أبو داود: ٣١- كتاب اللباس، ٢٦- باب: ما جاء في الكبر. عن ابن مسعود. الترمذي: ٢٥- كتاب البر، ٦٠- باب: ما جاء في الكبر].

(٢) بولس بضم الباء وفتح اللام. قال الهروي: من الإبلاس وهو بمعنى الياس، لأن الداخل فيه أيس من الخلاص.

(٣) حسن: «الترغيب» (٤ \ ١٨)، «المشكاة» (٥١١٢): [الترمذي: ٣٥- كتاب صفة القيامة، ٤٧- باب: حدثنا هناد].

## دەربارەی: ئەو کەسەی خۆی سەر دەخات لە ستەمەکەیدا (کاتێ ستەمی لێ دەکرێ)

٤٨٠- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهَا: «دُونَكِ فَانْتَصِرِي»»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: خۆت سەربخە (واتە: بەسەر ئەو کەسەدا خۆی سەربخات کە دەمەقاڵیان هەبووەو ستەمی لێ کردوە).

٤٨١- «أَنَّ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: أَرْسَلَ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ ﷺ فَاطِمَةَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَاسْتَأْذَنَتْ وَالنَّبِيُّ ﷺ مَعَ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) فِي مِرْطِهَا[٢] فَأَذِنَ لَهَا فَدَخَلَتْ، فَقَالَتْ: إِنَّ أَزْوَاجَكَ أَرْسَلْنَنِي يَسْأَلْنَكَ الْعَدْلَ فِي بِنْتِ أَبِي قُحَافَةَ، قَالَ: «أَيْ بُنَيَّةُ، أَتُحِبِّينَ مَا أُحِبُّ؟» قَالَتْ: بَلَى، قَالَ: «فَأَحِبِّي هَذِهِ، فَقَامَتْ فَخَرَجَتْ فَحَدَّثَتْهُمْ، فَقُلْنَ: مَا أَغْنَيْتِ عَنَّا شَيْئاً فَارْجِعِي إِلَيْهِ، قَالَتْ: وَاللَّهِ لَا أُكَلِّمُهُ فِيهَا أَبَداً. فَأَرْسَلْنَ زَيْنَبَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ، فَاسْتَأْذَنَتْ، فَأَذِنَ لَهَا، فَقَالَتْ لَهُ ذَلِكَ، وَوَقَعَتْ فِيَّ زَيْنَبُ تَسُبُّنِي، فَطَفِقْتُ أَنْظُرُ: هَلْ يَأْذَنُ لِيَ النَّبِيُّ ﷺ، فَلَمْ أَزَلْ حَتَّى عَرَفْتُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَا يَكْرَهُ أَنْ أَنْتَصِرَ، فَوَقَعْتُ بِزَيْنَبَ، فَلَمْ أَنْشَبْ أَنْ أَثْخَنْتُهَا غَلَبَةً، فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: أَمَا إِنَّهَا ابْنَةُ أَبِي بَكْرٍ»[٣].

واتە: (دایکمان) عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ فاتیمەیان (خوا لێیی ڕازی بێ) نارد تا بچێت بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، ئەویش داوای هاتنە ژووری کرد لە پێغەمبەر ﷺ، لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ عائیشە بوو، لە نێو پۆشاك و پێخەفەکەی، جا مۆڵەتی داو ئەویش هات، (فاتیمە خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: خێزانەکانت منیان ناردوە، داوای دادگەریت لێدەکەن لە نێوان ئەوان و عائیشە؟ (پێغەمبەریش) فەرمووی: ئەی کچی خۆشەویستم! ئایا تۆ ئەو کەسەت خۆشناوێ کە من خۆشم دەوێ؟ گوتم: با (خۆشم دەوێ)، جا پێی فەرموو: دەی عائیشەت خۆشبوێ، لەو کاتە فاتیمە هەڵساو چووە دەرەوەو قسەی بۆ کردن و (ئەوەی پێی گوترا) پێی گوتن، ئەوانیش گوتیان: هیچت بۆ نەکردووین، (ئەم جارەیان) زەینەبی خێزانی پێغەمبەریان ﷺ نارد، داوای هاتنە ژووری کرد، ئەویش مۆڵەتیداو هەمان قسەشی بە زەینەب فەرموو، جا زەینەب کەوتە سەر زەم کردنم و قسەی پێگوتم، منیش تەماشام کرد، ئایا پێغەمبەر ﷺ ڕێگەم پێدەدات وەڵامی بدەمەوە یان نا؟ ئیتر بەردەوام بووم لە تەماشا کردنی، تا زانیم پێی ناخۆش نیە، تا وەك هەقی خۆم وەڵامی بدەمەوەو بەرگری لە خۆم بکەم، ئیتر منیش قسەم پێگوت وازم لێ نەهێنا تا توانیم سەربکەوم بەسەریدا، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی و زەردەخەنەیەکی کرد، فەرمووی: ئەوە کچی ئەبو بەکرە (خوا لێی ڕازی بێ).

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٨٦٢) [يظهر لي أنه جزء من الحديث التالي بلفظ آخر].

(٢) في مرطها: اللحفة والإزار.

(٣) صحيح: [مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح٨٣].

٤٨٢- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ الْأَنْصَارَ قَالَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ: اقْسِمْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ إِخْوَانِنَا النَّخِيلَ، قَالَ: «لَا»، فَقَالُوا: تَكْفُونَا الْمَؤُونَةَ، وَنُشْرِكُكُمْ فِي الثَّمَرَةِ؟ قَالُوا: سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئەنصارەکان بە پێغەمبەریان ﷺ گوت: خورما لە نێوان ئێمەو براکانمان دابەش بکە، فەرمووی: نەخێر، ئەوانیش گوتیان: ئایا ئێوە خەرجیەکەمان لە کۆڵ دەکەنەوەو بتانکەینە هاوبەشی خۆمان لە بەرهەمەکەدا، گوتیان: گوێبیست بووین و جێبەجێی دەکەین، (واتە: بەم حوکمە ڕازین، جا هەر خۆیان پێکهاتن).

٤٨٣- «عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: عَامَ الرَّمَادَةِ، وَكَانَتْ سَنَةً شَدِيدَةً مُلِمَّةً، بَعْدَمَا اجْتَهَدَ عُمَرُ فِي إِمْدَادِ الْأَعْرَابِ بِالْإِبِلِ وَالْقَمْحِ وَالزَّيْتِ مِنَ الْأَرْيَافِ كُلِّهَا، حَتَّى بَلَحَتِ الْأَرْيَافُ كُلُّهَا مِمَّا جَهَدَهَا ذَلِكَ» فَقَامَ عُمَرُ يَدْعُو فَقَالَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْ رِزْقَهُمْ عَلَى رُءُوسِ الْجِبَالِ، فَاسْتَجَابَ اللَّهُ لَهُ وَلِلْمُسْلِمِينَ، فَقَالَ حِينَ نَزَلَ بِهِ الْغَيْثُ: الْحَمْدُ لِلهِ، فَوَاللَّهِ لَوْ أَنَّ اللَّهَ لَمْ يُفْرِجْهَا مَا تَرَكْتُ بِأَهْلِ بَيْتٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ لَهُمْ سَعَةٌ إِلَّا أَدْخَلْتُ مَعَهُمْ أَعْدَادَهُمْ مِنَ الْفُقَرَاءِ، فَلَمْ يَكُنِ اثْنَانِ يَهْلِكَانِ مِنَ الطَّعَامِ عَلَى مَا يُقِيمُ وَاحِداً»[٢].

واتە: لە عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ) گێڕدراوەتەوە، لە ساڵی ڕەماد، کە ساڵێکی زۆر قورس و گرانی و (قات و قڕی) بوو، دوای ئەوەی عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) هەوڵ و کۆششی زۆر ئەنجامدا لە یارمەتیدانی عەرەبە دەشتەکیەکان، لە ڕێگەی پێدانی وشترو گەنم و زەیت بە دەوروبەری شارەکان، تا وای لێهات خەڵکی دەوروبەر هەموویان ئەوەیان خوارد کە عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) هەوڵی بۆدا، ئنجا عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) هەڵساو دەستی بە پاڕانەوە کردو فەرمووی: خوایە ڕزق و ڕۆزیان بۆ بخەرە سەرووی چیاکان، خوا وەڵامی عومەرو مسوڵمانانی دایەوەو (باران باری)، جا کاتێك باران باری، گوتی: سوپاس بۆ خوا، وەڵڵاهی ئەگەر خوا ئەم گرانیەی لەسەرمان لانەبردبا، ئەوە هیچ ماڵێکی دەوڵەمەندو خوا پێداوم نەدەهێشتەوە، حەتمەن بە ژمارەی خۆیان خەڵکی هەژارم دەخستنە گەڵیان (دەبا بیانژیاندبان)، بۆیە نەدەبوو دوو کەس بە هۆی خواردنی کەسێکەوە مردبان (واتە: نەمدەهێشت کەسێك خواردنی سێ کەس بخوات و دوو کەسیش لە برسان بمرن).

٤٨٤- «عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ضَحَايَاكُمْ، لَا يُصْبِحُ أَحَدُكُمْ بَعْدَ ثَالِثَةٍ، وَفِي بَيْتِهِ مِنْهُ شَيْءٌ. فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الْمُقْبِلُ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، نَفْعَلُ كَمَا فَعَلْنَا الْعَامَ الْمَاضِيَ؟ قَالَ: «كُلُوا وَادَّخِرُوا، فَإِنَّ ذَلِكَ الْعَامَ كَانُوا فِي جَهْدٍ فَأَرَدْتُ أَنْ تُعِينُوا»»[٣].

---

(١) صحيح: [البخاري: ٤٥- كتاب الشروط، ٥- باب: الشروط في المعاملة].

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح: «الإرواء» (٤/٣٧٠) [البخاري: ٧٣- كتاب الأضاحي، ١٦- باب: ما يؤكل من لحوم الأضاحي. مسلم: ٣٥- كتاب الأضاحي، ح ٣٤].

واتە: سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو قوربانیانەی ئێوە کردووتانە، نابێ دوای سێ ڕۆژی دیکە هیچ کەسێك لە ئێوە بەیانی بکاتەوە لەکاتێکدا شتێك و بەشێك لەو قوربانیە لە ماڵەکەیدا هەبێت، جا کاتێك ساڵی ئاینده داهات، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا وەك ساڵی ڕابردوو هیچی لە ماڵەوە نەهێڵین؟ فەرمووی: لێی بخۆن و لێشی هەڵبگرن، ساڵەکەیتر لەبەر هەژاری بوو ئەم فەرمانەم دەرکرد، ویستم یارمەتی خەڵك بدەن (تا هەموو خەڵك گۆشتیان بەر بکەوێت).

## دەربارەی: ئەزموونەکان

٤٨٥- «عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كُنْتُ جَالِساً عِنْدَ مُعَاوِيَةَ، فَحَدَّثَ نَفْسَهُ، ثُمَّ انْتَبَهَ فَقَالَ: لاَ حِلْمَ إِلاَّ تَجْرِبَةٌ، يُعِيدُهَا ثَلاَثاً»[١].

واتە: هیشامی کوڕی عوروە، لە باوکیەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: من لە لای موعاویە بووم، قسەی بۆ خۆی دەکرد (لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد)، دواتر بە ئاگا هاتەوە، گوتی: نەرم و نیانی و لەسەرخۆیی تەنها بە ئەزموون پەیدا دەبێ، ئەمەی سێ جار دووبارە کردەوە.

## دەربارەی: پەیمانی سەردەمی نەفامی

٤٨٦- «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «شَهِدْتُ مَعَ عُمُومَتِي حِلْفَ الْمُطَيَّبِينَ، فَمَا أُحِبُّ أَنْ أَنْكُثَهُ، وَأَنَّ لِي حُمْرَ النَّعَمِ»»[٢].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەگەڵ مامەکانم ئامادەبووم و بەشداربووم لە پەیمانی (مُطَیَّبِین)، پێم خۆش نیە ئەم پەیمانە بشکێنم، هەرچەندە ئەگەر لە بەرانبەر شکاندنی ئەم پەیمانەدا هەرچی وشتری سوور هەیە بمدەنێ (ئەگەرچی گرانبەهاترین جۆری وشترە).

تێبینی: پەیمانی موتەیبین ئەو پەیمانە بوو کە زۆرێك لە قوڕەیشیەکان دایان لەسەر سەرخستنی بەنی عەبدول دار کە دەویسترا شەڕەفی خزمەتکردنی کەعبەو هەڵگرتنی ئاڵای جەنگ و ئاودانی حاجیانیان لێ بسەنن‌ەوەو ستەمیان لێ بکەن.

---

(١) صحيح موقوفاً: «تخريج المشكاة» (٥٠٥٦/ التحقيق الثاني).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٩٠٠).

## دەربارەی: دروستکردنی برایەتی

٤٨٧- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: آخَى النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ ابْنِ مَسْعُودٍ وَالزُّبَيْرِ»[١].

**واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ برایەتی دروستکرد لە نێوان عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودو زوبەیردا.**

٤٨٨- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: حَالَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ قُرَيْشٍ وَالْأَنْصَارِ فِي دَارِي الَّتِي بِالْمَدِينَةِ»[٢].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هاوپەیمانێتی دروستکرد لە نێوان قورەیش و ئەنصارەکان لە نێو ماڵی مندا کە لە شاری مەدینە بوو.**

## دەربارەی: هاوپەیمانێتی لە ئیسلامدا نەماوە

٤٨٩- «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: جَلَسَ النَّبِيُّ ﷺ عَامَ الْفَتْحِ عَلَى دَرَجِ الْكَعْبَةِ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: «مَنْ كَانَ لَهُ حِلْفٌ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، لَمْ يَزِدْهُ الْإِسْلَامُ إِلَّا شِدَّةً، وَلَا هِجْرَةَ بَعْدَ الْفَتْحِ»» [٣].

**واتە: عەمرى کوڕی شوعەیب، لە باوکیەوە، ئەویش لە باپیرەیەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی ڕزگار کردنی مەککەدا لەسەر قاڵدرمە (پایە، پەیژە)ی کەعبە دانیشتبوو، جا سوپاسی خوای کردو سەنای خوای فەرموو، پاشان فەرمووی: هەر کەسێك هاوپەیمانێتی سەردەمی نەفامی هەبێ، ئەوە ئیسلام توندتری دەکات (واتە: بە تۆکمەتر درێژەی پێ دەدات، ئەگەر لەسەر هەق بووبێ)، وە لە دوای ڕزگار کردنی مەککە کۆچکردن بوونی نەما (کە پێشتر پێویست بوو بکرێ لە مەککەو دەوروبەریەوە بۆ مەدینە).**

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣١٦٦).

(٢) صحيح: «صحيح أبي داود» (٢٥٩٧): [البخاري: ٩٦- كتاب الاعتصام، ١٦- باب: ما ذكر النبي ﷺ على اتفاق أهل العلم. مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ٢٠٥].

(٣) صحيح: «صحيح أبي داود» (٢٥٩٧): [ليس في شيء من الكتب الستة].

## دەربارەی: ئەوەی خۆی دەداتە بەر باران لە یەكەم باراندا

٤٩٠- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أَصَابَنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ مَطَرٌ، فَحَسَرَ النَّبِيُّ ﷺ ثَوْبَهُ عَنْهُ حَتَّى أَصَابَهُ الْمَطَرُ، قُلْنَا: لِمَ فَعَلْتَ؟ قَالَ: «لِأَنَّهُ حَدِيثُ عَهْدٍ بِرَبِّهِ»»[1].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ تووشی بارانێك هاتین، جا پێغەمبەر ﷺ پۆشاكەكەی هەڵكرد تاوەكو بارانەكەی بەركەوت (ڕاستەوخۆ پێستی تەڕ بێ)، گوتمان: بۆچی ئەمەت كرد؟ فەرمووی: چونكە تازە ئێستا لەلای پەروەردگاری بووە (بارانی یەكەمەو تازە یەكەم فەرمانی پێكراوەو موبارەكە).

## دەربارەی: مەڕو بزن بەرەكەتن

٤٩١- «عَنْ حُمَيْدِ بْنِ مَالِكِ بْنِ خُثَيْمٍ، أَنَّهُ قَالَ:كُنْتُ جَالِسَاً مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، بِأَرْضِهِ بِالْعَقِيقِ، فَأَتَاهُ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ عَلَى دَوَابَّ، فَنَزَلُوا، قَالَ حُمَيْدٌ: فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: اذْهَبْ إِلَى أُمِّي، وَقُلْ لَهَا: إِنَّ ابْنَكِ يُقْرِئُكِ السَّلَامَ، وَيَقُولُ: أَطْعِمِينَا شَيْئَاً قَالَ: فَوَضَعَتْ ثَلَاثَةَ أَقْرَاصٍ مِنْ شَعِيرٍ، وَشَيْئَاً مِنْ زَيْتٍ وَمِلْحٍ فِي صَحْفَةٍ، فَوَضَعْتُهَا عَلَى رَأْسِي، فَحَمَلْتُهَا إِلَيْهِمْ، فَلَمَّا وَضَعْتُهُ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ، كَبَّرَ أَبُو هُرَيْرَةَ، وَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَشْبَعَنَا مِنَ الْخُبْزِ بَعْدَ أَنْ لَمْ يَكُنْ طَعَامُنَا إِلَّا الْأَسْوَدَانِ: التَّمْرُ وَالْمَاءُ، فَلَمْ يُصب الْقَوْمُ مِنَ الطَّعَامِ شَيْئَاً! فَلَمَّا انْصَرَفُوا. قَالَ: يَا ابْنَ أَخِي! أَحْسِنْ إِلَى غَنَمِكَ، وَامْسَحْ الرُّغَامَ عَنْهَا، وَأَطِبْ مُرَاحَهَا، وَصَلِّ فِي نَاحِيَتِهَا؛ فَإِنَّهَا مِنْ دَوَابِّ الْجَنَّةِ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَيُوشِكُ أَنْ يَأْتِيَ عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ، تَكُونُ الثُّلَّةُ، مِنَ الْغَنَمِ أَحَبَّ إِلَى صَاحِبِهَا مِنْ دَارِ مَرْوَانَ»[2].

واتە: حومەیدی كوڕی مالیكی كوڕی خوثەیم دەگێڕێتەوە دەڵێ: لەگەڵ ئەبو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دانیشتبووین لە زەویەكەی خۆیدا لە عەقیق، جا كۆمەڵێك خەڵك لە مەدینەوە هاتنە لای، بە وڵاخەوە هاتبوون، دابەزین، حومەید دەڵێ: ئەبو هوڕەیرە گوتی: بڕۆ بۆ لای دایكم پێی بڵێ: كوڕەكەت سەلامت لێ دەكات، پێی بڵێ: خواردنێكمان پێ بدە، ئەویش سێ كولێرە لە جۆ، لەگەڵ زەیت و خوێی لەسەر سینیەك دانا، منیش لەسەر سەرم دانا، هەڵمگرت و بردم بۆیان، جا كاتێك لەبەر دەستیانم دانا، ئەبو هوڕەیرە (اللّٰە أكبر)ی كردو گوتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە لە نان تێری كردین دوای ئەوەی پێشتر خواردنی ئێمە تەنها بریتی بوو لە خورماو ئاو، خەڵكەكە شتێكی وایان لە خواردنەكە نەخوارد، جا كاتێك ڕۆیشتن، گوتی: ئەی كوڕی برام

---

(١) صحيح: «الظلال» (٦٢٢)، [مسلم: ٩- كتاب صلاة الاستسقاء، ح ١٣].

(٢) صحيح الإسناد، وجملة الصلاة في مراح الغنم ومسح رغامها وأنه من دواب الجنة، صحيح مرفوعاً، «السلسلة الصحيحة» (١١٢٨).

لەگەڵ مەڕەکانت باشبە، خوڵ و پیسیان لەسەر لابدە، مۆڵگەکەیان پاکبکەوە، لەلایان نوێژ بکە، چونکە ئەوانە ئاژەڵی بەهەشتن، سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە ڕۆژێك دێ پارچەو مێگەلێکی بچووك لە مەڕ خۆشەویستتر دەبێ بە لای خاوەنەکەیەوە لە ماڵی مەڕوانی کوڕی حەکەم (هەر چەندی کاربەدەستێکی گەورەش بێ، واتە: فیتنە ئەوەندە زۆر دەبێت مەڕو ئاژەڵ و خۆ دورخستنەوە بە نرختر دەبن لە کاربەدەستی و سەروەت).

## دەربارەی: وشتر سەربەرزیە بۆ خاوەنەکەی

٤٩٢- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «رَأْسُ الْكُفْرِ نَحْوَ الْمَشْرِقِ، وَالْفَخْرُ وَالْخُيَلَاءُ فِي أَهْلِ الْخَيْلِ وَالإِبِلِ، الْفَدَّادِينَ[١]، أَهْلِ الْوَبَرِ[٢]، وَالسَّكِينَةُ فِي أَهْلِ الْغَنَمِ»»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سەری بێبڕوایی لە لای خۆرهەڵاتەوەیە، شانازی و فیزو خۆ بەزلزانیش لە لای ئەو کەسانەوە دروست دەبێ کە خاوەنی ئەسپ و وشترن، ئەوانەی لە دووسەد بۆ هەزار وشتر یان ئەسپیان هەیە، وە ئارامی و لەسەرخۆیی لە لای ئەو کەسانەیە کە خاوەنی مەڕو بزنن.

٤٩٣- «عَنِ ابْنِ عَبَّاس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: عَجِبْتُ لِلْكِلَابِ وَالشَّاءِ، إِنَّ الشَّاءَ يُذْبَحُ مِنْهَا فِي السَّنَةِ كَذَا وَكَذَا، وَيُهْدَى كَذَا وَكَذَا، وَالْكَلْبُ تَضَعُ الْكَلْبَةُ الْوَاحِدَةُ كَذَا وَكَذَا، وَالشَّاءُ أَكْثَرُ مِنْهَا»[٤].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: سەرم سووڕماوە لە سەگەکان و مەڕەکان، مەڕەکان لە ساڵێکدا ئەوەندەو ئەوەندەیان لێ سەردەبڕدرێ و، ئەوەندەو ئەوەندەیان لێ دەکرێ بە هەدی و قوربانی (واتە: مەڕەکان ژمارەی کەم بێچوویان دەبێ و زۆر سەر دەبڕێن)، سەگێکیش ئەوەندەو ئەوەندە بێچووەی دەبێ (واتە: سەگ بێچووی زۆری دەبێ و سەریش نابڕدرێن)، کەچی هەر مەڕەکان زۆرترن.

٤٩٤- «عَنْ أَبِي ظَبْيَانَ قَالَ: قَالَ لِي عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): يَا أَبَا ظَبْيَانَ، كَمْ عَطَاؤُكَ؟ قُلْتُ: أَلْفَانِ وَخَمْسُمِائَةٍ، قَالَ لَهُ: يَا أَبَا ظَبْيَانَ، اتَّخِذْ مِنَ الْحَرْثِ وَالسَّابْيَاءِ[٥] مِنْ قَبْلِ أَنْ تَلِيَكُمْ غِلْمَةُ قُرَيْشٍ، لَا يُعَدُّ الْعَطَاءُ مَعَهُمْ مَالاً»[٦].

---

(١) الفدادين بالتشديد. جمع الفداد: مالك المئين من الإبل على الألف.

(٢) أهل الوبر هم: الجامعون بين الخيل والإبل والوبر.

(٣) صحيح: [البخاري: ٥٩- كتاب بدء الخلق، ١٥- باب: خير مال المسلم. مسلم: ١- كتاب الإيمان، ح ٨٩].

(٤) صحيح الإسناد.

(٥) يريد الزراعة والنتائج. والسابياء هي النتاج.

(٦) حسن الإسناد.

واتە: ئەبو ظەبیان دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ) پێی گوتم: ئەی باوکی ظەبیان تۆ چەند دەبەخشی؟ ئەویش گوتی: دوو هەزارو پێنج سەد، پێی گوت: باوکی ظەبیان هەوڵبدە کشتوکاڵ بکەیت، پێش ئەوەی مەڕو ماڵاتی قوڕەیش پێتان بگات، بەخشین لەگەڵ ئەواندا بە ماڵ هەژمار ناکرێ.

٤٩٥- «عَنْ شُعْبَةَ، سَمِعْتُ أَبَا إِسْحَاقَ، سَمِعْتُ عَبْدَةَ بْنَ حَزْنٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: تَفَاخَرَ أَهْلُ الْإِبِلِ وَأَصْحَابُ الشَّاءِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «بُعِثَ مُوسَى وَهُوَ رَاعِي غَنَمٍ، وَبُعِثَ دَاوُدُ وَهُوَ رَاعٍ، وَبُعِثْتُ أَنَا وَأَنَا أَرْعَى غَنَماً لِأَهْلِي بِالْأَجْيَادِ»[1].

واتە: شوعبە دەڵێ: گوێم لە ئەبو ئیسحاق بوو دەیگوت: گوێم لە عەبدەی کوڕی حەزن (خوا لێی ڕازی بێ) بوو دەیگوت: خاوەن وشترو خاوەن مەڕەکان دەستیان کرد بە شانازی کردن بەسەر یەکتردا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مووسا ئەو کاتەی کرایە پێغەمبەر شوانی مەڕ بوو، وە داوود کە ڕەوانکرا بە پێغەمبەر شوانی مەڕ بوو، منیش نێردراوم بە پێغەمبەر، لە کاتێکدا شوانی مەڕ بووم بۆ خزمەکانم لە ئەجیاد (واتە: پێغەمبەران کە گەورەترین پلەیان هەیە شوانی مەڕ بوون، ئێوە فیزی چی لێدەدەن بە وشترەکانتان!).

## دەربارەی: مانەوە لەسەر عەقڵیەتی دەشتەکیەت

٤٩٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: الْكَبَائِرُ سَبْعٌ، أَوَّلُهُنَّ: **الْإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَقَتْلُ النَّفْسِ،** وَرَمْيُ الْمُحْصَنَاتِ، وَالْأَعْرَابِيَّةُ بَعْدَ الْهِجْرَةِ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: تاوانە گەورەکان حەوتن، یەکەمیان: هاوبەشدانانە بۆ خوا، وە کوشتنی کەسێك (بە ناهەق)، وە بوختانکردن بە ئافرەتانی داوێن پاك، وە مانەوە لەسەر بۆچوونی ئەعرابیەت دوای کۆچکردن (بۆ لای پێغەمبەر ﷺ).

تێبینی: هەر چەندە ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، فەرموویەتی: حەوتن و، چواری هێناون، بەڵام ئەمە دەقی فەرموودەکەیە کە حەوت گوناهی گەورەی تێدا باسکراون: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ، قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: ١- الشِّرْكُ بِاللَّهِ، ٢- وَالسِّحْرُ، ٣- وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ، ٤- وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، ٥- وَأَكْلُ الرِّبَا، ٦- وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، ٧- وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلاَتِ الْمُؤْمِنَاتِ»[3]. واتە: خۆتان لە حەوت (گوناهە) فەوتێنەرەکان بپارێزن! گوترا:

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣١٦٧) [ليس في شيء من الكتب الستة].

(٢) صحيح هو في حكم المرفوع، وقد روي مرفوعاً نحوه- «السلسلة الصحيحة» (٢٢٤٤).

(٣) أخرجه البُخَارِيُّ: ٢٧٦٦، وَمُسْلِمٌ: ٢٥٨، وَأَبُو دَاوُدَ: ٢٨٧٤، وَالنَّسَائِيُّ: ٣٦٧٣.

ئەوانە چین ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: هاوبەش بۆ خوا دانان، جادوو کردن، بە ناهەق کوشتنی نەفسێك کە خوا قەدەغەی کردوە، خواردنی ماڵ هەتیو، خواردنی سوود، لە کاتی هێرشی دوژمن پشت تێکردنی، بوختانکردن بۆ ئافرەتانی پاکی بێئاگای بڕوادار.

هەر کامێك لەو حەوتانە ئینسان دەفەوتێنێ، واتە: گوناهی گەورەن، وە ئینسان وا لێدەکەن کە شایستەی سزای دۆزەخ بێ، کەچی هەر بە ئیمانداریش لە قەڵەم دەدرێ.

## دەربارەی: دانیشتوانی گوندەکان

٤٩٧- «عَن رَاشِدَ بْنَ سَعْدٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ لِي النَّبِيُّ ﷺ: «يَا ثَوْبَانُ، لاَ تَسْكُنِ الْكُفُورَ[١]، فَإِنَّ سَاكِنَ الْكُفُورِ كَسَاكِنِ الْقُبُورِ»»[٢].

واتە: ڕاشدی کوڕی سەعد دەڵێ: گوێم لە ثەوبان بوو (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: ئەی ثەوبان لە شوێنە دوورەکان نیشتەجێ مەبە، چونکە ئەوانەی لە شوێنە دوورەکانن وەك ئەوانە وان کە لە نێو گۆڕەکاندان (مەبەست لێرەدا ئەوەیە ئەوانەی ماڵیان دوورە لە شار لە زۆر هەواڵ بێ ئاگان).

٤٩٨- «عَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَسْكُنِ الْكُفُورَ، فَإِنَّ سَاكِنَ الْكُفُورِ كَسَاكِنِ الْقُبُورِ»»[٣].

واتە: ثەوبان (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی ثەوبان لە شوێنە دوورەکان نیشتەجێ مەبە، چونکە ئەوانەی لە شوێنە دوورەکانن وەك ئەوانەن کە لە نێو گۆڕەکانن.

## دەربارەی: ئەو دەشتاییانەی ئاویان لێیە

٤٩٩- «عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ شُرَيْحٍ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ عَنِ الْبَدْوِ، قُلْتُ: وَهَلْ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَبْدُو؟ فَقَالَتْ: نَعَمْ، كَانَ يَبْدُو إِلَى هَؤُلاَءِ التِّلاَعِ»[٤].

---

(١) ما بعد من الأرض عن الناس فلا يمر به أحد، يعني القرى النائية عن الأمصار، وعن مجتمع أهل العلم فالجهل عليهم أغلب والبدع إليهم أسرع. «فضل الله الصمد».

(٢) حسن.

(٣) حسن.

(٤) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٢٤).

واتە: میقدامی کوڕی شوڕەیح، لە باوکیەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە کرد لە بارەی دەشتایی، گوتم: ئایا پێغەمبەر ﷺ دەچووە دەشت؟ گوتی: بەڵێ، ئەو دەچووە دەشتی لای ئەو ئاوانە.

## دەربارەی: لەسەرخۆ بوون لە هەموو کارێکدا

۵۰۰- «عَنِ الْحَسَن، أَنَّ رَجُلاً تُوُفِّيَ وَتَرَكَ ابْناً لَهُ وَمَوْلًى لَهُ، فَأَوْصَى مَوْلاَهُ بِابْنِهِ، فَلَمْ يَأْلُوهُ حَتَّى أَدْرَكَ وَزَوَّجَهُ، فَقَالَ لَهُ: جَهِّزْنِي أَطْلُبِ الْعِلْمَ، فَجَهَّزَهُ، فَأَتَى عَالِماً فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: إِذَا أَرَدْتَ أَنْ تَنْطَلِقَ فَقُلْ لِي أُعَلِّمْكَ، فَقَالَ: حَضَرَ مِنِّي الْخُرُوجُ فَعَلِّمْنِي، فَقَالَ: اتَّقِ اللَّهَ وَاصْبِرْ، وَلاَ تَسْتَعْجِلْ. قَالَ الْحَسَنُ: فِي هَذَا الْخَيْرُ كُلُّهُ، فَجَاءَ وَلاَ يَكَادُ يَنْسَاهُنَّ، إِنَّمَا هُنَّ ثَلاَثٌ، فَلَمَّا جَاءَ أَهْلَهُ نَزَلَ عَنْ رَاحِلَتِهِ، فَلَمَّا نَزَلَ الدَّارَ إِذَا هُوَ بِرَجُلٍ نَائِمٍ مُتَرَاخٍ عَنِ الْمَرْأَةِ، وَإِذَا امْرَأَتُهُ نَائِمَةٌ، قَالَ: وَاللَّهِ مَا أُرِيدُ مَا أَنْتَظِرُ بِهَذَا؟ فَرَجَعَ إِلَى رَاحِلَتِهِ، فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يَأْخُذَ السَّيْفَ قَالَ: اتَّقِ اللَّهَ وَاصْبِرْ، وَلَا تَسْتَعْجِلْ. فَرَجَعَ، فَلَمَّا قَامَ عَلَى رَأْسِهِ قَالَ: مَا أَنْتَظِرُ بِهَذَا شَيْئاً، فَرَجَعَ إِلَى رَاحِلَتِهِ، فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يَأْخُذَ سَيْفَهُ ذَكَرَهُ، فَرَجَعَ إِلَيْهِ، فَلَمَّا قَامَ عَلَى رَأْسِهِ اسْتَيْقَظَ الرَّجُلُ، فَلَمَّا رَآهُ وَثَبَ إِلَيْهِ فَعَانَقَهُ وَقَبَّلَهُ، وَسَاءَلَهُ قَالَ: مَا أَصَبْتَ بَعْدِي؟ قَالَ: أَصَبْتُ وَاللَّهِ بَعْدَكَ خَيْراً كَثِيراً، أَصَبْتُ وَاللَّهِ بَعْدَكَ: أَنِّي مَشَيْتُ اللَّيْلَةَ بَيْنَ السَّيْفِ وَبَيْنَ رَأْسِكَ ثَلاَثَ مِرَارٍ، فَحَجَزَنِي مَا أَصَبْتُ مِنَ الْعِلْمِ عَنْ قَتْلِكَ»[۱].

واتە: حەسەن گێڕاویەتیەوە، گوتوویەتی: پیاوێك وەفاتی کردو منداڵێکی و بەندەیەکی دوای خۆی جێهێشت، جا (بەر لە مردنی) وەسێتی بۆ بەندەکەی کرد بەوەی چاوی لە منداڵەکەی بێ، ئەویش کەمتەرخەمی نەکرد (پەروەردەی کرد) تا فامی کردو گەیشتە تەمەنی لاوی و ژنی بۆ هێنا، جا (کوڕەکە) بە بەندەکەی گوت: ئامادەم بکە بە دوای زانستدا دەگەڕێم، ئەویش ئامادەی کرد، جا چوو بۆ لای زانایەك و داوای (زانستی) لێکرد، زاناکەش (دوای ماوەیەك) گوتی: ئەگەر ویستت بڕۆیت (بۆ گەڕانەوە بۆ ماڵەوە) ئەوە پێم بڵێ با (شتێکی گرنگت) فێر بکەم، جا (کوڕەکە) گوتی: کاتی ڕۆیشتنم هاتووەو فێرم بکە، زاناکەش گوتی: لە خوا بترسەو، ئارام بگرەو، پەلە مەکە، حەسەن گوتی: گشت چاکەیەك لەمەدا هەیە، جا هات و نەدەکرا لەبیری بچێتەوە، چونکە تەنها سێ ڕستە بوون، جا کە هاتەوەو گەیشتە لای خێزانەکەی، لە سواریەکەی دابەزی، جا کە چووە ژوورەوە بۆ نێو ماڵەکە بینی پیاوێك خەوتووە تۆزێك لە دووری ئافرەتەکەو، ئافرەتەکەشی خەوتووە، گوتی: سوێند بە خوا نامەوێ بۆچی چاوەڕوانی ئەوە بکەم (با بیکوژم)؟ گەڕایەوە لای وڵاخەکەی (تا شمشێرەکەی بێنێ)، جا کاتێك ویستی شمشێرەکەی هەڵبگرێ، (لە دڵی خۆی قسەی زاناکەی هەر لە یادبوو، بە خۆی) گوت: لە خوا بترسەو، ئارامبگرە، پەلە

---

(۱) حسن الإسناد.

مەکە، جا گەڕایەوە (بۆ لای پیاوەکە)، کاتێك وەستا لەسەر سەری، گوتی: هەرگیز چاوەڕێی ئەوە ناکەم (دەیکوژم با شمشێرەکەم بێنم)، جا گەڕایەوە لای وڵاخەکەی، کاتێك ویستی شمشێرەکەی هەڵبگرێ، قسەکەی هێنایەوە یادو گەڕایەوە، کاتێك وەستا لە لای سەری پیاوەکە، پیاوەکە لە خەو هەڵسا (دەرکەوت بەندەکە بوو کە پەروەردەی کردبوو و ژنی بۆ هێنابوو و بۆ زانست ڕەوانەی کردبوو)، جا کاتێك (خزمەتکارەکە کوڕەکەی) بینی خۆی بۆ هەڵداو کردیە باوەشی و ماچی کرد، پرسیاری لێکرد، لە دوای من چیت دەستکەوت؟ گوتی: سوێند بە خوا لە دوای تۆ خێرێکی زۆرم دەستکەوت، سوێند بە خوا من ئەوەم دەستکەوت کە ئەمشەو سێ جار لە نێوان شمشێرو سەری تۆدا دەهاتم و دەچووم (زۆری نەمابوو بتکوژم)، ئەو زانستەی کە من بەدەستم هێنا ڕێگری لێکردم لە کوشتنی تۆ.

## دەربارەی: لەسەرخۆیی لە ئیش و کاردا

٥٠١- «عَنْ أَشَجِّ عَبْدِ الْقَيْسِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ لِيَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ فِيكَ لَخُلُقَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ»، قُلْتُ: وَمَا هُمَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «الْحِلْمُ وَالْحَيَاءُ»، قُلْتُ: قَدِيماً كَانَ أَوْ حَدِيثاً؟ قَالَ: «قَدِيماً»، قُلْتُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَبَلَنِي عَلَى خُلُقَيْنِ أَحَبَّهُمَا اللَّهُ»[1].

واتە: ئەشەجی عەبدولقەیس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: بە ڕاستی دوو سیفەتت تێدان خوا خۆشی دەوێن، گوتم: کامانەن ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: هێدیی و مەندی و بە شەرم و حەیایی، گوتم: هەر لە سەرەتاوە خوا کە دروستی کردووم وا بووم، یان دواتر تێمدا پەیدابوون؟ فەرمووی: هەر لە سەرەتاوە خوا وای دروست کردووی، گوتم: سوپاس و ستایش بۆ ئەو زاتەی کە لەسەر دوو سیفەت دروستی کردووم کە خۆشی دەوێن.

٥٠٢- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِأَشَجِّ عَبْدِ الْقَيْسِ: «إِنَّ فِيكَ لَخَصْلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ: الْحِلْمُ وَالْأَنَاةُ»»[2].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە ئەشەجی عەبدولقەیسی فەرموو: بەڕاستی دوو سیفەتت تێدان، خوا خۆشی دەوێن: هێدیی و مەندیی و نەرم و نیانی.

٥٠٣- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِلْأَشَجِّ أَشَجِّ عَبْدِ الْقَيْسِ: «إِنَّ فِيكَ لَخَصْلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ: الْحِلْمُ وَالْأَنَاةُ»»[3].

---

(١) صحيح: «الظلال» (١٩٠/٨٤/١) [ليس في شيء من الكتب الستة].

(٢) صحيح: «الظلال» أيضاً، «المشكاة» (٥٠٥٤/٦٢٥/٢/التحقيق الثاني) [مسلم: ١- كتاب الإيمان، ح ٢٦].

(٣) صحيح: «الظلال» أيضاً: [مسلم: ١- كتاب الإيمان، ح ٢٥].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە ئەشەجی عەبدولقەیسی فەرموو: بەڕاستی دوو سیفەتت تێدان، خوا خۆشی دەوێن: هێدیی و مەندیی و نەرم و نیانی.

## دەربارەی: ستەم و دەستدرێژیی کردن

٥٠٤- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، قَالَ: لَوْ أَنَّ جَبَلاً بَغَى عَلَى جَبَلٍ لَدُكَّ الْبَاغِي»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: ئەگەر چیایەك ستەم لە چیایەكی دیكە بكات، ئەوە ئەو چیایەی كە ستەمی كردوە، وردو خاش دەكرێ.

٥٠٥- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «احْتَجَّتِ النَّارُ: يَدْخُلُنِي الْمُتَكَبِّرُونَ وَالْمُتَجَبِّرُونَ، وَقَالَتِ الْجَنَّةُ: لاَ يَدْخُلُنِي إِلاَّ الضُّعَفَاءُ الْمَسَاكِينُ. فَقَالَ لِلنَّارِ: أَنْتِ عَذَابِي، أَنْتَقِمُ بِكِ مِمَّنْ شِئْتُ، وَقَالَ لِلْجَنَّةِ: أَنْتِ رَحْمَتِي أَرْحَمُ بِكِ مَنْ شِئْتُ»»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ، كە فەرموویەتی: بەهەشت و دۆزەخ بووە گفتوگۆیان، ئاگر گوتی: ئەوانەی دەسەڵاتدارو خۆبەزلزان و ستەمكارن دێنە نێو منەوە، بەهەشتیش گوتی: هیچ كەس نایێتە نێو منەوە جگە لە لاوازو هەژارەكان، جا (خوا) بە ئاگری فەرموو: تۆ سزای منی، بە هۆی تۆوە تۆڵە دەسێنم لە هەر كەسێك كە بمەوێ، وە بە بەهەشتیشی فەرموو: تۆ میهرەبانیی منی، بە هۆی تۆوە بەزەیی دەنوێنم بە هەر كەسێك كە بمەوێ.**

٥٠٦- «عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «ثَلاَثَةٌ لاَ يُسْأَلُ عَنْهُمْ: رَجُلٌ فَارَقَ الْجَمَاعَةَ وَعَصَى إِمَامَهُ فَمَاتَ عَاصِياً، فَلاَ تَسْأَلْ عَنْهُ، وَأَمَةٌ أَوْ عَبْدٌ أَبِقَ مِنْ سَيِّدِهِ، وَامْرَأَةٌ غَابَ زَوْجُهَا، وَكَفَاهَا مُؤْونَةَ الدُّنْيَا فَتَبَرَّجَتْ وَتَمَرَّجَتْ بَعْدَهُ. وَثَلاَثَةٌ لاَ يُسْأَلُ عَنْهُمْ: رَجُلٌ نَازَعَ اللَّهَ رِدَاءَهُ، فَإِنَّ رِدَاءَهُ الْكِبْرِيَاءُ، وَإِزَارَهُ عِزَّهُ، وَرَجُلٌ شَكَّ فِي أَمْرِ اللَّهِ، وَالْقُنُوطُ مِنْ رَحْمَةِ اللَّهِ»»[٣].

**واتە: فوزاڵەی كوڕی عوبەید (خوا لێی ڕازی بێ)، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: سێ كەس هەن پرسیاریان لەبارەوە ناكرێ (بە دڵنیایی دەبێ بزانرێ تووشی لەنێوچوون بوون): پیاوێك جیابووبێتەوە لە كۆمەڵ (ی مسوڵمانان)و سەرپێچی پێشەوایەكەی كردبێ و، بە سەرپێچیەوە مردبێ، ئا ئەو كەسە پرسیاری لەبارەوە مەكە، وە كەنیزەكێك یان كۆیلەیەك لە دەست گەورەكەی ڕایكردبێ، وە ئافرەتێك مێردەكەی لە لای نەبێ و، مێردەكەی هەموو خەرجیەكانی بۆ دابین كردبێ، ئەویش لەش و لاری خۆی دەربخات و پۆشاكی ڕووت بكاتە بەری لە دوای (ڕۆیشتنی) مێردەكەی،**

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٤٢): [ليس في شيء من الكتب الستة].

هەروەها سێ کەسی دیکەش هەن پرسیاریان لە بارەوە ناکرێ (دڵنیابن ئەوانیش تووشی لەناوچوون بوون): پیاوێك خۆ بە گەورەزان بێ و کیبرکێ لەگەڵ خوا بکات لەم سیفەتەدا، لە کاتێکدا خۆبەزلزانی تایبەتە بە خوا، هەروەك چۆن بەدەسەڵاتی تایبەتە بە ئەو، هەروەها پیاوێك گومانی لە فەرمانی خواو ئاینی خوا هەبێ، هەروەها نائومێد بوون لە ڕەحم و میهرەبانی خوا.

٥٠٧- «عَنْ بَكَّارِ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كُلُّ ذُنُوبٍ يُؤَخِّرُ اللَّهُ مِنْهَا مَا شَاءَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، إِلَّا الْبَغْيَ، وَعُقُوقَ الْوَالِدَيْنِ، أَوْ قَطِيعَةَ الرَّحِمِ، يُعَجِّلُ لِصَاحِبِهَا فِي الدُّنْيَا قَبْلَ الْمَوْتِ»»[1].

واتە: بەککاری کوڕی عەبدولعەزیز لە باوکی و باپیریەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەموو گوناهێك ئەگەر خوا بیەوێ ئەوە سزاکەی دوادەخات تا ڕۆژی دوایی، جگە لە دەستدرێژیی و ئەزیەتدانی دایك و باوك، یان پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی، خوا سزاکەی بۆ خاوەنەکەی لە دونیا دێنێتە پێش، بەر لە مردن.

٥٠٨- «عَنْ يَزِيدَ بْنِ الْأَصَمِّ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: يُبْصِرُ أَحَدُكُمُ الْقَذَاةَ فِي عَيْنِ أَخِيهِ، وَيَنْسَى الْجِذْلَ «أَوِ الْجِذْعَ» فِي عَيْنِ نَفْسِهِ»[2].

واتە: یەزیدی کوڕی ئەصەم دەڵێ: گوێم لە ئەبو هوڕەیرە بوو (خوا لێی ڕازی بێ) دەیگوت: یەکێك لە ئێوە پوشکە لە چاوی براکەی دەبینێ، کاریتەش لە چاوی خۆی لە بیر دەکات و نایبینێ.

٥٠٩- «عَنْ مُعَاوِيَةُ بْنُ قُرَّةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كُنْتُ مَعَ مَعْقِلٍ الْمُزَنِيِّ، فَأَمَاطَ أَذًى عَنِ الطَّرِيقِ، فَرَأَيْتُ شَيْئاً فَبَادَرْتُهُ، فَقَالَ: مَا حَمَلَكَ عَلَى مَا صَنَعْتَ يَا ابْنَ أَخِي؟ قَالَ: رَأَيْتُكَ تَصْنَعُ شَيْئاً فَصَنَعْتُهُ، قَالَ: أَحْسَنْتَ يَا ابْنَ أَخِي، سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ أَمَاطَ أَذًى عَنْ طَرِيقِ الْمُسْلِمِينَ كُتِبَ لَهُ حَسَنَةٌ، وَمَنْ تُقُبِّلَتْ لَهُ حَسَنَةٌ دَخَلَ الْجَنَّةَ»»[3].

واتە: موعاویەی کوڕی قوڕڕە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: لەگەڵ مەعقیلی موزەنی بووم، جا شتێکی بە ئازاری لە ڕێگەدا لابرد، منیش شتێکی دیکەم بینی دەستپێشخەریم کرد بۆ لابردنی، جا (مەعقیل) پێی گوتم: چ شتێك وای لێکردی وا بکەی ئەی برازا؟ گوتی: تۆم بینی کارێکی وات کردو منیش وام کرد، گوتی: ئەی برازای خۆم، کارێکی باشت کرد، من لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: هەر کەسێك ئازارێك لەسەر ڕێگەی مسوڵمانان لابەرێ چاکەیەکی بۆ دەنووسرێ، وە هەر کەسێکیش چاکەیەکی لێ قبووڵ بکرێ، دەچێتە بەهەشت.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٩١٨): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٤٣- باب: في النهي عن البغي. الترمذي: ٣٥- كتاب صفة القيامة، ٥٧- باب: حدثنا علي بن حجر].

(٢) صحيح موقوفاً: «السلسلة الصحيحة» (٣٣).

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٣٠٦).

## دەربارەی: قبووڵ کردنی خەڵات و دیاری

٥١٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ يَقُولُ: «تَهَادُوا تَحَابُّوا»»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: دیاری و خەڵات بدەن بە یەکتر، خۆشەویست دەبن لە لای یەکتری.**

٥١١- «عَنْ ثَابِتٍ قَالَ: كَانَ أَنَسٌ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: يَا بَنِيَّ، تَبَاذَلُوا بَيْنَكُمْ، فَإِنَّهُ أَوَدُّ لِمَا بَيْنَكُمْ»[٢].

**واتە: سابیت دەڵێ: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەیگوت: ئەی ڕۆڵەکانم! شت ببەخشن لە نێو خۆتاندا، بە دڵنیایی خۆشەویستی نێوانتان زیاتر دەکات.**

## دەربارەی: ئەوەی دیاری وەرناگرێ لەو شتانەی تووڕەیی لە نێو خەڵکی دروست دەکات

٥١٢- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أَهْدَى رَجُلٌ مِنْ بَنِي فَزَارَةَ لِلنَّبِيِّ ﷺ نَاقَةً، فَعَوَّضَهُ، فَتَسَخَّطَهُ، فَسَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ، يَقُولُ: «يَهْدِي أَحَدُهُمْ فَأُعَوِّضُهُ بِقَدْرِ مَا عِنْدِي، ثُمَّ يَسْخَطُهُ وَايْمُ اللَّهِ، لَا أَقْبَلُ بَعْدَ عَامِي هَذَا مِنَ الْعَرَبِ هَدِيَّةً إِلَّا مِنْ قُرَشِيٍّ، أَوْ أَنْصَارِيٍّ، أَوْ ثَقَفِيٍّ، أَوْ دَوْسِيٍّ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك لە بەنی فەزارە وشترێکی بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش خەڵاتێکی دیکەی پێداو، (کابرا) تووڕەبوو (لەبەر ئەوەی خەڵات و دیاریەکەی پێغەمبەری ﷺ پێ کەم بوو، چونکە بیستبووی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر سەخی و دەستکراوەیە، خەیاڵی زیاتر لەوەی کردبوو)، جا گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ لەسەر مینبەر دەیفەرموو: یەکێکیان دیاری دێنێ، پاشان منیش بۆی قەرەبوو دەکەمەوە بە پێی ئەوەی کە لەلام هەیە (بە گوێرەی توانا)، پاشان تووڕە دەبێ!، سوێند بە خوا، لەم ساڵ بە دواوە دیاری و خەڵات لە عەرەب وەرناگرم، جگە لە قورەیش و، ئەنصارەکان و، سەقەفیەکان و، دەوسیەکان.**

---

(١) صحيح: «الإرواء» (١٦٠١) [ليس في شيء من الكتب الستة].

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٦٨٤): [الترمذي: ٤٦- كتاب المناقب، ٧٣- باب: في ثقيف وبني حنيفة].

## دەربارەی: شەرم و حەیا

٥١٣- «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ عُقْبَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسَ مِنْ كَلَامِ النُّبُوَّةِ: إِذَا لَمْ تَسْتَحِ فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ»[١].

**واته ئەبو مەسعوود كە عوقبەیە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە ڕاستیدا یەكێك لەو شتانەی خەڵك پێی گەیشتووە لە قسەی پێغەمبەرەكان ئەمەیە: ئەگەر شەرمت نەكرد چیت دەوێ بیكە (واتە: كە مرۆڤ شەرمی نەما لە هیچ شتێكی ناڕەوا سڵ ناكاتەوە).**

٥١٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الإِيمَانُ بِضْعٌ وَسِتُّونَ، أَوْ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ شُعْبَةً، أَفْضَلُهَا: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الْأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الْإِيمَانِ»»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئیمان شەست و ئەوەندە، یان حەفتاو ئەوەندە بەشەیە، باشترین و گەورەترینی (ئەوەیە بگوترێ): هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە خوا، وە نزمترینی (بریتیە لە) لابردنی ئازارێك لەسەر ڕێگەدا، وە شەرم و حەیا بەشێكە لە ئیمان.**

٥١٥- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ مَوْلَى أَنَسٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَشَدَّ حَيَاءً مِنَ الْعَذْرَاءِ فِي خِدْرِهَا، وَكَانَ إِذَا كَرِهَ شَيْئاً عَرَفْنَاهُ فِي وَجْهِهِ»[٣].

**واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عوبەیدوڵڵا كە خزمەتكاری ئەنەس بوو، دەڵێ: گوێم لە ئەبو سەعید بوو (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ زۆر بە شەرمتر بوو لە كچێكی تازە پێگەیشتووی بە شەرمی كونجیماڵەوە، وە كاتێك شتێكی پێ ناخۆش بووایە، لە ڕووخساریەوە دەمانزانی (لەبەر زۆر بە شەرمی دەری نەدەبڕی).**

٥١٦- «عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي يَحْيَى بْنُ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ، أَنَّ سَعِيدَ بْنَ الْعَاصِ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عُثْمَانَ وَعَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، حَدَّثَاهُ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ اسْتَأْذَنَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَهُوَ مُضْطَجِعٌ عَلَى فِرَاشِ عَائِشَةَ لَابِساً مِرْطَ عَائِشَةَ، فَأَذِنَ لِأَبِي بَكْرٍ وَهُوَ كَذَلِكَ، فَقَضَى إِلَيْهِ حَاجَتَهُ، ثُمَّ انْصَرَفَ. ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، فَأَذِنَ لَهُ وَهُوَ كَذَلِكَ، فَقَضَى إِلَيْهِ حَاجَتَهُ، ثُمَّ انْصَرَفَ. قَالَ عُثْمَانُ:

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٦٨٤)، «الإرواء» (٢٦٧٣): [البخاري: ٦٠- كتاب الأنبياء، ٥٤- باب: حدثنا أبو اليمان].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٧٦٩) ولفظ: «سبعون» أصح، [البخاري: كتاب ٢- كتاب الإيمان، ٣- باب: أمور الإيمان. مسلم: ١- كتاب الإيمان، ح ٥٧، ٥٨].

(٣) صحيح: «مختصر الشمائل» (٣٠٧): [البخاري: ٦١- كتاب المناقب، ٢٣- باب: صفة النبي ﷺ مسلم: ٤٣- كتاب الفضائل، ح ٦٧].

ثُمَّ اسْتَأْذَنْتُ عَلَيْهِ، فَجَلَسَ وَقَالَ لِعَائِشَةَ: اجْمَعِي إِلَيْكِ ثِيَابَكِ، قَالَ: فَقَضَيْتُ إِلَيْهِ حَاجَتِي، ثُمَّ انْصَرَفْتُ، قَالَ: فَقَالَتْ عَائِشَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَمْ أَرَكَ فَزِعْتَ لِأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا كَمَا فَزِعْتَ لِعُثْمَانَ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ عُثْمَانَ رَجُلٌ حَيِيٌّ، وَإِنِّي خَشِيتُ إِنْ أَذِنْتُ لَهُ، وَأَنَا عَلَى تِلْكَ الْحَالِ، أَنْ لَا يَبْلُغَ إِلَيَّ فِي حَاجَتِهِ»»[١].

**واتە: ئیبنو شیهاب دەڵێ: یەحیای کوڕی سەعیدی کوڕی عاص دەگێڕێتەوە، کە سەعیدی کوڕی عاص پێی ڕاگەیاندووە، عوسمان و عائیشە (خوا لێیان ڕازی بێ)، بۆیان گێڕاوەتەوە کە (ڕۆژێکیان) ئەبو بەکر داوای هاتنە ژوورەوەی کرد لە پێغەمبەر ﷺ، لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ لەسەر جێگای عائیشە بوو، پەشتەماڵێکی عائیشەی لەبەرکردبوو، جا ڕێگەیدا ئەبو بەکر بێتە لای، لە کاتێکدا هەر بەم شێوەیە پاڵکەوتبوو، پێویستیەکەی ئەبو بەکری جێبەجێکرد، پاشان (ئەبو بەکر) ڕۆیشت، ئنجا عومەر هات داوای هاتنە ژووری کرد، ڕێگەیدا، لە کاتێکدا هەر بەم شێوەیە پاڵکەوتبوو، پێویستیەکەی عومەری جێبەجێکرد، پاشان (عومەریش) ڕۆیشت، عوسمان دەڵێ: ئنجا من داوای چوونە ژوورم کرد، پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو و بە عائیشەی فەرموو: پۆشاکەکەت کۆبکەوە (جا بە ڕێك و ڕاستی دانیشت)، عوسمان دەڵێ: پێویستیەکەم لە لای باسکردو ڕۆیشتم، عائیشە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من تۆم نەبینی، هیچ جووڵەیەك بکەیت بۆ ئەبو بەکرو عومەر، هەروەك بۆ عوسمان کردت؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: عوسمان پیاوێکی زۆر بە شەرمە، ترسام لەوەی کە ئەگەر بەم شێوەیە من ببینێ، نەتوانێ پێویستیەکەی لە لام باس بکات لە شەرمان، بە شێوەیەك ئەوەی پێویستیەتی بەدەستی نەهێنێ.**

٥١٧- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا كَانَ الْحَيَاءُ فِي شَيْءٍ إِلَّا زَانَهُ، وَلَا كَانَ الْفُحْشُ فِي شَيْءٍ إِلاَّ شَانَهُ»»[٢].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: شەرم و حەیا لە هەر شتێکدا هەبێ حەتمەن جوانی دەکات، وە بێ شەرمی و بێ ڕێزی لە هەر شتێکدا هەبێ حەتمەن ناشرینی دەکات.**

٥١٨- «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ بِرَجُلٍ يَعِظُ أَخَاهُ فِي الْحَيَاءِ، فَقَالَ: «دَعْهُ، فَإِنَّ الْحَيَاءَ مِنَ الْإِيمَانِ»»[٣].

**واتە: سالم، لە باوکی (خوا لێی ڕازی بێ) گێڕاویەتیەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە لای پیاوێکدا تێپەڕی، لەکاتێکدا ئامۆژگاری برایەکەی دەکرد بەوەی هێندە بە شەرم و حەیا نەبێ، (بۆیە پێغەمبەر ﷺ) پێی فەرموو: وازی لێ بێنە، بەڕاستی شەرم و حەیا لە ئیمانەوەیە.**

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٦٨٧): [مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ٣٦، ٣٧].

(٢) صحيح: «تخريج المشكاة» (٤٨٥٤): [الترمذي: ٢٥- كتاب البر، ٤٧- ما جاء في الفحش والتفحش. إبن ماجه ٣٧- كتاب الزهد، ١٧- باب: الحياء، ح ٤١٨٥].

(٣) صحيح: «الروض النضير» (٥١٣): [البخاري: ٢- كتاب الإيمان، ١٦- باب: الحياء. مسلم: ١- كتاب الإيمان، ح ٥٩].

٥١٩- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى رَجُلٍ يُعَاتِبُ أَخَاهُ فِي الْحَيَاءِ، كَأَنَّهُ يَقُولُ: أَضَرَّ بِكَ، فَقَالَ: «دَعْهُ، فَإِنَّ الْحَيَاءَ مِنَ الْإِيمَانِ»»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە لای پیاوێكدا ڕۆیشت كە سەرزەنشتی براكەی دەكرد لەسەر بەشەرم و حەیایی، وەك ئەوەی پێی بڵێ: ئەوە زیانت پێدەگەیەنێ، (بۆیە پێغەمبەر ﷺ) پێی فەرموو: وازی لێ بێنە، بەڕاستی شەرم و حەیا لە ئیمانەوەیە.**

٥٢٠- «عَنْ سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، أَنَّ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ مُضْطَجِعاً فِي بَيْتِي، كَاشِفاً عَنْ فَخِذِهِ أَوْ سَاقَيْهِ، فَاسْتَأْذَنَ أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، فَأَذِنَ لَهُ كَذَلِكَ، فَتَحَدَّثَ، ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُمَرُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، فَأَذِنَ لَهُ كَذَلِكَ، ثُمَّ تَحَدَّثَ، ثُمَّ اسْتَأْذَنَ عُثْمَانُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، فَجَلَسَ النَّبِيُّ ﷺ وَسَوَّى ثِيَابَهُ، قَالَ مُحَمَّدٌ: وَلَا أَقُولُ فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ» فَدَخَلَ فَتَحَدَّثَ، فَلَمَّا خَرَجَ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ فَلَمْ تَهَشَّ وَلَمْ تُبَالِهِ، ثُمَّ دَخَلَ عُمَرُ فَلَمْ تَهَشَّ وَلَمْ تُبَالِهِ، ثُمَّ دَخَلَ عُثْمَانُ فَجَلَسْتَ وَسَوَّيْتَ ثِيَابَكَ؟ قَالَ: «أَلَا أَسْتَحِي مِنْ رَجُلٍ تَسْتَحِي مِنْهُ الْمَلَائِكَةُ؟»»[٢].

**واتە: سەلەمەی كوڕی عەبدوڕڕەحمان دەگێڕێتەوە، كە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژوورەكەی مندا درێژ ببوو، لە كاتێكدا ڕانی، یان دوو قاچەكانی هەڵكردبوو، ئەبو بەكر داوای مۆڵەتی كرد كە بێتە ژوورەوە، ئەویش بەم شێوەیە ڕێگەیدا بێتە ژوورەوەو، قسەی لەگەڵدا كرد، پاشان عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، هات، داوای مۆڵەتی كرد، ئەویش ڕێگەیدا بە هەمان شێوە بێـتە ژوورەوە (لەسەر هەمان حاڵ بوو)، ئنجا قسەی لەگەڵدا كرد، پاشان عوسمان (خوا لێی ڕازی بێ)، داوای مۆڵەتی كرد، پێغەمبەر ﷺ ڕێك دانیشت و پۆشاكەكەی ڕێكخست و ڕانی داپۆشی، عوسمان هات، قسەی لەگەڵدا كرد، جا كاتێك چووە دەرەوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو بەكر هاتە ژوورەوە پۆشاكت بەخۆتدا نەداو گوێت پێ نەدا، دواتر عومەر هاتە ژوورەوە پۆشاكت بەخۆتدا نەداو گوێت پێ نەدا، بەڵام كاتێك عوسمان هاتە ژوورەوە (ڕێك) دانیشتی و پۆشاكەكەت ڕێكخست؟ فەرمووی: ئایا شەرم نەكەم لە پیاوێك، كە فریشتەكان شەرمی لێدەكەن؟!.**

## دەربارەی: ئەو كەسەی داوا لە غەیری خۆی دەكات، دوعای بۆ بكات

٥٢١- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الْكَرِيمَ ابْنَ الْكَرِيمِ ابْنِ الْكَرِيمِ ابْنِ الْكَرِيمِ، يُوسُفُ بْنُ يَعْقُوبَ بْنِ إِسْحَاقَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلِ الرَّحْمَنِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى»، قَالَ:

---

(١) صحيح: «الروض النضير» (٥١٣): [البخاري: ٢- كتاب الإيمان،١٦- باب: الحياء. مسلم: ١- كتاب الإيمان، ح ٥٩].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٦٨٧).

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ لَبِثْتُ فِي السِّجْنِ مَا لَبِثَ يُوسُفُ، ثُمَّ جَاءَنِي الدَّاعِي لَأَجَبْتُ، إِذْ جَاءَهُ الرَّسُولُ فَقَالَ: ﴿ ٱرْجِعْ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسْـَٔلْهُ مَا بَالُ ٱلنِّسْوَةِ ٱلَّٰتِى قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ إِنَّ رَبِّى بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ ﴿٥٠﴾ ﴾يوسف، وَرَحْمَةُ اللَّهِ عَلَى لُوطٍ، إِنْ كَانَ لَيَأْوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ، إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ: ﴿ قَالَ لَوْ أَنَّ لِى بِكُمْ قُوَّةً أَوْ ءَاوِىٓ إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ ﴿٨٠﴾ ﴾هود، فَمَا بَعَثَ اللَّهُ بَعْدَهُ مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ فِي ثَرْوَةٍ مِنْ قَوْمِهِ»»[١].

**واته: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕێزی کوڕی بەڕێزی کوڕی بەڕێزی کوڕی بەڕێز، یوسفی کوڕی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی خەلیل و دۆستی خوایە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر من لە بەندیخانە بمابامەوە ئەوەندەی یوسف مایەوە، دواتر بانگکەرەکە بهاتبایە بۆ لام ئەوە وەڵامم دەدایەوە، کاتێ نێردراوەکە هات بۆ لای گوتی: ﴿ ٱرْجِعْ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسْـَٔلْهُ مَا بَالُ ٱلنِّسْوَةِ ٱلَّٰتِى قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ إِنَّ رَبِّى بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ ﴿٥٠﴾ ﴾يوسف، واتە: (يوسف عليه السلام بە نێردراوەکەی گوت): بگەڕێوە بۆ لای گەورەکەت، پرسیاری لێ بکە: ئەو ئافرەتانە هەواڵیان بە چی گەیشت، کاتێك کە دەستی خۆیان بڕی، بێگومان خوا بە فێڵی ئەوان دەزانێ، (وە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی) وە ڕەحمەتی خوا لە (پێغەمبەر) لووط بێ، کە پەنای بۆ پەنایەکی بەهێز برد بوو، (کە خوای پەروەردگارە)، کاتێك کە بە گەلەکەی گوت: ﴿ قَالَ لَوْ أَنَّ لِى بِكُمْ قُوَّةً أَوْ ءَاوِىٓ إِلَىٰ رُكْنٍ شَدِيدٍ ﴿٨٠﴾ ﴾هود، (واتە: لووط گوتی: خۆزگە هێزێکم دەبوو (بۆ بەرەنگاربوونەوەی ناپاکەکانتان) یان پەنا دەبەم بۆ پەناگەیەکی بەهێز. جا خوا هیچ پێغەمبەرێکی نەنارد دوای ئەو حەتمەن (ناردوویەتی) لە نێو ژمارەیەکی زۆری قەومەکەی (تا پشت ئەستوور بێ).**

## دەربارەی: دوعاو پاڕانەوەی پاك و بژارکراو

٥٢٢- «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: كَانَ الرَّبِيعُ يَأْتِي عَلْقَمَةَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَإِذَا لَمْ أَكُنْ ثَمَّةَ أرسَلُوا إِلَيْهِ، فَجَاءَ مَرَّةً وَلَسْتُ ثَمَّةَ، فَلَقِيَنِي عَلْقَمَةُ وَقَالَ لِي: أَلَمْ تَرَ مَا جَاءَ بِهِ الرَّبِيعُ؟ قَالَ: أَلَمْ تَرَ أَكْثَرَ مَا يَدْعُو النَّاسَ، وَمَا أَقَلَّ إِجَابَتَهُمْ؟ وَذَلِكَ إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَا يَقْبَلُ إِلَّا النَّاخِلَةَ مِنَ الدُّعَاءِ. قُلْتُ: أَوَ لَيْسَ قَدْ قَالَ ذَلِكَ عَبْدُ اللَّهِ؟ قَالَ: وَمَا قَالَ؟ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَا يَسْمَعُ اللَّهُ مِنْ مُسْمِعٍ، وَلاَ مُرَاءٍ، وَلَا لَاعِبٍ، إِلَّا داعٍ دَعَا يثبُتُ مِنْ قَلْبِهِ، قَالَ فَذَكَرَ عَلْقَمَةَ؟ قَالَ: نَعَمْ»[٢].

---

(١) حسن صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٦١٧): [البخاري: ٦٥- كتاب التفسير، ١٢- باب: سورة يوسف ٥- باب: فلما جاءه الرسول. مسلم: ٤٣- كتاب الفضائل، ح١٥٢].

(٢) صحيح الإسناد.

واتە: عەبدورڕەحمانی کوڕی زەید دەڵێ: ڕەبیع لە ڕۆژی جومعەدا دەهاتە لای عەلقەمە، (منیش دەچوومە لای، جا) ئەگەر من لەوێ نەبوومایە کەسێکیان بە دوامدا دەنارد، (جا جارێکیان) من لەوێ نەبووم، عەلقەمەش هات و منیش نەچوبووم بۆ ئەوێ، جا پێم گەیشت و، پێی گوتم: نەتبینیوە ڕەبیع چی هێناوەو (چی دەکات)؟ گوتی: مەگەر نابینی کە چەندە زۆر خەڵکی بانگ دەکات و خەڵکیش چەندە کەم بەدەمیەوە دەچن؟ ئەوەش لەبەر ئەوەیە خوای (عَزَّ وَجَلَّ) هیچ شتێك قبووڵ ناکات جگە لە شتی پاك و نیەتی پاك، منیش گوتم: ئایا ئەوە قسەی عەبدوڵلا نیەو عەبدوڵلا نەیگوتووە؟ گوتی: چی گوتووە؟ گوتم: عەبدوڵلا گوتوویەتی: خوا وەڵامی ئەو کەسە ناداتەوەو کارەکانی لێ قبووڵ ناکات کە مەبەستی ئەوە بێ خەڵك گوێیان لە ناوبانگی بێ، وە (لەو کەسەش قبووڵ ناکات) کە ڕیابازە، وە (لەو کەسەش قبووڵ ناکات) کە گاڵتەکارە (دین و ژین بە گاڵتە وەردەگرێ)، بەڵکو تەنها لەو کەسە قبووڵ دەکات کە پڕ بە دڵی و بە ڕاستگۆیی دەپاڕێتەوە. جا عەلقەمەش بیری کەوتەوەو گوتی: بەڵێ وایە (ئەمە قسەی عەبدوڵلایە).

## دەربارەی: سوور بوون لە پاڕانەوە، کەس بۆی نیە زۆر لە خوا بکات[1]

٥٢٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا دَعَا أَحَدُكُمْ فَلَا يَقُولُ: إِنْ شِئْتَ، وَلْيَعْزِمِ الْمَسْأَلَةَ، وَلْيُعَظِّمِ الرَّغْبَةَ، فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يَعْظُمُ عَلَيْهِ شَيْءٌ أَعْطَاهُ»»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە دوعای کرد، ئەوە با نەڵێ: (خوایە ئەوەم بۆ بکە) ئەگەر دەتەوێ، بەڵکو با زۆر پێدابگرێ لە داواکردندا، وە با ئارەزووی گەورە بکات، چونکە خوا هیچ شتێکی لە لا گەورەو سەخت نیە، پێی دەبەخشێت.

٥٢٤- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا دَعَا أَحَدُكُمْ فَلْيَعْزِمْ فِي الدُّعَاءِ، وَلَا يَقُلِ: اللَّهُمَّ إِنْ شِئْتَ فَأَعْطِنِي، فَإِنَّ اللَّهَ لَا مُسْتَكْرِهَ لَهُ»»[3].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە دوعای کرد، ئەوە با پێداگرو سوور بێ لەسەر داواکەی، وە نەڵێ: خوایە ئەگەر دەتەوێ و پێت

---

(١) واتە مەڵێن خوایە ئەو شتەمان بۆ دەکەی؟ بەڵکو بڵێن بۆمان بکە، ئەویش ئەگەر بۆتان بکات هەر بە ویست و ئارەزووی خۆی بۆتان دەکات.

(٢) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٣٢٣): [البخاري: ٨٠- كتاب الدعوات، ٢١- باب: ليعزم المسألة. مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء، ح ٨و ٩].

(٣) صحيح: «صحيح الجامع» (٥٣١): [البخاري: ٨٠- كتاب الدعوات، ٢١- باب: ليعزم المسألة. مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء، ح ٧].

خۆشه پێم ببەخشه (ئەگەرنا نا)، چونكه خوا هەرگیز ناتوانرێ به تۆبزی شتی لێوەربگیرێ (هەر به ویستی خۆی دەیدا، بەڵام ئێوه ئەوه دەرمەبڕن، چونكه ساردوسڕی تیایه له داواكردندا، خواش گەرموگوڕی پێ خۆشه).

## دەربارەی: بەرزكردنەوەی دەستەكان له كاتی پاڕانەوە

٥٢٥- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها)، أَنَّهَا رَأَتِ النَّبِيَّ ﷺ يَدْعُو رَافِعاً يَدَيْهِ، يَقُولُ: «إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ فَلَا تُعَاقِبْنِي، أَيُّمَا رَجُلٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ آذَيْتُهُ أَوْ شَتَمْتُهُ فَلَا تُعَاقِبْنِي فِيهِ»»[١].

واته: عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە كه پێغەمبەری خوای ﷺ بینیوە دوعای دەكرد، له كاتێكدا دەستەكانی بەرزكردبوونەوە، دەیفەرموو: خوایه من هەر مرۆڤم (ئەگەرچی پێغەمبەریش بم)، بۆیه سزام مەدە، هەر كەسێك له بڕوادارانم ئەزیەت دابێ، یان قسەم پێی گوتبێ: به هۆیەوە سزام مەدە.

٥٢٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَدِمَ الطُّفَيْلُ بْنُ عَمْرٍو الدَّوْسِيُّ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ دَوْساً قَدْ عَصَتْ وَأَبَتْ، فَادْعُ اللَّهَ عَلَيْهَا، فَاسْتَقْبَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْقِبْلَةَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ، فَظَنَّ النَّاسُ أَنَّهُ يَدْعُو عَلَيْهِمْ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ اهْدِ دَوْساً، وَائْتِ بِهِمْ»»[٢].

واته: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: توفەیلی كوڕی عەمری دەوسی هاته لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (هۆزی) دەوس سەرپێچی كردوەو پشتی هەڵكردوە، دوعایان لێ بكه، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی كرده قیبلەو دەستەكانی بەرزكردنەوە، جا خەڵكەكە پێیان وابوو نزایان لێ دەكات، ئەویش فەرمووی: خوایه هۆزی دەوس هیدایەت بدەو، بیانهێنه بۆ لام.

٥٢٧- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَحَطَ الْمَطَرُ عَاماً، فَقَامَ بَعْضُ الْمُسْلِمِينَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَحَطَ الْمَطَرُ، وَأَجْدَبَتِ الْأَرْضُ، وَهَلَكَ الْمَالُ. فَرَفَعَ يَدَيْهِ، وَمَا يُرَى فِي السَّمَاءِ مِنْ سَحَابَةٍ، فَمَدَّ يَدَيْهِ حَتَّى رَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ يَسْتَسْقِي اللَّهَ، فَمَا صَلَّيْنَا الْجُمُعَةَ حَتَّى أَهَمَّ الشَّابُّ الْقَرِيبُ الدَّارِ الرُّجُوعَ إِلَى أَهْلِهِ، فَدَامَتْ جُمُعَةٌ. فَلَمَّا كَانَتِ الْجُمُعَةُ الَّتِي تَلِيهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، تَهَدَّمَتِ الْبُيُوتُ، وَاحْتَبَسَ الرُّكْبَانُ. فَتَبَسَّمَ لِسُرْعَةِ مَلَالِ ابْنِ آدَمَ وَقَالَ بِيَدِهِ: «اللَّهُمَّ حَوَالَيْنَا، وَلَا عَلَيْنَا، فَتَكَشَّطَتْ عَنِ الْمَدِينَةِ»»[٣].

---

(١) صحيح لغيره: «السلسلة الصحيحة» (٨٢-٨٣): [مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٨٨].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣٩٤١): [البخاري: ٥٦- كتاب الجهاد، ١٠٠- باب: الدعاء للمشركين بالهدى. مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ١٩٧].

(٣) صحيح: «الإرواء» (١٤٤/٢-١٤٥)، التعليق على «صحيح ابن خزيمة» (١٧٨٩).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ساڵێك باران نەباری و وشکەساڵی بوو، هەندێك لە مسوڵمانان هەستان چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، لە ڕۆژی جومعەدا، جا یەکێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باران نابارێ و، زەوی وشك بۆتەوە، ماڵ و سامانیش لە ناوچوون (پێغەمبەری خواش ﷺ) دەستەکانی بەرزکردنەوە، لەکاتێکدا یەك پەڵە هەور لە ئاسمان نەدەبینرا، جا دەستەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوە تا سپیایی بن هەنگڵەکانی دەرکەوتن، جا هێشتا نوێژی هەینیمان نەکردبوو (بارانێکی بە خوڕ دایکرد) تا وای لێ هات گەنجێکی بەهێزی ماڵ نزیك نەیدەتوانی بگەڕێتەوە ماڵەوەو، بارانەکە یەك حەفتە بەردەوام بوو، جا کاتێ جومعەکەی دیکە داهات، هەمان پیاو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵەکان لەناوچوون و خەریکە هەمووی بڕوخێن، کاروانچیەکان بەند بوون (ڕێگەیان نیە دەربچن، دوعا بکە بارانەکە بوەستێ)، جا پێغەمبەر ﷺ زەردەخەنەی کرد لەبەر خێرا بێزاربوونی نەوەی ئادەم (لە هەموو حاڵەتێك)، ئنجا بە دەستی ئاماژەی کردو فەرمووی: خوایە ئەو بارانە با لە دەوروبەرمان ببارێ و، بەسەرماندا نەبارێ، جا هەورەکە بڵاوەی کردو لەسەر مەدینە لاکەوت (بارانەکە لە دەوروبەری مەدینە دەباری و بەرەکەتەکەشی بۆ مەدینە بەردەوام بوو).

٥٢٨- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها)، أَنَّهَا رَأَتِ النَّبِيَّ ﷺ يَدْعُو رَافِعاً يَدَيْهِ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنَّمَا أَنَا بَشَـرٌ فَلَا تُعَاقِبْنِي، أَيُّمَا رَجُلٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ آذَيْتُهُ أَوْ شَتَمْتُهُ فَلَا تُعَاقِبْنِي فِيهِ»»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری ﷺ بینیوە دوعای دەکرد لە کاتێکدا دەستەکانی بەرزکردبوونەوە، دەیفەرموو: خوایە من هەر مرۆڤم (ئەگەرچی پێغەمبەریش بم)، کەواتە سزام مەدە، هەر کەسێکی بڕوادارم ئەزیەت دابێ، یان قسەم پێی گوتبێ، ئەوە بەهۆیەوە سزام مەدە.

تێبینی: پێغەمبەری خوا ﷺ کەسی ئازار نەداوە بە ناحەق، ئەگەر کەسێکیشی ئازار دابێت لەسەر حەق، ئەوە پاداشتی کردوە، یان ئەو کەسە تۆڵەی خۆی کردۆتەوەو گەردنی ئازاد کردوە، بەڵام لەبەر ئەوەی دڵەکەی لێوانلێوە لە پاکی و ترسی خواو تەقوا بۆیە بەو شێوەیە دڵەکەی هەر بێ ئۆقرەیە، هەرچەندە خواش لێی خۆش بووە، بەڵام ئەو کارەی بۆ ئەوەیە مسوڵمانان لەوەوە فێر ببن زۆرو زوو تەوبە بکەن و، دوعا بکەن خوا لە کەمتەرخەمیەکان و تاوانەکانیان خۆش بێ.

٥٢٩- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَعَوَّذُ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَرَمِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبُخْلِ»»[٢].

---

(١) صحيح لغيره.

(٢) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٣٧٧): [البخاري: ٨- كتاب الدعوات، ٣٦- باب: التعوذ من غلبة الرجال. مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء. ح ٥٠].

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای بە خوا دەگرت دەیفەرموو: ئەی خوایە، من پەنا بە تۆ دەگرم لە تەنبەڵی، وە پەنا بە تۆ دەگرم لە ترسنۆكی، وە پەنا بە تۆ دەگرم لە پیری (پیریەكی پەككەوتە)، وە پەنا بە تۆ دەگرم لە ڕەزیلی و چرووكی.

٥٣٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «قَالَ اللَّهُ عَزَّوَجَلَّ: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي، وَأَنَا مَعَهُ إِذَا دَعَانِي»»[١].

واتە: ئەبو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوای (عَزَّ وَجَلَّ) فەرموویەتی: بە پێی گومانی بەندەكەمم (چۆن لە من ڕاببینێ ئاوا مامەڵەی لەگەڵ دەكەم)، وە من لەگەڵیم ئەگەر داوام لێبكات و بانگم بكات تا لەگەڵی بم.

## دەربارەی: گەورەی داوای لێبوردنەكان

٥٣١- «عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «سَيِّدُ الِاسْتِغْفَارِ: اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ، وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي، فَاغْفِرْ لِي، فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، إِذَا قَالَ حِينَ يُمْسِي فَمَاتَ دَخَلَ الْجَنَّةَ «أَوْ: كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ» وَإِذَا قَالَ حِينَ يُصْبِحُ فَمَاتَ مِنْ يَوْمِهِ ... مِثْلَهُ»[٢].

واتە: شەددادی كوڕی ئەوس (خوا لێی ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: گەورەترین پاڕانەوەو داوای لێخۆش بوون كردن ئەوەیە كە (بەندە) بڵێ: ئەی خوایە تۆ پەروەردگارمی، جگە لە تۆ هیچ پەرستراوی دیكەی بە هەق نیە، منت دروست كردوەو بەندەی تۆم، وە تا بتوانم لەسەر پەیماننامەكەمم (كە بەڵێنی جێبەجێ كردنیم بە تۆم داوە)، دان دەنێم بە نازو نیعمەتەكانت، وە دان دەنێم بە تاوانەكانم، دە جا لێم خۆشبە، چونكە كەس لە تاوان خۆش نابێ جگە لە تۆ، پەنا دەگرم بە تۆ لە خراپەی كردەوەی خۆم، جا ئەگەر (مرۆڤی مسوڵمان) ئەوە بڵێت كاتێ ئێوارەی كردەوەو (لە شەوەكەدا) مرد ئەوە چۆتە بەهەشت «یان یەكێكە لە خەڵكی بەهەشت» وە ئەگەر ئەوە بڵێت كاتێ بەیانی كردەوەو (لە ڕۆژەكەدا) مرد، ئەوە بە هەمان شێوەیە (واتە: دەچێتە بەهەشت).

٥٣٢- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: إِنْ كُنَّا لَنَعُدُّ فِي الْمَجْلِسِ لِلنَّبِيِّ ﷺ: «رَبِّ اغْفِرْ لِي، وَتُبْ عَلَيَّ، إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ» مِائَةَ مَرَّةٍ»[٣].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٩٤٢): [البخاري: ٩٧- كتاب التوحيد، ١٥- باب: قول الله تعالى: يحذركم الله نفسه. مسلم: ٤٨- الذكر والدعاء، ح ٢، ١٩].

(٢) صحيح.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٥٦): [أبو داود: ٨- كتاب الوتر، ٣٦- باب: في الاستغفار . الترمذي: ٤٥- كتاب الدعوات،

واتە: لە ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) گێردراوەتەوە، گوتوویەتی: ئێمە لە مەجلیسدا لە (دەمی) پێغەمبەر ﷺ سەد جار دەمان ژمارد کە دەیفەرموو: پەروەردگارم لێم خۆشبەو، تەوبەم لێ قبووڵ بکە، بێگومان تۆ تەوبە وەرگری بە بەزەیی.

٥٣٣- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها)، قَالَتْ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الضُّحَى، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَتُبْ عَلَيَّ، إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ، حَتَّى قَالَهَا مِائَةَ مَرَّةٍ»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی چێشتەنگاوی کرد، پاشان فەرمووی: خوایە لێم خۆشبەو، تەوبەم لێ قبووڵ بکە، بێگومان تۆ تەوبە وەرگری بە بەزەیی، هەتا سەد جار ئەوەی دووبارەی کردەوە.

٥٣٤- «عَن شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «سَيِّدُ الِاسْتِغْفَارِ أَنْ يَقُولَ: اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ، وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي، فَاغْفِرْ لِي، فَإِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ»، قَالَ: «مَنْ قَالَهَا مِنَ النَّهَارِ مُوقِناً بِهَا، فَمَاتَ مِنْ يَوْمِهِ قَبْلَ أَنْ يُمْسِيَ فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَمَنْ قَالَهَا مِنَ اللَّيْلِ وَهُوَ مُوقِنٌ بِهَا، فَمَاتَ قَبْلَ أَنْ يُصْبِحَ فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ»»[٢].

واتە: شەددادی کوڕی ئەوس (خوا لێی ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: گەورەترین پاڕانەوەو داوای لێخۆش بوون کردن ئەوەیە، کە (بەندە) بڵێ: ئەی خوایە، تۆ پەروەردگارمی، جگە لە تۆ هیچ پەرستراوی دیکەی بە هەق نیە، منت دروست کردووەو بەندەی تۆم، وە تا بتوانم لەسەر پەیماننامەکەتم (کە بەڵێنی جێبەجێ کردنیم بە تۆ داوە)، دان دەنێم بە نازونیعمەتەکانت، وە دان دەنێم بە تاوانەکانم، دە جا لێم خۆشبە، چونکە کەس لە تاوان خۆش نابێ جگە لە تۆ، جا فەرمووی: هەر کەسێك لە ڕۆژدا ئەوە بڵێ، بە دڵیش بڕوای تەواوی پێی هەبێ و لە ڕۆژەکەدا بمرێ، پێش هاتنی شەو، ئەوە بەهەشتیە، وە هەر کەسێك لە شەودا ئەوە بڵێ، وە بە دڵیش بڕوای تەواوی پێی هەبێ و لە شەوەکەیدا بمرێ، پێش هاتنی ڕۆژ، ئەوە بەهەشتیە.

٥٣٥- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «تُوبُوا إِلَى اللَّهِ، فَإِنِّي أَتُوبُ إِلَيْهِ كُلَّ يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ»»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، من هەموو ڕۆژێك سەد جاران تەوبە دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای.

---

٣٨- باب: ما يقول إذا قام في المجلس].

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٧٤٧): [البخاري: ٨٠- كتاب الدعوات، ١٦- باب: ما يقول إذا أصبح].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٤٥٢).

٥٣٦- «عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: مُعَقِّبَاتٌ لَا يَخِيبُ قَائِلُهُنَّ: سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ مِائَةَ مَرَّةٍ. رَفَعَهُ ابْنُ أَبِي أُنَيْسَةَ»[١].

**واتە: کەعبی کوڕی عوجرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: چەند وشەیەك هەن ئەوەی سەد جار بیانڵێ، تووشی بێ ئومێدی نابێ (وشەکانیش بریتین لەمانە): (سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدُ لِلهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ) سەد جار، ئیبنو ئەبی ئونەیسەش لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەوەی گێڕاوەتەوە.**

## دەربارەی: دوعا کردن بۆ براو (خوشکی مسوڵمان) بە پەنهانی

٥٣٧- «عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): إِنَّ دَعْوَةَ الْأَخِ فِي اللَّهِ تُسْتَجَابُ»[٢].

**واتە: ئەبو بەکری صیددیق (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بێگومان دوعاو پاڕانەوەی برایەکی پێناوی خوا (بۆ برای مسوڵمانی) وەڵامدراوەیە (خوا قبووڵی دەکات).**

٥٣٨- «عَنْ صَفْوَانَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ صَفْوَانَ «وَكَانَتْ تَحْتَهُ الدَّرْدَاءُ بِنْتُ أَبِي الدَّرْدَاءِ»، قَالَ: قَدِمْتُ عَلَيْهِمُ الشَّامَ، فَوَجَدْتُ أُمَّ الدَّرْدَاءِ فِي الْبَيْتِ، وَلَمْ أَجِدْ أَبَا الدَّرْدَاءِ، قَالَتْ: أَتُرِيدُ الْحَجَّ الْعَامَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَتْ: فَادْعُ اللَّهَ لَنَا بِخَيْرٍ؛ فَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «إِنَّ دَعْوَةَ الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ مُسْتَجَابَةٌ لِأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ، عِنْدَ رَأْسِهِ مَلَكٌ مُوَكَّلٌ، كُلَّمَا دَعَا لِأَخِيهِ بِخَيْرٍ، قَالَ: آمِينَ، وَلَكَ بِمِثْلٍ، قَالَ: فَلَقِيتُ أَبَا الدَّرْدَاءِ فِي السُّوقِ، فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ، يَأْثُرُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ»[٣].

**واتە: لە صەفوانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی صەفوانەوە گێڕدراوەتەوە، «کە دەڕدائی کچی ئەبو دەڕداء هاوسەری بوو»، (صەفوان) گوتوویەتی: هاتمە لایان لە شام (واتە: هاتمە ماڵی خەسوو خەزوورم)، دایکی دەڕدائم لە ماڵەکەیدا بینی، بەڵام باوکی دەڕدائم نەبینی، گوتی: ئایا دەتەوێ ئەمساڵ بچیتە حەج؟ گوتم: بەڵێ، گوتی: دوعای خێرمان بۆ بکە لە خوا، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: دوعای مسوڵمان بۆ مسوڵمان وەڵامدراوەیە کاتێك لە پەنهانیدا بۆی بکات، لە لای سەری فریشتەیەکی ڕاسپێردراو هەیە، هەر کاتێك دوعای بۆ براکەی کرد (فریشتەکە) دەڵێ: خوا قبووڵی بکات، بۆ تۆش بە هەمان شێوە، جا (دواتر) گەیشتمە ئەبو دەڕداء لە بازاڕ، هەمان شتی پێ گوتم کە (دایکی دەڕداء) باسی کرد، لە پێغەمبەری خوای ﷺ دەگێڕایەوە.**

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٠٢): [مسلم: ٥- كتاب المساجد، ح ١٤٤].

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٣٩٩): (مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء، ح ٨٨).

٥٣٩- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهما)، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَلِمُحَمَّدٍ وَحْدَنَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَقَدْ حَجَبْتَهَا عَنْ نَاسٍ كَثِيرٍ»»[١].

**واته: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێك گوتی: خوایە تەنها لە من و موحەممەد خۆشبە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بێگومان تۆ لێبوردەیی (خوا)ت لە خەڵکێکی زۆر دوورخستەوە. (خەڵکێکی زۆرت لێ بێبەش کرد، نابێ دوعاو خێروبێرە فراوانەکان ئاوا تەسك بکرێنەوە).**

٥٤٠- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَسْتَغْفِرُ اللَّهَ فِي الْمَجْلِسِ مِائَةَ مَرَّةٍ: «رَبِّ اغْفِرْ لِي، وَتُبْ عَلَيَّ، وَارْحَمْنِي، إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ»»[٢].

**واته: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو لە مەجلیس و دانیشتنەکان سەد جاران داوای لێخۆشبوونی لە خوا دەکردو دەیفەرموو: پەروەردگارم لێم خۆشبەو، تەوبەم لێوەربگرەو، ڕەحمم پێ بکە، بێگومان تۆ تەوبە وەرگری بە بەزەیی.**

٥٤١- «عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ الْأَوْدِيِّ، عَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ كَانَ فِيمَا يَدْعُو: اللَّهُمَّ تَوَفَّنِي مَعَ الْأَبْرَارِ، وَلَا تُخَلِّفْنِي فِي الْأَشْرَارِ، وَأَلْحِقْنِي بِالْأَخْيَارِ»[٣].

**واته: عەمری کوڕی مەیمونی ئەودی لە عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، کە لە یەکێك لە دوعاکانی دەیگوت: خوایە لەگەڵ چاکەکاران بمرێنە، وە لەگەڵ خراپەکاران جێم مەهێڵە، وە بمگەیەنە بە هەڵبژێردراوانی چاکەکار.**

٥٤٢- «عَنْ شَقِيقٍ قَالَ كَانَ عَبْدُ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يُكْثِرُ أَنْ يَدْعُوَ بِهَؤُلَاءِ الدَّعَوَاتِ: رَبَّنَا أَصْلِحْ بَيْنَنَا، وَاهْدِنَا سَبِيلَ الْإِسْلَامِ، وَنَجِّنَا مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ، وَاصْرِفْ عَنَّا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ، وَبَارِكْ لَنَا فِي أَسْمَاعِنَا وَأَبْصَارِنَا وَقُلُوبِنَا وَأَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا، وَتُبْ عَلَيْنَا إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ، وَاجْعَلْنَا شَاكِرِينَ لِنِعْمَتِكَ، مُثْنِينَ بِهَا، قَائِلِينَ بِهَا، وَأَتِمَّهَا عَلَيْنَا»[٤].

**واته: شەقیق دەڵێ: عەبدوڵڵا (خوا لێی ڕازی بێ)، زۆر ئەم دوعایانەی دەکرد: پەروەردگارمان نێوانمان چاك بکەو، ڕێنماییمان بکە بۆ ڕێگای ئیسلام (بە تەواوی لێی شارەزامان بکە بە کردارەوە)و، لە تاریکاییەکان ڕزگارمان بکە بەرەو ڕۆشنایی و، هەموو کارە خراپەکانمان لێ بە دوور بگرە، بە دیارو نادیاریەوە، وە بەرەکەت بخەرە بیستن و بینین و دڵ و هاوسەرو نەوەکانمان، وە تەوبەمان لێ قبووڵ بکە، تۆ زۆر تەوبە وەرگرو بە بەزەیی، وە بمانگێڕە لەو کەسانەی سوپاسی**

---

(١) صحيح: «الإرواء» (١٧١): (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٢٧- باب: رحمة الناس والبهائم، عن أبي هريرة).

(٢) صحيح.

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح الإسناد.

**نازو نیعمەتی تۆ دەکەن، (ئەوانەی) ستایش و سەنای تۆ دەکەن لەسەری، باسی دەکەن و دەڵێن هی خوایە، بۆشمان تەواو بکە (تا لە گشت خێروبێرەکانت بەهرەوەر بین).**

٥٤٣- «عَنْ ثَابِتٍ قَالَ: كَانَ أَنَسٌ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، إِذَا دَعَا لِأَخِيهِ يَقُولُ: جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْهِ صَلَاةَ قَوْمٍ أَبْرَارٍ لَيْسُوا بِظَلَمَةٍ وَلَا فُجَّارٍ، يَقُومُونَ اللَّيْلَ، وَيَصُومُونَ النَّهَارَ»[١].

**واتە: سابت دەڵێ: کاتێك ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دوعایەکی کردبایە بۆ برای (مسوڵمانی) دەیگوت: خوایە ئەو ڕەحمەتەی پێ ببەخشە کە دەیدەیت بە چاکەکاران، کە ستەمکارو خراپەکار نین، (ئەوانەی) شەونوێژ دەکەن و، بە ڕۆژ بەڕۆژوو دەبن (واتە: ڕەحمەتی ئەو جۆرە کەسە چاکانەی پێ ببەخشە، وەك چۆن بەو چاکەکارانە دەبەخشی).**

٥٤٤- «عَنْ إِسْمَاعِيل بْن أَبِي خَالِدٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَمْرَو بْنَ حُرَيْثٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: ذَهَبَتْ بِي أُمِّي إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَمَسَحَ عَلَى رَأْسِي، وَدَعَا لِي بِالرِّزْقِ»[٢].

**واتە: ئیسماعیلی کوڕی ئەبو خالد گوتوویەتی: گوێم لە عەمری کوڕی حورەیس بوو (خوا لێی ڕازی بێ) دەیگوت: دایکم منی برد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، ئەویش دەستی بەسەر سەرم دا هێنا، بۆم لە خوا پاڕایەوەو داوای ڕۆزی بۆ کردم.**

٥٤٥- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قِيلَ لَهُ: إِنَّ إِخْوَانَكَ أَتَوْكَ مِنَ الْبَصْرَةِ «وَهُوَ يَوْمَئِذٍ بِالزَّاوِيَةِ» لِتَدْعُوَ اللَّهَ لَهُمْ، قَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَنَا، وَارْحَمْنَا، وَآتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ، فَاسْتَزَادُوهُ، فَقَالَ مِثْلَهَا، فَقَالَ: إِنْ أُوتِيتُمْ هَذَا، فَقَدْ أُوتِيتُمْ خَيْرَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ»[٣].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) لێی گێڕدراوەتەوە، کە پێی گوتراوە: براکانت لە بەصرەوە هاتوون بۆ لات بۆ ئەوەی دوعایان بۆ بکەیت، لە کاتێکدا ئەو لە زاویە بوو (کە دوو فەرسەخ لە بەصرەوە دوورە)، (ئەویش دوعای بۆ کردن) گوتی: خوایە لێمان ببورەو، ڕەحممان پێ بکەو، لە دونیادا چاکەمان پێ ببەخشەو، لە دواڕۆژیشدا هەر چاکەمان پێ ببەخشەو، لە ئاگریش بمانپارێزە، ئەوانیش داوای دوعای زیاتریان لێکرد، ئەویش هەمان شتی گوتەوە، پاشان گوتی: ئەگەر ئێوە ئەوەتان پێ ببەخشرێ ئەوە هەرچی چاکەی دونیاو دواڕۆژە پێتان بەخشراوە.**

٥٤٦- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أَخَذَ النَّبِيُّ ﷺ غُصْنًا فَنَفَضَهُ فَلَمْ يَنْتَفِضْ، ثُمَّ نَفَضَهُ فَلَمْ يَنْتَفِضْ، ثُمَّ نَفَضَهُ فَانْتَفَضَ، قَالَ: «إِنَّ سُبْحَانَ اللَّهِ، وَالْحَمْدَ لِلَّهِ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، يَنْفُضْنَ الْخَطَايَا كَمَا تَنْفُضُ الشَّجَرَةُ وَرَقَهَا»»[٤].

---

(١) صحيح موقوفاً، وقد صح مرفوعاً: «السلسلة الصحيحة» (١٨١٠).

(٢) صحيح.

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٣١٦٨): [الترمذي: ٤٥- كتاب الدعوات، ٩٧- حدثنا محمد بن حميد].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چیلکەیەکی هەڵگرت و ڕایوەشاند، جا گەڵاکانی هەڵنەوەری، جارێکی دیکە ڕایوەشاندەوەو هەڵنەوەری، پاشان جارێکی دی ڕایوەشاند (ئەم جارەیان) گەڵاکانی وەری، ئنجا فەرمووی: بێگومان (سُبْحَانَ اللَّه) و (الحَمْدُ لِله) و (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّه) دەبنە مایەی وەراندنی تاوانەکان، هەروەکو چۆن درەخت گەڵاکانی دەوەرێنێ.

٥٤٧- «فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الدُّعَاءِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «سَلِ اللَّهَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ»، ثُمَّ أَتَاهُ الْغَدَ فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، أَيُّ الدُّعَاءِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «سَلِ اللَّهَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، فَإِذَا أُعْطِيتَ الْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ فَقَدْ أَفْلَحْتَ»»[١].

واتە: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا باشترین دوعا کامەیە؟ فەرمووی: داوا لە خوا بکە سەلامەتت بکات لە دونیاو دواڕۆژدا، پاشان بۆ بەیانی هاتەوە خزمەتی، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین دوعا کامەیە؟ فەرمووی: داوا لە خوا بکە سەلامەتت بکات لە دونیاو دواڕۆژدا، چونکە ئەگەر تۆ سەلامەتی و بێ زیانیت پێ بدرێ لە دونیاو دواڕۆژدا، ئەوە سەرفراز بوویت.

٥٤٨- «عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَحَبُّ الْكَلَامِ إِلَى اللَّهِ: سُبْحَانَ اللَّهِ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ»»[٢].

واتە: ئەبو زەڕ (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خۆشەویسترین وشە لای خوا (بریتیە): (سُبْحَانَ اللَّهِ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ)، واتە: پاکی و بێگەردی بۆ خوا، هیچ هاوبەشێکی نیە، موڵك و ستایش هەر هی ئەوە، وە ئەو بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە، هیچ لادانێك نیە (لە خراپە)و هیچ هێزێك نیە (بۆ ئەنجامدانی چاکە) تەنها بە خواوە بەندە، پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ خوایە.

٥٤٩- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ ﷺ وَأَنَا أُصَلِّي، وَلَهُ حَاجَةٌ، فَأَبْطَأْتُ عَلَيْهِ، قَالَ: يَا عَائِشَةُ، عَلَيْكِ بِجُمَلِ الدُّعَاءِ وَجَوَامِعِهِ، فَلَمَّا انْصَرَفْتُ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا جُمَلُ الدُّعَاءِ وَجَوَامِعُهُ؟ قَالَ: قُولِي: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنَ الْخَيْرِ كُلِّهِ، عَاجِلِهِ وَآجِلِهِ، مَا عَلِمْتُ مِنْهُ وَمَا لَمْ أَعْلَمْ. وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّرِّ كُلِّهِ عَاجِلِهِ وَآجِلِهِ، مَا عَلِمْتُ مِنْهُ وَمَا لَمْ أَعْلَمْ. وَأَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ وَمَا قَرَّبَ

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٥٢٣): [الترمذي: ٤٥- كتاب الدعوات، ٨٤- باب: حدثنا يوسف بن عيسى. إبن ماجه: ٣٤- كتاب الدعاء بالعفو والعافية، ح ٣٨٤٨].

(٢) صحيح الإسناد: [مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء والتوبة والاستغفار، ح ٨٤ و ٨٥].

إِلَيْهَا مِنْ قَوْلٍ أَوْ عَمَلٍ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ وَمَا قَرَّبَ إِلَيْهَا مِنْ قَوْلٍ أَوْ عَمَلٍ. وَأَسْأَلُكَ مِمَّا سَأَلَكَ بِهِ مُحَمَّدٌ ﷺ، وَأَعُوذُ بِكَ مِمَّا تَعَوَّذَ مِنْهُ مُحَمَّدٌ ﷺ، وَمَا قَضَيْتَ لِي مِنْ قَضَاءٍ فَاجْعَلْ عَاقِبَتَهُ رُشْدَاً»»[١].

**واتە: (دایکمان) عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەکەم لە کاتێکدا نوێژم دەکرد، پێویستیەکی هەبوو، منیش درەنگکەوتم لە نوێژەکەم (بە هۆی دوعای زۆرەوە)، فەرمووی: ئەی عائیشە هۆگری ئەو دوعایانەبە کە کورت و پڕمانان، جا کاتێك لێبوومەوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوعا کورت و پڕ ماناکان چین؟ فەرمووی: بڵێ: خوایە من داوات لێدەکەم هەموو چاکەیەکم پێ ببەخشی لە ئێستاو ئایندەدا، ئەوەی من زانیومە ئەوەیشی کە نەمزانیوە، وە پەنات پێ دەگرم لە هەموو خراپەیەك، ئەوەی زوو دێ، یان لە ئایندەدا دێ، ئەوەی من زانیومەو ئەوەیشی کە نەمزانیوە، وە داوای بەهەشتت لێ دەکەم، هەروەها ئەوەش کە لە بەهەشت نزیکخەرەوەیە لە گوفتارو کردار، وە پەنات پێ دەگرم لە ئاگر، هەروەها لەوەش کە مرۆڤ لە دۆزەخ نزیك دەخاتەوە لە گوفتارو کردار، وە داوای ئەوەت لێ دەکەم کە موحەممەد ﷺ داوای پێ لە تۆ کردوە، وە پەنا دەگرم لەوەی موحەممەد ﷺ پەنای پێ لە تۆ گرتوە، وە هەر بڕیارێکت دا لەسەر من با کۆتاییەکەی سەر ڕاستی و چاکە بێ.**

## دەربارەی: صەڵاوات ناردن بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ

٥٥٠- «عَن مَالِك بْنِ أَوْسِ بْنِ الْحَدَثَانِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ يَتَبَرَّزُ فَلَمْ يَجِدْ أَحَدَاً يَتْبَعُهُ، فَخَرَجَ عُمَرُ فَاتَّبَعَهُ بِفَخَّارَةٍ أَوْ مِطْهَرَةٍ، فَوَجَدَهُ سَاجِدَاً فِي مِسْرَبٍ، فَتَنَحَّى فَجَلَسَ وَرَاءَهُ، حَتَّى رَفَعَ النَّبِيُّ ﷺ رَأْسَهُ فَقَالَ: «أَحْسَنْتَ يَا عُمَرُ حِينَ وَجَدْتَنِي سَاجِدَاً فَتَنَحَّيْتَ عَنِّي، إِنَّ جِبْرِيلَ جَاءَنِي فَقَالَ: مَنْ صَلَّى عَلَيْكَ وَاحِدَةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ عَشْرَاً، وَرَفَعَ لَهُ عَشْرَ دَرَجَاتٍ»»[٢].

**واتە: مالیکی کوڕی ئەوسی کوڕی حەدەسان (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ ویستی بچێتە سەرئاو، کەسی دەست نەکەوت شوێنی بکەوێ، جا عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) چووە دەرو شوێنی کەوت، وە گۆزەیەك یان مەسینەیەکی لەگەڵ خۆیدا بۆ برد، جا بینی کە پێغەمبەر ﷺ لەناو گۆلە دارخورمایەك کڕنووشی بردوە، ئەویش خۆی لێ دوورخستەوەو لە پشتیەوە دانیشت هەتا پێغەمبەر ﷺ سەری بەرز کردەوە، جا فەرمووی: (کارێکی) باشت کرد ئەی عومەر، کاتێك منت بینی کڕنووشم بردبوو دوورکەوتیەوە، جبریل هاتە لام، فەرمووی: هەر کەسێك یەك جار صەڵاواتت لەسەر بدات، ئەوە خوا دە (١٠) ڕەحمەتی بەسەردا دەڕژێنێ، هەروەها دە پلەش بەرزی دەکاتەوە.**

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٥٣٢) [ليس في شيء من الكتب الستة].

(٢) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٨٢٩)، فضل الصَّلَاةِ عَلَىَ النَّبِيِّ ﷺ: (٤، ٥، ١٠، ١٢).

٥٥١- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ صَلَّى عَلَيَّ وَاحِدَةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ عَشْرًا، وَحَطَّ عَنْهُ عَشْرَ خَطِيئَاتٍ»»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: هەر کەسێك یەك جار صەڵاواتم لەسەر بدات، ئەوە خوا دە (١٠) ڕەحمەتی بەسەردا دەڕژێنێ، هەروەها دە گوناهی لێ هەڵدەوەرێنێ.

## دەربارەی: ئەو کەسەی ناوی پێغەمبەری ﷺ لەلا دەهێنرێ و صەڵاوات نادات

٥٥٢- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَقَى الْمِنْبَرَ، فَلَمَّا رَقَى الدَّرَجَةَ الْأُولَى قَالَ: «آمِينَ»، ثُمَّ رَقَى الثَّانِيَةَ فَقَالَ: «آمِينَ»، ثُمَّ رَقَى الثَّالِثَةَ فَقَالَ: «آمِينَ»، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، سَمِعْنَاكَ تَقُولُ: آمِينَ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ؟ قَالَ: «لَمَّا رَقِيتُ الدَّرَجَةَ الْأُولَى جَاءَنِي جِبْرِيلُ ﷺ فَقَالَ: شَقِيَ عَبْدٌ أَدْرَكَ رَمَضَانَ، فَانْسَلَخَ مِنْهُ وَلَمْ يُغْفَرْ لَهُ، فَقُلْتُ: آمِينَ. ثُمَّ قَالَ: شَقِيَ عَبْدٌ أَدْرَكَ وَالِدَيْهِ أَوْ أَحَدَهُمَا فَلَمْ يُدْخِلَاهُ الْجَنَّةَ، فَقُلْتُ: آمِينَ. ثُمَّ قَالَ: شَقِيَ عَبْدٌ ذُكِرْتَ عِنْدَهُ وَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْكَ، فَقُلْتُ: آمِينَ»»[٢].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چووە سەر مینبەر، کاتێك سەرکەوتە سەر پایەو (قاڵدرمە)ی یەکەم فەرمووی: ئامین، دواتر سەرکەوتە سەر دووەمیان فەرمووی: ئامین، دواتر سەرکەوتە سەر سێیەمیان فەرمووی: ئامین، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گوێمان لێ بوو سێ جاران فەرمووت ئامین (بۆچی وات فەرموو)؟ فەرمووی: کاتێك سەرکەوتمە پایەو (قاڵدرمە)ی یەکەم جبریل هات و گوتی: دەك ئەو کەسە بەدبەخت بێ، کە بە ڕەمەزان گەیشتووەو ڕەمەزان کۆتایی هاتوە، کەچی خوا لێی خۆش نەبووبێ (تۆزێك خۆی ماندوو نەکردوە کە شایستەی لێخۆشبوون بێ، لەگەڵ ئەوەی خوا زۆرترین ڕەحمەت و لێبوردنی خۆی لە ڕەمەزان داناوە بە کەمترین کردەوە)، منیش گوتم: ئامین، (دواتر جبریل) فەرمووی: دەك ئەو کەسە بەدبەخت بێ، کە دایك و باوکی هەبووبێ، یان یەکێکیانی هەبووبێ، بەڵام نەبووبنە هۆی چوونە بەهەشتی (هێندە خزمەتی نەکردوون کە شایستەی چوونە بەهەشت بێ)، منیش گوتم: ئامین، (دواتر جبریل) فەرمووی: دەك ئەو کەسە بەدبەخت بێ کە ناوی تۆی لەلا هێندرابێ و، صەڵاواتی لەسەر تۆ نەدابێ، منیش گوتم: ئامین.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨٢٩) فضل الصَّلَاةِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ (١٢)، (تخريج المشكاة) (٩٢٢): [ليس في شيء من الكتب السبة].

(٢) صحيح لغيره.

٥٥٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ صَلَّى عَلَيَّ وَاحِدَةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ عَشْرًا»»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك یەك جار صەڵاواتم لەسەر بدات، ئەوە خوا دە (١٠) ڕەحمەتی بەسەردا دەڕژێنێت.

٥٥٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَقَى الْمِنْبَرَ فَقَالَ: «آمِينَ، آمِينَ، آمِينَ» قِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! مَا كُنْتَ تَصْنَعُ هَذَا؟ فَقَالَ: «قَالَ لِي جِبْرِيلُ: رَغِمَ أَنْفُ عَبْدٍ أَدْرَكَ أَبَوَيْهِ أَوْ أَحَدَهُمَا لَمْ يُدْخِلْهُ الْجَنَّةَ. قُلْتُ: آمِينَ. ثُمَّ قَالَ: رَغِمَ أَنْفُ عَبْدٍ دَخَلَ عَلَيْهِ رَمَضَانُ لَمْ يُغْفَرْ لَهُ. فَقُلْتُ: آمِينَ. ثُمَّ قَالَ: رَغِمَ أَنْفُ امْرِئٍ ذُكِرتَ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْكَ، فَقُلْتُ: آمِينَ»»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ چووە سەر مینبەر، فەرمووی: ئامین، ئامین، ئامین، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! بۆچی ئاوات كرد (ئاوات فەرموو)؟ فەرمووی: جبریل پێی گوتم: لووتی ئەو كەسە بەخۆڵدابچێ و بەدبەخت بێت كە دایك و باوكی یان یەكێكیان مابێ، كەچی نەبووبنە هۆی چوونە بەهەشتی (ئەوەندە خزمەتی نەكردبن ببێتە مایەی چوونە بەهەشتی)، منیش گوتم: ئامین، پاشان (جبریل) گوتی: لووتی ئەو كەسە بەخۆڵدابچێ و بەدبەخت بێ كە ڕەمەزانی پێ گەیشتبێ و ڕەمەزان تێپەڕی بێ، بەڵام وای نەكردبێ خوا لێی خۆش بێ (ئەوەندە خۆی ماندوو نەكردبێ كە شایستەی لێخۆشبوون بێ)، منیش گوتم: ئامین، دواتر (جبریل) فەرمووی: لووتی ئەو كەسە بەخۆڵدابچێ و بەدبەخت بێ كە ناوی تۆی لەلا هێنرابێ و صەڵاواتی لەسەرت نەدابێ، منیش گوتم: ئامین.

٥٥٥- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ جُوَيْرِيَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ بْنِ أَبِي ضِرَارٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ مِنْ عِنْدِهَا، وَكَانَ اسْمُهَا بَرَّةَ، فَحَوَّلَ النَّبِيُّ ﷺ اسْمَهَا، فَسَمَّاهَا جُوَيْرِيَةَ، فَخَرَجَ وَكَرِهَ أَنْ يَدْخُلَ وَاسْمُهَا بَرَّةُ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَيْهَا بَعْدَمَا تَعَالَى النَّهَارُ، وَهِيَ فِي مَجْلِسِهَا، فَقَالَ: مَا زِلْتِ فِي مَجْلِسِكِ؟ «لَقَدْ قُلْتُ بَعْدَكِ أَرْبَعَ كَلِمَاتٍ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، لَوْ وُزِنَتْ بِكَلِمَاتِكِ وَزَنَتْهُنَّ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ عَدَدَ خَلْقِهِ، وَرِضَا نَفْسِهِ، وَزِنَةَ عَرْشِهِ، وَمِدَادَ «أَوْ مَدَدَ» كَلِمَاتِهِ»»(٣).

واتە: ئیبنو عەبباس لە جوەیریەی كچی حارسی كوڕی ئەبو ضیرار دەگێڕێتەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، كە پێغەمبەر ﷺ لە لای ئەوەوە چووە دەر، ناوی بەڕە بوو، پێغەمبەر ﷺ ناوەكەی گۆڕی و ناوی لێنا جوەیریە، جا چووە دەرو پێی ناخۆشبوو بچێتە لای و ناویشی بەڕە بێ، پاشان گەڕایەوە

---

(١) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٣٦٨): (أبو داود: ٨- كتاب الوتر، ٢٦- باب: في الاستغفار، ح ١٥٣٠).

(٢) حسن صحيح: «التعليق على فضل الصلاة» (١٨/٩)، (مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٩- ١٠).

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢١٢، ٢١٥٦)، «صحيح أبي داود» (١٣٤٧): (مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء والتوبة والاستغفار، ح ٧٩).

دوای ئەوەی خۆر بەرزبوویەوە، لە کاتێکدا (جوەیریە) هەر لە شوێنی خۆی بوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەوە هەر لە شوێنەکەی خۆت ماوی (هەر قسەی ئاساییت کردوە)؟! من دوای تۆ چوار وشەم گوتن، ئەگەر بکێشرێن لەگەڵ وشەکانی تۆ (کە گفتوگۆی ئاساییە)، ئەوە وشەکانی من زۆر قورستر دەبێ، (کە بریتین لەمانە): (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ عَدَدَ خَلْقِهِ، وَرِضَا نَفْسِهِ، وَزِنَةَ عَرْشِهِ، وَمِدَادَ «أَوْ مَدَدَ» كَلِمَاتِهِ) واتە: پاکی بۆ خوا لەگەڵ سوپاس و ستایش کردنی بە ئەندازەی ژمارەی دروستکراوەکانی و ڕازی بوونی خۆی و (بە ئەندازەی) کێشی عەرشەکەی و وشەکانی.

٥٥٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اسْتَعِيذُوا بِاللَّهِ مِنْ جَهَنَّمَ، اسْتَعِيذُوا بِاللَّهِ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، اسْتَعِيذُوا بِاللَّهِ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، اسْتَعِيذُوا بِاللَّهِ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ»»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پەنا بە خوا بگرن لە دۆزەخ، پەنا بە خوا بگرن لە سزای گۆڕ، پەنا بە خوا بگرن لە ئاشووب و بەڵای مەسیحی دەججال، پەنا بە خوا بگرن لە ئاشووب و بەڵای ژیان و مردن.

## دەربارەی: دوعا کردن لە کەسێك کە ستەمی لێکردووی

٥٥٧- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ أَصْلِحْ لِي سَمْعِي وَبَصَرِي، وَاجْعَلْهُمَا الْوَارِثَيْنِ مِنِّي، وَانْصُرْنِي عَلَى مَنْ ظَلَمَنِي، وَأَرِنِي مِنْهُ ثَأْرِي»»[٢].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوایە بیستن و بینینم چاك بکەی و، بیانهێڵیتەوە دوای خۆشم (واتە: تا کاتی مردن بینین و بیستنم لێ وەرمەگرەوە کوێرو کەڕم نەکەیت)و، سەرم بخەیت بەسەر ئەو کەسەی ستەمم لێ دەکات، وە هەقی منی لێ وەرگرەوەو نیشانمی بدە.

٥٥٨- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ مَتِّعْنِي بِسَمْعِي وَبَصَرِي، وَاجْعَلْهُمَا الْوَارِثَ مِنِّي، وَانْصُرْنِي عَلَى عَدُوِّي، وَأَرِنِي مِنْهُ ثَأْرِي»»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: خوایە سوودبەخشم بکە بە بیستن و بینایم و، بیانهێڵیتەوە دوای خۆشم (واتە: تا کاتی مردن بینین و بیستنم لێ

---

(١) صحيح: «الإرواء» (٣٥٠/٦٦/٢) مقيداً بالتشهد الأخير: (الترمذي: ٤٥- كتاب الدعوات، ١٣٢- باب: في الاستعاذة . النسائي: ٥٠- كتاب الاستعاذة، ٤٧- باب: الاستعاذة من عذاب جهنم وشر المسيح الدجال و ٥٣- باب: الاستعاذة من عذاب الله).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣١٧٠)، «الروض النضير» (٦٩٠): [ليس في شيء من الكتب الستة].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣٦٠٦).

وەرمەگرەوە كوێرو كەڕم مەكە)و، سەرم بخەیت بەسەر ئەو كەسەی ستەمم لێ دەكات و، وە ماف منی لێ وەرگرەوەو پێشانمی بدە.

٥٥٩- «عَنْ سَعْدِ بْنِ طَارِقِ بْنِ أَشْيَمَ الأَشْجَعِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كُنَّا نَغْدُو إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَيَجِيءُ الرَّجُلُ وَتَجِيءُ الْمَرْأَةُ فَيَقُولُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ أَقُولُ إِذَا صَلَّيْتُ؟ فَيَقُولُ: «قُلِ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي، وَارْحَمْنِي، وَاهْدِنِي، وَارْزُقْنِي، فَقَدْ جَمَعَتْ لَكَ دُنْيَاكَ وَآخِرَتَكَ»»[1].

واتە: سەعیدی كوڕی تاریقی كوڕی ئەشیەمی ئەشجەعی دەڵێ: باوكم (خوا لێی ڕازی بێ) بۆی گێڕامەوە گوتی: ئێمە دەچووینە لای پێغەمبەر ﷺ، جا پیاو دەهات و ئافرەت دەهات و، دەیگوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چی بڵێم كاتێك كە نوێژ دەكەم؟ ئەویش دەیفەرموو: بڵێ: خوایە لێم ببورەو، ڕەحمم پێ بكەو، ڕێنماییم بكەو، ڕزق و ڕۆزیم پێ ببەخشە، جا (ئەگەر ئەوەت كرد) ئەوە دونیاو دواڕۆژت كۆكردۆتەوە.

## دەربارەی: ئەو كەسەی دوعای تەمەن درێژی دەكات

٥٦٠- «عَنْ أَنَس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَدْخُلُ عَلَيْنَا، أَهْلَ الْبَيْتِ، فَدَخَلَ يَوْمَاً فَدَعَا لَنَا، فَقَالَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ خُوَيْدِمُكَ أَلَا تَدْعُو لَهُ؟ قَالَ: اللَّهُمَّ أَكْثِرْ مَالَهُ وَوَلَدَهُ، وَأَطِلْ حَيَاتَهُ، وَاغْفِرْ لَهُ. فَدَعَا لِي بِثَلَاثٍ، فَدَفَنْتُ مِائَةً وَثَلَاثَةً، وَإِنَّ ثَمَرَتِي لَتُطْعِمُ فِي السَّنَةِ مَرَّتَيْنِ، وَطَالَتْ حَيَاتِي حَتَّى اسْتَحْيَيْتُ مِنَ النَّاسِ، وَأَرْجُو الْمَغْفِرَةَ»»[2].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەهاتە ماڵی ئێمە، ڕۆژێك هاتە لامان و دوعای بۆ كردین، دایكی سولەیم گوتی: ئەوە (ئەنەسە) خزمەتكارە بچكۆڵەكەی تۆیە (ئەو كات ئەنەس منداڵ بوو)، ئایا دوعای بۆ ناكەی؟ فەرمووی: خوایە سەروەت و سامان و منداڵی زۆر بكەو، تەمەنی درێژ بكەو، لێی خۆشبە، جا ئەم سێ دوعایەی بۆ كردم (دووانیان گیرا بووە): ئەوەتا سەدو سێ كەسم (لە نەوەی خۆم) ناشتووەو، بەروبوومەكەم لە ساڵێكدا دووجار بەر دەدات (خوا ئاوا ڕۆزی و ماڵ و سەروەتی بەسەردا ڕژاندووم)و، تەمەنم هێندە درێژبووە تا وام لێهات لەبەر تەمەن درێژی شەرمم لە خەڵكی كرد (لەبەر ئەوەی ئەوانەی سەردەمی خۆی نەمابوون و نەوەی نوێش بە سەرسووڕمانەوە سەیری تەمەنم دەكەن)، وە ئومێدیشم وایە كە بگەم بە لێخۆشبوونی خوا (كە دوعای سێیەمیانەو ئومێدم وایە ئەویش دێتەجێ).

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٣١٨)، (مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء والتوبة والاستغفار ح ٣٤، ٣٥).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٢٤١ و ٢٥٤١)، (مسلم: ٥- كتاب المساجد، ٢٦٨).

## دەربارەی: بەندە دوعاکەی وەڵام دەدرێتەوە ئەگەر پەلە نەکات

٥٦١- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يُسْتَجَابُ لِأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ، يَقُولُ: دَعَوْتُ فَلَمْ يُسْتَجَبْ لِي»»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوعای هەر یەکێك لە ئێوە وەڵام دەدرێتەوە مادام پەلە نەکات، (پەلەکردنیش ئەوەیە کە یەکێك دەڵێ: دوعام کردو وەڵام نەدراومەوە.

٥٦٢- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يُسْتَجَابُ لِأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَدْعُ بِإِثْمٍ، أَوْ قَطِيعَةِ رَحِمٍ، أَوْ يَسْتَعْجِلَ فَيَقُولُ: دَعَوْتُ فَلَا أَرَى يَسْتَجِيبُ لِي، فَيَدَعُ الدُّعَاءَ»»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: دوعای هەر یەکێك لە ئێوە وەڵام دەدرێتەوە مادام داوایەکە گوناح نەبێ، یاخود پەیوەندی پچڕاندنی نێوانی خزمان نەبێ، یان پەلە نەکات و بڵێ: دوعام کردو نەمبینی خوا وەڵامم بداتەوە، بۆیە واز دێنێ لە دوعاو پاڕانەوە.

## دەربارەی: ئەوەی پەنا بە خوا دەگرێ لە تەنبەڵی

٥٦٣- «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَالْمَغْرَمِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ النَّارِ»»[٣].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکی و باپیریەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: بیستم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێدەگرم لە تەنبەڵی و قەرزاری، وە پەنات پێدەگرم لە بەڵاو ئاشووبی مەسیحی دەججال، وە پەنات پێدەگرم لە سزای ئاگر.

٥٦٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَعَوَّذُ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَعَذَابِ الْقَبْرِ، وَشَرِّ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ»[٤].

---

(١) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٣٣٤) (البخاري: ٨٠- كتاب الدعوات، ٢٢، باب: يستجاب للعبد ما لم يعجل. مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء والتوبة والإستغفار وح ٩١، ٩٢).

(٢) صحيح: انظر ما قبله.

(٣) حسن صحيح: (النسائي: ٥٠- كتاب الاستعاذة، ٣٣- باب: الاستعاذة من الهرم).

(٤) صحيح.

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پەنای بە خوا دەگرت لە خراپەی ژیان و مردن، وە لە سزای گۆڕ، وە لە شەڕو خراپەی مەسیحی دەججال.

## دەربارەی: هەر کەس داوا لە خوا نەکات، خوا لێی تووڕە دەبێ

٥٦٥- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ لَمْ يَسْأَلِ اللَّهَ غَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِ»»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەس داوا لە خوا نەکات و لێی نەپاڕێتەوە خوا لێی تووڕە دەبێ.

٥٦٦- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا دَعَوْتُمُ اللَّهَ فَاعْزِمُوا فِي الدُّعَاءِ، وَلَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: إِنْ شِئْتَ فَأَعْطِنِي، فَإِنَّ اللَّهَ لَا مُسْتَكْرِهَ لَهُ»»[٢].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر داواتان لە خوا کرد لە کاتی پاڕانەوە، ئەوە بە پێداگری و سوور بوون داوا بکەن، وە با یەکێك لە ئێوە نەڵێ: خوایە ئەگەر دەتەوێ (پێتخۆشە) پێم بدە، چونکە هیچ کەس ناتوانێ بە زۆر شت لە خوا بسەنێ، (هەر بە ویستی خۆیەتی، بەڵام ئێوە ئەو ویستە دەرمەبڕن، بەڵکو بە هەژارییەوە پێداگری بکەن و خۆتان تاڕاددەیەك بێ منەت پێشان مەدەن).

٥٦٧- «عَنْ أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ قَالَ: سَمِعْتُ عُثْمَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ قَالَ صَبَاحَ كُلِّ يَوْمٍ، وَمَسَاءَ كُلِّ لَيْلَةٍ، ثَلَاثاً ثَلَاثاً: بِسْمِ اللَّهِ الَّذِي لَا يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ، لَمْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ»»[٣].

واتە: ئەبانی کوڕی عوسمان دەڵێ: گوێم لە عوسمان بوو (خوا لێی ڕازی بێ) دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێك لە بەیانی هەموو ڕۆژێك و ئێوارەی هەموو شەوێکدا سێ جار سێ جار بڵێ: (بِسْمِ اللَّهِ الَّذِي لَا يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ)، واتە: بە ناوی ئەو خوایەی کە هیچ شتێك لەگەڵ ناوی ئەودا زیان ناگەیەنێ نە لەسەر زەوی و نە لە ئاسمان، وە ئەو زۆر بیسەرو زانایە، ئەوە هیچ شتێك زیانی پێ ناگەیەنێ.

---

(١) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٢٦٥٤).

(٢) صحيح: انظر الحديث رقم (٦٠٨): (البخاري: ٨٠- كتاب الدعوات، ٢١- باب: ليعزم المسالة. ٩٧-كتاب التوحيد، ٣١- باب: قوله تعالى: تؤتي الملك من تشاء. مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء والتوبة والاستغفار، ح ٧ و ٩. أبو داود: ٢- كتاب الصلاة، باب: الدعاء (عن أبي هريرة). «الموطأ» للإمام مالك: ١٥- كتاب القرآن، ٨- باب: ما جاء في الدعاء، ٢٨. «المسند» للإمام أحمد: ٧٣١٢ (عن أبي هريرة).

(٣) حسن صحيح: «تخريج الكلم الطيب» رقم: (٢٣)، «التعليق الرغيب» (٢٢٧/١) (تخريج المختارة» (٢٩١- ٢٩٢): (أبو داود: ٤٠ كتاب الأدب، ١٠١- باب: ما يقول إذا أصبح، ٥٠٨٨. الترمذي: ٤٥- كتاب الدعوات، ١٣- باب: ما جاء في الدعاء إذا أصبح وإذا أمسى).

تێبینی: ئەگەر شتێکیش زیانی پێ گەیاند دوای گوتنی ئەم زیکرە، ئەوە نیشانەی ئەوەیە بە هۆی ئەو شتەی تۆ بە زیانی دەبینی زیانێکی زۆر مەزنتر لابراوەو، ئەوە دەرمانێکە بۆ دەردێکی گەورە کە لە تۆدا دیار نیە، گرنگ ئەوەیە بزانرێت هیچ کات بە زیان ناشکێتەوە.

## دەربارەی: دوعا کردن لە ڕیزی جەنگان لە پێناوی خوا

٥٦٨- «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَاعَتَانِ تُفْتَحُ لَهُمَا أَبْوَابُ السَّمَاءِ، وَقَلَّ دَاعٍ تُرَدُّ عَلَيْهِ دَعْوَتُهُ: حِيْنَ يَحْضُرُ النِّدَاءُ، وَالصَّفُّ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»[1].

واتە: سەهلی کوڕی سەعد (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: دوو کات هەیە دەرگاکانی ئاسمانیان بۆ دەکرێنەوە، کەمجار وایە داواکار لەم دوو کاتەدا داوای کردبێ و قبووڵ نەبووبێ، (دوو کاتەکانیش بریتین لە): کاتێك بانگ دەدرێ بۆ نوێژ، هەروەها کاتی ڕیزبوون بۆ جەنگ و تێکۆشان لە پێناوی خوادا.

## دەربارەی: دوعاو پاڕانەوەکانی پێغەمبەر ﷺ

٥٦٩- «عَنْ شُتَيْرِ بْنِ شَكَلِ بْنِ حُمَيْدٍ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عَلِّمْنِي دُعَاءً أَنْتَفِعُ بِهِ، قَالَ: «قُلِ: اللَّهُمَّ عَافِنِي مِنْ شَرِّ سَمْعِي، وَبَصَرِي، وَلِسَانِي، وَقَلْبِي، وَشَرِّ مَنِيِّي» قَالَ وَكِيعٌ: مَنِيِّي يَعْنِي الزِّنَا وَالْفُجُورَ»[2].

واتە: شوتەیری کوڕی شەکەلی کوڕی حومەید، لە باوکیەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوعایەکم فێر بکە لێی سوودمەندبم، فەرمووی: بڵێ: خوایە سەلامەتم بکەو بمپارێزە لە خراپەی بیستنم و، بینینم و، زمانم و، دڵم و، مەنیم، وەکیع دەڵێ: خراپەی مەنی، واتە: زیناو داوێن پیسی (واتە: خوایە لە زیناو داوێنپیسی بمپارێزە).

٥٧٠- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ أَعِنِّي وَلَا تُعِنْ عَلَيَّ، وَانْصُرْنِي وَلَا تَنْصُرْ عَلَيَّ، وَيَسِّرِ الْهُدَى لِي»»[3].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: خوایە (بۆ هەموو کارێکی چاکە) یارمەتیم بدەو، یارمەتی (هیچ کەسێك و شتێك مەدە) بەسەرمەوە،

---

(١) صيح موقوفاً، وهو في حكم المرفوع: وقد ثبت مرفوعاً، «صحيح أبي داود» (٢٢٩٠).

(٢) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٣٨٧): (أبو داود: ٨- كتاب الوتر ٣٢- باب: في الاستعاذة، الترمذي: ٥٠- كتاب الاستعاذة، ٤- باب: الاستعاذة من شر السمع).

(٣) صحيح: أنظر ما بعده.

وە (بەسەر دوژمن و نەفس و شەیتان) سەرمبخەو کەسیش سەرمەخە بەسەرمەوە، وە ڕێگای هیدایەتم بۆ ئاسان بکە.

٥٧١- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَدْعُو بِهَذَا: «رَبِّ أَعِنِّي وَلَا تُعِنْ عَلَيَّ، وَانْصُرْنِي وَلَا تَنْصُرْ عَلَيَّ، وَامْكُرْ لِي وَلَا تَمْكُرْ عَلَيَّ، وَيَسِّرْ لِيَ الْهُدَى، وَانْصُرْنِي عَلَى مَنْ بَغَى عَلَيَّ. رَبِّ اجْعَلْنِي شَكَّاراً لَكَ، ذَكَّاراً لَكَ، رَاهِباً لَكَ، مِطْوَاعاً لَكَ، مُخْبِتاً لَكَ، أَوَّاهاً مُنِيباً، تَقَبَّلْ تَوْبَتِي، وَاغْسِلْ حَوْبَتِي، وَأَجِبْ دَعْوَتِي، وَثَبِّتْ حُجَّتِي، وَاهْدِ قَلْبِي، وَسَدِّدْ لِسَانِي، وَاسْلُلْ سَخِيمَةَ قَلْبِي»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتوویەتی: بیستم پێغەمبەر ﷺ ئەم دوعایەی دەکرد (دەیفەرموو): پەروەردگارم (بۆ هەموو کارێکی چاکە) یارمەتیم بدەو، یارمەتی (هیچ کەسێك و شتێك مەدە) بەسەرمەوە، وە (بەسەر دوژمن و نەفس و شەیتان) سەرمبخەو کەسیش سەرمەخە بەسەرمەوە، وە بە پلان یارمەتیم بدە (بۆ سەرکەوتن بەسەر دوژمن و تێکشکاندنی)، وە پیلان مەبەخشە بە دوژمنانم تا بەسەرمدا زاڵبن، وە ڕێگەی هیدایەتم بۆ ئاسان بکە، وە سەرمبخە بەسەر ئەو کەسەی کە ستەمم لێدەکات، پەروەردگارم بمگێڕە بە کەسێك کە زۆر سوپاست دەکات، زۆر یادت دەکات، زۆر لێت دەترسێت، زۆر گوێڕایەڵی تۆیە، زۆر ملکەچی تۆیە، زۆر دەگەڕێتەوەو بۆ لای تۆو تەوبە دەکات، خوایە تەوبەکەم گیرا بکەو، تاوانەکانم بشۆرەو، وەڵامی پاڕانەوەم بدەیتەوەو، دڵم ڕێنمایی بکەو، زمانم ڕاست و ڕێك بکە کە هەق بپێکێ و پاراوی بکەو، شتە تاریکەکانی ناو دڵم دەربێنە (واتە: هەرچی شتی نابەجێیە کە لە دڵدایە دەریبێنە).

٥٧٢- «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ كَعْبٍ الْقُرَظِيِّ قَالَ مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَلَى الْمِنْبَرِ: إِنَّهُ لَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ، وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعَ اللَّهُ، وَلَا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْهُ الْجَدُّ، وَمَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ، سَمِعْتُ هَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى هَذِهِ الْأَعْوَادِ»[٢].

واتە: موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەظی دەڵێ: موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان (خوا لێی ڕازی بێ) لەسەر مینبەر گوتی: (خوایە) هیچ ڕێگرێك نیەو ناتوانێ ڕێگری بکات لەوەی تۆ دەیبەخشیت، وە هیچ بەخشەرێك نیە بۆ شتێك، کە تۆ ڕێگری بکەیت و نەیبەخشی، وە هیچ خاوەن سەروەتێك سەروەتەکەی سوودی پێ ناگەیەنێ لەلای خوا (تەنها کردار سوودی دەبێ)، وە هەر کەسێك کە خوا بیەوێ چاکەی لەگەڵ بکات ئەوە شارەزاو تێگەیشتووی دەکات لە ئاییندا، جا گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو ئەم وشەو ڕستانەی دەفەرموو لەسەر ئەو چەند پارچە دارە (واتە: لەسەر ئەم مینبەرە).

---

(١) صحيح: «تخريج المشكاة» «٢٤٨٨/ التحقيق الثاني)، «الظلال» (٣٨٤): (الترمذي: ٤٥- كتاب الدعوات، ١٠٢- باب: في دعاء النبي ﷺ. إبن ماجه: ٣- كتاب الدعاء، ٢- باب: دُعَاءِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ح ٣٨٣٠).

(٢) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٣٤٩)، «السلسلة الصحيحة» (١١٩٤و ١١٩٥).

٥٧٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدْعُو: «اللَّهُمَّ أَصْلِحْ لِي دِينِي الَّذِي هُوَ عِصْمَةُ أَمْرِي، وَأَصْلِحْ لِي دُنْيَايَ الَّتِي فِيهَا مَعَاشِي، وَاجْعَلِ الْمَوْتَ رَحْمَةً لِي مِنْ كُلِّ سُوءٍ»»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای دەكرد (دەیفەرموو): خوایە دینداریەكەم چاك بكەی، كە پارێزەری ئیش و كارەكانمە، وە كاروباری دونیاشم بۆ چاك بكەی، كە ژیان و گوزەرانمی تێدایە، وە مردنیش بكەیە مایەی بەزەیی پێداهاتنەوەم لە هەموو خراپەیەك.

٥٧٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَعَوَّذُ مِنْ جَهْدِ الْبَلَاءِ، وَدَرَكِ الشَّقَاءِ[٢]، وَسُوءِ الْقَضَاءِ، وَشَمَاتَةِ الْأَعْدَاءِ»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پەنای دەگرت لە: خراپی بەڵاو ناڕەحەتی توند، وە لە گەیشتن بە لەناوچوون و بەدبەختی (یاخود گەیشتن بە دۆزەخ و بەدبەخت بوون)، وە لە قەدەرو سەرەنجامی خراپ، وە لە دڵ پێخۆشبوونی دوژمن.

٥٧٥- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ وَالْهَرَمِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ»»[٤].

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە بێ توانایی و تەنبەڵی، وە پەنات پێ دەگرم لە ترسنۆكی و پیریی (واتە: پیرییەكی پەككەوتە)، وە پەنات پێ دەگرم لە بەڵاو ئاشووبی ژیان و مردن، وە پەنات پێ دەگرم لە سزای گۆڕ.

٥٧٦- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ، وَالْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ، وَضَلَعِ الدَّيْنِ، وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ»»[٥].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: خوایە من پەنات پێ دەگرم لە خەمخواردن و دڵتەنگی و، بێ توانایی و، تەنبەڵی و، ترسنۆكی و، ڕەزیلی و، بارگرانیی قەرزو، زاڵبوونی پیاوانی دوژمن بەسەرماندا.

---

(١) صحيح: «الروض النضير» (١١١٢): (مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء والاستغفار، ح ٧١).

(٢) درك الشقاء: أي شدة المشقة في أمور الدنيا وضيقها عليه وحصول الضرر البالغ في بدنه أو أهله أو ماله، وقد يكون باعتبار الأمور الأخروية....»فضل الله الصمد».

(٣) صحيح: «تخريج السنة» (٣٨٢، ٣٨٣): (البخاري: ٨٢- كتاب القدر، ١٠٣- باب: من تعوذ من درك الشقاء. مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء، ح ٥٣).

(٤) صحيح: «الإرواء» (٣/٣٥٧-٣٥٨) «صحيح أبي داود» (١٣٧٧) (البخاري: ٨٠- كتاب الدعوات، ٣٨- باب: التعوذ من فتنة المحيا والممات. مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء، ح ٥٠).

(٥) صحيح: «غاية المرام» (٣٤٧). (البخاري: ٥٦- كتاب الجهاد، ٧٤- من غزا بصبي للخدمة).

٥٧٧- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ مِنْ دُعَاءِ النَّبِيِّ ﷺ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، إِنَّكَ أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَالْمُؤَخِّرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ»»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: یەكێك لە دوعاكانی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو (دەیفەرموو): خوایە لەو گوناهانەم خۆشبە كە پێشتر كردوومن و ئەوانەشی كە لە داهاتوودا دەیانكەم، وە ئەو گوناهانەی كە بە نهێنی كردوومن و ئەوانەشی كە بە ئاشكرا كردوومن، وە ئەو كردەوەو تاوانانەش كە تۆ زاناتری پێیان بە خۆم، بێگومان تۆ پێشخەرو پاشخەریت (تۆیت فەزڵی شتەكان پێش و پاش دەخەیت و پێوەری پێشكەوتن و دواكەوتن هەر لەلای تۆیە)، هیچ پەرستراوێك نیە (بە هەق) جگە لە تۆ.**

٥٧٨- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَدْعُو: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهُدَى، وَالْعَفَافَ، وَالْغِنَى، وَالتُّقَى»»[2].

**واتە: عەبدوڵلا (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای دەكرد (دەیفەرموو): خوایە من داوای ڕێنمایی و، پاكی (لە هەمووو نەشیاوێك)و، دەوڵەمەندیی و، پارێزكاریت لێدەكەم.**

٥٧٩- «عَنْ ثُمَامَةَ بْنِ حَزْنٍ قَالَ: سَمِعْتُ شَيْخاً يُنَادِي بِأَعْلَى صَوْتِهِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الشَّرِّ لَا يَخْلِطُهُ شَيْءٌ، قُلْتُ: مَنْ هَذَا الشَّيْخُ؟ قِيلَ: أَبُو الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)»[3].

**واتە: ثومامەی كوڕی حەزن دەڵێ: گوێم لە پیاوێكی بە تەمەن بوو بە دەنگی بەرز دەیگوت: ئەی خوایە پەنا دەگرم بە تۆ لە خراپەیەك كە هیچ شتێكی لەگەڵدا تێكەڵ نەبووە (واتە: شەڕێكی پڕ لە خراپە)، گوتم: ئەوە كێیە؟ گوتیان: ئەبو دەرداء (خوا لێی ڕازی بێ).**

٥٨٠- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ طَهِّرْنِي بِالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ وَالْمَاءِ الْبَارِدِ، كَمَا يُطَهَّرُ الثَّوْبُ الدَّنِسُ مِنَ الْوَسَخِ، ثُمَّ يَقُولُ: اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ مِلْءَ السَّمَاءِ وَمِلْءَ الْأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ»»[4].

**واتە: عەبدوڵلای كوڕی ئەبو ئەوفا (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، كە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: خوایە بە بەفرو تەرزەو ئاوی سارد پاكم بكەرەوە، هەروەك چۆن پۆشاكی پیس لە چڵك و پیسی پاك دەكرێتەوە، پاشان دەیفەرموو: ئەی خوای پەروەردگارمان سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە، بە پڕی ئاسمان و زەوی، هەروەها بە پڕی ئەوەی تۆ دەتەوێ دوای ئەوە.**

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٩٤٤): (البخاري: ١٩-كتاب التهجد، ١- باب: التهجد بالليل. ٦-كتاب صلاة المسافرين، ح ١٩٩).

(٢) صحيح: «تخريج فقه السيرة» (٤٨١): (مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء، ح ٧٢).

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح.

٥٨١- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُكْثِرُ أَنْ يَدْعُوَ بِهَذَا الدُّعَاءِ: «اللَّهُمَّ آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ»»[1].

**واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ زۆر دەپاڕایەوە بەم دوعایە: خوایە لە دونیادا چاکەمان پێ ببەخشی، وە لە دوارۆژیشدا چاکەمان پێ ببەخشی، وە لە سزای ئاگر بمانپارێزی.**

٥٨٢- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْفَقْرِ وَالْقِلَّةِ وَالذِّلَّةِ، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ»»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: خوایە پەنا دەگرم بە تۆ لە هەژاری و نەبوونی و زەبوونی، وە پەنا دەگرم بە تۆ لەوەی کە ستەم بکەم، یان ستەمم لێ بکرێ.**

٥٨٣- «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم)، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ النَّارِ»»[3].

**واتە: عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکی و باپیریەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، دەڵێ: بیستم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: خوایە پەنا بە تۆ دەگرم لە خراپەو ئاشووبی مەسیحی دەجال، وە پەنا بە تۆ دەگرم لە ئاشووب و فیتنەی ئاگر.**

٥٨٤- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ أَكْثَرُ دُعَاءِ النَّبِيِّ ﷺ: «اللَّهُمَّ آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ»»[4].

**واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: زۆربەی پاڕانەوەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەمە بوو: خوایە لە دونیادا چاکەمان پێ ببەخشەو، لە دوارۆژیش دا هەر چاکەمان پێ ببەخشەو، لە ئاگریش بمانپارێزە.**

٥٨٥- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ: «اللَّهُمَّ يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ! ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ»»[5].

---

(١) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٣٥٩): (البخاري: ٨٠- كتاب الدعوات، ٥٥-باب: قول النبي ﷺ.. الخ. ربنا آتنا. مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء، ح ٢٦، ٢٧).

(٢) صحيح: «الإرواء» (٨٦٠)، «تخريج فقه السيرة» (٤٨١)، «صحيح أبي داود) (١٣٨١): (أبو داود: ٨-كتاب الوتر، ٣٢- باب: في الاستعاذة ح ١٥٤٤. النسائي: ٥٠- كتاب الاستعاذة ١٤- بالاستعاذة من الذلة).

(٣) حسن صحيح.

(٤) صحيح.

(٥) صحيح: «ظلال الجنة» (٢٢٥): (الترمذي: ٣٠- كتاب القدر، ٧- باب: ماجاء أن القلوب بين إصبعي الرحمن).

**واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ زۆر دەیفەرموو: ئەی هەڵگێڕەوەو هەڵسوڕێنەری دڵەکان! دڵم لەسەر ئایینەکەت بچەسپێنە.**

٥٨٦- «عَن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَدْعُو: «اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ مِلْءَ السَّمَاوَاتِ وَمِلْءَ الْأَرْضِ، وَمِلْءَ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ، اللَّهُمَّ طَهِّرْنِي بِالْبَرْدِ وَالثَّلْجِ وَالْمَاءِ الْبَارِدِ، اللَّهُمَّ طَهِّرْنِي مِنَ الذُّنُوبِ، وَنَقِّنِي كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ»»[1].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەپاڕایەوەو دەیفەرموو: ئەی خوایە سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە، بە پڕی ئاسمان و زەوی و، هەروەها بە پڕی ئەوەی تۆ دەتەوێ دوای ئەوە، ئەی خوایە بە بەفرو تەرزەو ئاوی سارد پاکم بکەرەوە، خوایە گیان پاکم بکەرەوە لە گوناح، وە پاکم بکەرەوە هەروەکو چۆن پۆشاکی سپی لە چڵك و پیسی پاك دەکرێتەوە.**

٥٨٧- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: كَانَ مِنْ دُعَاءِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ زَوَالِ نِعْمَتِكَ، وَتَحَوُّلِ عَافِيَتِكَ، وَفُجَأَةِ نِقْمَتِكَ، وَجَمِيعِ سَخَطِكَ»»[2].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: یەکێك لە پاڕانەوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بوو (دەیفەرموو): خوایە گیان پەنات پێدەگرم لە نەمانی نیعمەتەکانت و، گۆڕانی لەشساغی تۆ لەسەرم (واتە: خۆم دەپارێزم بە تۆ لەوەی تەندروستیم بگۆڕێت لە لەشساغی بۆ نەخۆشی)، وە (پەنات پێ دەگرم) لە بەڵای لە ناکاوت، وە لە هەموو جۆرەکانی تووڕەبوونت.**

## دەربارەی: دوعای کاتی باران بارین

٥٨٨- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا رَأَى نَاشِئاً فِي أُفُقٍ مِنْ آفَاقِ السَّمَاءِ، تَرَكَ عَمَلَهُ «وَإِنْ كَانَ فِي صَلَاةٍ» ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْهِ، فَإِنْ كَشَفَهُ اللَّهُ حَمِدَ اللَّهَ، وَإِنْ مَطَرَتْ قَالَ: «اللَّهُمَّ صَيِّباً نَافِعاً»»[3].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك پەڵە هەورێکی دەبینی لە ئاسۆی ئاسمان، وازی لە کاری خۆی دەهێناو «ئەگەرچی لە نێو نوێژیش دا بووایە» پاشان ڕووی دەکردە هەورەکە، ئەگەر خوا هەورەکەی لابردبایە ئەوە سوپاسی خوای دەکرد، وە ئەگەر باران باریبایە، ئەوە دەیفەرموو: خوایە بارانێکی باش و بە سوود بێ.**

---

(١) صحيح: «الإرواء» (٣٤٦). «صحيح أبي داود» (٧٩٢): (مسلم: ٤٠-كتاب الصلاة، ح٢٠٤).

(٢) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٣٨٢): (أبو داود: ٨- كتاب الوتر، ٣٢- باب: في الاستعاذة).

(٣) صحيح: «المشكاة» (١٥٢٠)، «الصحيحة» (٢٧٥٧): (البخاري: ١٥- كتاب الاستسقاء، ٢٣- باب: ماذا يقال إذا أمطرت).

## دەربارەی: دوعای کاتی مردن

٥٨٩- «عَنْ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنِي قَيْسٌ قَالَ: أَتَيْتُ خَبَّاباً (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، وَقَدِ اكْتَوَى سَبْعاً، وَقَالَ: لَوْلَا أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَانَا أَنْ نَدْعُوَ بِالْمَوْتِ لَدَعَوْتُ بِهِ»[١].

واته: ئیسماعیل دەڵێ: قەیس پێی گوتم: چوومە لای خەبباب (خوا لێی ڕازی بێ)، لە کاتێکدا حەوت جار (سکی) داغ کرابوو (بۆ چارەسەر)، جا گوتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێکردووین داوای مردن بکەین، ئەوە داوای مردنم دەکرد.

## دەربارەی: دوعاکانی پێغەمبەر ﷺ

٥٩٠- «عَنِ ابْنِ أَبِي مُوسَى، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَدْعُو بِهَذَا الدُّعَاءِ: «رَبِّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي وَجَهْلِي، وَإِسْرَافِي فِي أَمْرِي كُلِّهِ، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي خَطَئِي كُلَّهُ، وَعَمْدِي وَجَهْلِي وَهَزْلِي، وَكُلُّ ذَلِكَ عِنْدِي. اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، وَأَنْتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ»»[٢].

واته: کوڕی ئەبو مووسا، لە باوکیەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ ئەم دوعایەی دەکرد (دەیفەرموو): پەروەردگارا لە گوناهەکانم و، نەزانیم و زێدەڕۆییم لە کاروبارەکانم خۆشبەو، هەروەها لەوەشدا (لێم خۆشبە) کە تۆ پێی شارەزاتری لە من (تۆ دەیزانی و من نایزانم)، خوایە گیان! لە هەموو هەڵەکانم و، ئەنقەستەکانم و، نەزانیەکانم و، گاڵتەکانم خۆشبە، هەموو ئەوانە لە منەوە بووەو ڕوویداوە، خوایە گیان! لەو (گوناهانەم) خۆشبە کە پێشتر کردوومن و لەوەشدا کە لەمەودوا دەیکەم، وە لەوەشدا کە بە نهێنی کردوومن و لەوەش کە بە ئاشکرا کردوومن، تۆ پێشخەرو پاشخەریت (هەموو پلەبەندی مەخلوقەکان لە پێشخستن و پاشخستنیان تایبەتە بە تۆ)، وە تۆ لەسەر هەموو شتێك بە توانای.

٥٩١- «عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهُ كَانَ يَدْعُو: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي وَجَهْلِي وَإِسْرَافِي فِي أَمْرِي، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي هَزْلِي وَجِدِّي، وَخَطَئِي وَعَمْدِي، وَكُلُّ ذَلِكَ عِنْدِي»»[٣].

---

(١) صحيح: «أحكام الجنائز» (٥٩): (البخاري: ٧٥- كتاب المرضي، ١٩- باب: تمني المريض الموت . مسلم: ٤٨-كتاب الذكر والدعاء، ح ١٢).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٩٤٤): (البخاري: ٨٠- كتاب الذكر والدعاء، ح ٧٠).

(٣) صحيح: انظر ما قبله.

واتە: ئەبو مووسای ئەشعەریی (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ ئەم دوعایەی دەکرد: خوایە! لە گوناهەکانم و، نەزانیم و، زێدەڕۆییم لە کاروبارەکانم خۆشبەو، هەروەها لەوەشدا (لێم خۆشبە) کە تۆ پێی شارەزاتری لە من (تۆ دەیزانی و من نایزانم)، خوایە! لە گاڵتەکانم و، جدیەکانم و، هەڵەکانم و، ئەنقەستەکانم خۆشبە، هەموو ئەوانە لە مندا هەیە.

٥٩٢- «عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَخَذَ بِيَدِي النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «يَا مُعَاذُ»، قُلْتُ: لَبَّيْكَ، قَالَ: «إِنِّي أُحِبُّكَ»، قُلْتُ: وَأَنَا وَاللَّهِ أُحِبُّكَ، قَالَ: «أَلَا أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ تَقُولُهَا فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاتِكَ»؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: «قُلِ: اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ، وَشُكْرِكَ، وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ»»[١].

واتە: موعازی کوڕی جەبەل (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستی گرتم و فەرمووی: ئەی موعاز، گوتم: لە خزمەتتدام ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: من تۆم خۆشدەوێ، منیش گوتم: منیش سوێند بە خوا خۆشمدەوێی، (پێغەمبەری خوا ﷺ) فەرمووی: ئایا فێری چەند ڕستەیەکت نەکەم کە لە دوای هەموو نوێژەکانەوە بیانڵێی؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: بڵێ: (اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ، وَشُكْرِكَ، وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ)، واتە: خوایە! یارمەتیم بدە لەسەر زیکرو یادو سوپاسکردن و جوان پەرستنی خۆت.

٥٩٣- «عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَجُلٌ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ: الْحَمْدُ لِلهِ حَمْداً كَثِيراً طَيِّباً مُبَارَكاً فِيهِ. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ صَاحِبُ الْكَلِمَةِ؟ فَسَكَتَ، وَرَأَى أَنَّهُ هَجَمَ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى شَيْءٍ كَرِهَهُ، فَقَالَ: «مَنْ هُوَ»؟ فَلَمْ يَقُلْ إِلَّا صَوَاباً، فَقَالَ رَجُلٌ: أَنَا، أَرْجُو بِهَا الْخَيْرَ، فَقَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، رَأَيْتُ ثَلَاثَةَ عَشَرَ مَلَكاً يَبْتَدِرُونَ أَيُّهُمْ يَرْفَعُهَا إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ»»[٢].

واتە: ئەبو ئەییوبی ئەنصاریی (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێك لە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: (الْحَمْدُ لِلهِ حَمْداً كَثِيراً طَيِّباً مُبَارَكاً فِيهِ)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: کێ بوو ئەو قسەیەی گوت؟ کابرا بێدەنگ بوو (نەوێرا خۆی دەربخات)، پێی وا بوو پێغەمبەر ﷺ هێرشی دەکاتە سەرو سەرزەنشتی دەکات لەسەر شتێك کە پێی ناخۆشە، جا (دووبارە) فەرمووی: ئەوە کێ بوو؟ ئەو کەسە جگە لە قسەی باش هیچی نەگوتوە، جا پیاوەکە (کە دڵنیا بوو سەرزەنشت لە بابەتەکەدا نیە) گوتی: من بووم، نیازی خێرم پێی هەیە (بۆ ئەوە گوتم پاداشت وەربگرم)، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، سێزدە فریشتەم بینین، کە پەلەیان دەکرد کامیان بینووسن و کارەکە بۆ لای خوای (عَزَّ وَجَلَّ) بەرز بکەنەوە.

٥٩٤- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَدْخُلَ الْخَلَاءَ قَالَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبْثِ وَالْخَبَائِثِ»»[٣].

---

(١) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٣٦٢): (أبو داود: ٨- الوتر، ٢٦- الاستغفار، ح ١٥٢٢. النسائي: ١٣- السهو، ٦٠- نوع آخر من الدعاء).

(٢) صحيح لغيره إلا العدد: والمحفوظ: بضعة وثلاثون، «المشكاة» (٩٩٢/التحقيق الثاني).

(٣) صحيح: «الإرواء» (٥١): (البخاري: ٤-كتاب الوضوء، ٩- باب: ما يقول عند الخلاء. مسلم: ٣-كتاب الحيض، ح ١٢٢).

**واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ دەیوست بچێتە ئاودەست، دەیفەرموو: خوایە! پەنا بە تۆ دەگرم لە جنۆکەی نێرو مێ.**

٥٩٥- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا خَرَجَ مِنَ الْخَلَاءِ قَالَ: «غُفْرَانَكَ»»[١].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك دەهاتەدەر لە شوێنی دەست بە ئاو گەیاندن، دەیفەرموو: (داواکاری) لێخۆشبونتم و لێم خۆشبە، (چونکە لەم ماوەیەی لەو شوێنە بووە، زیکرو یادی خوای نەکردوە).**

٥٩٦- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعَلِّمُنَا هَذَا الدُّعَاءَ كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ: «أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْقَبْرِ»»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فێری ئەم دوعایەی دەکردین هەروەك چۆن فێری سوورەتێکی قورئانی دەکردین (دوعایەکەش ئەمەیە): خوایە پەنات پێدەگرم لە ئاگری دۆزەخ، وە پەنات پێدەگرم لە سزای گۆڕ، وە پەنات پێدەگرم لە بەڵاو ئاشووبی مەسیحی دەجال، وە پەنات پێدەگرم لە بەڵاو ئاشووبی ژیان و مردن، وە پەنات پێدەگرم لە بەڵاو ئاشووبی نێو گۆڕ.**

٥٩٧- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: بِتُّ عِنْدَ مَيْمُونَةَ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ فَأَتَى حَاجَتَهُ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، ثُمَّ نَامَ، ثُمَّ قَامَ فَأَتَى الْقِرْبَةَ فَأَطْلَقَ شِنَاقَهَا، ثُمَّ تَوَضَّأَ وُضُوءاً بَيْنَ وُضُوءَيْنِ، لَمْ يُكْثِرْ وَقَدْ أَبْلَغَ، فَصَلَّى، فَقُمْتُ فَتَمَطَّيْتُ كَرَاهِيَةَ أَنْ يَرَى أَنِّي كُنْتُ أَبْقِيهِ، فَتَوَضَّأْتُ، فَقَامَ يُصَلِّي، فَقُمْتُ عِنْدَ يَسَارِهِ، فَأَخَذَ بِأُذُنِي فَأَدَارَنِي عَنْ يَمِينِهِ، فَتَتَامَّتْ صَلَاتُهُ مِنَ اللَّيْلِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، ثُمَّ اضْطَجَعَ فَنَامَ حَتَّى نَفَخَ، وَكَانَ إِذَا نَامَ نَفَخَ، فَآذَنَهُ بِلَالٌ بِالصَّلَاةِ، فَصَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ، وَكَانَ فِي دُعَائِهِ: اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُوراً، وَفِي سَمْعِي نُوراً، وَعَنْ يَمِينِي نُوراً، وَعَنْ يَسَارِي نُوراً، وَفَوْقِي نُوراً، وَتَحْتِي نُوراً، وَأَمَامِي نُوراً، وَخَلْفِي نُوراً، وَأَعْظِمْ لِي نُوراً، قَالَ كُرَيْبٌ: وَسَبْعاً فِي التَّابُوتِ. فَلَقِيتُ رَجُلاً مِنْ وَلَدِ الْعَبَّاسِ، فَحَدَّثَنِي بِهِنَّ، فَذَكَرَ: عَصَبِي، وَلَحْمِي، وَدَمِي، وَشَعْرِي، وَبَشَرِي، وَذَكَرَ خَصْلَتَيْنِ»[٣].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: شەو لە لای مەیمونە مامەوە (کە پووری بووەو خێزانی پێغەمبەریشە ﷺ)، جا پێغەمبەر ﷺ چووە سەرئاوو، ڕووخسارو دەستەکانی شوشتن، دواتر خەوت، پاشان هەڵساو، چوو بۆ لای مەتارەکەی ئاو و پەتەکەی کردەوە، دواتر دەستنوێژی**

---

(١) صحيح: «الإرواء» (٥٢)، «صحيح أبي داود» (٢٢): (الترمذي: ١-كتاب الطهارة، ٥- باب: ما يقول إذا خرج من الخلاء).

(٢) صحيح: «المشكاة» (٩٤١): (مسلم: ٥-كتاب المساجد ومواضع الصلاة ح ١٣٤).

(٣) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٢٢٦): (البخاري: ٤- كتاب الوضوء، ٥- باب: التخفف في الوضوء. مسلم: ٦١- كتاب صلاة المسافرين، ح ١٨١ واللفظ له).

شۆرد بە دەستنوێژ شۆردنێکی نێوانی دوو دەستنوێژ شۆردن، سێ جار نەیشۆرد لەکاتێکدا بە تێروتەسەلیش شۆردی (واتە: یەك جاری بە ڕێك و تەواوی شۆرد)و، منیش هەڵسام و، خۆم دواخست، پێم خۆش نەبوو بزانێ کە من ماوم و منیش دێم بۆ ئەوەی وا نەکەم لەبەر من ئاو بهێڵێتەوە، جا دەستنوێژم هەڵگرت، ئەویش دەستی کرد بە نوێژ کردن و، لە لای چەپەی ئەو وەستام، جا (بە نەرمی) گوێی گرتم و هێنامیە لای ڕاستی، شەو نوێژەکەی سێزدە ڕکات بوون، پاشان پاڵکەوت و، خەوت تا پرخەی هات، جا (عادەتی وابوو) کاتێك بخەوتایە پرخەی دەهات، بیلال بانگی کرد بۆ نوێژو، نوێژی کردو دەستنوێژی هەڵنەگرتەوە، جا لە پاڕانەوەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوو، دەیفەرموو: خوایە نوورو ڕۆشنایی بخە نێو دڵم و، بیستنم و، لای ڕاستم و، لای چەپەم و، سەرەوەم و، خوارەوەم و، بەردەمم و، پشتم و، نوورو ڕۆشناییم بۆ زیاد بکە، کوڕەیب دەڵێ: حەوت جار لە تابوتەکەدا، گەیشتمە پیاوێك کە لە ڕۆڵەکانی عەبباس بوو، ئەوانەی بۆ باسکردم، باسی ئەمانەی کرد: دەمارو گۆشت و موو و پێست، دوو تایبەتمەندی تری باسکرد (واتە: خوایە نوورو ڕۆشنایی بخە نێو دەمارو گۆشت و موو و پێستم).

٥٩٨- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ، فَصَلَّى فَقَضَى صَلَاتَهُ، يُثْنِي عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ يَكُونُ مِنْ آخِرِ كَلَامِهِ: «اللَّهُمَّ اجْعَلْ لِي نُوراً فِي قَلْبِي، وَاجْعَلْ لِي نُوراً فِي سَمْعِي، وَاجْعَلْ لِي نُوراً فِي بَصَرِي، وَاجْعَلْ لِي نُوراً عَنْ يَمِينِي، وَنُوراً عَنْ شِمَالِي، وَاجْعَلْ لِي نُوراً مِنْ بَيْنَ يَدَيَّ، وَنُوراً مِنْ خَلْفِي، وَزِدْنِي نُوراً، وَزِدْنِي نُوراً، وَزِدْنِي نُوراً»»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێك شەو هەڵدەستا نوێژ بکات، کە نوێژی تەواو دەکرد، ستایش و سەنای خوای دەکرد بەو شێوەی کە شایەنیەتی، دواتر لە کۆتایی فەرمایشتەکانی دەیفەرموو: خوایە نوورو ڕۆشنایی بخە نێو دڵم و، بیستنم و، بینینم و، لای ڕاستم و، لای چەپەم و، بەردەمم و، پشتم و، نوورو ڕۆشناییم بۆ زیاد بکە، نوورو ڕۆشناییم بۆ زیاد بکە، نوورو ڕۆشناییم بۆ زیاد بکە.

٥٩٩- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما): كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ قَالَ: «اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ، أَنْتَ قَيَّامُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، أَنْتَ الْحَقُّ، وَوَعْدُكَ الْحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ الْحَقُّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ. اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، أَنْتَ إِلَهِي، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ»»[٢].

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح: «صفة الصلاة» «صحيح أبي داود» (٧٤٥): (البخاري: ١٩-كتاب التهجد، ١- باب: التهجد بالليل. مسلم: ٦-كتاب صلاة المسافرين، ح١٩٩).

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێك دەرەنگانی شەو هەڵدەستا نوێژ بكات، دەیفەرموو: خوایە ستایش بۆ تۆ، تۆ ڕۆشنایی ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی تێیاندایە، وە تۆ ڕاگری ئاسمانەكان و زەوی، وە ستایش بۆ تۆ كە پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی تێیاندایە، تۆ هەقی، وە بەڵێنت هەقە، وە پێگەیشتنت هەقە، وە بەهەشت هەقە، وە دۆزەخ هەقە، وە دونیا تێكچوون هەقە، خوایە بۆ تۆ ملكەچ بووم، وە بڕوام پێ هێناوی، وە پشتم پێ بەستووی، وە گەڕاومەوە بۆ لات، وە هەرچی كێشەیەك هەم بێ بە تۆم سپاردوە، وە دادوەری خۆم بۆ لات هێناوە، دەجا لە گوناهەكانی ڕابردوو و داهاتووم خۆشبە، لەو گوناهانەشم كە بە نهێنی و ئاشكرا كردوومن، تۆ پەرستراوی منی، جگە لە تۆ هیچ پەرستراوی بە هەق نین.

٦٠٠- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَدْعُو: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَافِيَةَ فِي دِينِي وَأَهْلِي، وَاسْتُرْ عَوْرَتِي، وَآمِنْ رَوْعَتِي، وَاحْفَظْنِي مِنْ بَيْنَ يَدَيَّ، وَمِنْ خَلْفِي، وَعَنْ يَمِينِي، وَعَنْ يَسَارِي، وَمِنْ فَوْقِي، وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي»»[1].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: كە پێغەمبەر ﷺ دوعای دەكرد، (دەیفەرموو): خوایە! داوای لێخۆشبوون و سەلامەتی لە تۆ دەكەم لە دونیاو لە دوارۆژدا، خوایە! داوای سەلامەتیت لێ دەكەم لە دینم و ماڵ و منداڵم، وە كەم و كوڕیم داپۆشەو، ترسەكانم مەهێڵەو، بمپارێزە لە پێشمەوەو، لە پشتمەوەو، لە لای ڕاستمەوەو، لە لای چەپمەوەو، لە سەرمەوە (واتە: لە گشت لاكانم بمپارێزە كە بەڵای لێوە دێن)، وە پەنا دەگرم بە تۆ لەوەی لە ژێرەوە بپێكرێم (واتە: لەوەی خەسف بكرێم و ڕۆبچم بە زەویدا، یان سزا بدرێم لەلایەن مرۆڤەكانەوە لە ژێرەوە).

٦٠١- «عَنْ عُبَيْد بْن رِفَاعَةَ الزُّرَقِيُّ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ وَانْكَفَأَ الْمُشْرِكُونَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اسْتَوُوا حَتَّى أُثْنِيَ عَلَى رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ، فَصَارُوا خَلْفَهُ صُفُوفًا، فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ كُلُّهُ، اللَّهُمَّ لَا قَابِضَ لِمَا بَسَطْتَ، وَلَا مُقَرِّبَ لِمَا بَاعَدْتَ، وَلَا مُبَاعِدَ لِمَا قَرَّبْتَ، وَلَا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلَا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ. اللَّهُمَّ ابْسُطْ عَلَيْنَا مِنْ بَرَكَاتِكَ وَرَحْمَتِكَ وَفَضْلِكَ وَرِزْقِكَ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ النَّعِيمَ الْمُقِيمَ الَّذِي لَا يَحُولُ وَلَا يَزُولُ. اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ النَّعِيمَ يَوْمَ الْعَيْلَةِ، وَالْأَمْنَ يَوْمَ الْحَرْبِ، اللَّهُمَّ عَائِذاً بِكَ مِنْ سُوءِ مَا أَعْطَيْتَنَا، وَشَرِّ مَا مَنَعْتَ مِنَّا. اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الْإِيمَانَ وَزَيِّنْهُ فِي قُلُوبِنَا، وَكَرِّهْ إِلَيْنَا الْكُفْرَ وَالْفُسُوقَ وَالْعِصْيَانَ، وَاجْعَلْنَا مِنَ الرَّاشِدِينَ. اللَّهُمَّ تَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ، وَأَحْيِنَا مُسْلِمِينَ، وَأَلْحِقْنَا بِالصَّالِحِينَ، غَيْرَ خَزَايَا وَلَا مَفْتُونِينَ. اللَّهُمَّ قَاتِلِ الْكَفَرَةَ الَّذِينَ يَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِكَ، وَيُكَذِّبُونَ رُسُلَكَ، وَاجْعَلْ عَلَيْهِمْ رِجْزَكَ وَعَذَابَكَ. اللَّهُمَّ قَاتِلِ الْكَفَرَةَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ، إِلَهَ الْحَقِّ»[2].

---

(١) صحيح: «الكلم الطيب» (٢٧) المشكاة (٢٣٩٧): (أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ١٠١- باب: ما يقول إذا أصبح، ح ٥٠٧٤. إبن ماجه: ٣٤- كتاب الدعاء، ١٤- باب: ما يدعو به الرجل إذ أصبح وإذا أمسى، ح ٣٨٧١).

(٢) صحيح: «تخريج فقه السيرة» (٢٦٤).

واتە: عەبدورڕەحمانی کوڕی ڕیفاعەی زوڕەقی، لە باوکیەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەو کاتەی کە جەنگی ئوحود بوو، هاوبەشدانەران گەڕانەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕێك ڕاوەستن، بۆ ئەوەی سەناو ستایشی پەروەردگارم (عَزَّ وَجَلَّ) بکەم، مسوڵمانان لە پشتەوەی پێغەمبەر ﷺ بوون بە چەند ڕیزێك، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوایە ستایش هەمووی بۆ تۆیە، خوایە هیچ کەسێك ناتوانێ ئەوەی تۆ ناردووتە بیگێڕێتەوە، هیچ کەسێك ناتوانێ ئەو شتە ببەخشێ کە تۆ گرتۆتەوە، کەس ناتوانێ ئەو کەسە ڕێنمایی بکات کە تۆ (بە هۆی خراپی خۆیەوە) گومڕات کردوە، کەس ناتوانێ ئەو کەسە گومڕا بکات کە تۆ ڕێنماییت کردوە، کەس ناتوانێ ئەو شتە ببەخشێ کە تۆ قەدەغەت کردوە، کەس ناتوانێ ئەو شتە قەدەغە بکات کە تۆ بەخشیوتە، کەس نیە ئەوە نزیك بکاتەوە کە تۆ دوورت خستۆتەوە، ئەوەش دوورناخاتەوە کە تۆ نزیکت خستۆتەوە، خوایە بەرەکەت و میهرەبانیەکان و بەخششەکان و ڕزق و ڕۆزیەکانی خۆتمان بەسەردا بڕێژە، خوایە من داوای خۆشی ڕۆژی دواییت لێ دەکەم لەگەڵ ئەمین بوون و بێ ترس بوون لە ڕۆژی ترسدا، خوایە پەنا دەگرم لە خراپەی ئەوەی پێت بەخشیوین و لێتگرتووینەوە، خوایە ئیمان لە لامان خۆشەویست بکەو لە دڵەکانماندا جوانی بکە، کوفرو لادان و سەرپێچی لە لامان ناشیرین بکە، لە سەر ڕاستانمان بگێڕە، خوایە بە مسوڵمانی بمانمرێنە، بە مسوڵمانی بمانژیێنە، بمانگەیەنە بە پیاوچاکان، بە شێوەیەك کە نە سەرشۆڕبین و نە تووشی فیتنەو بەڵا بین، خوایە ئەو بێبڕوایانە بکوژەو لەناوبەرە، کە پێغەمبەرانی تۆ بە درۆ دەخەنەوەو بڕوایان پێیان نیەو دەبن بە لەمپەرو کۆسپ لە بەردەم ڕێبازی تۆ، خوایە سزای هەق و ڕەوای خۆتیان بەسەردا بدە.

## دەربارەی: دوعای کاتی گرفتاریی و ناخۆشی

٦٠٢- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَدْعُو عِنْدَ الْكَرْبِ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ»»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە کاتی ناخۆشی و گرفتاری ئەو دوعایەی دەکرد (دەیفەرموو): هیچ پەراستراوێك (بە هەق) نیە جگە لە اللّٰه، (کە سیفەتی وایە) گەورەو هێدیی و مەندە (دەسەڵاتی مەزنەو زووش مرۆڤ سزا نادات)، هیچ پەرستراوێك (بە هەق) نیە جگە لە اللّٰه، کە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و عەرشی مەزنە.

٦٠٣- «عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مَيْمُونٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرَةَ، أَنَّهُ قَالَ لِأَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا): يَا أَبَتِ، إِنِّي أَسْمَعُكَ تَدْعُو كُلَّ غَدَاةٍ: اللَّهُمَّ عَافِنِي فِي بَدَنِي، اللَّهُمَّ عَافِنِي فِي سَمْعِي، اللَّهُمَّ

---

(١) صحيح.

عَافِنِي فِي بَصَرِي، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، تُعِيدُهَا ثَلَاثاً حِينَ تُمْسِي، وَحِينَ تُصْبِحُ ثَلَاثاً، وَتَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكُفْرِ وَالْفَقْرِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، تُعِيدُهَا ثَلَاثاً حِينَ تُمْسِي، وَحِينَ تُصْبِحُ ثَلَاثاً. فَقَالَ: نَعَمْ، يَا بُنَيَّ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ بِهِنَّ، وَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَسْتَنَّ بِسُنَّتِهِ. قَالَ: وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «دَعَوَاتُ الْمَكْرُوبِ: اللَّهُمَّ رَحْمَتَكَ أَرْجُو، وَلَا تَكِلْنِي إِلَى نَفْسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ، وَأَصْلِحْ لِي شَأْنِي كُلَّهُ، لَا إِلَهَ أَلَا أَنْتَ»[١].

**واتە: جەعفەری کوڕی مەیمون دەڵێ: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە دەگێڕێتەوە، کە بە باوکی گوتووە (خوا لێیان ڕازی بێ): ئەی باوکە، من دەبیستم هەموو بەیانیەك ئەم دوعایە دەخوێنی: خوایە! لاشەم سەلامەت بکەی، خوایە! بیستنم سەلامەت بکەی، خوایە! بینینم سەلامەت بکەی، هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە تۆ کە شایستەی پەرستن بێ، سێ جار بەیانیان و ئێواران دەیڵێی، هەروەها دەڵێی: خوایە! پەنا دەگرم بە تۆ لە بێبڕوایی و، هەژاری، خوایە! پەنا بە تۆ دەگرم لە سزای گۆڕ، هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە تۆ کە شایستەی پەرستن بێ، سێ جار بەیانیان و ئێواران دووبارە دەیڵێیەوە، (ئەویش) گوتی: بەڵێ، کوڕەکەم، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە ئەوانەی دەخوێندن، منیش حەز دەکەم لەسەر سوننەتی ئەو بڕۆم، گوتی: هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوعاکانی کەسێك کە تووشی گرفتاریی و ناخۆشی بووە ئەمەیە (بڵێ): خوایە! ئومێدی میهرەبانی تۆ دەکەم، وە مەمخەرە دەست دەروونی خۆم بۆ چاو تروکانێکیش، هەموو کاروبارەکانم بۆ چاك بکە، هیچ پەرستراوێك جگە لە تۆ شایستەی پەرستن نیە، خوایە بێبڕوایان بکوژە، ئەوانەی خاوەنی کتێبن و (ئیسلام بە درۆ دەزانن) ئەی خوای هەق.**

٦٠٤- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ عِنْدَ الْكَرْبِ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَرَبُّ الْأَرْضِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ، اللَّهُمَّ اصْرِفْ شَرَّهُ»[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی حاریس دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عەبباس بوو (خوا لێیان ڕازی بێ) دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ لە کاتی گرفتاریی و ناخۆشی دەیفەرموو: هیچ پەرستراوێك نیە (شایەنی پەرستن بێ) جگە لە خوای گەورەو هێدیی و مەند، هیچ پەرستراوێك نیە (شایەنی پەرستن بێ) جگە لە پەروەردگاری عەرشی مەزن، هیچ پەرستراوێك نیە (شایەنی پەرستن بێ) جگە لە پەروەردگاری ئاسمانەکان و پەروەردگاری زەوی و پەروەردگاری عەرشی بەڕێز، خوایە! خراپەی ئەوەمان لەسەر لادە (ئنجا ناوی ئەو شتەی دەهێنا کە تووشی بووە تا لەسەری لابچێ).**

---

(١) حسن: «تمام المنة» (٣٣٢)، «تخريج الكلم» (١٢١): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ١٠١- باب: ما يقول إذا أصبح، ح ٥٠٩٠].
(٢) صحيح: (البخاري: ٨٠- كتاب الدعوات، ٢٧-باب الدعاء عند الكرب. مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء، ح ٨٣).

## دەربارەی: دوعای ئیستیخارە

٦٠٥- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُعَلِّمُنَا الِاسْتِخَارَةَ فِي الْأُمُورِ كَالسُّورَةِ مِنَ الْقُرْآنِ: « إِذَا هَمَّ بِالْأَمْرِ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ، وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ، وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ، فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلَا أَقْدِرُ، وَتَعْلَمُ وَلَا أَعْلَمُ، وَأَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ. اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْأَمْرَ خَيْرٌ لِي فِي دِينِي، وَمَعَاشِي، وَعَاقِبَةِ أمري «أَوْ قَالَ: فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ» فَاقْدُرْهُ لِي، وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْأَمْرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي، وَمَعَاشِي، وَعَاقِبَةِ «أَوْ قَالَ: عَاجِلِ» أَمْرِي وَآجِلِهِ فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ، وَاقْدُرْ لِيَ الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ، ثُمَّ رَضِّنِي، وَيُسَمِّي حَاجَتَهُ»[١].

**واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئیستیخارەی لە ئیش و کاردا فێر دەکردین وەك چۆن سوورەتێکی لە قورئان فێر دەکردین، (جا دەیفەموو: هەر یەکێك لە ئێوە) ئەگەر ویستی کارێك بکات، (بەڵام ڕوون نەبوو کە ئایا بۆی چاکە، یان خراپە)، ئەوە با دوو ڕکات (نوێژ) بکات (بۆ ئەو مەبەستە)، دوایی (دوای تەواو بوونی نوێژەکە دەستەکانی بەرز بکاتەوەو) بڵێ: ئەی خوایە! من بە زانیاریی خۆت داوای هەڵبژاردنت لێ دەکەم (لە نێوان کردن و نەکردنی ئەم کارە)، وە بە دەسەڵاتی خۆت داوای توانات لێ دەکەم، وە لە بەخششی گەورەی خۆت داوات لێ دەکەم (پێم ببەخشی)، چونکە تۆ دەتوانی (چاکە هەڵبژێری و توانا ببەخشی)، من ناتوانم، وە تۆ دەزانی (چ چاکەو چ خراپە بۆم) من نازانم، وە تۆ زانای هەموو نهێنیەکانی، جا ئەی خوایە! ئەگەر دەزانی ئەم کارە (جا لەو کاتەدا ناوی کارەکەت دێنی، بۆ وێنە: دەڵێی: ئەم سەفەرە، ئەم مامەڵەیە، ئەم هاوسەرگیریە)، بۆ دینم و بۆ بژێوو دونیام و بۆ سەرەنجامم چاکە {یاخود فەرمووی: (ئەگەر چاکە بۆ) ژیانی زوو تێپەڕم (کە ژیانی دونیایە) وە (بۆ ژیانی) دواییم} (ئەگەر بۆ گشت ئەو شتانەم چاکە) ئەوە بۆمی بڕیار بدە (و بۆم ئاسان بکە، وە دوایی بەرەکەتم بۆ تێبخە)[٢]، وە ئەگەر دەزانی ئەو کارە بۆ دین و دونیام و، ژیان و گوزەرانم و، سەرەنجامی کاروبارم خراپە {یاخود فەرمووی: (ئەگەر دەزانی بۆ) ژیانی زوو تێپەڕم و دواییم (خراپە)} ئەوە ئەو کارە لە من لابدەو، منیش لەو لابدە، وە پاشان هەر خێرو چاکەیەك کە بۆ خۆت پێت باشە بۆم بڕیار بدەو منیشی پێ ڕازی بکە، جا ناوی پێداویستیەکەی دەهێنێ.**

٦٠٦- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) يَقُولُ: دَعَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي هَذَا الْمَسْجِدِ، مَسْجِدِ الْفَتْحِ، يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَيَوْمَ الثُّلَاثَاءِ وَيَوْمَ الْأَرْبِعَاءِ، فَاسْتُجِيبَ لَهُ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ مِنْ يَوْمِ الْأَرْبِعَاءِ قَالَ جَابِرٌ: وَلَمْ يَنْزِلْ بِي أَمْرٌ مُهِمٌّ غَائِظٌ إِلَّا تَوَخَّيْتُ تِلْكَ السَّاعَةَ، فَدَعَوْتُ اللَّهَ فِيهِ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ يَوْمَ الْأَرْبِعَاءِ فِي تِلْكَ السَّاعَةِ، إِلَّا عَرَفْتُ الْإِجَابَةَ»[٣].

---

(١) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٣٧٦): (البخاري: ١٩- كتاب التهجد، ٢٥- باب: ماجاء في التطوع مثنى مثنى).

(٢) ئەمە لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە.

(٣) حسن.

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: **پێغەمبەری خوا ﷺ** لەم مزگەوتەدا دوعای کرد، لە مزگەوتی فەتح، لە ڕۆژی دوو شەم و سێ شەم و **چوار شەممەدا**، دوعاکەی وەڵامی درایەوە لە نێوان هەردوو نوێژەکاندا لە ڕۆژی چوار شەممەدا، **جابر دەڵێ**: جا هیچ بابەتێکی گرنگی تەنگەتاوکەر نەبووە تووشم بووبێ حەتمەن ئەم کاتەم بە مەبەست گرتووەو (لە نێوان ئەم دوو نوێژەدا) داوام لە خوا کردوە لە ڕۆژی چوار شەممە لەم کاتەدا، حەتمەن قبووڵ بوون و وەڵامدانەوەی داواکەم هەست پێکردوەو دەستکەوتووە.

٦٠٧- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، فَدَعَا رَجُلٌ فَقَالَ: يَا بَدِيعَ السَّمَاوَاتِ، يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ، إِنِّي أَسْأَلُكَ. فَقَالَ: «أَتَدْرُونَ بِمَا دَعَا؟ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، دَعَا اللَّهَ بِاسْمِهِ الَّذِي إِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ»[١].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووم، **پیاوێك دوعای** کردو، گوتی: ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان، ئەی (هەمیشە) زیندووی ڕاگر (ی بوونەوەر)، **من** داوات لێ دەکەم (جا داواکەی خۆی گوت)، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: **ئایا دەزانن بە چ** شتێك داوای لە خوا کرد؟ سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە بەو ناوەی **خوا پاڕایەوە کە ئەگەر** پێی داوای لێ بکرێ، ئەوە وەڵام دەداتەوە.

٦٠٨- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، لِلنَّبِيِّ ﷺ: عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلَاتِي، قَالَ: قُلِ: «اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا، وَلَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مِنْ عِنْدِكَ مَغْفِرَةً، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئەبو بەکر (**خوا لێی ڕازی بێ**)، بە پێغەمبەر ﷺ ی گوت: دوعایەکم فێر بکە لە نوێژدا پێی بپاڕێمەوە، فەرمووی: بڵێ: **خوایە!** من ستەمێکی زۆرم لە خۆم کردوە، وە هیچ کەسیش نیە لە گوناهان ببورێ جگە لە **تۆ، بۆیە بە لێخۆشبوونێك** (ی گەورەو تایبەت) لەلایەن خۆتەوە لێم خۆشبە، چونکە بە دڵنیایی **تۆ لێبوردەی بە بەزەیی**.

## دەربارەی: (خوێندنی زیکری) ترس هەبوون لە دەسەڵاتدار

٦٠٩- «عَنِ الْحَارِثِ بْنِ سُوَيْدٍ يَقُولُ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، إِذَا كَانَ عَلَى أَحَدِكُمْ إِمَامٌ يَخَافُ تَغَطْرُسَهُ أَوْ ظُلْمَهُ، فَلْيَقُلِ: اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ، وَرَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، كُنْ لِي جَاراً مِنْ فُلَانِ بْنِ فُلَانٍ وَأَحْزَابِهِ مِنْ خَلَائِقِكَ، أَنْ يَفْرُطَ عَلَيَّ أَحَدٌ مِنْهُمْ أَوْ يَطْغَى، عَزَّ جَارُكَ، وَجَلَّ ثَنَاؤُكَ، وَلَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ»[٣].

---

(١) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٣٤٢): (أبو داود: ٤٠-كتاب الوتر، ٢٣-باب: الدعاء ح ١٤٩٥).

(٢) صحيح: «صفة الصلاة» (البخاري: ٨٠- كتاب الدعوات، ١٧- باب: الدعاء في الصلاة. مسلم: ٤٨-كتاب الذكر والدعاء، ح ٤٨.

(٣) صحيح.

واتە: حارسی **كوڕی سوەید دەگێڕێتەوە** دەڵێ: عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: **ئەگەر كاربەدەستێك لەسەر یەكێك لە ئێوە** دەسەڵاتی هەبوو (ئەوەی) لە تووڕەییەكەی یان لە ستەمەكەی **دەترسا ئەوە با بڵێ**: ئەی خوایە! پەروەردگاری حەوت ئاسمانەكان و، پەروەردگاری عەرشی مەزن، **تۆ ببە بە پارێزەرم لە فڵانی كوڕی** فڵان و لایەنگرەكانی لە دروستكراوەكانت، (بمپارێزە) لەوەی كەسێك **دەستپێشخەری** بكات (بۆ سزادانم) یان دەستدرێژی بكات، پەنای تۆ زۆر بەهێزو زاڵەو پایەداری **تۆ زۆر گەورەیە، هیچ** پەرستراوێكیش نیە (كە شایستەی پەرستن بێ) جگە لە تۆ.

٦١٠- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَ: إِذَا أَتَيْتَ سُلْطَاناً مَهِيباً، تَخَافُ أَنْ يَسْطُوَ بِكَ، فَقُلْ: اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَعَزُّ مِنْ خَلْقِهِ جَمِيعاً، اللَّهُ أَعَزُّ مِمَّا أَخَافُ وَأَحْذَرُ، وَأَعُوذُ بِاللَّهِ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ، الْمُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ السَّبْعَ أَنْ يَقَعْنَ عَلَى الْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِ، مِنْ شَرِّ عَبْدِكَ فُلَانٍ، وَجُنُودِهِ وَأَتْبَاعِهِ وَأَشْيَاعِهِ مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ، اللَّهُمَّ كُنْ لِي جَاراً مِنْ شَرِّهِمْ، جَلَّ ثَنَاؤُكَ، وَعَزَّ جَارُكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَلَا إِلَهَ غَيْرُكَ، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ»[1].

واتە: لە ئیبنو **عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)** گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: كاتێك چوویتە لای دەسەڵاتدارێكی **مەترسیدار، ترسای** لەوەی هێرشبكاتە سەرت، ئەوە بڵێ: خوا گەورەترە، خوا لە هەموو **دروستكراوەكانی بە دەسەڵاترە**، خوا بەهێزترە لەوەی من لێی دەترسێم، پەنا دەگرم بەو خوایەی كە **هیچ پەرستراوێك** شایەنی پەرستن نیە جگە لەو، ئەو خوایەی كە ڕاگری حەوت ئاسمانەكانە تا **بەر زەوی نەكەون تەنها بە فەرمانی خۆی نەبێ**، (پەنا دەگرم بە تۆ) لە خراپەی فڵان و **شوێنكەوتووانی لە جن و مرۆڤەكان**، خوایە! ببە پارێزەرم لە خراپەیان، سەنای تۆ زۆر گەورەیە، وە **پەنای تۆ زۆر گەورەیە**، وە ناوت پاك و بێگەردە، وە هیچ پەرستراوێك نیە (كە شایەنی پەرستن بێ) **جگە لە تۆ**، سێ جار ئەمە بڵێ.

## دەربارەی: ئەو پاداشتەی بۆ كەسی دوعاكار هەڵدەگیرێ

٦١١- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَدْعُو، لَيْسَ بِإِثْمٍ وَلَا بِقَطِيعَةِ رَحِمٍ، إِلَّا أَعْطَاهُ إِحْدَى ثَلَاثٍ: إِمَّا أَنْ يُعَجِّلَ لَهُ دَعْوَتَهُ، وَإِمَّا أَنْ يَدَّخِرَهَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ، وَإِمَّا أَنْ يَدْفَعَ عَنْهُ مِنَ السُّوءِ مِثْلَهَا، قَالَ: إِذاً نُكْثِرُ؟ قَالَ: اللَّهُ أَكْثَرُ»[2].

واتە: ئەبو **سەعیدی خودری (خوا لێی ڕازی بێ)** دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر مسوڵمانێك دوعا بكات، **داواكەی گوناح نەبێ**، پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی تێدا نەبێ، مسۆگەر (خوا)

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح: «**تخريج الترغيب**» (٢٧٢/٢): **(الترمذي**: ٤٥- كتاب الدعوات، ١١٥- باب: في انتظار الفرج، عن عبادة بن الصامت).

**یەکێك لەم سێ شتانەی پێ دەبەخشێ: یان ئەوەی داوای دەکات بە پەلە پێی دەدات، یاخود بۆی هەڵدەگرێ بۆ ڕۆژی دوایی (بۆی دەکاتە چاکە)، یاخود بە هاوشێوەی دوعاکە خراپەو بەڵای لەسەر لادەبات (جا ئەبو سەعیدی خودری) گوتی: کەواتە زۆر دوعا بکەین؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: وەڵامدانەوەی خوا زیاترە (واتە: هەرچەندی دوعای زۆر بکەن خوا زیاتر دەبەخشێ).**

٦١٢- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ مُؤْمِنٍ يَنْصُبُ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ يَسْأَلُهُ مَسْأَلَةً، إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهَا، إِمَّا عَجَّلَهَا لَهُ فِي الدُّنْيَا، وَإِمَّا ذَخَرَهَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مَا لَمْ يَعْجَلْ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا عَجَلَتُهُ؟ قَالَ: يَقُولُ: دَعَوْتُ وَدَعَوْتُ، وَلَا أُرَاهُ يُسْتَجَابُ لِي»[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ بڕوادارێك نیە کە ڕووی لە خوا بکات، داوای شتێکی لێ بکات، حەتمەن خوا یان ئەوەی داوای دەکات بە پەلە پێی دەدات لە دونیا، یاخود بۆی هەڵدەگرێ بۆ ڕۆژی دوایی (بۆی دەکاتە چاکە)، مادام ئەو کەسە پەلە نەکات، (ئەبو هورەیرە) گوتی: پەلە کردنەکەی چیە؟ فەرمووی: (پەلە کردن ئەوەیە) دەڵێ: هەر دوعام کرد، هەر دوعام کرد، ناشبینم وەڵام بدرێمەوە.**

## دەربارەی: گەورەیی دوعاو پاڕانەوە

٦١٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ شَيْءٌ أَكْرَمَ عَلَى اللَّهِ مِنَ الدُّعَاءِ»[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هیچ شتێك نیە لە لای خوا بەڕێزتر بێ لە دوعاو پاڕانەوە.**

٦١٤- «عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنَّ الدُّعَاءَ هُوَ الْعِبَادَةُ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۝٦٠﴾ غافر»[3].

**واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: بەڕاستی خودی دوعاو پاڕانەوە پەرستشە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۝٦٠﴾ غافر، (واتە: داوام لێبکەن و لێم بپاڕێنەوە، وەڵامتان دەدەمەوە).**

---

(١) صحيح بما قبله: «المصدر نفسه»، (البخاري: ٨٠- كتاب الدعوات، ٢٢- باب يستجاب للعبد ما لم يعجل. مسلم: ٤٨- الذكر والدعاء، ح ٩٠و ٩١).

(٢) حسن: «تخريج المشكاة» (٢٢٣٢): [الترمذي: ٤٥- كتاب الدعوات، ١- باب: ما جاء في فضل الدعاء. إبن ماجه: ٣٤- كتاب الدعاء، ١- باب: فضل الدعاء، ح ٣٨٢٧].

(٣) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٣٢٩): (أبو داود: ٨٠-كتاب الوتر، ٢٣- باب: الدعاء ح ١٤٧٩. الترمذي: ٤٤- كتاب التفسير، ٢- سورة البقرة، ١٦- باب: حدثنا هناد).

٦١٥- «عَنْ مَعْقِلَ بْنَ يَسَارٍ، يَقُولُ: انْطَلَقْتُ مَعَ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «يَا أَبَا بَكْرٍ، لَلشِّرْكُ فِيكُمْ أَخْفَى مِنْ دَبِيبِ النَّمْلِ»، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَهَلِ الشِّرْكُ إِلَّا مَنْ جَعَلَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَلشِّرْكُ أَخْفَى مِنْ دَبِيبِ النَّمْلِ، أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى شَيْءٍ إِذَا قُلْتَهُ ذَهَبَ عَنْكَ قَلِيلُهُ وَكَثِيرُهُ؟ قَالَ: «قُلِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أُشْرِكَ بِكَ وَأَنَا أَعْلَمُ، وَأَسْتَغْفِرُكَ لِمَا لَا أَعْلَمُ»[١].

**واتە: مەعقیلی کوڕی یەسار، دەڵێ: لەگەڵ ئەبو بەکردا (خوا لێیان ڕازی بێ) ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، (جا پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەبو بەکر، هاوبەشدانان هەیە لە نێو ئێوەدا لە ڕۆیشتنی مێرووله شاراوەترو بێدەنگترە، ئەبو بەکریش گوتی: ئەی هاوبەشدانان هەر ئەوە نیە کە کەسێك لەگەڵ خوادا شتی دیکە بکاتە هاوبەش (ئەوەش شتێکی بەرچاوەو شاراوە نیە)؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: سوێند بە خوا هاوبەشدانان هەیە لە ڕۆیشتنی مێرووله نادیارو پەنهانترە، ئایا شتێکت پێ بڵێم ئەگەر گوتت هەموو (هاوبەشدانانێکت) لێ بروێنێت و لابەرێت بە کەم و زۆریەوە؟ فەرمووی بڵێ: خوایە! پەنا دەگرم بە تۆ لەوەی هاوبەشت بۆ بڕیار بدەم لە کاتێکدا کە دەزانم (ئەو کارە هاوبەشدانانە)، وە داوای لێخۆشبوونت لێدەکەم لەوەی هاوبەشت بۆ بڕیار بدەم لە شتێکدا کە من نایزانم (ئەوە هاوبەشدانان بووە).**

## دەربارەی: دوعا کردن لە کاتی هەڵکردنی با

٦١٦- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا هَاجَتْ رِيحٌ شَدِيدَةٌ قَالَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ»»[٢].

**واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئەگەر بایەکی توند هاتبا پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: خوایە! داوای چاکەی ئەوەت لێدەکەم کە بایەکە بۆی نێردراوە، وە پەنات پێدەگرم لەو خراپەیەی بایەکە پێی نێردراوە (واتە: سوودەکانی بامان پێ ببەخشەو، دوورمان بخەرەوە لە زیانەکانی).**

٦١٧- «عَنْ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَ: كَانَ إِذَا اشْتَدَّتِ الرِّيحُ، يَقُولُ: «اللَّهُمَّ لَقِحاً، لَا عَقِيماً»»[٣].

**واتە: سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێك با توند دەبوو، (پێغەمبەر ﷺ) دەیفەرموو: خوایە! ئەم بایە پیتێنەری ڕووەك بێ، بایەکی بێ بەرهەم و بێ سوود نەبێ.**

---

(١) صحيح: (التعليق الرغيب» (١/٣٩- ٤٠): (ليس في شيء من الكتب الستة).

(٢) صحيح.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» مرفوعاً (٢٠٥٨).

## دەربارەی: (فەرموودەی) جوێن بە با مەڵێن

٦١٨- «عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: لَا تَسُبُّوا الرِّيحَ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْهَا مَا تَكْرَهُونَ فَقُولُوا: «اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ خَيْرَ هَذِهِ الرِّيحِ، وَخَيْرَ مَا فِيهَا، وَخَيْرَ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ، وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ هَذِهِ الرِّيحِ، وَشَرِّ مَا فِيهَا، وَشَرِّ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ»»[1].

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: **جنێو بە با مەدەن، جا ئەگەر** شتێك (کارەساتێکتان) لە با بینی و پێتان ناخۆش بوو، ئەوە بڵێن: **خوایە! داوای خێرو** چاکەی ئەو بایەت لێدەکەین، هەروەها خێری ئەوەش کە تێیدایە، **وە خێری ئەوەش کە بۆی** نێردراوە، وە پەنات پێ دەگرین لە خراپەی ئەو بایەو، ئەو خراپەی تێیدایە، **وە ئەو خراپەش** کە ئەم بایەی بۆ نێردراوە.

٦١٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ **(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ**: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: **«الرِّيحُ** مِنْ رَوْحِ اللَّهِ، تَأْتِي بِالرَّحْمَةِ وَالْعَذَابِ، فَلَا تَسُبُّوهَا، وَلَكِنْ **سَلُوا اللَّهَ** مِنْ خَيْرِهَا، وَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ شَرِّهَا»»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: **پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:** با لە لایەن خواوە دێ، هەم بە ڕەحمەت دێ، هەم بە سزا دێ، **بۆیە جوێنی پێ مەڵێن**، بەڵکو داوای خێرەکەی لە خوا بکەن و، پەناش بە خوا بگرن لە خراپەکەی.

## دەربارەی: (دوعای) کاتی گوێبیستبوونی چەخماخەو گرمەی هەور

٦٢٠- «عَنْ عِكْرِمَةَ، أَنَّ **ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)**، كَانَ إِذَا سَمِعَ صَوْتَ **الرَّعْدِ** قَالَ: «سُبْحَانَ الَّذِي سَبَّحْتَ لَهُ، قَالَ: إِنَّ الرَّعْدَ **مَلَكٌ يَنْعِقُ بِالْغَيْثِ، كَمَا يَنْعِقُ الرَّاعِي بِغَنَمِهِ**»»[3].

واتە: عیکریمە، لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، **کە ئەگەر** گوێی لە دەنگی هەور (چەخماخە) بووایە دەیگوت: پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی **کە تۆ (ئەی چەخماخە)** بە پاکی دەگری، جا دەیفەرموو: دەنگی هەور (چەخماخە) دەنگی **فریشتەیەکە** کە هاوار دەکات بۆ باران (تا ببارێ)، هەروەکو چۆن شوان هاوار دەکات بۆ مەڕەکانی.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» مرفوعاً (٢٧٥٦).

(٢) صحيح: «تخريج الكلم» (١٥٣)، «تخريج المشكاة» (١٥١٦)، «الروض» (١١٠٧): **(أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ١٠٤- باب ما يقول إذا هاجت الريح. إبن ماجه: ٣٣- كتاب الأدب، ٢٩- باب النهي عن سب الريح، ح ٣٧٢٧).**

(٣) حسن: موسى سيء الحفظ، والحكم» وهو: ابن أبان ليس بالثبت، وثبت الشطر الأول منه بنحوه موقوفاً، انظر: «السلسلة الصحيحة» رقم: (١٨٧٢)، ثم وجدت له متابعاً قوياً في تفسير الطبري «١٣/ ٨١-٨٣» فهو به حسن إن شاء الله.

تێبینی: ڕەنگە کەسێك پرسیار بکات و بڵێ: دەنگی هەور (چەخماخە) لە ئەنجامی بەریەککەوتنی هەورەکان و دروستبوونی تەزووی کارەبا لە نێواندا دروست دەبێ، جا ئەم دەنگەی فریشتە چیە؟

لە وەڵامدا دەڵێن: ئەمە هۆکارە ماددیەکانە کە لە تێمە دیارن، لە پشت هەموو کردارێکی ئیلاهی ئەم گەردوونەدا، هۆکاری ئیلاهی و کاربەڕێکەری دیکە بوونیان هەیە، بەڵام زانستی ئێمەی مرۆڤ زۆر لەوە کەمترە درك بەو زانستە ئیلاهیە بکات.

٦٢١- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، أَنَّهُ كَانَ إِذَا سَمِعَ الرَّعْدَ تَرَكَ الْحَدِيثَ وَقَالَ: «سُبْحَانَ الَّذِي: ﴿وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعۡدُ بِحَمۡدِهِۦ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ مِنۡ خِيفَتِهِۦ ﴿١٣﴾﴾الرعد»، ثُمَّ يَقُولُ: «إِنَّ هَذَا لَوَعِيدٌ شَدِيدٌ لِأَهْلِ الْأَرْضِ»»[1].

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (خوا لێیان ڕازی بێ) گێڕدراوەتەوە، کاتێك گوێی لە دەنگی بروسك و هەورە تریشقە دەبوو، وازی لە قسە کردن دەهێناو دەیگوت: پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی: ﴿وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعۡدُ بِحَمۡدِهِۦ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ مِنۡ خِيفَتِهِۦ ﴿١٣﴾﴾الرعد، پاشان دەیفەرموو: بە ڕاستی ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر توندە بۆ خەڵکی زەوی.

## دەربارەی: ئەو کەسەی داوای سەلامەتی و ساغی لە خوا دەکات

٦٢٢- «عَنْ أَوْسَطَ بْنِ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) بَعْدَ وَفَاةِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: قَامَ النَّبِيُّ ﷺ عَامَ أَوَّلَ مَقَامِي هَذَا «ثُمَّ بَكَى أَبُو بَكْرٍ» ثُمَّ قَالَ: عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ، فَإِنَّهُ مَعَ الْبِرِّ، وَهُمَا فِي الْجَنَّةِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ، فَإِنَّهُ مَعَ الْفُجُورِ، وَهُمَا فِي النَّارِ، وَسَلُوا اللَّهَ الْمُعَافَاةَ، فَإِنَّهُ لَمْ يُؤْتَ بَعْدَ الْيَقِينِ خَيْرٌ مِنَ الْمُعَافَاةِ، وَلَا تَقَاطَعُوا، وَلَا تَدَابَرُوا، وَلَا تَحَاسَدُوا، وَلَا تَبَاغَضُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا»[2].

واتە: ئەوسەطی کوڕی ئیسماعیل دەڵێ: بیستم لە ئەبو بەکری صیددیق (خوا لێی ڕازی بێ) لە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ لە سەرەتای ئەو وەستانەی مندا هەڵسایە سەر پێ، ئنجا ئەبو بەکر گریا، پاشان فەرمووی ﷺ: داواتان لێدەکەم ڕاستگۆبن، چونکە لەگەڵ چاکەدایە (واتە: چاکەو ڕاستگۆیی بەردەوام پێکەوەن)، ئەو دووانە لە بەهەشتدانە، وە خۆتان بە دوور بگرن لە درۆ، چونکە لەگەڵ خراپەدایە، هەردووکیان لە نێو ئاگردان، وە داوای سەلامەتی لە خوا بکەن، چونکە دوای یەقین و دڵنیایی هیچ شتێك باشتر نیە لە سەلامەتی، وە پەیوەندی خزمایەتی مەپچڕێنن، وە پشت لە یەکدی مەکەن، وە حەسوود مەبن، وە ڕقتان لە یەکتر نەبێ، ببنە براو بەندەی خوابن.

---

(١) صحيح: «تخريج الكلم» (١٥٦).

(٢) صحيح: «تخريج المختارة» (٦٢)، «الروض» (٩١٧).

٦٢٣- «عَنِ الْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عَلِّمْنِي شَيْئاً أَسْأَلُ اللَّهَ بِهِ؟ فَقَالَ: «يَا عَبَّاسُ، سَلِ اللَّهَ الْعَافِيَةَ»، ثُمَّ مَكَثْتُ ثَلَاثاً، ثُمَّ جِئْتُ فَقُلْتُ: عَلِّمْنِي شَيْئاً أَسْأَلُ اللَّهَ بِهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: «يَا عَبَّاسُ، يَا عَمَّ رَسُولِ اللَّهِ، سَلِ اللَّهَ الْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ»»[١].

**واتە: عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شتێکم فێر بکە تاکو داوای پێ لە خوا بکەم، فەرمووی: ئەی عەبباس داوای ساغ و سەلامەتی لە خوا بکە، پاشان ماوەی سێ ڕۆژ مامەوە ئنجا هاتمەوە، گوتم: شتێکم فێر بکە تاکو داوای پێ لە خوا بکەم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ئەی عەبباس، ئەی مامی پێغەمبەری خوا ﷺ، داوای ساغ و سەلامەتی لە خوا بکە لە دونیاو دواڕۆژ.**

## دەربارەی: ئەوەی پێی باش نەبووە دوعا بکرێ بۆ توشبوون بە بەڵا

٦٢٤- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ: اللَّهُمَّ لَمْ تُعْطِنِي مَالاً فَأَتَصَدَّقَ بِهِ، فَابْتَلِنِي بِبَلَاءٍ يَكُونُ أَوْ قَالَ: فِيهِ أَجْرٌ، فَقَالَ: «سُبْحَانَ اللَّهِ، لَا تُطِيقُهُ، أَلَا قُلْتَ: اللَّهُمَّ آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ؟»»[٢].

**واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك لە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: خوایە! ماڵێکت پێ نەبەخشیم تا لێی ببەخشم، بۆیە بە بەڵایەك تاقیم بکەرەوە کە پاداشتی بۆم تێدابێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (سُبْحَانَ اللَّه)، تۆ ناتوانی خۆت لەبەرانبەر بەڵا بگری (بۆ ئەو داوایە زەحمەتە دەکەی؟)، ئەی بۆچی نەتدەگوت: خوایە! لە دونیا چاکەمان پێ ببەخشە، هەروەها لە دواڕۆژیشدا چاکەمان پێ ببەخشە، وە لە سزای ئاگر بمانپارێزە.**

٦٢٥- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: دَخَلَ[٣] عَلَى رَجُلٍ قَدْ جَهِدَ مِنَ الْمَرَضِ، فَكَأَنَّهُ فَرْخٌ مَنْتُوفٌ، قَالَ: «ادْعُ اللَّهَ بِشَيْءٍ أَوْ سَلْهُ»، فَجَعَلَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ مَا أَنْتَ مُعَذِّبِي بِهِ فِي الْآخِرَةِ، فَعَجِّلْهُ فِي الدُّنْيَا، قَالَ: «سُبْحَانَ اللَّهِ، لَا تَسْتَطِيعُهُ «أَوَ قَالَ: لَا تَسْتَطِيعُوا» أَلَا قُلْتَ: اللَّهُمَّ آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ؟» وَدَعَا لَهُ، فَشَفَاهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ»[٤].

**واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ سەردانی پیاوێکی کرد کە زۆر هیلاك و ماندوو بوو بە دەست نەخۆشیەوە، وەك فەرخەی بێ پەڕو باڵی لێهاتبوو، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: داوا**

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٥٢٣): (الترمذي: ٤٥- كتاب الدعوات، ٨٤- باب: حدثنا يوسف بن عيسى).

(٢) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٣٥٩)، دون قول الرجل.

(٣) دَخَلَ: قال البخاري: قُلْتُ لِحُمَيْدٍ النَّبِيُّ ﷺ؟ قَالَ: نَعَمْ.

(٤) صحيح: «المصدر نفسه»: أخرجه مسلم أيضاً دون أمره ﷺ الرجل بالدعاء، ودون جملة الدعاء والشفاء: باب كَرَاهَةِ الدُّعَاءِ بِتَعْجِيلِ الْعُقُوبَةِ فِي الدُّنْيَا، (الترمذي: ٤٥- كتاب الدعوات، ٧١- باب: ما جاء في عقد التسبيح باليد).

لە خوا بکە، ئەویش دەیگوت: خوایە! ئەوەی سزای منی پێ دەدەی لە دوارۆژ، لە دونیا سزامی پێ بدە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: (سبحان اللّٰه)، تۆ ناتوانی ئارام لەسەر بەڵاو نەخۆشی ئەو دوعایە بگری «یان گوتی: ئێوە ناتوانن ئارام لەسەر بەڵاو نەخۆشی ئەو دوعایە بگرن»، ئەی بۆ نەتدەگوت: خوایە! لە دونیا چاکەمان پێ ببەخشە، هەروەها لە دوارۆژدا چاکەمان پێ ببەخشە، وە لە سزای ئاگر بمانپارێزە.

## دەربارەی: ئەوەی پەنای گرتوە لە سەختی بەڵا

٦٢٦- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: يَقُولُ الرَّجُلُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ جَهْدِ الْبَلَاءِ، ثُمَّ يَسْكُتُ، فَإِذَا قَالَ ذَلِكَ فَلْيَقُلْ: إِلَّا بَلَاءً فِيهِ عَلَاءٌ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاو هەیە دەڵێ: خوایە! من پەنا دەگرم بە تۆ لە بەڵای سەخت، پاشان بێدەنگ دەبوو، (دوایی گوتی): وە ئەگەر ئەوەی گوت: با بڵێ: مەگەر بەڵایەك بێ کە بەرزبوونەوەی پلەی لەگەڵدا بێ، (ئەوە با ببێ بۆ بەرزبوونەوەی پلەو پایە لە دوارۆژ).

٦٢٧- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَعَوَّذُ مِنْ جَهْدِ الْبَلَاءِ، وَدَرَكِ الشَّقَاءِ، وَشَمَاتَةِ الْأَعْدَاءِ، وَسُوءِ الْقَضَاءِ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پەنای (بە خوا) دەگرت لە خراپی بەڵاو ناڕەحەتی سەخت، وە لە گەیشتن بە لەبەینچوون و بەدبەختی (یاخود گەیشتن بە دۆزەخ و بەدبەخت بوون)، وە لە دڵ پێخۆشبوونی دوژمن، وە لە قەدەرو سەرەنجامی خراپ.

## دەربارەی: ئەو کەسەی قسەی کەسێك دەڵێتەوە لە کاتی سەرزەنشتدا

٦٢٨- «عَنْ أَبِي نَوْفَلِ بْنِ أَبِي عَقْرَبَ، أَنَّ أَبَاهُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الصَّوْمِ، فَقَالَ: «صُمْ يَوْمًا مِنْ كُلِّ شَهْرٍ»، قُلْتُ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، زِدْنِي، قَالَ: «زِدْنِي، زِدْنِي، صُمْ يَوْمَيْنِ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ»، قُلْتُ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، زِدْنِي، فَإِنِّي أَجِدُنِي قَوِيًّا، فَقَالَ: «إِنِّي أَجِدُنِي قَوِيًّا، إِنِّي أَجِدُنِي قَوِيًّا»، فَأَفْحَمَ، حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ لَنْ يَزِيدَنِي، ثُمَّ قَالَ: «صُمْ ثَلَاثًا مِنْ كُلِّ شَهْرٍ»»[٣].

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح: «تخريج السنة» (٣٨٢، ٣٨٣): (البخاري: ٨٠- كتاب الدعوات، ٢٨- باب: التعوذ من جهد البلاء. مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء، ح ٥٣).

(٣) صحيح الإسناد: (النسائي ٢٢- كتاب الصيام، ٨٥- باب: صوم يومين من الشهر).

واتە: ئەبو نەوفەلی کوڕی ئەبو عەقرەب دەگێڕێتەوە، کە باوکی (خوا لێی ڕازی بێ)، پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردوە لە بارەی ڕۆژووەوە؟ (پێغەمبەریش ﷺ) پێی فەرمووە: یەك ڕۆژوو بگرە لە هەر مانگێکدا، گوتم: بە باوك و دایکەوە قوربانت بم، بۆم زیاد بکە، گوتی: بۆم زیاد بکە، بۆم زیاد بکە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: دوو ڕۆژوو بگرە لە هەر مانگێکدا، گوتم: بە باوك و دایکەوە قوربانت بم بۆم زیاد بکە، من خۆم بە بەهێز دەبینم، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: من خۆم بە بەهێز دەبینم، من خۆم بە بەهێز دەبینم، تا بێدەنگی کردم، تا گومانم برد چیتر بۆم زیاد ناکات، پاشان فەرمووی: سێ ڕۆژوو بگرە لە هەر مانگێکدا.

٦٢٩- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَارْتَفَعَتْ رِيحٌ خَبِيثَةٌ مُنْتِنَةٌ، فَقَالَ: «أَتَدْرُونَ مَا هَذِهِ؟ هَذِهِ رِيحُ الَّذِينَ يَغْتَابُونَ الْمُؤْمِنِينَ»»(١).

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین، بۆنێکی پیس و بۆگەنی بەرزبۆوە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئایا دەزانن ئەمە چیە؟ (هەر بۆ خۆی وەڵامی دایەوەو) فەرمووی: ئەمە بۆنی ئەو کەسانەیە کە غەیبەتی بڕواداران دەکەن.

٦٣٠- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: هَاجَتْ رِيحٌ مُنْتِنَةٌ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ نَاساً مِنَ الْمُنَافِقِينَ اغْتَابُوا أُنَاساً مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَبُعِثَتْ هَذِهِ الرِّيحُ لِذَلِكَ»»(٢).

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: بۆنێکی بۆگەنی هات لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەندێك لە خەڵکی مونافیق غەیبەتی خەڵکی مسوڵمان دەکەن، ئەم بۆنە بەم هۆیەوە ڕەوان کراوە (تا بزانین خەریکی چین و چەندە پیسن).

٦٣١- «عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ الشَّامِيِّ، سَمِعْتُ ابْنَ أُمِّ عَبْدٍ يَقُولُ: مَنِ اغْتِيبَ عِنْدَهُ مُؤْمِنٌ فَنَصَرهُ جَزَاهُ اللَّهُ بِهَا خَيْراً فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ، وَمَنِ اغْتِيبَ عِنْدهُ مُؤْمِنٌ فَلَمْ يَنْصُرْهُ جَزَاهُ اللَّهُ بِهَا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ شَرّاً، وَمَا الْتَقَمَ أَحَدٌ لُقْمَةً شَرّاً مِنَ اغْتِيَابِ مُؤْمِنٍ، إِنْ قَالَ فِيهِ مَا يَعْلَمُ، فَقَدِ اغْتَابَهُ، وَإِنْ قَالَ فِيهِ بِمَا لَا يَعْلَمُ فَقَدْ بَهَتَهُ»(٣).

واتە: قاسمی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی شامی، دەڵێ: گوێم لە ئیبنو ئوممی عەبد بوو، دەیگوت: هەر کەسێك غەیبەتی بڕوادارێکی لەلا کرا، ئەویش بڕوادارەکەی سەرخست و نەیهێشت غەیبەتی بکەن، ئەوە خوا لە دونیاو دواڕۆژدا پاداشتی چاکەی دەداتەوە، وە هەر کەسێك غەیبەتی بڕوادارێکی لەلا بکرێ و، بڕوادارەکە سەرنەخات، ئەوە خوا لە دونیاو دواڕۆژ سزاو

---

(١) حسن: انظر ما بعده.

(٢) حسن: (غاية المرام» (٤٢٩): (ليس في شيء من الكتب الستة).

(٣) صحيح الإسناد.

خراپەی دێنێتە ڕێ، وە هیچ کەسێك پاروویەکی خراپتری نەخواردووە لە غەیبەتکردنی بروادارێك خراپتر بێ، ئەگەر شتێکی لەبارەوە بڵێ بە زانیاریەوە، ئەوە غەیبەتی کردوە، وە ئەگەر شتێکی لەبارەوە بڵێ بێ زانیاریی، ئەوە بوختانی پێکردوە.

## دەربارەی: باسی غەیبەت و فەرمایشتی خوای بەرز:
## ﴿ وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا ﴿١٢﴾ ﴾[1].

٦٣٢- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَتَى عَلَى قَبْرَيْنِ يُعَذَّبُ صَاحِبَاهُمَا، فَقَالَ: «إِنَّهُمَا لَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، وَبَلَى، أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ يَغْتَابُ النَّاسَ، وَأَمَّا الْآخَرُ فَكَانَ لَا يَتَأَذَّى مِنَ الْبَوْلِ»، فَدَعَا بِجَرِيدَةٍ رَطْبَةٍ، أَوْ بِجَرِيدَتَيْنِ، فَكَسَرَهُمَا، ثُمَّ أَمَرَ بِكُلِّ كِسْرَةٍ فَغُرِسَتْ عَلَى قَبْرٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَمَا إِنَّهُ سَيُهَوَّنُ مِنْ عَذَابِهِمَا مَا كَانَتَا رَطْبَتَيْنِ، أَوْ: لَمْ تَيْبَسَا»»[2].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، جا هاتە لای دوو گۆڕ (قەبر) کە خاوەنەکانیان سزا دەدران، فەرمووی: ئەوانە لەبەر گوناهێك سزا نادرێن کە (لە پێش چاوی ئێوە) گەورە بێ، با گەورەشن، یەکێکیان غەیبەتی خەڵکی دەکرد، ئەوەی دیکەیان خۆی لە میز پاك نەدەکردەوە، جا داوای کرد لاسکێك، یان دوو لاسکە خورمای تەڕی بۆ بێنن، (هێنایان و) شکاندنی، فەرمانی کرد کە هەریەکەیان لەسەر گۆڕێك بروێنرێن، فەرمووی: سزایان لەسەر سووك دەکرێ هەتا ئەو دوو لاسکە خورمایە بە تەڕی بمێننەوە، یان مادەم وشك نەبن.

٦٣٣- «عَنْ قَيْسٍ قَالَ: كَانَ عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَسِيرُ مَعَ نَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَمَرَّ عَلَى بَغْلٍ مَيِّتٍ قَدِ انْتَفَخَ، فَقَالَ: وَاللَّهِ، لَأَنْ يَأْكُلَ أَحَدُكُمْ هَذَا حَتَّى يَمْلَأَ بَطْنَهُ، خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ مُسْلِمٍ»[3].

واتە: قەیس دەڵێ: عەمری کوڕی عاص (خوا لێی ڕازی بێ)، لەگەڵ کۆمەڵێك کەسدا دەڕۆیشت، جا بەلای هێسترێکی مردوودا تێپەڕین کە هەڵئاوسابوو، گوتی: سوێند بە خوا ئەگەر یەکێك لە ئێوە لە گۆشتی ئەم هێسترە بخوات، تا سکی پڕ دەبێ، ئەوە باشترە لەوەی گۆشتی مسوڵمانێك بخوات (واتە: غەیبەتی بکات!).

---

(١) الحجرات.

(٢) صحيح لغيره: «المشكاة» (١١٠/١) أخرجه مسلم مختصراً: (ليس في شيء من الكتب الستة عن جابر).

(٣) صحيح الإسناد.

## دەربارەی: ئەوەی دەستیهێناوە بە سەری منداڵ، كە لەگەڵ باوكی بووەو دوعای بەرەكەتی بۆ كردوە

٦٣٤- «عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الْوَلِيدِ بْنِ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم) قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ أَبِي وَأَنَا غُلَامٌ شَابٌّ، فَنَلْقَى شَيْخاً، قُلْتُ: أَيْ عَمِّ، مَا مَنَعَكَ أَنْ تُعْطِيَ غُلَامَكَ هَذِهِ النَّمِرَةَ، وَتَأْخُذَ الْبُرْدَةَ، فَتَكُونُ عَلَيْكَ بُرْدَتَانِ، وَعَلَيْهِ نَمِرَةٌ؟ فَأَقْبَلَ عَلَى أَبِي فَقَالَ: ابْنُكَ هَذَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَمَسَحَ عَلَى رَأْسِي وَقَالَ: بَارَكَ اللَّهُ فِيكَ، أَشْهَدُ لَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «أَطْعِمُوهُمْ مِمَّا تَأْكُلُونَ، وَاكْسُوهُمْ مِمَّا تَكْتَسُونَ»، يَا ابْنَ أَخِي، ذَهَابُ مَتَاعِ الدُّنْيَا أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ يَأْخُذَ مِنْ مَتَاعِ الْآخِرَةِ، قُلْتُ: أَيْ أَبَتَاهُ، مَنْ هَذَا الرَّجُلُ؟ قَالَ: أَبُو الْيَسَرِ بْنُ عَمْرٍو»[1].

**واتە: عوبادەی كوڕی وەلیدی كوڕی عوبادەی كوڕی صامت (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: لەگەڵ باوكمدا چوومە دەر، ئەو كاتە مێرمنداڵێكی گەنج بووم، گەیشتینە پیاوێكی پیر، گوتم: مامە: چ ڕێگرە لەوەی ئەو پۆشاكە نەمیرەیە بدەیە خزمەتكارەكەت و، پۆشاكە بوردەكەی لێ وەربگریتەوە تا تۆ دوو پارچە بوردەت لەبەردا بێت و ئەویش نەمیرەكەی لەبەردا بێ؟ ئەویش ڕووی لە باوكم كردو گوتی: ئەوە كوڕی تۆیە؟ (باوكم) گوتی: بەڵێ، دەستی بە سەرمدا هێناو، گوتی: خوا بەرەكەت بخاتە ژیانتەوە، من شایەدی دەدەم، كە بیستوومە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لەو خواردنە بدەن بە خزمەتكارەكانتان كە ئێوە لێی دەخۆن، وە لەو پۆشاكەیان لەبەر بكەن كە ئێوە دەیپۆشن، ئەی كوڕی برام، نەمانی خۆشیەكانی دونیا لای من چاكترە لەوەی كە لە خۆشی و كاڵای دواڕۆژ ببات، گوتم: باوكە گیان، ئەم پیاوە كێیە؟ گوتی: ئەوە ئەبو یوسری كوڕی عەمرە (هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ).**

## دەربارەی: خۆشەویستی مسوڵمان بۆ یەكدی

٦٣٥- «عَنْ بَقِيَّةَ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ زِيَادٍ قَالَ: أَدْرَكْتُ السَّلَفَ، وَإِنَّهُمْ لَيَكُونُونَ فِي الْمَنْزِلِ الْوَاحِدِ بِأَهَالِيهِمْ، فَرُبَّمَا نَزَلَ عَلَى بَعْضِهِمُ الضَّيْفُ، وَقِدْرُ أَحَدِهِمْ عَلَى النَّارِ، فَيَأْخُذُهَا صَاحِبُ الضَّيْفِ لِضَيْفِهِ، فَيَفْقِدُ الْقِدْرَ صَاحِبُهَا فَيَقُولُ: مَنْ أَخَذَ الْقِدْرَ؟ فَيَقُولُ صَاحِبُ الضَّيْفِ: نَحْنُ أَخَذْنَاهَا لِضَيْفِنَا، فَيَقُولُ صَاحِبُ الْقِدْرِ: بَارَكَ اللَّهُ لَكُمْ فِيهَا، أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا قَالَ بَقِيَّةُ: وَقَالَ مُحَمَّدٌ: وَالْخُبْزُ إِذَا خَبَزُوا مِثْلُ ذَلِكَ، وَلَيْسَ بَيْنَهُمْ إِلَّا جُدُرُ الْقَصَبِ. قَالَ بَقِيَّةُ: وَأَدْرَكْتُ أَنَا ذَلِكَ: مُحَمَّدَ بْنَ زِيَادٍ وَأَصْحَابَهُ»[2].

---

(١) صحيح: «الروض» (٨٤٤): (مسلم: ٥٣- كتاب الزهد والرقائق، ح ٧٤).

(٢) صحيح الإسناد.

واتە: بەقیيە دەڵێ: موحەممەدی کوڕی زیاد بۆی باسکردین، گوتی: گەیشتووم بە پیاوانی پێشین، ئەوان کاتێك چەندین کەس لەگەڵ خانەوادەکانیان لە یەك ماڵدا دەبوون، جا جاری وابوو یەکێك لە خانەوادەکان میوانیان دەهات، لە کاتێکدا مەنجەڵی یەکێك لە خانەوادەکان لەسەر ئاگر دەبوو، خاوەنی میوانەکە دەهات مەنجەڵەکەی بۆ میوانەکەی دەبرد، خاوەنی مەنجەڵەکە، مەنجەڵەکەی لێ ون دەبوو و دەیگوت: کێ مەنجەڵەکەی بردووە؟ خاوەنی میوانەکە دەیگوت: ئێمە بردوومانە بۆ میوانمان، خاوەنی مەنجەڵەکە دەیگوت: خوا بەرەکەت بخاتە نێوی بۆتان، یان قسەیەکی دەکرد کە هاوشێوەی ئەمە بوو (واتە: دڵی پێی خۆش دەبوو کە خەڵکی دی، سوودیان لە شتی ئەو وەرگرتووەو بەکاریان هێناوەو خواردوویانە) بەقیيە دەڵێ: موحەممەد گوتی: هەروەها بۆ نانیش ئاوا بوون کاتێك نانیان دروست دەکرد (ئاوا دەیاندا بە یەکدی)، لە نێوانیاندا هیچ دیوارو بەربەستێك نەبوو جگە لە لاسك و گەڵای دارخورما، بەقیيە دەڵێ: من گەیشتوم بە موحەممەدی کوڕی زیادو هاوەڵەکانی (ئەوانیش بەم شێوەیە بوون).

## دەربارەی: ڕێزگرتنی میوان و خزمەتکردنی بە خودی خۆی

٦٣٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَبَعَثَ إِلَى نِسَائِهِ، فَقُلْنَ: مَا مَعَنَا إِلَّا الْمَاءُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ يَضُمُّ «أَوْ يُضِيفُ» هَذَا؟»، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْأَنْصَارِ: أَنَا، فَانْطَلَقَ بِهِ إِلَى امْرَأَتِهِ، فَقَالَ: أَكْرِمِي ضَيْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: مَا عِنْدَنَا إِلَّا قُوتٌ لِلصِّبْيَانِ، فَقَالَ: هَيِّئِي طَعَامَكِ، وَأَصْلِحِي سِرَاجَكِ، وَنَوِّمِي صِبْيَانَكِ إِذَا أَرَادُوا عَشَاءً، فَهَيَّأَتْ طَعَامَهَا، وَأَصْلَحَتْ سِرَاجَهَا، وَنَوَّمَتْ صِبْيَانَهَا، ثُمَّ قَامَتْ كَأَنَّهَا تُصْلِحُ سِرَاجَهَا فَأَطْفَأَتْهُ، وَجَعَلَا يُرِيَانِهِ أَنَّهُمَا يَأْكُلَانِ، وَبَاتَا طَاوِيَيْنِ، فَلَمَّا أَصْبَحَ غَدَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ ﷺ: «لَقَدْ ضَحِكَ اللَّهُ «أَوْ: عَجِبَ» مِنْ فَعَالِكُمَا، وَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾ ﴾الحشر»»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەویش کەسێکی نارد بۆ لای خێزانەکانی (تا بزانێ چیان هەیە)، ئەوانیش گوتیان: تەنها ئاومان هەیە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێ ئەم پیاوە لەخۆ دەگرێ، یان کێ میوانداری ئەم پیاوە دەکات؟ پیاوێك لە ئەنصار گوتی: من، ئیدی پیاوەکەی بردەوە بۆ لای خێزانەکەی و، گوتی: ڕێز لە میوانی پێغەمبەر ﷺ بگرە، ئافرەتەکەش گوتی: هیچمان نیە، جگە لە خواردنی منداڵەکان، جا خاوەن ماڵەکە گوتی: (هەر باشە) خواردنەکە ئامادە بکە، وە چرایەکە والێبکە پێویستی بە

---

(١) صحيح: «ظلال الجنة» (٥٧٠) «السلسلة الصحيحة» (٣٢٧٢): (البخاري: ٦٥- كتاب التفسير، ٥٩- سورة الحشر، ٦- باب: ويؤثرون على أنفسهم. مسلم: ٣٦- كتاب الأشربة، ح ١٧٢).

چاككردن بێ، وە منداڵەكانت بخەوێنە كاتێك ویستیان نانی ئێوارە بخۆن، جا ئەویش خواردنەكەی ئامادەكردو، چراكەی والێكرد پێویستی بە چاككردن بێ، منداڵەكانی خەواند، پاشان هەڵسا وەك ئەوەی بیەوێ چراكە چاك بكات، ئیدی كوژاندیەوە (وای پێشاندا كە چراكە تێكچوو)، ئەوانیش دەخۆن، جا بە سكی برسی شەویان ڕابوارد، جا پیاوەكە كە بەیانی كردەوە چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بێگومان خوا پێكەنی، یان تەعەجوبی كرد بەو كارەی ئێوە كردتان، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾ ﴾الحشر، واتە: (هاوەڵان) ئەوانی دیكە بەسەر خۆیاندا هەڵدەبژێرن، هەرچەندە خۆیان لەوان پێویستیان زیاتر بەو شتەی كە دەیبەخشن، هەر كەسێك خۆی لە ڕژدیی دەروونی بپارێزێ، ئەوە لە سەرفرازانە.

## دەربارەی: دیاری و خەڵاتی میوان (ڕۆژی یەكەمی میوانداری)

٦٣٧- «عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْعَدَوِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: سَمِعَتْ أُذُنَايَ، وَأَبْصَرَتْ عَيْنَايَ، حِينَ تَكَلَّمَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ جَارَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ جَائِزَتَهُ»، قَالَ: وَمَا جَائِزَتُهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ، وَالضِّيَافَةُ ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ، فَمَا كَانَ وَرَاءَ ذَلِكَ فَهُوَ صَدَقَةٌ عَلَيْهِ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْراً أَوْ لِيَصْمُتْ»»[1].

واتە: ئەبو شورەیحی عەدەوی (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوێیەكانم بیستویانەو چاوەكانم بینیویانە، كاتێك پێغەمبەر ﷺ قسەی كردو فەرمووی: هەر كەسێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، با ڕێز لە دراوسێیەكەی بگرێ، وە هەر كەسێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، با ڕێز لە میوانەكەی بگرێ لە دیاریەكەی، گوتیان: دیاری میوان چیە؟ فەرمووی: شەوێك و ڕۆژێكە[2]، وە میوانداری سێ ڕۆژە[3]، جا زیاتر لەوە (واجب نیە میوان ڕابگیرێ) بەڵكو چاكەیەكە (خاوەن ماڵ بۆ خۆی دەیكات گەر بیەوێ)، وە هەر كەسێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، ئەوە با قسەی باش بكات، یان بێدەنگ بێ.

---

(١) صحیح: «الإرواء» (٢٥٢٣/١٦٢/٨): (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٣١- باب: من كان يؤمن بالله فلا يؤذ جاره. مسلم: ١- كتاب الإيمان، ح ٧٧).

(٢) واتە: دەبێ لە شەوو ڕۆژی یەكەمی میوانداری كردنی میوانەكە ئەوپەڕی ڕێزو خواردنی چاك و گونجاوی بۆ دابنرێ.

(٣) واتە: تا سێ ڕۆژ میوان مافی هەیە بمێنێتەوە.

## دەربارەی: (ماوەی) میوانداری (کە) سێ ڕۆژە

٦٣٨- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الضِّيَافَةُ ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ، فَمَا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ فَهُوَ صَدَقَةٌ»»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ماوەی میوانداری سێ ڕۆژە[2]، جا لە دوای ئەم ماوەیە، بۆ خاوەن ماڵ دەبێتە خێرو چاکە کردن. (واتە: واجب نیە کارەکانی پەك بخات و خەرجی لە عادەتی خۆی زیاتر بکات بۆی، بەڵام خێریشی دەگاتێ ئەگەر بەردەوام بوو).

## دەربارەی: میوان نامێنێتەوە تا ماوەیەکی وا کە خاوەن ماڵ بێزار بێ

٦٣٩- «عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ الْكَعْبِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ جَائِزَتَهُ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ، وَالضِّيَافَةُ ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ، فَمَا بَعْدَ ذَلِكَ فَهُوَ صَدَقَةٌ، وَلَا يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَثْوِيَ عِنْدَهُ حَتَّى يُحْرِجَهُ»»[3].

واتە: ئەبو شورەیحی کەعبی (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، با قسەی چاك بکات، یاخود بێدەنگ بێ، وە هەر کەسێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، با ڕێزی دیاری میوانی بگرێ، کە بریتیە لە ڕۆژو شەوێك (واتە: دەبێ لە شەو و ڕۆژی یەکەمی میوانداری کردنی میوانەکە ئەوپەڕی ڕێزو خواردنی چاك و گونجاوی بۆ دابنرێ)، وە ماوەی میوانداریش سێ ڕۆژە، جا لە دوای ئەم ماوەیە، (ڕاگرتنی میوان) بۆ خاوەن ماڵ دەبێتە خێرو چاکە کردن، وە دروست نیە بۆ هیچ میوانێك ئەوەندە لای خاوەن ماڵ بمێنێتەوە تا بێزارو سەغڵەتی دەکات.

---

(١) صحيح: «تخريج الترغيب» (٢٤٣/٣): (أبو داود: ٢٦- كتاب الأطعمة، ٥- باب: ماجاء في الضيافة، ح ٣٧٤٩).

(٢) واتە: تا سێ ڕۆژ دەکرێ نیش و کارو کەسابەت پەك بخرێ، ئەگەر زۆر پێویست نەبێ لەبەر ڕێزی میوان و بەخشینی شت و خۆراکی چاك پێدانی.

(٣) صحيح.

## دەربارەی: ئەگەر میوان لە حەوشەی خاوەن ماڵ بەیانی کردەوە (واتە: خزمەت نەکرا)

٦٤٠- «عَنِ الْمِقْدَامِ أَبِي كَرِيمَةَ الشَّامِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَيْلَةُ الضَّيْفِ حَقٌّ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ، فَمَنْ أَصْبَحَ بِفِنَائِهِ فَهُوَ دَيْنٌ عَلَيْهِ إِنْ شَاءَ، فَإِنْ شَاءَ اقْتَضَاهُ، وَإِنْ شَاءَ تَرَكَهُ»»[1].

**واتە: میقدامی کوڕی ئەبو کەریمەی شامی (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شەوی یەکەمی میوانداری مافێکی پێویستە لەسەر هەموو مسوڵمانێك، جا هەر کەسێك میوان لە نێو حەوشەی ماڵەکەیدا بەیانی کردەوە ئەوە لەسەری دەبێتە قەرز ئەگەر ویستی، جا ئەگەر (میوانەکە) ویستی وەری بگرێتەوە لە دونیا ئەوە وەریدەگرێتەوە، وە ئەگەر بیەوێ (وەری نەگرێ) ئەوە وازی لێدێنێ.**

## دەربارەی: کاتێك میوان بەیانی کردەوەو هیچی پێ نەدرا

٦٤١- «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّكَ تَبْعَثُنَا فَنَنْزِلُ بِقَوْمٍ فَلاَ يَقْرُونَا فَمَا تَرَى فِي ذَلِكَ؟ فَقَالَ لَنَا: «إِنْ نَزَلْتُمْ بِقَوْمٍ فَأُمِرَ لَكُم بِمَا يَنْبَغِي لِلضَّيْفِ فَاقْبَلُوا، فَإِنْ لَمْ يَفْعَلُوا فَخُذُوا مِنْهُمْ حَقَّ الضَّيْفِ الَّذِي يَنْبَغِي لَهُمْ»»[2].

**واتە: عوقبەی کوڕی عامر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ ئێمە بەڕێ دەکەیت (بۆ شوێنان)، ئێمەش (جاری وایە) لە لای کۆمەڵێك (خەڵك) بارگەوبنەمان دادەنێین کەچی نامان حەوێننەوە، ئەمە چۆن دەبینی؟ ئەویش پێی فەرمووین: ئەگەر لەلای خەڵکانێك گیرسانەوەو بارگەوبنەتان دانا ئەوانیش فەرمانیان کرد خزمەت بکرێن و وەك پێویست بوون، ئەوە وەریبگرن، وە ئەگەر نەیانکرد ئەوە ئەو مافەی میوانیان لێوەربگرن کە پێویست بوو ئەوان بیکەن (واتە: مافی میوانداریەکە وەربگرن کە ئەوان جێبەجێیان نەکردوە).**

**تێبینی: ئەم فەرموودانەی باسی واجبی میوانداری دەکەن نەسخ بوونەتەوەو میوانداری لە واجبەوە بوو بە سوننەت، بۆیە پێویستە مسوڵمانان لە کاتی خوێندنەوەی ئەم فەرموودانە وریای ئەم بابەتە بن.**

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٢٠٤): (أبو داود: ٢٦- كتاب الأطعمة، ٥- باب: ماجاء في الضيافة، ح ٣٧٥٠. إبن ماجه: ٣٣- كتاب الأدب، ٥- باب: حق الضيف، ح ٣٦٧٧).

(٢) صحيح: «الإرواء» (٢٥٢٤): (البخاري: ٤٦- كتاب المظالم والغصب، ١٨- باب: قصاص المظلوم إذا وجد مال ظالمه. مسلم: ٣١- كتاب اللقطة، ح ١٧).

## دەربارەی: خزمەت کردنی پیاو بۆ میوان بە خودی خۆی

٦٤٢- «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ أَبَا أُسَيْدٍ السَّاعِدِيَّ دَعَا النَّبِيَّ ﷺ فِي عُرْسِهِ، وَكَانَتِ امْرَأَتُهُ خَادِمَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَهِيَ الْعَرُوسُ، فَقَالَتْ: أَتَدْرُونَ مَا أَنْقَعْتُ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ أَنْقَعْتُ لَهُ تَمَرَاتٍ مِنَ اللَّيْلِ فِي تَوْرٍ»[1].

واتە: سەهلی کوڕی سەعد (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، کە ئەبو ئوسەیدی ساعیدی بانگهێشتی پێغەمبەری ﷺ کردبوو بۆ بووک گواستنەوە، جا خێزانەکەی خزمەتی میوانەکانی دەکرد لە کاتێکدا خۆی بووک بوو، گوتی: ئایا دەزانن چیم بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادە کردووەو گرتۆتەوە؟ چەند دانە خورمایەکم لە شەوەوە بۆ خستۆتە نێو لەگەنەوە[2] (واتە: خۆشاوێکی خۆشم بۆ دروست کردوە).

## دەربارەی: ئەوەی خواردن بە میوان دەدات و، هەڵدەستێ نوێژ دەکات

٦٤٣- «عَنْ نُعَيْمِ بْنِ قَعْنَبٍ قَالَ: أَتَيْتُ أَبَا ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) فَلَمْ أُوَافِقْهُ، فَقُلْتُ لِامْرَأَتِهِ: أَيْنَ أَبُو ذَرٍّ؟ قَالَتْ: يَمْتَهِنُ، سَيَأْتِيكَ الْآنَ. فَجَلَسْتُ لَهُ، فَجَاءَ وَمَعَهُ بَعِيرَانِ، قَدْ قَطَرَ أَحَدَهُمَا بِعَجُزِ الْآخَرِ، فِي عُنُقِ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا قِرْبَةٌ، فَوَضَعَهُمَا ثُمَّ جَاءَ، فَقُلْتُ: يَا أَبَا ذَرٍّ، مَا مِنْ رَجُلٍ كُنْتُ أَلْقَاهُ كَانَ أَحَبَّ إِلَيَّ لُقِيّاً مِنْكَ، وَلَا أَبْغَضَ إِلَيَّ لُقِيّاً مِنْكَ، قَالَ: لِلهِ أَبُوكَ، وَمَا جَمَعَ هَذَا؟ قَالَ: إِنِّي كُنْتُ وَأَدْتُ مَوؤدَةً فِي الْجَاهِلِيَّةِ أَرْهَبُ إِنْ لَقِيتُكَ أَنْ تَقُولَ: لَا تَوْبَةَ لَكَ، لَا مَخْرَجَ لَكَ، وَكُنْتُ أَرْجُو أَنْ تَقُولَ: لَكَ تَوْبَةٌ وَمَخْرَجٌ، قَالَ: أَفِي الْجَاهِلِيَّةِ أَصَبْتَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: عَفَا اللَّهُ عَمَّا سَلَفَ. وَقَالَ لِامْرَأَتِهِ: آتِينَا بِطَعَامٍ، فَأَبَتَ، ثُمَّ أَمَرَهَا فَأَبَتَ، حَتَّى ارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا، قَالَ: إِيهٍ، فَإِنَّكُنَّ لَا تَعْدُونَ مَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، قُلْتُ: وَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ فِيهِنَّ؟ قَالَ: «إِنَّ الْمَرْأَةَ خُلِقَتْ مِنْ ضِلَعٍ، وَإِنَّكَ إِنْ تُرِدْ أَنْ تُقِيمَهَا تَكْسِرْهَا، وَإِنْ تُدَارِهَا فَإِنَّ فِيهَا أَوَداً وَبُلْغَةً»، فَوَلَّتْ فَجَاءَتْ بِثَرِيدَةٍ كَأَنَّهَا قَطَاةٌ، فَقَالَ: كُلْ وَلَا أَهُولَنَّكَ فَإِنِّي صَائِمٌ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي، فَجَعَلَ يُهَذِّبُ الرُّكُوعَ، ثُمَّ انْفَتَلَ فَأَكَلَ، فَقُلْتُ: إِنَّا لِلهِ، مَا كُنْتُ أَخَافُ أَنْ تَكْذِبَنِي، قَالَ: لِلهِ أَبُوكَ، مَا كَذَبْتُ مُنْذُ لَقِيتَنِي، قُلْتُ: أَلَمْ تُخْبِرْنِي أَنَّكَ صَائِمٌ؟ قَالَ: بَلَى، إِنِّي صُمْتُ مِنْ هَذَا الشَّهْرِ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ فَكُتِبَ لِي أَجْرُهُ، وَحَلَّ لِيَ الطَّعَامُ»[3].

---

(١) صحيح: «آداب الزفاف» (١٧٨) (البخاري: ٨٣- كتاب الأيمان، ٢١- باب: إذا حلف لا يشرب نبيذاً. مسلم: ٣٦- كتاب الأشربة، ح ٨٦).

(٢) بریتیە لەو سەبەتەی کە شتی درشتی تێدا دەشۆرێتەوە.

(٣) حسن: «تخريج الترغيب» (٧٣/٣): (انظر «المسند» للإمام أحمد (٥: ١٥٠- ١٥١) الطبعة الأولى).

واتە: نوعەیمی كوڕی قەعنەب دەڵێ: چوومە لای ئەبو زەڕ (خوا لێی ڕازی بێ) پێینەگەیشتم، بە خێزانەكەیم گوت: ئەبو زەڕ لە كوێیە؟ گوتی: خەریكی لەوەڕاندنی ئاژەڵانە، ئێستا دێتە لات، منیش بۆی دانیشتم (تا بێت)، جا هات دوو وشتری پێ بوو، یەكێكیان سەری نابوو بە دواوەی ئەوی دیكەیان، لە ملی هەر یەكەیاندا كوندەیەك هەبوو، دایانان، پاشان هات، گوتم: ئەی ئەبو زەڕ! هیچ پیاوێك نەبووە كە پێی گەیشتبم پێگەیشتنەكەم پێ خۆشتر بووبێ لە پێگەیشتنی تۆ، هەروەها هیچ كەسێك نەبووە كە پێگەیشتنەكەم پێ ناخۆشتر بووبێ لە پێگەیشتنی تۆ، ئەویش گوتی: بۆ خاتری خوا چ شتێك ئەمە كۆدەكاتەوە (ئەو قسە دژو پێچەوانە چیە؟!) گوتی: من لە سەردەمی نەفامیدا زیندە بە چاڵم كردوە، دەترسام بگەم بە تۆ، تۆ پێم بڵێی: تەوبەت بۆ نیەو، هیچ ڕێگایەك نیە بۆ دەرباز بوونت، هەروەها ئومێدیشم وابوو كە بگەم بە تۆ، پێم بڵێی: تەوبەت بۆ هەیەو ڕێگای دەربازبوونت هەیە، (ئەبو زەڕیش) گوتی: لە سەردەمی نەفامیدا تووشی ئەمە بووی؟ گوتم: بەڵێ، گوتی: خوا لەوەی ڕابردوو خۆش بووە، ئنجا بە خێزانەكەی گوت: كە خواردنمان بۆ بێنێ، خێزانەكەی ڕەتیكردەوە كە بۆی بێنێ، پاشان فەرمانی پێكرد، ئەویش دووبارە ڕەتی كردەوە، تا دەنگیان بەرزبووەوە، جا (ئەبو زەڕ) گوتی: بەسە، ئێوەی ژنان لەم قسەیەی پێغەمبەر ﷺ دەرناچن ڕێك دەتانگرێتەوە)، گوتم: چی فەرمووە؟ گوتی: فەرموویەتی: ئافرەت لە (شێوەی)[1]، پەراسوو دروست بووە، ئەگەر بتەوێ ڕاستی بكەیەوە، ئەوە دەیشكێنی، ئەگەر لێشی بگەڕێی، ئەوە هەر بە لاری دەمێنێتەوەو ژیانی لەگەڵدایە، پاشان خێزانەكەی ڕۆیشت و تەشریبی هێنا پێدەچوو گۆشتی قەتێی تێدابێ، جا (ئەبو زەڕ) گوتی: بخۆ، لێت ناشارمەوە من بەڕۆژووم، پاشان هەڵسا نوێژی كرد، ڕكووعێكی پوخت و مام ناوەندی دەبرد، (نوێژەكەی مامناوەندبوو)، پاش تەواو بوون دەستی كرد بە خواردن، گوتم: (إنا لله)، من ترسام لەوەی درۆم لەگەڵدا بكەی! گوتی: سوێند بە خوا لەو كاتەی هاتوویت درۆم نەكردوە، گوتم: ئەی نەتگوت بە ڕۆژووم؟ گوتی: با، لەم مانگەدا سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بووم، پاداشتەكەم بۆ نووسراوە، خواردنم بۆ حەڵاڵ بووە (بۆیە شكاندم).

---

(١) {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه)، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «الْمَرْأَةُ كَالضِّلَعِ، إِنْ أَقَمْتَهَا كَسَرْتَهَا، وَإِنْ اسْتَمْتَعْتَ بِهَا، اسْتَمْتَعْتَ بِهَا وَفِيهَا عِوَجٌ»} (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ: ٩٨٨٤، وَمُسْلِمٌ: ٩٥)، واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت وەك پەراسوویە، ئەگەر بتەوێ ڕاستی بكەیتەوە دەیشكێنی، واتە: پیاو ئەگەر بیەوێ ئافرەت بێنێتە سەر سروشتی خۆی، دەبێ تەڵاقی بدات، چونكە لە ڕیوایەتی دیكەدا هاتوە دەفەرموێ: (وَكَسْرُهَا طَلَاقُهَا) (أَخْرَجَهُ مُسْلِم: ١٦)، واتە: شكاندنی ئافرەت مەبەستی پێ تەڵاقدانیەتی، ئەگەر لێیشی بگەڕێی بە لاریی لێی بەهرەمەند دەبی.

## دەربارەی: خەرجی پیاو بۆ ماڵ و منداڵی

٦٤٤- «عَنْ ثَوبَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَفْضَلُ دِينَارٍ يُنْفِقُهُ الرَّجُلُ دِينَارٌ يُنْفِقُهُ عَلَى عِيَالِهِ، وَدِينَارٌ أَنْفَقَهُ عَلَى أَصْحَابِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَدِينَارٌ أَنْفَقَهُ عَلَى دَابَّتِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»»[1].

واتە: ثەوبان (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: باشترین دینار پیاو خەرجی بکات دینارێکە خەرجی دەکات بۆ خانەوادەکەی، وە دینارێکە خەرجی دەکات بۆ هاوەڵەکانی لە پێناوی خوا، وە دینارێکە خەرجی دەکات بۆ سواریەکەی لە پێناوی خوا.

٦٤٥- «عَنْ أَبِي مَسْعُود البَدْرِيّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَنْفَقَ نَفَقَةً عَلَى أَهْلِهِ وَهُوَ يَحْتَسِبُهَا كَانَتْ لَهُ صَدَقَة»»[2].

واتە: ئەبو مەسعوودی بەدری (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك خەرجیەك بکات بۆ ماڵ و منداڵەکەی، وە چاوەڕوانی پاداشتەکەشی بکات، ئەوە بۆی بە چاکە دەنووسرێ.

٦٤٦- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عِنْدِي دِينَارٌ؟ قَالَ: «أَنْفِقْهُ عَلَى نَفْسِكَ»، قَالَ: عِنْدِي آخَرُ، فَقَالَ: «أَنْفِقْهُ عَلَى خَادِمِكَ» «أَوْ قَالَ: عَلَى وَلَدِكَ»، قَالَ: عِنْدِي آخَرُ، قَالَ: «ضَعْهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَهُوَ أَخَسُّهَا»»[3].

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دینارێکم هەیە (بۆ خێر)؟ فەرمووی: بۆ خۆت خەرجی بکە، فەرمووی: یەکێکی دیکەشم لایە (بۆ خێر)؟ فەرمووی: خەرجی بکە بۆ خزمەتکارەکەت، یان فەرمووی: بۆ منداڵەکەت، گوتی: یەکێکی دیکەشم هەیە (بۆ خێر)؟ فەرمووی: (بیکە خێرو) دایبنێ لە پێناوی خوا، لە کاتێکدا ئەوە کەمترین و بچوکترینیانە (واتە: مەسرەف کردنی ماڵ و منداڵ و خزم گەورەترە لە خێر کردن بۆ شتی دیکە).

٦٤٧- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَرْبَعَةُ دَنَانِيرَ: دِينَاراً أَعْطَيْتَهُ مِسْكِيناً، وَدِينَاراً أَعْطَيْتَهُ فِي رَقَبَةٍ، وَدِينَاراً أَنْفَقْتَهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَدِينَاراً أَنْفَقْتَهُ عَلَى أَهْلِكَ، أَفْضَلُهَا الَّذِي أَنْفَقْتَهُ عَلَى أَهْلِكَ»»[4].

---

(١) صحيح: (مسلم: ١٢- كتاب الزكاة، ح ٣٨).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٧٢٩ و ٩٨٢): (البخاري: ٢- كتاب الإيمان، ٤١- باب: ماجاء إن الأعمال بانية. مسلم: ١٢- كتاب الزكاة، ح ٤٨).

(٣) صحيح لغيره: دون قوله: (ضعه... ) أخرجه أبي داود (١٤٨٤) من حديث أبي هريرة، رواه مسلم.

(٤) صحيح.

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: لە چوار دینار: دینارێك كە دەیدەی بە هەژارێك و، دینارێك دەیدەی بۆ ئازاد كردنی كۆیلەیەك و، دینارێك كە خەرجی دەكەی لە پێناوی خواو، دینارێكیش كە خەرجی دەكەی بۆ ماڵ و خێزانت، باشترینیان ئەوەیە كە خەرجت كردوە بۆ ماڵ و خێزانت.

## دەربارەی: پیاو پاداشت دەدرێتەوە بە هەر خەرجیەكی بۆ خاووخێزانی

٦٤٨- «عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِسَعْدٍ: «إِنَّكَ لَنْ تُنْفِقَ نَفَقَةً تَبْتَغِي بِهَا وَجْهَ اللَّهِ عَزَّوَجَلَّ إِلَّا أُجِرْتَ بِهَا، حَتَّى مَا تَجْعَلُ فِي فَمِ امْرَأَتِكَ»»[1].

واتە: سەعدی كوڕی ئەبی وەققاص (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، كە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: دڵنیابە كە تۆ هیچ شتێك نیە كە خەرجی بكەیت و، مەبەستت پێی ڕەزامەندی خوا بێ، مەگەر پاداشت دەدرێیەوە لەسەری، هەتا ئەو (خواردنەش) كە دەیخەیە نێو دەمی خێزانەكەت.

## دەربارەی: پاڕانەوە كاتێ سێیەكی شەو دەمێنێ

٦٤٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي كُلِّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الْآخِرُ، فَيَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ؟ مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ؟ مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ؟»»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەروەردگارمان (تَبَارَكَ وَتَعَالَى) هەموو شەوێك دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا، كاتێك سێیەكی كۆتایی شەو دەمێنێتەوە، جا دەفەرموێ: كێ داوام لێدەكات بۆ ئەوەی پێی ببەخشم؟ كێ داوای لێخۆشبوونم لێدەكات بۆ ئەوەی لێی خۆشبم.

٦٥٠- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتِ: اسْتَأْذَنَ رَجُلٌ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «بِئْسَ أَخُو الْعَشِيرَةِ» فَلَمَّا دَخَلَ انْبَسَطَ إِلَيْهِ، فَقُلْتُ لَهُ؟ فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْفَاحِشَ الْمُتَفَحِّشَ»»[3].

---

(١) صحيح: «الإرواء» (٨٩٩): (البخاري: ٢- كتاب الإيمان، ٤١- باب: ماجاء إن الأعمال بانية. مسلم: ٢٥- كتاب الوصية، ح٥).

(٢) صحيح: «الإرواء» (٤٥٠): (البخاري: ١٩- كتاب التهجد، ١٤- باب: الدعاء والصلاة في آخر الليل. مسلم: ٦- كتاب صلاة المسافرين، ح ١٦٨- ١٧٢).

(٣) صحيح: «الإرواء» (٢١٣٣): (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٣٨- باب: لم يكنى ﷺ فَاحِشاً وَلاَ مُتَفَحُّشاً. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح٧٣).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێك داوای هاتنە ژوورەوەی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئەویش بەر لەوەی کابرا بێتە ژوور فەرمووی: خراپترین کەسی نێو هۆزەکەیەتی، کە هاتە ژوورەوە (پێغەمبەر ﷺ) ڕووی خۆی بۆ کردەوە، منیش گوتم: (بۆچی ئاوات فەرموو و ئاواش ڕەفتارت لەگەڵ کرد)؟ فەرمووی: بێگومان خوا قسەی نابەجێ و کردەوەی نابەجێی خۆشناوێن.

(وەك لە فەرموودەی دیکەدا هاتوە بۆیە خۆی لێ پاراستووە تاوەکو لە دەرەوە قسەی نەشیاوو بێ ڕێزی نەکات و لە خراپەی پارێزراو بێ).

٦٥١- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: اسْتَأْذَنَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَوْدَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) لَيْلَةَ جَمْعٍ «وَكَانَتِ امْرَأَةً ثَقِيلَةً ثَبِطَةً»[١]، فَأَذِنَ لَهَا فَأَذِنَ لَهَا»[٢].

واتە: عائیشە، دەڵێ: سەودە (خوا لێیان ڕازی بێ) مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرت تا زووتر بڕوات لە شەوی موزدەلیفە، ئەو ئافرەتێکی بە سەنگ و کێش بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی پێدا.

## دەربارەی: ئەوەی پێی وابووە گێڕانەوەی هەواڵ هیچ کێشەی نیە

٦٥٢- «عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: لَمَّا قَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ غَنَائِمَ حُنَيْنٍ بِالْجِعْرَانَةِ ازْدَحَمُوا عَلَيْهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ عَبْدَاً مِنْ عِبَادِ اللَّهِ بَعَثَهُ اللَّهُ إِلَى قَوْمٍ، فَكَذَّبُوهُ وَشَجُّوهُ، فَكَانَ يَمْسَحُ الدَّمَ عَنْ جَبْهَتِهِ، وَيَقُولُ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِقَوْمِي، فَإِنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ». قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ: فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَحْكِي الرَّجُلَ يَمْسَحُ عَنْ جَبْهَتِهِ»[٣].

واتە: ئیبنو مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ دەستکەوتی جەنگی حونەینی دابەش دەکرد لە جیعڕانە، قەڵەباڵغی زۆریان لەسەر دروستکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: خوا یەکێ لە بەندەکانی خۆی نارد بۆ لای گەلێك، ئەوانیش بە درۆیان داناو سەریان شکاند، ئەویش خوێنی لە نێو چەوانی خۆی دەسڕیەوەو دەیفەرموو: خوایە! لە گەلەکەم خۆشبە، چونکە ئەوان نازانن، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: وەك ئەوەی تەماشای پێغەمبەری خوا ﷺ بکەم باسی پیاوێك دەکات و نێو چەوانی دەسڕێتەوە (ئاوا دیمەنەکەم دێتە پێش چاو).

---

(١) أي: بطيئة الحركة كأنها تثبت في الأرض.

(٢) صحيح: (البخاري: ٢٥- كتاب الحج، ٩٨- باب: من قدم ضعفه أهله بليل. مسلم: ١٥- كتاب الحج، ٢٩٣).

(٣) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٣١٧٥) رواه البخاري ومسلم مختصراً: (انظر المسند للإمام أحمد (١: ٤٢٧) الطبعة الأولى (رقم ٤٠٥٧).

## دەربارەی: ئەو كەسەی دەڵێ: خەڵك لە ناوچوون

٦٥٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا سَمِعْتَ الرَّجُلَ يَقُولُ: هَلَكَ النَّاسُ، فَهُوَ أَهْلَكُهُمْ»»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بیستت پیاوێك دەیگوت: خەڵك هەموو لە ناوچوون (خەڵك هەمووی خراپ بوون)، ئەوە ئەو لە هەموو خەڵكی لەناوچووترە (لە هەموویان خراپترە، چونكە ئەو خراپیە بەسسە بۆ مرۆڤ كە هەموو خەڵكی بە خراپ بزانێ و خۆشی بە باش بزانێ، لە كاتێكدا زانیاری لەسەر حاڵی تەواوی خەڵكی نیە).

## دەربارەی: (فەرموودەی) بە مونافیق ناگوترێ: گەورە

٦٥٤- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَقُولُوا لِلْمُنَافِقِ: سَيِّدٌ، فَإِنَّهُ إِنْ يَكُ سَيِّدَكُمْ فَقَدْ أَسْخَطْتُمْ رَبَّكُمْ عَزَّ وَجَلَّ»»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی بورەیدە لە باوكی (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە (كەسی) دووڕوو مەڵێن: سەییدو گەورە، چونكە ئەگەر ئەو بكەنە گەورەی خۆتان، دڵنیابن بەمە پەروەردگاری خۆتان (عَزَّ وَجَلَّ) تووڕە كردوە.

## دەربارەی: ئەوەی پیاو دەیڵێ كاتێ مەدح دەكرێ

٦٥٥- «عَنْ عَدِيِّ بْنِ أَرْطَأَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ إِذَا زُكِّيَ قَالَ: اللَّهُمَّ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا يَقُولُونَ، وَاغْفِرْ لِي مَا لَا يَعْلَمُونَ»[٣].

واتە: عەدیی كوڕی ئەرەت (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، ئەگەر (یەكێكیان) مەدح كرابا، دەیگوت: خوایە! لێم مەگرەو سزام مەدە بە هۆی ئەوەی ئەوان دەیڵێن، وە لەو گوناهانەم خۆشبی كە ئەوان نایزانن.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣٠٧٤): (مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ١٣٩).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣٧١): (أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٧٥- باب: لا يقول المملوك ربي وربتي، ح ٤٩٧٧).

(٣) صحيح الإسناد.

٦٥٦- «عَنْ أَبِي الْمُهَلَّبِ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَامِرٍ قَالَ: يَا أَبَا مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، مَا سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ فِي زَعَمُوا؟ قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ: «بِئْسَ مَطِيَّةُ الرَّجُلِ»»[١].

واتە: ئەبو موهەللەب دەگێڕێتەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عامر گوتوویەتی: ئەی ئەبو مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) چیت بیستووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لەبارەی ڕستەی (گومانیان وابوو، پێیان وابوو)؟ فەرمووی: خراپترین سواری مرۆڤە (واتە: گومان خراپترین شتە کە مرۆڤ سواری ببێ و پێی وابێ بە هۆیەوە بۆ حەقیقەتی شتەکان دەچێ، نەخێر، بەڵکو ئەو سواریە دەتبات بۆ ئاگر، کە ئەمەش خراپترین سواریە مرۆڤ سواری پشتی ببێ).

٦٥٧- «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ فِي زَعَمُوا: بِئْسَ مَطِيَّةُ الرَّجُلِ، وَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «لَعْنُ الْمُؤْمِنِ كَقَتْلِهِ»»[٢].

واتە: ئەبو مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەربارەی ئەو کەسانەی هەر دەڵێن: گومانمان وایە ئەو شتە ئاوابێ، ڕەنگە فلان ئاوای کردبێ، (ڕەنگە ئاواو ئاوا...) دەیفەرموو: خراپترین سواری مرۆڤە.

تێبینی: گومان خراپترین شتە کە مرۆڤ سواری ببێ و پێی وابێ بە هۆیەوە بۆ حەقیقەتی شتەکان دەچێ، نەخێر بەڵکو ئەو سواریە دەتبات بۆ ئاگر، کە ئەمەش خراپترین سواریە مرۆڤ سواری پشتی ببێ، وە گوێم لێی بووە دەیفەرموو: نەفرین کردن لە بڕوادار وەك کوشتنیەتی واتە: دەبێ کەسی نەفرینکار سزایەکی بۆ دابنرێ، هەر وەك چۆن کەسی بکوژ سزایەکی بۆ هەیە.

## دەربارەی: شتێك کە ڕاست نیەو خوا لێی بەریە، مرۆڤ نابێ بڵێ خوا دەیزانێ[٣]

٦٥٨- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، لَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ لِشَيْءٍ لَا يَعْلَمُهُ: اللَّهُ يَعْلَمُهُ؛ وَاللَّهُ يَعْلَمُ غَيْرَ ذَلِكَ، فَيُعَلِّمَ اللَّهَ مَا لَا يَعْلَمُ، فَذَاكَ عِنْدَ اللَّهِ عَظِيمٌ»[٤].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: با هیچ یەکێکتان کاتێك شتێکی نەزانی و لێی دڵنیانەبوو نەڵێ: (ئاواو ئاوا دواتر بڵێ) خوا دەزانێ، چونکە خوا شتێکی جگە لەوە دەزانێ (واتە: خوا بەریە لەو گومانەی ئەو، بەڵکو ئەو زانستی تەواوی لەو بارەوە هەیە کە دژە لەگەڵ قسەکەی ئەو)، جا دەیەوێ شتێك فێری خوا بکات کە خۆشی نایزانێ، ئا ئەوە زۆر (گوناهێکی) گەورەیە لای خوا.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨٦٦)، (أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٧٢- باب: قول الرجل «زعموا».

(٢) صحيح لغيره: «الإرواء» (٢٥٧٥/٢٠١/٨).

(٣) (با خوا نەکاتە شاهێد لەسەر شتێك کە حەقیقەت نیە).

(٤) صحيح الإسناد.

تێبینی: ئەو گوناهە گەورە لەو كاتەدایە كە مرۆڤ گومانی لە شتێك هەبێ و، یان هەر زانیاری لەسەری نەبێ و، هەر لە خۆیەوە بڕیار بدات، خواش لەسەر ئەوە بكاتە شایەدو بڵێ: خوا ئەوە دەزانێ كە ئاوایە، بەڵام ئەگەر لە شتێك دڵنیابوو، یان هەر نەیزانی، ئنجا گوتی: زانستی تەواو لای خوایە، ئەوە دروستەو كێشەی تێدانیە، وەك ئەوەی ئێمە دەڵێین: واللّٰه أعلم.

## دەربارەی: مەجەڕڕە

٦٥٩- «عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ سَأَلَ ابْنُ الْكَوَّا عَلِيّاً عَنِ الْمَجَرَّةِ، قَالَ: هُوَ شَرَجُ السَّمَاءِ، وَمِنْهَا فُتِحَتِ السَّمَاءُ بِمَاءٍ مُنْهَمِرٍ»[1].

واتە: ئەبو طوفەیل دەڵێ: ئیبنو كەووا لە عەلی پرسی دەربارەی مەجەڕڕە (كە ئایا چیە)؟ گوتی: كونی ئاسمانە، لەوێوە ئاسمان كراوەتەوە بە ئاوێكی بە خوڕ.

تێبینی: ئەو مەجەڕڕەیەی ئێستا ئێمە دەیزانین و، بەو ناوە دەیناسین جیایە لەگەڵ ناوی ئەو مەجەڕڕەی ئەوان ناسیویانەو، ئەو ناوەیان بۆ بەكارهێناوە، ناوەكان هەر زەمانەی بۆ شتێك بەكاردێن، بۆ نمونە: ئیستیعمار بە مانای بوژانەوەو ئاوەدان كردنەوە دەهات، بەڵام ئێستا بە مانای داگیركەر دێ.

٦٦٠- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) الْقَوْسُ: أَمَانٌ لِأَهْلِ الْأَرْضِ مِنَ الْغَرَقِ، وَالْمَجَرَّةُ: بَابُ السَّمَاءِ الَّذِي تَنْشَقُّ مِنْهُ»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئەو شوێنەی پێی دەگوترێ قەوس (كەوان) ئەمانەو، نایەڵێ خەڵكی سەر زەوی نغرۆ ببن، مەجەڕڕەش دەرگای ئەو ئاسمانەیە كە لێوەی لەت بووە.

تێبینی: ئەو مەجەڕڕەیەو ئەو قەوسەی ئێستا ئێمە دەیزانین و، بەو ناوە دەیناسین جیایە لەگەڵ ناوی ئەو مەجەڕڕەو قەوسەی ئەوان ناسیویانەو ئەو ناوەیان بۆ بەكارهێناوە.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح الإسناد.

## دەربارەی: ئەوانەی پێیان ناپەسند بووە کە بگوترێ: خوایە لە نێو بەزەییت جێگیرمان بکە

٦٦١- «عَنْ أَبُو الْحَارِثِ الْكَرْمَانِيُّ قَالَ: سَمِعْتُ رَجُلاً قَالَ لِأَبِي رَجَاءٍ: أَقْرَأُ عَلَيْكَ السَّلَامَ، وَأَسْأَلُ اللَّهَ أَنْ يَجْمَعَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ فِي مُسْتَقَرِّ رَحْمَتِهِ، قَالَ: وَهَلْ يَسْتَطِيعُ أَحَدٌ ذَلِكَ؟ قَالَ: فَمَا مُسْتَقَرُّ رَحْمَتِهِ؟ قَالَ: الْجَنَّةُ، قَالَ: لَمْ تُصِبْ، قَالَ: فَمَا مُسْتَقَرُّ رَحْمَتِهِ؟ قَالَ: قُلْتُ: رَبُّ الْعَالَمِينَ»[١].

واتە: ئەبو حاریسی کەرمانی گوتوویەتی: گوێم لە پیاوێك بوو بە ئەبو ڕەجائی دەگوت: سڵاوت لێدەکەم و، داواکارم خوا من و تۆ لە نێو شوێنی جێگیربوونی ڕەحمەتی خۆی کۆبکاتەوە، (ئەبو ڕەجاء) گوتی: مەگەر کەس ئەوە دەتوانێ؟ (جا ئەبو ڕەجاء) گوتی: جێگیری ڕەحمەتی خوا چیە؟ (کابرا) گوتی: بەهەشتە، (ئەبو ڕەجاء) گوتی: نەتپێکا، گوتی: ئەدی شوێنی جێگیربوونی ڕەحمەت کێیە؟ (ئەبو ڕەجاء) دەڵێ: گوتم: پەروەردگاری جیهانییانە.

## دەربارەی: جوێن بە کات مەڵێن

٦٦٢- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: يَا خَيْبَةَ الدَّهْرِ، فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الدَّهْرُ»»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێکتان نەڵێ: ئای لە خراپەو زەرەرمەندی ڕۆژگار (کاتێك شتێکی بەسەر دێ)، چونکە خوا دانەری کات و سات و ڕۆژگارە.

٦٦٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَقُلْ أَحَدُكُمْ: يَا خَيْبَةَ الدَّهْرِ، قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: أَنَا الدَّهْرُ، أُرْسِلُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ، فَإِذَا شِئْتُ قَبَضْتُهُمَا. وَلَا يَقُولَنَّ لِلْعِنَبِ: الْكَرْمَ، فَإِنَّ الْكَرْمَ الرَّجُلُ الْمُسْلِمُ»»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێکتان نەڵێ: ئەی خراپەو زەرەرمەندی ڕۆژگار (کاتێك شتێکی بەسەر دێ)، خوای (عَزَّ وَجَلَّ)

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٣١)، «الروض» (١١٧٢): (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١٠١، ١٠٢- باب: لا تسبوا الدهر. مسلم: ٤٠- كتاب الألفاظ من الأدب وغيرها، ح ٤و ٦و ٧و ٨و٩).

فەرموویەتی: من دانەری کات و سات و ڕۆژگارم، شەوو ڕۆژ دەنێرم، ئەگەر بمەوێ دەیانگرمەوە (نە شەو دەمێنێ و نەڕۆژ)، وە هیچ کەس لە ئێوە بە ترێ نەڵێ کەڕم، چونکە کەڕم مرۆڤی مسوڵمانە (واتە: نابێ بە عەڕەبی بە ترێ بگوترێ کەڕم، چونکە کەڕم بە واتای سەخاوەت دێ، ئەوەش لەگەڵ مرۆڤی مسوڵمان دەگونجێ نەك ترێ، چونکە ترێ شایستەی ئەو ناوە جوانە نیە، لەبەر ئەوەی ئارەق و مەشروبیشی لێ دروست دەکرێ، بۆیە ناوی جوان بۆ شتێك دامەنێن کە لایەنی خراپی تێدابێ).

## دەربارەی: گوتنی (وشەی) هاوار بۆ تۆ

٦٦٤- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى رَجُلاً يَسُوقُ بَدَنَةً، فَقَالَ: «ارْكَبْهَا»، فَقَالَ: إِنَّهَا بَدَنَةٌ، قَالَ: «ارْكَبْهَا»، قَالَ: إِنَّهَا بَدَنَةٌ، قَالَ: «ارْكَبْهَا»، قَالَ: فَإِنَّهَا بَدَنَةٌ، قَالَ: «ارْكَبْهَا، وَيْلَكَ»»[١].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بینی وشترێکی قوربانی بە پێش خۆی دابوو (لە کاتی حەجدا)، فەرمووی: سواری بە، (کابرا) گوتی: ئەوە بۆ کردنە قوربانییە لە حەج، فەرمووی: سواری بە، کابرا گوتی: ئەوە بۆ کردنە قوربانییە لە حەج، فەرمووی: هاوار بۆ تۆ سواری بە (واتە: ئەوەندە ناحاڵی بووە لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ کە خاوەنی شەریعەتە سواربوونی بە دروست زانیوە کەچی ئەو هەر پێی وابوو دروست نیە!!).

٦٦٥- «عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ رِفَاعَةَ الْقُرَظِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ)، وَرَجُلٌ يَسْأَلُهُ، فَقَالَ: إِنِّي أَكَلْتُ خُبْزاً وَلَحْماً، فَهَلْ أَتَوَضَّأُ؟ فَقَالَ: وَيْحَكَ، أَتَتَوَضَّأُ مِنَ الطَّيِّبَاتِ؟»[٢].

واتە: مەیسوری کوڕی ڕیفاعەی قورەظی دەڵێ: گوێم لە ئیبنو عەبباس بوو (خوا لێیان ڕازی بێ) پیاوێك پرسیاری لێدەکردو گوتی: من نان و گۆشتم خواردوە، ئایا دەستنوێژ هەڵبگرم (دەستنوێژم شکاوە)؟ ئەویش گوتی: هاوار بۆ تۆ، ئایا دەستنوێژ هەڵدەگریەوە، بە هۆی (خواردنی) شتە پاکەکانەوە؟!

٦٦٦- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ حُنَيْنٍ بِالْجِعْرَانَةِ، وَالتِّبْرُ[٣] فِي حِجْرِ بِلَالٍ، وَهُوَ يَقْسِمُ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: اعْدِلْ، فَإِنَّكَ لَا تَعْدِلُ، فَقَالَ: وَيْلَكَ، فَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ أَعْدِلُ؟ قَالَ عُمَرُ: دَعْنِي يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَضْرِبْ عُنُقَ هَذَا الْمُنَافِقِ، فَقَالَ: إِنَّ هَذَا مَعَ أَصْحَابٍ لَهُ «أَوْ: فِي أَصْحَابٍ لَهُ» يَقْرَؤُونَ الْقُرْآنَ، لَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ»[٤].

---

(١) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٥٤٤): (البخاري: ٢٣٥- كتاب الحج، ١٠٣- باب: ركوب البدن. مسلم: ١٥- كتاب الحج، ح ٣٧٣).

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) التبر: الذهب الخالص والفضة قبل أن تضرب دنانير ودراهم أو فتاتهما قبل أن يصاغا.

(٤) صحيح: «ظلال الجنة» (٩٤٣): (البخاري: ٥٧- كتاب فرض الخمس ١٥- باب: ومن الدليل على أن

واته: جابر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی حونەیندا لە جیعرانە بوو، جا قالبە زێڕێك (خشتە زێڕێك) لە ناو کۆشی بیلال بوو، پێغەمبەریش دابەشی دەکرد، پیاوێکیش هاتە لای و گوتی: دادگەربە، چونکە تۆ دادگەر نیت، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: هاوار بۆ تۆ ئایا کێ دادگەرە ئەگەر من دادگەر نەبم؟ عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێمگەڕێ با لە ملی ئەو دووڕووە بدەم، (پێغەمبەر ﷺ نەیهێشت) فەرمووی: ئەم پیاوەو هاوەڵ و هاوئاوازەکانی قوڕئان دەخوێننەوە، لە قوڕگیان ناچێتە خوارەوە (ناگاتە دڵیان و کاریگەری لەسەریان نابێ)، لە دین دەردەچن، هەروەکو چۆن تیر لە کەوان دەردەچێ.

٦٦٧- «عَنْ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، «وَكَانَ اسْمُهُ زَحْمَ بْنَ مَعْبَدٍ»، فَهَاجَرَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: مَا اسْمُكَ؟ قَالَ: زَحْمٌ، قَالَ: بَلْ أَنْتَ بَشِيرٌ، قَالَ: بَيْنَمَا أَنَا أَمْشِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذْ مَرَّ بِقُبُورِ الْمُشْرِكِينَ فَقَالَ: لَقَدْ سَبَقَ هَؤُلَاءِ خَيْرٌ كَثِيرٌ ثَلَاثاً، فَمَرَّ بِقُبُورِ الْمُسْلِمِينَ، فَقَالَ: لَقَدْ أَدْرَكَ هَؤُلَاءِ خَيْراً كَثِيراً ثَلَاثاً، فَحَانَتْ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ نَظْرَةٌ، فَرَأَى رَجُلاً يَمْشِي فِي الْقُبُورِ، وَعَلَيْهِ نَعْلَانِ، فَقَالَ: «يَا صَاحِبَ السِّبْتِيَّتَيْنِ، أَلْقِ سِبْتِيَّتَيْكَ»، فَنَظَرَ الرَّجُلُ، فَلَمَّا رَأَى النَّبِيَّ ﷺ خَلَعَ نَعْلَيْهِ فَرَمَى بِهِمَا»[1].

واته: بەشیر (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، کە پێشتر ناوی زەحمی کوڕی مەعبەد بوو، کۆچی کرد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، (پێغەمبەریش ﷺ) پێی فەرموو: ناوت چیە؟ گوتی: زەحم، (واتە: جەنجاڵی و قەڵەباڵغی) فەرمووی: بەڵکو تۆ بەشیریت (واتە: موژدەدەری)، دەڵێ: لە کاتێکدا من لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دەڕۆیشتم، جا بە لای گۆڕی هاوبەشدانەراندا تێپەڕ بوو و فەرمووی: خێرو چاکە پێش ئەمانە کەوتەوە (پێی نەگەیشتن) سێ جار (ئاوای فەرموو)، ئنجا بە لای گۆڕی مسوڵماناندا تێپەڕ بوو و فەرمووی: ئەوانە گەیشتن بە خێرێکی زۆر، سێ جار (ئاوای فەرموو)، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ سەیرێکی کرد، بینی پیاوێك بە نێو گۆڕەکاندا دەڕۆیشت، جووتە نەعلەیەکی لەپێ بوو، جا فەرمووی: ئەی پیاوی نەعل لەبەر، نەعلەکانت دابکەنە، پیاوەکەش سەیری کرد، کاتێك پێغەمبەری ﷺ بینی، نەعلەکەی داکەندو فڕێی دان.

## دەربارەی: خانوو (دروستکردن)

٦٦٨- «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ هِلَالٍ، أَنَّهُ رَأَى حُجَرَ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ مِنْ جَرِيدٍ مَسْتُورَةً بِمُسُوحِ الشَّعْرِ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ بَيْتِ عَائِشَةَ؟ فَقَالَ: كَانَ بَابُهُ مِنْ وِجْهَةِ الشَّامِ، فَقُلْتُ: مِصْرَاعاً كَانَ أَوْ مِصْرَاعَيْنِ؟ قَالَ: كَانَ بَاباً وَاحِداً، قُلْتُ: مِنْ أَيِّ شَيْءٍ كَانَ؟ قَالَ: مِنْ عَرْعَرٍ أَوْ سَاجٍ»[2].

---

الخمس لنوائب المسلمين. مسلم: ١٢- كتاب الزكاة، ح ١٤٢).

(١) صحيح: «أحكام الجنائز» (١٣٦-١٣٧)، «الإرواء» (٧٦٠): (أبو داود: ٢٠- كتاب الجنائز،٧٤- باب: المشي في الحذاء بين القبور، ح (٣٢٣). النسائي: ٢١- كتاب الجنائز،١٠٧- باب: كراهية المشي بين القبور في النعال السبتية..

(٢) صحيح الإسناد: قَالَ إِبْرَاهِيمُ: يَعْنِي الثياب المخططة.

واتە: موحەممەدی کوڕی هیلال دەگێڕێتەوە، کە ژووری خێزانەکانی پێغەمبەری ﷺ بینیوە، کە لە لاسکی دارخورما دروستکرابوون و بە جلی موو داپۆشرابوون، منیش پرسیارم کرد لە خانووی عائیشە (چۆنە)؟ گوتی: دەرگاکەی بە ڕووی شامدا بوو، منیش گوتم: یەك دەرگا بوو، یان دوو دەرگا بوو، گوتی: یەك دەرگا بوو، گوتم لە چی دروست کرابوو؟ گوتی: لە عەرعەر یان لە ساج بوو.

٦٦٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَبْنِيَ النَّاسُ بُيُوتاً يُوشُونَهَا وَشْيَ الْمَرَاحِيلِ»»

واتە: ئەبو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژی دوایی نایەت تا ئەو کاتەی خەڵکی خانوو دروست دەکەن، ڕەنگیان دەکەن هەروەکو چۆن پۆشاکی بە وێنە ڕەنگ دەکرێ.

## دەربارەی: قسەی پیاو کە دەڵێ: نەخێر، سوێند بە باوکت

٦٧٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّه عَنْهُ)، جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ أَجْراً؟ قَالَ: «أَمَا وَأَبِيكَ لَتُنَبَّأَنَّهُ: أَنْ تَصَدَّقَ وَأَنْتَ صَحِيحٌ شَحِيحٌ تَخْشَى الْفَقْرَ، وَتَأْمُلُ الْغِنَى، وَلا تُمْهِلَ حَتَّى إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ قُلْتَ: لِفُلَانٍ كَذَا، وَلِفُلَانٍ كَذَا، وَقَدْ كَانَ لِفُلَانٍ»»[٢].

واتە: ئەبو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کام بەخشین باشترین پاداشتی هەیە؟ فەرمووی سوێند بە باوکت پێت ڕادەگەیەنم: خێرو چاکە بکەی لە کاتێکدا کە لەش ساغیت و ماڵ و سامانەکەشت خۆشدەوێ (لەبەر ئەوەی پێویستی زۆرت پێی هەیە)، وە ترسیشت لە هەژاری هەیە، وە بە هیوای دەوڵەمەندبوونی (ئەو جۆرە خێرە چاکترین پاداشتی هەیە)، وە نەکەی خۆت دوابخەی هەتا ڕووح دەگاتە گەروو، ئەو کاتە بڵێی: ئەوەندە بۆ فڵان و ئەوەندەش بۆ فلان، چونکە ماڵەکە تازە هەر بۆتە هی فڵان و فیسار (تازە بۆ فڵان و فیساریش نەبێ بۆ میراتگرانە، کەواتە: هەر جگە لە خۆت سوودی لێ دەبینێ نەك تۆ، ئەوەیان کەمترین پاداشتی هەیە).

تێبینی: لێرەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی خواردووە، زۆربەی زانایان دەیکەنە بەڵگە بەوەی ئەگەر مرۆڤ سوێندی بە جگە لە خوا خوارد، بەڵام سوێندخواردنەکەی بۆ بە گەورەگرتنی شتەکە نەبوو، بەڵکو سوێندێکی سەرزارەکی بوو، ئەوە کێشەی تێدا نیە، وەك لە فەرمودەی تریشدا هاتووە، واللّٰه أعلم.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٧٩).

(٢) صحيح دون لفظ «وأبيك»، (البخاري: ٢٤- كتاب الزكاة ١١- باب: أي الصدقة أفضل؟ مسلم: كتاب الزكاة، ح ٩٢).

وە هەندێکیش لە زانایان دەڵێن: ئەوە ئەو کاتە بووە کە هێشتا سوێند بە جگە لە خوا حەرام نەکرابوو، بەڵام ڕاستی ناتوانرێت ئەوە بسەلمێنرێ، چونکە مێژووی گوترانی فەرمودەکان دیارنین و نازانین.

هەندێکی دیکەش تەئویلی بۆ دەکەن، وشەی (رب)ی بۆ زیاد دەکەن، بەڵام ئەوە خیلافی زاهیرە.

بە هەر حاڵ ڕاجیایی هەیە، بەڵام ئەوەی یەکەمیان بەهێزترە، چونکە دوای وەفاتی پێغەمبەری خواش هاوەڵان بەکاریان هێناوە لە شیعر و قسەکانیاندا، وەك قسەی سەرزارەکی، واللّٰه أعلم.

## دەربارەی: ئەگەر کەسێك داوای شتێکی کرد، کەم داوا بکات و مەدحی کەسەکە نەکات

٦٧١- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: إِذَا طَلَبَ أَحَدُكُمُ الْحَاجَةَ فَلْيَطْلُبْهَا طَلَبًا يَسِيرًا، فَإِنَّمَا لَهُ مَا قُدِرَ لَهُ، وَلَا يَأْتِي أَحَدُكُمْ صَاحِبَهُ فَيَمْدَحَهُ، فَيَقْطَعَ ظَهْرَهُ»

واتە: عەبدوڵلا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئەگەر کەسێك لە ئێوە داوای پێویستیەکی کرد ئەوە با داوای شتێکی کەم بکات، چونکە ئەوەندەی بۆ هەیە کە بۆی دیاریکراوە، هەروەها با هیچ یەکێکتان نەچێتە لای هاوەڵەکەی و مەدحی بکات، بەمەش پشتی بشکێنێ، (واتە: نەکەن وا مەدحی یەکدی بکەن و لە خۆبایی بن، لە قیامەت پشتتان بشکێت بە هۆی لە خۆباییتان بە مەدح کردنەوە).

٦٧٢- «عَنْ أَبِي عَزَّةَ يَسَارِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْهُذَلِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ إِذَا أَرَادَ قَبْضَ عَبْدٍ بِأَرْضٍ، جَعَلَ لَهُ بِهَا «أَوْ: فِيهَا» حَاجَةً»»[٢].

واتە: ئەبو عەززە یەساری کوڕی عەبدوڵلای هوزەلی (خوا لێی ڕازی بێ)، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: کاتێك خوا ویستی ڕووحی بەندەیەکی بکێشێ لەسەر زەویەك (لە شوێنێکدا)، ئەوە لەو شوێنە پێویستیەکی بۆ دروست دەکات (بەندەکە) دەچێ بۆ ئەوێ.

---

[١] صحيح الإسناد.

[٢] صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٢٢١): (الترمذي: ٣٠- كتاب القدر، ١١- باب: ماجاء أن النفس تموت حيث ما كتب لها).

## دەربارەی: (فەرموودەی) با کەس نەڵێ: خوا و فڵان

٦٧٣- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا): قَالَ رَجُلٌ لِلنَّبِيِّ ﷺ: مَا شَاءَ اللَّهُ وَشِئْتَ، قَالَ: «جَعَلْتَ لِلهِ نِدًّا، مَا شَاءَ اللَّهُ وَحْدَهُ»»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ): دەڵێ: پیاوێك بە پێغەمبەری ﷺ گوت: ئەگەر خواو تۆ بتانەوێ (ئاوا دەبێ)، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: هاوبەشت بۆ خوا دانا، بڵێ: ئەگەر خوا بیەوێ بە تەنها.**

## دەربارەی: گۆرانی و ڕابواردن

٦٧٤- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) إِلَى السُّوقِ، فَمَرَّ عَلَى جَارِيَةٍ صَغِيرَةٍ تُغَنِّي، فَقَالَ: إِنَّ الشَّيْطَانَ لَوْ تَرَكَ أَحَداً لَتَرَكَ هَذِهِ»[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی دینار دەڵێ: لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەرچووین بەرەو بازاڕ، جا بەلای کچۆڵەیەکی بچووکدا تێپەڕی گۆرانی دەگوت، (عەبدوڵڵاش) گوتی: ئەگەر شەیتان وازی لە کەسێك هێنابایە، ئەوە وازی لەم (کچ)ە دەهێنا، (واتە: لەگەڵ ئەوەی بچووکیشە شەیتان هەر خەریکی فریودانیەتی و کاری ناڕەوای پێ ئەنجام دەدات).**

٦٧٥- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا): ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ ﴿٦﴾﴾لقمان، قَالَ: الْغِنَاءُ وَأَشْبَاهُهُ»[٣].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ ﴿٦﴾﴾، گوتوویەتی: واتە: گۆرانی و هاوشێوەکانی گۆرانی دەگرێتەوە.**

٦٧٦- «عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفْشُوا السَّلَامَ تَسْلَمُوا، وَالْأَشَرَةُ شَرٌّ قَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ: وَالْأَشَرُ: الْعَبَثُ»»[٤].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٣٨).

(٢) حسن الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) حسن: «الإرواء» (٧٦٩)، «السلسلة الصحيحة» (١٤٩٣)، [انظر «المسند» للإمام أحمد (٤: ٢٨٦) الطبعة الأولى].

واتە: بەڕائی کوڕی عازب (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سەلام کردن لە نێوانتاندا بڵاوبکەنەوە، سەلامەت و پارێزراو دەبن (لە شەڕو ئاژاوەو توندوتیژی)، وە بێ هوودەیی خراپترین شتە (واتە: کاری بێ بەرهەم و گاڵتەوگەپ خراپترین شتە).

## دەربارەی: ڕێگەو ڕێبازی جوان

٦٧٧- «عَنْ زَيْدُ بْنُ وَهْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: إِنَّكُمْ فِي زَمَانٍ: كَثِيرٌ فُقَهَاؤُهُ، قَلِيلٌ خُطَبَاؤُهُ، قَلِيلٌ سُؤَّالُهُ، كَثِيرٌ مُعْطُوهُ، الْعَمَلُ فِيهِ قَائِدٌ لِلْهَوَى، وَسَيَأْتِي مِنْ بَعْدِكُمْ زَمَانٌ: قَلِيلٌ فُقَهَاؤُهُ، كَثِيرٌ خُطَبَاؤُهُ، كَثِيرٌ سُؤَّالُهُ، قَلِيلٌ مُعْطُوهُ، الْهَوَى فِيهِ قَائِدٌ لِلْعَمَلِ، اعْلَمُوا أَنَّ حُسْنَ الْهَدْيِ، فِي آخِرِ الزَّمَانِ، خَيْرٌ مِنْ بَعْضِ الْعَمَلِ»[1].

واتە: زەیدی کوڕی وەهب دەڵێ: گوێم لە ئیبنو مەسعوود بوو (خوا لێی ڕازی بێ) دەیگوت: ئێوە لە ڕۆژگارێکدان کە زاناو فەقیهی شەرعیان زۆرە، وتاربێژیان کەمە، داواکارو دەست پانکەرەوەیان کەمەو بەخشەریان زۆرە، کردەوە بۆتە پێشەنگ بۆ هەواو ئارەزوو (واتە: ئارەزوو و شەهوەتیان گوێڕایەڵی کردەوەیانە)، جا لە دوای ئێوە ڕۆژگارێك دادێ، کە زانای شەرعزانیان کەم دەبێ، وتاربێژیان زۆر دەبێ، داواکارو دەست پانکەرەوەیان زۆر دەبن، بەخشەریان کەم دەبن، هەوەس و ئارەزوو دەبێتە پێشەنگ بۆ کارو کردەوە (واتە: کردەوە بە پێی ئارەزوو دەکەن)، بزانن کە ڕەوشت جوانی لە ئاخیر زەماندا لە هەندێك کردەوە باشترە.

٦٧٨- «عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قُلْتُ لَهُ: رَأَيْتَ النَّبِيَّ ﷺ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَلَا أَعْلَمُ عَلَى ظَهْرِ الْأَرْضِ رَجُلاً حَيّاً رَأَى النَّبِيَّ ﷺ غَيْرِي، قَالَ: وَكَانَ أَبْيَضَ، مَلِيحَ الْوَجْهِ، وَعَنْ يَزِيدَ بْنِ هَارُونَ، عَنِ الْجُرَيْرِيِّ قَالَ: كُنْتُ أَنَا وَأَبُو الطُّفَيْلِ نَطُوفُ بِالْبَيْتِ، قَالَ أَبُو الطُّفَيْلِ: مَا بَقِيَ أَحَدٌ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ غَيْرِي، قُلْتُ: وَرَأَيْتَهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، قُلْتُ: كَيْفَ كَانَ؟ قَالَ: كَانَ أَبْيَضَ مَلِيحاً مُقَصَّداً»[2].

واتە: بە ئەبو طوفەیلم گوت (خوا لێی ڕازی بێ): ئایا پێغەمبەرت ﷺ بینیوە، گوتی: بەڵێ، پێم وانیە لەسەر ئەم زەویە هیچ کەسێکی زیندوو پێغەمبەری ﷺ بینیبێ جگە لە من (یانی: لە نێو هاوەڵان تەنیا من ماوم لە ژیان)، (جا باسی پێغەمبەری کردو گوتی): کەسێکی سپی بوو و، ڕووخساری جوان بوو، وە لە یەزیدی کوڕی هاڕوونەوە گێڕدراوەتەوە ئەویش لە جورەیریەوە گێڕاویەتیەوە گوتوویەتی: من و ئەبو طوفەیل تەوافمان بە دەورەی بەیتدا دەکرد، ئەبو طوفەیل گوتی: هیچ کەسێك نەماوە کە پێغەمبەری ﷺ بینیبێ جگە لە من، گوتم: تۆ بینیوتە؟ گوتی: بەڵێ، گوتم: چۆن بوو؟ گوتی: کەسێکی سپی بوو، جوان بوو، (درێژیەکەی) مام ناوەند بوو.

---

(١) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٣١٨٩)، «التعليق على فتح الباري» (١٠/٥١٠).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٠٥٣): (ليس في شيء من الكتب الستة).

٦٧٩- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْهَدْيُ الصَّالِحُ، وَالسَّمْتُ الصَّالِحُ، وَالِاقْتِصَادُ، جُزْءٌ مِنْ خَمْسَةٍ وَعِشْرِينَ جُزْءاً مِنَ النُّبُوَّةِ»»[١].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: ڕەوشتی جوان و، ڕێگەو ڕێبازی ڕێك و جوان و، ناوەندگیری لە دینداری و ژیانکردندا، بەشێکە لە بیست و پێنج بەشی پێغەمبەرایەتی.**

## دەربارەی: کاتێك کەسانێك هەواڵت بۆ دێنن، تۆش نەتناردوون بۆ هێنانی هەواڵ

٦٨٠- «عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا): هَلْ سَمِعْتِ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَتَمَثَّلُ شِعْراً قَطُّ؟ فَقَالَتْ: أَحْيَاناً، إِذَا دَخَلَ بَيْتَهُ، يَقُولُ: «وَيَأْتِيكَ بِالْأَخْبَارِ مَنْ لَمْ تُزَوِّدِ»»[٢].

**واتە: عیکریمە دەڵێ: پرسیارم لە عائیشە کرد (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتم: ئایا گوێت لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە هیچ کاتێك شیعری هێنابێتەوە؟ گوتی: هەندێك جار کە دەهاتەوە ماڵەوە دەیفەرموو: «وَيَأْتِيكَ بِالْأَخْبَارِ مَنْ لَمْ تُزَوِّدِ» واتە: کەسانێك خۆیان هەواڵت بۆ دێنن، بێ ئەوەی تۆ بیاننێری بۆ هێنانی هەواڵ.**

٦٨١- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: إِنَّهَا كَلِمَةُ نَبِيٍّ ﷺ: «وَيَأْتِيكَ بِالْأَخْبَارِ مَنْ لَمْ تُزَوِّدِ»»[٣].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئەمە قسەی پێغەمبەرە ﷺ: کەسانێك خۆیان هەواڵت بۆ دێنن، بێ ئەوەی تۆ بیاننێری بۆ هێنانی هەواڵ.**

## دەربارەی: ناوی تریێ مەهێنن بە: کەڕم

٦٨٢- «عَنْ عَلْقَمَةَ بْنِ وَائِلٍ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمُ: الْكَرْمَ، وَقُولُوا: الْحَبَلَةَ»، يَعْنِي: الْعِنَبَ»[٤].

**واتە: عەلقەمەی کوڕی وائیل، دەگێڕێتەوە لە باوکی (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: با یەکێك لە ئێوە (بە تریێ) نەڵێ کەڕم (چونکە تریێ شایستەی ئەو ناوە جوانە نیە، لەبەر ئەوەی ئارەق و مەشروبیشی لێ دروست دەکرێ، بۆیە ناوی جوان بۆ شتێك دامەنێن کە لایەنی خراپی تێدابێ)، بەڵکو بڵێن: حەبەلە، واتە: تریێ.**

---

(١) حسن: «الروض النضير» (٣٧٤).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٠٥٧): (الترمذي: ٤١- كتاب الأدب، ٧٠- باب: ماجاء في إنشاد الشعر).

(٣) صحيح لغيره: انظر ما قبله.

(٤) صحيح: «الروض» ٩ (١١٧٢): (مسلم: ٤٠- كتاب الألفاظ في الأدب، ح ١١ و ١٢).

## دەربارەی: گوتنی: هاوار بۆ تۆ

**٦٨٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بِرَجُلٍ يَسُوقُ بَدَنَةً، فَقَالَ: «ارْكَبْهَا»، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا بَدَنَةٌ، فَقَالَ: «ارْكَبْهَا»، قَالَ: إِنَّهَا بَدَنَةٌ، قَالَ فِي الثَّالِثَةِ أَوْ فِي الرَّابِعَةِ: «وَيْحَكَ ارْكَبْهَا»»[1].**

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ بە لای پیاوێك تێپەڕ بوو وشترەکەی پێش خۆیدابوو، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: سواری بە، (پیاوەکەش) گوتی: ئەوە بۆ کردنە قوربانییە لە حەج، فەرمووی: سواری بە، کابرا گوتی: ئەوە بۆ کردنە قوربانییە لە حەج، دەڵێ: لە جاری سێیەم، یان چوارەمدا پێی فەرموو: هاوار بۆ تۆ سواری بە!**

## دەربارەی: قسەی پیاو کە دەڵێ: یا هەناهـ
## (واتە: ئەی ئەوە، کە بریتیە لە ئامرازێکی بانگکردن)

٦٨٤- «عَنْ حَبِيبِ بْنِ صُهْبَانَ الْأَسَدِيِّ: رَأَيْتُ عَمَّاراً صَلَّى الْمَكْتُوبَةَ، ثُمَّ قَالَ لِرَجُلٍ إِلَى جَنْبِهِ: يَا هَنَاهْ، ثُمَّ قَامَ»[2].

**واتە: حەبیبی کوڕی صوهبانی ئەسەدی دەڵێ: عەممارم بینی نوێژی فەڕزی دەکرد، (پاش ئەوەی تەواو بوو) گوتیە پیاوێك کە لە تەنیشتی بوو ئەی هناه دوایی هەڵسا.**

تێبینی: **(یا هناهـ)** واتە: یا هذا، بۆ بانگکردن بەکاردێ.

**٦٨٥- «عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أَرْدَفَنِي النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «هَلْ مَعَكَ مِنْ شِعْرِ أُمَيَّةَ بْنِ أَبِي الصَّلْتِ؟» قُلْتُ: نَعَمْ. فَأَنْشَدْتُهُ بَيْتاً، فَقَالَ: «هِيهِ»، حَتَّى أَنْشَدْتُهُ مِائَةَ بَيْتٍ»[3].**

**واتە: عەمری کوڕی شەرید، لە باوکیەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە دوای خۆی سواری کردم (لەسەر پشتی وڵاخەکەی)و، فەرمووی: ئایا هیچ شیعرێکی ئومەییەی کوڕی صەڵتت لەبەرە؟ گوتم: بەڵێ، جا دێڕە شیعرێکم بۆ گوت، فەرمووی: زیاتر بەردەوامبە، تا سەد دێڕە شیعرم بۆ گوت.**

---

(١) **صحيح:** «صحيح أبي داود» (١٥٤٤): (البخاري: ٢٥- كتاب الحج، ١٠٣- باب: ظكوب البدن. مسلم: **١٥- كتاب الحج، ح ٣٧١، ٣٧٢).**

(٢) **صحيح الإسناد.**

(٣) **صحيح: (مختصر الشمائل) (٢١٢)، «تخريج فقه السيرة) (٢٥): (مسلم: ٤١- كتاب الشعر، ح ١).**

## دەربارەی: قسەی پیاو کە دەڵێ: من بێهێز بووم

٦٨٦- «عَنْ يَزِيدَ بْنِ خُمَيْرٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي مُوسَى قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا): لَا تَدَعْ قِيَامَ اللَّيْلِ، فَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ لَا يَذَرُهُ، وَكَانَ إِذَا مَرِضَ أَوْ كَسِلَ صَلَّى قَاعِدًا»[١].

واتە: یەزیدی کوڕی خومەیر دەڵێ: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو مووسا بوو، گوتی: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: واز لە شەو نوێژ مەهێنە، چونکە پێغەمبەر ﷺ وازی لێ نەدەهێنا، وە ئەگەر نەخۆش بووایە یان بێ هێز بووایە نوێژی بە دانیشتنەوە دەکرد.

## دەربارەی: ئەوەی پەنای بە خوا گرتوە لە تەنبەڵی

٦٨٧- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ، وَالْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ، وَضَلَعِ الدَّيْنِ، وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ»»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ زۆر دەیفەرموو: خوایە من پەنا بە تۆ دەگرم لە خەم و، دڵتەنگی و، نەتوانین و تەنبەڵی و، ترسنۆکی و، ڕەزیلی و، قورسی قەرزو، زاڵبوونی پیاوانی دوژمن بەسەرماندا.

## دەربارەی: کەسێك کە دەڵێ: نەفسم بە فیدات بێ

٦٨٨- «عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: فَانْطَلَقَ النَّبِيُّ ﷺ نَحْوَ الْبَقِيعِ، وَانْطَلَقْتُ أَتْلُوهُ، فَالْتَفَتَ فَرَآنِي فَقَالَ: «يَا أَبَا ذَرٍّ»، فَقُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَسَعْدَيْكَ، وَأَنَا فِدَاؤُكَ، فَقَالَ: «إِنَّ الْمُكْثِرِينَ هُمُ الْمُقِلُّونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، إِلَّا مَنْ قَالَ هَكَذَا وَهَكَذَا فِي حَقٍّ»، قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، فَقَالَ: هَكَذَا ثَلَاثًا، ثُمَّ عَرَضَ لَنَا أُحُدٌ فَقَالَ: «يَا أَبَا ذَرٍّ»، فَقُلْتُ: لَبَّيْكَ رَسُولَ اللَّهِ وَسَعْدَيْكَ، وَأَنَا فِدَاؤُكَ، قَالَ: «مَا يَسُرُّنِي أَنَّ أُحُدًا لِآلِ مُحَمَّدٍ ذَهَبًا، فَيُمْسِي عِنْدَهُمْ دِينَارٌ، أَوْ قَالَ: مِثْقَالٌ»، ثُمَّ عَرَضَ لَنَا وَادٍ، فَاسْتَنْتَلَ، فَظَنَنْتُ أَنَّ لَهُ حَاجَةً، فَجَلَسْتُ عَلَى شَفِيرٍ، وَأَبْطَأَ عَلَيَّ، قَالَ: فَخَشِيتُ عَلَيْهِ، ثُمَّ سَمِعْتُهُ كَأَنَّهُ يُنَاجِي رَجُلًا، ثُمَّ خَرَجَ إِلَيَّ وَحْدَهُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَنِ الرَّجُلُ الَّذِي كُنْتَ تُنَاجِي؟ فَقَالَ: «أَوَ سَمِعْتَهُ؟»

---

(١) صحيح: «صحيح أبي داود» (١١٨٠).

(٢) صحيح: «غاية المرام» (٣٤٧)، «صحيح أبي داود» (١٣٨٧): (البخاري: ٥٦- كتاب الجهاد، ٧٤- باب من غزا بصبي للخدمة).

قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: «فَإِنَّهُ جِبْرِيلُ أَتَانِي، فَبَشَّرَنِي أَنَّهُ مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِي لَا يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئاً دَخَلَ الْجَنَّةَ، قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ: نَعَمْ»»[1].

واتە: ئەبو زەڕ (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بەرەو لای بەقیع، منیش بە دوایدا ڕۆیشتم، جا ئاوڕی دایەوەو منی بینی، فەرمووی: ئەی ئەبو زەڕ! گوتم: لە خزمەتتدام ئەی پێغەمبەری خوا، وە بەختەوەری لەسەر بەختەوەریت بە قسمەت بێ و، من فیدات بم، فەرمووی: ئەوانەی ماڵیان زۆرە پاداشتیان کەمە لە دواڕۆژدا، مەگەر کەسێك ئاواو ئاوا (بەملاو بەولادا) لە حەقدا ببەخشێ، گوتم: خواو پێغەمبەر زاناترن، جا سێ جار ئاماژەی کرد (بەملاو ئەولا)، پاشان ئوحودمان لێ دەرکەوت، فەرمووی: ئەی ئەبو زەڕ! گوتم لە خزمەتتدام ئەی پێغەمبەری خوا وە بەختەوەری بەسەر بەختەوەریت بە قسمەت بێ و، من بە فیدات بم، فەرمووی: پێم خۆش نیە ئوحود ببێ بە زێڕ بۆ خزم و کەسی موحەممەدو ئێوارە بکەنەوە دینارێکیان لەلا مابێ، یان فەرمووی حەز ناکەم مسقاڵێکیان لەلا مابێ، پاشان دۆڵێکمان لێ دەرکەوت، جا بەرەو پێشەوە چوو، گومانم وابوو پێویستیەکی هەیە (وەك سەرئاو)، منیش لەسەر لێوارەکە دانیشتم، پێغەمبەر ﷺ درەنگ کەوت، جا ترسام شتێکی بەسەر هاتبێ، پاشان گوێم لێ بوو، وەك ئەوەی گفتوگۆ لەگەڵ پیاوێکدا بکات، پاشان بە تەنها هاتە دەرەوە بۆ لام، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو پیاوە کێ بوو کە گفتوگۆت لەگەڵدا دەکرد؟ فەرمووی: ئایا گوێت لێی بوو؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: ئەوە جبریل بوو، هاتە لام موژدەی پێدام کە هەر کەسێك لە ئوممەتەکەی تۆ مردو، هیچ هاوبەشی بۆ خوا بڕیار نەدابێ دەچێتە بەهەشتەوە، گوتم: ئەگەر زینای کردبێ و دزیشی کردبێ؟ فەرمووی: بەڵێ.

## دەربارەی: قسەی پیاو کە دەڵێ: بە دایك و باوکەوە بە فیدات بم

٦٨٩- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَدَّادٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيّاً (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُفَدِّي رَجُلاً بَعْدَ سَعْدٍ، سَمِعْتُهُ يَقُولُ: «ارْمِ، فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي»»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی شەدداد دەڵێ: گوێم لە عەلی بوو (خوا لێی ڕازی بێ) دەیگوت: نەمبینیوە پێغەمبەر ﷺ خۆی فیدای کەس بکات لە دوای سەعد، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: بیهاوێژە باوك و دایکم فیدات بن.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح: (البخاري: ٥٦- كتاب الجهاد، ٨٠- باب: المجن ومن يتترس بترس صاحبه. مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ٤١).

٦٩٠- «عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى الْمَسْجِدِ وَأَبُو مُوسَى يَقْرَأُ، فَقَالَ: «مَنْ هَذَا؟» فَقُلْتُ: أَنَا بُرَيْدَةُ جُعِلْتُ فِدَاكَ، قَالَ: «قَدْ أُعْطِيَ هَذَا مِزْمَاراً مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ»»[١].

**واته: عەبدوڵلای کوڕی بوڕەیدە، لە باوکیەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە ماڵەوە دەرچوو بەرەو مزگەوت، لە کاتێکدا ئەبو مووسا قورئانی دەخوێندەوە، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: ئەوە کێیە؟ گوتم: من ئەبو بوڕەیدەم، بە فیدات بم، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەمە دەنگێك لە دەنگە خۆشەکانی ئەهلی داوودی پێ بەخشراوە (واتە: دەنگی خۆشە وەك ئەوان).**

## دەربارەی: گوتنی: ڕۆڵەکەم، کوڕەکەم

٦٩١- «عَنْ سَلْمٍ الْعَلَوِيِّ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَساً (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: كُنْتُ خَادِماً لِلنَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: فَكُنْتُ أَدْخُلُ بِغَيْرِ اسْتِئْذَانٍ، فَجِئْتُ يَوْماً، فَقَالَ: «كَمَا أَنْتَ يَا بُنَيَّ، فَإِنَّهُ قَدْ حَدَثَ بَعْدَكَ أَمْرٌ: لَا تَدْخُلَنَّ إِلَّا بِإِذْنٍ»»[٢].

**واته: سەلمی عەلەوی دەڵێ: گوێم لە ئەنەس بوو (خوا لێی ڕازی بێ) دەیگوت: من خزمەتکاری پێغەمبەر ﷺ بووم، بێ ئەوەی داوای چوونە ژوور بکەم دەچوومە ژوور، جا ڕۆژێك هاتم، فەرمووی: وەك ئەوە بە کە هەی ئەی ڕۆڵەکەم، لە دوای تۆ شتێك ڕوویداوە، بەبێ داوای هاتنە ژوورەوەو مۆڵەت وەرگرتن، مەیە ژوور.**

٦٩٢- «عَنِ ابْنِ أَبِي صَعْصَعَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ لَهُ: يَا بُنَيَّ»[٣].

**واته: ئیبنو ئەبو صەعصەعە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە ئەبو سەعیدی خودری (خوا لێی ڕازی بێ) پێی گوتوە: کوڕەکەم (ڕۆڵەکەم).**

## دەربارەی: با کەس نەڵێ: دەروونم پیس بووە

٦٩٣- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: خَبُثَتْ نَفْسِي، وَلَكِنْ لِيَقُلْ: لَقِسَتْ[٤] نَفْسِي»»[٥].

---

(١) صحيح: صحيح أبي داود (١٣٤١): (ليس في شيء من الكتب الستة).

(٢) صحيح لغيره: «السلسلة الصحيحة» (٢٩٥٧): (ليس في شيء من الكتب الستة).

(٣) صحيح الإسناد موقوف.

(٤) أي: إذا فسد مزاجها، وحصل فيه غثيان، أو سوء هضم.

(٥) صحيح: (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١٠٠- باب: لا يقل خبثب نفسي. مسلم: ٤٠- كتاب الألفاظ من الأدب ح ١٦).

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: با هیچ یەکێك لە ئێوە نەڵێ: دەروونم پیس بووە، بەڵکو با بڵێ: دەروونم تێکچووە.**

٦٩٤- «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: خَبُثَتْ نَفْسِي، وَلْيَقُلْ: لَقِسَتْ نَفْسِي»»[1].

**واتە: ئەبو ئومامە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە (خوا لێی ڕازی بێ) ئەویش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە فەرموویەتی: با هیچ یەکێك لە ئێوە نەڵێ: دەروونم پیس بووە، بەڵکو با بڵێ: دەروونم تێکچووە.**

## دەربارەی: نازناوی ئەبو حەکەم

٦٩٥- «عَنْ هَانِئُ بْنُ يَزِيدَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ لَمَّا وَفَدَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ مَعَ قَوْمِهِ، فَسَمِعَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ وَهُمْ يُكَنُّونَهُ بِأَبِي الْحَكَمِ، فَدَعَاهُ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَكَمُ، وَإِلَيْهِ الْحُكْمُ، فَلِمَ تَكَنَّيْتَ بِأَبِي الْحَكَمِ؟ قَالَ: لَا، وَلَكِنَّ قَوْمِي إِذَا اخْتَلَفُوا فِي شَيْءٍ أَتَوْنِي فَحَكَمْتُ بَيْنَهُمْ، فَرَضِيَ كِلَا الْفَرِيقَيْنِ، قَالَ: «مَا أَحْسَنَ هَذَا، ثُمَّ قَالَ: مَا لَكَ مِنَ الْوَلَدِ؟» قُلْتُ: لِي شُرَيْحٌ، وَعَبْدُ اللَّهِ، وَمُسْلِمٌ، بَنُو هَانِئٍ، قَالَ: «فَمَنْ أَكْبَرُهُمْ؟» قُلْتُ: شُرَيْحٌ، قَالَ: «فَأَنْتَ أَبُو شُرَيْحٍ»، وَدَعَا لَهُ وَوَلَدِهِ وَسَمِعَ النَّبِيُّ ﷺ قَوْمًا يُسَمُّونَ رَجُلاً مِنْهُمْ: عَبْدَ الْحَجَرِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا اسْمُكَ؟» قَالَ: عَبْدُ الْحَجَرِ، قَالَ: «لَا، أَنْتَ عَبْدُ اللَّهِ قَالَ شُرَيْحٌ: وَإِنَّ هَانِئًا لَمَّا حَضَرَ رُجُوعُهُ إِلَى بِلَادِهِ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: أَخْبِرْنِي بِأَيِّ شَيْءٍ يُوجِبُ لِيَ الْجَنَّةَ؟ «قَالَ: عَلَيْكَ بِحُسْنِ الْكَلَامِ، وَبَذْلِ الطَّعَامِ»»[2].

**واتە: هانیئی کوڕی یەزید دەگێڕێتەوە، کاتێ بە نوێنەرایەتی ڕۆیشتوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ قەومەکەی، پێغەمبەر ﷺ بیستی ئەوان بە ئەبو حەکەم بانگی دەکەن، پێغەمبەریش ﷺ بانگی کرد فەرمووی: بێگومان تەنها خوا حەکەمە، حوکم و بڕیاریش تەنها لای ئەوە، بۆچی نازناوی خۆت کردوە بە ئەبو حەکەم؟ گوتی: نەخێر، من ئەو نازناوەم بۆ خۆم دانەناوە، بەڵام قەومەکەم ئەگەر جیاوازیان بکەوتبایە نێوان لەبارەی شتێکەوە بانگی منیان دەکرد، منیش حوکم و بڕیارم لە نێوانیاندا دەدا، هەردوو کۆمەڵەکە ڕازی دەبوون، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: چی لەمە چاکترە! پاشان فەرمووی: چەند منداڵت هەیە؟ گوتم: شورەیح و عەبدوڵڵاو موسلیم، منداڵەکانی هانییء فەرمووی: کامەیان گەورەترینیانە؟ گوتم: شورەیح، فەرمووی: کەواتە تۆ ئەبو شورەیحیت، جا دوعای بۆ ئەوو منداڵەکانی کرد، وە (جارێکی دیکەیان) پێغەمبەر ﷺ گوێی لە قەومێك بوو بانگی پیاوێکی**

---

(١) صحيح: (البخاري، ومسلم: في البابين المذكورين قبل).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٩٣٩)، «الإرواء» (٢٦١٥): (أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٦٢- تغيير الاسم القبيح، ح ٤٩٥٥. النسائي: ٤٩- كتاب آداب القضاء، ٧- باب إذا حكموا رجلاً فقضي بينهم.




خۆیان دەکرد بە (عَبْد الْحَجَرِ) واتە: بەندەی بەرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ناوت چیە)؟ گوتی: (عَبْدَ الْحَجَرِ) فەرمووی: نەخێر، تۆ عەبدوڵڵای، شورەیح دەڵێ: جا کە هانیئ کاتی گەڕانەوەی هات بۆ شوێنی خۆی، هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵم بدەرێ بە شتێك بەهەشتم بۆ واجب بکات، فەرمووی: دەست بگرە بە قسەی جوان و بەخشینی خواردن.

## دەربارەی: پەلە کردن لە کاتی ڕۆیشتندا

٦٩٦- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: أَقْبَلَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ مُسْرِعاً وَنَحْنُ قُعُودٌ، حَتَّى أَفْزَعَنَا سُرْعَتُهُ إِلَيْنَا، فَلَمَّا انْتَهَى إِلَيْنَا سَلَّمَ، ثُمَّ قَالَ: «قَدْ أَقْبَلْتُ إِلَيْكُمْ مُسْرِعاً، لِأُخْبِرَكُمْ بِلَيْلَةِ الْقَدْرِ، فَنَسِيتُهَا فِيمَا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ، فَالْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ»»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە پەلە هات بۆ نێومان لەو کاتەدا ئێمە دانیشتبووین، تا ئەو ڕاددەیەی پەلەکردنەکەی بۆ لای ئێمە ترساندمانی، جا کاتێ گەیشتە لامان سڵاوی کرد، پاشان فەرمووی: بە پەلە هاتم بۆ لاتان تاکو هەواڵی شەوی قەدرتان بدەمێ، بەڵام لە نێوان خۆم و ئێوە بیرم چوویەوە، لە دە شەوی کۆتایی بۆی بگەڕێن.

## دەربارەی: خۆشەویستترین ناو لای خوا (عَزَّوَجَلَّ)

٦٩٧- «عَنْ أَبِي وَهْبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «تَسَمَّوْا بِأَسْمَاءِ الْأَنْبِيَاءِ، وَأَحَبُّ الْأَسْمَاءِ إِلَى اللَّهِ عَزَّوَجَلَّ: عَبْدُ اللَّهِ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ، وَأَصْدَقُهَا: حَارِثٌ، وَهَمَّامٌ، وَأَقْبَحُهَا: حَرْبٌ، وَمُرَّةُ»»[٢].

واتە: ئەبو وەهەب (خوا لێی ڕازی بێ)، کە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بووە، دەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ناوی خۆتان بنێن بە ناوی پێغەمبەران، وە خۆشەویسترین ناو لای خوا (عَزَّوَجَلَّ): عەبدوڵڵاو عەبدوڕڕەحمانە، وە ڕاسترینیان بریتیە لە: حاریث و هەممام (حارث واتە: جوتیار، شێر. هَمّام واتە: گەورەی ئازا، سەخی، شێر)، وە ناشرینترینیان بریتیە لە: حەرب و موڕڕە (کە بە واتای جەنگ و تاڵی دێن).

٦٩٨- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: وُلِدَ لِرَجُلٍ مِنَّا غُلَامٌ فَسَمَّاهُ: الْقَاسِمَ، فَقُلْنَا: لَا نُكَنِّيكَ أَبَا الْقَاسِمِ وَلَا كَرَامَةَ، فَأُخْبِرَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «سَمِّ ابْنَكَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ»»[٣].

---

(١) صحيح لغيره: دون سبب الحديث والإسراع «الضعيفة» (٦٣٣٨).

(٢) صحيح: دون جملة الأنبياء: «السلسلة الصحيحة» (١٠٤٠)، «الإرواء» (١١٧٨)، «تخريج الكلم الطيب» (٢١٨).

(٣) صحيح: (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١٠٥- باب: أحب الأسماء إلى الله عزوجل. مسلم: ٣٨- كتاب الأدب، ح ٧).

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: یەكێك لە ئێمە منداڵێكی بوو ناوی لێنا: قاسم، ئێمەش گوتمان: نە بە ئەبو قاسم بانگت دەكەین و، نە ڕێزیشت لێ دەنێین، جا هەواڵدرا بە پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمووی: كوڕەكەت ناو لێ بنێ عەبدوڕڕەحمان.

## دەربارەی: گۆڕینی ناوێك بۆ ناوێكی دیكە

٦٩٩- «عَنْ سَهْلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أُتِيَ بِالْمُنْذِرِ بْنِ أَبِي أُسَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، إِلَى النَّبِيِّ ﷺ حِينَ وُلِدَ، فَوَضَعَهُ عَلَى فَخِذِهِ «وَأَبُو أُسَيْدٍ جَالِسٌ» فَلَهَى النَّبِيُّ ﷺ بِشَيْءٍ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَأَمَرَ أَبُو أُسَيْدٍ بِابْنِهِ فَاحْتُمِلَ مِنْ فَخِذِ النَّبِيِّ ﷺ، فَاسْتَفَاقَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: أَيْنَ الصَّبِيُّ؟ فَقَالَ أَبُو أُسَيْدٍ: قَلَبْنَاهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: مَا اسْمُهُ؟ قَالَ: فُلَانٌ، قَالَ: «لَا، لَكِنِ اسْمُهُ الْمُنْذِرُ» فَسَمَّاهُ يَوْمَئِذٍ الْمُنْذِرَ»[1].

واتە: سەهل (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: مونزیری كوڕی ئوسەید كاتێ لە دایك بوو هێنرا بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، (جا باوكی) خستیە سەر ڕانی پێغەمبەر ﷺ، «ئەبو ئوسەیدیش دانیشتبوو» جا پێغەمبەر ﷺ سەرقاڵ بوو بە شتێكەوە كە لەبەر دەستیدا بوو، ئەبو ئوسەیدیش فەرمانی كرد كوڕەكەی هەڵبگیرێ لەسەر ڕانی پێغەمبەر ﷺ، جا پێغەمبەر ﷺ بە ئاگا هاتەوەو فەرمووی: منداڵەكە لە كوێیە؟ ئەبو ئوسەید گوتی: ناردمانەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: ناوی چیە؟ گوتی: فلان، فەرمووی: نەخێر، بەڵكو ناوی مونزیرە، جا ناوی لێنا مونزیر.

## دەربارەی: خراپترین ناو لای خوا (عَزَّوَجَلَّ)

٧٠٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَخْنَى الْأَسْمَاءِ عِنْدَ اللَّهِ رَجُلٌ تَسَمَّى مَلِكَ الْأَمْلَاكِ»»[2].

واتە: ئەبو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خراپترین و ناشیرینترین ناوەكان لای خوا پیاوێكە ناودەبرێ: بە پادشای پادشایان.

---

(١) صحيح: (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١٠٨- باب: تحويل الاسم الى اسم أحسن منه. مسلم: ٣٨- كتاب الآداب، ح ٢٩).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨١٥): (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١١٤- بأبغض الأسماء إلى الله. مسلم: ٣٨- كتاب الآداب، ح ٢٠).

## دەربارەی: ئەو کەسەی کەسێکی دیکە بانگ دەکات بە بچوك کردنەوەی ناوەکەی

٧٠١- «عَنْ طَلْقِ بْنِ حَبِيبٍ قَالَ: كُنْتُ أَشَدَّ النَّاسِ تَكْذِيباً بِالشَّفَاعَةِ، فَسَأَلْتُ جَابِراً، فَقَالَ: يَا طُلَيْقُ، سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «يَخْرُجُونَ مِنَ النَّارِ بَعْدَ دُخُولٍ، وَنَحْنُ نَقْرَأُ الَّذِي تَقْرَأُ»»[١].

**واتە: طەڵقی کوڕی حەبیب دەڵێ: من لەو کەسانە بووم، زۆر بە توندی شەفاعەتم بە درۆ دەزانی (واتە: شەفاعەتی دوارِۆژ)، بۆیە پرسیارم لە جابر کرد (لەوبارەوە)، ئەویش گوتی: ئەی طەڵقۆکە گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: کەسانێك لە نێو ئاگر دێنە دەرەوە، دوای ئەوەی چوونەتە نێویەوە، وە ئێمەش ئەوە دەخوێنینەوە کە تۆ دەیخوێنیتەوە.**

## دەربارەی: گۆڕینی ناوی عاصیە

٧٠٢- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّ النَّبِيَّ غَيَّرَ اسْمَ عَاصِيَةَ، وَقَالَ: «أَنْتِ جَمِيلَةُ»»[٢].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ناوی عاصییەی گۆڕی (کە بە مانای سەرپێچیکار دێ)، وە فەرمووی: بەڵکو تۆ (جمیلة)ی واتە: جوان.**

٧٠٣- «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ، أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى زَيْنَبَ بِنْتِ أَبِي سَلَمَةَ، فَسَأَلَتْهُ عَنِ اسْمِ أُخْتٍ لَهُ عِنْدَهُ؟ قَالَ: فَقُلْتُ: اسْمُهَا بَرَّةُ، قَالَتْ: غَيِّرِ اسْمَهَا، فَإِنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَكَحَ زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ وَاسْمُهَا بَرَّةُ، فَغَيَّرَ اسْمَهَا إِلَى زَيْنَبَ، وَدَخَلَ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ حِينَ تَزَوَّجَهَا، وَاسْمِي بَرَّةُ، فَسَمِعَهَا تَدْعُونِي: بَرَّةَ، فَقَالَ: «لَا تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمْ، فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ أَعْلَمُ بِالْبَرَّةِ مِنْكُنَّ وَالْفَاجِرَةِ، سَمِّيهَا زَيْنَبَ». فَقُلْتُ لَهَا: سَمِّي، فَقَالَتْ: غَيِّرْهُ إِلَى مَا غَيَّرَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَسَمَّهَا زَيْنَبَ»[٣].

**واتە: موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی عەطاء دەگێڕێتەوە، کە چۆتە ژوورەوە بۆ لای زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە، (زەینەب) پرسیاری لێکرد لەبارەی ناوی خوشکێکی ئەو کە لە لای بوو؟ دەڵێ: گوتم: ناوی (بَرَّة)یە، (واتە: چاك)، گوتی: ناوەکەی بگۆڕە، چونکە پێغەمبەر ﷺ زەینەبی کچی جەحشی مارە بڕی لە کاتێکدا ناوی (بَرَّة) بوو، جا ناوەکەی گۆڕی بۆ (زَيْنَب)، وە چووە ژوورەوە بۆ لای ئوممو سەلەمە کاتێ خوازبێنی (زەینەبی) کرد، لە کاتێکدا ناوم (بَرَّة) بوو، جا بیستی (ئوممو سەلەمە) بە (بَرَّة) بانگم دەکات، بۆیە فەرمووی: خۆتان بە چاك و پاك دامەنێن،**

---

(١) صحيح لغيره: «السلسلة الصحيحة» (٣٠٥٥): (مسلم: بمعناه مطولًا، ١- الإيمان ح ٣٢٠).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢١٣): (مسلم: ٣٨- كتاب الآداب، ح ١٥)

(٣) صحيح: (السلسلة الصحيحة» (٢١٠): (مسلم: ٣٨- كتاب الآداب، ح ١٨و ١٩).

چونکه تەنها خوا زاناترە کامەتان چاکەو کامەتان خراپە، ناوی بێنە بە زەینەب، جا منیش بە (زەینەبی کچی ئەبی سەلەمەم) گوت: ناوێکی بنێ، ئەویش گوتی: (خۆت) بیگۆڕە بۆ ئەو ناوەی پێغەمبەر ﷺ بۆی گۆڕیوە، بۆیە ئەویش ناوینا زەینەب.

## دەربارەی: ناوی (شیهاب)

٧٠٤- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، ذُكِرَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ: شِهَابٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَلْ أَنْتَ هِشَامٌ»»[١].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ باسی پیاوێك كرا پێی دەگوترا: شیهاب (واتە: بڵێسەی ئاگر)، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بەڵکو تۆ هیشامی (چونکە مانای هیشام خۆشەو، بە مانای سەخاوەت دێ).

## دەربارەی: ناوی عاص (سەرپێچیکار)

٧٠٥- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُطِيعٍ قَالَ: سَمِعْتُ مُطِيعاً (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ، يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ: «لَا يُقْتَلُ قُرَشِيٌّ صَبْرًا بَعْدَ الْيَوْمِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»، فَلَمْ يُدْرِكِ الْإِسْلَامَ أَحَدٌ مِنْ عُصَاةِ قُرَيْشٍ غَيْرُ مُطِيعٍ، كَانَ اسْمُهُ الْعَاصَ فَسَمَّاهُ النَّبِيُّ ﷺ مُطِيعاً»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موطیع، دەڵێ: لە موطیعم (خوا لێی ڕازی بێ)، بیست، دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو، لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا دەیفەرموو: لەمڕۆ بەدواوە هەتا قیامەتدا دێ، هیچ قورەیشیەك بە لەسەرخۆیی ناکوژرێ (واتە: نابێ بە تەعزیب بکوژرێ)، هیچ کەسێك لە سەرپێچیکارەکانی قورەیش نەگەیشت بە ئیسلام (و نەبوو بە مسوڵمان) جگە لە موطیع، کە (لە ئەصڵدا خۆی) ناوی عاص بوو (کە بە مانای سەرپێچی دێ) پێغەمبەر ﷺ ناوی گۆڕی بۆ موطیع (دوای مسوڵمان بوونی).

---

(١) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٢١٥)، [تعليقاً ٤٠- كتاب الأدب، ٦٢- باب: تغيير الاسم القبيح، ح ٤٩٥٦].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٤٢٧): (مسلم: ٣٢- كتاب الجهاد، ح ٨٨).

## دەربارەی: بانگکردنی کەسێك بە کورت و گچکەکردنەوەی بەشێك لە ناوەکەی (بۆ خۆشەویستی)

٧٠٦- «عَنْ أَبُو سَلَمَةَ، أَنَّ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا عَائِشُ، هَذَا جِبْرِيلُ يَقْرَأُ عَلَيْكِ السَّلَامَ»، قَالَتْ: وَعَلَيْهِ السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، قَالَتْ: وَهُوَ يَرَى مَا لَا أَرَى»[1].

واتە: ئەبو سەلەمە دەڵێ: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتویەتی: (ڕۆژێکیان) پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئەی عائیش! ئەوە جبریلە سەلامت لـێ دەکات، دەڵێ: ئەویش گوتی: (وَعَلَيْهِ السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ)، (جا عائیشە خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: ئەو دەیبینی (واتە: پێغەمبەر ﷺ جبریلی دەبینی) من نەمدەبینی.

## دەربارەی: ناوی زەحم (جەنجاڵ)

٧٠٧- «عَنْ خَالِدِ بْنِ شُمَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي بَشِيرُ بْنُ نُهَيْكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «مَا اسْمُكَ؟»، قَالَ: زَحْمٌ، قَالَ: «بَلْ أَنْتَ بَشِيرٌ»، فَبَيْنَمَا أَنَا أُمَاشِي النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «يَا ابْنَ الْخَصَاصِيَةِ! مَا أَصْبَحْتَ تَنْقِمُ عَلَى اللَّهِ؟ أَصْبَحْتَ تُمَاشِي رَسُولَ اللَّهِ ﷺ»، قُلْتُ: بِأَبِي وَأُمِّي، مَا أَنْقِمُ عَلَى اللَّهِ شَيْئاً، كُلَّ خَيْرٍ قَدْ أَصَبْتُ، فَأَتَى عَلَى قُبُورِ الْمُشْرِكِينَ فَقَالَ: «لَقَدْ سَبَقَ هَؤُلَاءِ خَيْرًا كَثِيراً»، ثُمَّ أَتَى عَلَى قُبُورِ الْمُسْلِمِينَ فَقَالَ: «لَقَدْ أَدْرَكَ هَؤُلَاءِ خَيْرًا كَثِيراً» فَإِذَا رَجُلٌ عَلَيْهِ سِبْتِيَّتَانِ يَمْشِي بَيْنَ الْقُبُورِ، فَقَالَ: «يَا صَاحِبَ السِّبْتِيَّتَيْنِ، أَلْقِ سِبْتِيَّتَكَ» فَخَلَعَ نَعْلَيْهِ»[2].

واتە: خالدی کوڕی شومەیر، دەڵێ: بەشیری کوڕی نوهەیك (باسی خۆی کرد) (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: هاتوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، ئەویش پێی فەرموو: ناوت چیە؟؟ گوتی: (زَحْمٌ)، (واتە: جەنجاڵ)، فەرمووی: بەڵکو تۆ (بَشِير)ی واتە: (مژدەدەر)، جا (جارێکی دیکەیان) لە کاتێکدا من لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەڕۆیشتم، فەرمووی: ئەی کوڕی خەصاصیە! ئەوە چیە دەتەوێ خوا لە خۆت تووڕە بکەی؟ وات لێهاتووە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بە ڕێگەدا بڕۆی، منیش گوتم: بە باوك و دایکم بە قوربانت بم، بە هیچ شێوەیەك خوا تووڕە ناکەم، هەموو خێرێکم دەست کەوتووە، جا هات بۆ لای گۆڕستانی هاوبەش دانەران فەرمووی: بەڕاستی خێرێکی زۆر پێش ئەمانە کەوت، پاشان هات بۆ لای گۆڕستانی مسوڵمانان فەرمووی: بە ڕاستی ئەمانە گەیشتن بە خێرێکی زۆر،

---

(١) صحيح: (البخاري: ٥٩- كتاب بدء الخلق، ٦- بذكر الملائكة. مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ٩١).

(٢) صحيح.

**پیاوێك جووتە نەعلەكی لەپێ بوون، لە نێوان گۆڕەكاندا دەڕۆیشت، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەی خاوەنی ئەو دوو نەعلە، نەعلەكانت فڕێ بدە، ئەویش نەعلەكانی داكەند.**

٧٠٨- «عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ إِيَادٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ لَيْلَى امْرَأَةَ بَشِيرٍ تُحَدِّثُ، عَنْ بَشِيرِ ابْنِ الْخَصَاصِيَةِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، وَكَانَ اسْمُهُ زَحْمَاً، فَسَمَّاهُ النَّبِيُّ ﷺ بَشِيراً»[١].

**واتە: عوبەیدوڵڵای كوڕی ئییاد لە باوكی دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوێم لە لەیلای خێزانی بەشیر بوو لە بەشیرەوە دەیگێڕایەوە (گوتوویەتی): پێشتر ناوی (زَحْم) بووە (كە بە مانای قەڵەباڵغی و جەنجاڵی دێ)، پێغەمبەریش ﷺ (ناوی گۆڕی و) ناوی لێنا (بَشِير) واتە: مژدەدەر.**

## دەربارەی: ناوی بەڕڕە (چاكەكار)

٧٠٩- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّ اسْمَ جُوَيْرِيَةَ كَانَ بَرَّةَ، فَسَمَّاهَا النَّبِيُّ ﷺ جُوَيْرِيَةَ»[٢].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێشتر جوەیریە ناوی (بَرَّةَ) بوو، پێغەمبەر ﷺ ناوی لێنا (جُوَيْرِيَةَ) واتە: جاریۆكەكە، یان گوڵە سووڕۆكەكە.**

٧١٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ اسْمُ مَيْمُونَةَ بَرَّةَ، فَسَمَّاهَا النَّبِيُّ ﷺ مَيْمُونَةَ»[٣].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: مەیمونە پێشتر ناوی (بَرَّةَ) بوو، پێغەمبەر ﷺ ناوی لێنا (مَيْمُونَةَ)، واتە: بە پیت و بەرەكەت.**

## دەربارەی: ناوی ئەفلەح (سەرفراز)

٧١١- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: إِنْ عِشْتُ نَهَيْتُ أُمَّتِي «إِنْ شَاءَ اللَّهُ» أَنْ يُسَمِّي أَحَدُهُمْ بَرَكَةَ، وَنَافِعاً، وَأَفْلَحَ، وَلَا أَدْرِي قَالَ: رَافِعاً أَمْ لَا؟ يُقَالُ: هَا هُنَا بَرَكَةُ؟ فَيُقَالُ: لَيْسَ هَا هُنَا، فَقُبِضَ النَّبِيُّ ﷺ وَلَمْ يَنْهَ عَنْ ذَلِكَ»[٤].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٩٤٥): (هو جزء من الحديث السابق).

(٢) شاذ: «السلسلة الصحيحة» (٢١١): [الذي في مسلم: ٣٨- كتاب الآداب، ح ١٧، أن زينب كان اسمها برة، فقيل تزكي نفسها فسماها رسول ﷺ زينب].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢١٢): (مسلم: ٣٨-كتاب الآداب، ح ١٦).

(٤) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢١٤٣) «تخريج الترغيب» (٣/٨٥): مسلم: (أبو داود: ٤٥- كتاب الأدب، ٦٢- باب: في تغيير الاسم القبيح، ح ٤٩٦٠)، في صحيح مسلم عن سمرة رضي اللّه عنه مرفوعا: (لا تسمين غلامك يسارا، ولا رباحا، ولا نجيحا، ولا أفلح، فإنك تقول: أثم هو؟ فلا يكون، فتقول: لا).

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ژیام ڕێگری لە ئوممەتەکەم دەکەم «ئەگەر خوا بیەوێ»، لەوەی یەکێکیان ناو بنێ بە ناوی: (بَرَكَةَ) بەرەکەت، (نَافع) بە سوود، (أَفْلَحَ) سەرفراز، نازانم (رَافع)یشی گوت یان نا؟ (کە بە مانای بەرزکەرەوە دێ)، (هۆی چاك نەبوونی ئەم ناوانەش لەبەر ئەوەیە چونکە) دەگوترێ: بەرەکەت لێرەیە؟ (جاری وایە) دەگوترێ: لێرە نیە (بۆیە ڕەنگە یاری بە وشەی بەرەکەت بکرێ)، پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کردو قەدەغەی نەکرد.

٧١٢- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، يَقُولُ: أَرَادَ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يَنْهَى أَنْ يُسَمَّى بِيَعْلَى، وَبِبَرَكَةَ، وَنَافِعٍ، وَيَسَارٍ، وَأَفْلَحَ، وَنَحْوَ ذَلِكَ، ثُمَّ سَكَتَ بَعْدُ عَنْهَا، فَلَمْ يَقُلْ شَيْئًا»[١].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ویستی ڕێگری بکات لەوەی کەسێك (یەکێك) ناو بنێ بە ناوی (يَعْلَى) بەرزدەبێتەوە، (بَرَكَةَ) بەرەکەت، (نَافع) بە سوود، (يَسَار) ئاسانکار، (أَفْلَحَ) سەرفرازو، هاووێنەی ئەو ناوانە، پاشان بێدەنگ بوو لێی، هیچی نەفەرموو.

## دەربارەی: ناوی ڕەباح (قازانج)

٧١٣- «عَنْ عُمَر بْن الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: لَمَّا اعْتَزَلَ النَّبِيُّ ﷺ نِسَاءَهُ، فَإِذَا أَنَا بِرَبَاحٍ غُلَامِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَنَادَيْتُ: يَا رَبَاحُ، اسْتَأْذِنْ لِي عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[٢].

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە خێزانەکانی دوورکەوتەوە، جا ڕەباحی خزمەتکاری پێغەمبەری خوام ﷺ بینی و، بانگم کرد (گوتم): ئەی ڕەباح مۆڵەتم بۆ وەربگرە بۆ چوونە لای پێغەمبەری خوا ﷺ.

## دەربارەی: ناوی پێغەمبەران عليهم السلام

٧١٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «تَسَمُّوا بِاسْمِي، وَلَا تُكَنُّوا بِكُنْيَتِي، فَإِنِّي أَنَا أَبُو الْقَاسِمِ»»[٣].

---

(١) صحيح: المصدر نفسه. مسلم: (أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٦٢- باب: في تغيير الاسم القبيح، ح ٤٩٦٠).

(٢) حسن: [جزء من حديث طويل أخرجه البخاري في: ٤٦- كتاب المظالم، ٢٥- باب: الطلاق، ح ٣٠. ولم يذكر البخاري اسم الغلام وإنما ذكره مسلم وهو رباح].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٩٤٦): (البخاري: ٣٨- كتاب الأدب، ١٠٦- باب: قول النبي ﷺ تسموا باسمي ولا تكنوا بكنيتي. مسلم: ٣٨- كتاب الآداب، ح ٨).

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ناو بنێن بە ناوی منەوە، بەڵام نازناو بۆخۆتان دامەنێن بە نازناوی منەوە، چونکە (تەنها) من باوکی قاسمم.

(مەبەستی ئەوەیە ناوی منداڵتان بنێن موحەممەد، أحمد، ماحی، حاشیر، بەڵام نازناو بۆ خۆتان دامەنێن بە ئەبو قاسم، چونکە ئەوە تایبەتە بە پێغەمبەر ﷺ کە مەبەست بە «ئەبو قاسم» دابەشکاری خێرو بێرو غەنیمەتە، کە تایبەتە بە پێغەمبەر ﷺ).

تێبینی: هەندێك لە زانایان دەفەرموون حەرامی ئەو کونیەو نازناو دانانە تایبەت بووە بە حاڵی حەیاتی پێغەمبەری خوا ﷺ، واتە: دوای وەفاتی ئەو دروستە، والله أعلم.

٧١٥- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ فِي السُّوقِ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا أَبَا الْقَاسِمِ، فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا دَعَوْتُ هَذَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «سَمُّوا بِاسْمِي، وَلَا تَكَنُّوا بِكُنْيَتِي»»[1].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە بازاڕ بوو، پیاوێك گوتی: ئەی ئەبو قاسم، پێغەمبەریش ﷺ ئاوڕی دایەوە، کابرا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی ئەو پیاوەم کرد (لەگەڵ تۆم نەبوو)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ناو بنێن بە ناوی منەوە، بەڵام نازناو بۆ خۆتان دامەنێن بە نازناوی منەوە.

٧١٦- «عَنْ يُوسُفَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَلَامٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: سَمَّانِي النَّبِيُّ ﷺ يُوسُفَ، وَأَقْعَدَنِي عَلَى حِجْرِهِ وَمَسَحَ عَلَى رَأْسِي»[2].

واتە: یوسفی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی سەلام (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ناوی لێنام یوسف و، لە کۆشی خۆی دانام و دەستی بەسەر سەرم داهێنا.

٧١٧- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: وُلِدَ لِرَجُلٍ مِنَّا مِنَ الْأَنْصَارِ غُلَامٌ، وَأَرَادَ أَنْ يُسَمِّيَهُ مُحَمَّداً -قَالَ شُعْبَةُ فِي حَدِيثِ مَنْصُورٍ: إِنَّ الْأَنْصَارِيَّ قَالَ: حَمَلْتُهُ عَلَى عُنُقِي، فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ، وَفِي حَدِيثِ سُلَيْمَانَ: وُلِدَ لَهُ غُلَامٌ فَأَرَادُوا أَنْ يُسَمِّيَهُ مُحَمَّداً- قَالَ: «تَسَمُّوا بِاسْمِي، وَلَا تُكَنُّوا بِكُنْيَتِي، فَإِنِّي إِنَّمَا جُعِلْتُ قَاسِماً، أَقْسِمُ بَيْنَكُمْ»»[3].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك لە ئێمەی ئەنصاریەکان منداڵێکی لەدایك بوو، جا ویستی ناوی لێبنێ موحەممەد، « شوعبە لە فەرموودەی منصوردا

---

(١) صحيح: (البخاري: ٣٤- كتاب البيوع، ٤٩- باب: ما ذكر في الأسواق. مسلم: ٣٨- كتاب الأدب، ح ١).

(٢) صحيح: «مختصر الشمائل» (٢٩٢/١٧٩) (ليس في شيء من الكتب الستة).

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٩٤٦): (البخاري- ٥٧- كتاب فرض الخمس، ٧- باب: قول الله تعالى: فأن لله خمسة (الأنفال: ٤١) مسلم: ٣٨- كتاب الآداب، ح ٣).

گوتوویەتی»: کابرای ئەنصاڕی گوتی: منداڵەکەم خستە سەر ملم و، هێنام بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، «لە فەرموودەکەی سولەیمانیشدا هاتوە»: منداڵێکی لە دایك بوو و ویستیان ناوی بنێن موحەممەد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ناو بنێن بە ناوی منەوە، بەڵام نازناو دامەنێن بە نازناوی منەوە، چونکە تەنها من کراوم بە قاسم (واتە: دابەشکار)، (لەبەر ئەوەی تەنها من میرات و دەستکەوت و خێروبێرەکان) لە نێوانتاندا دابەش دەکەم.

٧١٨- «عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: وُلِدَ لِي غُلَامٌ، فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ، فَسَمَّاهُ إِبْرَاهِيمَ، فَحَنَّكَهُ بِتَمْرَةٍ، وَدَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ، وَدَفَعَهُ إِلَيَّ»[١].

واتە: ئەبو مووسا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: منداڵێکم لە دایك بوو، هێنام بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، (ئەویش) ناوی لێنا ئیبراهیم، ئنجا دەمی شیرین کرد بە خورمایەك، وە دووعای بەرەکەتی بۆ کردو دایەوە دەستم.

## دەربارەی: ناوی حەزن (دڵتەنگ)

٧١٩- «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «مَا اسْمُكَ؟»، قَالَ: حَزْنٌ، قَالَ: أَنْتَ سَهْلٌ، قَالَ: لَا أُغَيِّرُ اسْمًا سَمَّانِيهِ أَبِي. قَالَ ابْنُ الْمُسَيَّبِ: فَمَا زَالَتِ الْحُزُونَةُ فِينَا بَعْدُ»[٢].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەییب لە باوکی و باپیری (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، کە ئەو هاتووە بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، (پێغەمبەریش) فەرمووی: ناوت چیە؟ گوتی: (حزن) (واتە: دڵتەنگ)، فەرمووی: تۆ (سەهل)ی (واتە: ئاسان)، جا (کابرا ڕازی نەبوو و) گوتی: ناوێك ناگۆڕم کە باوکم لێیناوم. سەعیدی کوڕی موسەییب دەڵێ: جا بەردەوام لە دوای ئەو کاتە دڵتەنگی لە ناوماندا هەبوو.

٧٢٠- «عن عَبْدُ الْحَمِيدِ بْنُ جُبَيْرِ بْنِ شَيْبَةَ قَالَ: جَلَسْتُ إِلَى سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ فَحَدَّثَنِي، أَنَّ جَدَّهُ حَزْنًا قَدِمَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «مَا اسْمُكَ؟» قَالَ: اسْمِي حَزْنٌ، قَالَ: «بَلْ أَنْتَ سَهْلٌ»، قَالَ: مَا أَنَا بِمُغَيِّرٍ اسْمًا سَمَّانِيهِ أَبِي قَالَ ابْنُ الْمُسَيَّبِ: فَمَا زَالَتْ فِينَا الْحُزُونَةُ بَعْدُ»[٣].

واتە: عەبدولحەمیدی کوڕی جوبەیری کوڕی شەیبە دەڵێ: دانیشتم لەلای سەعیدی کوڕی موسەییب، جا بۆی باسکردم باپیری (کە ناوی) حەزن بوو، هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، (پێغەمبەریش)

---

(١) صحيح: (البخاري: ٨٧- كتاب الأدب، ١٠٩- باب: من سمى بأسماء الأنبياء. مسلم: ٣٨- كتاب الآداب، ح ٢٤).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢١٤): (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ح ١٠٧).

(٣) صحيح.

فەرمووی: ناوت چیە؟ گوتی: ناوم (حزن)ە، واتە: دڵتەنگ، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: بەڵكو تۆ (سەهل)ی، واتە: ئاسان، گوتی: من ناوێك ناگۆڕم كە باوكم لێی ناوم، ئیبنو موسەیەب دەڵێ: جا بەردەوام لە دوای ئەوە دڵتەنگی لە ناوماندا هەبوو (چونكە باپیرم سەرپێچی پێغەمبەری خوای ﷺ كرد لەمەدا).

## دەربارەی: ناوو نازناوی پێغەمبەر ﷺ

٧٢١- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: وُلِدَ لِرَجُلٍ مِنَّا غُلَامٌ فَسَمَّاهُ الْقَاسِمَ، فَقَالَتِ الْأَنْصَارُ: لَا نُكَنِّيكَ أَبَا الْقَاسِمِ، وَلَا نُنْعِمُكَ عَيْناً، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ لَهُ: مَا قَالَتِ الْأَنْصَارُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَحْسَنَتِ الْأَنْصَارُ، تَسَمَّوا بِاسْمِي، وَلَا تَكْتَنُوا بِكُنْيَتِي، فَإِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ»»[1].

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك لە ئێمە منداڵێكی لە دایك بوو و ناوی لێنا قاسم، ئەنصارییەكانیش گوتیان: نە بە نازناوی ئەبو قاسم بانگت دەكەین، نە دڵخۆشت دەكەین بەو ناوە، ئەویش هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺو قسەی ئەنصارییەكانی بۆ باس كرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەنصارییەكان چاكیان كردوە، ناو بنێن بە ناوی منەوە، بەڵام نازناو دامەنێن بە نازناوی منەوە، چونكە بە ڕاستی تەنها من (قاسِم)م.

٧٢٢- «عَنْ مُنْذِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ الْحَنَفِيَّةِ يَقُولُ: كَانَتْ رُخْصَةً لِعَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنْ وُلِدَ لِي بَعْدَكَ أُسَمِّيهِ بِاسْمِكَ، وَأُكَنِّيهِ بِكُنْيَتِكَ؟ قَالَ: «نَعَمْ»»[2].

واتە: مونزیر دەڵێ: بیستم ئیبنو حەنەفیە دەیگوت: (نازناودانان بە نازناوی پێغەمبەر ﷺ) مۆڵەت بوو بۆ عەلی (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەگەر لە دوای تۆ منداڵم بوو ناوی بنێم بە ناوی تۆوەو، نازناویشی بنێم بە نازناوی تۆوە؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بەڵێ.

٧٢٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ نَجْمَعَ بَيْنَ اسْمِهِ وَكُنْيَتِهِ، وَقَالَ: «أَنَا أَبُو الْقَاسِمِ، وَاللَّهُ يُعْطِي، وَأَنَا أَقْسِمُ»»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەهی كردوە كە ناوو نازناوی ئەو بەیەكەوە كۆبكەینەوەو (دایبنێین بۆ منداڵەكانمان)، وە فەرمووی: من ئەبو قاسمم، خوا دەبەخشێ، منیش دابەشی دەكەم.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٩٤٦): (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١٠٥- باب: أحب الأسماء إلى الله عز وجل. مسلم: ٣٨- كتاب الآدب، ١٠٥- باب: أحب الأسماء إلى الله عز وجل. مسلم: ٣٨- كتاب الآداب، ح ٧).

(٢) صحيح: «المشكاة» (٤٧٧٢/ التحقيق الثاني): (مختصر تحفة الودود)، «السلسلة الصحيحة» (٢٩٤٦)، (أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٦٨- باب: الرخصة في الجمع بينهما، ح ٤٩٦٧. الترمذي: ٤١-: الأدب، ما جاء في كراهية الجمع بين اسم النبي وكنيته ﷺ.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٩٤٦): (الترمذي: ٤١- كتاب الأدب و ٦٨- باب: ماجاء في الجمع بين اسمه وكنيته ﷺ)

٧٢٤- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ فِي السُّوقِ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا أَبَا الْقَاسِمِ، فَالْتَفَتَ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ: دَعَوْتُ هَذَا، فَقَالَ: «سَمُّوا بِاسْمِي، وَلَا تُكَنُّوا بِكُنْيَتِي»»[1].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە بازاڕ بوو، پیاوێکیش گوتی: ئەی ئەبو قاسم، پێغەمبەریش ﷺ ئاوڕی دایەوە، کابراش گوتی: بانگی ئەو پیاوەم کرد (لەگەڵ تۆم نەبوو)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ناو بنێن بە ناوی منەوە، بەڵام نازناو دامەنێن بە نازناوی منەوە.

## دەربارەی: ئایا کەسی هاوبەشدانەر نازناوی بۆ دادەنرێ؟

٧٢٥- «عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، أَنَّ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَخْبَرَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَلَغَ مَجْلِسًا فِيهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيِّ بْنُ سَلُولٍ، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ يُسْلِمَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ، فَقَالَ: لَا تُؤْذِينَا فِي مَجْلِسِنَا، فَدَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ فَقَالَ: «أَيْ سَعْدُ، أَلَا تَسْمَعُ مَا يَقُولُ أَبُو حُبَابٍ؟»، يُرِيدُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيِّ ابْنَ سَلُولٍ»[2].

واتە: عوروەی کوڕی زوبەیر گێڕاویەتیەوە، (گوتوویەتی): ئوسامەی کوڕی زەید (خوا لێی ڕازی بێ)، هەواڵی پێداوە، (گوتوویەتی): پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت بە مەجلیسێك کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولی تێدا بوو، جا ئەوە پێش مسوڵمان بوونی بوو، (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول) گوتی: ئازارمان مەدە لە کۆڕو دانیشتنەکەماندا، پێغەمبەریش ﷺ چوو بۆ لای سەعدی کوڕی عوبادەو فەرمووی: ئەی سەعد! ئایا گوێت لە ئەبو حوباب نیە چی دەڵێ؟ مەبەستی پێی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بوو.

تێبینی: لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ گوێ درێژەکی پێ بوو (وەك لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە) ئەم مونافیقە لووتی خۆی داپۆشی بەوەی کە لای بوو، گوتی: بە بۆنی ناخۆشی گوێ درێژەکەت و تۆزو خۆڵەکەی ئازارمان مەدەو لێمان دوور بکەوە، (ئەمەشی وەك سوکایەتی کردن گوت بە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ) .

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٩٤٦): (الترمذي: ٤١- كتاب الأدب و ٦٨- باب: ماجاء في الجمع بين اسمه وكنيته ﷺ).

(٢) صحيح: (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١١٥- باب: كنية المشرك. مسلم: ٣٢- كتاب الجهاد والسير، ح ١٦).

## دەربارەی: نازناو بۆ منداڵ

٧٢٦- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَدْخُلُ عَلَيْنَا، وَلِي أَخٌ صَغِيرٌ يُكَنَّى: أَبَا عُمَيْرٍ، وَكَانَ لَهُ نُغَرٌ يَلْعَبُ بِهِ فَمَاتَ، فَدَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ فَرَآهُ حَزِيناً، فَقَالَ: «مَا شَأْنُهُ؟» قِيلَ لَهُ: مَاتَ نُغَرُهُ، فَقَالَ: «يَا أَبَا عُمَيْرٍ، مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ؟»»[١].

**واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هاتە لامان، من برایەکی بچووکم هەبوو بە نازناوی ئەبو عومەیر بانگ دەکرا، چۆلەکەیەکیشی هەبوو یاری لەگەڵ دەکرد، ئیدی چۆلەکەکە مرد، پێغەمبەریش ﷺ هاتەماڵمان و بینی (براکەم) دڵتەنگە فەرمووی: ئەوە چی بووە؟ پێیان گوت: چۆلەکەکەی مردوە، فەرمووی: ئەی ئەبا عومەیر چۆلەکەکە چی لێهات؟!**

**تێبینی: خەڵکانێك گاڵتەیان بە هەندێك فەرموودە دەهات و، دەیانگوت ئەم فەرموودەیە سوودی چیە؟! پێشەوا ئیبنو حەجەری عەسقەلانی بۆ سەلماندنی سوودەوە دەستهاتووەکانی ئەم فەرموودەیە گەڕاوە، حەفتا ئیستینباتی لێ دەرهێناوە.**

## دەربارەی: نازناو (بۆ کەسێك) پێش ئەوەی ببێتە خاوەن منداڵ

٧٢٧- «عَنْ إِبْرَاهِيمَ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ كَنَّى عَلْقَمَةَ: أَبَا شِبْلٍ، وَلَمْ يُولَدْ لَهُ»[٢].

**واتە: ئیبراهیم، دەڵێ: عەبدوڵڵا نازناوی ئەبو شیبلی لە عەلقەمە نا، پێش ئەوەی لە دایك ببێ.**

٧٢٨- «عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ: كَنَّانِي عَبْدُ اللَّهِ قَبْلَ أَنْ يُولَدَ لِي»[٣].

**واتە: عەلقەمە دەڵێ: عەبدوڵڵا نازناوی بۆ دانابووم، پێش ئەوەی لە دایك ببم.**

## دەربارەی: نازناوی ئافرەتان

٧٢٩- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَنَّيْتَ نِسَاءَكَ، فَاكْنِنِي، فَقَالَ: «تَكَنَّي بِابْنِ أُخْتِكِ عَبْدِ اللَّهِ»»[٤].

---

(١) صحيح: «مختصر الشمائل» (٢٠١): (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١١٢- باب: الكنية للصبي قبل أن يوجل. مسلم: ٣٨- كتاب الآداب، ح ٣٨).

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٣٢) دون قولها: «كنيت نساءك فاكنني» فهي رواية منكرة».

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: چوومە لای پێغەمبەر ﷺ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، نازناوت بۆ خێزانەکانت داناوە، نازناو بۆ منیش دابنێ، فەرمووی: نازناوەکەت با بە ناوی عەبدوڵڵای خوشکەزاتەوە بێ.

٧٣٠- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، أَنَّ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، أَلَا تُكَنِّينِي؟ فَقَالَ: «اكْتَنِي بِابْنِكِ» يَعْنِي: عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ، فَكَانَتْ تُكَنَّى: أُمَّ عَبْدِ اللَّهِ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا نازناوم بۆ دانانێی؟ فەرمووی: خۆت ناوزەند بکە بە ناوی کوڕەکەتەوە. واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر، جا بە دایکی عەبدوڵڵا ناوزەندکرا.

## دەربارەی: ئەو کەسەی نازناو بۆ پیاوێك دادەنێ بە شتێك، کە تیایەتی یان بە یەکێك لەوان

٧٣١- «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، إِنْ كَانَتْ أَحَبَّ أَسْمَاءِ عَلِيٍّ إِلَيْهِ لَأَبُو تُرَابٍ، وَإِنْ كَانَ لَيَفْرَحُ أَنْ يُدْعَى بِهَا، وَمَا سَمَّاهُ أَبَا تُرَابٍ إِلَّا النَّبِيُّ ﷺ، غَاضَبَ يَوْماً فَاطِمَةَ، فَخَرَجَ فَاضْطَجَعَ إِلَى الْجِدَارِ إِلَى الْمَسْجِدِ، وَجَاءَهُ النَّبِيُّ ﷺ يَتْبَعُهُ، فَقَالَ: هُوَ ذَا مُضْطَجِعٌ فِي الْجِدَارِ، فَجَاءَ النَّبِيَّ ﷺ وَقَدِ امْتَلَأَ ظَهْرُهُ تُرَاباً، فَجَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَمْسَحُ التُّرَابَ عَنْ ظَهْرِهِ وَيَقُولُ: «اجْلِسْ أَبَا تُرَابٍ»»[٢].

واتە: سەهلی کوڕی سەعد (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، خۆشەویسترین ناوی عەلی بە لای خۆیەوە (خوا لێی ڕازی بێ) ئەبو توراب بوو، وە زۆر دڵخۆش دەبوو کە بەو ناوەوە بانگ بکرابایە، کەس ناوی نەنا بە ئەبو توراب جگە لە پێغەمبەر ﷺ، (بەسەرهاتەکەش بەم شێوەیە بوو) ڕۆژێك لە فاتیمە تووڕە بوو، ئەویش هاتە دەرەوەو لە تەنیشت دیواری مزگەوتدا ڕاکشاو پاڵکەوت، پێغەمبەریش ﷺ هات (بۆ لای) لە کاتێکدا پشتی پڕی خۆڵ بوو، پێغەمبەریش ﷺ خۆڵەکەی سەر پشتی دادەکوتاو پێی دەفەرموو: دانیشە ئەی ئەبو توراب (خۆت لە زەوی بکەرەوەو هەڵسە).

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٣٢): (أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٧٠- باب: في المرأة تكني)..

(٢) صحيح: (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١١٣- باب: التكني بأبي تراب وإن كانت له كنية أخرى مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح٣٨).

## دەربارەی: چۆنیەتی ڕۆیشتن لەگەڵ پیاوماقوڵان و كەسانی ڕێزدار

٧٣٢- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: بَيْنَمَا النَّبِيُّ ﷺ فِي نَخْلٍ لَنَا «نَخْلٍ لِأَبِي طَلْحَةَ: تَبَرَّزَ لِحَاجَتِهِ، وَبِلَالٌ يَمْشِي وَرَاءَهُ، يُكْرِمُ النَّبِيَّ ﷺ أَنْ يَمْشِيَ إِلَى جَنْبِهِ، فَمَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بِقَبْرٍ فَقَامَ، حَتَّى تَمَّ إِلَيْهِ بِلَالٌ، فَقَالَ: «وَيْحَكَ يَا بِلَالُ، هَلْ تَسْمَعُ مَا أَسْمَعُ؟» قَالَ: مَا أَسْمَعُ شَيْئًا، فَقَالَ: «صَاحِبُ هَذَا الْقَبْرِ يُعَذَّبُ»، فَوُجِدَ يَهُودِيًّا»[1].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: لە كاتێكدا كە پێغەمبەر ﷺ لە نێو باخێكی دارخورمای ئێمەدا بوو «باخی ئەبو تەڵحە بوو» دووركەوتەوە بۆ سەرئاو كردن، بیلالیش لە پشتیەوە دەڕۆیشت، ڕێزی پێغەمبەری ﷺ دەگرت (لەبەر گەورەیی و ڕێزی) شان بە شانی نەدەڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بە لای گۆڕێك و وەستا، هەتا (ئەو ئەندازەیەی) بیلال هات و گەیشتە تەنیشتی، جا فەرمووی: هاوار بۆ تۆ ئەی بیلال، ئایا ئەوە دەبیستی كە من دەیبیستم؟ گوتی: من هیچ شتێك نابیستم، فەرمووی: خاوەنی ئەم گۆڕە سزا دەدرێ، جا (دوایی) زانرا جوولەكە بوو.

٧٣٣- «عَنْ قَيْسٍ قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ لِأَخٍ لَهُ صَغِيرٍ: أَرْدِفِ الْغُلَامَ، فَأَبَى، فَقَالَ لَهُ مُعَاوِيَةُ: بِئْسَ مَا أُدِّبْتَ، قَالَ قَيْسٌ: فَسَمِعْتُ أَبَا سُفْيَانَ يَقُولُ: دَعْ عَنْكَ أَخَاكَ»[2].

واتە: قەیس دەڵێ: بیستم موعاویە (خوا لێی ڕازی بێ)، بە برایەكی بچوكی خۆی دەگوت: خزمەتكارەكە لە دواوە سوار بكە، ئەویش گوێڕایەڵی نەكرد، موعاویە پێی گوت: بە خراپترین شێوە پەروەردە كراوی، قەیس گوتی: گوێم لە ئەبو سوفیان بوو دەیگوت: واز لە براكەت بهێنە (چونكە گوێڕایەڵ نیەو تۆ وەك ئەو مەبە).

٧٣٤- «عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: إِذَا كَثُرَ الْأَخِلَّاءُ كَثُرَ الْغُرَمَاءُ، قُلْتُ لِمُوسَى: وَمَا الْغُرَمَاءُ؟ قَالَ: الْحُقُوقُ»[3].

واتە: عەمری كوڕی عاص (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئەگەر براكان زۆر بوون (الْغُرَمَاء)یش زۆر دەبن، (ڕاوی دەڵێ:) بە مووسام گوت: (غُرَمَاء) چیە؟ گوتی: مافەكان (واتە: زۆری مافەكان پەیوەستە بە زۆری براكانەوە، جا برای خوێنی بێ یان برای دینی).

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد.

## دەربارەی: لە شیعرو هۆنراوەدا حیكمەت هەیە

٧٣٥- «عَنْ قَتَادَةَ، سَمِعَ مُطَرِّفاً قَالَ: صَحِبْتُ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، مِنَ الْكُوفَةِ إِلَى الْبَصْرَةِ، فَقَلَّ مَنْزِلٌ يَنْزِلُهُ إِلَّا وَهُوَ يُنْشِدُنِي شِعْراً، وَقَالَ: إِنَّ فِي الْمَعَارِيضِ لَمَنْدُوحَةٌ عَنِ الْكَذِبِ»[1].

واتە: قەتادە دەگێڕێتەوە بیستوویەتی موتەڕڕیف گوتوویەتی: هاوەڵیەتی عیمرانی كوڕی حوصەینم كرد (خوا لێی ڕازی بێ)، لە كوفەوە بۆ بەصرە، كەم شوێن هەبوو تێیدا دابنیشێ، ئەوە هەر شیعرێكی بۆ دەگوتم، وە گوتی: بە ڕاستی: (مَعَارِيض)[2]، واتە: لە بەكارهێنانی وشەو ڕستەی چەند ڕوو (واتە: هەڵبژاردنی ئەو وشەو ڕستانەی دوو مانا، یان زیاتریان هەیەو، خۆت مەبەستت مانا دوورەكەیەو بەرانبەرەكەتە بە مانا نزیكەكە تێدەگات) دووركەوتنەوەو خۆ پاراستن لە درۆ هەیە (واتە: دەتوانی بە بەكارهێنانی ئەم جۆرە وشانە بەرانبەرەكەت ڕازی بكەیت و درۆش نەكەیت لە وشەكەدا).

تێبینی: ئەو بابەتە بۆ دوو حاڵەت بەكاردێ:

حاڵەتی یەكەم: كاتێك مرۆڤ ژیانی دەكەوێتە خەتەرو دەیانەوێ ستەمی لێ بكەن ئەگەر ڕاستی بدركێنێ، بۆ نمونە: كاتێ ئیمامی شافیعی دەستگیر كرا لەلایەن ئەوانەی پێیان وابوو قورئان دروستكراو (مخلوق)ە، بۆیە لێیان پرسی ئایا قورئان مەخلوقە؟ ئیمامی شافیعیش هەر چوار پەنجەكانی بەرز كردنەوەو یەك یەك پەنجەكانی دەگرت و دەیگوت: زەبوورو تەورات و ئینجیل و قورئان گشتیان مەخلوقن، جا ئازادیان كرد، وا تێگەیشتن مەبەستی هەر چوار كتێبەكەیە، كەچی ئەو مەبەستی پەنجەكانی دەستی خۆی بوو.

حاڵەتی دووەم: كاتێ مرۆڤ دەیەوێ نێوانگیریەكی چاك و بە سوود ئەنجام بدات بۆ مەبەستی ئاشتەوایی، بۆ نمونە تۆ بە كەسێك دەڵێی: بیستم ئەو كەسەی ڕقت لێیەتی دووعای خێری بۆ دەكردی، مەبەستت پێی ئەوەیە كاتێ دووعای بۆ مسوڵمانان دەكرد، دیارە ئەویش دەگرێتەوە.

٧٣٦- «عَنِ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ مِنَ الشِّعْرِ حِكْمَةً»»[3].

واتە: ئوبەی كوڕی كەعب (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان لە هۆنراوەدا حیكمەت و قسەلەجێیی هەیە (كەواتە: شیعرو هۆنراوەی شەرعی و چاك، ڕەوایەو سوود بەخشە).

---

(١) صحيح موقوفاً.

(٢) ئەم وشەی كە بیسەر پێچەوانەی بێژەر لێی تێدەگات.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٨٥١): (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٩٠- باب: ما يجوز من الشمر والرجز والحداء).

۷۳۷- «عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ سَرِيعٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي مَدَحْتُ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ بِمَحَامِدَ، قَالَ: «أَمَا إِنَّ رَبَّكَ يُحِبُّ الْحَمْدَ»، وَلَمْ يَزِدْهُ عَلَى ذَلِكَ»[1].

واته: ئەسوەدی کوڕی سەریع (خوا لێی ڕازای بێ)، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من مەدحی پەروەردگاری زاڵ و پایەدارم کرد بە کۆمەڵێك ستایش، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: بەڵام بە دڵنیایی پەروەردگارت حەمدو ستاییشی پێ خۆشە، هیچی لەوە زیاتر پێ نەفەرموو.

۷۳۸- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَأَنْ يَمْتَلِئَ جَوْفُ رَجُلٍ قَيْحًا حَتَّى يَرِيَهُ، خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَمْتَلِئَ شِعْرًا»»[2].

واته: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ناخی کەسێك پڕ بێ لە کێم و زووخاو، چاکترە بۆی لەوەی ناخی پڕ بێ لە هۆنراوە (واتە: هەر لە دوای هۆنراوە بێ، کەچی قورئان و فەرموودە وێڵ بکات، وە لە جیاتی حەقیقەت بە دوای وشەکاریی دا بگەڕێ).

۷۳۹- «عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ سَرِيعٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كُنْتُ شَاعِرًا، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ: أَلَا أُنْشِدُكَ مَحَامِدَ حَمِدْتُ بِهَا رَبِّي؟ قَالَ: «إِنَّ رَبَّكَ يُحِبُّ الْمَحَامِدَ»، وَلَمْ يَزِدْنِي عَلَيْهِ»[3].

واته: ئەسوەدی کوڕی سەریع (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من شاعیر بووم، هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، گوتم: ئایا شیعرێکی ستاییشیت بۆ بڵێم کە ستایشی پەروەردگارم پێی کردوە؟ فەرمووی: پەروەردگارت ستایشی پێ خۆشە، وە لەوە زیاتری پێ نەفەرمووم.

۷٤۰- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، قَالَتِ: اسْتَأْذَنَ حَسَّانُ بْنُ ثَابِتٍ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي هِجَاءِ الْمُشْرِكِينَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَكَيْفَ بِنِسْبَتِي؟»، فَقَالَ: لَأَسُلَّنَّكَ مِنْهُمْ كَمَا تُسَلُّ الشَّعْرَةُ مِنَ الْعَجِينِ»[4].

واته: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: حەسانی کوڕی سابیت داوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد مۆڵەتی بدات لە هەجو کردن و داشۆرینی هاوبەشدانەران (بە هۆنراوە)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەدی ڕەچەڵەکی من چی (واتە: کاتێ قسە بەوان بڵێیت و لەکەداریان بکەی، ئەدی منیش ناگرێتەوە، چونکە لە ڕەچەڵەکی ئەوانم)؟ گوتی: تۆ لە نێو ئەوان دەردێنم (لە هۆنراوەکانمدا) وەکو چۆن داوە موو لە نێو هەویردا دەردەهێنرێ.

---

(١) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٣١٧٩).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣٣٦): (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٩٢- باب: مايكره أن يكون الغالب على الإنسان الشعر . مسلم: ٤١- كتاب الشعر، ح٧).

(٣) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٣١٧٩).

(٤) صحيح: (البخاري: ٦١- كتاب المناقب، ١٦- باب: من أحب أن لا يسب نسبه . مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ١٥٦).

٧٤١- «عَنْ هِشَامٍ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: ذَهَبْتُ أَسُبُّ حَسَّانَ عِنْدَ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، فَقَالَتْ: لَا تَسُبَّهُ، فَإِنَّهُ كَانَ يُنَافِحُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[١].

واتە: هیشام لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە، گوتوویەتی: ڕۆیشتم قسەی ناشرینم بە حەسان گوت: لای عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، جا (عائیشە) گوتی: قسەی ناشرینی پێ مەڵێ، ئەو بەرگری لە پێغەمبەر ﷺ دەكرد (بە هۆنراوەكانی).

تێبینی: مەبەست لە هێنانی ئەم فەرموودە لەم شوێنە لەوانەیە ئەوە بێ، كە كاتێ خۆی لە بوختان هەڵبەستان بۆ دایكی ئیمانداران عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، حەسان (خوا لێی ڕازی بێ) یەكێك بوو لەو كەسانەی بڕوای بە بوختانەكە كرد، بەڵام دوایی تەوبەی كردو پەشێمان بۆوە، كەچی دایكمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، بە خراپەی ئەوی نەكردوە، وەك دەبینین بەرگری لێدەكات، لە ڕاستیدا چاكە ئەوە نیە چاكەكاربی لەگەڵ كەسێك چاكەت لەگەڵ دەكات، بەڵكو چاكەكاریی ئەوەیە لەگەڵ كەسێك چاكەكار بی، كە ئەو خراپەت لەگەڵ بكات، یان خراپەی لەگەڵ كردبی.

## دەربارەی: هۆنراوەی جوان وەك قسەی جوان وایە، وە خراپ و ناشرینیشی تێدایە

٧٤٢- «عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مِنَ الشِّعْرِ حِكْمَةٌ»»[٢].

واتە: واتە: ئوبەی كوڕی كەعب (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان هەندێ لە هۆنراوە حیكمەت و قسەلەجێییان تێدایە.

٧٤٣- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الشِّعْرُ بِمَنْزِلَةِ الْكَلَامِ، حَسَنُهُ كَحَسَنِ الْكَلَامِ، وَقَبِيحُهُ كَقَبِيحِ الْكَلَامِ»»[٣].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەمرِ (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هۆنراوە لە پلەی قسە دایە، جوانی و باشیەكانی وەك جوانی و باشی قسە وایە (دروست و چاكەو، خاوەنەكەی شایەنی پاداشتە)، خراپی و ناشرینیشی وەك خراپی و ناشرینی قسە وایە (دروست نیەو گوناهەو، خاوەنەكەی شایەنی سزایە).

---

(١) صحيح: (البخاري: ٦١- كتاب المناقب، ٦٦- باب من أحب أن لا يسب نسبه . مسلم: ٤٤- فضائل الصحابة، ح ١٥٤).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٨٥١): (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٩٠- باب: ما يجوز من الشعر والرجز والحداء وما يكره منه).

(٣) صحيح لغيره: «السلسلة الصحيحة» (٤٤٨). (ليس في شيء من الكتب الستة).

٧٤٤- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، أَنَّهَا كَانَتْ تَقُولُ: الشِّعْرُ مِنْهُ حَسَنٌ، وَمِنْهُ قَبِيحٌ، خُذْ بِالْحَسَنِ وَدَعِ الْقَبِيحَ، وَلَقَدْ رَوَيْتُ مِنْ شِعْرِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ أَشْعَاراً، مِنْهَا الْقَصِيدَةُ فِيهَا أَرْبَعُونَ بَيْتاً، وَدُونَ ذَلِكَ»[١].

واته: عائیشه (خوا لێی ڕازی بێ)، دەیگوت: هۆنراوه تێیاندا هەیه چاك و جوانه، وه تێشیاندا هەیه خراپ و ناشرینه، جا دەست به چاك و جوانەكەوه بگرەو، واز له ناشیرین و خراپەكه بێنه، من چەند هۆنراوەیەكی كەعبی كوڕی مالیكم گێڕاوەتەوه، یەكێك له هۆنراوەكان، هۆنراوه چل دێڕەكەیه، وه جگه لەوەش (هی دیكەشم گێڕاوەتەوه).

٧٤٥- «عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ شُرَيْحٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا): أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَمَثَّلُ بِشَيْءٍ مِنَ الشِّعْرِ؟ فَقَالَتْ: كَانَ يَتَمَثَّلُ بِشَيْءٍ مِنْ شِعْرِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ رَوَاحَةَ: «وَيَأْتِيكَ بِالْأَخْبَارِ مَنْ لَمْ تُزَوِّدِ»»[٢].

واته: میقدامی كوڕی شورەیح له باوكیەوه گێڕاویەتیەوه، گوتوویەتی: به عائیشەم (خوا لێی ڕازی بێ) گوت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ وێنەی به هیچ هۆنراوەیەك دەهێنایەوه؟ گوتی: وێنەی به بەشێك له هۆنراوەكانی عەبدوڵلای كوڕی ڕەواحه دەهێنایەوه: وەك: (وَيَأْتِيكَ بِالْأَخْبَارِ مَنْ لَمْ تُزَوِّدِ)[٣]، واتای شیعرەكه: وه كەسانێك خۆیان هەواڵت بۆ دێنن بێ ئەوەی تۆ بیاننێری بۆ هێنانی هەواڵ.

٧٤٦- «عَنِ الْأَسْوَدِ بْنَ سَرِيعٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كُنْتُ شَاعِراً فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، امْتَدَحْتُ رَبِّي، فَقَالَ: «أَمَا إِنَّ رَبَّكَ يُحِبُّ الْحَمْدَ»، وَمَا اسْتَزَادَنِي عَلَى ذَلِكَ»[٤].

واته: ئەسوەدی كوڕی سەریع (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: من شاعیر بووم، جا گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ستایشی پەروەردگارم كردوه (به هۆنراوه)، فەرمووی: بێگومان پەروەردگارت ستایشی پێخۆشه، جا لەوه زیاتری بۆ باس نەكردم و پێی نەفەرمووم.

## دەربارەی: ئەو كەسەی داوای هۆنراوه گوتن دەكات

٧٤٧- «عَنِ الشَّرِيدِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: اسْتَنْشَدَنِي النَّبِيُّ ﷺ شِعْرَ أُمَيَّةَ بْنِ أَبِي الصَّلْتِ، وَأَنْشَدْتُهُ، فَأَخَذَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ: «هِيهِ، هِيهِ» حَتَّى أَنْشَدْتُهُ مِائَةَ قَافِيَةٍ، فَقَالَ: «إِنْ كَادَ لَيُسْلِمُ»»[٥].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٤٤٨) أيضاً.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٠٥٧): (الترمذي: ٤١- كتاب الأدب، ٧٠- ماجاء في إنشاد الشعر).

(٣) پێشتر مانا كراوه.

(٤) صحيح.

(٥) حسن.

واتە: شەرید (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ داوای لێکردم هۆنراوەی ئومەیەی کوڕی ئەبو صەڵتی بۆ بڵێم، منیش بۆم گوت، پێغەمبەریش ﷺ هەر دەیفەرموو: ئێی، ئێی، (واتە: زیاتر بڵێ)، هەتا سەد بەند شیعرم بۆی گوت، جا فەرمووی: خەریك بوو ئومەیە مسوڵمان ببێ (واتە: هۆنراوەکانی ئەوەندە لە ئیسلامەوە نزیك بوون).

## دەربارەی: ئەو کەسەی شیعر زۆری و زاڵبوونی شیعری پێ خراپ بووە

٧٤٨- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لِأَنْ يَمْتَلِئَ جَوْفُ أَحَدِكُمْ قَيْحاً خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمْتَلِئَ شِعْراً»»[1].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان ناخی پڕ بێ لە کێم و زووخاو، چاکترە بۆی لەوەی ناخی پڕ بێ لە هۆنراوە (واتە: زۆر خۆ خەریك کردن بە هۆنراوە کارێکی باش نیە).

## دەربارەی: فەرمایشتی خوای بەرز: ﴿وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ ﴿٢٢٤﴾﴾[2]

٧٤٩- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: ﴿وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ ﴿٢٢٤﴾﴾الشعراء، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ﴾الشعراء، فَنَسَخَ مِنْ ذَلِكَ وَاسْتَثْنَى فَقَالَ: ﴿إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا﴾الشعراء، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿يَنقَلِبُونَ ﴿٢٢٧﴾﴾الشعراء»[3].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ﴿وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلْغَاوُۥنَ ﴿٢٢٤﴾﴾، (واتە: «پێغەمبەر ﷺ شاعیر نیە»، شاعیرەکان گومڕاکان شوێنیان دەکەون) هەتا دەگاتە ئایەتی: ﴿وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ﴾الشعراء، واتە: (وە بە ڕاستی ئەوانە شتێك دەڵێن کە خۆیان نایکەن) لەمەی سڕیوەتەوەو جیاکردۆتەوەو فەرموویەتی: ﴿إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا﴾، (واتە: جگە لەوانەیان «واتە: جگە لەو شاعیرانەی» بڕوایان هێناوە) هەتا فەرمایشتی: ﴿يَنقَلِبُونَ ﴿٢٢٧﴾﴾، (واتە: کە چۆن گەڕانەوەیەك دەگەڕێنەوە (بۆ لای خوا دوای مردن).

---

(١) صحيح: «تخريج المشكاة» (٤٨٠٥/ التحقيق الثاني).

(٢) الشعراء.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣٣٦): (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٩٢- باب: ما يكره أن يكون الغالب على الإنسان الشعر).

٧٥٠- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّ رَجُلاً «أَوْ أَعْرَابِيّاً» أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَتَكَلَّمَ بِكَلَامٍ بَيِّنٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ سِحْراً، وَإِنَّ مِنَ الشِّعْرِ حِكْمَةً»»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك «یان دەشتەكییەك» هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺو قسەی كرد، بە قسەو وشەی ڕەوانبێژی (زۆر ڕوون بوون)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بێگومان لە ڕەوانبێژی جادوو هەیە (چونكە كاریگەرە لەسەر بەرانبەرەكە)، وە لە هۆنراوەشدا حیكمەت و قسەلەجێیی هەیە.

## دەربارەی: ئەوەی باش نیە (بگوترێ) لە هۆنراوەدا

٧٥١- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أَعْظَمَ النَّاسِ جُرْماً إِنْسَانٌ شَاعِرٌ يَهْجُو الْقَبِيلَةَ مِنْ أَسْرِهَا، وَرَجُلٌ انْتَفَى مِنْ أَبِيهِ»»[٢].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە ڕاستی گەورەترین تاوان ئەوەیە مرۆڤێكی شاعیر جوێن بە هۆزێك بدات بە گشتی، وە پیاوێكیشە خۆی بە كوڕی باوكی نەزانێ (بۆ نموونە بڵێ: من كوڕی ئەو باوكە نیم).

## دەربارەی: زۆر قسە كردن

٧٥٢- «عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، يَقُولُ: قَدِمَ رَجُلَانِ مِنَ الْمَشْرِقِ خَطِيبَانِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَامَا فَتَكَلَّمَا ثُمَّ قَعَدَا، وَقَامَ ثَابِتُ بْنُ قَيْسٍ، خَطِيبُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَتَكَلَّمَ، فَعَجِبَ النَّاسُ مِنْ كَلَامِهِمَا، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ فَقَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ، قُولُوا قَوْلَكُمْ، فَإِنَّمَا تَشْقِيقُ الْكَلَامِ مِنَ الشَّيْطَانِ»، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ سِحْراً»»[٣].

واتە: زەیدی كوڕی ئەسلەم دەڵێ: بیستم ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەیگوت: دوو پیاوی وتاردەر لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتن لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا هەڵسان قسەیان كردو پاشان دانیشتن، جا سابتی كوڕی قەیس وتاربێژی پێغەمبەر ﷺ هەڵساو قسەی كرد، خەڵكەكە سەرسام بوون بە قسەكانیان، جا پێغەمبەر ﷺ هەڵساو وتاریداو، فەرمووی: ئەی خەڵكینە! قسەی خۆتان

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٧٣١): (أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٨٧- باب: ماجاء في الشعر، ح ٥٠١١ . إبن ماجه ٣٣- كتاب الأدب، ٤١- باب: في الشعر، ح ٣٧٥٦).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٧٦٣).

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٧٣١): (البخاري: ٦٧- كتاب النكاح، ٤٧- باب: الخطبة).

بکەن، بەڕاستی زەقکردنەوەو ڕازاندنەوەی قسان لە شەیتانەوەیە، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڕاستی هەندێك لە ڕەوانبێژی جۆرێك لە جادووی تێدایە (واتە: وەك جادوو کاریگەری هەیە).

٧٥٣- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: خَطَبَ رَجُلٌ عِنْدَ عُمَرَ فَأَكْثَرَ الْكَلَامَ، فَقَالَ عُمَرُ: إِنَّ كَثْرَةَ الْكَلَامِ فِي الْخُطَبِ مِنْ شَقَاشِقِ الشَّيْطَانِ»[1].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێك وتاریدا لە لای عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) زۆر قسەی کرد، جا عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: بەڕاستی زۆر قسەکردن لە وتاردا لە دەمڕاستان و نوێنەرانی شەیتانەوەیە.

٧٥٤- «عَنْ سُهَيْلِ بْنِ ذِرَاعٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا يَزِيدَ أَوْ مَعْنَ بْنَ يَزِيدَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «اجْتَمِعُوا فِي مَسَاجِدِكُمْ، وَكُلَّمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فَلْيُؤْذِنُونِي، فَأَتَانَا أَوَّلَ مَنْ أَتَى، فَجَلَسَ، فَتَكَلَّمَ مُتَكَلِّمٌ مِنَّا»، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ الَّذِي لَيْسَ لِلْحَمْدِ دُونَهُ مَقْصَدٌ، وَلَا وَرَاءَهُ مَنْفَذٌ. فَغَضِبَ فَقَامَ، فَتَلَاوَمْنَا بَيْنَنَا، فَقُلْنَا: أَتَانَا أَوَّلَ مَنْ أَتَى، فَذَهَبَ إِلَى مَسْجِدٍ آخَرَ فَجَلَسَ فِيهِ، فَأَتَيْنَاهُ فَكَلَّمْنَاهُ، فَجَاءَ مَعَنَا فَقَعَدَ فِي مَجْلِسِهِ أَوْ قَرِيباً مِنْ مَجْلِسِهِ، ثُمَّ قَالَ: الْحَمْدُ لِلهِ الَّذِي مَا شَاءَ جَعَلَ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَمَا شَاءَ جَعَلَ خَلْفَهُ، وَإِنَّ مِنَ الْبَيَانِ سِحْراً، ثُمَّ أَمَرَنَا وَعَلَّمَنَا»[2].

واتە: سوهەیلی کوڕی زیراع، گوتوویەتی: گوێم لە ئەبو یەزید یان مەعنی کوڕی یەزید بوو (دەیگوت): پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە مزگەوتەکانتاندا کۆببنەوە، وە هەر کاتێك خەڵکێك کۆبوویەوە با ئاگادارم بکەنەوە، جا یەکەم کەس هات بۆ لای ئێمەو دانیشت، وە یەکێك لە ئێمە دەستی کرد بە قسەکردن، پاشان گوتی: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە مەبەستی جگە لەو بۆ ستایش کردن نیە، وە هیچ دەرچەیەك لە دوای ئەوەوە نیە (واتە: بە هەموو شێوازێك ستاییش هەر هی ئەوەو بۆ ئەوە)، جا پێغەمبەر ﷺ تووڕە بوو و هەڵسا، ئێمەش لە نێوان خۆماندا سەرزەنشتی یەکترمان کردو، گوتمان: یەکەم کەس هات بۆ لای ئێمە، پاشان چوو بۆ مزگەوتێکی دیکەو تێیدا دانیشت، ئێمەیش هاتین بۆ لای و قسەمان لەگەڵیدا کرد، ئنجا لەگەڵمان هاتوو لە جێگاکەی خۆی دانیشت یان نزیك لە جێگاکەی خۆی، پاشان فەرمووی: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی ئەوەی بیەوێ دەیخاتە پێش خۆی، وە ئەوەیشی بیەوێ دەیخاتە پشتەوەی، بە ڕاستی جۆرێ لە قسەکردن کە ڕەوان بێژیەکی ئەوتۆی تێدایە جادووە، پاشان فەرمانی پێکردین و فێری کردین.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) حسن الإسناد: (ليس في شيء من الكتب الستة، (وانظر «المسند» للإمام أحمد (٣: ٤٧٠) الطبعة الأولى).

## دەربارەی: خۆزگەخواستن

٧٥٥- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: أَرِقَ النَّبِيُّ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ فَقَالَ: لَيْتَ رَجُلاً صَالِحَاً مِنْ أَصْحَابِي يَجِيئُنِي فَيَحْرُسَنِي اللَّيْلَةَ، إِذْ سَمِعْنَا صَوْتَ السِّلَاحِ، فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ قَالَ: سَعْدٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ، جِئْتُ أَحْرُسُكَ، فَنَامَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى سَمِعْنَا غَطِيطَهُ»[1].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ شەوێکیان نەخەوت، فەرمووی: خۆزگە پیاوێکی چاك لە هاوەڵەکانم بهاتایە ئەمشەو پاسەوانیی بکردبوومایە، لە ناکاو گوێمان لە دەنگی چەك بوو (دەنگی شمشێر هات)، فەرمووی: ئەوە کێیە؟ گوتی: سەعدم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووم پاسەوانیت بکەم، ئنجا پێغەمبەر ﷺ خەوت تاوەکو گوێمان لە پرخەی بوو.**

## دەربارەی: بەپیاو و بە شت و بە ئەسپ دەگوترێ: (بَحْر)

٧٥٦- «عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: كَانَ فَزَعٌ بِالْمَدِينَةِ، فَاسْتَعَارَ النَّبِيُّ ﷺ فَرَساً لِأَبِي طَلْحَةَ، يُقَالُ لَهُ: الْمَنْدُوبُ، فَرَكِبَهُ، فَلَمَّا رَجَعَ قَالَ: «مَا رَأَيْنَا مِنْ شَيْءٍ، وَإِنْ وَجَدْنَاهُ لَبَحْراً»»[2].

**واتە: قەتادە دەڵێ: بیستم ئەنەسی کوڕی مالك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەیگوت: لە ناو مەدینەدا ترسێك ڕویدا (چونکە دەنگێکیان گوێ لێبوو)، جا پێغەمبەر ﷺ ئەسپەکەی ئەبو تەڵحەی بە خواستن برد، کە پێی دەگوترا: (الْمَنْدُوبُ)، وە سواری بوو، جا کاتێ گەڕایەوە فەرمووی: هیچ شتێکمان نەبینی، ئەوەی کە بینیمان ئەسپێك بوو.**

## دەربارەی: لێدان لەسەر هەڵە کردن لە عەرەبیدا

٧٥٧- «عَنْ نَافِعٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) يَضْرِبُ وَلَدَهُ عَلَى اللَّحْنِ»[3].

**واتە: نافیع گوتوویەتی: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) لە کوڕەکەی دەدا لەسەر هەڵە کردن لە زمانی عەرەبیدا (تاوەکو خۆی فێر بکات و زمانی قورئان شارەزا بێ).**

---

(١) صحيح: (البخاري: ٩٤- كتاب التمني، ٤- باب: قوله ﷺ: ليت كذا وكذا . مسلم: ٤٤- فضائل الصحابة، ح ٣٩، ٤٠).

(٢) صحيح: «الإرواء» (٥/٣٤٣/ ١٥١٢): (البخاري: ٥١- كتاب الهبة، ٣٣- باب: من استعار من الناس الفرس . مسلم: ٤٣- كتاب الفضائل، ح ٤٨).

(٣) صحيح الإسناد.

## دەربارەی: كەسێك دەڵێ: ئەوە هیچ نیە، مەبەستی پێی ئەوەیە: كە هەق نیە

٧٥٨- «عَنِ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) يَقُولُ: قَالَتْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) زَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ: سَأَلَ نَاسٌ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الْكُهَّانِ، فَقَالَ لَهُمْ: لَيْسُوا بِشَيْءٍ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَإِنَّهُمْ يُحَدِّثُونَ بِالشَّيْءِ يَكُونُ حَقًّا؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «تِلْكَ الْكَلِمَةُ مِنَ الْحَقِّ يَخْطَفُهَا الشَّيْطَانُ، فَيُقَرْقِرُهُ[1]، بِأُذُنَيْ وَلِيِّهِ كَقَرْقَرَةِ الدَّجَاجَةِ، فَيَخْلِطُونَ فِيهَا بِأَكْثَرَ مِنْ مِائَةِ كِذْبَةٍ»»[2].

واتە: عورووەی كوڕی زوبەیر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەیگوت: خەڵكانێك پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ كرد دەربارەی كاهینەكان، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموون: ئەوان هیچ نین، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوان هەواڵ لەبارەی شتێكەوە دەدەن (جاری وایە) ڕاست دەردەچێ، (ئەوە چۆنە)؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەندە قسەی كە ڕاستە ئەوە شەیتان دەیدزێ و دەیدات بە گوێی دۆستەكانیدا وەك قرەقرەی مریشك، ئەوانیش سەد درۆی لەگەڵ تێكەڵ دەكەن.

(الكاهن): بریتیە لەو كەسەی شت وەردەگرێ لەو شەیتانانەی كە گوێ هەڵدەخەن، ئەوانە پێش هاتنی پێغەمبەر ﷺ زۆر بوون، بەڵام دوای هاتنی پێغەمبەر ﷺ كەم بوونەوە، چونكە خوا ئاسمانەكانی تەنیووە بە ئەستێرە ئاگرینەكان.

## دەربارەی: قسەی دوو سەر (یان زیاتر)

٧٥٩- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي مَسِيرٍ لَهُ، فَحَدَا الْحَادِي، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ارْفُقْ يَا أَنْجَشَةُ «وَيْحَكَ» بِالْقَوَارِيرِ»»[3].

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەرچوونێكدا بوو، وشترەوانەكەش وشترەكانی خستبووە پێشی خۆی و گۆرانی بۆ دەگوتن بۆ ئەوەی هانیان بدات لەسەر ڕۆیشتن (زۆر خێرای كردبوون)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هاور بۆ تۆ ئەی ئەنجەشە! لەسەرخۆو هێواشبە لەگەڵ شوشەكان (واتە: لەگەڵ ئەو ئافرەتانەی سواری پشتی وشترەكان بوون)!

---

(١) أي: يرددها.

(٢) صحيح: (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١١٢- باب: قول الرجل للشيء ليس بشيء مسلم: ٣٩- كتاب السلام، ح ١٣٢، ١٢٣).

(٣) صحيح: (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١١٦- باب: في المعاريض مندوحة عن الكذب. مسلم: ٤٣- كتاب الفضائل، ح٧٠، ٧١).

٧٦٠- «عَنْ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) «فِيمَا أَرَى شَكَّ أَبِي»، أَنَّهُ قَالَ: حَسْبُ امْرِئٍ مِنَ الْكَذِبِ أَنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا سَمِعَ. قَالَ: وَفِيمَا أَرَى قَالَ: قَالَ عُمَرُ: أَمَا فِي الْمَعَارِيضِ مَا يَكْفِي الْمُسْلِمَ مِنَ الْكَذِبِ»[1].

واتە: ئیبنو عومەر لە عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: مرۆڤ ئەوەندە درۆیەی بەسسە کە هەرچی گوێبیستی دەبێ بیگێڕێتەوەو باسی بکات، (جا ڕاویەکەی ئیبنو عومەر) دەڵێ: هەروەها وابزانم ئیبنو عومەر گوتی: عومەر گوتوویەتی: بەڵام دەربارەی (مَعَارِيضِ) «کە بریتیە لە بەکارهێنانی قسەیەکی دوو لایەن، کەچی تۆ مەبەستت لایەنە دوورەکە بێ» ئەوە مسوڵمان لەکۆڵ درۆ دەکاتەوە (واتە: بە درۆ حیساب نیە).

٧٦١- «عَنْ مُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الشِّخِّيرِ قَالَ: صَحِبْتُ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ إِلَى الْبَصْرَةِ، فَمَا أَتَى عَلَيْنَا يَوْمٌ إِلَّا أَنْشَدْنَا فِيهِ الشِّعْرَ، وَقَالَ: إِنَّ فِي مَعَارِيضِ الْكَلَامِ لَمَنْدُوحَةً عَنِ الْكَذِبِ»[2].

واتە: موتەڕڕیفی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی شیخخیر دەڵێ: هاوەڵیەتی عیمرانی کوڕی حوصەینم کرد تاوەکو بەصرە، جا هیچ ڕۆژێك نەهات بەسەرماندا مەگەر شیعرێکی تیایدا بۆ دەگوتین، وە گوتی: (مَعَارِيضِ) لە قساندا (واتە: ئەو قسانەی کە دوو مانا، یاخود زیاتر لە دوو مانایان هەیەو، مانایەکیان نزیکەو ئەوەی دیکە دوورە، وە تۆ مانا دوورەکە بە مەبەست دەگری) ئەوە دوورخەرەوەیە لە درۆ.

(بۆ وێنە: بە کەسێك دەڵێی: بیستم ئەو کەسەی ڕقت لێیەتی دوعای خێری بۆ دەکردی، مەبەستی پێی ئەوەیە کاتێ دوعای بۆ مسوڵمانان دەکرد، بێگومان ئەویش دەگرێتەوە، بەڵام دوعاشی بۆ نەکردوە).

## دەربارەی: ئاشکراکردنی نهێنی

٧٦٢- «عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: عَجِبْتُ مِنَ الرَّجُلِ يَفِرُّ مِنَ الْقَدَرِ وَهُوَ مُوَاقِعُهُ، وَيَرَى الْقَذَاةَ فِي عَيْنِ أَخِيهِ وَيَدَعُ الْجِذْعَ فِي عَيْنِهِ، وَيُخْرِجُ الضَّغْنَ مِنْ نَفْسِ أَخِيهِ وَيَدَعُ الضَّغْنَ فِي نَفْسِهِ، وَمَا وَضَعْتُ سِرِّي عِنْدَ أَحَدٍ فَلُمْتُهُ عَلَى إِفْشَائِهِ، وَكَيْفَ أَلُومُهُ وَقَدْ ضِقْتُ بِهِ ذَرْعاً؟»[3].

واتە: عەمری کوڕی عاص (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: سەرم سووڕماوە لە پیاوێك لە قەزاو قەدەر ڕادەکات، لە کاتێکدا لە نێویەتی، وە پووش دەبینێ لە چاوی براکەیدا، بەڵام قەدی دارخورما

---

(١) صحيح موقوفاً.

(٢) صحيح موقوفاً.

(٣) صحيح موقوفاً.

(کاریته) له چاوی خۆیدا نابینێ، ڕق و کینەو خەشم دەبینێ له ناخی براکەیدا، بەڵام له ناخی خۆیدا ڕق و کینەو خەشم نابینێ، وە نهێنی خۆم لای هیچ کەسێك دانەناوە پاشان لۆمەم کردبێ لەسەر بڵاوکردنەوەی، چۆن لۆمەی بکەم له کاتێکدا خۆم بۆم هەڵنەگیرا (واته: کاتێ خۆم ئەوەندە خۆڕاگریەم نەبێ نهێنیەکانی خۆم بپارێزم و نەیدرکێنم، چۆن چاوەڕێ بکەم خەڵکی بۆم هەڵبگرن و نەیدرکێنن؟! کەواته: نهێنی خۆت لای کەس دامەنێ).

## دەربارەی: لەسەرخۆیی و سەنگینی له کاروبارەکاندا

٧٦٣- «عَنْ مُحَمَّدِ ابْنِ الْحَنَفِيَّةِ قَالَ: لَيْسَ بِحَكِيمٍ مَنْ لَا يُعَاشِرُ بِالْمَعْرُوفِ مَنْ لَا يَجِدُ مِنْ مُعَاشَرَتِهِ بُدّاً، حَتَّى يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُ فَرَجاً أَوْ مَخْرَجاً»[١].

واته: موحەممەدی کوڕی حەنەفیه گوتوویەتی: ئەو کەسە داناو کاربەجێ نیه کە بە چاکە مامەڵە لەگەڵ ئەو کەسەدا ناکات کە هیچ پشکێکی دەست ناکەوێ لە مامەڵەکردن لەگەڵیدا، هەتا خوا دەروویەکی (خێری) لێ دەکاتەوە (هاوەڵی بە سوودی پێ ئاشنا دەکات).

## دەربارەی: ئەو کەسەی کۆڵانێك یان ڕێگایەك پیشانی کەسێك دەدات

٧٦٤- «عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ مَنَحَ مَنِيحَةً أَوْ هَدَّى زُقَاقاً «أَوْ قَالَ: طَرِيقاً» كَانَ لَهُ عَدْلُ عِتَاقِ نَسَمَةٍ»»[٢].

واته: بەڕائی کوڕی عازب (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ئاژەڵێك، یان بەروبوومێك و بەخشینێك بدات بە کەسێك، یاخود کۆڵان و کوچەیەك «یان ڕێگەیەك» پیشانی کەسێکی نەشارەزا بدات ئەوە بۆ ئەو وەکو (پاداشتی) ئازادکردنی مرۆڤێك وایە.

٧٦٥- «عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: إِفْرَاغُكَ مِنْ دَلْوِكَ فِي دَلْوِ أَخِيكَ صَدَقَةٌ، وَأَمْرُكَ بِالْمَعْرُوفِ وَنَهْيُكَ عَنِ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ، وَتَبَسُّمُكَ فِي وَجْهِ أَخِيكَ صَدَقَةٌ، وَإِمَاطَتُكَ الْحَجَرَ وَالشَّوْكَ وَالْعَظْمَ عَنْ طَرِيقِ النَّاسِ لَكَ صَدَقَةٌ، وَهِدَايَتُكَ الرَّجُلَ فِي أَرْضِ الضَّالَّةِ صَدَقَةٌ»[٣].

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح: تخريج المشكاة (١٩١٧)، التعليق الرغيب (٣٤/٢ و ٢٤١)، الترمذي: (البر والصلة ح ١٩٥٨).

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٧٢): (الترمذي: ٢٥- كتاب البر والصلة، ٣٦- باب: ماجاء في صانع المعروف).

واتە: ئەبو زەڕ (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: دەرهێنانی (ئاو) لە دۆڵكەی خۆت بۆ نێو دۆڵكەی برا (ی مسوڵمانت) چاكەیەكە، وە فەرمان كردنت بە چاكەو ڕێگری كردنت لە خراپە چاكەیەكە، وە زەردەخەنەت بە ڕووی براكەتدا چاكەیەكە، وە لابردنی بەردێك یان دڕكێك یان ئێسكێك (یان هەر شتێك كە ئازاری خەڵكی بدات لایبەری) لەسەر ڕێگای خەڵكی بۆ تۆ چاكەیەكە، وە ڕێنمایی كردنی كەسێك لە شوێنێكی ونبوو چاكەیەكە.

## دەربارەی: ئەو كەسەی ڕێگە لە كوێرێك بشارێتەوەو پێشانی نەدات

٧٦٦- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَعَنَ اللَّهُ مَنْ كَمَّهَ أَعْمَى عَنِ السَّبِيلِ»»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: نەفرینی خوا لەو كەسە بێ كە ڕێگە لە كوێرێك دەشارێتەوە (ڕێنمایی ناكات، یان ڕێی لێ هەڵە دەكات).

## دەربارەی: (باش بوون لەگەڵ كچان و) سزای ستەم و دەستدرێژی

٧٦٧- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تُدْرِكَا، دَخَلْتُ أَنَا وَهُوَ فِي الْجَنَّةِ كَهَاتَيْنِ»، وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ»[٢].

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك دوو كچ بە چاكی بە خێو بكات تا گەورە دەبن، من و ئەو لە بەهەشتدا وەك ئەم دووانەین) جا ئاماژەی بە پەنجەی شایەتمان و پەنجەی نێوەڕاستی كرد.

٧٦٨- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «بَابَانِ يُعَجَّلَانِ فِي الدُّنْيَا: الْبَغْيُ، وَقَطِيعَةُ الرَّحِمِ»»[٣].

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دوو گوناهو تاوان هەن سزاكەیان پەلەی لێدەكرێ لە دونیادا: دەستدرێژی و، پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی.

---

(١) حسن صحيح: (أحكام الجنائز» (٢٠٣)، «التعليق الرغيب» (١٩٨/٣): (ليس في شيء من الكتب الستة).

(٢) صحيح.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٩٧، ١٠٢٦)، (مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح١٤٩).

## دەربارەی: ڕەچەڵەك

٧٦٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الْكَرِيمَ ابْنَ الْكَرِيمِ ابْنِ الْكَرِيمِ ابْنِ الْكَرِيمِ يُوسُفُ بْنُ يَعْقُوبَ بْنِ إِسْحَاقَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ»»(1).

**واتە: ئەبو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بێگومان بەڕێزی کوڕی بەڕێزی کوڕی بەڕێزی کوڕی بەڕێز (بریتیە لە) یوسفی کوڕی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم.**

٧٧٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أَوْلِيَائِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ الْمُتَّقُونَ، وَإِنْ كَانَ نَسَبٌ أَقْرَبَ مِنْ نَسَبٍ، فَلَا يَأْتِينِي النَّاسُ بِالْأَعْمَالِ وَتَأْتُونَ بِالدُّنْيَا تَحْمِلُونَهَا عَلَى رِقَابِكُمْ، فَتَقُولُونَ: يَا مُحَمَّدُ، فَأَقُولُ هَكَذَا وَهَكَذَا: لَا، وَأَعْرَضَ فِي كِلَا عِطْفَيْهِ»»(2).

**واتە: ئەبو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دۆستەکانی من لە ڕۆژی دواییدا پارێزکارانن، ئەگەر چی ڕەچەڵەکێکیش لە ڕەچەڵەکێکی ترەوە نزیکتر بێ (هەر ئەوەیان لە پێشترە کە پارێزکارترینە)، بۆیە با خەڵکی بە کردەوەوە نەیەن بۆ لام و، ئێوەیش بە دونیاوە بێن و لەسەر ملی خۆتان هەڵتان گرتبێ و بڵێن: ئەی موحەممەد (شەفاعەتمان بۆ بکە)، منیش دەڵێم: بەم شێوەو بەو شێوە: نەخێر، جا لە هەردوو جارەکەدا ڕووی وەرچەرخاند (بۆ لای ڕاست و چەپ، واتە: ڕووتان لێ وەردەگێرم و شەفاعەتتان بۆ ناکەم بەو شێوەیە).**

٧٧١- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: لَا أَرَى أَحَداً يَعْمَلُ بِهَذِهِ الْآيَةِ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ ١٣﴾ الحجرات، حتَّى بَلَغَ: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ١٣﴾ الحجرات، فَيَقُولُ الرَّجُلُ لِلرَّجُلِ: أَنَا أَكْرَمُ مِنْكَ، فَلَيْسَ أَحَدٌ أَكْرَمَ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِتَقْوَى اللَّهِ»(3).

**واتە: ئیبنو عەباس (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتوویەتی: کەس نابینم کار بەم ئایەتە بکات: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ ١٣﴾، (واتە: ئەی خەڵکینە! بێگومان ئێمە دروستمان کردوون لە نێرو مێیەك) هەتا گەیشتە: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ١٣﴾، (واتە: بێگومان بەڕێزترینتان لای خوا پارێزکارترینتانە)، جا پیاوێك بە پیاوێکی دیکە دەڵێ: من لە تۆ بەڕێزترم، هیچ کەسێك لە کەسێکی دیکە بەڕێزتر نیە، تەنها بە پارێزکاری نەبێ.**

---

(١) صحيح: (في معناه البخاري: ٦٠- كتاب الأنبياء، ١٩- باب: لقد كان في يوسف وإخوته، مسلم: ٤٣- كتاب الفضائل، ح ١٦٨).

(٢) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٧٦٥). «الظلال» (١/٩٣/٢١٣ و ٢/٤٨٦/١٠١٢) (ليس في شيء من الكتب الستة).

(٣) صحيح الإسناد.

٧٧٢- «عَنْ يَزِيدَ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا): مَا تَعُدُّونَ الْكَرَمَ؟ وَقَدْ بَيَّنَ اللَّهُ الْكَرَمَ، فَأَكْرَمُكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ، مَا تَعُدُّونَ الْحَسَبَ؟ أَفْضَلُكُمْ حَسَباً أَحْسَنُكُمْ خُلُقاً»[1].

واتە: یەزید دەڵێ: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتی: ئێوە چ شتێك بەڕێز دادەنێن؟ لە کاتێکدا بە دڵنیایی خوا ڕێزی ڕوون کردۆتەوە، بەڕێزترینتان لە لای خوا پارێزکارترینتانە، ئێوە چ شتێك بە ڕەچەڵەك دادەنێن؟ چاکترین ڕەچەڵەکتان ڕەوشت بەرزترینتانە.

## دەربارەی: (فەرموودەی) ڕووحەکان سەربازانی مەشق پێکراون

٧٧٣- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «الْأَرْوَاحُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ، فَمَا تَعَارَفَ مِنْهَا ائْتَلَفَ، وَمَا تَنَاكَرَ مِنْهَا اخْتَلَفَ»»[2].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: ڕووحەکان کۆمەڵە سەربازێکی مەشق پێکراون، جا هەر ڕووحێك ئەوی تری ناسیەوە هۆگری دەبێ، وە ئەوەشی نکووڵی لێ بکات جیاواز دەبن.

٧٧٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْأَرْوَاحُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ، فَمَا تَعَارَفَ مِنْهَا ائْتَلَفَ، وَمَا تَنَاكَرَ مِنْهَا اخْتَلَفَ»»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ڕووحەکان کۆمەڵە سەربازێکی مەشق پێکراون، جا هەر ڕووحێك ئەوی تری ناسیەوە هۆگری دەبێ، وە ئەوەشی نکووڵی لێ بکات جیاواز دەبن.

تێبینی: ئەوەی دەربارەی ڕوونکردنەوەی ئەم فەرموودانە گوتراون زۆرن، بە کورتی: مەبەست پێی ئەوەی ئەو دوو ڕووحەی کە خوای تعالی دروستی کردوون سیفەتەکانیان لێك نزیك بێ، هۆگری یەکدی دەبن و یەکتریان خۆشدەوێ، وە ئەگەر لە کاتی دروستکردنیان جیاوازبن، ئەوە لە دونیاش هۆگری یەکتر نابن و پێك ئاشنا نابن و لێك دوور دەکەونەوە.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح: «المشكاة» (٥٠٠٣/التحقيق الثاني)، (البخاري: ٦٠- كتاب الأنبياء، ٢- باب: الأرواح جنود مجندة).

(٣) صحيح: «المشكاة» أيضاً: (مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ١٥٩و ١٦٠).

## دەربارەی: گوتنی: (سُبْحَانَ اللَّه) لە کاتی سەرسوڕماندا

٧٧٥- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «بَيْنَمَا رَاعٍ فِي غَنَمِهِ، عَدَا عَلَيْهِ الذِّئْبُ فَأَخَذَ مِنْهُ شَاةً، فَطَلَبَهُ الرَّاعِي، فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ الذِّئْبُ فَقَالَ: مَنْ لَهَا يَوْمَ السَّبُعِ؟ لَيْسَ لَهَا رَاعٍ غَيْرِي»، فَقَالَ النَّاسُ: سُبْحَانَ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَإِنِّي أُؤْمِنُ بِذَلِكَ، أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ»»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بیستم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: لە کاتێکدا شوانێك لە نێو مەڕەکانیدا بوو، گورگ پەلاماریداو مەڕێکی لێبرد، شوانەکە بە دوایدا ڕۆیشت، گورگەکە ئاوڕی لێ دایەوەو گوتی: کێ (مەڕ) دەپارێزێ لەو ڕۆژەدا لە خۆشیدان نایانپەڕژێتە سەر ئاژەڵەکانیان، کە هیچ شوانێکیان نیە جگە لە من (واتە: هەر دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی من)، خەڵکەکە گوتیان: سبحان اللَّه! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: من و ئەبو بەکرو عومەر بڕوا بەوە دەکەین.

(يَوْمَ السَّبُعِ: جەژنێك بوو لە سەردەمی نەفامیدا، خەڵکی تێیدا کۆدەبوونەوە بۆ ڕابواردن، بەو هۆیەوە مەڕو ماڵاتەکانیان لە بیر دەکردو دڕندە دەیخواردن).

٧٧٦- «عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ فِي جَنَازَةٍ، فَأَخَذَ شَيْئاً فَجَعَلَ يَنْكُتُ بِهِ فِي الْأَرْضِ، فَقَالَ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا قَدْ كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ، وَمَقْعَدُهُ مِنَ الْجَنَّةِ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَلَا نَتَّكِلُ عَلَى كِتَابِنَا، وَنَدَعُ الْعَمَلَ؟ قَالَ: «اعْمَلُوا، فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ»، قَالَ: «أَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَسَيُيَسَّرُ لِعَمَلِ السَّعَادَةِ، وَأَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ فَسَيُيَسَّرُ لِعَمَلِ الشَّقَاوَةِ»، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ۝٥ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ۝٦﴾ الليل»[٢].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ تەرمێکدا بوو، جا شتێکی هەڵگرت و هەر دەیدا لە زەویەکەو فەرمووی: هیچ یەکێك لە ئێوە نیە مەگەر شوێنەکەی بۆ نووسراوە لە ئاگرو لە بەهەشت، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەواتە بۆچی لێی پاڵ نەدەینەوە لەسەر ئەوەی نووسراوەو واز لە کردەوە بێنین؟ فەرمووی: کردەوە بکەن، هەموو کەسێك ئامادەکراوە بۆ ئەو کردەوەی بۆی دروست کراوە، فەرمووی: هەرچی ئەوەیانە کە لە خۆشبەختانە، ئەوە کردەوەی خۆشبەختانی بۆ ئامادە دەکرێ، هەر کەسێکیش لە بەدبەختان بێ،

---

(١) صحيح: «الإرواء» (٢٤٢/٧): (البخاري: ٦٠- كتاب الأنبياء، ٥٤- باب: حدثنا أبو اليمان ك/ ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ١٣).

(٢) صحيح: «البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١٢٠- باب: الرجل ينكت الشيء بيده في الأرض. مسلم: ٤٦- كتاب القدر، ح٦و٧).

کردەوەی بەدبەختانی بۆ ئامادە دەکرێ، پاشان ئەم (ئایەتە)ی خوێندەوە: ﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ ﴾، (واتە: ئنجا ئەو کەسەی ماڵ ببەخشێ و پارێزکار بێ . وە بڕوای هەبێ بەوەی زۆر چاکە) (کە بریتیە لە بەهەشت، ئەوە ئامادەی دەکەین بۆ بەهەشت).

## دەربارەی: بەرد هاوێشتن بە پەنجەی بچوك

٧٧٧- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ الْمُزَنِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الْخَذْفِ، وَقَالَ: «إِنَّهُ لَا يَقْتُلُ الصَّيْدَ، وَلَا يُنْكِي الْعَدُوَّ، وَإِنَّهُ يَفْقَأُ الْعَيْنَ، وَيَكْسِرُ السِّنَّ»»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەلی موزەنی (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لە هاویشتنی بەردی بچووك بە نێوانی پەنجەکان (کە پێی دەگوترێ: هاویشتنی پت، یان پەلاپیتکە)، وە فەرمووی: ئەو کارە نە نێچیر دەکوژێ و، نە دوژمن بەرپەرچ دەداتەوە، بەڵکو چاو کوێر دەکات و، ددان دەشکێنێ.

## دەربارەی: (فەرموودەی) جوێن بە با مەدەن

٧٧٨- «عَنْ ثَابِتِ بْنِ قَيْسٍ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أَخَذَتِ النَّاسَ الرِّيحُ فِي طَرِيقِ مَكَّةَ «وَعُمَرُ حَاجٌّ» فَاشْتَدَّتْ، فَقَالَ عُمَرُ لِمَنْ حَوْلَهُ: «مَا الرِّيحُ؟» فَلَمْ يَرْجِعُوا بِشَيْءٍ، فَاسْتَحْثَثْتُ رَاحِلَتِي فَأَدْرَكْتُهُ، فَقُلْتُ: بَلَغَنِي أَنَّكَ سَأَلْتَ عَنِ الرِّيحِ، وَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الرِّيحُ مِنْ رَوْحِ اللَّهِ، تَأْتِي بِالرَّحْمَةِ، وَتَأْتِي بِالْعَذَابِ، فَلَا تَسُبُّوهَا، وَسَلُوا اللَّهَ خَيْرَهَا، وَعُوذُوا مِنْ شَرِّهَا»»[٢].

واتە: سابتی کوڕی قەیس دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ئەبو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: لە ڕێگای مەککە بایەك تووشی خەڵك بوو «لەو کاتەدا عومەر حەجی دەکرد» جا بایەکە توندی کرد، عومەریش بە دەوروبەرەکەی گوت: ئەو بایە چیە (واتە: خراپە یان چاکە)؟ کەس وەڵامی نەدایەوە، منیش سواریەکەی خۆم هانداو خێرام کردو پێی گەیشتم، گوتم: پێمگەیشت پرسیارت کردوە دەربارەی با، منیش لە پێغەمبەرم ﷺ بیست دەیفەرموو: با لە لایەن خواوەیە، هەم بە ڕەحمەت دێ، هەم وەك سزا دێ، کەواتە: جوێنی پێ مەدەن، (بەڵکو) داوای بەشە چاکەکەی لە خوا بکەن، وە پەناش بگرن لە خراپەکەی.

---

(١) صحيح: «غاية المرام» (٥١): البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١٢٢- باب: النهي عن الخذف. مسلم: ٣٤- كتاب الصيد والذبائح، ح ٥٤).

(٢) حسن صحيح: «المشكاة» ٩ (١٥١٦)، «تخريج الكلم الطيب»، «السلسلة الصحيحة» (٢٧٥٧): (أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب ١٠٤- باب: ما يقول إذا هاجت الريح، ح٥٠٩٧. إبن ماجه: ٣٣- كتاب الأدب، ٢٩- باب: النهي عن سب الريح، ح ٣٧٢٧).

## دەربارەی: قسەی كەسێك كە دەڵێ: بارانمان بۆ باری بە هۆی ئەوەو ئەوەوە؟!

٧٧٩- «عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ قَالَ: صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلَاةَ الصُّبْحِ بِالْحُدَيْبِيَةِ عَلَى أَثَرِ سَمَاءٍ كَانَتْ مِنَ اللَّيْلَةِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ النَّبِيُّ ﷺ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: «هَلْ تَدْرُونَ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ؟»، قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «أَصْبَحَ مِنْ عِبَادِي مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ، فَأَمَّا مَنْ قَالَ: مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللَّهِ وَرَحْمَتِهِ، فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ بِي كَافِرٌ بِالْكَوْكَبِ، وَأَمَّا مَنْ قَالَ: بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا، فَذَلِكَ كَافِرٌ بِي، مُؤْمِنٌ بِالْكَوْكَبِ»»[1].

واتە: زەیدی كوڕی خالیدی جوهەنی (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی لە حودەیبیە بۆ كردین، لە دوای بارانێ كە لە شەودا باریبوو، جا كاتێ لە نوێژەكە بوویەوە ڕووی كردە خەڵكەكەو فەرمووی: ئایا دەزانن پەروەردگارتان چی فەرمووە؟ گوتیان: خواو پێغەمبەرەكەی دەزانن، فەرمووی (پەروەردگار فەرموویەتی): هەندێ لە بەندەكانم بەیانیان كردەوە بە بڕواهێنان بە من، وە (هەندێكیش) بە من بێبڕوا بوون، جا ئەوەی كە گوتی: بارانمان بۆ باری بە فەزڵ و ڕەحمەتی خوا، ئەوە بڕوای بە من هێناوەو، بێبڕوا بووە بە ئەستێرەكان، بەڵام ئەوەی گوتی: بارانمان بۆ باری بە هۆی هەڵاتن، یان ئاوابوونی ئەستێرەكان، ئەوە بێبڕوا بووە بە من و بڕوای هێناوە بە ئەستێرەكان.

## دەربارەی: مرۆڤ چی دەڵێ لە كاتی بینینی هەور؟

٧٨٠- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا رَأَى مَخِيلَةً دَخَلَ وَخَرَجَ، وَأَقْبَلَ وَأَدْبَرَ، وَتَغَيَّرَ وَجْهُهُ، فَإِذَا مَطَرَتِ السَّمَاءُ سُرِّيَ، فَعَرَّفَتْهُ عَائِشَةُ ذَلِكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَمَا أَدْرِي لَعَلَّهُ كَمَا قَالَ اللَّهُ: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ ٱلْآيَةَ﴾الأحقاف»»[2].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ كاتێ پەڵە هەورێكی بینی بووایە دەهاتە ژوورەوەو دەچووە دەرەوەو، دەهات و دەچوو، وە ڕەنگ و ڕووخساری دەگۆڕا، كاتێ كە باران دەباری دڵخۆش دەبوو، جا عائیشە ئەوەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ بینیبووی بۆی باس كرد (تا هۆكارەكەی بزانێ)، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: نازانم لەوانەیە (سزای خوا بێ) هەروەك ئەوەی

---

(١) صحيح: «الإرواء» (٦٨١): (البخاري: ١٠- كتاب الأذان، ١٥٦- باب: يستقبل الإمام الناس إذا سلم. مسلم: ١- كتاب الإيمان ح ١٢٥).

(٢) صحيح: (البخاري: ٥٩- كتاب بدء الخلق، ٥- باب: ماجاء في قوله: وهو الذي أرسل الريح بشراً. مسلم: ٩- كتاب الاستسقاء، ح ١٤).

خوا فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ ٱلْءَمْ﴾، (واتە: جا كاتێ پەڵە هەوریان بینی بەرەو شیوەكانیان دێ دڵخۆش بوون، وایانزانی باران دەبارێ، بەڵام سزا بوو، نەك باران).

۷۸۱- «عَنْ عَبْدِ اللَّه (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الطِّيَرَةُ شِرْكٌ، وَمَا مِنَّا، وَلَكِنَّ اللَّهَ يُذْهِبُهُ بِالتَّوَكُّلِ»»[۱].

واتە: عەبدوڵلا (خوا لێی ڕازی) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بیرۆكەی شووم هاوبەشدانانە (واتە: كەسێك پێی وابێ ئەگەر ناوی لەگەڵ فڵان بورجی ئەستێرە، یان فڵان ڕۆژ تێك بكاتەوە یان كونەپەپوو، یان قەڵەڕەش بێتە سەر خانووەكەیان ...هتد، ئەوە شومەو كارەساتێكی بەسەر دێ)، وە كەس لە ئێمە نیە شتێكی وای بە دڵدا نەیەت، بەڵام خوا بە پشت بەستن لایدەبات.

## دەربارەی: شووم (الطيرة)

۷۸۲- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لَا طِيَرَةَ، وَخَيْرُهَا الْفَأْلُ»، قَالُوا: وَمَا الْفَأْلُ؟ قَالَ: «كَلِمَةٌ صَالِحَةٌ يَسْمَعُهَا أَحَدُكُمْ»»[۲].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: بیستم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: شووم بوونی نیە، وە چاكترینیان (الْفَأْل) گەشبینیە، گوتیان (الْفَأْل) گەشبینی چیە؟ فەرمووی: قسەیەكی چاكە یەكێكتان دەیبیستێ، (واتە: لە جیاتی ئەوەی بە دوای قسەی شووم بكەون، دوای قسەی گەشبین و چاك بكەون).

۷۸۳- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «عُرِضَتْ عَلَيَّ الْأُمَمُ بِالْمَوْسِمِ أَيَّامَ الْحَجِّ، فَأَعْجَبَنِي كَثْرَةُ أُمَّتِي، قَدْ مَلَأُوا السَّهْلَ وَالْجَبَلَ، قَالُوا: يَا مُحَمَّدُ، أَرَضِيتَ؟ قَالَ: نَعَمْ، أَيْ رَبِّ، قَالَ: فَإِنَّ مَعَ هَؤُلَاءِ سَبْعِينَ أَلْفاً يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ بِغَيْرِ حِسَابٍ، وَهُمُ الَّذِينَ لَا يَسْتَرْقُونَ وَلَا يَكْتَوُونَ، وَلَا يَتَطَيَّرُونَ، وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ»، قَالَ عُكَّاشَةُ: فَادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، قَالَ: «اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ مِنْهُمْ»، فَقَالَ رَجُلٌ آخَرُ: ادْعُ اللَّهَ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ، قَالَ: «سَبَقَكَ بِهَا عُكَّاشَةُ»»[۳].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئۆممەتەكانی پێشوو پێشاندران لە كاتی حەجدا، جا سەرسام بووم بە زۆری ئۆممەتەكەم

---

(۱) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (أبو داود: ۲۷- كتاب الطب، ۲٤- باب: الطيرة، ح ۳۹۱۰. الترمذي: ۱۹- كتاب السير، ٤۷- باب: ماجاء في الطيرة).

(۲) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (۷۸٦): (البخاري: ۷٦- كتاب الطب، ۳۳- باب الأل. مسلم: ۳۹- كتاب السلام، ح ۱۱۳و ۱۱٤).

(۳) حسن صحيح: «العليق على الإحسنان» (٦۲۸/۷): [ليس في شيء من الكتب الستة]، الحديث رواه المصنف في (الطب) وفي (الرقائق) ورواه مسلم في (الإيمان).

کە ڕاستان و کێوەکانیان پڕ کردبوو، گوتیان: ئەی موحەممەد ئایا ڕازیت؟ گوتم: بەڵێ، ئەی پەروەردگارم، (پەروەردگار) فەرمووی: بەڕاستی لەگەڵ ئەوانەدا حەفتا هەزار خەڵك دەچنە بەهەشتەوە بەبێ لێپرسینەوە (بێ سزا)، ئا ئەوانە ئەو کەسانەن کە داوای نوشتە ناکەن، وە ئەوانەن کە داغکردن بۆ برین بەکارناهێنن (بۆ نەخۆشی)، هەروەها ئەوانەن کە یانسیب بۆ شووم ناکەن و پشت بە خوا دەبەستن، جا عوککاشە گوتی: (ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ) داوا لە خوا بکە من بە یەکێك لەوان بگێڕێ، فەرمووی: خوایە بیگێڕە بە یەکێك لەوانە، پیاوێکی دیکەش گوتی: داوا لە خوا بکە منیش بگێڕێ بە یەکێك لەوان، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: عوککاشە لەوەدا پێشت کەوت.

٧٨٤- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «لَا عَدْوَى، وَلَا طِيَرَةَ، وَيُعْجِبُنِي الْفَأْلُ الصَّالِحُ، الْكَلِمَةُ الْحَسَنَةُ»»[١].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: گواستنەوەی نەخۆشی بوونی نیە (واتە: کاتێ کەسێك نەخۆشیەك لە کەسێکی ترەوە دەگرێتەوە لەبەر خودی نەخۆشیەکە کەسانی تر نایگرنەوە، بەڵکو خوا کەسانی تر تووش دەکات چۆن کەسانی سەرەتا تووش دەکات، واتە: ئەوەی دووەمیش بە فەرمانی خوا دەبێ نەك بە نەخۆشیەکە، چونکە جاری وا هەیە کەسێك بە تەواوی تێکەڵی کەسێك دەبێ کە نەخۆشی گوێزەرەوەی هەیە، کەچی تووش نابێ، چونکە خوا نەیویستووە ئەو تووش ببێ)، وە یانسیبی شووم (کە بریتیە لەوەی مرۆڤ شووم ببەستێتەوە بە فڕینی باڵندەیەك بۆ لای چەپ، یان قەڵەڕەش نیشتنەوە لەسەر خانووەکەی)، وە (الْفَأْلُ) گەشبینیم پێ خۆشە، کە بریتیە لە قسەی چاك.

٧٨٥- «عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: حَدَّثَنِي حَيَّةُ التَّمِيمِيُّ، أَنَّ أَبَاهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لاَ شَيْءَ فِي الْهَامِ، وَأَصْدَقُ الطِّيَرَةِ الْفَأْلُ، وَالْعَيْنُ حَقٌّ»»[٢].

واتە: یەحیای کوڕی ئەبو کەسیر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: حەییەی تەمیمی بۆی گێڕامەوە کە باوکی هەواڵی پێداوە، ئەو بیستوویەتی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ هامێك بوونی نیە (هام: ئەوەیە کاتی خۆی خەڵکی سەردەمی نەزانی پێیان وابوو باڵندەیەك لەسەر سەری کوژراوەکان دێتە دەرەوەو هەڵدەفڕێ و دەڵێ: تینووم بشکێنن، تینووم بشکێنن، تینووم بشکێنن، تا تۆڵەی بۆ دەکرێتەوە)، وە ڕاسترین هەڵبژاردن گەشبینیە، چاو پیسیش ڕاستە (و کاریگەری هەیە).

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٧٨٦): (البخاري: ٧٦- كتاب الطب، ٤٤- باب: الفأل. مسلم: ٣٩- كتاب السلام، ح ١١٣و ١١٤).

(٢) صحيح لغيره: «السلسلة الصحيحة» (٧٨- ٧٨٢-٧٨٥و ٧٨٩و ٢٩٤٩): (الراوي مجهول).

## دەربارەی: تەبەڕڕوك بە ناوی چاکەوە

٧٨٦- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ عَامَ الْحُدَيْبِيَةِ، حِينَ ذَكَرَ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ أَنَّ سُهَيْلاً قَدْ أَرْسَلَهُ إِلَيْهِ قَوْمُهُ، فَصَالَحُوهُ عَلَى أَنْ يَرْجِعَ عَنْهُمْ هَذَا الْعَامَ، وَيُخَلُّوهَا لَهُمْ قَابِلَ ثَلَاثَةٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ حِينَ أَتَى فَقِيلَ: أَتَى سُهَيْلٌ: «سَهَّلَ اللَّهُ أَمْرَكُمْ»، وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ السَّائِبِ أَدْرَكَ النَّبِيَّ ﷺ»[(١)].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سائیب (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ لە ساڵی حودەیبیە کاتێ عوسمانی کوڕی عەففان باسیکرد کە سوهەیل قەومەکەی ناردیان (بۆ ئەوەی ئاشتەوایی لەگەڵدا بکەن)، جا ئاشتەواییان لەگەڵدا کرد لەسەر ئەوەی ئەم ساڵ بگەڕێنەوەو بۆ ساڵی داهاتوو سێ ڕۆژان کەعبەیان بۆ چۆڵ بکەن، جا کاتێ سوهەیل هات گوترا: سوهەیل هات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خوا کاروبارتان بۆ ئاسان بکات (چونکە سوهەیل بە واتای ئاسانی دێ).

وە عەبدوڵڵای کوڕی سائیب (خوا لێی ڕازی بێ) گەیشتوە بە پێغەمبەر (واتە: هاوەڵی پێغەمبەری خوایە ﷺ، وە گێڕەرەوەی ئەو فەرمودەیەیە).

## دەربارەی: (فەرموودەی) شووم لە ئەسپدایە

٧٨٧- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الشُّؤْمُ فِي الدَّارِ، وَالْمَرْأَةِ، وَالْفَرَسِ»»[(٢)].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شووم (واتە: تاقیکردنەوەو ڕووداوی ناخۆش) لە خانوو و، ژن و، ئەسپ دایە (کارەسات تووشی یەکێك لەو شتانەی مرۆڤ دەبێ).

٧٨٨- «عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنْ كَانَ الشُّؤْمُ فِي شَيْءٍ، فَفِي الْمَرْأَةِ، وَالْفَرَسِ، وَالْمَسْكَنِ»»[(٣)].

---

(١) حسن لغيره: «تخريج الكلم الطيب» (التعليق: ١٩٢)، «مختصر البخاري» (٢/٢٣٤/١٨): [ليس في شيء من اكتب الستة].

(٢) شاذ: والمحفوظ عن ابن عمر وغيره: إن كان الشؤم في شيء ففي الدار» «السلسلة الصحيحة» «٧٩٩و ٩٩٣ ١٨٩٧»، وهو الآتي من حديث سهل بن سعد باللفظ المحفوظ رقم «٩١٧»: [البخاري: ٥٦- الجهاد، ٤٧- باب ما يذكر في شؤم الفرس. مسلم: ٣٩- السلام ح ١١٥، ١١٦]

(٣) صحيح: (البخاري: ٦٧- كتاب النكاح، ١٧- باب: ما يتقى من شؤم المرأة. مسلم: ٣٩- كتاب السلام، ح ١١٩).

واتە: سەهلی کوڕی سەعد (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر شووم لە شتێکدا هەبێ ئەوە لە ژن و ئەسپ و خانوودا هەیە (واتە: کارەسات و تاقیکردنەوە کە تووشی مرۆڤ دەبێ لە یەکێك لەو شتانەی مرۆڤ دەبێ).

٧٨٩- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا كُنَّا فِي دَارٍ كَثُرَ فِيهَا عَدَدُنَا، وَكَثُرَ فِيهَا أَمْوَالُنَا، فَتَحَوَّلْنَا إِلَى دَارٍ أُخْرَى، فَقَلَّ فِيهَا عَدَدُنَا، وَقَلَّتْ فِيهَا أَمْوَالُنَا؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «رُدُّوهَا، أَوْ دَعُوهَا، وَهِيَ ذَمِيمَةٌ»»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە لە خانووێکدا بووین ژمارەمان زۆر بوو، ماڵ و سامانیشمان زۆر بوو، گواستمانەوە بۆ خانووێکی دیکە، ژمارەمان تێیدا کەمی کردو، ماڵ و سامانمانیشمان تێیدا کەمی کرد؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ئەم خانووەی تێستاتان) بگەڕێننەوە، یان وازی لێبێنن، چونکە ئەم خانووە خراپە.

## دەربارەی: پژمـــین

٧٩٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعُطَاسَ، وَيَكْرَهُ التَّثَاؤُبَ، فَإِذَا عَطَسَ فَحَمِدَ اللَّهَ فَحَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ سَمِعَهُ أَنْ يُشَمِّتَهُ، وَأَمَّا التَّثَاؤُبُ فَإِنَّمَا هُوَ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَلْيَرُدَّهُ مَا اسْتَطَاعَ، فَإِذَا قَالَ: هَاهْ، ضَحِكَ مِنْهُ الشَّيْطَانُ»»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی خوا پژمینی خۆشدەوێ و، ڕقی لە باوێشکە[٣]، جا ئەگەر یەکێك لە ئێوە پژمی و ستایشی خوای کرد، لەسەر هەر کەسێکی مسوڵمان کە لەوێیەو گوێی لێیە، پێویستە پێی بڵێ: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ) خوا بەزەیی پێت دابێتەوە، هەرچی باوێشکیشە بە دڵنیایی لە شەیتانەوەیە[٤]، کەواتە با بە پێی توانا بیگێڕێتەوە، (دەست لەسەر دەمی دابنێ)، چونکە ئەگەر (دەمی لێك کردەوەو) گوتی: (هــاااا)، شەیتان پێی پێدەکەنێ.

---

(١) حسن: «تخريج المشكاة» (٤٥٨٩)، «السلسلة الصحيحة» (٧٩٠)،: (أبو داود: ٢٨- كتاب الطب، ٢٤- باب: الطيرة، ح ٣٩٢) قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: فِي إِسْنَادِهِ نَظَرٌ.

(٢) صحيح: «الإرواء» (٧٧٩/٢٤٤/٣): (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١٢٨- باب: إذا تثائب فليضع يده على فمه).

(٣) پژمین نیشانەی گورج و گۆڵی چالاکیە، بەڵام باوێشك نیشانەی قالب گرانی و تەوەزەلی و بێ تاقەتیە.

(٤) شەیتان پێی خۆشە ئینسانی مسوڵمان بێ تاقەت بێ، بێزار بێ، ماندوو بێ.

## دەربارەی: ئەوەی دەگوترێ لە کاتی پژمیندا

٧٩١- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا عَطَسَ فَلْيَقُلِ: الْحَمْدُ لِلهِ، فَإِذَا قَالَ فَلْيَقُلْ لَهُ أَخُوهُ أَوْ صَاحِبُهُ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ، فَإِذَا قَالَ لَهُ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ فَلْيَقُلْ: يَهْدِيكَ اللَّهُ وَيُصْلِحُ بَالَكَ»»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر (یەکێك) پژمی با بڵێ: (الحمد لله)، جا ئەگەر ئەمەی گوت با براکەی یان هاوەڵەکەی پێی بڵێ: (يَرْحَمُكَ اللّه)، ئەگەر پێی گوترا: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ)، ئەوە با ئەو بڵێ: (يَهْدِيكَ اللَّهُ وَيُصْلِحُ بَالَكَ) واتە: خوا ڕێنماییت بکات و کاروبارت بۆ ڕێك بخات.**

## دەربارەی: دوعا کردن بۆ ئەو کەسەی دەپژمێ

٧٩٢- «عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَرْبَعٌ لِلْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ: يَعُودُهُ إِذَا مَرِضَ، وَيَشْهَدُهُ إِذَا مَاتَ، وَيُجِيبُهُ إِذَا دَعَاهُ، وَيُشَمِّتُهُ إِذَا عَطَسَ»»[٢].

**واتە: ئیبنو مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: چوار شت هەن پێویست (واجب)ن لەسەر مسوڵمان بۆ مسوڵمان: کاتێ نەخۆشی تووش دێ سەردانی بکات، وە کاتێ مرد ئامادەی تەرمەکەی بێ، وە کاتێ بانگهێشتی کرد وەڵامی بداتەوە، وە کاتێ پژمی دوعای بۆ بکات (پێی بڵێ: يرحمك اللّه).**

٧٩٣- «عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِسَبْعٍ، وَنَهَانَا عَنْ سَبْعٍ: أَمَرَنَا بِعِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَاتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ، وَتَشْمِيتِ الْعَاطِسِ، وَإِبْرَارِ الْمُقْسِمِ، وَنَصْرِ الْمَظْلُومِ، وَإِفْشَاءِ السَّلَامِ، وَإِجَابَةِ الدَّاعِي. وَنَهَانَا عَنْ: خَوَاتِيمِ الذَّهَبِ، وَعَنْ آنِيَةِ الْفِضَّةِ، وَعَنِ الْمَيَاثِرِ، وَالْقَسِّيَّةِ، وَالْإِسْتَبْرَقِ، وَالدِّيبَاجِ، وَالْحَرِيرِ»[٣].

**واتە: بەڕائی کوڕی عازب (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین بە حەوت شت، وە ڕێگریشی لێ کردین لە حەوت شت: فەرمانی پێکردین بە سەردانی نەخۆش و، شوێنکەوتنی جەنازەو، دوعاکردن بۆ ئەو کەسەی دەپژمێ (بەوەی پێی بڵێین: يرحمك اللّه)، سوێند بردنە سەرو،**

---

(١) صحيح: «الإرواء» (٧٨٠) (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١٢٦- باب: إذا عطس كيف يشمت).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢١٥٤): (إبن ماجه: ٦- كتاب الجنائز، ١- باب: ماجاء في عيادة المريض، ح ١٤٣٤).

(٣) صحيح: «الإرواء» (٣٨٥): (البخاري: ٢٣- كتاب الجنائز، ٢- باب: الأمر باتباع الجنائز. ٣٧- كتاب اللباس والزينة، ح ٣).

سەرخستنی ستەم لێکراو، وە بڵاوکردنەوەی سڵاوکردن، وە چوون بۆ دەعوەت، وە ڕێگری لێکردین لە: بەکارهێنانی گوستیلەی ئاڵتوون (زێڕ)، بەکارهێنانی قاپ و کەل و پەلی زیوو، بەکارهێنانی پۆشاکی تێکەڵ بە ئاوریشم و، ئیستەبرەق و دیباج و (کە دوو جۆری تایبەتی حەریرن) وە حەریر (بە گشتی).

(الْقَسِّيَّة): پۆشاکێکە زۆرینەی حەریرە.

(الْمِياثِر): ڕاخەرێکە لەسەر کورتانی ئەسپ و وشتر دادەنرا، ئافرەتان دروستیان دەکرد بۆ مێردەکانیان، ڕەنگی سوور بوو لە حەریر دروست دەکرا، کە پیشەی لووت بەرزەکان بوو.

٧٩٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ سِتٌّ، قِيلَ: مَا هِيَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: إِذَا لَقِيتَهُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، وَإِذَا دَعَاكَ فَأَجِبْهُ، وَإِذَا اسْتَنْصَحَكَ فَانْصَحْ لَهُ، وَإِذَا عَطَسَ فَحَمِدَ اللَّهَ فَشَمِّتْهُ، وَإِذَا مَرِضَ تَعُودُهُ، وَإِذَا مَاتَ فَاتَّبِعْهُ»»(١).

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مافی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان شەش شتە: گوترا: ئەوانە چین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: کاتێ پێی گەیشتی سڵاوی لێ بکە، وە کاتی بانگی کردی (بۆ دەعوەت) وەڵامی بدەوە، وە کاتێ داوای ئامۆژگاری لێ کردی (دڵسۆزبە) ئامۆژگاری بکە، وە کاتێ پژمی و ستایشی خوای کرد دوعای بۆ بکە (بڵێ: يرحمك اللّٰه)، وە کاتێ نەخۆشی تووش هات سەردانی بکە، وە کاتێ مرد شوێن تەرمەکەی بکەوە.

## دەربارەی: ئەو کەسەی گوێی لە پژمین دەبێ، چۆن دوعا دەکات؟

٧٩٥- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلِ: الْحَمْدُ لِلهِ، فَإِذَا قَالَ: الْحَمْدُ لِلهِ، فَلْيَقُلْ لَهُ أَخُوهُ أَوْ صَاحِبُهُ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ، وَلْيَقُلْ هُوَ: يَهْدِيكُمُ اللَّهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ»»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە پژمی با بڵێ: (الْحَمْدُ لِلهِ) واتە: گشت ستاییشێك بۆ خوا، جا کاتێ گوتی: الحمد لله، ئەوە با براکەی یان هاوەڵەکەی پێی بڵێ: (يرحمك اللّٰه) واتە: خوا ڕەحمت پێ بکات، وە با کەسی پژمیو، بڵێ: (يَهْدِيكُمُ اللَّهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ) واتە: خوا هیدایەتتان بدات و کاروبارتان چاك و ڕێك بکات.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٨٣٢): (البخاري: ٢٣- كتاب الجنائز، ٢- باب: الأمر باتباع الجنائز. مسلم: ٣٩- كتاب السلام، ح٥).

(٢) صحيح: «الإرواء» (٧٨٠): (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١٢٦- باب: إذا عطس كيف يشمت).

٧٩٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعُطَاسَ، وَيَكْرَهُ التَّثَاؤُبَ، وَإِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ وَحَمِدَ اللَّهَ كَانَ حَقاً عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ سَمِعَهُ أَنْ يَقُولَ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ، فَأَمَّا التَّثَاؤُبُ فَإِنَّمَا هُوَ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَرُدَّهُ مَا اسْتَطَاعَ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا تَثَاءَبَ ضَحِكَ مِنْهُ الشَّيْطَانُ»»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی خوا پژمینی خۆشدەوێ و، ڕقی لە باوێشکە[٢]، جا ئەگەر یەکێك لە ئێوە پژمی و ستایشی خوای کرد، ئەوە پێویستە لەسەر هەر کەسێك کە دەیبیستێ ، پێی بڵێ: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ) واتە: خوا بەزەیی پێت دابێتەوە، وە هەرچی باوێشکیشە بە دڵنیایی لە شەیتانەوەیە[٣]، جا ئەگەر یەکێك لە ئێوە، باوێشکی هات با بە پێی توانا بیگێڕێتەوە، (دەست لەسەر دەمی دابنێ)، چونکە ئەگەر یەکێك لە ئێوە کە باوێشك دەدا (دەمی لێك بکاتەوەو بڵێ: هـاااا)، شەیتان پێی پێدەکەنێ.**

٧٩٧- «عَنْ أَبِي جَمْرَةَ قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ إِذَا شُمِّتَ: عَافَانَا اللَّهُ وَإِيَّاكُمْ مِنَ النَّارِ، يَرْحَمُكُمُ اللَّهُ»[٤].

**واتە: ئەبو جەمرە دەڵێ: ئەگەر وەڵامی پشمینی ئیبنو عەبباس (خوا لێی ڕازی بێ) بدرابایەوە (واتە: پێی گوترابا: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ)، دەیگوت: (عَافَانَا اللَّهُ وَإِيَّاكُمْ مِنَ النَّارِ، يَرْحَمُكُمُ اللَّهُ) واتە: خوا ئێمەو ئێوە بپارێزێ لە ئاگر، خوا ڕەحمتان پێبکات.**

٧٩٨- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا جُلُوساً عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَعَطَسَ رَجُلٌ فَحَمِدَ اللَّهَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَرْحَمُكَ اللَّهُ»، ثُمَّ عَطَسَ آخَرُ، فَلَمْ يَقُلْ لَهُ شَيْئاً، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، رَدَدْتَ عَلَى الْآخَرِ، وَلَمْ تَقُلْ لِي شَيْئاً؟ قَالَ: «إِنَّهُ حَمِدَ اللَّهَ، وَسَكَتَّ»»[٥].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین، پیاوێك پژمی و ستایشی خوای کرد، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ) واتە: خوا ڕەحمت پێبکات، پاشان یەکێکی دیکە پژمی، پێغەمبەریش هیچی بۆ نەفەرموو، جا (کابرا) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی ئەوی دیکەت دایەوە، وە هیچت بۆ من نەفەرموو؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەو ستایشی خوای کرد، تۆش بێدەنگ بووی (نەتگوت: الحَمْدُ اللَّه).**

---

(١) صحيح.

(٢) پژمین نیشانەی گورج و گۆڵی چالاکیە، بەڵام باوێشك نیشانەی قالب گرانی و تەوەزەلی و بێ تاقەتیە.

(٣) شەیتان پێی خۆشە ئینسانی مسوڵمان بێ تاقەت بێ، بێزار بێ، ماندوو بێ.

(٤) صحيح الإسناد، وكذا في «الفتح» (١٠/٦٠٩).

(٥) صحيح: «تخريج المشكاة» (٤٧٣٤/ التحقيق الثاني): (ليس في شيء من الكتب الستة).

## دەربارەی: کەسێك (پژمی و) ستایشی خوای نەکرد، دوعای بۆ ناکرێ

٧٩٩- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: عَطَسَ رَجُلَانِ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَشَمَّتَ أَحَدَهُمَا، وَلَمْ يُشَمِّتِ الْآخَرَ، فَقَالَ: شَمَّتَّ هَذَا وَلَمْ تُشَمِّتْنِي؟ قَالَ: «إِنَّ هَذَا حَمِدَ اللَّهَ، وَلَمْ تَحْمَدْهُ»»[١].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: دوو پیاو لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ پژمین، جا وەڵامی یەکێکیانی دایەوە (فەرمووی: يرحمك اللّه)، وە وەڵامی ئەوەیتریانی نەدایەوە، جا (ئەو پیاوەی وەڵام نەدرایەوە) گوتی: (يرحمك اللّه)ت کرد بۆ ئەوەو بۆ منت نەکرد؟ فەرمووی: ئەمەیان ستایشی خوای کردو، تۆ ستایشی خوات نەکرد (تۆ نەتگوت: الحمد لله).

٨٠٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: جَلَسَ رَجُلَانِ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ أَحَدُهُمَا أَشْرَفُ مِنَ الْآخَرِ، فَعَطَسَ الشَّرِيفُ مِنْهُمَا فَلَمْ يَحْمَدِ اللَّهَ، وَلَمْ يُشَمِّتْهُ، وَعَطَسَ الْآخَرُ فَحَمِدَ اللَّهَ، فَشَمَّتَهُ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ الشَّرِيفُ: عَطَسْتُ عِنْدَكَ فَلَمْ تُشَمِّتْنِي، وَعَطَسَ هَذَا الْآخَرُ فَشَمَّتَّهُ، فَقَالَ: «إِنَّ هَذَا ذَكَرَ اللَّهَ فَذَكَرْتُهُ، وَأَنْتَ نَسِيتَ اللَّهَ فَنَسِيتُكَ»»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: دوو پیاو لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشت بوون، یەکێکیان لەوی دیکەیان بە ناوبانگتر بوو، جا کابرای بە ناوبانگ پژمی ستایشی خوای نەکرد، پێغەمبەریش ﷺ دوعای بۆی نەکرد (نەیفەرموو: يرحمك اللّه)، وە ئەوی دیکەیان پژمی و ستایشی خوای کرد، پێغەمبەریش ﷺ دوعای خێری بۆی کرد (فەرمووی: يرحكم اللّه)، جا کابرایە بەناوبانگەکە گوتی: من لە لات پژمیم دوعات بۆ نەکردم، ئەمەش پژمی دوعات بۆ کرد؟! (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەوە یادی خوای کرد (گوتی: الحمد لله) منیش دوعام بۆ کرد، تۆش خوات لە بیر کرد، منیش تۆم لە بیر کرد.

## دەربارەی: ئەو کەسەی دەپژمی سەرەتا چی دەڵێ؟

٨٠١- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّهُ كَانَ إِذَا عَطَسَ فَقِيلَ لَهُ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ، فَقَالَ: يَرْحَمُنَا اللَّهُ وَإِيَّاكُمْ، وَيَغْفِرُ لَنَا وَلَكُمْ»[٣].

---

(١) صحيح: (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١٢٣- باب: الحمد للعاطس. مسلم: ٥٣- كتاب الزهد ح ٥٣).

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) حسن: «المشكاة» (٤٧٣٤/ التحقيق الثاني).

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) گێڕدراوەتەوە، کە ئەگەر بپژمیباو پێی گوترابا: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ)، دەیگوت: (يَرْحَمُنَا اللَّهُ وَإِيَّاكُمْ، وَيَغْفِرُ لَنَا وَلَكُمْ) واتە: خوا بەزەیی بە ئێمەو ئێوەدا بێتەوە، وە لە ئێمەو لە ئێوە خۆش بێ.

٨٠٢- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلِ: الْحَمْدُ لِلهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، وَلْيَقُلْ مَنْ يَرُدُّ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ، وَلْيَقُلْ هُوَ: يَغْفِرُ اللَّهُ لِي وَلَكُمْ»[1].

واتە: لە عەبدوڵڵا (خوا لێی ڕازی بێ) گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە پژمی، با بڵێ: (الْحَمْدُ لِلهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) واتە: ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانییان، وە ئەوەش کە وەڵامی دەداتەوە با بڵێ: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ) واتە: خوا ڕەحمت پێ بکات، وە با ئەویش بڵێ: (يَغْفِرُ اللَّهُ لِي وَلَكُمْ) واتە: خوا لە من و لە ئێوەش خۆش بێ.

٨٠٣- «عَنْ إِيَاس بْنِ سَلَمَةَ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: عَطَسَ رَجُلٌ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «يَرْحَمُكَ اللَّهُ»، ثُمَّ عَطَسَ أُخْرَى، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هَذَا مَزْكُومٌ»»[2].

واتە: ئیاسی کوڕی سەلەمە لە باوکی (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پیاوێك پژمی لای پێغەمبەر ﷺو پێی فەرموو: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ)، دوایی جارێکی دیکە پژمیەوە، فەرمووی: ئەوە نەخۆشە (واتە: زۆر دەپژمێت پێویستی بە وەڵامدانەوە نیە).

## دەربارەی: ئەو کەسەی دەپژمێ نابێ بڵێ: (آبَّ)

٨٠٤- «عَنْ مُجَاهِدٍ يَقُولُ: عَطَسَ ابْنٌ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) إِمَّا أَبُو بَكْرٍ، وَإِمَّا عُمَرُ، فَقَالَ: آبَّ، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: وَمَا آبَّ؟ إِنَّ آبَّ اسْمُ شَيْطَانٍ مِنَ الشَّيَاطِينِ جَعَلَهَا بَيْنَ الْعَطْسَةِ وَالْحَمْدِ»[3].

واتە: موجاهید دەڵێ: کوڕێکی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) پژمی، یان ئەبو بەکر، یان عومەر بوو (کە هەردووکیان کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بوون) جا کە پژمی گوتی: (آبَّ) (واتە: ئەو دەنگەی لێوەهات لە کاتی پشمینەکە) جا ئیبنو عومەر گوتی: (آبَّ) چیە؟! (آبَّ) ناوی شەیتانێکە لە شەیتانەکان، (شەیتان) لە نێوانی پژمین (الحمد لله) کردندا دایدەنێ.

---

(١) صحيح الإسناد موقوفاً.

(٢) صحيح: «الصحيحة» (١٣٣٠)، «المشكاة» (٤٧٣٦)، (أبو داود ٤٠- كتاب الأدب، ٩٢- باب: كم مرة يشمت العاطس؟ ح ٥٠٣٧. الترمذي: ٤١- كتاب الأدب، ٥- باب: ماجاء كيف يشمت العاطس).

(٣) صحيح الإسناد: صححه الحافظ في «الفتح» (١٠/٦٠١).

(واتە: شەیتان وا دەکات مسوڵمان لە جیاتی (الحمد لله) کردن وشەو دەنگی دیکە دەرببڕێ و ستاییشەکەی خوا نەکات).

## دەربارەی: کاتێ کەسێك چەند جارێك دەپژمی

٨٠٥- «عَنْ إِيَاس بْنِ سَلَمَةَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَعَطَسَ رَجُلٌ، فَقَالَ: «يَرْحَمُكَ اللَّهُ»، ثُمَّ عَطَسَ أُخْرَى، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هَذَا مَزْكُومٌ»»[1].

واتە: ئیاسی کوڕی سەلەمە دەڵێ: باوکم (خوا لێی ڕازی بێ) بۆی گێڕامەوە، گوتی: لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بووم، جا پیاوێك پژمی، (پێغەمبەریش ﷺ) پێی فەرموو: (يَرْحَمُكَ اللَّهُ) پاشان جارێکی دیکە پژمییەوە، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە نەخۆشە (واتە: وەڵامدانەوەی پێویست نیە).

٨٠٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: شَمِّتْهُ وَاحِدَةً وَثِنْتَيْنِ وَثَلَاثًا، فَمَا كَانَ بَعْدَ هَذَا فَهُوَ زُكَامٌ»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: جارێك و دووان و سیان وەڵامی ئەو کەسە بدەرەوە (بە گوتنی: يَرْحَمُكَ اللَّهُ) کە دەپژمێت، جا دوای ئەوە (ئەگەر پژمی) ئەوە نەخۆشیە (وەڵامدانەوەی پێویست نیە).

## دەربارەی: کاتێك جوولەکە دەپژمی

٨٠٧- «عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ الْيَهُودُ يَتَعَاطَسُونَ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ رَجَاءَ أَنْ يَقُولَ لَهُمْ: يَرْحَمُكُمُ اللَّهُ، فَكَانَ يَقُولُ: «يَهْدِيكُمُ اللَّهُ، وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ»»[3].

واتە: ئەبو مووسا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: جوولەکەکان لە لای پێغەمبەر ﷺ دەپژمین بە ئومێدی ئەوەی پێیان بفەرموێ: (يَرْحَمُكُمُ اللَّهُ) واتە: خوا بەزەیی پێتان بێتەوە (ئەوەش دروست نیە بە غەیری مسوڵمان بگوترێ)، بۆیە (پێغەمبەری خوا ﷺ لە جیاتی ئەوە) پێی دەفەرموون: (يَهْدِيكُمُ اللَّهُ، وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ) واتە: خوا هیدایەتتان بدات، حاڵ و گوزەرانتان چاك بكات.

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح: «تخريج المشكاة» (٤٧٤٣)، «السلسلة الصحيحة» (١٣٣٠).

(٣) صحيح: (الإرواء» (١٢٧٧): (أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٩٣- باب: كيف يشمت الذمي؟ ح ٥٠٣٨).

## دەربارەی: دوعا کردنی پیاو بۆ ژن (بە گوتنی: يَرْحَمُكُمُ اللَّهُ)

٨٠٨- «عَنْ أَبِي بُرْدَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى أَبِي مُوسَى، وَهُوَ فِي بَيْتِ ابْنَتِهِ أُمِّ الْفَضْلِ بْنِ الْعَبَّاسِ، فَعَطَسْتُ فَلَمْ يُشَمِّتْنِي، وَعَطَسَتْ فَشَمَّتَهَا، فَأَخْبَرْتُ أُمِّي، فَلَمَّا أَتَاهَا وَقَعَتْ بِهِ وَقَالَتْ: عَطَسَ ابْنِي فَلَمْ تُشَمِّتْهُ، وَعَطَسَتْ فَشَمَّتَّهَا، فَقَالَ لَهَا: إِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَحَمِدَ اللَّهَ فَشَمِّتُوهُ، وَإِنْ لَمْ يَحْمَدِ اللَّهَ فَلَا تُشَمِّتُوهُ»، وَإِنَّ ابْنَكِ عَطَسَ فَلَمْ يَحْمَدِ اللَّهَ، فَلَمْ أُشَمِّتْهُ، وَعَطَسَتْ فَحَمِدَتِ اللَّهَ فَشَمَّتُّهَا، فَقَالَتْ: أَحْسَنْتَ»[١].

واتە: ئەبو بوردە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: چوومە ژوورەوە بۆ لای ئەبو مووسا ئەو کاتە لە ماڵی کچەکەیدا بوو کە دایکی فەضلی کوڕی عەبباسە، پژمیم دووعای بۆ نەکردم (نەیگوت: يَرْحَمُكَ اللَّهُ)، بەڵام کچەکەی پژمی دوعای بۆ کرد (گوتی: يَرْحَمُكِ اللَّهُ)، جا منیش هەواڵمدا بە دایکم، کاتێ (دایکم) هات بۆ لای پێی گوت: کوڕەکەم پژمی دوعات بۆ نەکرد، بەڵام کچەکەت پژمی دووعات بۆ کردوە (بۆ جیاوازیت کردوە)؟! ئەویش پێی گوت: من بیستم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ئەگەر یەکێك لە ئێوە پژمی و ستایشی خوای کرد، ئەوە دوعای بۆ بکەن (بڵێن: يَرْحَمُكَ اللَّهُ)، وە ئەگەر ستایشی خوای نەکرد دوعای بۆ مەکەن (مەڵێن: يَرْحَمُكَ اللَّهُ)، جا کوڕەکەی تۆ پژمی و ستایشی خوای نەکرد، منیش دوعام بۆی نەکرد، وە کچەکەم پژمی و ستایشی خوای کرد منیش دوعام بۆ کرد، جا (دایکم) گوتی: کارێکی چاکت کردوە.

## دەربارەی: باوێشك

٨٠٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَكْظِمْ مَا اسْتَطَاعَ»»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر یەکێکتان باوێشکی هات ئەوەندەی لە توانای دایە با بیخواتەوەو بیگێڕێتەوە.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣٠٩٤): (مسلم: ٥٣-كتاب الزهد والرقائق ، ح ٥٤).

(٢) صحيح.

## دەربارەی: ئەو کەسەی لە کاتی وەڵامدانەوەدا دەڵێ: لە خزمەتدام

٨١٠- «عَنْ مُعَاذٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أَنَا رَدِيفُ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «يَا مُعَاذُ»، قُلْتُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، ثُمَّ قَالَ مِثْلَهُ ثَلَاثًا: «هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ اللَّهِ عَلَى الْعِبَادِ؟» قُلْتُ: لَا، قَالَ: «أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلَا يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً»، ثُمَّ سَارَ سَاعَةً فَقَالَ: «يَا مُعَاذُ»، قُلْتُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ، قَالَ: «هَلْ تَدْرِي مَا حَقُّ الْعِبَادِ عَلَى اللَّهِ إِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ؟ أَنْ لَا يُعَذِّبَهُمْ»»[١].

واتە: موعاز (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من لە پشتی پێغەمبەرەوە ﷺ سواری وڵاخەکەی ببووم فەرمووی: (ئەی موعاز) گوتم: بەردەوام لە خزمەتدام لە بۆ هەر شتێك خۆشحاڵت بکات، پاشان سێ جار هەمان شتی فەرموو (دوایی فەرمووی): ئایا دەزانی مافی خوا چیە لەسەر بەندەکانی؟ گوتم: نەخێر، فەرمووی: ئەوەیە بیپەرستن و هاوبەشی بۆ دانەنێن، پاشان ئەندازەیەك ڕۆیشت و فەرمووی: ئەی موعاز گوتم: بەردەوام لە خزمەتدام بۆ هەر شتێك خۆشحاڵت بکات، فەرمووی: ئایا دەزانی مافی بەندەکان چیە لەسەر خوا ئەگەر ئەوەیان ئەنجامدا؟ (پێغەمبەر ﷺ هەر خۆی وەڵامی دایەوە فەرمووی): ئەوەیە کە سزایان نەدات.

## دەربارەی: هەڵسانەوەی پیاو لەبەر براکەی (بۆ ڕێزگرتن)

٨١١- «عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ كَعْبٍ «وَكَانَ قَائِدَ كَعْبٍ مِنْ بَنِيهِ حِينَ عَمِيَ» قَالَ: سَمِعْتُ كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ يُحَدِّثُ حَدِيثَهُ حِينَ تَخَلَّفَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَنْ غَزْوَةِ تَبُوكَ، فَتَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ: وَآذَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِتَوْبَةِ اللَّهِ عَلَيْنَا حِينَ صَلَّى صَلَاةَ الْفَجْرِ، فَتَلَقَّانِي النَّاسُ فَوْجاً فَوْجاً، يُهَنُّونِي بِالتَّوْبَةِ يَقُولُونَ: لِتَهْنِكَ تَوْبَةُ اللَّهِ عَلَيْكَ، حَتَّى دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ، فَإِذَا بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَوْلَهُ النَّاسُ، فَقَامَ إِلَيَّ طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ يُهَرْوِلُ، حَتَّى صَافَحَنِي وَهَنَّانِي، وَاللَّهِ مَا قَامَ إِلَيَّ رَجُلٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ غَيْرُهُ، لَا أَنْسَاهَا لِطَلْحَةَ»[٢].

واتە: ئیبنو شیهاب دەڵێ: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە (خوا لێیان ڕازی بێ)، کە عەبدوڵڵای کوڕی کەعب «ئەو کوڕەی کەعب کە دەستی کەعبی باوکی خۆی دەگرت لە نێو منداڵەکانی کەعب کوێر ببوو» دەڵێ: بیستم کەعبی کوڕی

---

(١) صحيح: «صحيح أبي داود» (٢٣٠٧)، (البخاري: ٧٧- كتاب اللباس، ١٠١- إرداف الرجل خلف الرجل. مسلم: ١-كتاب الإيمان، ح ٤٨).

(٢) صحيح: «الإرواء» (٢/٢٣١-٢٣٢/٤٧٧)، (البخاري: : ٦٤- كتاب المغازي، ٧٩- باب: حديث كعب بن مالك. مسلم: ٤٩- كتاب التوبة، ح ٥٣).

مالیك باسی خۆی دەكرد كە لە پێغەمبەر ﷺ دواكەوتبوو لە كاتی جەنگی تەبووكدا (لەبەر فریوخواردن بە دونیا)، پاشان (تەوبەی كردو زۆر بە چاكی گەڕایەوەو) خوا لێی خۆش بوو، گوتی: پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری كردینەوە بە لێ خۆشبوونی خواو تەوبە قبوولبوونمان، كاتێ كە نوێژی بەیانی ئەنجامدا، خەڵك پۆل پۆل دەهاتن بۆ لام، پیرۆزبایی لێ خۆشبوونەكەیان لێ دەكردم دەیانگوت: پیرۆزت بێ ئەو لێخۆشبوونەی خوا، هەتا چوومە نێو مزگەوتەوە، بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێیەو خەڵكیش لە دەوروبەری دانیشتوون، جا تەڵحەی كوڕی عوبەیدوڵلا هەڵساو بە ڕاكردن و پەلە هات بۆ لام، تاوەكو تەوقەی لەگەڵ كردم و، باوەشی پێداكردم و، پیرۆزبایی لێكردم، سوێند بە خوا هیچ كەسێك لە موهاجیرەكان جگە لەو لەبەرم هەڵنەستایەوە، هەرگیز ئەو هەڵوێستەی تەڵحەم بیر ناچێتەوە.

٨١٢- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ نَاساً نَزَلُوا عَلَى حُكْمِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ، فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ، فَجَاءَ عَلَى حِمَارٍ، فَلَمَّا بَلَغَ قَرِيباً مِنَ الْمَسْجِدِ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ائْتُوا خَيْرَكُمْ، أَوْ سَيِّدَكُمْ»، فَقَالَ: «يَا سَعْدُ! إِنَّ هَؤُلَاءِ نَزَلُوا عَلَى حُكْمِكَ»، فَقَالَ سَعْدٌ: أَحْكُمُ فِيهِمْ أَنْ تُقْتَلَ مُقَاتِلَتُهُمْ، وَتُسْبَى ذُرِّيَّتُهُمْ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «حَكَمْتَ بِحُكْمِ اللَّهِ»، أَوْ قَالَ: «حَكَمْتَ بِحُكْمِ الْمَلِكِ»»[1].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: خەڵكانێك (واتە: جوولەكەكان) ڕازی بوون بەوەی سەعدی كوڕی موعاز (كە هاوپەیمانیان بوو) بڕیار بدات بەسەریانداو (سزای خیانەتی گەورەیان بۆ دابنێ)، (پێغەمبەریش ﷺ) لە دوای نارد، ئەویش بەسەر پشتی گوێدرێژێكەوە هات، كاتێ نزیك بووەوە لە مزگەوت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چاكترینتان «یان گەورەكەتان» بێنن (یارمەتی بدەن)، (جا كە هات پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەی سەعد! ئەوان ڕازین بە هەر حوكم و بڕیارێك تۆ بیدەی، سەعدیش گوتی: بڕیاری من دەربارەی ئەوان ئەوەیە ئەوانەی شەڕكەرن بكوژرێن و منداڵەكانیشیان بكرێن بە كۆیلە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: هەمان بڕیاری خواتدا، یانیش فەرمووی: بڕیارتدا بە بڕیاری خوای پادشا (چونكە لە تەوڕاتدا سزای خیانەتی گەورە ئاوا بوو، واتە: سەعد بە دینی خۆیان بڕیاری لەسەر دان).

٨١٣- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: مَا كَانَ شَخْصٌ أَحَبَّ إِلَيْهِمْ رُؤْيَةً مِنَ النَّبِيِّ ﷺ، وَكَانُوا إِذَا رَأَوْهُ لَمْ يَقُومُوا إِلَيْهِ، لِمَا يَعْلَمُونَ مِنْ كَرَاهِيَتِهِ لِذَلِكَ»[2].

---

(١) صحيح: (السلسلة الصحيحة) (٦٧)، «تحريج فقه السيرة» (ص: ٣١٥) (البخاري: ٥٦- كتاب الجهاد ، ١٦٨- باب: إذا أنزل العدو على حكم رجل. مسلم: ٣٢- كتاب الجهاد، ح ٦٤).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣٥٨)، «المشكاة» (٤٦٩٨)، «مختصر الشمائل» (٢٨٩)، (نقد الكتاني» (ص ٥١) (ليس في شيء من الكتب الستة) الحديث أخرجه الترمذي.

**واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: بینینی هیچ کەسێك بەلای هاوەڵانەوە خۆشتر نەبوو لە بینینی پێغەمبەر ﷺ، وە کاتێ بیانبینیایە لەبەری هەڵنەدەستان، چونکە دەیانزانی ئەوەی پێ ناخۆشە.**

٨١٤- «عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ أَحَداً مِنَ النَّاسِ كَانَ أَشْبَهَ بِالنَّبِيِّ ﷺ كَلَاماً وَلَا حَدِيثاً وَلَا جِلْسَةً مِنْ فَاطِمَةَ، قَالَتْ: وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا رَآهَا قَدْ أَقْبَلَتْ رَحَّبَ بِهَا، ثُمَّ قَامَ إِلَيْهَا فَقَبَّلَهَا، ثُمَّ أَخَذَ بِيَدِهَا فَجَاءَ بِهَا حَتَّى يُجْلِسَهَا فِي مَكَانِهِ، وَكَانَتْ إِذَا أَتَاهَا النَّبِيُّ ﷺ رَحَّبَتْ بِهِ، ثُمَّ قَامَتْ إِلَيْهِ فَقَبَّلَتْهُ، وأَنَّهَا دَخَلَتْ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فِي مَرَضِهِ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ، فَرَحَّبَ وَقَبَّلَهَا، وَأَسَرَّ إِلَيْهَا، فَبَكَتْ، ثُمَّ أَسَرَّ إِلَيْهَا، فَضَحِكَتْ، فَقُلْتُ لِلنِّسَاءِ: إِنْ كُنْتُ لَأَرَى أَنَّ لِهَذِهِ الْمَرْأَةِ فَضْلاً عَلَى النِّسَاءِ، فَإِذَا هِيَ مِنَ النِّسَاءِ، بَيْنَمَا هِيَ تَبْكِي إِذَا هِيَ تَضْحَكُ، فَسَأَلْتُهَا: مَا قَالَ لَكِ؟ قَالَتْ: إِنِّي إِذاً لَبَذِرَةٌ[1] فَلَمَّا قُبِضَ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَتْ: أَسَرَّ إِلَيَّ فَقَالَ: «إِنِّي مَيِّتٌ»، فَبَكَيْتُ، ثُمَّ أَسَرَّ إِلَيَّ فَقَالَ: «إِنَّكِ أَوَّلُ أَهْلِي بِي لُحُوقاً»، فَسُرِرْتُ بِذَلِكَ وَأَعْجَبَنِي»[2].

**واتە: خاتوون عائیشەی دایکی ئیمانداران (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: هیچ کەسێکم لە خەڵکی نەبینیوە لە پێغەمبەر ﷺ بچێت لە قسەکردن و دانیشتندا هێندەی فاتیمە، (عائیشە) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ فاتیمەی ببینیایە دڵی پێی خۆش دەبوو، پاشان هەڵدەستاو بەرەو ڕووی دەچوو، پێشوازی لێدەکردو ماچی دەکرد، پاشان دەستی دەگرت و دەیهێنا دایدەنیشاند لە جێگاکەی خۆیدا، ئەویش کاتێ پێغەمبەر ﷺ بهاتایە بۆ لای دڵی زۆر پێ خۆش دەبوو، پاشان هەڵدەستایەوەو پێشوازی لێدەکردو ماچی دەکرد، جا فاتیمە چووە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لەو نەخۆشیەی کە بە هۆیەوە کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەری خوا زۆر دڵی پێ خۆش بوو و ماچی کردو، بە نهێنی قسەیەکی لەگەڵ کرد، فاتیمەش گریا، پاشان بە نهێنی قسەیەکی دیکەی بۆ کردو فاتیمە پێکەنی، جا بە ئافرەتەکانم گوت: من پێشتر پێم وابوو ئەو ئافرەتە (واتە: فاتیمە) فەزڵێکی هەیە بەسەر ئافرەتانەوە، کەچی دەرچوو هەر وەکو ئافرەتانە، (چونکە) لەو کاتەدا دەگری و پێشدەکەنێ (کەسێك باوکی بمرێ چۆن پێدەکەنێ)! پرسیارم لێی کرد، گوتم: (فاتیمە پێغەمبەری خوا ﷺ) چی پێت فەرموو؟ گوتی: (ئەگەر قسەکەی بڵێم و بیدرکێنم) کەواتە کەسێکی دەم شڕم (من چۆن نهێنی پێغەمبەر ﷺ دەدرکێنم کە هێشتا لە ژیاندا ماوە)، جا کاتێ پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد، گوتی: (باوکم) بە نهێنی قسەی بۆ کردم، فەرمووی: من دەمرم، بۆیە دەستم کرد بە گریان، پاشان بە نهێنی قسەی بۆ کردم، فەرمووی: تۆ یەکەم کەسی**

---

(١) «لبذرة»: البذر من يفشي السر ويظهر ما يسمعه.

(٢) صحيح: «تخريج المشكاة» (٤٦٨٩)، «نقد نصوص حديثية» (٤٤-٤٥): (البخاري: ٦١-كتاب المناقب، ٢٥- باب علامات النبوة في الإسلام. مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة ح ٩٧، ٩٨، ٩٩).

لە خانەوادەی من پێم دەگەی (واتە: زوو دەمری و دەگەیتەوە بە من)، جا زۆر دڵخۆش بووم بەوەو پێکەنیم.

تێبینی: وەك پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی دابوو، فاتیمەی کچی یەکەم کەس گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺو، دوای شەش مانگ لە وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ فاتیمە (خوا لێی ڕازی بێ) وەفاتی کرد.

## دەربارەی: هەڵسانەوەی کەسێك بۆ خاتری کەسێکی دانیشتوو

٨١٥- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: اشْتَكَى النَّبِيُّ ﷺ، فَصَلَّيْنَا وَرَاءَهُ وَهُوَ قَاعِدٌ، وَأَبُو بَكْرٍ يُسْمِعُ النَّاسَ تَكْبِيرَهُ، فَالْتَفَتَ إِلَيْنَا فَرَآنَا قِيَاماً، فَأَشَارَ إِلَيْنَا فَقَعَدْنَا، فَصَلَّيْنَا بِصَلَاتِهِ قُعُوداً، فَلَمَّا سَلَّمَ قَالَ: إِنْ كِدْتُمْ لَتَفْعَلُوا فِعْلَ فَارِسَ وَالرُّومِ، يَقُومُونَ عَلَى مُلُوكِهِمْ وَهُمْ قُعُودٌ، فَلَا تَفْعَلُوا، ائْتَمُّوا بِأَئِمَّتِكُمْ، إِنْ صَلَّى قَائِماً فَصَلُّوا قِيَاماً، وَإِنْ صَلَّى قَاعِداً فَصَلُّوا قُعُوداً»[1].

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەخۆش بوو، ئێمەش لە پشتیەوە نوێژمان کرد لەکاتێکدا ئەو دانیشتبوو، ئەبو بەکریش تەکبیرەکەی دەگەیاند بە خەڵکی، جا هەندێك ڕووخساری سووڕاند، بینی بە پێوە وەستاوین، ئاماژەی بۆ کردین (دابنیشین) ئێمەش دانیشتین، بەدانیشتنەوە نوێژمان لەگەڵی کرد، جا کاتێ سەلامی دایەوە فەرمووی: خەریکە ئێوەش وەك فارس و ڕۆمەکان بکەن، لە بەردەم دەسەڵاتدارەکانتاندا دەوەستن لە کاتێکدا ئەوان دانیشتوون، (ئاوا مەکەن بەڵکو) چاو لە پێشنوێژەکەتان بکەن، ئەگەر بە وەستان نوێژی کرد، ئێوەش بە وەستانەوە نوێژ بکەن، وە ئەگەر بە دانیشتن نوێژی کرد، ئێوەش بە دانیشتنەوە نوێژ بکەن.

## دەربارەی: ئەگەر کەسێك باوێشکی هات با دەستی لەسەر دەمی دابنێ

٨١٦- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَضَعْ يَدَهُ بِفِيهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَدْخُلُ فِيهِ»»[2].

واتە: ئەبو سەعید (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر یەکێکتان باوێشکی هات با دەستی بخاتە سەر دەمی، چونکە شەیتان دەچێتە دەمیەوە.

---

(١) صحيح: «الإرواء» (١٢٢/٢): (مسلم: ٤- كتاب الصلاة، ح ٨٤).

(٢) صحيح: (مسلم: ٥٣- كتاب الزهد والرقائق، ح ٥٧، ٥٨، ٥٩).

٨١٧- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: «إِذَا تَثَاءَبَ فَلْيَضَعْ يَدَهُ عَلَى فِيهِ، فَإِنَّمَا هُوَ مِنَ الشَّيْطَانِ»»(١).

**واته: له ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: ئەگەر (کەسێك) باوێشکی هات با دەستی بخاتە سەر دەمی، چونکە ئەو باوێشکە تەنها لە شەیتانەوەیە.**

٨١٨- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيُمْسِكْ عَلَى فِيهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَدْخُلُهُ»»(٢).

**واته: ئەبو سەعیدی خودری (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر یەکێکتان باوێشکی هات با دەمی بگرێ (دەست بخاتە سەر دەمی)، چونکە شەیتان دەڕواتە دەمیەوە.**

## دەربارەی: ئایا هیچ کەسێك سەری کەسێکی دیکە دەڕوانێ؟

٨١٩- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَدْخُلُ عَلَى أُمِّ حَرَامٍ ابْنَةِ مِلْحَانَ، فَتُطْعِمُهُ، وَكَانَتْ تَحْتَ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، فَأَطْعَمَتْهُ وَجَعَلَتْ تَفْلِي رَأْسَهُ، فَنَامَ ثُمَّ اسْتَيْقَظَ يَضْحَكُ»(٣).

**واته: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەچوو بۆ لای ئوممو حەرامی کچی میلحان، ئەویش خواردنی بە پێغەمبەر دەدا، کە خێزانی عوبادەی کوڕی صامیت بوو، جا (ڕۆژێکیان) خواردنی بە پێغەمبەر ﷺ داو ناو سەری پێغەمبەری دەڕوانی، ئنجا خەوت، پاشان کە لە خەو هەڵسا پێدەکەنی.**

٨٢٠- «عَنْ قَيْسِ بْنِ عَاصِمٍ السَّعْدِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: هَذَا سَيِّدُ أَهْلِ الْوَبَرِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا الْمَالُ الَّذِي لَيْسَ عَلَيَّ فِيهِ تَبِعَةٌ مِنْ طَالِبٍ، وَلَا مِنْ ضَيْفٍ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نِعْمَ الْمَالُ أَرْبَعُونَ، وَالْأَكْثَرُ سِتُّونَ، وَوَيْلٌ لِأَصْحَابِ الْمِئِينَ إِلَّا مَنْ أَعْطَى الْكَرِيمَةَ، وَمَنَحَ الْغَزِيرَةَ، وَنَحَرَ السَّمِينَةَ، فَأَكَلَ وَأَطْعَمَ الْقَانِعَ وَالْمُعْتَرَّ» ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا أَكْرَمُ هَذِهِ الْأَخْلَاقِ، لَا يُحَلُّ بِوَادٍ أَنَا فِيهِ مِنْ كَثْرَةِ نَعَمِي؟ فَقَالَ: «كَيْفَ تَصْنَعُ بِالْعَطِيَّةِ؟» قُلْتُ: أُعْطِي

---

(١) صحيح الإسناد موقوفاً.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح: «صحيح أبي داود» (٢٢٤٩-٢٢٥٠): (البخاري: ٥٦- كتاب الجهاد، ٣- ب الدعاء بالجهاد والشهادة للرجال والنساء. مسلم: ٣٣- كتاب الإمارة، ح ١٦٠، ١٦١، ١٦٢).

الْبِكْرَ، وَأُعْطِي النَّابَ، قَالَ: «كَيْفَ تَصْنَعُ فِي الْمَنِيحَةِ؟» قَالَ: إِنِّي لَأَمْنَحُ النَّاقَةَ، قَالَ: «كَيْفَ تَصْنَعُ فِي الطَّرُوقَةِ؟» قَالَ: يَغْدُو النَّاسُ بِحِبَالِهِمْ، وَلَا يُوزَعُ رَجُلٌ مِنْ جَمَلٍ يَخْتَطِمُهُ، فَيُمْسِكُهُ مَا بَدَا لَهُ، حَتَّى يَكُونَ هُوَ يَرُدَّهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «فَمَالُكَ أَحَبُّ إِلَيْكَ أَمْ مَالُ مَوَالِيكَ؟» قَالَ: مَالِي، قَالَ: «فَإِنَّمَا لَكَ مِنْ مَالِكَ مَا أَكَلْتَ فَأَفْنَيْتَ، أَوْ أَعْطَيْتَ فَأَمْضَيْتَ، وَسَائِرُهُ لِمَوَالِيكَ»، فَقُلْتُ: لَا جَرَمَ، لَئِنْ رَجَعْتُ لَأُقِلَّنَّ عَدَدَهَا فَلَمَّا حَضَرَهُ الْمَوْتُ جَمَعَ بَنِيهِ فَقَالَ: يَا بَنِيَّ، خُذُوا عَنِّي، فَإِنَّكُمْ لَنْ تَأْخُذُوا عَنْ أَحَدٍ هُوَ أَنْصَحُ لَكُمْ مِنِّي: لَا تَنُوحُوا عَلَيَّ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يُنَحْ عَلَيْهِ، وَقَدْ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَنْهَى عَنِ النِّيَاحَةِ، وَكَفِّنُونِي فِي ثِيَابِي الَّتِي كُنْتُ أُصَلِّي فِيهَا، وَسَوِّدُوا أَكَابِرَكُمْ، فَإِنَّكُمْ إِذَا سَوَّدْتُمْ أَكَابِرَكُمْ لَمْ يَزَلْ لِأَبِيكُمْ فِيكُمْ خَلِيفَةٌ، وَإِذَا سَوَّدْتُمْ أَصَاغِرَكُمْ هَانَ أَكَابِرُكُمْ عَلَى النَّاسِ، وزهدوا فيكم وَأَصْلِحُوا عَيْشَكُمْ، فَإِنَّ فِيهِ غِنًى عَنْ طَلَبِ النَّاسِ، وَإِيَّاكُمْ وَالْمَسْأَلَةَ، فَإِنَّهَا آخِرُ كَسْبِ الْمَرْءِ، وَإِذَا دَفَنْتُمُونِي فَسَوُّوا عَلَيَّ قَبْرِي، فَإِنَّهُ كَانَ يَكُونُ شَيْءٌ بَيْنِي وَبَيْنَ هَذَا الْحَيِّ مِنْ بَكْرِ بْنِ وَائِلٍ: خُمَاشَاتٌ، فَلَا آمَنُ سَفِيهاً أَنْ يَأْتِيَ أَمْراً يُدْخِلُ عَلَيْكُمْ عَيْباً فِي دِينِكُمْ»[1].

واتە: قەیسی کوڕی عاصمی سەعدی (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەمە گەورەی دەشتنشینانە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ماڵ و سامانە چیە کە بەرپرسیاریەتی هیچ داواکارو میوانێکم لەسەر نیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چاکترین ماڵ و سامان چلە، وە زۆریەکەی شەستە، هاوار بۆ ئەوانەی خاوەنی سەدان (ئاژەڵ و دینار و دۆلار)ن، مەگەر کەسێك بە چاکی لێی ببەخشێ و شیری ئاژەڵی بدات بە خەڵك و، وشتری قەڵەو سەرببڕێ و خۆی لێی بخوات و بیدات بە داواکاران و هەژاران، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئای چەندە جوانە ئەو ڕەوشتە، (کەس) نایەت بۆ دۆڵێك (ئاژەڵەکانی بلەوەڕێنێ) کە منی لێ بێ لەبەر زۆری ئاژەڵەکانم (واتە: ئاژەڵی زۆر زیاترم هەیە لەوەی تۆ دەفەرمووی و باسی دەکەی)، فەرمووی: چۆن دەیبەخشی؟ گوتم: وشتری تازە پێگەیشتوو دەبەخشم، وە وشتری گەورەو بە تەمەنیش دەبەخشم، فەرمووی: ئایا چۆن مامەڵە لەگەڵ وشتری شیردەر دەکەی؟ گوتی: من وشتری شیردەر دەبەخشم بۆ ئەوەی خەڵکی سوود لە شیرەکەی وەربگرن، فەرمووی: چۆن مامەڵە بە وشتری نێرە دەکەی؟ گوتی: خەڵکی بەیانی دەکەنەوە پێیان دەدەم لەگەڵ گوریسەکانی ملیان، ڕێگریش ناکەم لەو کەسەی چ وشترێکی دەوێ، ئەوەندەی پێویستە لای بمێنێتەوە، هەتا خۆی بۆم دێنێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ماڵەکەت لە لات خۆشەویستترە یان خزمەتکارەکانت؟ گوتی: ماڵەکەم، فەرمووی: ئەوە هی تۆیە لە ماڵەکەت کە دەیخۆی و نامێنێ، یان دەیبەخشی و دەڕوات، ئەوەش دەمێنێ بۆ خزمەتکارەکانتە؟ گوتی: بێگومان وایە، کاتێ گەڕامەوە ژمارەیان کەم دەکەمەوە، کاتێ سەرەمەرگی نزیك بوویەوە منداڵەکانی کۆکردەوە، گوتی: ئەی منداڵەکانم، ماڵ و سامانم لێ

---

(١) صحيح لغيره: (ابن حبان في ترجمة زياد بن أبي زياد ، والحاكم في «المستدرك» (٦١٢/٣).

ببەن، بێگومان ئێوە لە هیچ کەسێك ئامۆژگاری وەرناگرن لە من چاکتربێ بۆتان: شیوەن مەکەن بەسەرمدا، چونکە پێغەمبەر ﷺ شیوەن نەکرا بەسەریدا، بیستم پێغەمبەر ﷺ ڕێگری دەکرد لە شیوەن کردن، وە بەو پۆشاکەوە کفنم بکەن کە نوێژم پێی دەکرد، برا گەورەتان بکەن بە گەورەو دەم ڕاستی خۆتان، بەردەوام با باوکتان جێنیشینی هەبێ، ئەگەر بچوکەکانتان کرد بە گەورەو دەم ڕاستی خۆتان، گەورەکانتان لە پێش چاوی خەڵکی بە کەم تەماشا دەکرێن، خەڵکیشتان لێ دووردەبێتەوە، وە کاروباری ژیانتان چاك بکەن (واتە: وشترەکانتان جوان بە خێو بکەن، یان کارو پیشەیەك بۆ خۆتان دابین بکەن)، چونکە ئەوە واتان لێ دەکات پێویستیتان بە خەڵکی نەبێ، تکایە هەرگیز داوا لە کەس مەکەن و سواڵ مەکەن، چونکە ئەوە کۆتا کەسابەتی مرۆڤە، وە کاتێ کە منتان شاردەوە گۆڕەکەم ڕێك بکەنەوە، چونکە لە نێوانی من و ئەو گەڕەکەدا بەکری کوڕی وائیل، دەمەقاڵەیەك و شەڕو کێشە هەبوو، ئەمین نیم لەوەی نەفامێك لەوان هەڵەیەك بکات ئێوەش کارێك بکەن ئاینەکەتان لەکەدار بێ.

## دەربارەی: سەر جوڵاندن و لێو گەستن لە کاتی سەرسوڕماندا

٨٢١- «عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الصَّامِتِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: سَأَلْتُ خَلِيلِي أَبَا ذَرٍّ، فَقَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ بِوَضُوءٍ، فَحَرَّكَ رَأْسَهُ، وَعَضَّ عَلَى شَفَتَيْهِ، قُلْتُ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي آذَيْتُكَ؟ قَالَ: لَا، وَلَكِنَّكَ تُدْرِكُ أُمَرَاءَ أَوْ أَئِمَّةً يُؤَخِّرُونَ الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا، قُلْتُ: فَمَا تَأْمُرُنِي؟ قَالَ: «صَلِّ الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا، فَإِنْ أَدْرَكْتَ مَعَهُمْ فَصَلِّهِ، وَلَا تَقُولَنَّ: صَلَّيْتُ، فَلَا أُصَلِّي»»[1].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی صامیت (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: داوام لە ئەبو زەڕی خۆشەویستم کرد (تا فەرموودەیەکی پێغەمبەرم ﷺ بۆ بگێڕێتەوە)، ئەویش گوتی: چووم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ بە ئاوی دەستنوێژەوە، جا سەری جوڵاندەوەو لێوی خۆی گەست، گوتم: بە باوك و دایکمەوە بە قوربانت بم ئایا ئازارم دای؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵام (بۆ حاڵی تۆ وا دەکەم) دەگەی بە کۆمەڵە بەرپرسێك، یان پێشنوێژکەرانێك، نوێژەکانیان لە کاتی خۆی دوادەخەن، گوتم: جا بە چی فەرمانم پێ دەکەی؟ فەرمووی: نوێژ لە کاتی خۆیدا ئەنجام بدە (تۆ دوای مەخە)، جا ئەگەر بە نوێژی ئەوانیش ڕاگەیشتی ئەوە نوێژەکە دووبارە بکەرەوەو مەڵێ: نوێژم کردووەو نوێژ ناکەم.

---

(١) صحيح: «الإرواء» (٤٨٣): (مسلم: ٥- ك المساجد ، ح ٢٣٨، ٢٣٩).

## دەربارەی: دەست لە چۆکی خۆدان لە کاتی سەرسامی، یان بۆ شتێك

٨٢٢- «عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ طَرَقَهُ وَفَاطِمَةَ بِنْتَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «أَلَا تُصَلُّونَ؟»، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّمَا أَنْفُسُنَا عِنْدَ اللَّهِ، فَإِذَا شَاءَ أَنْ يَبْعَثَنَا بَعَثَنَا، فَانْصَرَفَ النَّبِيُّ ﷺ، وَلَمْ يَرْجِعْ إِلَيَّ شَيْئًا، ثُمَّ سَمِعْتُ وَهُوَ مُدْبِرٌ يَضْرِبُ فَخِذَهُ يَقُولُ: ﴿وَكَانَ الإِنسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلاً ﴿٥٤﴾﴾الكهف»[1].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب (خوا لێی ڕازی بێ) (گوتوویەتی): پێغەمبەر ﷺ لە دەرگای ماڵی ئەوو فاتیمەی کچی داو فەرمووی: ئایا نوێژ ناکەن؟ (عەلی دەڵێ:) گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، گیانی ئێمە بە دەستی خوایە، جا ئەگەر ویستی خەبەرمان بکاتەوە ئەوە هەڵدەستین، ئیدی پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت و هیچ وەڵامێکی نەدامەوە، پاشان گوێم لێبوو کە پشتی هەڵکردو ڕۆیشت لە ڕانی خۆی دەداو دەیفەرموو: ﴿وَكَانَ الإِنسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلاً ﴿٥٤﴾﴾الكهف، (واتە: بەڵام هەمیشە ئینسان لە هەموو شتێك زیاتر موجادەلە دەکات).

٨٢٣- «عَنْ أَبِي رَزِينٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: رَأَيْتُهُ يَضْرِبُ جَبْهَتَهُ بِيَدِهِ وَيَقُولُ: يَا أَهْلَ الْعِرَاقِ، أَتَزْعُمُونَ أَنِّي أَكْذِبُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، أَيَكُونُ لَكُمُ الْمَهْنَأُ وَعَلَيَّ الْمَأْثَمُ؟ أَشْهَدُ لَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا انْقَطَعَ شِسْعُ نَعْلِ أَحَدِكُمْ، فَلَا يَمْشِي فِي نَعْلِهِ الْأُخْرَى حَتَّى يُصْلِحَهُ»»[2].

واتە: ئەبو ڕەزین لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: بینیم ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، بە دەستی لە نێو چاوانی خۆی دەدا، دەیگوت: ئەی خەڵکی عێراق ئایا وا گومان دەبەن من درۆ بە دەم پێغەمبەرەوە ﷺ دەکەم، ئایا بەهەشت بۆ ئێوە بێ و، گوناهیش لەسەر من؟! (واتە: مەگەر ئەوەندە ناحاڵیم چۆن ئێوە بەرەو بەهەشت دەبەم خۆشم بە گوناهەوە بەرەو دۆزەخم دەچم!)، شایەتی دەدەم بیستوومە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ئەگەر قەیتانی نەعلی یەکێکتان پچڕا، ئەوە با بە یەك تاك نەعلەکەیتر نەڕوات تاوەکو چاکی دەکاتەوە.

## دەربارەی: کاتێ کەسێك لە ڕانی براکەی بدات و مەبەستی خراپ نەبێ

٨٢٤- «عَنْ أَبِي الْعَالِيَةِ قَالَ: مَرَّ بِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ الصَّامِتِ، فَأَلْقَيْتُ لَهُ كُرْسِيًّا، فَجَلَسَ، فَقُلْتُ لَهُ: إِنَّ ابْنَ زِيَادٍ قَدْ أَخَّرَ الصَّلَاةَ، فَمَا تَأْمُرُ؟ فَضَرَبَ فَخِذِي ضَرْبَةً «أَحْسَبُهُ قَالَ: حَتَّى أَثَّرَ فِيهَا»، ثُمَّ قَالَ: سَأَلْتُ

---

(١) صحيح: «صحيح ابن خزيمة» (١١٤٠)، (البخاري: ١٩- كتاب التهجد ، ٥- باب تحريض النبي ﷺ على صلاة الليل. مسلم: ٦- كتاب صلاة المسافرين، ح ٢٠٦).

(٢) صحيح: «تخريج المشكاة» (٤١٢/ التحقيق الثاني)، (مسلم: ٣٧- كتاب اللباس والزينة، ح ٣٩).

أَبَا ذَرٍّ كَمَا سَأَلْتَنِي، فَضَرَبَ فَخِذِي كَمَا ضَرَبْتُ فَخِذَكَ، فَقَالَ: صَلِّ الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا، فَإِنْ أَدْرَكْتَ مَعَهُمْ فَصَلِّ، وَلَا تَقُلْ: قَدْ صَلَّيْتُ، فَلَا أُصَلِّي»[١].

واتە: ئەبو عالیە دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی صامیت تێپەڕی بەلامدا، منیش کورسیەکم بۆ داناو، دانیشت، جا پێم گوت: ئیبن زیاد نوێژ دوا دەخات، فەرمان بە چی دەکەیت (لەو حاڵەتەدا چی بکەین)؟ جا جارێك دای لە ڕانم «پێم وابوو گوتی: هەتا ئێشی پێگەیاندم»، پاشان گوتی: پرسیارم لە ئەبو زەڕ کرد، وەکو چۆن تۆ پرسیارت لێکردم، جا ئەویش کێشای بە ڕانم وەکو چۆن من کێشام بە ڕانت، وە گوتی: نوێژ لە کاتی خۆیدا ئەنجام بدە، جا ئەگەر گەیشتی بە نوێژی ئەوان ئەوە نوێژ بکە، مەڵی نوێژم کردوەو نوێژ ناکەم (با جیاوازی دروست نەبێ).

٨٢٥- «عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ أَخْبَرَهُ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، انْطَلَقَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي رَهْطٍ مِنْ أَصْحَابِهِ قِبَلَ ابْنِ صَيَّادٍ، حَتَّى وَجَدُوهُ يَلْعَبُ مَعَ الْغِلْمَانِ فِي أُطُمِ بَنِي مَغَالَةَ، وَقَدْ قَارَبَ ابْنُ صَيَّادٍ يَوْمَئِذٍ الْحُلُمَ، فَلَمْ يَشْعُرْ حَتَّى ضَرَبَ النَّبِيُّ ﷺ ظَهْرَهُ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَالَ: «أَتَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ؟» فَنَظَرَ إِلَيْهِ فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ الْأُمِّيِّينَ، قَالَ ابْنُ صَيَّادٍ: فَتَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ؟ فَرَصَّهُ النَّبِيُّ ﷺ ثُمَّ قَالَ: «آمَنْتُ بِاللَّهِ وَبِرَسُولِهِ»، ثُمَّ قَالَ لِابْنِ صَيَّادٍ: «مَاذَا تَرَى؟» فَقَالَ ابْنُ صَيَّادٍ: يَأْتِينِي صَادِقٌ وَكَاذِبٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «خُلِّطَ عَلَيْكَ الْأَمْرُ»، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنِّي خَبَّأْتُ لَكَ خَبِيئًا»، قَالَ: هُوَ الدُّخُّ، قَالَ: «اخْسَأْ فَلَمْ تَعْدُ قَدْرَكَ»، قَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتَأْذَنُ لِي فِيهِ أَنْ أَضْرِبَ عُنُقَهُ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنْ يَكُ هُوَ لَا تُسَلَّطُ عَلَيْهِ، وَإِنْ لَمْ يَكُ هُوَ فَلَا خَيْرَ لَكَ فِي قَتْلِهِ»»[٢].

واتە: سالیمی کوڕی عەبدوڵلا دەگێڕێتەوە، کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر هەواڵی پێداوە (گوتوویەتی): عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ)، لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ و کۆمەڵێك لە هاوەڵان ڕۆیشت بە لای ئیبنو صەیاددا، تاوەکو بینیان لەگەڵ منداڵەکاندا یاری دەکرد، لە نێو شوڕەی بەنی مەغالە، ئەو کاتە ئیبنو صەیاد نزیك باڵغ بوون بوو، جا هەستی (بە هیچ) نەکرد، هەتا پێغەمبەر ﷺ بە دەستی لە پشتیدا، پاشان فەرمووی: ئایا شایەتی دەدەی من پێغەمبەری خوام؟ ئەویش تەماشای کردو گوتی: شایەتی دەدەم تۆ پێغەمبەری نەخوێندەوارەکانی (واتە: تەنها پێغەمبەری عەرەبی، قسەکەی ئەوە دەگەیەنێ)، ئیبنو صەیادیش گوتی: تۆش شایەتی دەدەی من پێغەمبەری خوام؟ پێغەمبەر ﷺ گرتی توند گوشی، پاشان فەرمووی: بڕوام بە خواو پێغەمبەرەکەی هێنا، پاشان بە ئیبنو صەیادی فەرموو: چی دەبینی (لە کاروباری غەیب)؟ ئیبنو صەیاد گوتی: ڕاستگۆ و درۆزن دێن بۆ لام، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بابەتەکەت بەسەر تێکەڵ و پێکەڵ کراوە (سەریان لێ شێواندووی)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من شتێکم لە نەفسی خۆمدا

---

(١) صحيح: وصحَّ مرفوعاً.

(٢) صحيح.

لێت شاردۆتەوە، (بۆ ئەوەی هەواڵم پێ بدەی و تاقیت بکەمەوە بزانم دەزانی شتەکە چیە، شتەکەش ئەوە بوو سورەتی دوخانی بۆ دابەزی بوو) جا ئیبنو صەییاد گوتی: شتەکە (الدُّخ)ـە (نیوەی زانی و نیوەشی نەزانی)، پێغەمبەریش فەرمووی: بێ دەنگبە سنووری خۆتت تێنەپەڕاند (نەتتوانی غەیب بزانی)، جا عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتم دەدەی لە گەردنی بدەم؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئەوە ئەو بێ (واتە: ئەگەر دەججال بێ) کەس بەسەریدا زاڵ نابێ (تا پێغەمبەر عیسا دێتە خوارەوەو دەیکوژێ)، ئەگەر ئەویش نەبێ هیچ سوودی بۆت نابێ لە کوشتنیدا (چونکە جوولەکەی خاوەن پەیمانی ئێمەن بۆمان دروست نیە بیانکوژین).

٨٢٦- «قَالَ سَالِمٌ: فَسَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: انْطَلَقَ بَعْدَ ذَلِكَ النَّبِيُّ ﷺ هُوَ وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ الْأَنْصَارِيُّ يَوْماً إِلَى النَّخْلِ الَّتِي فِيهَا ابْنُ صَيَّادٍ، حَتَّى إِذَا دَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ طَفِقَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَّقِي بِجُذُوعِ النَّخْلِ، وَهُوَ يَسْمَعُ مِنِ ابْنِ صَيَّادٍ شَيْئاً قَبْلَ أَنْ يَرَاهُ، وَابْنُ صَيَّادٍ مُضْطَجِعٌ عَلَى فِرَاشِهِ فِي قَطِيفَةٍ لَهُ فِيهَا زَمْزَمَةٌ[١]، فَرَأَتْ أُمُّ ابْنِ صَيَّادٍ النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ يَتَّقِي بِجُذُوعِ النَّخْلِ، فَقَالَتْ لِابْنِ صَيَّادٍ: أَيْ صَافُ «وَهُوَ اسْمُهُ» هَذَا مُحَمَّدٌ، فَتَنَاهَى ابْنُ صَيَّادٍ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَوْ تَرَكَتْهُ لَبَيَّنَ»»[٢].

واتە: سالم دەڵێ: بیستم عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەیگوت: دوای ئەوە ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺو ئوبەی کوڕی کەعبی ئەنصاری ڕۆیشتن بۆ نێو ئەو دارخورمایانەی ئیبنو صەییادی تێدا بوو، تاوەکو پێغەمبەر ﷺ چووە نێویەوەو خۆی لە پشت دارخورماکان شاردەوە، (ئەوەندە نزیك بوویەوە لێی) تاوەکو شتێکی لە ئیبنو صەییادەوە دەبیست پێش ئەوەی لێی دەربکەوێ، ئیبنو صەیادیش پاڵکەوتبوو لەسەر جێگاکەی کە لۆکە بوو، دەنگێکی لێوە دەهات لێی تێدەگەیشتی و لێی تێنەدەگەیشتی، جا دایکی ئیبنو صەییاد پێغەمبەری ﷺ بینی کە خۆی دەشاردەوە لە پشت قەدە دارخورماکان، جا بە ئیبنو صەییادی گوتی: ئەی صاف « کە ئەوە ناوەکەی بوو» ئەوە موحەممەدە، ئیبنو صیەیادیش کۆتایی بە قسەکەی هێنا (بێ دەنگ بوو)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر دایکی وازی لێ بهێنایە (ئەوەی لە ناخیدا بوو دەریدەخست) حاڵی ڕوون دەبوویەوە.

٨٢٧- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): قَامَ النَّبِيُّ ﷺ فِي النَّاسِ، فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ ذَكَرَ الدَّجَّالَ فَقَالَ: «إِنِّي أُنْذِرُكُمُوهُ، وَمَا مِنْ نَبِيٍّ إِلَّا وَقَدْ أَنْذَرَ قَوْمَهُ، لَقَدْ أَنْذَرَ نُوحٌ قَوْمَهُ، وَلَكِنْ سَأَقُولُ لَكُمْ فِيهِ قَوْلاً لَمْ يَقُلْهُ نَبِيٌّ لِقَوْمِهِ: تَعْلَمُونَ أَنَّهُ أَعْوَرُ، وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِأَعْوَرَ»»[٣].

---

(١) (زمزمة): أي صوت خفي لا يكاد يُفهم أو لا يُفهم.

(٢) صحيح: (البخاري: ٢٣- كتاب الجنائز، ٧٩- باب إذا أسمل الصبي فمات هل يصلي عليه؟ مسلم: ٥٢، كتاب الفتن وأشراط الساعة، ح ٩٥).

(٣) صحيح: (البخاري: ٢٣- كتاب الجنائز، ٧٩- باب إذا أسمل الصبي فمات هل يصلي عليه؟ مسلم: ٥٢، كتاب الفتن وأشراط الساعة، ح ٩٥).

واتە: عەبدوڵلا (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە نێو خەڵكدا هەڵساو ستایشی خوای كرد بەوەی شایستەیەتی، پاشان باسی دەججالی كرد، فەرمووی: من ئاگادارتان دەكەمەوە لێی، وە هیچ پێغەمبەرێك نەهاتوە حەتمەن گەلەكەی لێی ئاگادار كردۆتەوە، بە دڵنیایی نووح گەلەكەی ئاگادار كردۆتەوە، بەڵام من شتێكتان پێ دەڵێم لە بارەیەوە هیچ پێغەمبەرێك بە گەلەكەی نەگوتووە: ئەو چاوێكی كوێرە، بەڵام خوا كوێر نیە (واتە: بە نیشانەی عەیب و كەم و كوڕیی بزانن ئەوە نە پێغەمبەرە، نە خوایە، پاكە و بێگەردی بۆ خوا).

٨٢٨- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا كَانَ جُنُباً، يَصُبُّ عَلَى رَأْسِهِ ثَلَاثَ حَفَنَاتٍ مِنْ مَاءٍ قَالَ الْحَسَنُ بْنُ مُحَمَّدٍ: أَبَا عَبْدِ اللَّهِ، إِنَّ شَعْرِي أَكْثَرُ مِنْ ذَاكَ، قَالَ: وَضَرَبَ بِيَدِهِ عَلَى فَخِذِ الْحَسَنِ فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي، كَانَ شَعْرُ النَّبِيِّ ﷺ أَكْثَرَ مِنْ شَعْرِكَ وَأَطْيَبَ»[1].

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ كاتێ لەشی گران بووایە سێ مشت ئاوی بەسەریدا دەكرد، حەسەنی كوڕی موحەممەد گوتی: ئەی ئەبو عەبدوڵلا من قژم لەوە زیاترە، گوتی: بە دەستی دای لە ڕانی حەسەن و گوتی: ئەی برازام! قژی پێغەمبەر ﷺ لە قژی تۆ زۆرترو چڕو پڕتر بوو.

## دەربارەی: ئەو كەسەی پێی ناخۆش بووە ئەو دابنیشێ و خەڵك بۆی بوەستن

٨٢٩- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: صُرِعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ فَرَسٍ بِالْمَدِينَةِ عَلَى جِذْعِ نَخْلَةٍ، فَانْفَكَّتْ قَدَمُهُ، فَكُنَّا نَعُودُهُ فِي مَشْرُبَةٍ لِعَائِشَةَ، فَأَتَيْنَاهُ وَهُوَ يُصَلِّي قَاعِداً، فَصَلَّيْنَا قِيَاماً، ثُمَّ أَتَيْنَاهُ مَرَّةً أُخْرَى وَهُوَ يُصَلِّي الْمَكْتُوبَةَ قَاعِداً، فَصَلَّيْنَا خَلْفَهُ قِيَاماً، فَأَوْمَأَ إِلَيْنَا أَنِ اقْعُدُوا، فَلَمَّا قَضَى الصَّلَاةَ قَالَ: «إِذَا صَلَّى الْإِمَامُ قَاعِداً فَصَلُّوا قُعُوداً، وَإِذَا صَلَّى قَائِماً فَصَلُّوا قِيَاماً، وَلَا تَقُومُوا وَالْإِمَامُ قَاعِدٌ كَمَا تَفْعَلُ فَارِسُ بِعُظَمَائِهِمْ»»[2].

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەسپێك كەوتە خوارەوە بەسەر بنی دارخورمایەك لە مەدینەدا، جا ئێسكی قاچی دەرچوو، ئێمەش سەردانیمان دەكرد لە ژوورەكەی عائیشە، جا كە هاتین بۆ لای بە دانیشتنەوە نوێژی دەكرد، ئێمەش بە پێوە نوێژمان لەگەڵی كرد، پاشان جارێكی دیكە هاتین بۆ لای بە دانیشتنەوە نوێژی فەرزی دەكرد، ئێمەش لە پشتیەوە نوێژمان كرد بە پێوە، ئاماژەی بۆ كردین دانیشن، جا كاتێ لە نوێژ تەواو بوو، فەرمووی: ئەگەر ئیمام بە دانیشتنەوە نوێژی كرد ئێوەش بە دانیشتنەوە نوێژ بكەن، ئەگەر بە پێوە نوێژی كرد

---

(١) صحيح الإسناد: (البخاري: ٥- كتاب الغسل، ٣- باب الغسل بالصاع ونحوه. مسلم: ٣- كتاب الحيض، ح ٥٧).

(٢) صحيح: «الإرواء» (٢/ ١٢٢)، «صحيح أبي داود» (٦١٥)، (انظر المسند (٣: ٣٠٠) الطبعة الأولى).

ئێوەش بە پێوە نوێژ بکەن، وە بە پێوە نوێژ مەکەن لە کاتێکدا ئیمام دانیشتبێ وەك چۆن فارس لەگەڵ گەورەکانیاندا دەیکەن.

٨٣٠- «قَالَ: وَوُلِدَ لِفُلَانٍ مِنَ الْأَنْصَارِ غُلَامٌ، فَسَمَّاهُ مُحَمَّداً، فَقَالَتِ الْأَنْصَارُ: لَا نُكَنِّيكَ بِرَسُولِ اللَّهِ، حَتَّى قَعَدْنَا فِي الطَّرِيقِ نَسْأَلُهُ عَنِ السَّاعَةِ، فَقَالَ: «جِئْتُمُونِي تَسْأَلُونِي عَنِ السَّاعَةِ؟» قُلْنَا: نَعَمْ، قَالَ: «مَا مِنْ نَفْسٍ مَنْفُوسَةٍ، يَأْتِي عَلَيْهَا مِائَةُ سَنَةٍ»»[١].

واتە: (جابر) (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: فڵانکەس لە ئەنصارەکان منداڵێکی بوو ناوی لێنا موحەممەد، جا ئەنصارەکان گوتیان: بە نازناوی پێغەمبەر ﷺ بانگت ناکەین، هەتا لەسەر ڕێگە دانیشتین پرسیارمان (لە پێغەمبەر ﷺ) کرد لەبارەی تێکچوونی دونیا، ئەویش فەرمووی: هاتوون بۆ لام پرسیاری تێکچوونی دونیام لێ دەکەن؟ گوتمان: بەڵێ، فەرمووی: هیچ کەسێك نیە (لەم سەردەمەدا) گیانی لەبەردا بێ سەد ساڵ بەسەریدا تێپەڕ ببێ (واتە: بێگومان ناگاتە سەد ساڵ گشت مرۆڤەکان دەمرن و قیامەتیان دادێ، چونکە هەر کەس مرد، ئیدی قیامەتی هاتوە)، گوتمان: فڵانە کەس لە ئەنصارەکان منداڵێکی بووەو ناوی ناوە موحەممەد، ئەنصارەکانیش گوتیان: بە نازناوی پێغەمبەر ﷺ بانگت ناکەین، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئەنصارەکان چاکیان کردوە، ناو بنێن بە ناوی منەوە، بەڵام نازناو دامەنێن بە نازناوی منەوە.

تێبینی: کەواتە کارەکەی کابرا تەواو بووە، چونکە ناوی منداڵەکەی ناوە بە ناوی پێغەمبەرەوە، نەك ناوی نابێ بە نازناوی پێغەمبەر، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیە دەستخۆشی لە ئەنصارەکان کردوە، چونکە زانیویانە نازناو دانان وەك نازناوی پێغەمبەر ﷺ دروست نیەو ڕازی نەبوون دانی پێدا بنێن، بەڵام نەیانزانیوە ناو دانان بە ناوەکەی دروستە، واللّه أعلم.

٨٣١- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ فِي السُّوقِ دَاخِلاً مِنْ بَعْضِ الْعَالِيَةِ وَالنَّاسُ كَنَفَيْهِ، فَمَرَّ بِجَدْيٍ أَسَكَّ، فَتَنَاوَلَهُ فَأَخَذَ بِأُذُنِهِ ثُمَّ قَالَ: «أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنَّ هَذَا لَهُ بِدِرْهَمٍ؟» فَقَالُوا: مَا نُحِبُّ أَنَّهُ لَنَا بِشَيْءٍ، وَمَا نَصْنَعُ بِهِ؟ قَالَ: «أَتُحِبُّونَ أَنَّهُ لَكُمْ؟» قَالُوا: لَا، قَالَ ذَلِكَ لَهُمْ ثَلَاثاً، فَقَالُوا: لَا وَاللَّهِ، لَوْ كَانَ حَيّاً لَكَانَ عَيْباً فِيهِ أَنَّهُ أَسَكُّ «وَالْأَسَكُّ: الَّذِي لَيْسَ لَهُ أُذُنَانِ» فَكَيْفَ وَهُوَ مَيِّتٌ؟ قَالَ: «فَوَاللَّهِ، لَلدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَى اللَّهِ مِنْ هَذَا عَلَيْكُمْ»»[٢].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی بە نێو هەندێ لە بەرزاییەکانی مەدینەدا خەڵکەکەش لە تەنیشتی بوون (شوێنەکە، شوێنی

---

(١) صحيح: (البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ١٠٥- باب: أحب الأسماء إلى الله عز وجل ، ١٠٦- باب: قول النبي ﷺ سموا باسمي ولا تكنوا بكنيتي. مسلم: ٣٨- كتاب الآداب، ح ٣- ٧).

(٢) صحيح: «صحيح أبي داود» (١٨١)، «التعليق الرغيب» (٤/ ١٠١)، (مسلم: ٥٣- الزهد، ح ٢).

كڕین و فرۆشتنی ئاژەڵەكان بوو، چوار میل لە مەدینەوە دوور بوو)، جا تێپەڕی بە لای بێچووە بزنێكی مردارەوەبوو، كە گوێچكەی زۆر بچووك بوو، یان بڕا بوو، دەستی بردو گوێی گرت، پاشان فەرمووی: كێ لە ئێوە حەز دەكات ئەمە بۆ ئەو بێ بە درەمێك؟ گوتیان: حەز ناكەین ئەوە بۆ ئێمە بێ بە هیچ شتێك، چی لێ بكەین؟ فەرمووی: حەز دەكەن ئەوە بۆ ئێوە بێ (بێ بەرانبەر)؟ گوتیان نەخێر، سێ جار ئەوەی فەرموو، ئەوانیش گوتیان: نا سوێند بە خوا، ئەگەر زیندوویش بووایە عەیبدارە چونكە ئەسەككە، «ئەسەككیش بریتیە لەوەی كە گوێچكەی نیە (چونكە بڕاوە)»، ئەی ئەگەر مردارەوەبوو بێ؟ (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: سوێند بە خوا دونیا لای خوا زۆر كەم و بێ نرخترە لەو كاریلەیە لای ئێوە.

٨٣٢- «عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ كَانَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي حَائِطٍ مِنْ حِيطَانِ الْمَدِينَةِ، وَفِي يَدِ النَّبِيِّ ﷺ عُودٌ يَضْرِبُ بِهِ مِنَ الْمَاءِ وَالطِّينِ، فَجَاءَ رَجُلٌ يَسْتَفْتِحُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «افْتَحْ لَهُ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ» فَذَهَبَ، فَإِذَا أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، فَفَتَحْتُ لَهُ، وَبَشَّرْتُهُ بِالْجَنَّةِ. ثُمَّ اسْتَفْتَحَ رَجُلٌ آخَرُ، فَقَالَ: «افْتَحْ لَهُ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ» ثُمَّ اسْتَفْتَحَ رَجُلٌ آخَرُ، فَقَالَ: افْتَحْ لَهُ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ، فَإِذَا عُمَرُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، فَفَتَحْتُ لَهُ، وَبَشَّرْتُهُ بِالْجَنَّةِ. ثُمَّ اسْتَفْتَحَ رَجُلٌ آخَرُ «وَكَانَ مُتَّكِئاً فَجَلَسَ» وَقَالَ: «افْتَحْ لَهُ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ عَلَى بَلْوَى تُصِيبُهُ، أَوْ تَكُونُ» فَذَهَبْتُ، فَإِذَا عُثْمَانُ، فَفَتَحْتُ لَهُ، فَأَخْبَرْتُهُ بِالَّذِي قَالَ، قَالَ: اللَّهُ الْمُسْتَعَانُ»[1].

واتە: ئەبو مووسا (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، ئەو لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بوو لە باخێك لە باخەكانی مەدینەدا، پێغەمبەریش ﷺ دارێكی بە دەستەوە بوو لە ئاو و قوڕەكەی دەدا، جا پیاوێك هات داوای هاتنە ژوورەوەی كرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەرگای بۆ بكەوەو مژدەی بەهەشتی پێ بدە، منیش ڕۆیشتم، جا بینیم ئەبو بەكر بوو، دەرگام بۆ كردەوەو مژدەی بەهەشتم پێدا، پاشان پیاوێكی دیكە داوای هاتنە ژوورەوەی كرد، فەرمووی: دەرگای بۆ بكەوەو مژدەی بەهەشتی پێ بدە، منیش ڕۆیشتم، بینیم عومەر بوو، جا دەرگام بۆی كردەوەو مژدەی بەهەشتم پێدا، پاشان پیاوێكی دیكە داوای هاتنە ژورەوەی كرد، «پێغەمبەریش ﷺ دانیشت لە كاتێكدا پێشتر پاڵكەوتبوو» گوتی: دەرگای بۆ بكەوەو مژدەی بەهەشتی پێ بدە لەسەر بەڵایەك كە تووشی دەبێت، منیش ڕۆیشتم، بینیم عوسمان بوو، جا دەرگام بۆ كردەوەو هەواڵی ئەوەم پێدا كە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی، (ئەویش) گوتی: خوا یارەمەتیدەرە.

---

(١) صحيح: (البخاري: ٦٢- كتاب فضائل أصحاب النبي ﷺ، ٦- باب مناقب عمر بن الخطاب. مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ٢٨).

## دەربارەی: تەوقە كردن لەگەڵ منداڵان

۸۳۳- «عَنْ سَلَمَةَ بْنِ وَرْدَانَ قَالَ: رَأَيْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يُصَافِحُ النَّاسَ، فَسَأَلَنِي: مَنْ أَنْتَ؟ فَقُلْتُ: مَوْلًى لِبَنِي لَيْثٍ، فَمَسَحَ عَلَى رَأْسِي ثَلَاثاً وَقَالَ: بَارَكَ اللَّهُ فِيكَ»[١].

**واتە: سەلەمەی كوڕی وەردان دەڵێ: ئەنەسی كوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) تەوقەی لەگەڵ خەڵكی دەكرد، جا (كە گەیشت بە من) پرسیاری لێكردم: تۆ كێی؟ منیش گوتم: مەولای نەوەكانی لەیسم، جا سێ جار دەستی هێنا بەسەرمداو گوتی: خوا بەرەكەت بخاتە ژیانتەوە.**

## دەربارەی: تەوقە كردن

۸۳٤- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: لَمَّا جَاءَ أَهْلُ الْيَمَنِ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «قَدْ أَقْبَلَ أَهْلُ الْيَمَنِ وَهُمْ أَرَقُّ قُلُوباً مِنْكُمْ»، فَهُمْ أَوَّلُ مَنْ جَاءَ بِالْمُصَافَحَةِ»[٢].

**واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: كاتێ خەڵكی یەمەن هاتن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە خەڵكی یەمەن هاتن، ئەوان دڵیان لە ئێوە ناسكترە، ئەوان یەكەم كەس بوون تەوقەكردنیان هێنا.**

۸۳٥- «عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: مِنْ تَمَامِ التَّحِيَّةِ أَنْ تُصَافِحَ أَخَاكَ»[٣].

**واتە: بەڕائی كوڕی عازیب (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لە تەواوی سڵاوو ڕێزدا ئەوەیە تەوقە لەگەڵ براكەتدا بكەی.**

## دەربارەی: دەست لە مل كردن

۸۳٦- «عَنِ ابْنِ عَقِيلٍ، أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، حَدَّثَهُ، أَنَّهُ بَلَغَهُ حَدِيثٌ عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، فَابْتَعْتُ بَعِيراً فَشَدَدْتُ إِلَيْهِ رَحْلِي شَهْراً، حَتَّى قَدِمْتُ الشَّامَ، فَإِذَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُنَيْسٍ، فَبَعَثْتُ إِلَيْهِ أَنَّ جَابِراً بِالْبَابِ، فَرَجَعَ الرَّسُولُ فَقَالَ: جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَخَرَجَ فَاعْتَنَقَنِي،

---

(١) حسن الإسناد.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٢٧) : (ليس في شيء من الكتب الستة).

(٣) صحيح: الإسناد موقوفاً.

قُلْتُ: حَدِيثٌ بَلَغَنِي لَمْ أَسْمَعْهُ، خَشِيتُ أَنْ أَمُوتَ أَوْ تَمُوتَ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «يَحْشُرُ اللَّهُ الْعِبَادَ «أَوِ النَّاسَ» عُرَاةً غُرْلاً بُهْماً»، قُلْتُ: مَا بُهْمًا؟ قَالَ: «لَيْسَ مَعَهُمْ شَيْءٌ، فَيُنَادِيهِمْ بِصَوْتٍ يَسْمَعُهُ مَنْ بَعُدَ «أَحْسَبُهُ قَالَ: كَمَا يَسْمَعُهُ مَنْ قَرُبَ»: أَنَا الْمَلِكُ، لَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ وَأَحَدٌ مِنْ أَهْلِ النَّارِ يَطْلُبُهُ بِمَظْلَمَةٍ، وَلَا يَنْبَغِي لِأَحَدٍ مِنْ أَهْلِ النَّارِ يَدْخُلُ النَّارَ وَأَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ يَطْلُبُهُ بِمَظْلَمَةٍ»، قُلْتُ: وَكَيْفَ؟ وَإِنَّمَا نَأْتِي اللَّهَ عُرَاةً بُهْمًا؟ قَالَ: «بِالْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ»»[1].

**واتە: ئیبنو عەقیل دەگێڕێتەوە کە جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) بۆی باسکردوە، کە فەرموودەیەکی پێگەیشتوە لە پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، گوتوویەتی: جا وشترێکم کڕی و بارگەم پێچایەوە یەك مانگە ڕێ ڕۆیشتم، هەتا گەیشتمە شام، جا کە دەبینم عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیسە، بۆیە ناردم بە دوایدا تا پێی بڵێن جابر لەبەر دەرگایە، جا نێردراوەکە گەڕایەوە گوتی: جابری کوڕی عەبدوڵڵای؟ گوتم: بەڵێ، (عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیس) هاتە دەرەوەو دەستی لە مل کردم، گوتم: فەرموودەیەکم پێگەیشتووە (کە لای تۆ هەیە) من لە پێغەمبەرەوە گوێم لێ نەبووە، لەوە ترسام من بمرم یان تۆ بمری (لە کاتێکدا من ئەو فەرموودەیە نازانم)، گوتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: خوا بەندەکان، «یان خەڵك» کۆدەکاتەوەو حەشریان دەکات بە ڕووتی و خەتەنە نەکراوی و بوهمی، گوتم: بوهم چیە؟ فەرمووی: (بوهم واتە:) هیچیان لەگەڵدا نیە، جا بە دەنگێك بانگیان دەکات، ئەوەی دوورە دەیبیستێ وەك چۆن ئەوەی نزیك دەیبیستێ، (دەفەرموێ): من پاشاو دەسەڵاتدارم، بۆ هیچ کەسێك نیە لە ئەهلی بەهەشت بچێتە بەهەشتەوە لە کاتێکدا کەسێکی ئەهلی دۆزەخ داوای مافێکی خۆی لێ دەکات، وە بۆ هیچ کەسێکی ئەهلی دۆزەخ نیە بچێتە دۆزەخ لە کاتێکدا یەکێك لە ئەهلی بەهەشت داوای مافی خۆی لێ دەکات (دەبێ مافەکان بدرێن ئنجا)، منیش گوتم جا چۆن؟ لە کاتێکدا بەبێ هیچ شتێك دەچینەوە لای خوا (خۆ پارەو پوڵمان لا نیە تا مافیان بدەینەوە)؟ گوتی: بە چاکەکان و خراپەکان.**

**(واتە: کەسی خاوەن ماف پاداشت و چاکەی بەرانبەرەکەی دەبات بە پێی مافەکەی، جا ئەگەر چاکەی نەبوو، ئیدی گوناهو تاوانی خاوەن ماف دەخرێتە سەر بە ئەندازەی مافەکەی، باری خۆی سووك دەکات).**

## دەربارەی: باوك کچی خۆی ماچ بکات

٨٣٧- «عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ أَحَداً كَانَ أَشْبَهَ حَدِيثاً وَكَلَاماً بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ فَاطِمَةَ، وَكَانَتْ إِذَا دَخَلَتْ عَلَيْهِ قَامَ إِلَيْهَا، فَرَحَّبَ بِهَا وَقَبَّلَهَا، وَأَجْلَسَهَا فِي مَجْلِسِهِ، وَكَانَ

---

(١) صحيح: «ظلال الجنة» (٥١٤).

إِذَا دَخَلَ عَلَيْهَا قَامَتْ إِلَيْهِ فَأَخَذَتْ بِيَدِهِ، فَرَحَّبَتْ بِهِ وَقَبَّلَتْهُ، وَأَجْلَسَتْهُ فِي مَجْلِسِهَا، فَدَخَلَتْ عَلَيْهِ فِي مَرَضِهِ الَّذِي تُوُفِّيَ، فَرَحَّبَ بِهَا وَقَبَّلَهَا»[1].

واتە: عائیشە دایكی ئیمانداران (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: هیچ كەسێكم نەبینیوە لە چۆنیەتی قسەو باس ئەوەندەی فاتیمە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بچێت، جا كاتێ فاتیمە بهاتایە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر لەبەری هەڵدەستاو پێشوازی لێ دەكردو ماچی دەكرد، وە لە جێگاكەی خۆی دایدەنیشاند، ئەویش كاتێ پێغەمبەر ﷺ بهاتایە بۆ لای لەبەری هەڵدەستاو پێشوازی لێدەكردو ماچی دەكردو لە جێگاكەی خۆی دایدەنیشاند، جا لە نەخۆشی سەرەمەرگیدا (فاتیمە) هاتە ژوورەوە بۆ خزمەتی (پێغەمبەر ﷺ)، (پێغەمبەریش ﷺ) دڵی پێی خۆش بوو و پێشوازی لێكردو ماچی كرد.

## دەربارەی: دەست ماچ كردن

٨٣٨- «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنُ رَزِينٍ قَالَ: مَرَرْنَا بِالرَّبَذَةِ فَقِيلَ لَنَا: هَا هُنَا سَلَمَةُ بْنُ الْأَكْوَعِ، فَأَتَيْنَاهُ فَسَلَّمْنَا عَلَيْهِ، فَأَخْرَجَ يَدَيْهِ فَقَالَ: بَايَعْتُ بِهَاتَيْنِ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ، فَأَخْرَجَ كَفًّا لَهُ ضَخْمَةً كَأَنَّهَا كَفُّ بَعِيرٍ، فَقُمْنَا إِلَيْهَا فَقَبَّلْنَاهَا»[2].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی كوڕی ڕەزین دەڵێ: تێپەڕمان كرد بە ڕەبەزەدا (كە شوێنێكە لە نزیك مەدینە)، پێمان گوترا: سەلەمەی كوڕی ئەكوەع لێرەیە، ئیدی هاتین بۆ لای و سڵاومان لێكرد، ئەویش دەستی دەرهێناو گوتی: بەم دوو دەستانە بەیعەتم داوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ، جا لەپی دەستی دەرهێنا كە زۆر گەورە بوو لە لەپی وشتر دەچوو، ئێمەش هەڵساین و دەستمان ماچ كرد (لەبەر بەرەكەتی دەستكەوتنی بە دەستی موبارەكی پێغەمبەری خوا ﷺ ).

## دەربارەی: هەڵسانەوە لەبەر یەكدی، بۆ بە گەورەگرتن

٨٣٩- «عَنْ أَبِي مِجْلَزٍ يَقُولُ: إِنَّ مُعَاوِيَةَ خَرَجَ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَامِرٍ وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ الزُّبَيْرِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، قُعُودٌ، فَقَامَ ابْنُ عَامِرٍ، وَقَعَدَ ابْنُ الزُّبَيْرِ، وَكَانَ أَرْزَنَهُمَا، قَالَ مُعَاوِيَةُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَمْثُلَ لَهُ عِبَادُ اللَّهِ قِيَامًا، فَلْيَتَبَوَّأْ بَيْتًا مِنَ النَّارِ»»[3].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٦٠): [البخاري تعليقاً، «المسند» (٣: ٤٩٥)].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣٥٧)، تخريج المشكاة» (٤٦٩٩): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب ، ١٥٢- باب: قيام الرجل

واتە: ئەبو میجلەز دەڵێ: موعاویە هاتە دەرەوە، لە کاتێکدا عەبدوڵڵای کوڕی عامیرو عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر دانیشتبوون (خوا لە هەموویان ڕازی بێ)، جا ئیبنو عامیر هەڵسا (وەك ڕێزگرتن لە موعاویە)، ئیبنو زوبەیریش دانیشت (هەڵنەستا) جا ئەو لە هەردووکیان لەسەرخۆو سەنگینتر بوو، موعاویە گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك پێی خۆش بێ بەندەکانی خوا لەبەری هەڵسنەوە، ئەوە باماڵێك بۆ خۆی ئامادە بکات لە نێو ئاگردا.

## دەربارەی: دەست پێکردن بە سڵاو

٨٤٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خَلَقَ اللَّهُ آدَمَ ﷺ عَلَى صُورَتِهِ، وَطُولُهُ سِتُّونَ ذِرَاعاً، ثُمَّ قَالَ: اذْهَبْ، فَسَلِّمْ عَلَى أُولَئِكَ «نَفَرٌ مِنَ الْمَلَائِكَةِ جُلُوسٌ» فَاسْتَمِعْ مَا يُحَيُّونَكَ بِهِ فَإِنَّهَا تَحِيَّتُكَ وَتَحِيَّةُ ذُرِّيَّتِكَ، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، فَقَالُوا: السَّلَامُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، فَزَادُوهُ: وَرَحْمَةُ اللَّهِ، فَكُلُّ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ عَلَى صُورَتِهِ، فَلَمْ يَزَلْ يَنْقُصُ الْخَلْقُ حَتَّى الْآنَ»»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا ئادەمی لەسەر شێوەی خۆی (کە لە دونیا دەبینرا) دروست کرد (واتە: ئادەم هیچ کامێك لە قۆناغەکانی نوتفەو عەلەقەو موضغەو نێو ڕەحم و ... هتد، نەبینیوە، بەڵکو ڕێك بەو شێوە تەواوەی خۆی دروست کرا کە لە دونیادا دەبینرا)، درێژیشی شەست باڵ بوو، پاشان (پەروەردگار) فەرمووی: برۆ سڵاو لەوانە بکە « کۆمەڵە فریشتەیەك دانیشتبوون»، جا گوێ بگرە چۆن وەڵامت دەدەنەوە، ئا ئەوە سڵاوی خۆت و نەوەکانتە، ئەویش (چووە لای فریشتەکان) و گوتی: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ)، ئەوانیش گوتیان: (السَّلَامُ عَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّه) جا (وَرَحْمَةُ اللَّهِ) یان بۆ زیاد کرد، جا هەر کەسێك کە دەچێتە بەهەشت، لەسەر شێوەی ئەو دەچێتە بەهەشت، وە بەردەوام خەڵك (مرۆڤایەتی) لە کورتبوونەوە دابوون هەتا ئێستا.

## دەربارەی: بڵاوکرنەوەی سڵاو

٨٤١- «عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَفْشُوا السَّلَامَ تَسْلَمُوا»»[2].

---

للرجل، ح ٥٢٢٩. الترمذي: ٤١- كتاب الأدب، ١٣- باب: ماجاء في كراهية قيام الرجل للرجل].

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٤٤٩) «الظلال» (٥١٦): [البخاري: ٧٩- كتاب الاستئذان، ١- باب: بدء السلام، مسلم: ٥١- كتاب الجنة وصفة نعيمها وأهلها، ح ٢٨].

(٢) حسن: «الإرواء» (٧٧٧)، [انظر «المسند» : ٤: ٢٨٦].

واتە: بەڕاء (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سڵاو بڵاوبکەنەوە، سەلامەت و پارێزراو دەبن.

٨٤٢- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا تَحَابُّونَ بِهِ؟ قَالُوا: بَلَى، يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «أَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ»»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە(خوا لێی ڕازی بێ) لە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: ناچنە بەهەشت هەتا ئیمان دێنن، وە ئیمانتان تەواو نابێ، هەتا یەکدیتان خۆشنەوێ، ئایا شتێکتان پێ نەڵێم کە بەهۆیەوە خۆشەویست بن؟ گوتیان: با، ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: سڵاو لە نێوانتان بڵاوبکەنەوە.

٨٤٣- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اعْبُدُوا الرَّحْمَنَ، وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ، وَأَفْشُوا السَّلَامَ، تَدْخُلُوا الْجِنَانَ»»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەندایەتی بۆ خوا بکەن و، خواردن ببەخشن و، سڵاو بڵاوبکەنەوە، دەچنە بەهەشتەوە.

## دەربارەی: ئەوەی سەرەتا سڵاو دەکات

٨٤٤- «عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ قَالَ: مَا كَانَ أَحَدٌ يَبْدَأُ - أَوْ يَبْدُرُ - ابْنَ عُمَرَ بِالسَّلَامِ»[٣].

واتە: بوشەیری کوڕی یەسار دەڵێ: هیچ کەسێك نەبوو پێش ئیبنو عومەر بکەوێتەوە، یان دەستپێشخەرتر بێ لە سڵاو کردن.

٨٤٥- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي، وَالْمَاشِي عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْمَاشِيَانِ أَيُّهُمَا يَبْدَأُ بِالسَّلَامِ فَهُوَ أَفْضَلُ»[٤].

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: کەسی سوار سڵاو لە پیادە دەکات، کەسی پیادەش سڵاو لە دانیشتوو دەکات، وە ئەو دوو کەسەش کە پیادەن باشترینیان ئەوەیانە کە زووتر سڵاو دەکات.

٨٤٦- «عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، أَخْبَرَهُ، أَنَّ الْأَغَرَّ «وَهُوَ رَجُلٌ مِنْ مُزَيْنَةَ، وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ» كَانَتْ لَهُ أَوْسُقٌ مِنْ تَمْرٍ عَلَى رَجُلٍ مِنْ بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ، اخْتَلَفَ إِلَيْهِ مِرَاراً،

---

(١) صحيح: «الإرواء» أيضاً: [مسلم: ١- كتاب الإيمان ، ح ٩٣].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٥٧١) ، «الإرواء» (٣/ ٢٣٩) : [الترمذي: ٢٣- كتاب الأطعمة، ٤٥- باب: فضل إطعام الطعام].

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح الإسناد موقوفاً، وصح موفوعاً: «السلسلة الصحيحة» (١١٤٦).

قَالَ: فَجِئْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَأَرْسَلَ مَعِي أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ، قَالَ: فَكُلُّ مَنْ لَقِينَا سَلَّمُوا عَلَيْنَا، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَلَا تَرَى النَّاسَ يَبْدَأُونَكَ بِالسَّلَامِ فَيَكُونُ لَهُمُ الْأَجْرُ؟ ابْدَأْهُمْ بِالسَّلَامِ يَكُنْ لَكَ الْأَجْرُ يُحَدِّثُ هَذَا ابْنُ عُمَرَ عَنْ نَفْسِهِ»[1].

**واتە: نافع دەگێڕێتەوە، ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) هەواڵی پێداوە، (گوتوویەتی): ئەغەر « کە پیاوێك بووە لە موزەینە هاوەڵی پێغەمبەر بوو ﷺ» ئەو پیاوە چەند ویسقێك[2] خورمای قەرزی لە لای پیاوێك بوو، لە نەوەکانی عەمری کوڕی عەوف، جا چەند جارێك چووە لای داوای لێکرد (دیارە نەیداوەتەوە)، دەڵێ: ئیدی هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، ئەویش ئەبو بەکری صیددیقی لەگەڵدا ناردم، دەڵێ: جا بگەیشتباین بە هەر کەسێك سڵاویان لێ دەکردین، ئەبو بەکریش گوتی: ئایا نابینی خەڵك پێشت دەکەونەوە بە سڵاوو پاداشتیان بۆ هەیە؟ تۆش سەرەتا سڵاو لەوان بکە، هەتا پاداشت بۆ تۆ بێ، ئیبنو عومەر ئەم بەسەرهاتەی خۆی باسکرد.**

٨٤٧- «عَنْ أَبِي أَيُّوبَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَحِلُّ لِامْرِئٍ مُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثٍ، فَيَلْتَقِيَانِ فَيُعْرِضُ هَذَا وَيُعْرِضُ هَذَا، وَخَيْرُهُمَا الَّذِي يَبْدَأُ بِالسَّلَامِ»»[3].

**واتە: ئەبو ئەییوب (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەڵاڵ نیە بۆ هیچ مسوڵمانێك لە سێ ڕۆژ زیاتر قسە لەگەڵ براکەیدا نەکات، (بە شێوەیەك) بگەن بە یەکدی، ئەوەیان ڕوو بەلایەکدا وەرچەرخێنێ، وە ئەوی دیکەش بەلایەکی تردا، وە چاکترینیان ئەو کەسەیە کە سەرەتا سڵاو دەکات.**

## دەربارەی: گەورەیی سڵاو کردن

٨٤٨- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَجُلاً مَرَّ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ فِي مَجْلِسٍ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، فَقَالَ: «عَشْرُ حَسَنَاتٍ»، فَمَرَّ رَجُلٌ آخَرُ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، فَقَالَ: «عِشْرُونَ حَسَنَةً»، فَمَرَّ رَجُلٌ آخَرُ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، فَقَالَ: «ثَلَاثُونَ حَسَنَةً»، فَقَامَ رَجُلٌ مِنَ الْمَجْلِسِ وَلَمْ يُسَلِّمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا أَوْشَكَ مَا نَسِيَ صَاحِبُكُمْ، إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْمَجْلِسَ فَلْيُسَلِّمْ، فَإِنْ بَدَا لَهُ أَنْ يَجْلِسَ فَلْيَجْلِسْ، وَإِذَا قَامَ فَلْيُسَلِّمْ، مَا الْأُولَى بِأَحَقَّ مِنَ الْآخِرَةِ»»[4].

---

(١) حسن: «التعليق الرغيب» (٢٦٧/٣).

(٢) هەر ویسقێك بریتیە لە (١٣٠) کغم.

(٣) صحيح: «الإرواء» (٢٠٢٩): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٦٢- باب الهجرة وقول رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (لاَ يحل لرجل أن يهجر أخاه فوق ثلاث). مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٢٥].

(٤) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٨٣): [الترمذي: ٤٠- كتاب الاستئذان، ١٥- باب: ماجاء في لتسليم عند القيام وعند القعود].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە كە پیاوێك تێپەڕی بەلای پێغەمبەری خوا ﷺ، كە لە مەجلیسێكدا بوو، (پیاوەكە) گوتی: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ)، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: دە چاكە، پیاوێكی دی تێپەڕی و گوتی: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ)، فەرمووی: بیست چاكە، پیاوێكی دی تێپەڕی و گوتی: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ) فەرمووی: سی چاكە، جا پیاوێك لە كۆڕەكە هەڵساو سڵاوی نەكرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: چی وای لێكرد هاوەڵەكەتان سڵاو لە یاد بكات، ئەگەر یەكێك لە ئێوە هاتە مەجلیسێك با سڵاو بكات، وە ئەگەر بۆی دەركەوت (دانیشتن چاكەی بۆ ئەو تێدایە) ئەوە با دابنیشێت، وە كاتێ هەڵسا با سڵاو بكات، (چونكە) سڵاوی سەرەتا لە پێشترو شایستەتر نیە لە سڵاو كردنی كۆتایی و هەڵسان (لە مەجلیس).

٨٤٩- «عَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كُنْتُ رَدِيفَ أَبِي بَكْرٍ، فَيَمُرُّ عَلَى الْقَوْمِ فَيَقُولُ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، فَيَقُولُونَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، وَيَقُولُ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، فَيَقُولُونَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَضَلَنَا النَّاسُ الْيَوْمَ بِزِيَادَةٍ كَثِيرَةٍ»[1].

واتە: عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: من لە دوای ئەبو بەكر بووم، جا بە لای كۆمەڵێكدا تێپەڕ بوو، گوتی: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ)، ئەوانیش گوتیان: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ)، ئەویش گوتی: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ) ئەوانیش گوتیان: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ)، جا ئەبو بەكر گوتی: ئەمڕۆ خەڵك بە چاكەی زۆرەوە پێشمان كەوتنەوە.

٨٥٠- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا حَسَدَكُمُ الْيَهُودُ عَلَى شَيْءٍ مَا حَسَدُوكُمْ عَلَى السَّلَامِ وَالتَّأْمِينِ»»[2].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: جوولەكەكان هێندەی هیچ شتێك ئێرەییان پێ نەبردوون، وە ئەوەی حەسوودیتان پێ دەبەن لەسەر سڵاوكردن و گوتنی ئامین (كاتێ پێشنوێژ خوێن فاتیحە تەواو دەكات).

## سەلام ناوێكە لە ناوەكانی خوای بەرز

٨٥١- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ السَّلَامَ اسْمٌ مِنْ أَسْمَاءِ اللَّهِ تَعَالَى، وَضَعَهُ اللَّهُ فِي الْأَرْضِ، فَأَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ»»[3].

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح: «تخريج الترغيب» (١٧٨/١): [إبن ماجه: ٥- كتاب إقامة الصلاة والسنة فيها، ١٤- باب: الجهر بالتأمين، ح ٨٥٦].

(٣) حسن: «الصحيحة» (١٨٤ و ١٦٠٧)، (الروض) ٩ (١٠٧٥): [ليس في شيء من الكتب الستة].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان سەلام ناوێکە لە ناوەکانی خوای بەرز، لەسەر زەوی دایناوە، کەواتە سڵاو لە نێوانتاندا بڵاو بکەنەوە.

٨٥٢- «عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانُوا يُصَلُّونَ خَلْفَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ الْقَائِلُ: السَّلَامُ عَلَى اللَّهِ، فَلَمَّا قَضَى النَّبِيُّ ﷺ صَلَاتَهُ قَالَ: «مَنِ الْقَائِلُ: السَّلَامُ عَلَى اللَّهِ؟ إِنَّ اللَّهَ هُوَ السَّلَامُ، وَلَكِنْ قُولُوا: التَّحِيَّاتُ لِلهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ « قَالَ: وَقَدْ كَانُوا يَتَعَلَّمُونَهَا كَمَا يَتَعَلَّمُ أَحَدُكُمُ السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ»[١].

واتە: ئیبنو مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئێمە لە دوای پێغەمبەر ﷺ نوێژمان دەکرد، یەکێك گوتی: سەلام لەسەر خوا بێ، کاتێ پێغەمبەر ﷺ لە نوێژەکەی تەواو بوو، فەرمووی: مەڵێن: سەلام لەسەر خوا، چونکە خوا خۆی سەلامە، بەڵکو بڵێن: هەرچی گەورەیی و ڕێزو موڵك هەیە تەنها بۆ خوایە، لەگەڵ هەموو پەرستش و وتەیەکی پاك، سڵاوو ڕەحمەت و پیت و پێز برژێ بەسەر تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ، وە سەلام لەسەر ئێمەو لەسەر هەموو بەندە چاکەکان بێت، شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك بە هەق نیە جگە لە خوا، وە شایەتی دەدەم کە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خوایە. (ئیبنو مەسعوود) گوتی: هاوەڵان خۆیان فێر دەکرد (و لەبەریان دەکرد)، هەر وەك چۆن یەکێك لە ئێوە خۆی فێری سوورەتێك لە قورئان دەکات (لەبەری دەکات)

## دەربارەی: مافی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان ئەوەیە سڵاوی لێبکات کاتێ پێیگەیشت

٨٥٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ سِتٌّ»، قِيلَ: وَمَا هِيَ؟ قَالَ: «إِذَا لَقِيتُهُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ، وَإِذَا دَعَاكَ فَأَجِبْهُ، وَإِذَا اسْتَنْصَحَكَ فَانْصَحْ لَهُ، وَإِذَا عَطَسَ فَحَمِدَ اللَّهَ فَشَمِّتْهُ، وَإِذَا مَرِضَ فَعُدْهُ، وَإِذَا مَاتَ فَاصْحَبْهُ»»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مافی مسوڵمان لەسەر مسوڵمان شەش شتە: گوترا: ئەوانە چین؟ فەرمووی: ئەگەر پێیگەیشتی سڵاوی لێ بکە، وە ئەگەر بانگی کردی (بۆ دەعوەت) وەڵامی بدەوە، وە کاتێ داوای ئامۆژگاری لێکردی (دڵسۆزبە)

---

(١) صحيح: «الإرواء» (٢/ ٢٤ و ٣٦)، «صحيح أبي داود» (٨٩٢) [البخاري: ١٠- كتاب الأذان، ١٤- باب: التشهد في الآخرة. مسلم: ٤- كتاب الصلاة، ح ٥٥].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٨٣٢): [البخاري: ٢٣- كتاب الجنائز، باب: الأمر باتباع الجنائز. مسلم: ٣٩- السلام، ح ٤و ٥] .

ئامۆژگاری بکە، کاتێ پژمی و ستایشی خوای کرد دووعای بۆ بکە (بڵێ: يَرْحَمُكَ اللَّه)، کاتێ نەخۆش کەوت سەردانی بکە، وە کاتێ مرد هاوەڵی بەو شوێن تەرمەکەی بکەوە.

## دەربارەی: کەسی پیادە سڵاو دەکات لە کەسی دانیشتوو

٨٥٤- «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ شِبْلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لِيُسَلِّمِ الرَّاكِبُ عَلَى الرَّاجِلِ، وَلْيُسَلِّمِ الرَّاجِلُ عَلَى الْقَاعِدِ، وَلْيُسَلِّمِ الْأَقَلُّ عَلَى الْأَكْثَرِ، فَمَنْ أَجَابَ السَّلَامَ فَهُوَ لَهُ، وَمَنْ لَمْ يُجِبْ فَلَا شَيْءَ لَهُ»»(١).

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی شیبل (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: بیستم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: با کەسی سوار سڵاو بکات لە کەسی پیادە، (کۆمەڵی) کەمیش سڵاو بکات لە (کۆمەڵی) زۆر، جا هەر کەسێك وەڵامی سڵاوی دایەوە ئەوە (پاداشتی) بۆ هەیە، وە هەر کەسێك وەڵامی نەدایەوە ئەوە هیچ (پاداشتێکی) بۆ نیە.

٨٥٥- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي، وَالْمَاشِي عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ»»(٢).

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەسی سواری سڵاو لەوە دەکات کە بە پیادە دەڕوات، وە پیادە سڵاو لەو کەسە دەکات کە دانیشتووە، وە ئەوانەی ژمارەیان کەمە سڵاو لەوانە دەکەن کە ژمارەیان زۆرە.

٨٥٦- «عن جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: الْمَاشِيَانِ إِذَا اجْتَمَعَا فَأَيُّهُمَا بَدَأَ بِالسَّلَامِ فَهُوَ أَفْضَلُ»(٣).

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەیگوت: ئەو دوو کەسەی کە پیادەن و بە یەکدی دەگەن، باشترینیان ئەوەیە کە زووتر سڵاو دەکات.

٨٥٧- «عَنْ فَضَالَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي، وَالْمَاشِي عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ»»(٤).

واتە: فەزالە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە گوتوویەتی: کەسی سواری سڵاو لە کەسی دانیشتوو دەکات، وە پیادە سڵاو لەو کەسە دەکات کە دانیشتووە، وە ئەوانەی ژمارەیان کەمە سڵاو لەوانە دەکەن کە ژمارەیان زۆرە.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١١٤٧ و ٢١٩٩): [ليس في شيء من الكتب الستة].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١١٤٥و ١١٤٩): [البخاري: ٧٩- كتاب الاستئذان، ٤- باب: تسليم القليل على الكثير، ٥- باب: تسليم الراكب على الماشي، ٦- باب: تسليم الماشي على القاعد، ٧- تسليم الصغير على الكبير. مسلم: ٣٩- كتاب السلام، ح ١].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١١٤٦).

(٤) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١١٤٥، ١١٥٠): [الترمذي: ٤٠- كتاب الاستئذان، ١٤- باب: ما جاء في تسليم الراكب على الماشي].

## دەربارەی: ئایا کەسی پیادە سەرەتا سڵاو لە کەسی سواری دەکات؟

٨٥٨- «عَنْ حُصَين، عَنِ الشَّعْبِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ لَقِيَ فَارِساً فَبَدَأَهُ بِالسَّلَامِ، فَقُلْتُ: تَبْدَأُهُ بِالسَّلَامِ؟ قَالَ: رَأَيْتُ شُرَيْحاً مَاشِياً يَبْدَأُ بِالسَّلَامِ»[١].

**واتە:** حوصەین لێی گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: شەعبی بە کەسێکی سواری گەیشت و سەرەتا دەستی بە سڵاو کرد (کەچی خۆی پیادە بوو)، (حوصەینیش دەڵێ) منیش گوتم: سەرەتا تۆ دەست بە سڵاو دەکەی؟ گوتی: من شورەیحم بینی بە پیادە بوو و، سەرەتا دەستی بە سڵاو کردن کرد.

## دەربارەی: ئەوانەی ژمارەیان کەمە سڵاو لەوانە دەکەن کە ژمارەیان زۆرە

٨٥٩- «عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي، وَالْمَاشِي عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ»»[٢].

**واتە:** فەزالەی کوڕی عوبەید (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سواری سڵاو لەوە دەکات کە بە پیادەیە، وە کەسی پیادەش سڵاو لەوە دەکات کە دانیشتووە، وە ئەوانەی ژمارەیان کەمە سڵاو لەوانە دەکەن کە ژمارەیان زۆرە.

٨٦٠- «عَنْ فَضَالَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يُسَلِّمُ الْفَارِسُ عَلَى الْمَاشِي، وَالْمَاشِي عَلَى الْقَائِمِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ»»[٣].

**واتە:** فەزاڵە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەسی سواری سڵاو لەوە دەکات کە بە پیادەیە، وە کەسی پیادەش سڵاو لەوە دەکات کە وەستاوە، وە ئەوانەی ژمارەیان کەمە سڵاو لەوانە دەکەن کە ژمارەیان زۆرە.

## دەربارەی: بچوك سڵاو لە گەورە دەکات

٨٦١- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي، وَالْمَاشِي عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ»»[٤].

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کەسی سواری سڵاو لەوە دەکات کە بە پیادەیە، کەسی پیادەش سڵاو لەوە دەکات کە دانیشتووە، وە ئەوانەی ژمارەیان کەمە سڵاو لەوانە دەکەن کە ژمارەیان زۆرە.

٨٦٢- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُسَلِّمُ الصَّغِيرُ عَلَى الْكَبِيرِ، وَالْمَاشِي عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ»»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بچوك سڵاو لە گەورە دەکات، وە پیادە سڵاو لەوە دەکات کە دانیشتووە، وە ئەوانەی ژمارەیان کەمە سڵاو لەوانە دەکەن کە ژمارەیان زۆرە.

## دەربارەی: ئەوپەڕی سڵاو کردن

٨٦٣- «عَنْ أَبِي الزِّنَادِ قَالَ: كَانَ خَارِجَةُ يَكْتُبُ عَلَى كِتَابِ زَيْدٍ إِذَا سَلَّمَ، قَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكَ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ وَمَغْفِرَتُهُ، وَطَيِّبُ صَلَوَاتِهِ»[٢].

واتە: ئەبو زیناد دەڵێ: خاریجە لەسەر نووسراوی زەید ئەگەر سڵاوی بکردایە دەینووسی: سڵاوو ڕەحمەت و بەرەکەت و لێخۆشبوون و ڕەحمەتە چاکەکانت لەسەر ئەی پێشەوای بڕواداران.

## دەربارەی: ئەو کەسەی سڵاو بکات بە ئاماژە

٨٦٤- «قَالَتْ أَسْمَاءُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): أَلْوَى النَّبِيُّ ﷺ بِيَدِهِ إِلَى النِّسَاءِ بِالسَّلَامِ»[٣].

واتە: ئەسماء (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە دەستی سڵاوی لە ئافرەتان کرد.

٨٦٥- «عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانُوا يَكْرَهُونَ التَّسْلِيمَ بِالْيَدِ، أَوْ قَالَ: كَانَ يَكْرَهُ التَّسْلِيمَ بِالْيَدِ»[٤].

واتە: عەطائی کوڕی ئەبو ڕەباح (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئەوان پێیان باش نەبوو بە (تەنها) بە دەست سڵاو بکرێ، یان گوتی: ئەو پێی باش نەبوو (تەنها) بە دەست سڵاو بکرێ.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١١٤٩) .

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح: وهو معلق، وسيأتي موصولًا.

(٤) صحيح الإسناد.

تێبینی: چونکە کاتێك کەسێك تەنها بە دەست سڵاو دەکات، بەرانبەرەکەی وەڵام دەداتەوە، ئەمەش دەبێتە سڵاوی یەکەم و پێویستە کەسی یەکەم وەڵام بداتەوە، وەڵامیش ناداتەوە، چونکە بیر لەوە ناکاتەوە.

## دەربارەی: مرۆڤ دەنگی بەرز دەکاتەوە کە سڵاوی کرد تاکو بیبیستێ

٨٦٦- «عَنْ ثَابِتِ بْنِ عُبَيْدٍ قَالَ: أَتَيْتُ مَجْلِسَاً فِيهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ، فَقَالَ: إِذَا سَلَّمْتَ فَأَسْمِعْ، فَإِنَّهَا تَحِيَّةٌ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ مُبَارَكَةً طَيِّبَةً» [١].

واتە: سابتی کوڕی عوبید دەڵێ: هاتمە مەجلیسێك کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەری تێدا بوو، جا (عەبدوڵڵا) گوتی: ئەگەر سڵاوت کرد، خەڵك گوێبیست بکە (دەنگت بەرز بکەوە)، چونکە ئەوە سڵاوێکە لە لایەن خواوەیە پیرۆزو پاکە.

## دەربارەی: ئەو کەسەی دەرچوو سڵاو دەکات، سڵاویشی لێ دەکرێ

٨٦٧- «عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، أَنَّ الطُّفَيْلَ بْنَ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ كَانَ يَأْتِي عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ فَيَغْدُو مَعَهُ إِلَى السُّوقِ، قَالَ: فَإِذَا غَدَوْنَا إِلَى السُّوقِ لَمْ يَمُرَّ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ عَلَى سَقَّاطٍ، وَلَا صَاحِبِ بَيْعَةٍ، وَلَا مِسْكِينٍ، وَلَا أَحَدٍ إِلَّا يُسَلِّمُ عَلَيْهِ. قَالَ الطُّفَيْلُ: فَجِئْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ يَوْمَاً، فَاسْتَتْبَعَنِي إِلَى السُّوقِ، فَقُلْتُ: مَا تَصْنَعُ بِالسُّوقِ وَأَنْتَ لَا تَقِفُ عَلَى الْبَيْعِ، وَلَا تَسْأَلُ عَنِ السِّلَعِ، وَلَا تَسُومُ بِهَا، وَلَا تَجْلِسُ فِي مَجَالِسِ السُّوقِ؟ فَاجْلِسْ بِنَا هَاهُنَا نَتَحَدَّثُ. فَقَالَ لِي عَبْدُ اللَّهِ: يَا أَبَا بَطْنٍ، «وَكَانَ الطُّفَيْلُ ذَا بَطْنٍ»، إِنَّمَا نَغْدُو مِنْ أَجْلِ السَّلَامِ، نُسَلِّمُ عَلَى مَنْ لَقِيَنَا»[٢].

واتە: ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو تەڵحە دەگێڕێتەوە، (دەڵێ): توفەیلی کوڕی ئوبەی کوڕی کەعب هەواڵی پێداوە کە (هەموو جار) دەهات بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو بەیانیەکەی لەگەڵی دەچوو بۆ بازاڕ، دەڵێ: جا کاتێ دەچوینە بازاڕ عەبدوڵڵا تێنەدەپەڕی بە لای (سَقَّاط) ئەو کەسەی کۆرپەلەی ئاژەڵ دەفرۆشێ، وە خاوەنی کڕین و فرۆشتنێك و، هەژارو، هەر کەسێکی دیکەدا حەتمەن سڵاوی لێ دەکرد، توفەیل گوتی: جا ڕۆژێك هاتم بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو بەدوای خۆی دام و بردمی بۆ بازاڕ، منیش گوتم: چی دەکەی لە بازاڕدا، نە بۆ شت کڕین دەوەستی، وە نە پرسیاری شتومەك دەکەی، نە نرخی شت دەپرسی، وە نە لە کۆڕو دانیشتنی بازاڕدا دادەنیشی (ئامانجت چیە؟) (گوتی:) لێرە دابنیشە لەگەڵمان قسە دەکەین، جا

---

(١) صحيح الإسناد، وكذا قال الحافظ (١١/١٨) .

(٢) صحيح: «تخريج المشكاة» (٤٦٦٤/ التحقيق الثاني) .

عەبدوڵلا پێی گوتم: ئەی خاوەن ورگ «جا توفەیل ورگی هەبوو» تەنها بۆ سەلام دێینە بازاڕ، سەلام لە هەر کەسێك دەکەین کە پێمان دەگەن.

## دەربارەی: سڵاو کردن لەو کاتەی یەکێك دێت بۆ مەجلیس

٨٦٨- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْمَجْلِسَ فَلْيُسَلِّمْ، فَإِنْ رَجَعَ فَلْيُسَلِّمْ، فَإِنَّ الْأُخْرَى لَيْسَتْ بِأَحَقَّ مِنَ الْأُولَى»»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر یەکێکتان هاتە مەجلیس با سڵاو بکات، وە ئەگەر گەڕایەوەو (لە مەجلیسەکە ڕۆیشت) با سڵاو بکات، چونکە سڵاو کردنی کۆتایی لە پێشترو شایستەتر نیە لە سڵاو کردنی سەرەتا.**

## دەربارەی: سڵاو کردن لەو کاتەی یەکێك لە مەجلیس هەڵدەستێ

٨٦٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا جَاءَ الرَّجُلُ الْمَجْلِسَ فَلْيُسَلِّمْ، فَإِنْ جَلَسَ ثُمَّ بَدَا لَهُ أَنْ يَقُومَ قَبْلَ أَنْ يَتَفَرَّقَ الْمَجْلِسُ فَلْيُسَلِّمْ، فَإِنَّ الْأُولَى لَيْسَتْ بِأَحَقَّ مِنَ الْأُخْرَى»»[٢].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر پیاوێك هاتە مەجلیس با سڵاو بکات، جا ئەگەر دانیشت و دواتر پێویستیەکی هاتە پێش، ئیدی ویستی هەڵسێ، ئەوە پێش ئەوەی هەڵسێ و، جیابێتەوە لە مەجلیسەکە با سڵاو بکات، چونکە سڵاو کردنی سەرەتا لە پێشترو شایستەتر نیە لە سڵاو کردنی کۆتایی.**

## دەربارەی: هەقی ئەو کەسەی سڵاو دەکات کاتێ هەڵدەستێ

٨٧٠- «عَنْ بِسْطَامٌ قَالَ: سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ بْنَ قُرَّةَ قَالَ: قَالَ لِي أَبِي: يَا بُنَيَّ، إِنْ كُنْتَ فِي مَجْلِسٍ تَرْجُو خَيْرَهُ، فَعَجِلَتْ بِكَ حَاجَةٌ فَقُلْ: سَلَامٌ عَلَيْكُمْ، فَإِنَّكَ تَشْرَكُهُمْ فِيمَا أَصَابُوا فِي ذَلِكَ الْمَجْلِسِ، وَمَا مِنْ قَوْمٍ يَجْلِسُونَ مَجْلِساً فَيَتَفَرَّقُونَ عَنْهُ لَمْ يُذْكَرِ اللَّهُ، إِلَّا كَأَنَّمَا تَفَرَّقُوا عَنْ جِيفَةِ حِمَارٍ»[٣].

**واتە: بیسطام دەڵێ: گوێم لە موعاویەی کوڕی قوڕڕە بوو، گوتی: ئوبەی پێی گوتم: ئەی ڕۆڵە گیان! ئەگەر لە مەجلیسێکدا بووی ئومێدی خێرت لێدەکرد، پێویستیەك پەلەی پێکردی (مەجلیسەکەی**

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٨٣)، وهو طرف من الحديث السابق (٩٨٦) .

(٢) صحيح: انظر ما قبله.

(٣) صحيح موقوف: «السلسلة الصحيحة» «١٨٣»، وجملة الذكر صحت مرفوعاً، «السلسلة الصحيحة» (٧٧).

پێ جێهێشتی)، ئەوە بڵێ: (سَلَامٌ عَلَيْكُمْ)، چونکە تۆ بەشدار دەبی لەو خێرو چاکەی کە ئەوان پێیان دەگات لەو مەجلیسە، وە هەر کۆمەڵە خەڵكێك لە کۆڕو مەجلیسێکدا دابنیشن، پاشان لە یەکدی جیاببنەوە لە مەجلیسەکەداو، یادی خوایان نەکردبێ، حەتمەن وەك ئەوە وایە لەسەر کەلاکی گوێ درێژبووبن و جیابووبنەوە.

٨٧١- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: «مَنْ لَقِيَ أَخَاهُ فَلْيُسَلِّمْ عَلَيْهِ، فَإِنْ حَالَتْ بَيْنَهُمَا شَجَرَةٌ، أَوْ حَائِطٌ، ثُمَّ لَقِيَهُ فَلْيُسَلِّمْ عَلَيْهِ»»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، بیستوویەتی (پێغەمبەری خوا ﷺ) دەیفەرموو: ئەگەر یەکێك لە ئێوە بە برای مسوڵمانی خۆی گەیشت ئەوە با سڵاوی لێبکات، وە ئەگەر درەختێك، یان دیوارێك کەوتە نێوانیان، پاشان پێی گەیشتەوە ئەوە با دیسان سڵاوی لێبکاتەوە.

٨٧٢- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ أَصْحَابَ النَّبِيِّ ﷺ كَانُوا يَكُونُونَ مُجْتَمِعِينَ فَتَسْتَقْبِلُهُمُ الشَّجَرَةُ، فَتَنْطَلِقُ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ عَنْ يَمِينِهَا وَطَائِفَةٌ عَنْ شِمَالِهَا، فَإِذَا الْتَقَوْا سَلَّمَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ»[٢].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە (دەڵێ:) هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پێکەوە کۆدەبوونەوەو دەڕۆیشتن بە ڕێگەدا، جا کە دارێك دەکەوتە بەرانبەریان، کۆمەڵێکیان بە لای ڕاستیدا دەڕۆیشتن، کۆمەڵێکی دیکەشیان بە لای چەپیدا، جا کە بە یەکدی دەگەیشتنەوە، هەندێکیان سڵاویان لە هەندێکیان دەکرد.

## دەربارەی: ئەوەی دەستی چەور بکات بە بۆنێکی خۆش بۆ تەوقە کردن

٨٧٣- «عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، أَنَّ أَنَساً كَانَ إِذَا أَصْبَحَ ادَّهَنَ يَدَهُ بِدُهْنٍ طَيِّبٍ لِمُصَافَحَةِ إِخْوَانِهِ»[٣].

واتە: سابتی بونانی دەگێڕێتەوە (دەڵێ): ئەنەس کاتێ بەیانی دەکردەوە دەستی چەور دەکرد بە بۆنێکی خۆش، بۆ تەوقەکردن لەگەڵ براکانی.

## دەربارەی: سڵاو بکە لە هەر کەسێك بیناسی، یان نەیناسی

٨٧٤- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الْإِسْلَامِ خَيْرٌ؟ قَالَ: «تُطْعِمُ الطَّعَامَ، وَتُقْرِئُ السَّلَامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ»»[٤].

---

(١) صحيح موقوفاً، وصح مرفوعاً: «السلسلة الصحيحة» «١٨٦»، «تخريج المشكاة» (٤٦٥٠.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٨٣).

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح: [البخاري: ٢- كتاب الإيمان، ٦- باب: إطعام الطعام في الإسلام. مسلم: ١- كتاب الإيمان، ح ٦٣].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە (دەڵێ): پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! باشترین ئیسلامەتی کامەیە؟ فەرمووی: خواردن ببەخشی و سڵاو بکەی لەو کەسەی دەیناسی و ئەو کەسەش کە نایناسی.

٨٧٥- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الْأَفْنِيَةِ وَالصُّعُدَاتِ أَنْ يُجْلَسَ فِيهَا، فَقَالَ الْمُسْلِمُونَ: لَا نَسْتَطِيعُهُ، لَا نُطِيقُهُ، قَالَ: أَمَّا لَا، فَأَعْطُوا حَقَّهَا، قَالُوا: وَمَا حَقُّهَا؟ قَالَ: «غَضُّ الْبَصَرِ، وَإِرْشَادُ ابْنِ السَّبِيلِ، وَتَشْمِيتُ الْعَاطِسِ إِذَا حَمِدَ اللَّهَ، وَرَدُّ التَّحِيَّةِ»»[١].

واتە: ئەبو هوڕەیڕە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە (دەڵێ): پێغەمبەر ﷺ نەهی کرد لە دانیشتن لەبەر دەرگاو کۆڵانەکان، جا مسوڵمانان گوتیان: ناتوانین (واز لەوە بێنین)! فەرمووی: ئەگەر لە تواناتاندا نیە کەواتە مافی بدەن، گوتیان: مافی ئەو ڕێگەو شوێنانە چیە؟ فەرمووی: چاوداخستن و، ڕێ پێشاندانی کەسی ناشارەزاو، دوعاکردن بۆ ئەو کەسەی دەپژمێ ئەگەر ستایشی خوای کرد، وەڵامدانەوەی سڵاو (ی خەڵك).

## دەربارەی: سڵاو ناکرێ لە کەسی فاسیق

٨٧٦- «عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى قَوْمٍ فِيهِمْ رَجُلٌ مُتَخَلِّقٌ بِخَلُوقٍ، فَنَظَرَ إِلَيْهِمْ وَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، وَأَعْرَضَ عَنِ الرَّجُلِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: أَعْرَضْتَ عَنِّي؟ قَالَ: «بَيْنَ عَيْنَيْهِ جَمْرَةٌ»»[٢].

واتە: عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بە لای کۆمەڵێکدا کە پیاوێکیان تێدا بوو ڕەوشتی ناشرین بوو، جا سەیری کردن و سڵاوی لێکردن، ڕووشی وەرگێڕا لە پیاوەکە، جا پیاوەکە گوتی: بۆچی ڕووت لە من وەرگێڕا؟ فەرمووی: لە نێوان هەردوو چاویدا پشکۆی ئاگر هەیە (واتە: شوێنەواری گوناهو پشکۆی ئاگری دۆزەخ لە نێوچاوانی دەبینم).

٨٧٧- «عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ ﷺ وَفِي يَدِهِ خَاتَمٌ مِنْ ذَهَبٍ، فَأَعْرَضَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْهُ، فَلَمَّا رَأَى الرَّجُلُ كَرَاهِيَتَهُ ذَهَبَ فَأَلْقَى الْخَاتَمَ، وَأَخَذَ خَاتَماً مِنْ حَدِيدٍ فَلَبِسَهُ، وَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: «هَذَا شَرٌّ، هَذَا حِلْيَةُ أَهْلِ النَّارِ»، فَرَجَعَ فَطَرَحَهُ، وَلَبِسَ خَاتَماً مِنْ وَرِقٍ، فَسَكَتَ عَنْهُ النَّبِيُّ ﷺ»[٣].

واتە: عەمری کوڕی شوعەیب (خوا لێی ڕازی بێ) لە باوك و باپیرەیەوە دەگێڕێتەوە (دەڵێ): پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، وە گوستیلەیەکی ئاڵتونی لە دەست بوو، پێغەمبەریش ﷺ

---

(١) صحيح: «تخريج المشكاة» (٤٦٤١/ التحقيق الثاني)، «السلسلة الصحيحة» (٢٥٠١) [لم أعثر عليه].

(٢) حسن: [ليس في شيء من الكتب الستة]

(٣) حسن: «آداب الزفاف» (٢١٧): [النسائي: ٤٨- كتاب الزينة، ٥٠- باب: لبس خاتم صفر] .

پشتی تێکرد، کاتێ پیاوەکە بینی پێغەمبەر ﷺ پێی ناخۆشە، بۆیە چوو گوستیلەکەی فڕێداو ئەنگوستیلەیەکی ئاسنی لە دەستکرد، پاشان هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: ئەمەش خراپەیە، ئەمە خشڵی دوزەخیەکانە، بۆیە گەڕایەوەو فڕێیداو ئەنگوستیلەیەکی زیوی لە دەست کرد، ئنجا پێغەمبەر ﷺ لێی بێدەنگ بوو (واتە: بە گوستیلە زیوەکە ڕازی بوو).

## دەربارەی: سڵاوکردن لە کاربەدەست

٨٧٨- «عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ سَأَلَ أَبَا بَكْرِ بْنَ سُلَيْمَانَ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ: لِمَ كَانَ أَبُو بَكْرٍ يَكْتُبُ: مِنْ أَبِي بَكْرٍ خَلِيفَةِ رَسُولِ اللَّهِ، ثُمَّ كَانَ عُمَرُ يَكْتُبُ بَعْدَهُ: مِنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ خَلِيفَةِ أَبِي بَكْرٍ، مَنْ أَوَّلُ مَنْ كَتَبَ: أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ؟ فَقَالَ: حَدَّثَتْنِي جَدَّتِي الشِّفَاءُ - وَكَانَتْ مِنَ الْمُهَاجِرَاتِ الْأُوَلِ، وَكَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ إِذَا هُوَ دَخَلَ السُّوقَ دَخَلَ عَلَيْهَا - قَالَتْ: كَتَبَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ إِلَى عَامِلِ الْعِرَاقَيْنِ: أَنِ ابْعَثْ إِلَيَّ بِرَجُلَيْنِ جَلْدَيْنِ نَبِيلَيْنِ، أَسْأَلُهُمَا عَنِ الْعِرَاقِ وَأَهْلِهِ، فَبَعَثَ إِلَيْهِ صَاحِبُ الْعِرَاقَيْنِ بِلَبِيدِ بْنِ رَبِيعَةَ، وَعَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ، فَقَدِمَا الْمَدِينَةَ فَأَنَاخَا رَاحِلَتَيْهِمَا بِفِنَاءِ الْمَسْجِدِ، ثُمَّ دَخَلَا الْمَسْجِدَ فَوَجَدَا عَمْرَو بْنَ الْعَاصِ، فَقَالَا لَهُ: يَا عَمْرُو، اسْتَأْذِنْ لَنَا عَلَى أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ عُمَرَ، فَوَثَبَ عَمْرٌو فَدَخَلَ عَلَى عُمَرَ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكَ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: مَا بَدَا لَكَ فِي هَذَا الِاسْمِ يَا ابْنَ الْعَاصِ؟ لَتَخْرُجَنَّ مِمَّا قُلْتَ، قَالَ: نَعَمْ، قَدِمَ لَبِيدُ بْنُ رَبِيعَةَ، وَعَدِيُّ بْنُ حَاتِمٍ، فَقَالَا لِي: اسْتَأْذِنْ لَنَا عَلَى أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ، فَقُلْتُ: أَنْتُمَا وَاللَّهِ أَصَبْتُمَا اسْمَهُ، وَإِنَّهُ الْأَمِيرُ، وَنَحْنُ الْمُؤْمِنُونَ. فَجَرَى الْكِتَابُ مِنْ ذَلِكَ الْيَوْمِ»[١].

واتە: ئیبنو شیهاب دەگێڕێتەوە (دەڵێ): عومەری کوڕی عەبدولعەزیز پرسیاری کرد لە ئەبو بەکری کوڕی سولەیمانی کوڕی ئەبو حەثـمە: بۆچی ئەبو بەکر نووسراوی دەنووسی (بەم شێوەیە): لە ئەبو بەکری جێنشینی پێغەمبەری خواوە، پاشان عومەر دوای ئەو نووسراوی دەنووسی (بەم شێوەیە): لە عومەری کوڕی خەتتابی جێنشینی ئەبو بەکرەوە، جا یەکەم کەس کێ بوو نووسی: ئەمیری بڕواداران (خۆ ئەمانە نەیان نووسی)؟ گوتی: داپیرەم شیفاء «کە یەکێك بوو لەو ئافرەتانەی لە سەرەتاوە کۆچیان کردبوو، عومەر کوڕی خەتتاب کاتێ دەچووە بازاڕ سەردانی ئەوی دەکرد» (جا ئەو شیفائە) گوتی: عومری کوڕی خەتتاب کتابێکی بۆ کاربەدەستی عێراق نووسی (تێیدا نووسی): دوو پیاوی بەهێزو ژیرم بۆ بنێرن، پرسیاریان لێدەکەم لە بارەی عێراق و خەڵکەکەی، ئەویش لەبیدی کوڕی ڕەبیعەو عەدی کوڕی حاتەمیان بۆ لای نارد، جا هاتن بۆ مەدینەو ئاژەڵەکانیان یەخ کرد لە حەوشەی مزگەوتەکەدا، پاشان هاتنە نێو مزگەوت و عەمری کوڕی عاصیان بینی، پێیان گوت: ئەی عەمر! مۆڵەتمان بۆ وەربگرە بچین بۆ لای ئەمیری بڕواداران، عەمر بە پەلە چوو بۆ لای

---

(١) صحيح الإسناد.

عومەرو گوتی: سڵاوی خوات لەسەر بێ ئەی ئەمیری بڕواداران! عومەریش پێی گوت: ئەم ناوەت لە کوێ هێنا ئەی کوڕی عاص؟ دەچیتە دەرەوە لەبەر ئەو قسەی گوتت، گوتی: باشە، (بەڵام بۆ ئەوە هاتبووم تا پێت بڵێم) لەبیدی کوڕی ڕەبیعەو عەدی کوڕی حاتەم هات بۆ لام و پێیان گوتم: مۆڵەتمان بۆ وەربگرە تا بچین بۆ لای ئەمیری بڕواداران، منیش گوتم: سوێند بە خوا ئێوە هەردووکتان ناوەکەتان پێکا (شتێکی جوانتان داهێناوە)، بێگومان ئەو ئەمیرە، ئێمەش بڕوادارین (کەواتە: ناوی ئەمیری بڕواداران، زۆر تەواوە)، جا لەو ڕۆژەوە نووسراو بەو ناوەوە دەکرا.

٨٧٩- «عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: قَدِمَ مُعَاوِيَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، حَاجًّا حَجَّتَهُ الْأُولَى وَهُوَ خَلِيفَةٌ، فَدَخَلَ عَلَيْهِ عُثْمَانُ بْنُ حُنَيْفٍ الْأَنْصَارِيُّ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا الْأَمِيرُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، فَأَنْكَرَهَا أَهْلُ الشَّامِ وَقَالُوا: مَنْ هَذَا الْمُنَافِقُ الَّذِي يُقَصِّرُ بِتَحِيَّةِ أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ؟ فَبَرَكَ عُثْمَانُ عَلَى رُكْبَتِهِ ثُمَّ قَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، إِنَّ هَؤُلَاءِ أَنْكَرُوا عَلَيَّ أَمْرًا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنْهُمْ، فَوَاللَّهِ لَقَدْ حَيَّيْتُ بِهَا أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ، فَمَا أَنْكَرَهُ مِنْهُمْ أَحَدٌ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ لِمَنْ تَكَلَّمَ مِنْ أَهْلِ الشَّامِ: عَلَى رِسْلِكُمْ، فَإِنَّهُ قَدْ كَانَ بَعْضُ مَا يَقُولُ، وَلَكِنَّ أَهْلَ الشَّامِ قَدْ حَدَثَتْ هَذِهِ الْفِتَنُ، قَالُوا: لَا تُقَصَّرُ عِنْدَنَا تَحِيَّةُ خَلِيفَتِنَا، فَإِنِّي إِخَالُكُمْ يَا أَهْلَ الْمَدِينَةِ تَقُولُونَ لِعَامِلِ الصَّدَقَةِ: أَيُّهَا الْأَمِيرُ»[١].

واتە: عوبەیدی کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: موعاویە (خوا لێی ڕازی بێ) هات بۆ حەج کردنی یەکەمی لەکاتێکدا خەلیفە بوو، جا عوسمانی کوڕی حونەیفی ئەنصاڕی هاتە لای و گوتی: سڵاوی خوات لێ بێ ئەی ئەمیر، لەگەڵ ڕەحمەت و میهرەبانی خوا، جا خەڵکی شام ئەوەیان پێناخۆش بوو و گوتیان: ئەم دووڕووە کێیە کە بە ناتەواوی سڵاو لە ئەمیری بڕواداران دەکات؟ جا عوسمان لەسەر چۆك دانیشت، پاشان گوتی: ئەی ئەمیری بڕوادارن، ئەمانە نکووڵی شتێکم لێدەکەن تۆ لەوان چاکتر دەیزانی (هیچ کێشەی تێدا نیە)، سوێند بە خوا بەو شێوەیە سڵاوم کرد لە ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان، هیچ یەکێکیان نکووڵی ئەوەیان لێ نەکردم، جا موعاویە بەوانەی گوت کە قسەیان کرد لە خەڵکی شام: لەسەرخۆبن، ئەوە هەندێ لە قسەکانی بوو کە گوتی، بەڵام خەڵکی شام ئەم فیتنانەیان لەنێودا پەیدا بوو گوتیان: لە لای ئێمە کەم و کورتی نەکرێ لە سڵاوی خەلیفەکەماندا، ئەی خەڵکی مەدینە من پێم وابێ ئێوە بە کاربەدەستی زەکات دەڵێن: ئەی ئەمیر.

٨٨٠- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى الْحَجَّاجِ فَمَا سَلَّمْتُ عَلَيْهِ»[٢].

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: چوومە ژوورەوە بۆ لای حەججاج و سڵاوم لێ نەکرد (چونکە زاڵم بوو).

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح الإسناد.

٨٨١- «عَنْ تَمِيمِ بْنِ حَذْلَمٍ قَالَ: إِنِّي لَأَذْكُرُ أَوَّلَ مَنْ سَلَّمَ عَلَيْهِ بِالْإِمْرَةِ بِالْكُوفَةِ، خَرَجَ الْمُغِيرَةُ بْنُ شُعْبَةَ مِنْ بَابِ الرَّحَبَةِ، فَفَجَأَهُ رَجُلٌ مِنْ كِنْدَةَ «زَعَمُوا أَنَّهُ: أَبُو قُرَّةَ الْكِنْدِيُّ» فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا الْأَمِيرُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، فَكَرِهَهُ، فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ أَيُّهَا الْأَمِيرُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، هَلْ أَنَا إِلَّا مِنْهُمْ، أَمْ لَا؟ قَالَ سِمَاكٌ: ثُمَّ أَقَرَّ بِهَا بَعْدُ»[١].

واته: تەمیمی کوڕی حەذلەم دەڵێ: من یەکەم کەسم بە بیرم دێ کە سڵاوی لێکرا بە ناوی ئەمیر لە کوفە، (بابەتەکە ئاوا بوو): موغیرەی کوڕی شوعبە لە دەرگای پێشوازی کوفە چووە دەرەوە، جا لە ناکاو پیاوێکی کیندی تووش بوو «گوتوویانە ئەبو قوڕڕەی کیندی بووە» جا سڵاوی لێکرد، گوتی: سڵاوی خوات لێ بێ ئەی ئەمیر، لەگەڵ ڕەحمەتی خوا، (موغیرەی کوڕی شوعبەش گوتی:) سڵاوی خواتان لێ بێ، پێی ناخۆش بوو (کە پێی گوت: ئەی ئەمیر)، ئنجا گوتی: سڵاوی خوات لێ بێ ئەی ئەمیر وە ڕەحمەتی خوایش، (موغیرەی کوڕی شوعبەش گوتی:) سڵاوی خواتان لێ بێ، (دوایی موغیرە) گوتی: ئایا من لەوانم (لە ئەمیرەکانم) یان نا؟ سیماك گوتی: پاشان دوای ئەوە دانی پێدانا.

## دەربارەی: سڵاو کردن لە خەوتوو

٨٨٢- «عَنِ الْمِقْدَادِ بْنِ الْأَسْوَدِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَجِيءُ مِنَ اللَّيْلِ، فَيُسَلِّمُ تَسْلِيْمَاً لَا يُوقِظُ نَائِـمَاً، وَيُسْمِعُ الْيَقْظَانَ»[٢].

واته: میقدادی کوڕی ئەسوەد (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە شەودا دەهات و سڵاوێکی وای دەکرد خەوتووی بە خەبەر نەدەکردەوە و ئەوانەشی کە بەخەبەر بوون گوێبیستی دەکردن و گوێیان لێ دەبوو.

## دەربارەی: بەخێرهاتن

٨٨٣- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَتْ: أَقْبَلَتْ فَاطِمَةُ تَمْشِي كَأَنَّ مِشْيَتَهَا مَشْيُ النَّبِيِّ ﷺ ، فَقَالَ: «مَرْحَبًا بِابْنَتِي»، ثُمَّ أَجْلَسَهَا عَنْ يَمِينِهِ، أَوْ عَنْ شِمَالِهِ»[٣].

واته: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: فاتیمە (خوا لێی ڕازی بێ) هات بە پێ دەڕۆیشت، ڕۆیشتنی بە ڕۆیشتنی پێغەمبەر ﷺ دەچوو، جا فەرمووی: بەخێر هاتی کچەکەم! پاشان داینیشاند لە لای ڕاستی، یان لای چەپی.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح: «آداب الزفاف» (١٦٧- ١٦٩/ الطبعة الجديدة)، [ليس في شيء من الكتب الستة].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٩٤٨): [البخاري: ٦٤- كتاب المغازي، ٨٣- باب: مرض النبي ﷺ. مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ٩٨].

٨٨٤- «عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: اسْتَأْذَنَ عَمَّارٌ(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَلَى النَّبِيِّ ﷺ ، فَعَرَفَ صَوْتَهُ، فَقَالَ: «مَرْحَبًا بِالطَّيِّبِ الْمُطَيَّبِ»»[1].

واتە: عەلی (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: عەمار (خوا لێی ڕازی بێ) مۆڵەتی هاتنە لای پێغەمبەری ﷺ وەرگرت، جا (پێغەمبەر) دەنگی ناسی و فەرمووی: بەخێر بێت پاك و پاككراوە.

## دەربارەی: وەڵامدانەوەی سڵاو چۆنە؟

٨٨٥- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فِي ظِلِّ شَجَرَةٍ بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ، إِذْ جَاءَ أَعْرَابِيٌّ مِنَ أَجْلَفِ النَّاسِ وَأَشَدِّهِمْ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، فَقَالُوا: وَعَلَيْكُمُ السَّلَامُ»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین لە ژێر سێبەری درەختێك لە نێوان مەککەو مەدینەدا، جا لەو کاتەدا پیاوێکی دەشتەکی هات، کە لە دڵڕەقترین و توندترینی خەڵکی بوو، گوتی: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ) گوتیان: (وَعَلَيْكُمُ السَّلَامُ).

٨٨٦- «عَنْ أَبِي جَمْرَةَ، سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، إِذَا سُلِّمَ عَلَيْهِ يَقُولُ: وَعَلَيْكَ، وَرَحْمَةُ اللَّهِ»[3].

واتە: ئەبو جەمرە دەڵێ: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) ئەگەر سڵاوی لێکرابا، دەیگوت: (وَعَلَيْكَ، وَرَحْمَةُ اللَّهِ).

٨٨٧- «قَالَتْ قَيْلَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): قَالَ رَجُلٌ: السَّلَامُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «وَعَلَيْكَ السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ»»[4].

واتە: قەیلە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێك گوتی: (السَّلَامُ عَلَيْكَ) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: (وَعَلَيْكَ السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ).

٨٨٨- «عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ حِينَ فَرَغَ مِنْ صَلَاتِهِ، فَكُنْتُ أَوَّلَ مَنْ حَيَّاهُ بِتَحِيَّةِ الْإِسْلَامِ، فَقَالَ: وَعَلَيْكَ، «وَعَلَيْكَ، وَرَحْمَةُ اللَّهِ، مِمَّنْ أَنْتَ؟» قُلْتُ: مِنْ غِفَارٍ»[5].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٤٦٧/٢): [الترمذي: ٤٦- كتاب المناقب، ٣٤- باب: مناقب عمار بن ياسر رضي الله عنهما. إبن ماجه: المقدمة، ١١- باب: فضائل أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ح ١٤٦].

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) حسن صحيح: «مختصر الشمائل المحمدية» (٥٣/ التحقيق الثاني): [ليس في شيء من اكتب الستة].

(٥) صحيح: [مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ١٣٢] .

واته: ئه‌بو زه‌ڕ (خوا لێی ڕازی بێ)، ده‌ڵێ: هاتم بۆ لای پێغه‌مبه‌ر ﷺ كاتێ له‌ نوێژ ته‌واو بوو، جا من یه‌كه‌مین كه‌س بووم سڵاوم لێكرد به‌ سڵاوی ئیسلام، ئه‌ویش فه‌رمووی: (وَعَلَيْكَ، وَرَحْمَةُ اللَّهِ)، تۆ له‌ كێی (له‌ چ هۆزێكی)؟ گوتم: له‌ غیفار.

٨٨٩- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : «يَا عَائِشُ، هَذَا جِبْرِيلُ، وَهُوَ يَقْرَأُ عَلَيْكِ السَّلَامَ»، قَالَتْ: فَقُلْتُ: وَعَلَيْهِ السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، تَرَى مَا لَا أَرَى. تُرِيدُ بِذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ»[١].

واته: عائیشه‌ (خوا لێی ڕازی بێ) ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی: ئه‌ی عائیشه‌ ئه‌مه‌ جبریله‌ سڵاوت لێ ده‌كات، ده‌ڵێ: گوتم: (وَعَلَيْهِ السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ) تۆ ده‌یبینی و ئێمه‌ نایبینین. مه‌به‌ستی پێی پێغه‌مبه‌ر ﷺ بوو (وه‌ ویستی هۆكاری وتنی زه‌میری غائیبیش ڕوون بكاته‌وه‌، چونكه‌ خۆی نه‌یبینیوه‌ بۆیه‌ به‌ غائیب مامه‌ڵه‌ی له‌گه‌ڵ كردوه‌ هه‌رچه‌نده‌ له‌وێش بووبێ).

٨٩٠- «عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنَ قُرَّةَ(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ لِي أَبِي: يَا بُنَيَّ، إِذَا مَرَّ بِكَ الرَّجُلُ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، فَلَا تَقُلْ: وَعَلَيْكَ، كَأَنَّكَ تَخُصُّهُ بِذَلِكَ وَحْدَهُ، فَإِنَّهُ لَيْسَ وَحْدَهُ، وَلَكِنْ قُلِ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ»[٢].

واته: مه‌عاویه‌ی كوڕی قوڕره‌ (خوا لێی ڕازی بێ) ده‌ڵێ: باوكم پێی گوتم: ئه‌ی ڕۆڵه‌كه‌م! ئه‌گه‌ر پیاوێك تێپه‌ڕ بوو به‌ لاتداو گوتی: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ)، مه‌ڵێ: (وَعَلَيْكَ)، وه‌ك بڵێی بته‌وێ سڵاوه‌كه‌ تایبه‌ت بكه‌ی به‌و، چونكه‌ ئه‌و به‌ ته‌نها نیه‌ (فریشته‌ی له‌گه‌ڵن)، به‌ڵكو بڵێ: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ).

## ده‌رباره‌ی: ئه‌و كه‌سه‌ی وه‌ڵامی سڵاو ناداته‌وه‌

٨٩١- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الصَّامِتِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قُلْتُ لِأَبِي ذَرٍّ: مَرَرْتُ بِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أُمِّ الْحَكَمِ فَسَلَّمْتُ، فَمَا رَدَّ عَلَيَّ شَيْئًا؟ فَقَالَ: يَا ابْنَ أَخِي، مَا يَكُونُ عَلَيْكَ مِنْ ذَلِكَ؟ رَدَّ عَلَيْكَ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْهُ، مَلَكٌ عَنْ يَمِينِهِ»[٣].

واته: عه‌بدوڵڵای كوڕی صامت (خوا لێی ڕازی بێ) ده‌ڵێ: به‌ ئه‌بو زه‌ڕم گوت: تێپه‌ڕیم به‌لای عه‌بدوڕڕه‌حمانی كوڕی ئومولحه‌كه‌م و سڵاوم لێكرد، كه‌چی وه‌ڵامی سڵاوه‌كه‌ی نه‌دامه‌وه‌؟ ئه‌ویش گوتی: ئه‌ی برازاكه‌م، تۆ له‌مه‌دا چیت له‌سه‌ره‌؟ (هیچت له‌سه‌ر نیه‌و خه‌م له‌ چی ده‌خۆی)، كه‌سێك وه‌ڵامی دایه‌وه‌ زۆر چاكتره‌ له‌و، ئه‌ویش فریشته‌یه‌كه‌ له‌لای (شانی) ڕاسته‌ی.

---

(١) صحيح: [البخاري: ٥٩- كتاب بدء الخلق، ٦- باب: ذكر الملائكة، ح ١٥٤٩. مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ٩٠و ٩١].

(٢) صحيح: «الضعيفة» تحت الحديث (٥٧٥٣).

(٣) صحيح الإسناد موقوفاً على أبي ذر، وصح مرفوعاً عن غيره «انظر تخريج الذي يليه» .

٨٩٢- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: إِنَّ السَّلَامَ اسْمٌ مِنْ أَسْمَاءِ اللَّهِ، وَضَعَهُ اللَّهُ فِي الْأَرْضِ، فَأَفْشُوهُ بَيْنَكُمْ، إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا سَلَّمَ عَلَى الْقَوْمِ فَرَدُّوا عَلَيْهِ كَانَتْ لَهُ عَلَيْهِمْ فَضْلُ دَرَجَةٍ، لِأَنَّهُ ذَكَّرَهُمُ السَّلَامَ، وَإِنْ لَمْ يُرَدَّ عَلَيْهِ رَدَّ عَلَيْهِ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْهُ وَأَطْيَبُ»[١]

**واته: عەبدوڵلا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: بێگومان (السَّلَامَ) ناوێکە لە ناوەکانی خوا لەسەر زەوی دایناوە، بۆیە لە نێوانتاندا بڵاوی بکەنەوە، بە دڵنیایی ئەگەر پیاوێك سڵاو لە کۆمەڵێك بکات، ئەوانیش وەڵامی بدەنەوە، ئەوە یەك پلە فەزڵی لەوان زیاترە، چونکە سەلامی خوای بیرخستوونەوە، وە ئەگەر وەڵام نەدرایەوە، ئەوە کەسێك وەڵامی دەداتەوە کە لەو (کەسەی سڵاوی لێکراوە و وەڵامی نەداوەتەوە) چاکترو پاکترە.**

٨٩٣- «عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: التَّسْلِيمُ تَطَوُّعٌ، وَالرَّدُّ فَرِيضَةٌ»[٢].

**واته: حەسەن دەڵێ: سڵاو کردن سوننەتەو، وەڵامدانەوەشی فەڕزە.**

## دەربارەی: ئەوە کەسەی ڕەزیلی دەکات لە سڵاو کردن

٨٩٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أَبْخَلُ النَّاسِ الَّذِي يَبْخَلُ بِالسَّلَامِ، وَإِنَّ أَعْجَزَ النَّاسِ مَنْ عَجَزَ بِالدُّعَاءِ»[٣]

**واته: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: ڕەزیلترین و چرووکترینی خەڵکی ئەو کەسەیە لە سڵاو کردن ڕەزیلە، وە لاوازترین و بێ تواناترینی خەڵکی ئەو کەسەیە کە بێ توانایە لە دوعا کردن.**

## دەربارەی: سڵاو کردن لە منداڵان

٨٩٥- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ مَرَّ عَلَى صِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، وَقَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَفْعَلُهُ بِهِمْ»[٤].

**واته: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە (خوا لێی ڕازی بێ) گێڕدراوەتەوە کە تێپەڕیوە بە لای کۆمەڵە منداڵێکداو سڵاوی لێ کردوون، وە گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ ئاوای لەگەڵ دەکردن (سڵاوی لێ دەکردن).**

---

(١) صحيح موقوفاً وصح مرفوعاً: «السلسلة الصحيحة» (١٨٤و ١٦٠٧).

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد موقوفاً، وصح مرفوعاً: «السلسلة الصحيحة» (٦٠١).

(٤) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٢٧٨ و ٢٩٥٠): [البخاري: ٧٩- كتاب الاستئذان، ١٥- باب: التسليم على الصبيان ح ٢٣٧٣. مسلم: ٣٩- كتاب السلام، ح ١٤، ١٥].

٨٩٦- «عَنْ عَنْبَسَةَ قَالَ: رَأَيْتُ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا)، يُسَلِّمُ عَلَى الصِّبْيَانِ فِي الْكُتَّابِ»[١].

واتە: عەنبەسە دەڵێ: ئیبنو عومەرم بینی (خوا لێیان ڕازی بێ)، سڵاوی دەکرد لە منداڵان لە شوێن و فێرگەکان (ی قورئان خوێندن).

## دەربارەی: سڵاو کردنی ئافرەتان لە پیاوان

٨٩٧- «عَنْ أَبِي النَّضْرِ، أَنَّ أَبَا مُرَّةَ مَوْلَى أُمِّ هَانِئٍ ابْنَةِ أَبِي طَالِبٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ أُمَّ هَانِئٍ تَقُولُ: ذَهَبْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يَغْتَسِلُ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: «مَنْ هَذِهِ؟» فَقُلْتُ: أُمُّ هَانِئٍ، قَالَ: «مَرْحَباً بِأُمِّ هَانِئٍ»»[٢].

واتە: ئەبو نەضر دەگێڕێتەوە، ئەبو مورڕەی خزمەتکاری دایکی هانیئی، کچی ئەبو تاڵیب هەواڵی پێداوە کە لە دایکی هانیئی بیستووە گوتوویەتی: ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لەکاتێکدا خۆی دەشۆرد، جا سڵاوم لێکرد، ئەویش فەرمووی: ئەوە کێیە؟ منیش گوتم: دایکی هانیئم، فەرمووی: بەخێر بێیت دایکی هانیء.

٨٩٨- «عَنِ الْحَسَنِ (رَحِمَهُ اللَّه)، يَقُولُ: كُنَّ النِّسَاءُ يُسَلِّمْنَ عَلَى الرِّجَالِ»[٣].

واتە: حەسەن (ڕەحمەتی لێ بێ) دەڵێ: ئافرەتان سڵاویان لە پیاوان دەکرد.

## دەربارەی: سڵاو کردنی پیاوان لە ئافرەتان

٨٩٩- «عَنْ أَسْمَاءَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَتْ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَرَّ فِي الْمَسْجِدِ، وَعُصْبَةٌ مِنَ النِّسَاءِ قُعُودٌ، قَالَ بِيَدِهِ إِلَيْهِنَّ بِالسَّلَامِ، فَقَالَ: «إِيَّاكُنَّ وَكُفْرَانَ الْمُنْعِمِينَ، إِيَّاكُنَّ وَكُفْرَانَ الْمُنْعِمِينَ»، قَالَتْ إِحْدَاهُنَّ: نَعُوذُ بِاللَّهِ، يَا نَبِيَّ اللَّهِ، مِنْ كُفْرَانِ نِعَمِ اللَّهِ، قَالَ: بَلَى إِنَّ إِحْدَاكُنَّ تَطُولُ أَيْمَتُهَا، ثُمَّ تَغْضَبُ الْغَضْبَةَ فَتَقُولُ: وَاللَّهِ مَا رَأَيْتُ مِنْهُ سَاعَةً خَيْراً قَطُّ، فَذَلِكَ كُفْرَانُ نِعَمِ اللَّهِ، وَذَلِكَ كُفْرَانُ نِعَمِ الْمُنْعِمِينَ»[٤].

واتە: ئەسماء (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بە نێو مزگەوتدا، جا کۆمەڵێك لە ئافرەتانیش دانیشتبوون، (پێغەمبەریش ﷺ) بە دەستی سڵاوی لێکردن و فەرمووی: نەکەن

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح: [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٩٤- باب: ماجاء في زعموا. مسلم: ٦- كتاب صلاة المسافرين، ح ٨٢].

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح: دون ذكر اليد، «جلباب المرأة المسلمة» «١٩٢-٢٩٤»، «السلسلة الصحيحة» «٨٢٣»: [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ١٣٧- باب: في السلام على النساء. الترمذي: ٤٠- كتاب الاستئذان، ٩- باب: ماجاء في التسلي على النساء].

سپڵەیی بنوێنن بەرانبەر چاکەکاران (کاتێ چاکەیەکتان لەگەڵ دەکەن)، نەکەن سپڵەیی بنوێنن بەرانبەر چاکەکاران، یەکێکیان گوتی: پەنا دەگرین بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کەسانە بین سپڵە بین بە بەخششەکانی خوا، فەرمووی: با، کەسی واتان تێدایە ماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوەو شوو ناکات (لای دایك و باوکی دەمێنێتەوە بێ هاوسەر، پاشان خوا مێردی پێ دەبەخشێ و منداڵی پێ دەبەخشێ)، پاشان بە شێوەیەك تووڕە دەبێ (لە مێردەکەی) دەڵێ: سوێند بە خوا هەرگیز ساتێك خێرم لێ نەبینیوە، ئا ئەوە سپڵەییە بە بەخششەکانی خوا، وە ئەوە سپڵەیی نیعمەتی چاکەکارانە.

٩٠٠- «عَنْ أَسْمَاءَ ابْنَةِ يَزِيدَ الْأَنْصَارِيَّةِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قالت، مَرَّ بِيَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَنَا فِي جِوَارِ أَتْرَابٍ لِي، فَسَلَّمَ عَلَيْنَا وَقَالَ: «إِيَّاكُنَّ وَكُفْرَ الْمُنْعِمِينَ»، وَكُنْتُ مِنْ أَجْرَئِهِنَّ عَلَى مَسْأَلَتِهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا كُفْرُ الْمُنْعِمِينَ؟ قَالَ: لَعَلَّ إِحْدَاكُنَّ تَطُولُ أَيْمَتُهَا مِنْ أَبَوَيْهَا، ثُمَّ يَرْزُقُهَا اللَّهُ زَوْجاً، وَيَرْزُقُهَا مِنْهُ وَلَداً، فَتَغْضَبُ الْغَضْبَةَ فَتَكْفُرُ فَتَقُولُ: مَا رَأَيْتُ مِنْكَ خَيْراً قَطُّ»[١].

واتە: ئەسمائی کچی یەزیدی ئەنصاری (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بەلامدا، لەوکاتەدا لەگەڵ هاوتەمەنانمدا دانیشتبووم، جا سڵاوی لێکردین و فەرمووی: نەکەن سپڵەیی بنوێنن بەرانبەر چاکەکاران، جا من بوێرترینیان بووم لە پرسیار لێکردنی، بۆیە گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سپڵە بوون بە نیعمەتی چاکەکاران چیە؟ فەرمووی: لەوانەیە یەکێك لە ئێوە ماوەیەکی زۆر بمێنێتەوە لای دایك و باوکی (شوو نەکات)، پاشان خوا مێردێکی پێ ببەخشێ و لەویش منداڵی پێ ببەخشێ، جا کاتێ کە تووڕە ببێ (لە مێردەکەی)، سپڵەیی بکات و بڵێ: هەرگیز ساتێك خێرم لێ نەبینیوی.

## دەربارەی: ئەو کەسەی سڵاو کردنی پێناخۆشە لە کەسانێکی دیاریکراو

٩٠١- «عَنْ طَارِقٍ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَبْدِ اللَّهِ جُلُوساً، فَجَاءَ آذِنُهُ فَقَالَ: قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، فَقَامَ وَقُمْنَا مَعَهُ، فَدَخَلْنَا الْمَسْجِدَ، فَرَأَى النَّاسَ رُكُوعاً فِي مُقَدَّمِ الْمَسْجِدِ، فَكَبَّرَ وَرَكَعَ، وَمَشَيْنَا وَفَعَلْنَا مِثْلَ مَا فَعَلَ، فَمَرَّ رَجُلٌ مُسْرِعٌ فَقَالَ: عَلَيْكُمُ السَّلَامُ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، فَقَالَ: صَدَقَ اللَّهُ، وَبَلَّغَ رَسُولُهُ، فَلَمَّا صَلَّيْنَا رَجَعَ، فَوَلَجَ عَلَى أَهْلِهِ، وَجَلَسْنَا فِي مَكَانِنَا نَنْتَظِرُهُ حَتَّى يَخْرُجَ، فَقَالَ بَعْضُنَا لِبَعْضٍ: أَيُّكُمْ يَسْأَلُهُ؟ قَالَ طَارِقٌ: أَنَا أَسْأَلُهُ، فَسَأَلَهُ، فَقَالَ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ: تَسْلِيمُ الْخَاصَّةِ، وَفُشُوُّ التِّجَارَةِ حَتَّى تُعِينَ الْمَرْأَةُ زَوْجَهَا عَلَى التِّجَارَةِ، وَقَطْعُ الْأَرْحَامِ، وَفُشُوُّ الْقَلَمِ، وَظُهُورُ الشَّهَادَةِ بِالزُّورِ، وَكِتْمَانُ شَهَادَةِ الْحَقِّ»[٢].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨٢٣) .

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٧٦٧)، [ليس في شيء من الكتب الستة، وانظر «المسند» ح ٣٨٧٠].

واتە: طاريق دەڵێ: ئێمە لەلای عەبدوڵلا دانیشتبووین، جا بانگبێژەکەی هات، گوتی: (قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ)، ئەویش هەڵساو ئێمەش لەگەڵی هەڵساین و چووینە نێو مزگەوت، کە بینی خەڵکەکە لە ڕکووعدا بوون لە پێشی مزگەوتەکەوە، ئەویش تەکبیری کردو چووە ڕکووع، ئێمەش لەگەڵ ئەودا وەکو ئەومان کرد، جا پیاوێك بە پەلە تێپەڕی، وە گوتی: (عَلَيْكُمُ السَّلَامُ) ئەی ئەبو عەبدوڕڕەحمان، ئەویش گوتی: خوا ڕاستی فەرموو، پێغەمبەرەکەشی ڕایگەیاند، جا کاتێ نوێژمان کرد گەڕایەوەو چووە ژوورەوە بۆ نێو ماڵ و منداڵەکەی، ئێمەش لە شوێنی خۆمان دانیشتین و چاوەڕێی ئەومان دەکرد هەتا بێتە دەرەوە، هەندێکمان بە هەندێکی دیکەی گوت: کامەتان پرسیاری لێدەکات؟ طاريق گوتی: من پرسیاری لێ دەکەم، پرسیاری لێکرد، (ئەویش لە وەڵامدا) گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەر لە ڕۆژی دوایی (ئەمانە ڕوودەدەن): سڵاو کردن تەنها لە کەسانێکی تایبەت و دیاریکراوو، بڵاوبوونەوەو زۆربونی بازرگانی هەتا وای لێ دێت ئافرەت دەبێتە یارمەتی دەری مێردەکەی لە بازرگانیداو، پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی و، زۆربوون و بڵاوبوونەوەی پێنووس و، زۆربوونی شایەتیدانی بە درۆ، وە شاردنەوەی شایەتی هەق و ڕاست.

٩٠٢- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: أَيُّ الْإِسْلَامِ خَيْرٌ؟ قَالَ: «تُطْعِمُ الطَّعَامَ، وَتَقْرَأُ السَّلَامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ»»[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە (دەڵێ:) پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد: باشترین ئیسلامەتی کامەیە؟ فەرمووی: خواردن ببەخشی و، سڵاو بکەی لەو کەسەی دەیناسی و لەو کەسەش کە نایناسی.

## دەربارەی: چۆنیەتی دابەزینی ئایەتی حیجاب؟

٩٠٣- «عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَنَسٌ، أَنَّهُ كَانَ ابْنَ عَشْرِ سِنِينَ مَقْدَمَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ، فَكُنَّ أُمَّهَاتِي يُوَطِّوِّنَنِي عَلَى خِدْمَتِهِ، فَخَدَمْتُهُ عَشْرَ سِنِينَ، وَتُوُفِّيَ وَأَنَا ابْنُ عِشْرِينَ، فَكُنْتُ أَعْلَمَ النَّاسِ بِشَأْنِ الْحِجَابِ، فَكَانَ أَوَّلُ مَا نَزَلَ مَا ابْتَنَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِزَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، أَصْبَحَ بِهَا عَرُوساً، فَدَعَى الْقَوْمَ فَأَصَابُوا مِنَ الطَّعَامِ، ثُمَّ خَرَجُوا، وَبَقِيَ رَهْطٌ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَطَالُوا الْمُكْثَ، فَقَامَ فَخَرَجَ وَخَرَجْتُ لِكَيْ يَخْرُجُوا، فَمَشَى فَمَشَيْتُ مَعَهُ، حَتَّى جَاءَ عَتَبَةَ حُجْرَةِ عَائِشَةَ، ثُمَّ ظَنَّ أَنَّهُمْ خَرَجُوا، فَرَجَعَ وَرَجَعْتُ مَعَهُ حَتَّى دَخَلَ عَلَى زَيْنَبَ، فَإِذَا هُمْ جُلُوسٌ، فَرَجَعَ وَرَجَعْتُ حَتَّى بَلَغَ عَتَبَةَ حُجْرَةِ عَائِشَةَ، وَظَنَّ أَنَّهُمْ خَرَجُوا، فَرَجَعَ وَرَجَعْتُ مَعَهُ، فَإِذَا هُمْ قَدْ خَرَجُوا، فَضَرَبَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنِي وَبَيْنَهُ السِّتْرَ، وَأَنْزَلَ الْحِجَابَ»[2].

---

(١) صحيح: [البخاري: ٢- كتاب الإيمان، ٦- باب: إطعام الطعام في الإسلام. مسلم: ١- كتاب الإيمان، ح ٦٣].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣١٤٨): [البخاري: ٦٥- كتاب التفسير، ٣٣- سورة الأحزاب، ٨- باب: قوله تعالى: لا تدخلوا

واتە: ئیبنو شیهاب دەڵێ: ئەنەس هەواڵی پێدام (باسی خۆی دەکرد، گوتی:) تەمەنی دە ساڵان بووە کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتۆتە مەدینە، دایکانم هانیان دەدام لەسەر خزمەتکردنی پێغەمبەر ﷺ، منیش دە ساڵ لە خزمەتی بووم، وە کاتێك پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد، تەمەنم بیست ساڵ بوو، وە شارەزاترین کەس بووم لە بارەی حیجابەوە، یەکەمجار (کە ئایەت دەربارەی حیجاب) دابەزی ئەو کاتە بوو پێغەمبەر ﷺ زەینەبی کچی جەحشی گواستەوە و بووە هاوسەری، خەڵکی بانگکرد بۆ نان خواردن، خەڵکەکە خواردنیان خوارد، پاشان چوونە دەرەوە، کۆمەڵێکیش مانەوە لای پێغەمبەر و ﷺ زۆر مانەوە نەڕۆیشتن، پێغەمبەریش ﷺ هەڵسا چووە دەرەوە، (ئەنەس دەڵێ) منیش چوومە دەرەوە بۆ ئەوەی (خەڵکەکە هەست بە خۆیان بکەن) بچنە دەرەوە، (پێغەمبەری خوا) ڕۆیشت و منیش لەگەڵی ڕۆیشتم هەتا گەیشت بە سەکۆی دەرگای ژوورەکەی عائیشە، پاشان گومانی برد ئەوان دەرچوون و ڕۆیشتوون، (بۆیە) گەڕایەوە منیش لەگەڵی گەڕامەوە هەتا چووە ژوورەوە بۆ لای زەینەب، کاتێ تەماشای کرد ئەوان هێشتا دانیشتبوون و نەڕۆیشتوون، جا گەڕایەوەو منیش گەڕامەوە، هەتا گەیشت بە سەکۆی دەرگای ژوورەکەی عائیشە، (دووبارە) گومانی برد ئەوان دەرچوون و ڕۆیشتوون، (بۆیە) گەڕایەوە منیش لەگەڵی گەڕامەوە، (ئەم جارەیان) ئەوان دەرچوو بوون و ڕۆیشتبوون، پێغەمبەر ﷺ لە نێوان من و خۆیدا پەردەیەکی داناو، ئایەتی حیجابیش دابەزی.

## دەربارەی: ئەو سێ کاتەی پێویستە مۆڵەتیان بۆ وەربگیرێ

٩٠٤- «عَنْ ثَعْلَبَةَ بْنِ أَبِي مَالِكٍ الْقُرَظِيِّ، أَنَّهُ رَكِبَ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سُوَيْدٍ «أَخِي بَنِي حَارِثَةَ بْنِ الْحَارِثِ» يَسْأَلُهُ عَنِ الْعَوْرَاتِ الثَّلَاثِ، وَكَانَ يَعْمَلُ بِهِنَّ، فَقَالَ: مَا تُرِيدُ؟ فَقُلْتُ: أُرِيدُ أَنْ أَعْمَلَ بِهِنَّ، فَقَالَ: إِذَا وَضَعْتُ ثِيَابِي مِنَ الظَّهِيرَةِ لَمْ يَدْخُلْ عَلَيَّ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِي بَلَغَ الْحُلُمَ إِلَّا بِإِذْنِي، إِلَّا أَنْ أَدْعُوَهُ، فَذَلِكَ إِذْنُهُ. وَلَا إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ وَتَحَرَّكَ النَّاسُ حَتَّى تُصَلَّى الصَّلَاةُ. وَلَا إِذَا صَلَّيْتُ الْعِشَاءَ وَوَضَعْتُ ثِيَابِي حَتَّى أَنَامَ»[1].

واتە: لە ثەعلەبەی کوڕی ئەبو مالیکی قوڕەظی گێڕدراوەتەوە کە سواری وڵاخەکەی بووەو ڕۆیشتووە بۆ لای عەبدوڵلای کوڕی سوەید «برای نەوەکانی حاریثەی کوڕی حاریث» پرسیاری لێکردوە لەبارەی ئەو سێ کاتەی کە دروست نیە بەبێ مۆڵەت بچنە لای یەکدی (چونکە کاتی خۆ تەنها کردن و پشوودانە)، کە ئەو کاری بەو سێ کاتە دەکرد (پشووی تێدا دەداو ڕێگەی نەدەدا هیچ کەس بچنە لای)، (عەبدوڵلای کوڕی سوەید) گوتی: چیت مەبەستە (بەو سێ کاتە)؟

---

بیوت النبي إلا أن يؤذن لكم. ح٢٠٣٥. مسلم: ١٦- كتاب النكاح، ح ٨٧، ٨٩].

(١) صحيح الإسناد.

گوتم: دەمەوێ کاریان پێ بکەم، گوتی (سێ کاتەکان بەو شێوەیەن): کاتێ پۆشاك دادەنێم لە کاتی نیوەڕۆیاندا بێ مۆڵەتی خۆم کەس نایێ بۆ لام لە کەس وکارم کە باڵغ بووبن، تەنها ئەوە نەبێ کە بانگی دەکەم، ئا ئەوەش مۆڵەت پێدانیەتی، وە کاتێکیش کە بەیان دەردەکەوێ و خەڵکی دەکەونە جووڵە هەتا نوێژ دەکرێ، وە کاتێکیش نوێژی عیشام کردو پۆشاکەکانم دانا تا دەخەوم (ئەوە ئەو سێ کاتەن کە لە قورئاندا هاتوون و، بە کاتی پشوودان و خۆتەنها کردن دانراون، پێویستیان بە مۆڵەت وەرگرتنە).

## دەربارەی: نان خواردنی پیاو لەگەڵ خێزانەکەیدا

٩٠٥- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَتْ: كُنْتُ آكُلُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ حَيْسًا، فَمَرَّ عُمَرُ، فَدَعَاهُ فَأَكَلَ، فَأَصَابَتْ يَدُهُ إِصْبَعِي، فَقَالَ: حَسِّ، لَوْ أُطَاعُ فِيكُنَّ مَا رَأَتْكُنَّ عَيْنٌ. فَنَزَلَ الْحِجَابُ»[1].

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ خواردنی (حَیْس)مان دەخوارد (کە خواردنێکە لە خورماو ڕۆن و کەشك دروست دەکرا)، جا عومەر تێپەڕی بەلاماندا، (پێغەمبەریش ﷺ) بانگی کرد، ئەویش (هات)و لێی خواردو دەستی بەر پەنجەی من کەوت، (هێندەی پێناخۆش بوو)، گوتی: حەسسی (وشەیەکە عەرەب لە کاتی دەستکەوتنیان بە شتی زۆر گەرم بەکاری دێنن، وەك دەستکەوتن بە پشکۆی ئاگر) گوتی: ئەگەر من گوێڕایەڵیم بکرێ (بۆچوونم وایە) بە شێوەیەك بن، هیچ چاوێك نەتانبینێ، ئیدی ئایەتی حیجاب دابەزی.

٩٠٦- «عَنْ سَالِمِ بْنِ سَرْجٍ مَوْلَى أُمِّ صَبِيَّةَ بِنْتِ قَيْسٍ وَهِيَ خَوْلَةُ، وَهِيَ جَدَّةُ خَارِجَةَ بْنِ الْحَارِثِ، أَنَّهُ سَمِعَهَا تَقُولُ: اخْتَلَفَتْ يَدِي وَيَدُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي إِنَاءٍ وَاحِدٍ»[2].

واتە: سالیمی کوڕی سەرجی کۆیلەی ئازادکراوی ئوممی صەبیەی کچی قەیس، کە (ناوی) خەولەیەو داپیرەی خاریجەی کوڕی حاریثەیە، سالیم گوێی لەو بووە کە دەیگوت: دەستی من و دەستی پێغەمبەر ﷺ لە نێو یەك قاپ دابوو (واتە: پێکەوە دەستنوێژیان شۆردوە، جارێك پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوی هەڵگرتوەو، جارێکیش ئافرەتەکە، دیارە ویستویەتی بگات بە بەرەکەتی ئاوی دەستنوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ).

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» تحت الحديث (٣١٤٨)، «الروض النضير» (٨٠١): [ليس في شيء من الكتب الستة].

(٢) صحيح: «صحيح أبي داود» (٧١): [ليس هذا في شيء من الكتب الستة].

## دەربارەی: ئەگەر كەسێك چووە خانووێك كەس تێیدا نیشتەجێ نەبوو

٩٠٧- «عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: إِذَا دَخَلَ الْبَيْتَ غَيْرَ الْمَسْكُونِ فَلْيَقُلِ: السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ»[1].

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە عەبدوڵلای كوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتوویەتی: ئەگەر كەسێك چووە نێو ماڵێكەوە كەسی تێدا نیشتەجێ نەبوو (خالی بوو لە مرۆڤ)، با بڵێ: (السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ) واتە: سڵاو لەسەر ئێمەو لەسەر بەندە چاكەكانی خوا.

٩٠٨- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ﴿٢٧﴾﴾النور، وَاسْتَثْنَى مِنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: ﴿لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَاعٌ لَّكُمْ ﴿٢٩﴾﴾النور، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٢٩﴾﴾»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ﴿٢٧﴾﴾، (واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! مەچنە ماڵانێك جگە لە ماڵی خۆتان، هەتا مۆڵەت وەردەگرن بە شێوەیەكی هۆگرانەو سڵاو لە خەڵكەكەی دەكەن). جا (خوای پەروەردگار) لەوەدا هەڵاواردنی كردووەو فەرموویەتی: ﴿لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَاعٌ لَّكُمْ ﴿٢٩﴾﴾النور، (گوناهتان ناگات كە (بەبێ مۆڵەت وەرگرتن) بچنە شوێنە گشتییەكانەوە كە سوودێكیان بۆتان تێدایە) هەتا دەگاتە: ﴿تَكْتُمُونَ ﴿٢٩﴾﴾، (گشتی هەڵاواردنە لەو ئایەتەی پێشەوە).

## دەربارەی: ئەم ئایەتە: ﴿وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ ﴿٥٨﴾﴾[3]:

٩٠٩- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّهُ كَانَ إِذَا بَلَغَ بَعْضُ وَلَدِهِ الْحُلُمَ عَزَلَهُ، فَلَمْ يَدْخُلْ عَلَيْهِ إِلَّا بِإِذْنٍ»[4].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) كاتێ كە منداڵێكی باڵغ ببووایە جیای دەكردەوە، جا (منداڵەكەی) نەدەچووە ژوورەوە بۆ لای، مەگەر بە مۆڵەت نەبووایە (ئاوا فێری كردبوون).

---

(١) حسن الإسناد، وكذا قال الحافظ في «الفتح» (١١/١٧).

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) سورة النور.

(٤) صحيح الإسناد.

## دەربارەی: مرۆڤ داوای مۆڵەت دەکات بۆ چوونە لای دایکی

٩١٠- «عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، قَالَ: أَسْتَأْذِنُ عَلَى أُمِّي؟ فَقَالَ: مَا عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهَا تُحِبُّ أَنْ تَرَاهَا»[١].

واتە: عەلقەمە دەڵێ: پیاوێك هات بۆ لای عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ)، گوتی: ئایا داوای مۆڵەت بکەم بۆ چونە لای دایکم؟ ئەویش گوتی: (دایکت) حەز ناکات تۆ بە هەموو شێوەیەك ببینی (کەواتە: دەبێ مۆڵەتی لێ وەربگری، ئنجا بچیت بۆ لای).

٩١١- «عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: سَمِعْتُ مُسْلِمَ بْنَ نَذِيرٍ يَقُولُ: سَأَلَ رَجُلٌ حُذَيْفَةَ فَقَالَ: أَسْتَأْذِنُ عَلَى أُمِّي؟ فَقَالَ: إِنْ لَمْ تَسْتَأْذِنْ عَلَيْهَا رَأَيْتَ مَا تَكْرَهُ»[٢].

واتە: ئەبو ئیسحاق دەڵێ: گوێم لە موسلیمی کوڕی نەزیر بوو دەیگوت: پیاوێك پرسیاری لە حوزەیفە کرد گوتی: ئایا مۆڵەت وەربگرم بۆ چوونە لای دایکم؟ (ئەویش) گوتی: ئەگەر مۆڵەتی لێ وەرنەگری ئەوەی پێت ناخۆشە دەیبینی (واتە: لەوانەیە بە شێوەیەك ببینی کە پێت خۆش نەبێ).

## دەربارەی: مرۆڤ مۆڵەت وەردەگرێ بۆ چوونە لای خوشکی

٩١٢- «عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، فَقُلْتُ: أَسْتَأْذِنُ عَلَى أُخْتِي؟ فَقَالَ: نَعَمْ، فَأَعَدْتُ فَقُلْتُ: أُخْتَانِ فِي حِجْرِي، وَأَنَا أَمُونُهُمَا وَأُنْفِقُ عَلَيْهِمَا، أَسْتَأْذِنُ عَلَيْهِمَا؟ قَالَ: نَعَمْ، أَتُحِبُّ أَنْ تَرَاهُمَا عُرْيَانَتَيْنِ؟ ثُمَّ قَرَأَ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ﴾النور، إِلَى: ﴿ثَلَـٰثُ عَوْرَٰتٍ لَّكُمْ ﴿٥٨﴾﴾النور، قَالَ: فَلَمْ يُؤْمَرْ هَؤُلَاءِ بِالْإِذْنِ إِلَّا فِي هَذِهِ الْعَوْرَاتِ الثَّلَاثِ، قَالَ: ﴿وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَـٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ ﴿٥٨﴾﴾النور، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما): فَالْإِذْنُ وَاجِبٌ. زَادَ ابْنُ جُرَيْجٍ: عَلَى النَّاسِ كُلِّهِمْ»[٣].

واتە: عەطاء دەڵێ: پرسیارم لە ئیبنو عەبباس کرد (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتم: ئایا مۆڵەت وەربگرم بۆ چوونە لای خوشکەکەم؟ گوتی: بەڵێ، منیش دووبارەم کردەوەو گوتم: هەردوو خوشکەکەم لای خۆمن، من بژێویان دەدەم و خەرجیان دەکێشم، ئایا داوای مۆڵەتیان لێ بکەم کە دەچم بۆ لایان؟ گوتی: بەڵێ، ئایا پێت خۆشە بە ڕووتی بیانبینی؟ پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا

---

(١) صحيح الإسناد.
(٢) صحيح الإسناد.
(٣) صحيح الإسناد.

ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِيَسۡتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ ﴾ (واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! با کۆیلەو بەردەستەکانتان و ئەوانەش کە باڵغ نەبوون (لە منداڵەکانتان چ کوڕ چ کچ) سێ کەڕەتان (لە سێ کاتتاندا، بۆ هاتنە ژوورەکانتان) مۆڵەتتان لێوەربگرن: پێش نوێژی بەیانیی و کاتێك پۆشاکەکانتان دادەنێن، لە نیوەڕۆدا (بۆ سەرخەو شکاندنی قەیلوولە) و، دوای نوێژی خەوتنان، هەتا دەگاتە: ﴿ ثَلَٰثُ عَوۡرَٰتٖ لَّكُمۡ ﴿٥٨﴾ ﴾ (واتە: ئەمانە سێ «کاتی دەرکەوتنی» عەورەتتانن، جگە لەو کاتانە ئێوەش و ئەوانیش بە هۆی بەسەر یەکدیەوە گەڕانەوە، گوناهتان ناگاتێ..)، گوتی: ئەمانە فەرمانیان پێ نەکراوە بە مۆڵەت وەرگرتن تەنها لەم سێ کاتەی خۆتەنها کردن نەبێت، فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا بَلَغَ ٱلۡأَطۡفَٰلُ مِنكُمُ ٱلۡحُلُمَ ﴿٥٩﴾ ﴾ (واتە: هەر کاتێکیش منداڵەکانتان باڵغ بوون با مۆڵەت وەربگرن «بۆ هاتنە ژوور» وەك ئەوانەی پێش وان مۆڵەتیان وەرگرت)، ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتی: مۆڵەت وەرگرتن واجبە، ئیبنو جورەیج ئەوەی زیاد کرد (کە گوتوویەتی): لەسەر هەموو خەڵکی (واتە: واجبیەتی مۆڵەت وەرگرتنەکە بۆ هەموو خەڵکیە).

## دەربارەی: مۆڵەت وەرگرتن سێ جارە

٩١٣- «عَنْ عُبَيْدِ بْنِ عُمَيْرٍ، أَنَّ أَبَا مُوسَى الْأَشْعَرِيَّ اسْتَأْذَنَ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، فَلَمْ يُؤْذَنْ لَهُ «وَكَأَنَّهُ كَانَ مَشْغُولاً» فَرَجَعَ أَبُو مُوسَى، فَفَرَغَ عُمَرُ فَقَالَ: أَلَمْ أَسْمَعْ صَوْتَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَيْسٍ؟ إيذَنُوا لَهُ، قِيلَ: قَدْ رَجَعَ، فَدَعَاهُ، فَقَالَ: كُنَّا نُؤْمَرُ بِذَلِكَ، فَقَالَ: تَأْتِينِي عَلَى ذَلِكَ بِالْبَيِّنَةِ، فَانْطَلَقَ إِلَى مَجْلِسِ الْأَنْصَارِ فَسَأَلَهُمْ، فَقَالُوا: لَا يَشْهَدُ لَكَ عَلَى هَذَا إِلَّا أَصْغَرُنَا: أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ فَذَهَبَ بِأَبِي سَعِيدٍ، فَقَالَ عُمَرُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): أَخَفِيَ عَلَيَّ مِنْ أَمْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ أَلْهَانِي الصَّفْقُ بِالْأَسْوَاقِ، يَعْنِي الْخُرُوجَ إِلَى التِّجَارَةِ»[1].

واتە: عوبەیدی کوڕی عومەیر دەگێڕێتەوە (دەڵێ:) ئەبو مووسای ئەشعەری داوای مۆڵەتی کرد بچێت بۆ لای عومەر، (داوای مۆڵەت کردن) مۆڵەتی پێنەدرا، «چونکە سەرقاڵ بوون»، ئیدی ئەبو مووساش گەڕایەوە، پاشان عومەر سەرقاڵیەکەی نەماو تەواو بوو، گوتی: ئایا گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی قەیس نەبوو (واتە: وابزانم ئەبو مووسا دەنگی هات و داوای مۆڵەتی کرد)؟ دەی مۆڵەتی پێبدەن، گوترا: گەڕایەوە (ڕۆیشت)، ئەویش ناردی بە شوێنیدا (کە هات پێی گوت: بۆچی گەڕایتەوە)، گوتی: ئێمە بەو شێوە فەرمانمان پێکراوە (پێغەمبەری خوا ئاوا فەرمانی کردوە)، عومەریش گوتی: دەبێ لەسەر ئەوە بەڵگەم بۆ بێنی، جا (ئەبو مووساش) ڕۆیشت بۆ لای کۆڕو مەجلیسی ئەنصاریەکان و پرسیاری لێکردن (کە ئایا کێ وەك ئەو گوێبیستی فەرموودەی لە دەرگادان و مۆڵەت وەرگرتن بووە؟)، گوتیان: کەس شایەدیت لەسەر ئەمە بۆ نادات جگە لە

---

(١) صحيح: [البخاري: ٧٩- كتاب الاستئذان، ١٣- باب: التسليم والاستئذان ثلاثاً. مسلم: ٣٨- كتاب الآداب، ح ٣٣- ٣٧].

بچوكترینمان نەبێ: كە ئەبو سەعیدی خودریە، ئەویش ئەبو سەعیدی خودری لەگەڵ خۆی برد، عومەریش (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: ئایا هەندێك لە فەرمان و فەرمایشتی پێغەمبەرم ﷺ لێ شاراوەیەو نایزانم؟ مامەڵەو ئیش و كار كردنم لە بازاڕ بێ ئاگای كردووم، واتە دەرچوون بۆ بازرگانی (مەبەستی ئەوە بوو: بەڵێ ئێوە لەسەر هەقن، ئەمە وای كردوە من هەندێ فەرمایشت نەبیستم و ئێوە لەلاتان بێ).

## دەربارەی: مۆڵەت وەرگرتن جیایە لە سڵاوكردن (سڵاو پێش مۆڵەت وەرگرتنە)

٩١٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، فِيمَنْ يَسْتَأْذِنُ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ قَالَ: لَا يُؤْذَنُ لَهُ حَتَّى يَبْدَأَ بِالسَّلَامِ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) لە بارەی ئەو كەسەی كە داوای مۆڵەت وەرگرتنی (چوونە ژوورەوە) دەكات پێش ئەوەی سڵاو بكات، گوتوویەتی: مۆڵەتی پێنادرێ هەتا سەرەتا سڵاو دەكات.

٩١٥- «عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: إِذَا دَخَلَ وَلَمْ يَقُلِ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، فَقُلْ: لَا، حَتَّى يَأْتِيَ بِالْمِفْتَاحِ: السَّلَامِ»[٢].

واتە: عەطاء دەڵێ: بیستم ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەیگوت: ئەگەر كەسێك هاتە ژوورەوەو نەیگوت: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ)، بڵێ: نەخێر، (واتە: وەڵامی مەدەوەو مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی پێ مەدە)، هەتا كلیل دەهێنێ، واتە: هەتا سڵاو دەكات.

## دەربارەی: ئەگەر كەسێك بێ مۆڵەت سەیری ماڵێكی كرد چاوی دەڕژێنرێ

٩١٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَوْ اطَّلَعَ رَجُلٌ فِي بَيْتِكَ، فَخَذَفْتَهُ بِحَصَاةٍ فَفَقَأْتَ عَيْنَهُ، مَا كَانَ عَلَيْكَ جُنَاحٌ»»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێك (بەبێ مۆڵەت وەرگرتن) تەماشای نێو ماڵی كردی، تۆش وردە بەردۆكەت تێگرت و چاوت ڕژاند، ئەوە هیچ تۆڵەو گوناهێكت لەسەر نیە.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٤١٧و ٢٢٨٩): [البخاري: ٨٧- كتاب الديات، ١٥- باب: من أخذ حقه أو اقتص دون السلطان، ح ٦٨٨٨. مسلم: ٣٨- كتاب الأداب، ح ٤٤].

تێبینی: بێگومان مەبەست ئەوە نیە چاوڕژاندن ئەنجام بدرێ، بەڵكو مەبەست ترسان و هەڕەشە كردنە لەو كەسەی ڕێگەی بە خۆی دەدات سنوورەكان ببەزێنێ و ئازادیەكانی خەڵك پێشێل بكات، جا نەبوونی قیصاص و تۆڵە سەندنەوەو دادگەریە.

٩١٧- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ قَائِماً يُصَلِّي، فَاطَّلَعَ رَجُلٌ فِي بَيْتِهِ، فَأَخَذَ سَهْماً مِنْ كِنَانَتِهِ، فَسَدَّدَ نَحْوَ عَيْنَيْهِ»[١].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ وەستا بوو نوێژی دەكرد، پیاوێكیش (لەسەر دیوار، یان لە كونی دەرگاوە) تەماشای نێوماڵیانی دەكرد، ئەویش تیرێكی دەرهێنا لە تیردانەكەوە، تێیگرت بە ئاڕاستەی چاوی.

## دەربارەی: مۆڵەت وەرگرتن لە پێناو تەماشا كردنە (بۆ ئەوەی بە نەشیاوی نەبینرێن)

٩١٨- «عَنْ سَهْلِ بْنَ سَعْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قال: أَنَّ رَجُلاً اطَّلَعَ مِنْ جُحْرٍ فِي بَابِ النَّبِيِّ ﷺ، وَمَعَ النَّبِيِّ ﷺ مِدْرَىً[٢] يَحُكُّ بِهِ رَأْسَهُ، فَلَمَّا رَآهُ النَّبِيُّ ﷺ قَالَ: «لَوْ أَعْلَمُ أَنَّكَ تَنْتَظِرُنِي لَطَعَنْتُ بِهِ فِي عَيْنِكَ»»[٣].

واتە: سەهلی كوڕی سەعد (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێك لە كونی دەرگای ماڵی پێغەمبەر ﷺ، سەیری پێغەمبەری خوای ﷺ كرد، پێغەمبەریش پارچە دارێكی تیژی لە دەست بوو، قژی پێ دەخوراند، جا كاتێ پێغەمبەر ﷺ پیاوەكەی بینی (زانی سەیری كردوە) فەرمووی: ئەگەر بمزانیبایە سەیرم دەكەی ئەوە بە پارچە دارەكە دەمدا لە چاوت.

٩١٩- «وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّمَا جُعِلَ الْإِذْنُ مِنْ أَجْلِ الْبَصَرِ»»[٤].

واتە: وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان مۆڵەت وەرگرتن لەبەر بینین دانراوە (تاوەكو خەڵكی یەكدی بە شێوازی ناشایست نەبینن).

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٦١٢): [البخاري: ٨٧- كتاب الديات، ١٥- باب من اخذ أو اقتص دون السلطان، ح ٦٨٨٩. مسلم: ٣٨- الآداب ح ٤٢].

(٢) مدرى: عود تدخله المرأة في رأسها تضم بعض شعرها إلى بعض وهو يشبه المسلة، (دارێكە، كە ئافرەتان بەكاری دێنن بۆ قایم كردن و ڕاگرتنی قژیان، كە بریتیە لە پارچە دارێكی وەك شوژن).

(٣) صحيح.

(٤) صحيح: [البخاري: ١٩- كتاب الاستئذان، ١١- باب: الاستذان من أجل البصر، ح ٢٣٠٠. مسلم: ٣٨- كتاب الآداب، ح ٤١].

٩٢٠- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: اطَّلَعَ رَجُلٌ مِنْ خَلَلٍ فِي حُجْرَةِ النَّبِيِّ ﷺ، فَسَدَّدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمِشْقَصٍ، فَأَخْرَجَ الرَّجُلُ رَأْسَهُ»(١).

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێك لە بۆشاییێکەوە تەماشای ژوورەکەی پێغەمبەری ﷺ کرد، پێغەمبەریش ﷺ میشقەصێکی بۆ هاویشت (کە بریتیە لە تیرێکی دەر پان) کابراش سەری دەرهێنا (لە کونەکە و، خۆی لادا تا بەر چاوی نەکەوێ).

## دەربارەی: ئەگەر کەسێك سڵاوی لە کەسێکی دیکە کرد لە نێو ماڵەکەیدا

٩٢١- «عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: اسْتَأْذَنْتُ عَلَى عُمَرَ، فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي «ثَلَاثاً» فَأَدْبَرْتُ، فَأَرْسَلَ إِلَيَّ فَقَالَ: يَا عَبْدَ اللَّهِ، اشْتَدَّ عَلَيْكَ أَنْ تُحْتَبَسَ عَلَى بَابِي؟ اعْلَمْ أَنَّ النَّاسَ كَذَلِكَ يَشْتَدُّ عَلَيْهِمْ أَنْ يُحْتَبَسُوا عَلَى بَابِكَ، فَقُلْتُ: بَلِ اسْتَأْذَنْتُ عَلَيْكَ ثَلَاثاً، فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي، فَرَجَعْتُ، فَقَالَ: مِمَّنْ سَمِعْتَ هَذَا؟ فَقُلْتُ: سَمِعْتُهُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: أَسَمِعْتَ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ مَا لَمْ نَسْمَعْ؟ لَئِنْ لَمْ تَأْتِنِي عَلَى هَذَا بِبَيِّنَةٍ لَأَجْعَلَنَّكَ نَكَالاً، فَخَرَجْتُ حَتَّى أَتَيْتُ نَفَراً مِنَ الْأَنْصَارِ جُلُوساً فِي الْمَسْجِدِ فَسَأَلْتُهُمْ، فَقَالُوا: أَوَيَشُكُّ فِي هَذَا أَحَدٌ؟ فَأَخْبَرْتُهُمْ مَا قَالَ عُمَرُ، فَقَالُوا: لَا يَقُومُ مَعَكَ إِلَّا أَصْغَرُنَا، فَقَامَ مَعِي أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ «أَوْ أَبُو مَسْعُودٍ» إِلَى عُمَرَ، فَقَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يُرِيدُ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ، حَتَّى أَتَاهُ فَسَلَّمَ، فَلَمْ يُؤْذَنْ لَهُ، ثُمَّ سَلَّمَ الثَّانِيَةَ، ثُمَّ الثَّالِثَةَ، فَلَمْ يُؤْذَنْ لَهُ، فَقَالَ: «قَضَيْنَا مَا عَلَيْنَا»، ثُمَّ رَجَعَ، فَأَدْرَكَهُ سَعْدٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا سَلَّمْتَ مِنْ مَرَّةٍ إِلَّا وَأَنَا أَسْمَعُ، وَأَرُدُّ عَلَيْكَ، وَلَكِنْ أَحْبَبْتُ أَنْ تُكْثِرَ مِنَ السَّلَامِ عَلَيَّ وَعَلَى أَهْلِ بَيْتِي، فَقَالَ أَبُو مُوسَى: وَاللَّهِ إِنْ كُنْتُ لَأَمِيناً عَلَى حَدِيثِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: أَجَلْ، وَلَكِنْ أَحْبَبْتُ أَنْ أَسْتَثْبِتَ»(٢).

واتە: ئەبو مووسا (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: سێ جار داوای مۆڵەتی چوونە ژوورەوەم کرد بۆ لای عومەر و، مۆڵەتم پێ نەدرا، منیش پشتم هەڵکردو ڕۆیشتم، ئەویش کەسێکی بە دوامدا نارد، (جا کە هاتم عومەر) گوتی: ئەی عەبدوڵلا پێت سەخت بوو لە پێش دەرگاکەمدا ڕابگیرێی؟ بزانە بەهەمان شێوە خەڵکیش بەلایانەوە سەختە لەبەر دەرگاکەتدا ڕابگیرێن، منیش گوتم: (لەبەر ئەوە نیە) بەڵکو لەبەر ئەوە بوو سێ جار داوای مۆڵەتم کردو مۆڵەتم پێنەدرا، بۆیە گەڕامەوە، گوتی: ئەمەت لە کێ بیستووە (کێ پێی گوتووی دوای سێ جار بۆت نیە زیاتر داوای مۆڵەتی زیاتر بکەی و بوەستیت)؟ گوتم: لە پێغەمبەرم ﷺ بیستووە، گوتی: ئایا تۆ شتانێکت لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیستووە و ئێمە نەمان بیستووە؟! ئەگەر بەڵگەم بۆ نەهێنی لەسەر ئەوەی گوتت، تەمبێت دەکەم و دەتکەم بە پەند بۆ خەڵکی دیکەش، (دەڵێ) جا منیش دەرچووم هەتا گەیشتمە

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح لغيره: [البخاري: ٣٤- كتاب البيوع، ٩- باب: الخروج في التجارة. مسلم: ٣٨- كتاب الآداب، ح ٣٦].

کۆمەڵە کەسێك لە ئەنصارەکان کە لە مزگەوت دانیشتبوون، پرسیارم لێکردن (گوتم: کێ وەك من ئەم فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیستووە؟)، گوتیان: ئایا کەسێك هەیە لەمەدا گومانی هەبێ؟ منیش ئەوەم پێ ڕاگەیاندن کە عومەر گوتبووی، گوتیان: کەس لەگەڵت نایەت، جگە لە بچوکترینمان، کە ئەبو سەعیدی خودریە «یان ئەبو مەسعوودە» جا هەڵسا لەگەڵم هات بۆ لای عومەرو گوتی: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچووین لە کاتێکدا دەچوو بۆ لای سەعدی کوڕی عوبادە، هەتا هات بۆ لای (ماڵەکەی) و سڵاوی کرد، جا مۆڵەتی پێنەدرا، پاشان جاری دووەم سڵاوی کرد، پاشان جاری سێیەم، هەر مۆڵەتی پێنەدرا، جا فەرمووی: ئەوەی لەسەرمان بوو تەواومان کرد (واتە: سێ جار تەواو بوو چیتر بۆمان نیە بوەستین و داوای مۆڵەت بکەین)، جا گەڕایەوە و ڕۆیشت، ئنجا سەعد هات و، پێی گەیشتەوە، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند بەو خوایەی تۆی بە هەق ناردوە، هەر جارێك سڵاوت کرد گوێبیست دەبووم و، وەڵامیشم دەدایەوە (حەزم نەکرد زوو دەرگا بکەمەوە)، بەڵکو پێم خۆش بوو زۆر سڵاو لە خۆم و خانەوادەکەم بکەیت و (بەرەکەتی سڵاوەکەتمان بەسەردا بڕژێ)، (جا دوای ئەوەی ئەبو سەعیدی خودری ئەم فەرموودەی بۆ عومەر گێڕایەوە) ئەبو مووسا گوتی: سوێند بە خوا من ئەمینم لە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ (تا دڵنیا نەبم نایڵێم)، عومەریش گوتی: ڕاستەکەی، بەڵام حەزم کرد دڵنیا بمەوە.

## دەربارەی: بانگێشت کردنی کەسێك مۆڵەت پێدانیەتی

٩٢٢- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: إِذَا دُعِيَ الرَّجُلُ فَقَدْ أُذِنَ لَهُ»[١].

واتە: عەبدوڵڵا (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئەگەر کەسێك بانگکرا بۆ ماڵەوە، ئەوە مۆڵەتی پێدراوە (واتە: خودی بەدوادا ناردنەکە مۆڵەت پێدانە).

٩٢٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ فَجَاءَ مَعَ الرَّسُولِ، فَهُوَ إِذْنُهُ»»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە بانگێشتکراو لەگەڵ نێردراوەکەدا هات، ئەوە خودی مۆڵەتەکەیەتی.

٩٢٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «رَسُولُ الرَّجُلِ إِلَى الرَّجُلِ إِذْنُهُ»»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: نێردراوی کەسێك بۆ لای کەسێکی دیکە مۆڵەت پێدانیەتی.

---

(١) صحيح موقوف: «الإرواء» (١٩٥٦).

(٢) صحيح: «الإرواء» (١٩٥٥): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ١٢٩- باب: في الرجل يدعى أيكون ذلك إذنه، ح ٥١٩٠].

(٣) صحيح: وأخرجه وابن حبان: ٥٨١١، قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم.




٩٢٥- «عَنْ أَبِي الْعَلَانِيَةِ قَالَ: أَتَيْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ فَسَلَّمْتُ فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي، ثُمَّ سَلَّمْتُ فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي، ثُمَّ سَلَّمْتُ الثَّالِثَةَ فَرَفَعْتُ صَوْتِي وَقُلْتُ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ يَا أَهْلَ الدَّارِ، فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي، فَتَنَحَّيْتُ نَاحِيَةً فَقَعَدْتُ، فَخَرَجَ إِلَيَّ غُلَامٌ فَقَالَ: ادْخُلْ، فَدَخَلْتُ، فَقَالَ لِي أَبُو سَعِيدٍ: أَمَا إِنَّكَ لَوْ زِدْتَ لَمْ يُؤْذَنْ لَكَ، فَسَأَلْتُهُ عَنِ الْأَوْعِيَةِ، فَلَمْ أَسْأَلْهُ عَنْ شَيْءٍ إِلَّا قَالَ: حَرَامٌ، حَتَّى سَأَلْتُهُ عَنِ الْجَفِّ[1]؟ فَقَالَ: حَرَامٌ»[2].

واتە: ئەبو عەلانیە گوتوویەتی: هاتم بۆ لای ماڵی ئەبو سەعیدی خودری و سڵاوم کردو مۆڵەتم پێنەدرا (بۆ چوونە ژوورەوە)، پاشان (جاری دووەم) سڵاوم کردو مۆڵەتم پێنەدرا، پاشان بۆ جاری سێیەم سڵاوم کردو دەنگم بەرز کردەوەو گوتم: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ) ئەی خاوەن ماڵ، هەر (کەس وەڵامی نەدایەوەو) مۆڵەتم پێنەدرا، جا چووم بۆ لایەك و دانیشتم، پاشان منداڵێك هاتە دەرەوە بۆ لام، گوتی: وەرە ژوورەوە، منیش چوومە ژوورەوە، ئەبو سەعید پێی گوتم: ئەگەر زیاترت بکردایە (واتە: زیاد لە سێ جار داوای مۆڵەتت بکردایە) ئەوە هەر مۆڵەتت پێنەدەدرا، (ئەبو عەلانیە دەڵێ) جا پرسیارم لێکرد لە بارەی قاپ و قاچاخەوە، وە پرسیارم لە هەر شتێك لێکرد هەر گوتی: حەرامە، هەتا پرسیارم لە بارەی (جەف) لێکرد (کە بریتیە لە مەتارەیەك کە لە پێستە دروست دەکرێ)؟ گوتی: حەرامە.

## دەربارەی: چۆنیەتی وەستان لەبەردەم دەرگای ماڵ

٩٢٦- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ بُسْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، صَاحِبُ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا أَتَى بَاباً يُرِيدُ أَنْ يَسْتَأْذِنَ لَمْ يَسْتَقْبِلْهُ، جَاءَ يَمِيناً وَشِمَالاً، فَإِنْ أُذِنَ لَهُ وَإِلَّا انْصَرَفَ»[3].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بوسری (خوا لێی ڕازی بێ) هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بچووبایە بەر دەرگایەك و ویستبای مۆڵەت وەربگرێ، ئەوە بەرانبەر دەرگەی ماڵەکە نەدەوەستا، (بەڵکو) دەهات لە لای ڕاست یان چەپدا ڕادەوەستا، جا ئەگەر مۆڵەتی پێبدرایە (ئەوە دەچووە ژوورەوە)، ئەگەرنا دەڕۆیشت.

٩٢٧- «عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ حُدَيْجٍ قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ فَاسْتَأْذَنْتُ عَلَيْهِ، فَقَالُوا لِي: مَكَانَكَ حَتَّى يَخْرُجَ إِلَيْكَ، فَقَعَدْتُ قَرِيباً مِنْ بَابِهِ، قَالَ: فَخَرَجَ إِلَيَّ فَدَعَا بِمَاءٍ فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ مَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، أَمِنَ الْبَوْلِ هَذَا؟ قَالَ: مِنَ الْبَوْلِ، أَوْ مِنْ غَيْرِهِ»[4].

---

(١) وعاء من جلود. لا يوكأ: أي: لا يشد.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٩٥١) .

(٣) حسن صحيح: «تخريج المشكاة» (٤٦٧٣/ التحقيق الثاني) .

(٤) حسن الإسناد.

واتە: موعاویەی کوڕی حودەیج (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: هاتم بۆ لای ماڵی عومەری کوڕی خەتتاب، داوای مۆڵەتم کرد تا بچم بۆ لای، ئەوانیش پێیان گوتم: لە شوێنی خۆت بمێنەوە هەتا دێ بۆ لات، جا لە نزیك دەرگەی ماڵەکەی کەمێك دانیشتم، دەڵێ: جا عومەر هاتە دەرەوە بۆ لام و داوای ئاوی کردو دەستنوێژی هەڵگرت، پاشان مەسحی لەسەر خوفەکانی کرد، (موعاویەش) گوتی: ئەی ئەمیری بڕواداران ئەم خوف لەبەرکردنە لە دوای میز کردنەوەیە (واتە: ئایا دەستنوێژ شکانەکەت بە شتی خەفیف بووە بۆیە مەسح لەسەر خوفت بۆ دروستە)؟ گوتی: بۆ میز کردن و جگە لە میز کردنیشە (واتە لە دوای هەموو دەستنوێژ شکانێك دروستە خوف بەکاربێ و مەسحی لەسەر بکەیت بە مەرجی خۆی، کە بۆ گەشتیار سێ شەوو سێ ڕۆژە، بۆ دانیشتووی ماڵیش تەنیا شەوو ڕۆژێکە).

## دەربارەی: لە دەرگا دان

٩٢٨- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، إِنَّ أَبْوَابَ النَّبِيِّ ﷺ كَانَتْ تُقْرَعُ بِالْأَظَافِيرِ»[١].

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: دەرگاکانی پێغەمبەر ﷺ (ئەوەندە تەنك بوون) بە نینۆکەکان لێیان دەدرا (وەك هی زاڵمان کۆنکرێت نەبوون).

## دەربارەی: ئەگەر یەکێك هاتە ژوور بێ مۆڵەت وەرگرتن

٩٢٩- «عَنْ عَمْرِو بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ صَفْوَانَ، أَنَّ كَلَدَةَ بْنَ حَنْبَلٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ صَفْوَانَ بْنَ أُمَيَّةَ بَعَثَهُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فِي الْفَتْحِ بِلَبَنٍ وَجِدَايَةٍ وَضَغَابِيسَ «قَالَ أَبُو عَاصِمٍ: يَعْنِي الْبَقْلَ» وَالنَّبِيُّ ﷺ بِأَعْلَى الْوَادِي، وَلَمْ أُسَلِّمْ وَلَمْ أَسْتَأْذِنْ، فَقَالَ: «ارْجِعْ، فَقُلِ السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، أَأَدْخُلُ؟»، وَذَلِكَ بَعْدَمَا أَسْلَمَ صَفْوَانُ»[٢].

واتە: عەمری کوڕی عەبدوڵلای کوڕی صەفوان دەگێڕێتەوە (دەڵێ:) کەلەدەی کوڕی حەنبەل هەواڵی پێداوە، صەفوانی کوڕی ئومەییە لە کاتی ئازاد کردنی مەککەدا ئەوی نارد بۆ بردنی شیرو ئاسك و پاقلە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ لە سەرووی دۆڵەکە بوو، جا نە سڵاوم کردو نە داوای مۆڵەتیشم کرد، (پێغەمبەریش) فەرمووی: بگەڕێوە، بڵێ: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ) ئایا بێمە ژوورەوە؟ ئەوەش پاش ئەو کاتەبوو کە صەفوان بوو بە مسوڵمان.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٠٩٢) .

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٠٩٢) .

## دەربارەی: ئەگەر کەسێك گوتی: بێمە ژوورەوە، سڵاویشی نەکرد

٩٣٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: إِذَا قَالَ: أَأَدْخُلُ؟ وَلَمْ يُسَلِّمْ، فَقُلْ: لَا، حَتَّى تَأْتِيَ بِالْمِفْتَاحِ، قُلْتُ: السَّلَامُ؟ قَالَ: نَعَمْ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئەگەر (کەسێك لەبەر دەرگا) گوتی: ئایا بێمە ژوورەوە؟ سڵاوی نەکرد، ئەوە بڵێ: نەخێر، تاکو بە کلیلەوە دێیت، گوتم: (مەبەستت بە کلیل) سڵاوکردنە؟ گوتی: بەڵێ.

٩٣١- «عَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ قَالَ: حَدَّثَنِي رَجُلٌ مِنْ بَنِي عَامِرٍ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: أَأَلِجُ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِلْجَارِيَةِ: اخْرُجِي فَقُولِي لَهُ: قُلِ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، أَأَدْخُلُ؟ فَإِنَّهُ لَمْ يُحْسِنِ الإِسْتِئْذَانَ، قَالَ: فَسَمِعْتُهَا قَبْلَ أَنْ تَخْرُجَ إِلَيَّ الْجَارِيَةُ فَقُلْتُ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، أَأَدْخُلُ؟ فَقَالَ: «وَعَلَيْكَ، ادْخُلْ»، قَالَ: فَدَخَلْتُ فَقُلْتُ: بِأَيِّ شَيْءٍ جِئْتَ؟ فَقَالَ: لَمْ آتِكُمْ إِلَّا بِخَيْرٍ، أَتَيْتُكُمْ لِتَعْبُدُوا اللَّهَ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَتَدَعُوا عِبَادَةَ اللَّاتِ وَالْعُزَّى، وَتُصَلُّوا فِي اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ خَمْسَ صَلَوَاتٍ، وَتَصُومُوا فِي السَّنَةِ شَهْرًا، وَتَحُجُّوا هَذَا الْبَيْتَ، وَتَأْخُذُوا مِنْ مَالِ أَغْنِيَائِكُمْ فَتَرُدُّوهَا عَلَى فُقَرَائِكُمْ، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: هَلْ مِنَ الْعِلْمِ شَيْءٌ لَا تَعْلَمُهُ؟ قَالَ: لَقَدْ عَلَّمَ اللَّهُ خَيْرًا، وَإِنَّ مِنَ الْعِلْمِ مَا لَا يَعْلَمُهُ إِلَّا اللَّهُ، الْخَمْسُ لَا يَعْلَمُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ: ﴿إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ ما فِي الْأَرْحامِ وَما تَدْرِي نَفْسٌ ماذا تَكْسِبُ غَداً وَما تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ﴿٣٤﴾﴾لقمان»[٢].

واتە: ڕیبعی کوڕی حیراش دەڵێ: پیاوێك لە هۆزی بەنی عامیر هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ (سڵاوی نەکرد) گوتی: ئایا بێمە ژوورەوە، پێغەمبەریش ﷺ بە کەنیزەکەکەی فەرموو: برۆ دەرەوە پێی بڵێ: با بڵێت: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ)، ئایا بێمە ژوورەوە؟ چونکە ئەو بە جوانی داوای مۆڵەتی نەکردوە، (کابرا) دەڵێ: قسەکەم بیست پێش ئەوەی کەنیزەکەکە بێتە دەرەوە بۆ لام، گوتم: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ)، ئایا بێمە ژورەوە؟ فەرمووی: (وَعَلَيْكَ) وەرە ژوورەوە، دەڵێ: چوومە ژوورەوەو گوتم: بە چ شتێکەوە هاتووی (پەیامەکەت چی هێناوە)؟ (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: بۆتان نەهاتووم تەنها بە چاکەو خێر نەبێ، هاتووم بۆ لاتان بۆ ئەوەی تەنها خوا بپەرستن و هاوبەشی بۆ دانەنێن، وە واز لە پەرستنی لات و عوززا بێنن، وە لە شەوو ڕۆژێکدا پێنج نوێژان بکەن، وە لەساڵێکیشدا یەك مانگ بە ڕۆژوو بن، وە حەجی ئەمماڵەش بکەن (کە حەرەمی مەککەیە)، وە لە ماڵ و سامانی دەوڵەمەندەکانتان وەربگرن و دابەشی بکەن بەسەر هەژارەکانتاندا، دەڵێ جا پێمگوت: ئایا لە زانستدا شتێك هەیە تۆ نەیزانی؟ فەرمووی: بێگومان خوا (خەڵکی) فێرە شتی خێرو چاك

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨١٩): [إبن ماجه: ٤٠- كتاب الأدب، ١٢٧- باب: في الاستئذان، ح ٥١٧٧].

دەكات (كە زانستیش بەشێكە لەوە)، وە هەندێك لە زانست هەیە كەس نایزانێ جگە لە خوا، (بۆ وێنە:) پێنج شتەكان هیچ كەسێك نایانزانێ (بە تەواوی و بە وردی) جگە لە خوا: ﴿ إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ ما فِي الْأَرْحامِ وَما تَدْرِي نَفْسٌ ماذا تَكْسِبُ غَداً وَما تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ(٣٤) ﴾لقمان، واتە: بەڕاستی تەنها لای خوایە زانیاری (كاتی هاتنی) ڕۆژی دوایی، وە هەر خوا باران دەبارێنێ تەنها خوا دەزانێ بەوەی كە لە منداڵدانی (دایكان) دایە، وە هیچ كەس نازانێ سبەینێ (لە داهاتوودا) چی دەكات و چی بەدەست دێنێ، وە هیچ كەس نازانێ لە چ شوێن و زەویەكدا دەمرێ (وردەكاری هەموو ئەو شتانە تەنها لەلای خوایە).

## دەربارەی: چۆنیەتی مۆڵەت وەرگرتن

٩٣٢- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: اسْتَأْذَنَ عُمَرُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ، السَّلَامُ عَلَيْكُمْ، أَيَدْخُلُ عُمَرُ؟»(١).

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەر ﷺ كرد، گوتی: سەلام لەسەر پێغەمبەری خواو سەلام لەسەر ئێوەش، ئایا عومەر بێتە ژوورەوە؟

## دەربارەی: ئەوەی پێی دەگوترێ كێیە؟ دەڵێ: منم (ناوی خۆی ناڵێ)

٩٣٣- «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ، قَالَ: سَمِعْتُ جَابِراً (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي دَيْنٍ كَانَ عَلَى أَبِي، فَدَقَقْتُ الْبَابَ، فَقَالَ: «مَنْ ذَا؟» فَقُلْتُ: أَنَا، قَالَ: «أَنَا، أَنَا؟»، كَأَنَّهُ كَرِهَهُ»(٢).

واتە: موحەممەدی كوڕی مونكەدیر، دەڵێ: بیستم جابر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەیگوت: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە بارەی قەرزێكەوە كە لەسەر باوكم بوو (تا لەبارەیەوە قسەی لەگەڵ بكەم هاوكاریم بكات بۆ دانەوەی)، لە دەرگامدا، فەرمووی: كێیە؟ گوتم: منم، فەرمووی: منم، منم؟، وەك بڵێی پێی ناخۆش بوو.

تێبینی: بێگومان كاتێك خاوەن ماڵ ئەم پرسیارە دەكات، دەیەوێ بزانێ ئەو كەسەی هاتوە كێیە؟ بە دڵنیایی وشەی «منم» سوودی پێ ناگەیەنێ و، وەڵامی پرسیارەكەشی ناداتەوە، بۆیە پێویستە ئەو میوانە ڕاستەوخۆ ناوی خۆی بڵێ، ئەوە لە ئێستادا حاڵەتێكی تا ڕاددەك باوە، كە خەڵك

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح: «تخريج المشكاة» (٤٦٦٩/ التحقيق الثاني): [البخاري: ٧٩- كتاب الاستئذان، ١٧- باب: إذا قال: من ذا؟ قال: أنا. مسلم: ٣٨- كتاب الآداب، ح ٣٨، ٣٩].

تەلەفۆن دەكات، ماوەكی باش كاتت لێ بە فیڕۆ دەدات، ئنجا دوای ناوی خۆی دەڵێ، بۆیە بە پێی ئەم فەرموودە ئەمە كارێكی نەگونجاوو نەشیاوە.

٩٣٤- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى الْمَسْجِدِ، وَأَبُو مُوسَى يَقْرَأُ، فَقَالَ: «مَنْ هَذَا؟» فَقُلْتُ: أَنَا بُرَيْدَةُ، جُعِلْتُ فِدَاكَ، فَقَالَ: «قَدْ أُعْطِيَ هَذَا مِزْمَاراً مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ»»[١].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی بورەیدە لە باوكیەوە (خوا لێی ڕازی بێ) گێڕاویەتیەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ مزگەوت، لەو كاتەدا ئەبو مووسا قورئانی دەخوێند، فەرمووی: (كێیە)؟ منیش گوتم: منم بورەیدەم قوربانت بم، فەرمووی: بەڕاستی ئەمە ئاوازێك لە ئاوازەكانی خانەوادەی داوودی پێبەخشراوە.

## دەربارەی: ئەگەر كەسێك داوای مۆڵەتی كرد، پێی گوترا: وەرە ژوور بە سڵاو كردن

٩٣٥- «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ جُدْعَانَ قَالَ: كُنْتُ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، فَاسْتَأْذَنَ عَلَى أَهْلِ بَيْتٍ، فَقِيلَ: ادْخُلْ بِسَلَامٍ، فَأَبَى أَنْ يَدْخُلَ عَلَيْهِمْ»[٢].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی كوڕی جودعان، دەڵێ: من لەگەڵ عەبدوڵڵای كوڕی عومەر بووم (خوا لێیان ڕازی بێ)، جا داوای مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی لە خاوەن ماڵێك كردو گوترا: وەرە ژوورەوو سڵاو بكە، جا ڕازی نەبوو بچێتە ژوورەوە بۆ لایان.

تێبینی: بێگومان ناگونجێ كەسێك وەك ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) سوننەتێكی وا گەورە كە سڵاوكردنە فەرامۆش بكات، بە تایبەت لە كاتێكی وا هەستیار كە چوونە ماڵێكی دیكەیە، بۆیە بە دڵنیایی لە كاتی مۆڵەت وەرگرتن سڵاوی كردوەو ئەمەش هۆكاری گەڕانەوەكەی بووە، چونكە وەك گاڵتە پێكرانێك لەوە تێگەیشتوە كە پێی گوتراوە.

وە ئەوەی كە پاڵپشتی ئەو تێگەیشتنەی ئێمە دەكات، گێڕانەوەیەكی دیكەیە بە بێژەیەكی صەحیح، كە ئیبنو ئەبی شەیبە هێناویەتی لە موصەننەفەكەیدا: (عَنْ أَبِي مِجْلَزٍ، قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ إِذَا اسْتَأْذَنَ فَقِيلَ لَهُ: ادْخُلْ بِسَلَامٍ، رَجَعَ، قَالَ: لاَ أَدْرِي أَدْخُلُ بِسَلَامٍ ، أَوْ بِغَيْرِ سَلَامٍ)[٣].

---

(١) صحيح: [مسلم: ٦- كتاب صلاة المسافرين وقصرها، ح ٢٣٥].

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) المصنف: ج٨، ص٤٥٩، ح ٢٦٣٥٠.

## دەربارەی: تەماشا کردنی نێو ماڵان (پێش مۆڵەتدان)

٩٣٦- «عَنْ مُسْلِمِ بْنِ نَذِيرٍ قَالَ: اسْتَأْذَنَ رَجُلٌ عَلَى حُذَيْفَةَ فَاطَّلَعَ وَقَالَ: أَدْخُلُ؟ قَالَ حُذَيْفَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): أَمَّا عَيْنُكَ فَقَدْ دَخَلَتْ، وَأَمَّا اسْتُكَ فَلَمْ تَدْخُلْ»[1].

**واتە: موسلیمی کوڕی نەزیر دەڵێ: پیاوێك داوای مۆڵەتی لە حوزەیفە کرد، سەری بردە ژوورەوەو تەماشای ماڵی حوزەیفەی کردو، گوتی: ئایا بێمە ژوورەوە؟ حوزەیفە (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: چاوت هاتۆتە ژوورەوەو، دواوەت هێشتا نەهاتۆتە ژوورەوە (واتە: بە نارِەزاییەوە ئاوای گوت، چونکە هیچ مانای نیە داوای مۆڵەت بکەیت و بچیتە ژوورەوەش بەر لە وەڵامدانەوەی مۆڵەتەکە).**

٩٣٧- «وَقَالَ رَجُلٌ: أَسْتَأْذِنُ عَلَى أُمِّي؟ قَالَ: إِنْ لَمْ تَسْتَأْذِنْ رَأَيْتَ مَا يَسُوؤُكَ»[2].

**واتە: پیاوێك (پرسیاری لە حوزەیفە کرد) گوتی: ئایا مۆڵەت وەربگرم بۆ چوونە لای دایکم؟ (ئەویش) گوتی: ئەگەر مۆڵەتی لێ وەرنەگری ئەوەی پێت ناخۆشە دەیبینی (واتە: لەوانەیە بە شێوەیەك ببینی کە پێت خۆش نەبێ).**

٩٣٨- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ أَعْرَابِيّاً أَتَى بَيْتَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَلْقَمَ عَيْنَهُ خَصَاصَةَ الْبَابِ، فَأَخَذَ سَهْماً أَوْ عُوداً مُحَدَّداً، فَتَوَخَّى الْأَعْرَابِيَّ، لِيَفْقَأَ عَيْنَ الْأَعْرَابِيِّ، فَذَهَبَ، فَقَالَ: «أَمَا إِنَّكَ لَوْ ثَبَتَّ لَفَقَأْتُ عَيْنَكَ»»[3].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) (دەڵێ:) پیاوێکی دەشتەکی هات بۆ ماڵی پێغەمبەر ﷺو، چاوی خستە سەر درزی (کونی) دەرگاکە، پێغەمبەریش ﷺ تیرێك، یان دارێکی تیژی هەڵگرت، بۆ ئەوەی چاوی دەشتەکیەکەی پێ کوێر بکات، کابرای دەشتەکی چاوی لاداو ڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر لە شوێنی خۆت مابای ئەوە چاوم کوێر دەکردی.**

٩٣٩- «عَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا يَحِلُّ لِامْرِئٍ مُسْلِمٍ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى جَوْفِ بَيْتٍ حَتَّى يَسْتَأْذِنَ، فَإِنْ فَعَلَ فَقَدْ دَخَلَ، وَلَا يَؤُمُّ قَوْماً فَيَخُصُّ نَفْسَهُ بِدَعْوَةٍ دُونَهُمْ حَتَّى يَنْصَرِفَ، وَلَا يُصَلِّي وَهُوَ حَاقِنٌ حَتَّى يَتَخَفَّفَ»»[4].

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) حسن الإسناد.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٦١٢): [النسائي: ٤٥- كتاب القسامة، ٤٧- باب: ذكر حديث عمرو بن حزم في العقول].

(٤) صحيح دون جملة الإمامة، «تخريج المشكاة» (١٠٧٠)، «ضعيف أبي داود» «١٣»: [ليس في شيء من الكتب الستة]، رواه الترمذي وأبو داود.

واتە: ئەوبانى (خوا لێی ڕازی بێ) خزمەتكاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دروست نیە بۆ هیچ کەسێکی مسوڵمان تەماشای نێو ماڵی کەسێك بکات هەتا مۆڵەتی وەردەگرێ، جا ئەگەر تەماشای کرد ئەوە تازە چۆتە ژوورەوە، وە (دروست نیە بۆ هیچ کەسێکی مسوڵمان) کە پێشنوێژی بۆ خەڵکانێك بکات (لە نوێژەکەیدا) تەنها دوعا بۆ خۆی بکات بەبێ ئەوانی دیکە، هەتا لێی دەبێتەوە، وە با نوێژ نەکات لە کاتێکدا میزی خۆی ڕاگرتووەو پێویستی بەسەر ئاوە، هەتا باری خۆی سووك دەکات (سەرئاوی خۆی دەکات، بۆ ئەوەی نوێژەکەی بە بەئاگاییەوە بکات، نەوەك هەر بیری لەلای ئازاری میزڵدانی بێ).

## دەربارەی: ئەو کەسەی دەچێتە نێو ماڵی خۆی بە سڵاو کردنەوە

٩٤٠- «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ثَلَاثَةٌ كُلُّهُمْ ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ، إِنْ عَاشَ كُفِيَ، وَإِنْ مَاتَ دَخَلَ الْجَنَّةَ: مَنْ دَخَلَ بَيْتَهُ بِسَلَامٍ فَهُوَ ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَمَنْ خَرَجَ إِلَى الْمَسْجِدِ فَهُوَ ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ، وَمَنْ خَرَجَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَهُوَ ضَامِنٌ عَلَى اللَّهِ»»[١].

واتە: ئەبو ئومامە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سێ کەس هەن هەموویان لە ژێر گرەنتی چاودێری خوان: (هەر یەکێکیان) ئەگەر ژیا خوا کاروباری بۆ دەستەبەر دەکات، وە ئەگەر مردیش خوا دەیخاتە بەهەشتەوە (سێ کەسەکانیش بریتین لەمانە): هەر کەسێك بچێتە ماڵەوە بە سڵاوکردنەوە، ئەوە گرەنتی پێدراوە لە لایەنی خوا (عَزَّ وَجَلَّ)، وە هەر کەسێك بچێت بۆ مزگەوت، ئەوە گرەنتی پێدراوە لە لایەن خواوە، وە هەر کەسێك بچێتە دەرەوە (لە ماڵەوە) لە پێناوی خوادا (جا بۆ جیهاد بێ، یان بۆ زانستی شەرعی بێ، یان بۆ پەیداکردنی ڕزقی حەڵاڵ بێ)، ئەوە لە لایەنی خواوە گرەنتی پێدراوە (و پارێزراوە).

٩٤١- «عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو الزُّبَيْرِ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرًا (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: إِذَا دَخَلْتَ عَلَى أَهْلِكَ فَسَلِّمْ عَلَيْهِمْ تَحِيَّةً مِنْ عِنْدِ اللَّهِ مُبَارَكَةً طَيِّبَةً، قَالَ: مَا رَأَيْتُهُ إِلَّا يُوجِبُهُ قَوْلُهُ: ﴿وَإِذَا حُيِّيتُمْ بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا وَمَن﴾النساء»[٢].

واتە: ئیبنو جورەیج گوتوویەتی: ئەبو زوبەیر هەواڵی پێداوە، ئەو بیستوویەتی جابر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەیگوت: ئەگەر چوویە ژوورەوە بۆ لای خانەوادەکەت، ئەوە سڵاویان لێ بکە، بە سڵاوێك لە لایەن خواوە کە بە پیت و پێزو پاك و چاکە، گوتی: پێم وایە ئەوەی ئەم سڵاو کردنە واجب

---

(١) صحيح: «تخريج المشكاة» (٧٢٧)، «صحيح أبي داود» (٢٢٥٣): [أبو داود: ١٥- كتاب الجهاد، ٩- باب: في ركوب البحر في الغزو، ح ٢٤٩٤].

(٢) صحيح الإسناد.

دەكات كە فەرمايشتی خوایە: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُمْ بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا وَمَن ﴾ (واتە: هەركاتێك سڵاوێكتان لێكرا، ئەوە بە چاكتر لەو سڵاوكردنە، یان وەك خۆی وەڵام بدەنەوە).

## دەربارەی: ئەو كەسەی یادی خوای نەكرد لە كاتی چوونەوەماڵدا، ئەوە شەیتان تێیدا دەمێنێتەوە

٩٤٢- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ، فَذَكَرَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ عِنْدَ دُخُولِهِ، وَعِنْدَ طَعَامِهِ، قَالَ الشَّيْطَانُ: لَا مَبِيتَ لَكُمْ وَلَا عَشَاءَ، وَإِذَا دَخَلَ فَلَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ عِنْدَ دُخُولِهِ قَالَ الشَّيْطَانُ: أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ، وَإِنْ لَمْ يَذْكُرِ اللَّهَ عِنْدَ طَعَامِهِ قَالَ الشَّيْطَانُ: أَدْرَكْتُمُ الْمَبِيتَ وَالْعَشَاءَ»»[1].

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، بیستوویەتی لە پێغەمبەر ﷺ كە دەیفەرموو: ئەگەر پیاو چووە نێو ماڵەوەو یادی خوا (عَزَّ وَجَلَّ)ی كرد، (بسم اللّٰه)ی كرد لە كاتی چوونە ژوورەوەو لە كاتی نان خواردنیدا، (ئەو كات) شەیتان (بە هاوەڵانی) دەڵێ: نە شوێنی مانەوەتان بۆ هەیە، نە خواردن، و ئەگەر چووە (پیاو) نێو ماڵەوەو یادی خوای نەكردو (بسم اللّٰه)ی نەكرد لە كاتی چوونە ژوورەوەیدا، (ئەو كات) شەیتان (بە هاوەڵانی) دەڵێ: شوێنی مانەوەتان دەستكەوت، وە ئەگەر لە كاتی نان خواردنیشدا یادی خوای نەكردو (بسم اللّٰه)ی نەكرد، ئەوە شەیتان دەڵێ: شوێنی مانەوەو خواردنیشتان دەستكەوت.

٩٤٣- «عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، لَا يَسْتَأْذِنُ عَلَى بُيُوتِ السُّوقِ»[2].

واتە: موجاهید دەڵێ: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) مۆڵەتی وەرنەگرت لەسەر چوون بۆ خانوەكانی نێو بازار (چونكە هەموو دەم خەڵكیان بەسەرڕوەدەچوو).

٩٤٤- «عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، يَسْتَأْذِنُ فِي ظُلَّةِ الْبَزَّازِ»[3].

واتە: عەطاء دەڵێ: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) مۆڵەتی وەردەگرت لە وەستان لە ژێر سێبەری دوكان و شتومەكەكانی قوماش فرۆشان.

---

(١) صحيح: «التعليق الرغيب» (١١٦/٣): [مسلم: ٣٦- كتاب الأشربة، ح ١٠٣].

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد.

## دەربارەی: ئەگەر جوولەکەو نەصڕانی لە نووسراویاندا سڵاویان نووسی، وەڵام دەدرێنەوە

٩٤٥- «عَنْ أَبِي عُثْمَانَ النَّهْدِيِّ قَالَ: كَتَبَ أَبُو مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، إِلَى رُهْبَانٍ يُسَلِّمُ عَلَيْهِ فِي كِتَابِهِ، فَقِيلَ لَهُ: أَتُسَلِّمُ عَلَيْهِ وَهُوَ كَافِرٌ؟ قَالَ: إِنَّهُ كَتَبَ إِلَيَّ فَسَلَّمَ عَلَيَّ، فَرَدَدْتُ عَلَيْهِ»[١].

واتە: ئەبو عوسمانی نەهدی دەڵێ: ئەبو مووسا (خوا لێی ڕازی بێ) نووسراوێکی نووسی بۆ عابیدێکی گاور، لە نووسراوەکەیدا سڵاوی لێکرد، جا پێی گوترا: ئایا سڵاوی لێ دەکەی، (دەشزانی) ئەو بێبڕوایە؟ گوتی: ئەو نووسراوی بۆ ناردووم سڵاوی لێکردووم، منیش وەڵامم دایەوە (بۆیە وەڵامدانەوە دروستە).

## دەربارەی: دەستپێشخەری نەکردن بە سڵاو کردن لە نامسوڵمانان[٢]

٩٤٦- «عَنْ أَبِي بَصْرَةَ الْغِفَارِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنِّي رَاكِبٌ غَداً إِلَى يَهُودَ، فَلَا تَبْدَأُوهُمْ بِالسَّلَامِ، فَإِذَا سَلَّمُوا عَلَيْكُمْ فَقُولُوا: وَعَلَيْكُمْ»[٣].

واتە: ئەبو بەصرەی غیفاری (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: من سبەینێ دەچم بۆ لای جوولەکەکان، سەرەتا ئێوە بە سڵاوکردن دەست پێ مەکەن، جا ئەگەر سڵاویان لێکردن ئێوەش بڵێن: (وَعَلَيْكُمْ).

٩٤٧- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَهْلُ الْكِتَابِ لَا تَبْدَأُوهُمْ بِالسَّلَامِ، وَاضْطَرُّوهُمْ إِلَى أَضْيَقِ الطَّرِيقِ»»[٤].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دەستپێشخەری خاوەن کتێبەکان مەکەن بە سڵاو کردن، وە (ئەگەر پێیان گەیشتن لەسەر ڕێگە) ئەوە ناچاریان بکەن بە لای تەنگترینی ڕێگاکەدا بڕۆن.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣٢٦/٢).

(٢) (أَهْلَ الذِّمَّةِ: زاراوەیەکی فیقهییە، مەبەست پێی هەریەکە لە جوولەکەکان و نەصرانیەکان و خاوەن ئاینەکانی دیکە، ئەوانەن کە لە ژێر دەسەڵاتی حوکمی ئیسلامدا دەژین و، ساڵانە سەرانە دەدەن بە دەوڵەت).

(٣) صحيح: «الإرواء» (١١٢/٥): [ليس في شيء من الكتب السبة] أخرجه النسائي وابن ماجه.

(٤) صحيح: «الإرواء» (١٢٧١)، «السلسلة الصحيحة» (٧٠٤ و ١٤١١): [مسلم: ٣٩- كتاب السلام ح ١٣].

تێبینی: ئەم فەرمایشتەی خۆشەویست لە کاتی ڕاگەیاندنی جەنگی خەیبەر بوو فەرمووی، تاوەکو مسوڵمانان جوولەکەکان ئاگادار بکەنەوە کە لە حاڵەتی جەنگ دان لەگەڵیان، وە سڵاوکردنیش مانای ئەمان و ئاشتی دەگەیەنێ، دوو شتی دژ بە یەك و پێچەوانەن، بۆیە پێغەمبەری ڕەحمەت ﷺ فەرمانی کردوە سڵاو نەکەن و تەنگەتاویان بکەن، تا تێبگەن ئەگەر وازنەهێنن لە خیانەت ئەوە پاش کەمێکیتر خوێن لە نێوانیان دەڕژێ و مسوڵمانان چیان لە دەست بێ بەرانبەریان دەیکەن.

## دەربارەی: ئەو کەسەی بە ئاماژە سڵاو بکات

٩٤٨- «عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ: إِنَّمَا سَلَّمَ عَبْدُ اللَّهِ عَلَى الدَّهَاقِينَ إِشَارَةً»[١].

واتە: عەلقەمە دەڵێ: عەبدوڵلا تەنها بە ئاماژە سڵاوی کرد لە (الدَّهَاقِينَ) (واتە: لە سەرۆك هۆزە دەمارگیرەکان، یان دەسەڵاتدارە ستەمکارەکان، یان بازرگانە فێڵبازو خیانەتکارەکان).

تێبینی: دەشگونجێ لێرەدا مەبەستی پێی ئەو خاوەن کتێبانە بێ، کە لە ژێر حوکم و دەسەڵاتی ئیسلامدا ژیاون.

٩٤٩- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: مَرَّ يَهُودِيٌّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: السَّامُ عَلَيْكُمْ، فَرَدَّ أَصْحَابُهُ السَّلَامَ، فَقَالَ: قَالَ: السَّامُ عَلَيْكُمْ، فَأُخِذَ الْيَهُودِيُّ فَاعْتَرَفَ، قَالَ: «رُدُّوا عَلَيْهِ مَا قَالَ»»[٢].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: جوولەکەیەك تێپەڕی بە لای پێغەمبەر ﷺ، گوتی: (السَّامُ عَلَيْكم) (واتە): مردنتان لەسەر بێ، هاوەڵانیش (تێنەگەیشتن بۆیە) بە سڵاو وەڵامیان دایەوە، (پێغەمبەریش) فەرمووی: جولەکەکە گوتی: (السَّامُ عَلَيْكم)، جا جوولەکەکە هێنراو، ئەویش دانی پێدانا، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: چی گوت، وەك خۆی وەڵامی بدەنەوە.

## دەربارەی: چۆنیەتی وەڵامدانەوەی سڵاوی ئەهلی کتێب

٩٥٠- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ الْيَهُودَ إِذَا سَلَّمَ عَلَيْكُمْ أَحَدُهُمْ، فَإِنَّمَا يَقُولُ: السَّامُ عَلَيْكَ، فَقُولُوا: وَعَلَيْكَ»[٣].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣٢٧/٢).

(٢) صحيح: «الإرواء» (١٢٧٦)، مسلم: مختصراً: [لم أعثر عليه]. أخرجه مسلم وأبو داود والنسائي.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣٢٨/٢): [البخاري: ٧٩- كتاب الاستئذان، ٢٢- باب كيف يرد على أهل الذمة السلام. مسلم: ٣٩- كتاب السلام، ح ٨].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەكێك لە جوولەكەكان سڵاوی لێكردن، ئەوە دەڵێ: (السَّامُ عَلَيْكم) (واتە): مردنتان لەسەر بێ، بۆیە ئێوەش بڵێن: (وَعَلَيْكَ) واتە: لەسەر تۆش.

٩٥١- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: رُدُّوا السَّلَامَ عَلَى مَنْ كَانَ يَهُودِيًّا، أَوْ نَصْرَانِيًّا، أَوْ مَجُوسِيًّا، ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ يَقُولُ: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُمْ بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا ﴾النساء: ٨٦١»[1].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: وەڵامی سڵاوی جوولەكە، یان گاور، یان مەجوسی بدەنەوە، چونكە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُمْ بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا ﴾النساء: ٨٦١، (واتە: هەركاتێك سڵاوێكتان لێ كرا ئەوە بە چاكتر لە سڵاوكردنەكە، یان وەك خۆی وەڵام بدەنەوە).

## دەربارەی: سڵاوكردن لە مەجلیسێك، كە مسوڵمان و هاوبەشدانەری تێدابن

٩٥٢- «عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، أَنَّ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ)، أَخْبَرَهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَكِبَ عَلَى حِمَارٍ عَلَيْهِ إِكَافٌ عَلَى قَطِيفَةٍ فَدَكِيَّةٍ، وَأَرْدَفَ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ وَرَاءَهُ، يَعُودُ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ، حَتَّى مَرَّ بِمَجْلِسٍ فِيهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَيٍّ ابْنُ سَلُولٍ - وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ يُسْلِمَ عَبْدُ اللَّهِ» فَإِذَا فِي الْمَجْلِسِ أَخْلَاطٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُشْرِكِينَ وَعَبَدَةِ الْأَوْثَانِ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ»[2].

واتە: عورووەی كوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە، ئوسامەی كوڕی زەید (خوا لێیان ڕازی بێ)، هەواڵی پێداوە، (گوتوویەتی): پێغەمبەر ﷺ سواری گوێدرێژێك بوو پۆشاكێكی قەدیفەی فەدەكیە لەسەر گوێدرێژەكە بوو، ئوسامەی كوڕی زەیدیش لە پشتیەوە سوار بوو، سەردانی سەعدی كوڕی عوبادەی دەكرد، (ڕۆیشتن) هەتا تێپەڕی بە مەجلیسێكدا عەبدوڵڵای كوڕی ئوبەی كوڕی سەلولی تێدابوو «پێش ئەوەی عەبدوڵڵا مسوڵمان بێ»[3]، لە نێو مەجلیسەكەدا مسوڵمانان و هاوبەشدانەران و بتپەرستان بە تێكەڵاوی دانیشتبوون، جا سڵاوی لە هەموویان كرد.

## دەربارەی: چۆنیەتی نووسراوی پێغەمبەر ﷺ خاوەن كتێبەكان؟

٩٥٣- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: أَنَّ أَبَا سُفْيَانَ بْنَ حَرْبٍ أَخْبَرَهُ: أَرْسَلَ إِلَيْهِ هِرَقْلُ مَلِكُ الرُّومِ، ثُمَّ دَعَا بِكِتَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الَّذِي أُرْسِلَ بِهِ مَعَ دِحْيَةَ الْكَلْبِيِّ إِلَى عَظِيمِ بُصْرَى،

---

(١) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٣٢٩/٢).

(٢) صحيح: [البخاري: ٧٩- كتاب الاستئذان، ٢٠- باب: التسليم في مجلس فيه أخلاط من المسلمين والمشركين. مسلم: ٣٢- كتاب الجهاد والسير، ح ١١٦].

(٣) هەرچەندە ڕۆژێك داخلی ئیسلام نەبوو، چونكە لە سەرەتای هاتنە نێو ئیسلام مونافیق بوو، تا وەفاتی كرد.

فَدَفَعَهُ إِلَيَّ هِرَقْلُ فَقَرَأَهُ، فَإِذَا فِيهِ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، مِنْ مُحَمَّدٍ عَبْدِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ إِلَى هِرَقْلَ عَظِيمِ الرُّومِ، سَلَامٌ عَلَى مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَى، أَمَّا بَعْدُ، فَإِنِّي أَدْعُوكَ بِدِعَايَةِ الْإِسْلَامِ، أَسْلِمْ تَسْلَمْ، يُؤْتِكَ اللَّهُ أَجْرَكَ مَرَّتَيْنِ، فَإِنْ تَوَلَّيْتَ فَإِنَّ عَلَيْكَ إِثْمَ الْأَرِيسِيِّينَ وَ: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللَّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾﴾ آل عمران»[1].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئەبو سوفیانی كوڕی حەڕب هەواڵی پێدا، هیرەقل پاشای ڕۆمەكان بە دوایدا نارد، پاشان داوای نووسراوەكەی پێغەمبەری خوای ﷺ لێكرد، كە بە دیحیەی كەلبی ناردبووی بۆ گەورەی بوصرا، ئەویش دایە دەستی هیرەقل و خوێندیەوە، كە ئەم دەستەواژەی تێدا نووسرابوو: بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، لە موحەممەدی كوڕی عەبدوڵڵا، كە پێغەمبەری خوایە ﷺ، بۆ هیرەقلی گەورەی ڕۆم، سڵاو لەوانەی شوێن ڕێگەی ڕاست دەكەون، دوای ئەمە، داوات لێدەكەم ئیسلام هەڵبژێری، ئەگەر مسوڵمان بی سەلامەت دەبی، خوا دووجار پاداشتت دەداتەوە: (پاداشتی مسوڵمان بوونی خۆت و، پاداشتی مسوڵمان بوونی گەلەكەت)، ئەگەر پشت هەڵبكەی و یاخی بی، ئەوە تاوانی ئەریسیەكانیش لە ئەستۆی تۆیە، وە فەرموویەتی: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللَّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾﴾ آل عمران، (واتە: «ئەی موحەممەد ﷺ» بڵێ: ئەی خاوەن كتێبینە! وەرن بۆ قسەیەكی یەكسان لە نێوان ئێمەو ئێوەدا، كە جگە لە خوا هیچ شتێك نەپەرستین، وە هیچ شتێك نەكەینە هاوبەش، وە هەندێكمان هەندێكمان لە جیاتی خوا بە سەروەرو پەروەردگار نەگرین، جا ئەگەر پشتیان هەڵكرد، بڵێن: شایەدبن كە ئێمە مسوڵمانین).

## دەربارەی: ئەگەر خاوەن كتێبەكان گوتیان: (السَّامُ عَلَيْكُمْ) مردنتان لەسەر بێ

٩٥٤- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: سَلَّمَ نَاسٌ مِنَ الْيَهُودِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالُوا: السَّامُ عَلَيْكُمْ، قَالَ: «وَعَلَيْكُمْ»، فَقَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا وَغَضِبَتْ: أَلَمْ تَسْمَعْ مَا قَالُوا؟ قَالَ: «بَلَى، قَدْ سَمِعْتُ فَرَدَدْتُ عَلَيْهِمْ، نُجَابُ عَلَيْهِمْ، وَلَا يُجَابُونَ فِينَا»»[2].

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: خەڵكانێك لە جوولەكە سڵاویان كرد لە پێغەمبەر ﷺ، گوتیان: (السَّامُ عَلَيْكُمْ) واتە: مردنتان لەسەر بێ (مردن بۆ ئێوە)، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی:

---

(١) صحيح: «الإرواء» (٣٧/١)، «السلسلة الصحيحة» (٣٢٦/٢): [البخاري: ١- كتاب بدء الوحي، ٦- باب: حدثنا أبو اليمان. مسلم: ٣٢- كتاب الجهاد والسير، ح ٧٤].

(٢) صحيح: [مسلم: ٣٩- كتاب السلام، ح ١٢].

(وَعَلَيْكُمْ) لەسەر ئێوەش بێ، جا دایكمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) تووڕە بوو، گوتی: ئایا نەتبیست چیان گوت؟ فەرمووی: بەڵێ، بیستم و وەڵامم دانەوە، ئێمە وەڵام دەدرێینەوە لەسەر ئەوان (واتە: خوا دوعا لێكردنەكەی ئێمە لەسەر ئەوان قبووڵ دەبێ)، بەڵام ئەوان وەڵام نادرێنەوە دەربارەی ئێمە (واتە: خوا دوعاكەی ئەوان لەسەر ئێمە قبووڵی ناكات).

## دەربارەی: مسوڵمان چۆن دوعا دەكات بۆ بێبڕوایەكی خاوەن پەیمان؟

٩٥٥- «عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ مَرَّ بِرَجُلٍ هَيْئَتُهُ هَيْئَةُ مُسْلِمٍ، فَسَلَّمَ، فَرَدَّ عَلَيْهِ: وَعَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، فَقَالَ لَهُ الْغُلَامُ: إِنَّهُ نَصْرَانِيٌّ، فَقَامَ عُقْبَةُ فَتَبِعَهُ حَتَّى أَدْرَكَهُ فَقَالَ: إِنَّ رَحْمَةَ اللَّهِ وَبَرَكَاتَهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ، لَكِنْ أَطَالَ اللَّهُ حَيَاتَكَ، وَأَكْثَرَ مَالَكَ وَوَلَدَكَ»[1].

واتە: عوقبەی كوڕی عامیری جوهەنی (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، كە تێپەڕیوە بە لای پیاوێكدا كە شێوەو ڕوخساری لە مسوڵمان دەچوو سڵاویشی كرد، (عوقبەش) وەڵامی دایەوەو گوتی: (وَعَلَيْكَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ) جا خزماتكارەكەی پێیگوت: ئەو پیاوە نەصرانییە، ئیدی عوقبە هەڵساو بە دوایدا ڕۆیشت هەتا پێی گەیشت، گوتی: بەڕاستی ڕەحمەت و بەرەكەتی خوا لەسەر بڕوادارانە، بەڵام (پێت دەڵێم:) خوا تەمەنت درێژ بكات، وە ماڵ و منداڵت زۆر بكات.

٩٥٦- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: لَوْ قَالَ لِي فِرْعَوْنُ: بَارَكَ اللَّهُ فِيكَ، قُلْتُ: وَفِيكَ، وَفِرْعَوْنُ قَدْ مَاتَ»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: ئەگەر فیرعەون پێم بڵێ: (بَارَكَ اللَّهُ فِيكَ) پێی دەڵێم: (وَفِيكَ)، جا بێگومان فیرعەون مردوە.

٩٥٧- «عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ الْيَهُودُ يَتَعَاطَسُونَ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ رَجَاءَ أَنْ يَقُولَ لَهُمْ: يَرْحَمُكُمُ اللَّهُ، فَكَانَ يَقُولُ: «يَهْدِيكُمُ اللَّهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ»»[3].

واتە: ئەبو مووسا (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: جوولەكەكان لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دەپژمین، بە ئومێدی ئەوەی پێیان بفەرموێ: (يَرْحَمُكُمُ اللَّهُ) واتە: خوا ڕەحمتان پێبكات، بەڵام (لە جیاتی ئەوە) دەیفەرموو: (يَهْدِيكُمُ اللَّهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ) خوا هیدایەتتان بدات و كاروبارتان چاك بكات.

---

(١) حسن: «الإرواء» (١٢٧٤).

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣٢٩/٢).

(٣) صحيح: [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٩٣- باب: كيف يشمت الذمي، ح ٥٠٣٨].

## دەربارەی: کاتێ مسوڵمان بە نەزانین سڵاوی کرد لە نەصڕانیی

٩٥٨- «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: مَرَّ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، بِنَصْرَانِيٍّ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ، فَرَدَّ عَلَيْهِ، فَأُخْبِرَ أَنَّهُ نَصْرَانِيٌّ، فَلَمَّا عَلِمَ رَجَعَ إِلَيْهِ فَقَالَ: رُدَّ عَلَيَّ سَلَامِي»[1].

**واتە: عەبدوڕڕەحمان (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) تێپەڕی بە لای نەصڕانیەك و سڵاوی لێ کرد، ئەویش وەڵامی دایەوە، دواتر هەواڵی پێدرا ئەو کەسە نەصڕانییە، کاتێك ئەوەی زانی گەڕایەوە بۆ لای، گوتی: سڵاوەکەم بۆ بگەڕێنەوە (دەڵێن: بۆ ئەمە وای پێ گوتوە کە بزانێ خۆشەویستی و هۆگر بوون لە نێوانیان نیە، بەڵکو خۆشەویستی و هۆگر بوونی تەنیا بۆ مسوڵمانانە).**

## دەربارەی: ئەگەر یەکێك گوتی: فڵان کەس سڵاوت لێ دەکات

٩٥٩- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهَا: «جِبْرِيلُ يَقْرَأُ عَلَيْكِ السَّلَامَ»، فَقَالَتْ: وَعَلَيْهِ السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ»[2].

**واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: جبریل سڵاوت لێ دەکات، ئەویش گوتی: سڵاوو ڕەحمەتی خوا لەسەر ئەویش بێ.**

## دەربارەی: وەڵامدانەوەی نووسراوێك کە سڵاوی تێدا بێ

٩٦٠- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، قَالَ: إِنِّي لَأَرَى لِجَوَابِ الْكِتَابِ حَقّاً كَرَدِّ السَّلَامِ»[3].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: من پێم وایە پێویستە وەڵامی چاك و چۆنی و هەواڵ پرسین بدرێتەوە بە نوسراو، هەروەك چۆن سڵاو وەڵام دەدرێتەوە (واتە: دەبێ ئەگەر ڕێزو سڵاوێکت پێگەیشت بە نامە، ئەوە تۆش ڕێزو سڵاو بنێریەوە، جا بە نامە بێ، یان هەر هۆکارێکی دیکە).**

---

(١) حسن: «الإرواء» (١٢٧٤) .

(٢) صحيح: [البخاري: ٧٩- كتاب الإستئذان، ١٩- باب: إذا قال فلان يقرئك السلام. مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ٩١].

(٣) حسن الإسناد.

## دەربارەی: نووسراو بۆ ئافرەتان و وەڵامدانەوەیان

٩٦١- «عَنْ عَائِشَةَ بِنْتُ طَلْحَةَ قَالَتْ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) «وَأَنَا فِي حِجْرِهَا» وَكَانَ النَّاسُ يَأْتُونَهَا مِنْ كُلِّ مِصْرٍ، فَكَانَ الشُّيُوخُ يَنْتَابُونِي لِمَكَانِي مِنْهَا، وَكَانَ الشَّبَابُ يَتَأَخَّوْنِي فَيُهْدُونَ إِلَيَّ، وَيَكْتُبُونَ إِلَيَّ مِنَ الْأَمْصَارِ، فَأَقُولُ لِعَائِشَةَ: يَا خَالَةُ، هَذَا كِتَابُ فُلَانٍ وَهَدِيَّتُهُ، فَتَقُولُ لِي عَائِشَةُ: أَيْ بُنَيَّةُ، فَأَجِيبِيهِ وَأَثِيبِيهِ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ عِنْدَكِ ثَوَابٌ أَعْطَيْتُكِ، فَقَالَتْ: فَتُعْطِينِي»[١].

**واتە: عائیشەی کچی طەڵحە دەڵێ: لە کاتێکدا من لەلای عائیشەو لە ژێر سەرپەرشتی ئەودا بووم، خەڵکیش لە هەموو شارەکانەوە دەهاتن بۆ لام، جا بە تەمەنەکان جار لە دوای جار دەهاتن بۆ لام لەبەر پێگەکەم (واتە: لەبەر نزیکیم لە خاتوو عائیشە)، گەنجەکانیش خۆیان بە برام دەزانی، وە وەك خوشکی خۆیان تەماشایان دەکردم و دیاریان بۆم دەهێنا، وە لە هەموو شارێکەوە نامەیان بۆ دەنووسیم، منیش بە عائیشەم دەگوت: ئەی پورە گیان! ئەمە نووسراوو دیاری فڵان کەسە، عائیشەش دەیگوت: ئەی کچی خۆم وەڵامی بدەوەو پاداشتیشی بکەوە، ئەگەر پاداشتت لەلا نەبوو، ئەوە من پێت دەدەم، دەڵێ: جا پێمی دەدا (تا من بە دیاری بیبەخشم بۆ دیاری هێنەران).**

## دەربارەی: سەرەتاو دەستپێکی نامە نوسین

٩٦٢- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، كَتَبَ إِلَى عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مَرْوَانَ يُبَايِعُهُ، فَكَتَبَ إِلَيْهِ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، لِعَبْدِ الْمَلِكِ أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ: سَلَامٌ عَلَيْكَ، فَإِنِّي أَحْمَدُ إِلَيْكَ اللَّهَ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ، وَأُقِرُّ لَكَ بِالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ عَلَى سُنَّةِ اللَّهِ وَسُنَّةِ رَسُولِهِ، فِيمَا اسْتَطَعْتُ»[٢].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی دینار دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) نووسراوێکی نارد بۆ عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان بەیعەتی پێدا، جا بۆی نووسی: بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە بۆ عەبدولمەلیکی ئەمیری بڕواداران: (سَلَامٌ عَلَيْكَ) سڵاوت لێ بێ، من لەلای تۆ سوپاسی ئەو خوایە دەکەم کە هیچ پەرستراوێك بە هەق نیە جگە لە اللّٰه، وە دان دەنێم بە گوێڕایەڵی و ملکەچی کردنت، لەسەر سوننەتی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی، بە پێی ئەوەی لە توانامدا هەیە.**

---

(١) حسن الإسناد.

(٢) صحيح الإسناد.

## دەربارەی: وشەی: (أَمَّا بَعْدُ)

٩٦٣- «عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، قَالَ: أَرْسَلَنِي أَبِي إِلَى ابْنِ عُمَرَ، فَرَأَيْتُهُ يَكْتُبُ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، أَمَّا بَعْدُ»[١].

واته: زەیدی کوڕی ئەسلەم (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: باوکم ناردمی بۆ لای ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، بینیم دەینووسی: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، أَمَّا بَعْدُ)، واته (دەینوسی): بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، دوای ئەوە (واته: دوای بسم اللّه)...ئاواو ئاوا.

تێبینی: وشەی (أَمَّا بَعْدُ) دوای «بسم اللّه» و «صەڵات و سەلام» و «حەمدی خوا» بەکاردێت، بۆ مەبەستی پەڕینەوە لەم پێشەکیانە بۆ نێوەڕۆکی بابەتی مەبەستدارو و بە ئامانج گیراو لە نامەکەدا، یان بۆ پەڕینەوە لە بابەتێك بۆ بابەتێکی دیکە.

٩٦٤- «عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ قَالَ: رَأَيْتُ رَسَائِلَ مِنْ رَسَائِلِ النَّبِيِّ ﷺ، كُلَّمَا انْقَضَتْ قِصَّةٌ قَالَ: «أَمَّا بَعْدُ»»[٢].

واته: هیشامی کوڕی عوروە دەڵێ: چەند نامەیەکم بینی لە نامەکانی پێغەمبەر ﷺ، هەرکاتێك باسێکی تەواو بکردایە دەیفەرموو: (أَمَّا بَعْدُ) واته: دوای ئەوە ... (ئنجا دەستی بە نووسینی بابەتێکی دیکە دەکرد).

## دەربارەی: سەرەتای نامە نووسین بە: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)

٩٦٥- «عَنْ خَارِجَةَ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ كُبَرَاءِ آلِ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، كَتَبَ بِهَذِهِ الرِّسَالَةِ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، لِعَبْدِ اللَّهِ مُعَاوِيَةَ أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ، مِنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، سَلَامٌ عَلَيْكَ أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، فَإِنِّي أَحْمَدُ إِلَيْكَ اللَّهَ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ، أَمَّا بَعْدُ»[٣].

واته: خاریجەی کوڕی زەید دەگێڕێتەوە، لە گەورە پیاوانی خانەوادەی زەیدی کوڕی ثابیتەوە (گوتوویانە): زەیدی کوڕی ثابت (خوا لێی ڕازی بێ) ئەم نامەیەی نووسی: بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، لە زەیدی کوڕی ثابیتەوە بۆ بەندەی خوا موعاویە ئەمیری بڕواداران: سەلامی خوات لەسەر بێ ئەی ئەمیری بڕواداران، وە ڕەحمەتی خواشت لێ بێ، من بۆ تۆ سوپاسی ئەو

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح لغيره: «الإرواء» تحت الحديث (٧) .

(٣) حسن الإسناد.

خوایە دەکەم کە هیچ پەرستراوێك بە هەق نیە جگە لە اللَّه، (أَمَّا بَعْدُ) واتە: دوای ئەوە ... ئاواو ئاوا.

٩٦٦- «عَنْ أَبُو مَسْعُودٍ الْجُرَيْرِيُّ قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ الْحَسَنَ عَنْ قِرَاءَةِ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ؟ قَالَ: تِلْكَ صُدُورُ الرَّسَائِلِ»[١].

واتە: ئەبو مەسعوودی جورەیری دەڵێ: پیاوێك پرسیاری کرد لە حەسەن دەربارەی خوێندنی: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)؟ (حەسەنیش) گوتی: ئەوە سەرەتاو دەستپێکی هەموو نامەیەکە.

## دەربارەی: چۆنیەتی دەست پێکردنی نووسراو؟

٩٦٧- «عَنْ نَافِعٍ قَالَ: كَانَتْ لِابْنِ عُمَرَ حَاجَةٌ إِلَى مُعَاوِيَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ)، فَأَرَادَ أَنْ يَكْتُبَ إِلَيْهِ، فَقَالُوا: ابْدَأْ بِهِ، فَلَمْ يَزَالُوا بِهِ حَتَّى كَتَبَ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، إِلَى مُعَاوِيَةَ»[٢].

واتە: نافیع دەڵێ: ئیبنو عومەر پێویستیەکی بە موعاویە بوو (خوا لە هەموویان ڕازی بێ)، جا ویستی نووسراوێکی بۆ بنووسێ، گوتیان: بە (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) دەست پێ بکە، جا بەردەوام هەر پێیان گوت هەتا نووسی: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) بۆ موعاویە...».

٩٦٨- «عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: كَتَبْتُ لِابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، فَقَالَ: اكْتُبْ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، أَمَّا بَعْدُ: إِلَى فُلَانٍ»[٣].

واتە: ئەنەسی کوڕی سیرین دەڵێ: نووسراوێکم کرد بۆ ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، گوتی: بنووسە: بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، دوای ئەوە: بۆ فڵانە کەسە...(بابەتەکەی دەنووسی).

٩٦٩- «عَنْ أَنَسِ بْنِ سِيرِينَ قَالَ: كَتَبَ رَجُلٌ بَيْنَ يَدَيِ ابْنِ عُمَرَ(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا): بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، لِفُلَانٍ، فَنَهَاهُ ابْنُ عُمَرَ وَقَالَ: قُلْ: بِسْمِ اللَّهِ، هُوَ لَهُ»[٤].

واتە: ئەنەسی کوڕی سیرین دەڵێ: پیاوێك لەبەر دەستی ئیبنو عومەردا (خوا لێیان ڕازی بێ) نووسراوی نووسی (بەم شێوەیە): بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، بۆ فڵانە کەس، ئیبنو عومەریش نەهی لێکردو گوتی: بڵێ: (بِسْمِ اللَّهِ) ئەمە بۆ ئەوە.

---

(١) صحيح الإسناد عن الحسن: وهو البصري.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح الإسناد.

(٤) صحيح الإسناد.

٩٧٠- «عَنْ خَارِجَةَ بْنِ زَيْدٍ، عَنْ كُبَرَاءِ آلِ زَيْدٍ، أَنَّ زَيْداً كَتَبَ بِهَذِهِ الرِّسَالَةِ: لِعَبْدِ اللَّهِ مُعَاوِيَةَ أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ، مِنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ: سَلَامٌ عَلَيْكَ أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، فَإِنِّي أَحْمَدُ إِلَيْكَ اللَّهَ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ، أَمَّا بَعْدُ»[١].

**واتە: خاریجەی کوڕی زەید لە گەورە پیاوانی خانەوادەی زەیدی گێڕاوەتەوە، (گوتوویانە:) زەید ئەم نووسراوەی نووسی (بەم شێوەیە): لە زەیدی کوڕی ثابیتەوە بۆ بەندەی خوا موعاویەی ئەمیری بڕواداران: سەلامی خوات لێ بێ ئەی ئەمیری بڕواداران، وە ڕەحمەتی خوات لێ بێ، من لەلایەنی تۆوە سوپاسی ئەو خوایە دەکەم کە هیچ پەرستراوێك بە هەق نیە جگە لەو، (أَمَّا بَعْدُ) واتە: دوای ئەوە ... (ئنجا نێوەڕۆکی نامەکەی دەنووسی).**

## دەربارەی: (ڕستەی) چۆن بەیانیت کردەوە؟

٩٧١- «عَنْ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ قَالَ: لَمَّا أُصِيبَ أَكْحُلُ سَعْدٍ يَوْمَ الْخَنْدَقِ فَثَقُلَ، حَوَّلُوهُ عِنْدَ امْرَأَةٍ يُقَالُ لَهَا: رُفَيْدَةُ، وَكَانَتْ تُدَاوِي الْجَرْحَى، فَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا مَرَّ بِهِ يَقُولُ: «كَيْفَ أَمْسَيْتَ؟»، وَإِذَا أَصْبَحَ: «كَيْفَ أَصْبَحْتَ؟» فَيُخْبِرُهُ»[٢].

**واتە: مەحمودی کوڕی لەبید دەڵێ: کاتێ شادەماری باسکی سەعد لە ڕۆژی شەڕی خەندەقدا پێکراو برینێکی قورسی تێکەوت، جا گواستیانەوەو بردیان بۆ لای ئافرەتێك کە پێی دەگوترا ڕوفەیدە، کە چارەسەری برینداره‌کانی دەکرد، جا پێغەمبەر ﷺ هەر کاتێك بەلای سەعددا تێپەڕی بووایە دەیفەرموو: ئەم شەو چۆن بووی؟ وە ئەگەر ڕۆژی بکردبایەوە (پێی دەفەرموو): چۆن بەیانیت کردەوەو ئەمڕۆ چۆنی؟ ئەویش هەواڵی پێ دەدا (تەندروستی چۆن بووە).**

٩٧٢- «عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ الْأَنْصَارِيُّ «قَالَ: وَكَانَ كَعْبُ بْنُ مَالِكٍ أَحَدَ الثَّلَاثَةِ الَّذِينَ تِيبَ عَلَيْهِمْ» أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَلِيَّ بْنَ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) خَرَجَ مِنْ عِنْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي وَجَعِهِ الَّذِي تُوُفِّيَ فِيهِ، فَقَالَ النَّاسُ: يَا أَبَا الْحَسَنِ، كَيْفَ أَصْبَحَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: أَصْبَحَ بِحَمْدِ اللَّهِ بَارِئاً، قَالَ: فَأَخَذَ عَبَّاسُ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ بِيَدِهِ، فَقَالَ: أَرَأَيْتُكَ؟ فَأَنْتَ وَاللَّهِ بَعْدَ ثَلَاثٍ عَبْدُ الْعَصَا، وَإِنِّي وَاللَّهِ لَأَرَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَوْفَ يُتَوَفَّى فِي مَرَضِهِ هَذَا، إِنِّي أَعْرِفُ وُجُوهَ بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ عِنْدَ الْمَوْتِ، فَاذْهَبْ بِنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَلْنَسْأَلْهُ: فِيمَنْ هَذَا الْأَمْرُ؟ فَإِنْ كَانَ فِينَا عَلِمْنَا ذَلِكَ، وَإِنْ كَانَ فِي غَيْرِنَا كَلَّمْنَاهُ فَأَوْصَى بِنَا، فَقَالَ عَلِيٌّ: إِنَّا وَاللَّهِ إِنْ سَأَلْنَاهُ فَمَنَعَنَاهَا لَا يُعْطِينَاهَا النَّاسُ بَعْدَهُ أَبَداً وَإِنِّي وَاللَّهِ لَا أَسْأَلُهَا رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَبَداً»[٣].

---

(١) حسن الإسناد.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١١٥٨) .

(٣) صحيح: [البخاري: ٦٤- كتاب المغزي، ٨٣- باب: مرض النبي ﷺ ووفاته].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی کەعبی کوڕی مالیکی ئەنصاڕی (دەڵێ: کەعبی کوڕی مالیك یەکێك بوو لەو سێ کەسەی کە خوا لێیان خۆش بوو: جا ئیبنو عەبباس هەواڵی بەو داوە گوتوویەتی): کە عەلی کوڕی ئەبو طاڵیب (خوا لێی ڕازی بێ)، لەلای پێغەمبەر ﷺ دەرچوو لە کاتی ئەو نەخۆشیەی کە بە هۆیەوە کۆچی کرد، خەڵکەکە گوتیان: ئەی باوکی حەسەن پێغەمبەر ﷺ چۆن بەیانی کردەوە (ئەمڕۆ حاڵی چۆنە)؟ گوتی: ستایش بۆ خوا بەیانی کردەوە بە بە ئاگایی (لە بوورانەوە بە ئاگا هاتۆتەوە)، جا عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب دەستی گرت و، گوتی: دەزانی چۆنت دەبینم؟ سوێند بە خوا تۆ دوای سێ ڕۆژی دیکە دەبیتە فەرمانبەری کەسێکی دیکەی جگە لە پێغەمبەر، وە من سوێند بە خوا پێم وایە پێغەمبەر ﷺ دوای سێ ڕۆژ وەفات دەکات، من ڕووخساری نەوەکانی عەبدولموتەلیب دەناسمەوە لە کاتی مردندا، جا بڕۆ با بچین بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێ بکەین: ئەم خیلافەتە بۆ کێیە (دوای تۆ)؟ ئەگەر بۆ ئێمە بێ ئەوە دەیزانین، وە ئەگەر بۆ ئێمەش نەبێ قسەی لەگەڵ دەکەین بەڵکو وەسیەتێکمان بۆ بکات، جا عەلی گوتی: سوێند بە خوا ئەگەر داوای لێ بکەین خەڵکی لە دوای ئەو ڕێگریمان لێ دەکەن.

## دەربارەی: ئەو کەسەی لە کۆتایی نووسراوەکەیدا نووسی: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ) فڵانی کوڕی فڵان نوسراوی نووسی دوازدە شەوی مابوو لە مانگدا

٩٧٣- «عَنِ ابْنِ أَبِي الزِّنَادِ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي، أَنَّهُ أَخَذَ هَذِهِ الرِّسَالَةَ مِنْ خَارِجَةَ بْنِ زَيْدٍ، وَمِنْ كُبَرَاءِ آلِ زَيْدٍ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، لِعَبْدِ اللَّهِ مُعَاوِيَةَ أَمِيرِ الْمُؤْمِنِينَ، مِنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ: سَلَامٌ عَلَيْكَ أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، فَإِنِّي أَحْمَدُ إِلَيْكَ اللَّهَ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ، أَمَّا بَعْدُ: فَإِنَّكَ تَسْأَلُنِي عَنْ مِيرَاثِ الْجَدِّ وَالْإِخْوَةِ، فَذَكَرَ الرِّسَالَةَ، وَنَسْأَلُ اللَّهَ الْهُدَى وَالْحِفْظَ وَالتَّثَبُّتَ فِي أَمْرِنَا كُلِّهِ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ أَنْ نَضِلَّ، أَوْ نَجْهَلَ، أَوْ نُكَلَّفَ مَا لَيْسَ لَنَا بِهِ عِلْمٌ، وَالسَّلَامُ عَلَيْكَ أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ وَمَغْفِرَتُهُ. وَكَتَبَ وُهَيْبٌ: يَوْمَ الْخَمِيسِ لِثِنْتَيْ عَشْرَةَ بَقِيَتْ مِنْ رَمَضَانَ سَنَةَ اثْنَيْنِ وَأَرْبَعِينَ»[١].

واتە: ئیبنو ئەبی زیناد دەڵێ: باوکم بۆی باسکردم کە ئەو نامەیەی وەرگرتووە لە خاریجەی کوڕی زەیدو گەورە پیاوانی خانەوادەی زەید (کە لە نامەکەدا ئاوا هاتوە): بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، لە زەیدی کوڕی ثابیتەوە بۆ بەندەی خوا موعاویەی ئەمیری بڕواداران: (سَلَامٌ عَلَيْكَ) سڵاوو ڕەحمەتی خوات لەسەر بێت ئەی ئەمیری بڕواداران، من لەلای تۆوە سوپاسی ئەو خوایە دەکەم کە هیچ پەرستراوێك بە هەق نیە جگە لەو، (أَمَّا بَعْدُ) واتە: دوای (سڵاو و حەمدی خوا، دەست دەکەم بە باسەکەم): تۆ پرسیارم لێ دەکەی لە بارەی میراتی باپیرەو براکانەوە، جا باسی نامەکەی کرد (واتە: حەل کردنی بابەتەکەی میراتی خوێندەوە کە زەید بۆی نوسی بوو، دواتر

---

(١) حسن الإسناد.

نوسیبووی): وە داوای هیدایەت و پارێزراوی و جێگیر بوون دەکەم لە هەموو کاروبارەکانمان بە گشتی، وە پەنا دەگرم بە خوا لەوەی گومڕا بین، یان تووشی نەفامی بین، یان ئەرکێك بخرێتە ئەستۆمان هیچ زانیاریمان لە بارەیەوە نەبێ، وە سڵاوو ڕەحمەت و لێبوردەیی خوات لەسەر بێ ئەی ئەمیری بڕواداران. جا وەهەیب نووسراوەکەی نووسی لە ڕۆژی پێنج شەممە کە دوازدە ڕۆژی مابوو لە ڕەمەزانی ساڵی چل و دوو.

## دەربارەی: چۆن وەڵام دەدەیەوە، ئەگەر گوترا: بەیانیت چۆن کردەوە؟

٩٧٤- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قِيلَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: كَيْفَ أَصْبَحْتَ؟ قَالَ: «بِخَيْرٍ مِنْ قَوْمٍ لَمْ يَشْهَدُوا جَنَازَةً، وَلَمْ يَعُودُوا مَرِيْضاً»»[١].

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، (دەڵێ): بە پێغەمبەر ﷺ گوترا: چۆن بەیانیت کردەوەو ئەمڕۆ چۆنی؟ فەرمووی: بە خێرو چاکی (بەیانیم کردەوە) لە نێو کۆمەڵێکدا کە ئامادەی تەرم نەبوون، وە نەخۆشیش نەبوو سەردانی بکەن (واتە: سوپاس بۆ خوا مسوڵمانان سەلامەتن، بۆیە حاڵم باشە).

٩٧٥- «عَنْ مُهَاجِرٍ هُوَ الصَّائِغُ، قَالَ: كُنْتُ أَجْلِسُ إِلَى رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ ضَخْمٍ مِنَ الْحَضْـرَمِيِّينَ، فَكَانَ إِذَا قِيلَ لَهُ: كَيْفَ أَصْبَحْتَ؟ قَالَ: لَا نُشْرِكُ بِاللَّهِ»[٢].

**واتە: لە کۆچکەرێکەوە کە ناوی صائیغە بوو گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: من لای پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووم کە چوار شانەو زەخم بوو لە حەضرەمیەکان بوو، ئەگەر پێی بگوترایە: چۆن بەیانیت کردەوەو ئەمڕۆ چۆنی؟ دەیگوت: هاوبەش بۆ خوا دانانێین (کەواتە: حاڵمان زۆر باشە).**

## دەربارەی: باشترین مەجلیس فراوانترینیانە

٩٧٦- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «خَيْرُ الْمَجَالِسِ أَوْسَعُهَا»، ثُمَّ تَنَحَّى وَجَلَسَ فِي مَجْلِسٍ وَاسِعٍ»[٣].

---

(١) حسن لغيره: التعليق على «سنن ابن ماجه» (٣٩٩/٢): [إبن ماجه: ٣٣- كتاب الأدب، ١٨- باب: المريض يقال له: كيف أصبحت؟ ح ٣٧١٠].

(٢) حسن الإسناد موقوف.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨٣٢): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ١٢- باب: في سعة المجلس، ح ٤٨٢٠].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: باشترین مەجلیس فراوانترینیانە، پاشان لە لایەك دانیشت لە مەجلیسێكی فراوان.

## دەربارەی: ئەگەر كەسێك هەڵسا لە شوێنەكەی و دوایی گەڕایەوە شوێنەكەی

٩٧٧- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنْ مَجْلِسِهِ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَيْهِ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ»»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ (فەرموویەتی): ئەگەر یەكێك لە ئێوە هەڵسا لە شوێنەكەی خۆی لە مەجلیس، پاشان گەڕایەوە بۆی، ئەوە خۆی لە هەموو كەس شایستەترو لە پێشترە بەو شوێنە (لێی دابنیشتەوە).

## دەربارەی: دانیشتن لەسەر ڕێگاو بان

٩٧٨- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): أَتَانَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَنَحْنُ صِبْيَانٌ، فَسَلَّمَ عَلَيْنَا، وَأَرْسَلَنِي فِي حَاجَةٍ، وَجَلَسَ فِي الطَّرِيقِ يَنْتَظِرُنِي حَتَّى رَجَعْتُ إِلَيْهِ، قَالَ: فَأَبْطَأْتُ عَلَى أُمِّ سُلَيْمٍ، فَقَالَتْ: مَا حَبَسَكَ؟ فَقُلْتُ: بَعَثَنِي النَّبِيُّ ﷺ فِي حَاجَةٍ، قَالَتْ: مَا هِيَ؟ قُلْتُ: إِنَّهَا سِرٌّ، قَالَتْ: فَاحْفَظْ سِرَّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ»[٢].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە (دەڵێت): پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لامان لەكاتێكدا ئێمە منداڵ بووین، جا سڵاوی لێكردین و، منی نارد بۆ پێویستیەك، جا لەسەر ڕێگاكە دانیشت چاوەڕوانی منی دەكرد هەتا گەڕامەوە، دەڵێ: جا (بەهۆی كارەكەی پێغەمبەری خواوە) دواكەوتم لە گەڕانەوەم لەلای ئوممو سولەیم (ی دایكم)، (ئوممو سولەیمیش) گوتی: چ شتێك تۆی قەتیس كردو دوایخستی؟ گوتم: پێغەمبەر ﷺ ناردمی بۆ پێویستیەك، گوتی: پێویستیەكە چی بوو؟ گوتم: ئەوە نهێنیە، گوتی: كەواتە نهێنی پێغەمبەر ﷺ بپارێزە.

## دەربارەی: فراوان كردنی كۆڕو مەجلیس

٩٧٩- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا يُقِيمَنَّ أَحَدُكُمُ الرَّجُلَ مِنْ مَجْلِسِهِ، ثُمَّ يَجْلِسُ فِيهِ، وَلَكِنْ تَفَسَّحُوا وَتَوَسَّعُوا»»[٣].

---

(١) صحيح: [مسلم: ٣٩- كتاب السلام، ح ٣١].

(٢) صحيح: [مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ١٤٥].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٢٨، ٦٦٠): [البخاري: ٧٩-- كتاب الاستئذان، ٣١- باب: لا يقيم الرجل الرجل من مجلسه.

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: با هیچ یەکێکتان پیاوێکی دیکە لە شوێنەکەی هەڵنەستێنێ، پاشان خۆی لە شوێنی ئەو دابنیشێ، بەڵکو (مەجلیسەکە) فراوان بکەن.

تێبینی: وشەی (تَفَسَّحُوا) کە هەم لەم فەرموودەو، هەم لە قورئانیش هاتوە، مەبەست پێی فراوانکردنی شوێنی دانیشتنەکەیە، بەڵام ئایا ئەگەر مەبەست خودی مەجلیسەکە بێ، هەموو مەجلیسێك دەگرێتەوە؟ هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەمە تایبەت بووە بە کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ، چونکە هاوەڵان موونافەسیان دەکرد لە نزیك بوون و چوونە پێش لە پێغەمبەر بۆ ئەوەی لە نزیکەوە ببینن کاتێك فەرمایشت دەفەرموێ، هەندێك لە زانایانیش دەڵێن: نەخێر، ئەم فراوان کردنە بۆ هەموو کۆڕو مەجلیسێکە.

## دەربارەی: مرۆڤ لەو شوێنە دادەنیشێ کە مەجلیسەکە کۆتایی پێهاتوە

٩٨٠- «عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كُنَّا إِذَا أَتَيْنَا النَّبِيَّ ﷺ جَلَسَ أَحَدُنَا حَيْثُ انْتَهَى»[١].

واتە: جابری کوڕی سەموره (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئێمە ئەگەر بهاتباین بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ئەوە هەر یەکێکمان لەو شوێنە دادەنیشت کە کۆتایی مەجلیسەکە بوو.

## دەربارەی: مرۆڤ نابێ دوو کەس لێك جیابکاتەوەو لە نێوانیان دابنیشێ

٩٨١- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا يَحِلُّ لِرَجُلٍ أَنْ يُفَرِّقَ بَيْنَ اثْنَيْنِ، إِلَّا بِإِذْنِهِمَا»»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دروست نیە بۆ کەسێك کە دوو کەسان لێك بکاتەوە لە کاتی دانیشتن (بچێ لە نێوانیان دابنیشێ)، مەگەر بە مۆڵەتی هەردووکیان (ئەم کارە بکات).

٩٨٢- «عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، وَعِنْدَهُ الْقَوْمُ جُلُوسٌ، يَتَخَطَّى إِلَيْهِ، فَمَنَعُوهُ، فَقَالَ: اتْرُكُوا الرَّجُلَ، فَجَاءَ حَتَّى جَلَسَ إِلَيْهِ، فَقَالَ: أَخْبِرْنِي بِشَيْءٍ سَمِعْتَهُ مِنْ

---

مسلم: ٣٩- كتاب السلام، ح ٢٧].

(١) صحيح لغيره: «السلسلة الصحيحة» (٣٣٠): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ١٤- باب: في التحلق، ح ٤٨٢٥].

(٢) حسن: «المسكاة» (٤٧٠٣/ التحقيق الثاني): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٢١- باب: الرجل يجلس بين الرجلين بغير إذنهما، ح ٣٨٤٥. الترمذي: ٤١- كتاب الأدب، ١١- باب: كراهية الجلوس بين الرجلين بغير إذنهما].

رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الْمُسْلِمُ مِنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ، وَالْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ مَا نَهَى اللَّهُ عَنْهُ»»(١).

واتە: شەعبی دەڵێ: پیاوێك هات بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوا لێیان ڕازی بێ)، لەو کاتەدا خەڵکانێك لە لای دانیشتبوون، (پیاوەکە) بە نێویاندا تێپەڕ بوو بۆ ئەوەی بچێ بۆ لای (عەبدوڵڵای کوڕی عەمر)، ئەوانیش ڕێگریان لێکرد، (عەبدوڵڵای کوڕی عەمریش) گوتی: واز لەو پیاوە بێنن، ئیدی (پیاوەکە) هات تا لای دانیشت، گوتی: هەواڵم پێبدە بە شتێك کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیستبێتت، گوتی: بیستم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: مسوڵمانی تەواو ئەو کەسەیە کە مسوڵمانان پارێزراو بن لە زمان و دەستی، کۆچکەریش ئەو کەسەیە کۆچ دەکات لەو شتانەی خوا ڕێگری لێکردوەو وازیان لێ دێنێ.

## دەربارەی: بەڕێزترینی خەڵکی لای مرۆڤ ئەو کەسانەن کە لەگەڵی دادەنیشن

٩٨٣- «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبَّادِ بْنِ جَعْفَرٍ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا): أَكْرَمُ النَّاسِ عَلَيَّ جَلِيسِي»(٢).

واتە: موحەممەدی کوڕی عەببادی کوڕی جەعفەر دەڵێ: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتی: بەڕێزترینی خەڵکی لەلای من ئەوانەن کە لەگەڵم دادەنیشن و هاومەجلیسمن (واتە: ئەو کەسانە هەم زۆر بەڕێزن، هەم شایەنی ڕێزن، دەبێ من ڕێزیان بگرم، چونکە ئەوان ڕێزم دەگرن بەوەی دێنە مەجلیسەکەم).

## دەربارەی: ئایا مرۆڤ قاچی درێژ دەکات لەبەردەم ئەو کەسانەی لەگەڵی دانیشتوون؟

٩٨٤- «عَنْ كَثِيرِ بْنِ مُرَّةَ قَالَ: دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فَوَجَدْتُ عَوْفَ بْنَ مَالِكٍ الْأَشْجَعِيَّ جَالِسًا فِي حَلْقَةٍ مَادًّا رِجْلَيْهِ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَلَمَّا رَآنِي قَبَضَ رِجْلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ لِي: تَدْرِي لِأَيِّ شَيْءٍ مَدَدْتُ رِجْلَيَّ؟ لَيَجِيءَ رَجُلٌ صَالِحٌ فَيَجْلِسَ»(٣).

واتە: کەثیری کوڕی موڕڕە دەڵێ: لە ڕۆژی هەینی چوومە نێو مزگەوتەوە، بینیم عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعی لە نێو ئەڵقەی کۆڕێکدا دانیشتووە لە کاتێکدا هەردوو قاچی درێژکردوە بۆ

(١) صحيح: «الروض النضير» (٥٩١): [البخاري: ٢- كتاب الإيمان، ٤- باب: الْمُسْلِمُ مِنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ. مسلم: ١- كتاب الإيمان، ح ٦٤].

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) حسن الإسناد.

بەردەمی، جا کە منی بینی قاچی کێشایەوە دواوە، پاشان پێی گوتم: دەزانی بۆچی قاچم درێژ کردبوو؟ بۆ ئەوەی (شوێنێك بهێڵمەوە) تا پیاوێکی چاك بێ و دابنیشێ.

## دەربارەی: (کاتێ) مرۆڤ لە نێو خەڵکی بێت و (پێویست بێ) تف ڕوو بکات

٩٨٥- «عَنْ الْحَارِثِ بْنِ عَمْرٍو السَّهْمِيِّ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ بِمِنًى «أَوْ بِعَرَفَاتٍ» وَقَدْ أَطَافَ بِهِ النَّاسُ، وَيَجِيءُ الْأَعْرَابُ، فَإِذَا رَأَوْا وَجْهَهُ قَالُوا: هَذَا وَجْهٌ مُبَارَكٌ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اسْتَغْفِرْ لِي، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَنَا»، فَدُرْتُ فَقُلْتُ: اسْتَغْفِرْ لِي، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَنَا»، فَذَهَبَ يَبْزُقُ، فَقَالَ بِيَدِهِ فَأَخَذَ بِهَا بُزَاقَهُ، وَمَسَحَ بِهِ نَعْلَهُ، كَرِهَ أَنْ يُصِيبَ أَحَداً مِنْ حَوْلِهِ»[1].

واتە: حارثی کوڕی عەمری سەهمی دەڵێ: هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ کە ئەو لە مینا «یان لە کێوی عەرەفات» بوو، خەڵکیش لەدەورەی دەهاتن و دەچوون، دەشتەکیەکانیش دەهاتن، جا کاتێ ڕووخساریان دەبینی دەیانگوت: ئەم ڕووخسارە پیرۆزە، (دەڵێ منیش) گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێخۆشبونم بۆ بکە، فەرمووی: خوایە لێمان خۆشبە، منیش سووڕامەوەو (دووبارە) گوتم: داوای لێخۆشبونم بۆ بکە، فەرمووی: خوایە لێمان خۆشبە، ئنجا ڕۆیشت تفی کردە نێو دەستی و بە نەعلەکەیدا سڕییەوە، پێی ناخۆش بوو بەر کەسێك بکەوێ لە دەوروبەری (لەبەر قەڵەباڵغی مەجالی فڕێدانی نەبوو).

## دەربارەی: دانیشتن لە کوچەو کۆڵانەکان

٩٨٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ الْمَجَالِسِ بِالصُّعُدَاتِ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَيَشُقُّ عَلَيْنَا الْجُلُوسُ فِي بُيُوتِنَا؟ قَالَ: «فَإِنْ جَلَسْتُمْ فَأَعْطُوا الْمَجَالِسَ حَقَّهَا»، قَالُوا: وَمَا حَقُّهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «إِدْلَالُ السَّائِلِ، وَرَدُّ السَّلَامِ، وَغَضُّ الْأَبْصَارِ، وَالْأَمْرُ بِالْمَعْرُوفِ، وَالنَّهْيُ عَنِ الْمُنْكَرِ»»[2].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ ڕێگری کردوە لە دانیشتنی پێش دەرگاو کوچەو کۆڵانەکان، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، گرانە بەسەرمانەوە لەماڵەوە دابنیشین (چ بکەین؟) فەرمووی: مادەم ئەگەر دانیشتن مافی مەجلیسەکان بدەن، گوتیان: مافی مەجلیسەکان چیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ڕێنمایی کردنی کەسی پرسیارکار، وەڵامدانەوەی سڵاوو، چاو داخستن (لە حەرام)، وە فەرمان بە چاکەو ڕێگری کردن لە خراپە.

---

(١) حسن: «صحيح أبي داود» (١٥٢٩): [أبو داود: ١١- كتاب المناسك، ٨- باب: في المواقيت، ح ١٧٤٢].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٥٦١): [ليس في شيء من الكتب الستة].

٩٨٧- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِيَّاكُمْ وَالْجُلُوسَ فِي الطُّرُقَاتِ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا لَنَا بُدٌّ مِنْ مَجَالِسِنَا نَتَحَدَّثُ فِيهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَمَّا إِذْ أَبَيْتُمْ، فَأَعْطُوا الطَّرِيقَ حَقَّهُ»، قَالُوا: وَمَا حَقُّ الطَّرِيقِ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «غَضُّ الْبَصَرِ، وَكَفُّ الْأَذَى، وَالْأَمْرُ بِالْمَعْرُوفِ، وَالنَّهْيُ عَنِ الْمُنْكَرِ»»[1].

**واتە: ئەبو سەعیدی خودری (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە دانیشتن لەسەر ڕێگاکان، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شوێنێکمان نیە بۆ دانیشتنەکانمان تا باس و خواسی تێدا بکەین، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر نەتانتوانی و خۆتان بۆ نەگیرا، ئەوە مافی ڕێگاکە بدەن، گوتیان: مافی ڕێگا چیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: چاوداخستن (لە حەڕام)و، ئازار نەدان، وە فەرمان کردن بە چاکەو ڕێگری کردن لە خراپە.**

## دەربارەی: ئەو کەسەی قاچی شۆڕ دەکاتەوە بۆ نێو بیرو دەریان دەخات

٩٨٨- «عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْماً إِلَى حَائِطٍ مِنْ حَوَائِطِ الْمَدِينَةِ لِحَاجَتِهِ، وَخَرَجْتُ فِي أَثَرِهِ، فَلَمَّا دَخَلَ الْحَائِطَ جَلَسْتُ عَلَى بَابِهِ، وَقُلْتُ: لَأَكُونَنَّ الْيَوْمَ بَوَّابَ النَّبِيِّ ﷺ، وَلَمْ يَأْمُرْنِي، فَذَهَبَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَضَى حَاجَتَهُ وَجَلَسَ عَلَى قُفِّ الْبِئْرِ، وَكَشَفَ عَنْ سَاقَيْهِ، وَدَلَّاهُمَا فِي الْبِئْرِ، فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ لِيَسْتَأْذِنَ عَلَيْهِ لِيَدْخُلَ، فَقُلْتُ: كَمَا أَنْتَ حَتَّى أَسْتَأْذِنَ لَكَ، فَوَقَفَ، وَجِئْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَبُو بَكْرٍ يَسْتَأْذِنُ عَلَيْكَ؟ فَقَالَ: «ائْذَنْ لَهُ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ»، فَدَخَلَ فَجَاءَ عَنْ يَمِينِ النَّبِيِّ ﷺ، فَكَشَفَ عَنْ سَاقَيْهِ وَدَلَّاهُمَا فِي الْبِئْرِ، فَجَاءَ عُمَرُ، فَقُلْتُ: كَمَا أَنْتَ حَتَّى أَسْتَأْذِنَ لَكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ائْذَنْ لَهُ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ»، فَجَاءَ عُمَرُ عَنْ يَسَارِ النَّبِيِّ ﷺ فَكَشَفَ عَنْ سَاقَيْهِ وَدَلَّاهُمَا فِي الْبِئْرِ فَامْتَلَأَ الْقُفُّ، فَلَمْ يَكُنْ فِيهِ مَجْلِسٌ. ثُمَّ جَاءَ عُثْمَانُ، فَقُلْتُ: كَمَا أَنْتَ حَتَّى أَسْتَأْذِنَ لَكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ائْذَنْ لَهُ، وَبَشِّرْهُ بِالْجَنَّةِ مَعَهَا بَلَاءٌ يُصِيبُهُ»، فَدَخَلَ فَلَمْ يَجِدْ مَعَهُمْ مَجْلِساً، فَتَحَوَّلَ حَتَّى جَاءَ مُقَابِلَهُمْ عَلَى شَفَةِ الْبِئْرِ، فَكَشَفَ عَنْ سَاقَيْهِ ثُمَّ دَلَّاهُمَا فِي الْبِئْرِ، فَجَعَلْتُ أَتَمَنَّى أَنْ يَأْتِيَ أَخٌ لِي، وَأَدْعُو اللَّهَ أَنْ يَأْتِيَ بِهِ، فَلَمْ يَأْتِ حَتَّى قَامُوا. قَالَ ابْنُ الْمُسَيِّبِ: فَأَوَّلْتُ ذَلِكَ قُبُورَهُمْ، اجْتَمَعَتْ هَا هُنَا، وَانْفَرَدَ عُثْمَانُ»[2].

**واتە: ئەبو مووسای ئەشعەری (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك دەرچوو بۆ نێو شورەی باخێك لە باخەکانی مەدینە بۆ پێویستی خۆی، منیش بە دوایدا ڕۆیشتم، کاتێ چووە**

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» أيضاً (١٥٦١ و ٢٥٠١): [البخاري: ٤٦- كتاب المظالم، ٢٢- باب: أفنية الدور والجلوس فيها. مسلم: ٣٧- كتاب اللباس والزينة، ح ١١٤].

(٢) صحيح: [البخاري: ٦٢- كتاب فضائل أصحاب النبي ﷺ، ٥- باب: قول النبي ﷺ لو كنت متخذاً خليلًا. مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ٢٩].

نێو شوڕەی باخەکەوە من لەسەر دەرگای باخەکە دانیشتم، گوتم: ئەمڕۆ دەبێ ببم بە دەرگاوانی پێغەمبەر ﷺ فەرمانیشی پێنەکردبووم بەوە، جا پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت پێویستیەکەی تەواو کرد، پاشان لەسەر لێواری بیرەکە دانیشت و قاچەکانی دەرخستن و شۆڕی کردنەوە بۆ نێو بیرەکە، ئەبو بەکر هات مۆڵەتی لێ وەربگرێ بۆ ئەوەی بچێت بۆ لای، گوتم: چاوەڕوان بە هەتا مۆڵەتت بۆ وەردەگرم، ئەویش وەستا، منیش ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو بەکر داوای مۆڵەتت لێ دەکات؟ فەرمووی: مۆڵەتی پێبدەو موژدەی بەهەشتیشی پێبدە، جا هاتە ژوورەوەو لەلای ڕاستی پێغەمبەر ﷺ دانیشت و قاچی دەرخستن و شۆڕی کردەوە نێو بیرەکە، پاشان عومەر هات گوتم: چاوەڕوان بە هەتا مۆڵەتت بۆ وەردەگرم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مۆڵەتی پێبدەو موژدەی بەهەشتیشی پێبدە، جا هاتە ژوورەوەو لەلای ڕاستی پێغەمبەر ﷺ دانیشت و قاچی دەرخستن و شۆڕی کردەوە نێو بیرەکە، جا سەری بیرەکە پڕ بوو جێگە نەما، پاشان عوسمان هات، گوتم: چاوەڕوان بە هەتا مۆڵەتت بۆ وەردەگرم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مۆڵەتی پێبدەو مژدەی بەهەشتی پێبدە بە بەڵایەك كە تووشی دەبێ، جا هات بۆ لایان شوێنێکی نەبینیەوە دابنیشێ (شوێنی دانیشتن نەمابوو لەسەر لێواری بیرەکە)، بۆیە چووە بەرانبەریان لە لێواری بیرەکەو قاچەکانی دەرخستن و شۆڕی کردەوە بۆ نێو بیرەکە، (جا من لە دڵی خۆم) گوتم: خۆزگە دەخوازم برایەکم بهاتبایە، داوا دەکەم لە خوا بیهێنێ (تا ئەویش موژدەی بەهەشت وەرگرێ و بچێتە لایان، یاخود بۆ ئەوەی بێتە شوێنی من و منیش بچم بۆ لایان)، بەڵام (کەس) نەهات هەتا هەڵسان، جا ئیبنو موسەییب دەڵێ: ئەوەم بە گۆڕ (قەبر) ـەکانیان تەفسیر کرد، (پێغەمبەر ﷺو ئەبوبەکرو عومەر) لێرەدا کۆبوونەوەو عوسمانیش بە تەنها بوو و لەوان جیابوویەوە (گۆڕەکەی).

٩٨٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ فِي طَائِفَةِ النَّهَارِ لَا يُكَلِّمُنِي وَلَا أُكَلِّمُهُ، حَتَّى أَتَى سُوقَ بَنِي قَيْنُقَاعٍ، فَجَلَسَ بِفِنَاءِ بَيْتِ فَاطِمَةَ، فَقَالَ«أَثَمَّ لُكَعٌ؟ أَثَمَّ لُكَعٌ؟»[1]؟ فَحَبَسَتْهُ شَيْئًا، فَظَنَنْتُ أَنَّهَا تُلْبِسُهُ سِخَابًا[2] أَوْ تُغَسِّلُهُ، فَجَاءَ يَشْتَدُّ حَتَّى عَانَقَهُ وَقَبَّلَهُ، وَقَالَ: «اللَّهُمَّ أَحْبِبْهُ، وَأَحْبِبْ مَنْ يُحِبُّهُ»»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ دەرچوو نە قسەی لەگەڵ کردم، نە منیش قسەم لەگەڵ کرد، هەتا هاتە بازاڕی بەنو قەینوقاع، جا لە حەوشەی ماڵی فاطیمەدا دانیشت و فەرمووی: کوا بچکۆڵەکە (واتە: کوا حەسەن)؟ جا دایکی (واتە: فاتیمە) تۆزێك حەسەنی دواخست (لە ناردنی بۆ لای پێغەمبەر)، پێم وابێ ملوانکەیەکی بۆنخۆشی

---

(١) لكع: بمعنى الصغير، قيل لغة تميم والمراد الحسن.

(٢) سخابا: أي قلادة من طيب ليس فيها ذهب، ولا فضة، أو خرز أو قرنفل.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٨٠٧): [البخاري: ٣٤- كتاب البيوع، ٤٩- باب: ما ذكر في الأسواق. مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ٥٧].

دەكردە مل، یان دەیشۆری، پاشان حەسەن هات لە كاتێكدا ڕایدەكرد و بە پەڕۆشەوە دەهات، (پێغەمبەر ﷺ) گرتی و باوەشی پێدا كردو ماچی كردو، فەرمووی: خوایە خۆشت بوێ و، ئەو كەسەشت خۆش بوێ كە حەسەنی خۆش دەوێ.

## دەربارەی: ئەگەر یەكێك كەسێكی بۆ هەڵسا لە مەجلیسەكەی، لە شوێنی دانانیشێ

٩٩٠- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُقِيمَ الرَّجُلَ مِنَ الْمَجْلِسِ ثُمَّ يَجْلِسُ فِيهِ. وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ إِذَا قَامَ لَهُ رَجُلٌ مِنْ مَجْلِسِهِ لَمْ يَجْلِسْ فِيهِ»[١].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەهی كردوە كەسێك كەسێكی دیكە لە مەجلیس هەڵسێنێ، پاشان خۆی لە شوێنی ئەو دابنیشێ. جا ئیبنو عومەر ئەگەر پیاوێك بۆی هەڵسابا لە مەجلیسێكدا، ئەو لە شوێنەكەی دانەدەنیشت.

## دەربارەی: ئەمانەت و سپاردە

٩٩١- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): خَدَمْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَوْماً، حَتَّى إِذَا رَأَيْتُ أَنِّي قَدْ فَرَغْتُ مِنْ خِدْمَتِهِ قُلْتُ: يَقِيلُ النَّبِيُّ ﷺ، فَخَرَجْتُ مِنْ عِنْدِهِ، فَإِذَا غِلْمَةٌ يَلْعَبُونَ، فَقُمْتُ أَنْظُرُ إِلَيْهِمْ إِلَى لَعِبِهِمْ، فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ فَانْتَهَى إِلَيْهِمْ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، ثُمَّ دَعَانِي فَبَعَثَنِي إِلَى حَاجَةٍ، فَكَانَ فِي فَيْءٍ حَتَّى أَتَيْتُهُ. وَأَبْطَأْتُ عَلَى أُمِّي، فَقَالَتْ: مَا حَبَسَكَ؟ قُلْتُ: بَعَثَنِي النَّبِيُّ ﷺ إِلَى حَاجَةٍ، قَالَتْ: مَا هِيَ؟ قُلْتُ: إِنَّهُ سِرٌّ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَتِ: احْفَظْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ سِرَّهُ، فَمَا حَدَّثْتُ بِتِلْكَ الْحَاجَةِ أَحَداً مِنَ الْخَلْقِ، فَلَوْ كُنْتُ مُحَدِّثاً حَدَّثْتُكَ بِهَا»[٢].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ڕۆژێك خزمەتی پێغەمبەرم ﷺ كرد، تا پێم وابوو ئیشەكانم تەواو بووە لە خزمەتكردنی، (جا لە دڵی خۆمدا) گوتم: پێغەمبەر ﷺ سەرخەوێك دەشكێنێ (كاری بە من نیە)، بۆیە چوومە دەرەوە لەلای ڕۆیشتم، جا بینیم كۆمەڵە منداڵێك یاریان دەكرد، منیش وەستام و تەماشای یاریەكەیانم دەكرد، جا پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لایان و سڵاوی لێكردن، پاشان منی بانگكردو ناردمی بۆ پێویستیەك، جا لە ژێر سێبەرێك چاوەڕوانی كردم هەتا گەڕامەوە، ئیدی (لەبەر كارەكەی پێغەمبەری خوا) دواكەوتم لە گەڕانەوەم بۆ لای دایكم، (دایكم) گوتی: چ شتێك

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٢٨): [البخاري: ٧٩- كتاب الاستئذان، ٣٢- باب: إذا قيل لكم تفسحوا في المجالس. مسلم: ٣٩- كتاب السلام، ح ٢٩].

(٢) صحيح الإسناد.

دوای خستی؟ گوتم: پێغەمبەر ﷺ ناردمی بۆ پێویستیەك، گوتی: پێویستیەکە چی بوو؟ گوتم: ئەوە نهێنی پێغەمبەرە ﷺ، گوتی: نهێنی پێغەمبەری خوا ﷺ بپارێزە، جا ئەو کارو پێویستیەم بۆ هیچ کەسێك لە دروستکراوەکان باس نەکردوە، ئەگەر باسم بکردایە بۆ تۆم باس دەکرد (ئەو قسەیەی بەو کەسە گوتوە کە ئەو فەرموودەی بۆ گێڕاوەتەوە).

## دەربارەی: ئەگەر کەسێك ڕووی وەسووڕاندو ئاوڕی دایەوە، با هەموو لاشەی بسووڕێنێ

۹۹۲- «عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيِّبِ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَصِفُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ: كَانَ رَبْعَةً، وَهُوَ إِلَى الطُّولِ أَقْرَبُ، شَدِيدُ الْبَيَاضِ، أَسْوَدُ شَعْرِ اللِّحْيَةِ، حَسَنُ الثَّغْرِ، أَهْدَبُ أَشْفَارِ الْعَيْنَيْنِ، بَعِيدُ مَا بَيْنَ الْمَنْكِبَيْنِ، مُفَاضُ الْجَبِينِ، يَطَأُ بِقَدَمِهِ جَمِيعاً، لَيْسَ لَهَا أَخْمُصُ، يُقْبِلُ جَمِيعاً، وَيُدْبِرُ جَمِيعاً، لَمْ أَرَ مِثْلَهُ قَبْلُ وَلَا بَعْدُ»[١].

واتە: سەعیدی کوڕی موسەییب دەگێڕێتەوە، کە گوێی لە ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) بووە کە وەسفی پێغەمبەری ﷺ دەکرد (دەیگوت): چوار شانە بوو، بەلای درێژیەوە بوو، زۆر سپی بوو، ڕیشی ڕەش بوو، دەم و لێوی زۆر جوان و ڕێك بوو، برژانگی درێژ بوو، ناوشانی لە یەکدی دوور بوو، نێوچاوان و تەوێڵی پان بوو، بە تەواوی قاچی لەسەر زەوی دادەنا (واتە: تەنها نوکی پێی لەسەر زەوی دانەدەنا لەکاتی هەنگاوناندا، بەڵکو گشت بەشەکانی پێی بە جارێك لەسەر زەوی دادەنا لە کاتی هەنگاونان)، قەوسایی بنی پێی نەبوو (واتە: ژێر پێیەکانی تەخت بووەو ئەو بەشەی نەبووە کە قەوسەو بەرزەو بەر زەوی ناکەوێت)، کاتێ ڕوی دەکردە لایێك بە گشت جەستەی ڕووی تێدەکرد (واتە: تەنها بە سەر ئاوڕی نەدەدایەوە)، وە کاتێ پشتی لەلایەك دەکرد بە گشت جەستەی پشتی تێدەکرد، هیچ چاوێك پێشتر وەك ئەوی نەبینیوەو دواتریش وەك ئەو نابینێ.

## دەربارەی: ئەو کەسەی گوێ بۆ قسەی خەڵکی دەگرێ و ئەوانیش پێیان ناخۆشە

۹۹۳- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ صَوَّرَ صُورَةً كُلِّفَ أَنْ يَنْفُخَ فِيهِ وَعُذِّبَ، وَلَنْ يَنْفُخَ فِيهِ. وَمَنْ تَحَلَّمَ كُلِّفَ أَنْ يَعْقِدَ بَيْنَ شَعِيرَتَيْنِ وَعُذِّبَ، وَلَنْ يَعْقِدَ بَيْنَهُمَا، وَمَنِ اسْتَمَعَ إِلَى حَدِيثِ قَوْمٍ يَفِرُّونَ مِنْهُ، صُبَّ فِي أُذُنَيْهِ الْآنُكُ»»[٢].

---

(١) حسن لغيره: «مختصر الشمائل» (رقم ١- ٤)، «السلسلة الصحيحة» (٢٠٩٥) .

(٢) صحيح: «غاية المرام» (١٢٠و ١٦٠): [البخاري: ٩١- كتاب التعبير، ٤٥- باب: من كذب في حلمه].

واته: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك وێنەیەك بکێشێ داوای لێ دەکرێ (لە ڕۆژی قیامەت) ڕووحی بەبەردا بکات، ئەویش هەرگیز ناتوانێ ڕووحی بەبەردا بکات و سزا دەدرێ، وە هەر کەسێك خەونێك بە درۆ بگێڕێتەوە، ئەوە داوای لێ دەکرێ دوو دەنکە جۆ پێکەوە گرێ بدات، هەرگیزیش ناتوانێ گرێیان بدات بە یەکەوە، وە هەر کەسێك گوێ لە قسەو باسی کۆمەڵێك بگرێ ئەوانیش لێی ڕابکەن (پێیان)، ئەوە قورقوشمی بە گوێدا دەکرێ.

٩٩٤- «عَنْ أَبِي الْعَالِيَةِ قَالَ: جَلَسْتُ مَعَ ابْنِ عَبَّاسٍ عَلَى سَرِيرٍ»[١].

واته: ئەبو عالیە دەڵێ: لەگەڵ ئیبنو عەبباسدا لەسەر یەك جێگە دانیشتم.

٩٩٥- «عَنْ أَبِي جَمْرَةَ قَالَ: كُنْتُ أَقْعُدُ مَعَ ابْنِ عَبَّاسٍ، فَكَانَ يُقْعِدُنِي عَلَى سَرِيرِهِ، فَقَالَ لِي: أَقِمْ عِنْدِي حَتَّى أَجْعَلَ لَكَ سَهْمَاً مِنْ مَالِي، فَأَقَمْتُ عِنْدَهُ شَهْرَيْنِ»[٢].

واته: ئەبو جەمرە دەڵێ: من لەگەڵ ئیبنو عەبباسدا دادەنیشتم، لەسەر جێگاکەی خۆی دایدەنیشاندم، جا (جارێکیان) پێی گوتم: لە لام بمێنەوە، هەتا بەشێك لە ماڵەکەمت پێبدەم، منیش دوو مانگ لە لای مامەوە.

٩٩٦- «عَنْ خَالِدِ بْنِ دِينَارٍ أَبُو خَلْدَةَ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ، وَهُوَ مَعَ الْحَكَمِ أَمِيرٌ بِالْبَصْرَةِ عَلَى السَّرِيرِ، يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا كَانَ الْحَرُّ أَبْرَدَ بِالصَّلَاةِ، وَإِذَا كَانَ الْبَرْدُ بَكَّرَ بِالصَّلَاةِ»[٣].

واته: خالدی کوڕی دینار ئەبو خەلدە، دەڵێ: گوێم لە ئەنەسی کوڕی مالیك بوو لەکاتێکدا لەگەڵ حەکەمی کاربەدەستی بەصرەدا بوو لەسەر تەختەکەی، (ئەنەس) دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر (کەش و هەوا زۆر) گەرم بووایە نوێژی (نیوەڕۆی) دوادەخست هەتا نوێژەکەی دەخستە کاتێکی فێنك، وە ئەگەر ساردو فێنك بووایە ئەوە (لە کاتی خۆی) دەستی بە نوێژەکە دەکرد.

٩٩٧- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ عَلَى سَرِيرٍ مَرْمُولٍ بِشَرِيطٍ، تَحْتَ رَأْسِهِ وِسَادَةٌ مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهَا لِيفٌ، مَا بَيْنَ جِلْدِهِ وَبَيْنَ السَّرِيرِ ثَوْبٌ، فَدَخَلَ عَلَيْهِ عُمَرُ فَبَكَى، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا يُبْكِيكَ يَا عُمَرُ؟» قَالَ: أَمَا وَاللَّهِ مَا أَبْكِي يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَّا أَكُونَ أَعْلَمُ أَنَّكَ أَكْرَمُ عَلَى اللَّهِ مِنْ كِسْرَى وَقَيْصَرَ، فَهُمَا يَعِيثَانِ فِيمَا يَعِيثَانِ فِيهِ مِنَ الدُّنْيَا، وَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ بِالْمَكَانِ الَّذِي أَرَى، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَمَا تَرْضَى يَا عُمَرُ أَنْ تَكُونَ لَهُمُ الدُّنْيَا وَلَنَا الْآخِرَةُ؟» قُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «فَإِنَّهُ كَذَلِكَ»»[٤].

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح: (المشكاة» (رقم ١٦/ التحقيق الثاني).

(٣) حسن الإسناد: والمرفوع منه صحيح: «المشكاة» (٦٢٠).

(٤) حسن صحيح: «تخريج الترغيب» (١١٤/٤): أخرجه أحمد: ١٢٤٤٠، والبخاري:٤٦٢٩، ومسلم: ١٤٧٩.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: چوومە ژوورەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ لەسەر سەرینێك بوو کە چنرابوو بە قەیتان، سەرینێکی لە ژێر سەریدا بوو لە پێستە دروست کرابوو ناوەکەی ڕیشاڵی خورمای تێدا بوو، لە نێوان پێستی (جەستەی موبارەکی)و جێگەکەیدا پۆشاکێك هەبوو، عومەر هاتە ژوورەوەو بۆ لای، دەستی بە گریان کرد، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: چی دەتگریەنێ ئەی عومەر؟ گوتی: سوێند بە خوا ناگریم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، لەبەر ئەوەی نەزانم تۆ بەڕێزتری لای خوا لە کیسراو قەیصەر، ئەوان خراپەو زێدەڕۆیی زۆر دەکەن لە دونیاداو خۆشترین جێگایان هەیە، تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو شوێنەی کە دەیبینم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا ڕازی نیت ئەی عومەر دونیا بۆ ئەوان بێ، وە دوارۆژیش بۆ ئێمە؟ گوتم: با، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: کەواتە بەو شێوەیە.

٩٩٨- «عَنْ أَبِي رِفَاعَةَ الْعَدَوِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: انْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يَخْطُبُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، رَجُلٌ غَرِيبٌ جَاءَ يَسْأَلُ عَنْ دِينِهِ، لَا يَدْرِي مَا دِينُهُ، فَأَقْبَلَ إِلَيَّ وَتَرَكَ خُطْبَتَهُ، فَأَتَى بِكُرْسِيٍّ خِلْتُ قَوَائِمَهُ حَدِيداً» قَالَ حُمَيْدٌ: أُرَاهُ خَشَباً أَسْوَدَ حَسِبَهُ حَدِيداً» فَقَعَدَ عَلَيْهِ، فَجَعَلَ يُعَلِّمُنِي مِمَّا عَلَّمَهُ اللَّهُ، ثُمَّ أَتَمَّ خُطْبَتَهُ، آخِرَهَا»[1].

واتە: ئەبو ڕیفاعەی عەدەوی (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: (هاتم و) گەیشتمە لای پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا وتاری دەخوێندەوە، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، پیاوێکی نەناسراو هاتووە (کە مەبەستی خۆیەتی) پرسیار لە بارەی ئاینەکەیەوە دەکات نازانێ ئایینەکەی چیە؟ (پێغەمبەر ﷺ) ڕووی تێکردم و وازی لە وتارەکەی هێناو کورسیەکی هێنا، پێم وابێ پێچکەکانی ئاسن بوو «حومەید گوتوویەتی: پێم وایە دارێکی ڕەش بوو وەکو ئاسن دەردەکەوت» جا لەسەری دانیشت و دەستی پێکرد فێری دەکرم لەوەی خوا فێری کردبوو، پاشان وتارەکەی تەواو کرد تا کۆتایی.

٩٩٩- «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ مُسْلِمٍ قَالَ: رَأَيْتُ أَنَساً (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، جَالِساً عَلَى سَرِيرٍ وَاضِعاً إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الأُخْرَى»[2].

واتە: عیمرانی کوڕی موسلیم دەڵێ: بینیم ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دانیشتبوو لەسەر پێخەفێك قاچێکی خستبووە سەر قاچەکەی دیکەی (واتە: قاچەکانی بە ڕاست و ڕێکی درێژ کردبوو، ئنجا خستبوونیە سەر یەکدی).

---

(١) صحيح: [مسلم: ٧- الجمعة، باب حَدِيثِ التَّعْلِيمِ فِي الْخُطْبَةِ، ح ٦٠] .

(٢) حسن الإسناد.

## دەربارەی: کەسێك خەڵکانێکی بینی بە چپە قسەیان دەکرد نابێ بچێتە نێویانەوە

١٠٠٠- «عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ يَقُولُ: مَرَرْتُ عَلَى ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، وَمَعَهُ رَجُلٌ يَتَحَدَّثُ، فَقُمْتُ إِلَيْهِمَا، فَلَطَمَ فِي صَدْرِي فَقَالَ: إِذَا وَجَدْتَ اثْنَيْنِ يَتَحَدَّثَانِ فَلَا تَقُمْ مَعَهُمَا، وَلَا تَجْلِسْ مَعَهُمَا، حَتَّى تَسْتَأْذِنَهُمَا، فَقُلْتُ: أَصْلَحَكَ اللَّهُ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنَّمَا رَجَوْتُ أَنْ أَسْمَعَ مِنْكُمَا خَيْرًا»[١].

واتە: سەعیدی مەقبوری دەڵێ: تێپەڕیم بەلای ئیبنو عومەردا (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە کاتێکدا پیاوێکی لەگەڵدا بوو قسەی دەکرد، منیش هەڵسام چووم بۆ لایان، (ئیبنو عومەریش بە دەستی) لە سنگمی داو، گوتی: ئەگەر بینیت دوو کەس قسەیان پێکەوە دەکرد لەگەڵیاندا مەوەستەو مەچۆ بۆ لایان و، لەلایان دامەنیشە هەتا مۆڵەتیان لێ وەردەگری، منیش گوتم: خوا چاکت بکات ئەی باوکی عەبدوڕڕەحمان، تەنها ئومێدی ئەوەم دەکرد قسەیەکی خێرتان لێ ببیستم (بۆیە هاتم و نەمزانی قسەی تایبەتیتان هەیە).

١٠٠١- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: مَنْ تَسَمَّعَ إِلَى حَدِيثِ قَوْمٍ وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ، صُبَّ فِي أُذُنِهِ الْآنُكُ، وَمَنْ تَحَلَّمَ بِحُلْمٍ كُلِّفَ أَنْ يَعْقِدَ شَعِيرَةً»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: هەر کەسێك گوێ بۆ قسەو باسی خەڵکانێك بگرێ و، ئەوانیش پێیان ناخۆش بێ، (ئەوە لە دواڕۆژدا) قوڕقوشمی بە گوێدا دەکرێ، وە هەر کەسێك خەونێك بە درۆ دروست بکات و بیگێڕێتەوە (لە کاتێکدا نەیبینیوە)، ئەوە داوای لێ دەکرێ، دەنکە جۆیەك گرێ بدات.

## دەربارەی: (ئەگەر سێ کەس بوون) با دووان بە چپە قسان نەکەن

١٠٠٢- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا كَانُوا ثَلَاثَةً، فَلَا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ الثَّالِثِ»»[٣].

واتە: عەبدوڵلا (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر سێ کەس بوون، با دووانیان چپە نەکەن و بە ئەسپایی قسە لە نێوانیاندا نەکەن بەبێ کەسی سێیەم و بەژداریپێکردنی.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح الإسناد موقوفاً، وقد صح مرفوعاً.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٤٠٢): [البخاري: ٧٩- كتاب الاستئذان، ٤٥- باب: لا يتناجي اثنان دون الثالث. مسلم: ٣٩- كتاب السلام، ح ٣٦].

## دەربارەی: ئەگەر چوار کەس بوون (ئایا دروستە دووانیان بە چپە قسان بکەن؟)

١٠٠٣- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا كُنْتُمْ ثَلَاثَةً فَلَا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ الثَّالِثِ، فَإِنَّهُ يُحْزِنُهُ ذَلِكَ»»[١].

واتە: عەبدوڵلا (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئێوە سێ کەس بوون با دووانتان بە چپە قسە نەکات بەبێ سێیەم، چونکە ئەو (کار)ە دڵتەنگی دەکات.

١٠٠٤- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مِثْلَهُ، قُلْنَا: فَإِنْ كَانُوا أَرْبَعَةً؟ قَالَ: «لَا يَضُرُّهُ»»[٢].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) هەمان فەرموودەی پێشوو لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، (بەڵام ئەوەندەی زیاترە دەڵێ) گوتمان: ئەی ئەگەر چوار کەس بوون؟ فەرمووی: زیانی پێ ناگەیەنێ (چونکە ئەگەر چوار کەس بن، دووانیشیان بە چپە قسە بکەن، دووانیان دەمێننەوەو گومانی خراپ نابەن، چونکە یەکسانن و خۆیان بە غەریب نازانن).

١٠٠٥- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ الْآخَرِ حَتَّى يَخْتَلِطُوا بِالنَّاسِ، مِنْ أَجْلِ أَنَّ ذَلِكَ يُحْزِنُهُ»»[٣].

واتە: عەبدوڵلا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ئەگەر سێ کەس بوون) با دووانتان بەبێ کەسی سێیەم بە چپە قسە نەکەن، هەتا تێکەڵاوی خەڵك دەبن، چونکە ئەو (کار)ە دڵتەنگی دەکات.

١٠٠٦- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: إِذَا كَانُوا أَرْبَعَةً فَلَا بَأْسَ»[٤].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: ئەگەر چوار کەس بوون، ئەوە ئاساییە (دوو کەسیان بە چپە قسە بکەن).

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» أيضاً: [البخاري: ٧٩- كتاب الاستئذان، ٤٧- باب: إذا كانوا أكثر من ثلاثة. مسلم: ٣٩- كتاب السلام، ح ٣٨].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٤٠٢): [ليس في شيء من الكتب الستة].

(٣) صحيح: [مسلم: ٣٩- كتاب السلام، ح ٣٧] .

(٤) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٤٠٢).

## دەربارەی: (فەرموودەی) با لەبەر خۆر نەوەستێ!

١٠٠٧- «عن قَيْسٍ عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ جَاءَ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ، فَقَامَ فِي الشَّمْسِ، فَأَمَرَهُ فَتَحَوَّلَ إِلَى الظِّلِّ»[١].

واتە: قەیس لە باوكیەوە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە (باسی خۆی كردوە)، ئەو هاتوە لەو كاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا، بۆیە لەبەر خۆرەكە وەستا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی پێكرد (لەبەر خۆرەكە لابچێ) ئەویش شوێنی خۆی گۆڕی چوو بۆ بن سێبەرەكە.

## دەربارەی: دانیشتنی (الإِحْتِبَاءِ) لە نێو پۆشاك

١٠٠٨- «عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ لِبْسَتَيْنِ وَبَيْعَتَيْنِ: نَهَى عَنِ الْمُلَامَسَةِ، وَالْمُنَابَذَةِ فِي الْبَيْعِ {الْمُلَامَسَةُ: أَنْ يَمَسَّ الرَّجُلُ ثَوْبَهُ}، {وَالْمُنَابَذَةُ: يَنْبُذُ الْآخَرُ إِلَيْهِ ثَوْبَهُ} وَيَكُونُ ذَلِكَ بَيْعَهُمْ عَنْ غَيْرِ نَظَرٍ. وَاللِّبْسَتَيْنِ اشْتِمَالُ الصَّمَّاءِ، {وَالصَّمَّاءُ: أَنْ يَجْعَلَ طَرَفَ ثَوْبِهِ عَلَى إِحْدَى عَاتِقَيْهِ، فَيَبْدُو أَحَدُ شِقَّيْهِ لَيْسَ عَلَيْهِ شَيْءٌ} وَاللِّبْسَةُ الْأُخْرَى احْتِبَاؤُهُ بِثَوْبِهِ وَهُوَ جَالِسٌ، لَيْسَ عَلَى فَرْجِهِ مِنْهُ شَيْءٌ»[٢].

واتە: ئەبو سەعیدی خودری (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی كردوە لە پۆشینی دوو جۆر پۆشاك و دوو كڕین و فرۆشتن: وە نەهی كردوە لە (مُلَامَسَة) و (مُنَابَذَة)، {(الْمُلَامَسَة) بریتیە لەوەی دوو كەس كڕین و فرۆشتن بكەن بە دوو پۆشاك لە تاریكیدا هەر یەكەیان دەست بدات لە پۆشاكی ئەوی دیكە}. وە {(الْمُنَابَذَة): بریتیە لەوەی پیاوێك پۆشاكەكەی فڕێ بدات (هەڵبدات) بۆ پیاوێكی دیكە، پیاوەكەی دیكەش پۆشاكەكەی خۆی بۆ ئەو هەڵبدات، جا هەردووكیان لەسەر ئەوە مامەڵە دەكەن بەبێ ئەوەی تەماشای بكەن. وە دوو جۆرە پۆشاك پۆشینەكەش بریتین لە: پۆشینی پۆشاكێك كە داخراو بێ، كەسەكە نەتوانێ دەستی لێیەوە بێنێتە دەرەوە، وە پۆشینەكەی دیكەش بریتیە لە دانیشتن بە شێوەی (الِاحْتِبَاءِ) بە پۆشاكەكەیەوە لە كاتێكدا هیچ لەسەر داوێنی نەبێ.

(واتە: ئەگەر وەك شێوازی سەر چیچكان دابنیشێ، بەڵام نێركەكانی لەسەر زەوی دابنێ و دیوی ژوورەوەی ئانیشكەكانی بخاتە ئەمبەرو ئەوبەری چۆكەكانی، وە دوو دەستەكاتی بەیەكەوە

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨٣٣): [ليس في شيء من الكتب الستة] أخرجه أبو داود في كتاب الأدب.

(٢) صحيح: [البخاري: ٧٧- كتاب اللباس، ٢٠- باب: اشتمال الصماء. مسلم: ٢١- كتاب البيوع، ح ٣].

بگرێ و، چۆکەکانی بەرەو سەرەوە بن، لەگەڵ ئەوەشدا پۆشاکی ژێرەوەی لەبەر نەبێ، ئیدی بەو شێوەیە عەورەتی دەردەکەوێ.

## دەربارەی: ئەو کەسەی سەرینێکی بۆ دادەنرێ

١٠٠٩- «عَنْ أَبِي قِلَابَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو الْمَلِيحِ، قَالَ: دَخَلْتُ مَعَ أَبِيكَ زَيْدٍ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، فَحَدَّثَنَا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ ذُكِرَ لَهُ صَوْمِي، فَدَخَلَ عَلَيَّ، فَأَلْقَيْتُ لَهُ وِسَادَةً مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهَا لِيفٌ، فَجَلَسَ عَلَى الْأَرْضِ، وَصَارَتِ الْوِسَادَةُ بَيْنِي وَبَيْنَهُ، فَقَالَ لِي: «أَمَا يَكْفِيكَ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ؟» قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «خَمْسَاً»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «سَبْعَاً»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «تِسْعَاً»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «إِحْدَى عَشْرَةَ»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «لَا صَوْمَ فَوْقَ صَوْمِ دَاوُدَ شَطْرَ الدَّهْرِ، صِيَامُ يَوْمٍ وَإِفْطَارُ يَوْمٍ»»[1].

واتە: ئەبو قیلابە دەڵێ: ئەبو مەلیح هەواڵی پێدام گوتی: لەگەڵ زەیدی باوکت ڕۆیشتم بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ (خوا لێیان ڕازی بێ)، جا بۆی باس کردین کە پێغەمبەر ﷺ باسی ڕۆژووی منی بۆ کرابوو، هاتە ژوورەوە بۆ لام، منیش سەرینێکم پێدا لە پێستە دروست کرابوو نێوەکەی ڕیشاڵی خورمای تێدا بوو، لەسەر زەویەکە دانیشت و، سەرینەکەش کەوتە نێوان من و ئەو، پێی فەرمووم: ئایا لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژت بەس نیە؟ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (واتە: ویستم بڵێم کەمە)، فەرمووی: پێنج، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: حەوت، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: نۆ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: یازدە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: لە سەرووی ڕۆژوی داوود (علیه السلام) ڕۆژوو نیە، (واتە: ڕۆژوو نیە بە پاداشتتر بێ لە ڕۆژووی پێغەمبەر داوود)، کە نیو ساڵە، ڕۆژێك بە ڕۆژووبوون و ڕۆژێك بە ڕۆژوو نەبوونە.

١٠١٠- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَرَّ عَلَى أَبِيهِ، فَأَلْقَى لَهُ قَطِيفَةً فَجَلَسَ عَلَيْهَا»[2].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بوسر (خوا لێی ڕازی بێ)، (گوتوویەتی:) پێغەمبەر ﷺ تێپەڕی بە لای باوکمدا، (باوکیشم) پارچە لۆکەیەکی بۆ ڕاخست و لەسەری دانیشت.

---

(١) صحيح: «التعليق الرغيب» (٢/٨٨): [البخاري: ٣٠- كتاب الصيام، ٥٩- باب: صيام داود عليه السلام. مسلم: ١٣- كتاب الصيام، ح ١٩١].

(٢) صحيح الإسناد: [ليس في شيء من الكتب الستة].

## دەربارەی: دانیشتنی سەر چیچکان (الْقُرْفُصَاءِ)

دانیشتی سەر چیچکان: بریتیە لەو دانیشتنەی کە مرۆڤ تەنها هەردوو قاچی لەسەر زەوی دادەنێ.

١٠١١- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنُ حَسَّانَ الْعَنْبَرِيُّ قَالَ: حَدَّثَتْنِي جَدَّتَايَ صَفِيَّةُ بِنْتُ عُلَيْبَةَ، وَدُحَيْبَةُ بِنْتُ عُلَيْبَةَ «وَكَانَتَا رَبِيبَتَيْ قَيْلَةَ» أَنَّهُمَا أَخْبَرَتْهُمَا قَيْلَةُ قَالَتْ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ قَاعِدًا الْقُرْفُصَاءَ، فَلَمَّا رَأَيْتُ النَّبِيَّ الْمُتَخَشِّعَ فِي الْجِلْسَةِ أُرْعِدْتُ مِنَ الْفَرَقِ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی حەسانی عەنبەری دەڵێ: هەردوو داپیرەم بۆیان باسکردم، (کە بریتین لە) صەفیەی کچی عولەیبەو دوحیەی کچی عولەیبە «ئەو دووانە خزمەتکاری قەیلەی (کچی مەخرەمە بوون)» جا قەیلە بۆی گێڕاونەتەوەو گوتوویەتی: بینیم پێغەمبەر ﷺ دانیشتبوو بە شێوەی (الْقُرْفُصَاءَ) واتە: لەسەر چیچکان، جا کاتێ بینیم دانیشتنەکەی شوێنەواری ترسی خوای پێوە دیارە (بەوەی ئاوا لەسەر زەوی دانیشتووە بەبێ فیزو خۆ بە گەورە زانین، لە کاتێکدا کیسراو قەیسەرو نەجاشی لەسەر کورسی مەزن دادەنیشن)، لەرزم لێهات لە ترسی خوا بە هۆی ئەو شێوە دانیشتنەی پێغەمبەرەوە ﷺ.

## دەربارەی: دانیشتنی چوار مشقی (دانیشتنی مەجلیسی)

١٠١٢- «عَنْ حَنْظَلَةَ بْنِ حِذْيَمٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَرَأَيْتُهُ جَالِسًا مُتَرَبِّعًا»[٢].

واتە: حەنظەڵەی کوڕی حیذیەم (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەرو ﷺ بینیم چواری دانیشتووە (واتە: وەك دانیشتنی مەجلیسی خۆمان لە کوردەواریی دانیشتووە، بە شێوەیەك قاچی ڕاستی خستبووە ژێر ڕانی چەپی، قاچی چەپیشی خستبووە ژێر ڕانی ڕاستی).

١٠١٣- «عَنْ عِمْرَانَ بْنِ مُسْلِمٍ قَالَ: رَأَيْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَجْلِسُ هَكَذَا مُتَرَبِّعًا، وَيَضَعُ إِحْدَى قَدَمَيْهِ عَلَى الْأُخْرَى»[٣].

واتە: عیمڕانی کوڕی موسلیم دەڵێ: ئەنەسی کوڕی مالیکم بینی (خوا لێی ڕازی بێ) بەم شێوەیە چواری دادەنیشت (وەك دانیشتنی مەجلیسی لای خۆمان)، قاچێکی دەخستە سەر قاچەکەی دیکەی (لە ژێرەوە).

---

(١) حسن: «مختصر الشمائل» (٥٣/ التحقيق الثاني)، «المشكاة» (٤٧١٤/ التحقيق الثاني): [ليس في شيء من الكتب الستة] أخرجه أبو داود والترمذي.

(٢) صحيح لغيره: «السلسلة الصحيحة» (٢٩٥٤): [ليس في شيء من الكتب الستة].

(٣) صحيح الإسناد.

## دەربارەی: دانیشتنی (الإحْتِبَاءِ)

**(الإحْتِبَاءِ: بریتیە لەو دانیشتنەی مرۆڤ سمتی بە تەواوی جێگیر دەكات لەسەر زەوی و قاچی دەنوشتێنێتەوە ئەژنۆی لە یەكتر نزیك دەكاتەوە هەردوو ئانیشكی دەخاتە سەر ئەژنۆكانی).**

١٠١٤- «عَنْ سُلَيْمِ بْنِ جَابِرٍ الْهُجَيْمِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ مُحْتَبٍ فِي بُرْدَةٍ، وَإِنَّ هُدَّابَهَا لَعَلَى قَدَمَيْهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَوْصِنِي، قَالَ: «عَلَيْكَ بِاتِّقَاءِ اللَّهِ، وَلَا تَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئًا، وَلَوْ أَنْ تُفْرِغَ لِلْمُسْتَسْقِي مِنْ دَلْوِكَ فِي إِنَائِهِ، أَوْ تُكَلِّمَ أَخَاكَ وَوَجْهُكَ مُنْبَسِطٌ، وَإِيَّاكَ وَإِسْبَالَ الْإِزَارِ، فَإِنَّهَا مِنَ الْمَخِيلَةِ، وَلَا يُحِبُّهَا اللَّهُ، وَإِنِ امْرُؤٌ عَيَّرَكَ بِشَيْءٍ يَعْلَمُهُ مِنْكَ فَلَا تُعَيِّرْهُ بِشَيْءٍ تَعْلَمُهُ مِنْهُ، دَعْهُ يَكُونُ وَبَالُهُ عَلَيْهِ، وَأَجْرُهُ لَكَ، وَلَا تَسُبَّنَّ شَيْئًا»، قَالَ: فَمَا سَبَبْتُ بَعْدُ دَابَّةً وَلَا إِنْسَانًا»[1].

**واتە: سولەیمی كوڕی جابری هوجەیمی (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هاتم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ داپۆشراوبوو بە شێوەی (إحْتِبَاءِ) عەبایەكی بە خۆیدا دابوو، تەنیشتەكانی لەسەر هەردوو پێی بوو، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریم بكە، فەرمووی: دەست بگرە بە پارێزكاریی، وە هیچ شتێك لە چاكەكاری بە كەم مەزانە، ئەگەرچی لە دێمكەو دۆلكەكەی خۆت ئاو دەربێنی و بیخەیتە نێو جام و گڵاسی ئەو كەسەی داوات لێدەكات، یان قسە لەگەڵ براكەتدا بكەی لە كاتێكدا ڕووت خۆش و گەشە، وە خۆت بپارێزە لە دەلینگ و دامەن درێژ كردن، چونكە بەڕاستی ئەوە لە لووت بەرزیەوەیەو، خوا (ئەم سیفەتەی) خۆشناوێ، وە ئەگەر كەسێك تانەی لێدای و عەیبداری كردی بەشتێك كە دەربارەی تۆ دەیزانی، ئەوە تۆ عەیبداری مەكەوە بە شتێك كە دەیزانی دەربارەی ئەو، وازی لێ بێنە، با گوناهی خۆی لەسەر خۆی بێ، وە با پاداشتەكەشی بۆ تۆ بێ، وە جوێن بە هیچ شتێك مەدە، (جا سولەیم) گوتوویەتی: دوای ئەوە جوێنم نەداوە نە بە ئاژەڵێك، نە بە مرۆڤێك.**

١٠١٥- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: مَا رَأَيْتُ حَسَنًا قَطُّ إِلَّا فَاضَتْ عَيْنَايَ دُمُوعًا، وَذَلِكَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ يَوْمًا، فَوَجَدَنِي فِي الْمَسْجِدِ، فَأَخَذَ بِيَدِي، فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ، فَمَا كَلَّمَنِي حَتَّى جِئْنَا سُوقَ بَنِي قَيْنُقَاعٍ، فَطَافَ فِيهِ وَنَظَرَ، ثُمَّ انْصَرَفَ وَأَنَا مَعَهُ، حَتَّى جِئْنَا الْمَسْجِدَ، فَجَلَسَ فَاحْتَبَى ثُمَّ قَالَ: «أَيْنَ لَكَاعٌ؟ ادْعُ لِي لَكَاعًا»، فَجَاءَ حَسَنٌ يَشْتَدُّ فَوَقَعَ فِي حِجْرِهِ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي لِحْيَتِهِ، ثُمَّ جَعَلَ النَّبِيُّ ﷺ يَفْتَحُ فَاهُ فَيُدْخِلُ فَاهُ فِي فِيهِ، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أُحِبُّهُ، فَأَحْبِبْهُ، وَأَحِبَّ مَنْ يُحِبُّهُ»»[2].

---

(١) صحيح لغيره: «السلسلة الصحيحة» (٨٢٧): [أبو داود: ٣١- كتاب اللباس، ٢٠- باب: في الهدب، ح ٤٠٧٤. أبو داود: ٣١- كتاب اللباس، ٢٤- باب: ماجاء في إسبال الإزار، ح ٤٠٨٤].

(٢) حسن: [البخاري: ٣٤- كتاب البيوع، ٤٩- باب: ما ذكر في الأسواق. مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح ٥٧].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هەرگیز حەسەنم نەبینیوە حەتمەن فرمێسك بە چاوانمدا هاتۆتە خوارەوە، ئەوەش لەبەر ئەوەیە: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ هاتە دەر لە ماڵ، منی لە مزگەوت بینی، جا دەستی گرتم و، منیش لەگەڵیدا ڕۆیشتم، قسەی لەگەڵ نەکردم هەتا گەیشتینە بازاڕی بەنو قەینوقاع، جا بە نێو بازاڕەکەدا سووڕایەوەو تەماشای کرد، پاشان ڕۆیشت منیش هەر لەگەڵی بووم، هەتا گەیشتینەوە مزگەوت، ئنجا دانیشت بە شێوەی (إحْتِبَاء)و عەباکەی لە خۆیدا پێچایەوە، دوایی فەرمووی: لوکاع لە کوێیە؟ لوکاعم بۆ بانگ بکە؟ پاشان حەسەن هات لە کاتێکدا ڕایدەکردو بە پەرۆشەوە دەهات و کەوتە باوشیەوە، پاشان دەستی خستە نێو ڕیشیەوە، دوایی پێغەمبەر ﷺ دەمی کردەوەو دەمی خستە نێو دەمی، پاشان فەرمووی: خوایە من خۆشم دەوێ تۆش خۆشت بوێ.

(اللّٰه أكبر! لەم خۆشەویستیە، خۆزگەم بە خۆت حەسەن گیان، ئەی خوا لێت ڕازی بێ، وەك لێت ڕازی بوو، هاوارو واوەیلا بۆ کەسانێك تۆیان خۆش نەوێ!).

## دەربارەی: ئەو کەسەی لەسەر چۆك دادەنیشێ

١٠١٦- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى بِهِمُ الظُّهْرَ، فَلَمَّا سَلَّمَ قَامَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَذَكَرَ السَّاعَةَ، وَذَكَرَ أَنَّ فِيهَا أُمُوراً عِظَاماً، ثُمَّ قَالَ: «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَسْأَلَ عَنْ شَيْءٍ فَلْيَسْأَلْ عَنْهُ، فَوَاللَّهِ لَا تَسْأَلُونِي عَنْ شَيْءٍ إِلَّا أَخْبَرْتُكُمْ مَا دُمْتُ فِي مَقَامِي هَذَا»، قَالَ أَنَسٌ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): فَأَكْثَرَ النَّاسُ الْبُكَاءَ حِينَ سَمِعُوا ذَلِكَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَأَكْثَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَقُولَ: «سَلُوا»، فَبَرَكَ عُمَرُ عَلَى رُكْبَتَيْهِ وَقَالَ: رَضِينَا بِاللَّهِ رَبّاً، وَبِالْإِسْلَامِ دِيناً، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ قَالَ ذَلِكَ عُمَرُ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَوْلَى، أَمَا وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَقَدْ عُرِضَتْ عَلَيَّ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ فِي عُرْضِ هَذَا الْحَائِطِ، وَأَنَا أُصَلِّي، فَلَمْ أَرَ كَالْيَوْمِ فِي الْخَيْرِ وَالشَّرِّ»»(١).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردن، کاتێ سەلامی دایەوە، لەسەر مینبەر وەستاو باسی ڕۆژی دوایی و دونیا تێکچوونی کرد، وە باسی ئەوەی کرد ڕۆژی دوایی ڕووداوی گەورەی تێدان، پاشان فەرمووی: هەر کەس حەز دەکات پرسیار بکات لە بارەی شتێکەوە با پرسیاری لەبارەوە بکات، سوێند بە خوا پرسیارم لێ بکەن لە بارەی هەر شتێك وەڵامتان دەدەمەوە، هەتا لەم جێگایەدا بم، ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: خەڵکەکە زۆر گریان کاتێ ئەو قسەیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیست، پێغەمبەریش ﷺ زۆر فەرمووی: پرسیارم لێ بکەن، جا عومەر چووە سەر چۆك و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازی بووین بەوەی خوا پەروەردگارمان بێ، ئیسلام ئاینمان بێ، وە

---

(١) حسن صحيح: [البخاري: ٩٦- كتاب الاعتصام، ٣- باب: ما يكره من كثرة السؤال. مسلم: ٤٣- كتاب الفضائل، ح ١٣٦].

موحەممەدیش پێغەمبەرمان بێ، ئیدی کاتێ عومەر ئەوەی گوت، پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگ بوو، پاشان فەرمووی: سوێند بەو زاتەی گیانی منی بە دەستە، کەمێك پێش ئێستا بەهەشت و ئاگرم بۆ نمایشکرا (خرایە پێش چاوم) لەلای ئەم دیوارە، لەو کاتەی کە نوێژم دەکرد، وە هیچ ڕۆژێکم نەبینیوە وەك ئەمڕۆ خێرو شەڕی تێدابێ (چونکە نازو نیعمەتی خەڵکی بەهەشت و، ئازارو حەسرەتی خەڵکی دۆزەخم بینی لە یەك کاتدا).

## دەربارەی: ڕاکشان لەسەر پشت

١٠١٧- «عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ، قَالَ: رَأَيْتُهُ قُلْتُ لِابْنِ عُيَيْنَةَ: النَّبِيُّ ﷺ؟ قَالَ: نَعَمْ مُسْتَلْقِيًا، وَاضِعًا إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الْأُخْرَى»[١].

واتە: عەببادی کوڕی تەمیم دەگێڕێتەوە لە مامیەوە کە گوتوویەتی: بینیم، جا منیش بە ئیبنو عویەینەم گوت: ئایا پێغەمبەری ﷺ بینیوە؟ گوتی: بەڵێ، ڕاکشابوو لەسەر پشت، قاچێکیشی خستبووە سەر قاچەکەی دیکە (بە ڕاست و ڕێکی، واتە: ئەژنۆی بەرز نەکردبوویەوە، بەڵکو قاچەکانی بە شێوەیەکی ڕاست درێژ کردبوون و خستبوونیە سەر یەکتری).

## دەربارەی: پاڵکەوتن لەسەر ڕووخسار

١٠١٨- «عَنِ ابْنِ طِخْفَةَ الْغِفَارِيِّ، أَنَّ أَبَاهُ أَخْبَرَهُ، أَنَّهُ كَانَ مِنْ أَصْحَابِ الصُّفَّةِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، قَالَ: بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ فِي الْمَسْجِدِ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ، أَتَانِي آتٍ وَأَنَا نَائِمٌ عَلَى بَطْنِي، فَحَرَّكَنِي بِرِجْلِهِ فَقَالَ: «قُمْ، هَذِهِ ضَجْعَةٌ يُبْغِضُهَا اللَّهُ»، فَرَفَعْتُ رَأْسِي، فَإِذَا النَّبِيُّ ﷺ قَائِمٌ عَلَى رَأْسِي»[٢].

واتە: ئەبو طیخفەی غیفاری دەگێڕێتەوە باوکی هەواڵی پێداوە، کە یەکێك بووە لە هاوەڵانی صوففە[٣]، (خوا لێیان ڕازی بێ)، گوتوویەتی: لە کاتێکدا خەوتبووم لە نێو مزگەوتدا، لە کۆتایی شەو، کەسێك هات بۆ لام لەو کاتەدا لەسەر سك خەوتبووم، بە قاچەکانی جوڵاندمی و فەرمووی: هەستە، ئەمە ڕاکشانێکە خوا ڕقی لێیەتی، منیش سەرم بەرز کردەوە، بینیم ئەوە پێغەمبەرە ﷺ لەسەر سەرم وەستاوە.

---

(١) صحيح: [البخاري: ٨- كتاب الصلاة، ٨٥- باب: الاستلقاء في المسجد ومد الرجل. مسلم: كتاب ٣٧- كتاب اللباس، ح ٧٥].

(٢) صحيح: «تخريج المشكاة» (٤٧١٩): [أبو داود: ٤- كتاب الأدب، ٩٥- باب: في الرجل ينبطح على بطنه، ح ٥٠٤٠. إبن ماجه ٣٣- كتاب الأدب، ٢٧- باب: النهي عن الاضطجاع على الوجه، ح ٣٧٢٣].

(٣) واتە: لەو کەسانە بوو کە هەژار و بێ ماڵ و مناڵ بوون و لە حوجرەی مزگەوت دەمانەوە.

## دەربارەی: مسوڵمان بە دەستی ڕاستی نەبێ شت وەرناگرێ و شت نادات

١٠١٩- «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا يَأْكُلْ أَحَدُكُمْ بِشِمَالِهِ، وَلَا يَشْرَبَنَّ بِشِمَالِهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِشِمَالِهِ، وَيَشْرَبُ بِشِمَالِهِ»، قَالَ: كَانَ نَافِعٌ يَزِيدُ فِيهَا: وَلَا يَأْخُذْ بِهَا، وَلَا يُعْطِي بِهَا»[1].

واتە: سالم دەگێڕێتەوە لە باوکیەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: با هیچ یەکێك لە ئێوە بە دەستی چەپی نەخوات، وە بە دەستی چەپیشی نەخواتەوە، چونکە شەیتان بە دەستی چەپی دەخواو بە دەستی چەپیشی دەخواتەوە، دەڵێ: نافیع ئەوەشی زیاد کرد تێیدا (واتە: ڕیوایەتی لای ئەو ئەوەندەشی تێدایە کە پێغەمبەر فەرموویەتی): هەروەها با بە دەستی چەپیشی (شت) وەرنەگرێ و، نەیبەخشێ.

## دەربارەی: شەیتان دارو شت دەهێنێ فڕێی دەداتە شوێنی خەوتن

١٠٢٠- «عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: إِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْتِي إِلَى فِرَاشِ أَحَدِكُمْ بَعْدَمَا يَفْرِشُهُ أَهْلُهُ وَيُهَيِّئُونَهُ، فَيُلْقِي عَلَيْهِ الْعُودَ أَوِ الْحَجَرَ أَوِ الشَّيْءَ، لِيُغْضِبَهُ عَلَى أَهْلِهِ، فَإِذَا وَجَدَ ذَلِكَ فَلَا يَغْضَبْ عَلَى أَهْلِهِ، قَالَ: لِأَنَّهُ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ»[2].

واتە: ئەبو ئومامە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: شەیتان دێ بۆ شوێنی خەوتنی هەر یەکێکتان، دوای ئەوەی خێزانەکەی ڕایدەخات و ئامادەی دەکەن، جا (شەیتان) دارێك، یان بەردێك، یان شتێك (وەك دەرزی، یان دەمبوز یان هەر شتێك کە مرۆڤ پێی قەڵس و تووڕە بێ، وە ئازاری پێ بگات لە کاتی پاڵکەوتن) فڕێ دەداتە سەری، بۆ ئەوەی تووڕەی بکات لە خێزان و منداڵەکانی (کە جێگەیان بۆ ڕاخستووە)، جا ئەگەر ئەوەی بینی با تووڕە نەبێ لە خێزان و منداڵەکانی، گوتویەتی: چونکە ئەوە لە کاری شەیتانە (ڕەنگە شەیتان یەکێکیانی فریو دابێ ئەم کارە بکات).

## دەربارەی: ئەو کەسەی لە سەربانێك دەخەوێ کە چوارچێوەی نیە

١٠٢١- «عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَلِيٍّ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ بَاتَ عَلَى ظَهْرِ بَيْتٍ لَيْسَ عَلَيْهِ حِجَابٌ، فَقَدْ بَرِئَتْ مِنْهُ الذِّمَّةُ»»[3].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٢٣٦): [مسلم: ٣٦- كتاب الأشربة، ح ١٠٥، ١٠٦].

(٢) حسن الإسناد: وقد صح مرفوعاً عن أبي هريرة نحوه، مضى.

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٨٢٨): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٩٦- باب: في النوم على سطح غير محجر، ح ٥٠٤١].

واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەلی لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێك لە سەربانێك بخەوێ کە ستارەو چوارچێوەی نەبێ، ئەوە پارێزگاری لەسەر نەماوە (واتە: بە دەستی خۆی، خۆی تووشی بەڵاو لەکەداری دەکات، چونکە ڕەنگە لە کاتی خەوتن و بێئاگایی دا، یەکێکیان بکەوێتە خوارەوە، یان خەڵك شوێنی شەرمەو عەیبەیان ببینێ و لەکەداربن)[1].

١٠٢٢- «عَنْ زُهَيْرٍ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: مَنْ بَاتَ عَلَى إِنْجَارٍ[2] فَوَقَعَ مِنْهُ فَمَاتَ، بَرِئَتْ مِنْهُ الذِّمَّةُ، وَمَنْ رَكِبَ الْبَحْرَ حِينَ يَرْتَجُّ «يَعْنِي: يَغْتَلِمُ» فَهَلَكَ بَرِئَتْ مِنْهُ الذِّمَّةُ»[3].

واتە: زوهەیر دەگێڕێتەوە لە پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ (خوا لە هەموویان ڕازی بێ)، لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرموویەتی: هەر کەسێك لە سەربانێك بخەوێ کە ستارەو چوارچێوەی نەبێ، ئنجا کەوتە خوارەوەو مرد، ئەوە پارێزگاری لەسەر لادراوە، وە هەر کەسێك بچێتە نێو دەریایەك لە کاتێ شەپۆل دەداو (کەسە) مرد، ئەوە پاریزگاری لەسەر لادراوە (بە دەستی خۆی خۆی بە هیلاك بردووە).

## دەربارەی: ئایا ئاساییە مرۆڤ قاچی شۆڕ بکاتەوە بۆ نێو بیر لە کاتی دانیشت؟

١٠٢٣- «عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ فِي حَائِطٍ عَلَى قُفِّ الْبِئْرِ، مُدَلِّياً رِجْلَيْهِ فِي الْبِئْرِ»[4].

واتە: ئەبو موسای ئەشعەری (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە لێواری بیرێك دانیشتبوو قاچی شۆڕ کردبووەوە بۆ نێو بیرەکە.

## دەربارەی: ئەوەی مرۆڤی مسوڵمان دەیڵێ کاتێ بەیانی دەکاتەوە

١٠٢٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَصْبَحَ قَالَ: «اللَّهُمَّ بِكَ أَصْبَحْنَا، وَبِكَ أَمْسَيْنَا، وَبِكَ نَحْيَا، وَبِكَ نَمُوتُ، وَإِلَيْكَ النُّشُورُ» وَإِذَا أَمْسَى قَالَ: «اللَّهُمَّ بِكَ أَمْسَيْنَا، وَبِكَ أَصْبَحْنَا، وَبِكَ نَحْيَا، وَبِكَ نَمُوتُ، وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ»»[5].

---

(١) ئەگەر کەوتە خوارەوە خوێنی بە فیڕۆ چووە.

(٢) إنجار لغة غجار وهو السطح الذي ليس حوله ما يرد الساقط.

(٣) حسن: «تخريج الترغيب» (٤/ ٥٩)، «السلسلة الصحيحة» (٨٢٨).

(٤) حسن صحيح: [البخاري: قطعة من حديث طويل في البخاري: ٦٢- كتاب فضائل أصحاب النبي ﷺ ٥- باب قول النبي ﷺ لو كنت متخذاً خليلاً، مسلم: ٤٤- كتاب فضائل الصحابة، ح٢٩] .

(٥) صحيح: «تخريج الكلم» رقم (٢٠)، «السلسلة الصحيحة» (٢٦٢): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ١٠١- باب: ما يقول إذا

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ بەیانی دەکردەوە دەیفەرموو: خوایە (بە نیعمەتی پاراستن و پشتیوانی) تۆوە بەیانیمان کردەوە، وە بە (بە نیعمەتی پاراستن و پشتیوانی) تۆوە ئێوارەمان کردەوە، وە (بە نیعمەتی پاراستن و پشتیوانی) تۆوە دەژین، وە (بە فەرمانی) تۆوە دەمرین، وە زیندوو بوونەوەشمان هەر بۆ لای تۆیە، وە کاتێ ئێوارەی بکردبایەوە دەیفەرموو: خوایە (بە نیعمەتی پاراستن و پشتیوانی) تۆوە ئێوارەمان کردەوە، وە (بە نیعمەتی پاراستن و پشتیوانی) تۆوە بەیانیمان کردەوە، وە بە (بە نیعمەتی پاراستن و پشتیوانی) تۆوە دەژین و دەمرین و سەرەنجامیشمان هەر بۆ لای تۆیە.

١٠٢٥- «عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، يَقُولُ: لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَعُ هَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ إِذَا أَصْبَحَ وَإِذَا أَمْسَى: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ. اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ. اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي دِينِي وَدُنْيَايَ، وَأَهْلِي وَمَالِي. اللَّهُمَّ اسْتُرْ عَوْرَاتِي، وَآمِنْ رَوْعَاتِي. اللَّهُمَّ احْفَظْنِي مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ وَمِنْ خَلْفِي، وَعَنْ يَمِينِي وَعَنْ شِمَالِي، وَمِنْ فَوْقِي، وَأَعُوذُ بِعَظَمَتِكَ مِنْ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي»»[1].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ وازی لەم ڕستەو وشانە نەدەهێنا، کاتێ بەیانی و ئێوارەی دەکردەوە (ڕستەو وشەکانی بریتی بوون لەوەی دەیفەرموو): خوایە من داوای سەلامەتی و پارێزراویت لێدەکەم (لە نەخۆشی و بەڵای) دنیاو دوارۆژدا، خوایە من داوای سەلامەتی و پارێزراویت لێدەکەم لە دینداری و دونیاداری کەس و کارو ماڵ و سەروەتمدا، خوایە کەم و کوڕی و عەیبەکانم داپۆشەو ترسەکانم مەهێڵەو ئەمینم بکە، خوایە بمپارێزە لە پێشمەوەو لە دوامەوەو لە ڕاستم و لە چەپم و لە سەرەوەم، وە پەنا دەگرم بە گەورەیی تۆ لەوەی لە ژێرەوە سزا بدرێم (واتە لەوەی لە زەوی ڕوبچوێنرێم و خەسف بکرێم).

## دەربارەی: ئەوەی مرۆڤی مسوڵمان دەیڵێ کاتێ ئێوارە دەکاتەوە

١٠٢٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ يَقُولُ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا): يَا رَسُولَ اللَّهِ، عَلِّمْنِي شَيْئاً أَقُولُهُ إِذَا أَصْبَحْتُ وَأَمْسَيْتُ، قَالَ: قُلِ: اللَّهُمَّ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي، وَمِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ، قُلْهُ إِذَا أَصْبَحْتَ وَإِذَا أَمْسَيْتَ، وَإِذَا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ»[2].

---

أصبح، ح ٥٠٦٨، الترمذي: ٤٥- كتاب الدعوات، ١٢- باب: ما جاء في الدعاء إذا أصبح وإذا أمسي].

(١) صحيح: «تخريج الكلم» (٢٧): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ح ١٠١، باب: ما يقول إذا أصبح، ح ٥٠٧٤. إبن ماجه: ٣٤- كتاب الدعاء ٤١- باب: ما يدعو الرجل إذا أصبح وإذا أمسي].

(٢) صحيح: «الكلم الطيب» (٢٢)، «السلسلة الصحيحة» (٢٧٥٣): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ١٠١- باب: ما يقول إذا أصبح، ح ٥٠٦٧. الترمذي: ٤٥- كتاب الدعوات، ١٤- باب: منه].

واتە: ئەبو هورەیرە دەڵێ: ئەبو بەكر (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، شتێكم فێر بكە كاتێ بەیانی و ئێوارەم كردەوە بیڵێم؟ فەرمووی: بڵێ: خوایە ئەی زانای پەنهان و ئاشكرا، ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوی، ئەی پەروەردگارو خاوەنی هەموو شتێك، شایەتی دەدەم كە هیچ پەرستراوێك بە هەق نیە جگە لە تۆ، پەنات پێ دەگرم لە خراپەی نەفسم و لە شەڕو خراپەی شەیتان و هاوبەشدانانی. ئەوە بڵێ كاتێ بەیانیت كردەوەو كاتێ ئێوارەت كردەوە، هەروەها كاتێك چوویتە سەر جێگە (بۆ خەوتن).

١٠٢٧- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، مِثْلَهُ. وَقَالَ: «رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ»، وَقَالَ: «شَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ»»[1].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) هەروەك ئەو فەرموودەی پێشووی گێڕاوەتەوە، گوتی: پەروەردگارو خاوەنی هەموو شتێك، وە گوتی: لە شەڕو خراپەی شەیتان و هاوبەشدانانی.

١٠٢٨- «عَنْ أَبِي رَاشِدٍ الْحُبْرَانِيِّ: أَتَيْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، فَقُلْتُ لَهُ: حَدِّثْنَا بِمَا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَلْقَى إِلَيَّ صَحِيفَةً فَقَالَ: هَذَا مَا كَتَبَ لِيَ النَّبِيُّ ﷺ فَنَظَرْتُ فِيهَا، فَإِذَا فِيهَا: إِنَّ أَبَا بَكْرٍ الصِّدِّيقَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، عَلِّمْنِي مَا أَقُولُ إِذَا أَصْبَحْتُ وَإِذَا أَمْسَيْتُ، فَقَالَ: يَا أَبَا بَكْرٍ، قُلِ: اللَّهُمَّ فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي، وَشَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ، وَأَنْ أَقْتَرِفَ عَلَى نَفْسِي سُوءاً، أَوْ أَجُرَّهُ إِلَى مُسْلِمٍ»[2].

واتە: ئەبو ڕاشدی حوبرانی دەڵێ: هاتم بۆ لای عەبدوڵڵای كوڕی عەمرِ (خوا لێیان ڕازی بێ)و پێمگوت: ئەوەی لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیستووتە بۆمان باس بكە، جا پەڕاوێكی بۆ كردمەوە گوتی: ئەمە ئەوەیە كە پێغەمبەر ﷺ بۆی نووسیوم (واتە: ئەو فەرموویەتی، منیش نووسیتم بە فەرمانی ئەو) جا منیش تەماشام كرد، تێیدا هاتبوو (نووسرابوو): ئەبو بەكری صیددیق پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ كرد گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شتێكم فێر بكە كاتێ بەیانی و ئێوارەم كردەوە بیڵێم: (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەبو بكر بڵێ: خوایە ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوی، ئەی زانای پەنهان و ئاشكرا، ئەی پەروەردگارو خاوەنی هەموو شتێك، پەنات پێ دەگرم لە خراپەی نەفسم و، لە شەڕو خراپەی شەیتان و هاوبەشدانانی، وە (پەنات پێ دەگرم) لەوەی كە بە نەفسم خراپەیەك ئەنجام بدەم، یان خراپەیەك تووشی مسوڵمانێك بكەم.

---

(١) صحيح: وانظر ما قبله.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٧٦٣)، «الكلم الطيب» (٩): [الترمذي: ٤٥- كتاب الدعوات، ٩٤- باب: حدثنا الحسن بن عرفه].

## دەربارەی: مرۆڤی مسوڵمان چی دەڵێ کاتێ دەچێتە شوێنی خەوتنی

١٠٢٩- «عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَامَ قَالَ: «بِاسْمِكَ اللَّهُمَّ أَمُوتُ وَأَحْيَا»، وَإِذَا اسْتَيْقَظَ مِنْ مَنَامِهِ قَالَ: «الْحَمْدُ لِلهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا، وَإِلَيْهِ النُّشُورُ»»[١].

واتە: حوزەیفە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بیویستایە بخەوێ دەیفەرموو: خوایە بە ناوی تۆوە دەمرم و زیندوو دەبمەوە (لێرەدا مەبەست بە مردن نووستنە، چونکە نووستن برای مردنە)[٢]، وە کاتێ لە خەو هەڵسابا دەیفەرموو: ستایش بۆ ئەو خوایەی زیندووی کردینەوە دوای ئەوەی مراندمانی، زیندووبوونەوەو گەڕانەوەشمان هەر بۆ لای ئەوە.

١٠٣٠- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ قَالَ: «الْحَمْدُ لِلهِ الَّذِي أَطْعَمَنَا وَسَقَانَا، وَكَفَانَا وَآوَانَا، كَمْ مَنْ لَا كَافٍ لَهُ وَلَا مُؤْوِيَ»»[٣].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ بچووبا سەر جێگاکەی دەیفەرموو: ستایش بۆ ئەو خوایەی کە خواردن و خواردنەوەی پێ بەخشین، وە هەر خۆی بوو بە ڕزگارکارمان و شوێن و جێگەی بۆ دابین کردین، زۆر کەس هەن کە ڕزگارکارو شوێندابینکاری نیە.

١٠٣١- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يَنَامُ حَتَّى يَقْرَأَ: ﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ۝٢﴾ السجدة، و: ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ ۝١﴾ الملك»[٤].

واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەخەوت هەتا سوورەتی سەجدەو مولکی دەخوێند: ﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ۝٢﴾ السجدة، وە: ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ ۝١﴾ الملك».

١٠٣٢- «قَالَ أَبُو الزُّبَيْرِ: فَهُمَا يَفْضُلَانِ كُلَّ سُورَةٍ فِي الْقُرْآنِ بِسَبْعِينَ حَسَنَةً، وَمَنْ قَرَأَهُمَا كُتِبَ لَهُ بِهِمَا سَبْعُونَ حَسَنَةً، وَرُفِعَ بِهِمَا لَهُ سَبْعُونَ دَرَجَةً، وَحُطَّ بِهِمَا عَنْهُ سَبْعُونَ خَطِيئَةً»[٥].

واتە: ئەبو زوبەیر دەڵێ: ئەم دووانە فەزڵیان بەسەر هەموو سوورەتەکانی قوڕئانەوە هەیە بە حەفتا چاکە، وە هەر کەسێك بیانخوێنێ حەفتا چاکەی بۆ دەنوسرێ، وە حەفتا پلەش بەرز دەکرێتەوە، وە بە هۆیانەوە حەفتا هەڵەو گوناهی لەسەر لادەبرێ.

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٧٥٤)، «مختصر الشمائل» (٢١٧): [البخاري: ٩٧- كتاب التوحيد ١٣- باب: السؤال بأسماء الله تعالي والاستعاذة بها].

(٢) «النَّوْمُ أَخُو الْمَوْتِ، وَلَا يَمُوتُ أَهْلُ الجَنَّةِ» رَوَاهُ الدَيْلَمِي: ٧٠٩٦، وَصَحَّحهُ الألباني، واتە: نووستن برای مردنە، وە خەڵکی بەهەشتیش نامرن.

(٣) صحيح: «مختصر الشمائل» (٢١٩): [مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء والتوبة والاستغفار ح ٦٤].

(٤) صحيح لغيره: «السلسلة الصحيحة» (٥٨٥): [الترمذي: ٤٢- كتاب ثواب القرآن، ٩- باب: ما جاء في فضل سورة الملك].

(٥) صحيح من قول أبي الزبير، فهو مقطوع موقوف.

١٠٣٣- «عَنْ أَبِي الْأَحْوَصِ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): النَّوْمُ عِنْدَ الذِّكْرِ مِنَ الشَّيْطَانِ، إِنْ شِئْتُمْ فَجَرِّبُوا، إِذَا أَخَذَ أَحَدُكُمْ مَضْجَعَهُ وَأَرَادَ أَنْ يَنَامَ فَلْيَذْكُرِ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ»[1].

**واتە: ئەبو ئەحوەص دەڵێ: عەبدوڵلا (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: خەوتن لە کاتی زیکرو یاد کردنی خوا لە شەیتانەوەیە، ئەگەر ویستتان تاقی بکەنەوە، ئەگەر یەکێك لە ئێوە چووە سەر جێگاکەی و ویستی بخەوێ، با یادی خوا بکات.**

١٠٣٤- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ لَا يَنَامُ حَتَّى يَقْرَأَ: تَبَارَكَ وَ:﴿ الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ۝٢ ﴾السَّجْدَةِ»[2].

**واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەدەخەوت هەتا سوورەتی تەبارەکە (واتە: ملك)و، سەجدەی دەخوێند: ﴿ الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ۝٢ ﴾.**

١٠٣٥- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا أَوَى أَحَدُكُمْ إِلَى فِرَاشِهِ، فَلْيَحِلَّ دَاخِلَةَ إِزَارِهِ، فَلْيَنْفُضْ بِهَا فِرَاشَهُ، فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي مَا خَلَّفَ فِي فِرَاشِهِ، وَلْيَضْطَجِعْ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ، وَلْيَقُلْ: بِاسْمِكَ وَضَعْتُ جَنْبِي، فَإِنِ احْتَبَسْتَ نَفْسِي فَارْحَمْهَا، وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ الصَّالِحِينَ «، أَوْ قَالَ: «عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ»»[3].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان چووە سەر جێگاکەی، ئەوە با بە دیوی ژوورەوەی لیچکی پۆشاکەکەی (ئەگەر پۆشاکی درێژی لەبەر بوو، یان بەهەر شتێکی دیکە) جێگاکەی داوەشێنێ، چونکە ئەو نازانێ دوای ئەو چی چۆتە نێو جێگەو پێخەفەکەی، وە با لەسەر لای ڕاستیدا بخەوێ و بڵێ: خوایە بە ناوی تۆوە تەنیشتم داناو ڕاکشام، ئەگەر ڕووحم نەگەڕایەوە بەزەیت پێی بێتەوە، وە ئەگەر گەڕاندیشتەوە بیپارێزە بەوەی ڕووحی پیاو چاکانت پێ پاراستووە.**

١٠٣٦- «عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ نَامَ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ وَجَّهْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَأَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَهْبَةً وَرَغْبَةً إِلَيْكَ، لَا مَنْجَا وَلَا مَلْجَأَ مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ، قَالَ: «فَمَنْ قَالَهُنَّ فِي لَيْلَةٍ ثُمَّ مَاتَ مَاتَ عَلَى الْفِطْرَةِ»»[4].

**واتە: بەرائی کوڕی عازیب (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ بچووبا سەر جێگاکەی لەسەر لای ڕاستی پاڵدەکەوت و پاشان دەیفەرموو: خوایە ڕووم کردە تۆو، نەفسم گوێڕایەڵ و**

---

(١) صحيح موقوف.

(٢) صحيح لغيره.

(٣) صحيح.

(٤) صحيح.

تەسلیمی تۆ کردو، پشتم بە تۆ بەست، بە لێترسان و ئومێدی پاداشتەوە، هیچ ڕزگاربوون و پەناگەیەك نیە مەگەر بۆ لای تۆ بێ (هەر تۆ جێگەی ڕزگاری و پەناگەی)، بڕوام هێناوە بە کتێبەکەت کە داتبەزاندووە، وە بەو پێغەمبەرەت کە ناردووتە و ڕەوانەت کردوە. (ڕاوی دەڵێ: دوایی) فەرمووی: هەر کەسێك بیڵێ و لەو شەوەدا بمرێ، ئەوە لەسەر ئیسلامەتی و سیفەتی چاك مردوە.

١٠٣٧- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ: «اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ، فَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى، مُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ وَالْقُرْآنِ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ كُلِّ ذِي شَرٍّ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ، أَنْتَ الْأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ، اقْضِ عَنِّي الدَّيْنَ، وَأَغْنِنِي مِنَ الْفَقْرِ»»[1].

واتە: ئەبو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێ بچووبا سەر جێگاکەی دەیفەرموو: ئەی خوایە! پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و زەوی و، ئەی پەروەردگاری هەموو شتێك، ئەی تەقێنەرو ڕوێنەری تۆوی دانەوێڵە و ناوکی بەروبومەکان و دابەزێنەری تەوڕات و ئینجیل و قوڕئان، پەنا دەگرم بە تۆ لە خراپەی هەموو شتێك کە ناوچەوان و چارەنووسی بە دەستی تۆیە، تۆ یەکەمینی و کەس لە پێشی تۆوە نیەو، تۆ دوایەمینی و کەس لە دوای تۆوە نیەو تۆ بە دەسەڵات و زاڵی و هیچ شتێك لە سەرووی تۆوە نیە، وە تۆ پەنهانی و بە ئاگای بە شاراوەکان و شتێك لە تۆ پەنهان نیە، قەرزاریم لەسەر هەڵگرەو بێنیازو دەوڵەمەندم بکە لە هەژاری.

## گەورەیی دوعا کردن لە کاتی خەوتندا

١٠٣٨- «عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ نَامَ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ، وَوَجَّهْتُ بِوَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لَا مَنْجَا وَلَا مَلْجَأَ مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ، آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَالَهُنَّ ثُمَّ مَاتَ تَحْتَ لَيْلَتِهِ مَاتَ عَلَى الْفِطْرَةِ»»[2].

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ بچووبا سەر جێگاکەی لەسەر لای ڕاستی پاڵدەکەوت، پاشان دەیفەموو: خوایە نەفسم گوێڕایەڵ و تەسلیمی

---

(١) صحيح: «تخريج الكلم» (٤٠): [مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء والتوبة والاستغفار، ح ٦١].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٨٨٩): [البخاري: ٤- كتاب الوضوء، ٧٥- باب: فضل من بات على وضوء. مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء والتوبة والاستغفار، ح ٥٦، ٥٧، ٥٨].

تۆ کردو، ڕووم کردە تۆو، کاروباری خۆم دایە دەستی تۆو، پشتم بە تۆ بەست، بە چاوبڕینە پاداشت و ترس لە تۆ، هیچ ڕزگاربوون و قەڵاو پەناگەیەك نیە لە پاراستن لە تۆ، مەگەر هەر بۆ لای خۆت نێ، بڕوام هێناوە بە کتێبەکەت کە داتبەزاندووە، وە بەو پێغەمبەرەت کە ناردووتەو ڕەوانەت کردوە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك ئەمانە بڵێ و لەو شەوەدا بـمرێ لەسەر ئیسلامەتی و سیفەتی چاك دەمرێ.

## دەربارەی: (مسوڵمان) دەست دەخاتە ژێر ڕوومەتی (لە کاتی خەوتندا)

١٠٣٩- «عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَامَ وَضَعَ يَدَهُ تَحْتَ خَدِّهِ الْأَيْمَنِ، وَيَقُولُ: «اللَّهُمَّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبَادَكَ»»[١].

واتە: بەڕاء (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بیویستایە بخەوێ دەستی دەخستە ژێر ڕوومەتی ڕاستی و دەیفەرموو: خوایە بمپارێزە لە سزای خۆت، لەو ڕۆژەی بەندەکانت زیندوو دەکەیتەوە.

١٠٤٠- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: خَلَّتَانِ لَا يُحْصِيهِمَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ إِلَّا دَخَلَ الْجَنَّةَ، وَهُمَا يَسِيرٌ، وَمَنْ يَعْمَلُ بِهِمَا قَلِيلٌ»، قِيلَ: وَمَا هُمَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «يُكَبِّرُ أَحَدُكُمْ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ عَشْرًا، وَيَحْمَدُ عَشْرًا، وَيُسَبِّحُ عَشْرًا، فَذَلِكَ خَمْسُونَ وَمِائَةٌ عَلَى اللِّسَانِ، وَأَلْفٌ وَخَمْسُمِائَةٍ فِي الْمِيزَانِ»، فَرَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَعُدُّهُنَّ بِيَدِهِ. «وَإِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ سَبَّحَهُ وَحَمِدَهُ وَكَبَّرَهُ، فَتِلْكَ مِائَةٌ عَلَى اللِّسَانِ، وَأَلْفٌ فِي الْمِيزَانِ، فَأَيُّكُمْ يَعْمَلُ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ أَلْفَيْنِ وَخَمْسَمِائَةِ سَيِّئَةٍ؟»، قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ لَا يُحْصِيهِمَا؟ قَالَ: «يَأْتِي أَحَدَكُمُ الشَّيْطَانُ فِي صَلَاتِهِ، فَيُذَكِّرُهُ حَاجَةَ كَذَا وَكَذَا، فَلَا يَذْكُرُهُ»»[٢].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دوو خەسڵەت هەن پیاوی بڕوادار بەردەوام بێ لەسەریان حەتمەن دەچێتە بەهەشت، هەردووکیشیان ئاسانن، (کەچی) کەمن ئەو کەسانەی کاریان پێدەکەن، گوترا: ئەو دووانە چین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ئەوەیە کەسێك لە ئێوە لە دوای هەموو نوێژێك دە جار بڵێ: (اللّٰه أكبر)، وە دە جاریش (الحمد لله) بکات، وە دە جاریش (سُبحان اللّٰه) بکات، ئەوە بە زمان سەدو پەنجا جارە، لە تەرازووشدا هەزارو پێنج سەدە، دەڵێ: جا بینیم پێغەمبەر ﷺ بە پەنجەکانی دەستی

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٢٧٥٤): [الترمذي: ٤٥- كتاب الدعوات، ١٨- باب: منه حدثنا ابن أبي عمر. إبن ماجه: ٣٤- كتاب الدعاء، ١٥- باب: ما يقعو إذا أوى إلى فراشه، ح ٣٨٧٧].

(٢) صحيح: «تخريج الكلم» (١١٢)، «تخريج المشكاة» (٢٤٠٦)، «صحيح أبي داود» (١٣٤٦) [أبو دلود: ٤٠- كتاب الأدب، باب:- التسبيح عند النوم ح ٥٠٦٠. الترمذي: ٤٥- كتاب الدعوات، ٢٥- باب: منه، حدثنا أحمد بن منيع].

دەیژمارد (کاتێ ئەم زیکرانەی دەکرد). وە (شتی دووەمیش ئەوەیە) کاتێ یەکێك لە ئێوە بچێتە سەر جێگای خەوی خۆی و (٣٣) (سُبحان اللّٰه) بکات و، (٣٣) (الحمد لله) بکات و، (٣٤) (اللّٰهُ أكبر) بکات، ئەوە سەد دانەیە بە زمان و، هەزار دانەیە لەسەر تەرازوو[١]، جا کێ لە ئێوە لە ڕۆژو شەوێکدا دوو هەزارو پێنج سەد گوناه دەکات؟ گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا چۆن (مرۆڤ لەسەر کردارێکی ئاوا ئاسان) بەردەوام نابێ؟ فەرمووی: شەیتان دێ بۆ لای یەکێك لە ئێوە لە کاتی نوێژدا، ئەوەو ئەوەی لە پێویستی بیر دەخاتەوە، جا زیکرەکەی بیرناکەوێتەوەو (نایکات، بۆ کارەکەی بە پەلە دەڕوات).

## دەربارەی: ئەگەر (یەکێك) لە جێگای خەوتنی هەڵساو پاشان گەڕایەوە، با جێگاکەی بتەکێنێ

١٠٤١- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِذَا أَوَى أَحَدُكُمْ إِلَى فِرَاشِهِ فَلْيَأْخُذْ دَاخِلَةَ إِزَارِهِ، فَلْيَنْفُضْ بِهَا فِرَاشَهُ وَلْيُسَمِّ اللَّهَ، فَإِنَّهُ لَا يَعْلَمُ مَا خَلَّفَهُ بَعْدَهُ عَلَى فِرَاشِهِ، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَضْطَجِعَ فَلْيَضْطَجِعْ عَلَى شِقِّهِ الْأَيْمَنِ وَلْيَقُلْ: سُبْحَانَكَ رَبِّي، بِكَ وَضَعْتُ جَنْبِي، وَبِكَ أَرْفَعُهُ، إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَاغْفِرْ لَهَا، وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان چووە سەر جێگاکەی، ئەوە با بە دیوی ژوورەوەی لیچکی پۆشاکەکەی (ئەگەر پۆشاکی درێژی لەبەر بوو، یان بە هەر شتێکی دیکە) جێگاکەی هەڵتەکێنێ، چونکە ئەو نازانێ دوای خۆی چ شتێك چۆتە نێو جێگەو پێخەفەکەی، وە کاتێ ویستی پاڵبکەوێ ئەوە با لەسەر لای ڕاستیدا پاڵبکەوێ و بڵێ: پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگارم بە (یارمەتی و کۆمەکی) تۆوە تەنیشتم داناو ڕاکشام، هەر بە (یارمەتی و کۆمەکی) تۆش تەنیشتم بەرز دەکەمەوەو (خەبەرم دەبێتەوە)، ئەگەر ڕووحت گرتمەوەو (مراندمت)و نەگەڕایەوە ئەوە بەزەییت پێی بێتەوەو لێی خۆشبە، وە ئەگەر ڕێگەشت پێداو (زیندووت کردمەوەو خەبەرم بوویەوە) ئەوە بیپارێزە بەوەی ڕووحی بەندە چاکەکانت پێ پاراستووە.

---

(١) (چونکە هەر چاکەیەك بە دەیە)، (کۆی گشتی پاداشتی ئەم زیکرانە لە دوای نوێژەکان و لە کاتی خەوتن دەکاتە دوو هەزار و پێنج سەد).

(٢) صحيح: «الكلم الطيب» (٣٤): [البخاري: ٨٠- كتاب الدعوات، ١٣- باب حدثنا أحمد بن يونس. مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء، ح ٦٤].

## دەربارەی: ( مسوڵمان) کاتێ شەو لە خەو هەڵسا چی دەڵێ؟

١٠٤٢- «عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ كَعْبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كُنْتُ أَبِيتُ عِنْدَ بَابِ النَّبِيِّ ﷺ فَأُعْطِيهِ وَضُوءَهُ، قَالَ: فَأَسْمَعُهُ الْهَوِيَّ مِنَ اللَّيْلِ يَقُولُ: «سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ» وَأَسْمَعُهُ الْهَوِيَّ مِنَ اللَّيْلِ يَقُولُ: «الْحَمْدُ لِلهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ»»[١].

**واتە: ڕەبیعەی کوڕی کەعب (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: من شەوان لەلای دەرگای ماڵی پێغەمبەر ﷺ دەمامەوە ئاوی دەستنوێژیم پێدەدا، گوتی: شەوانە ماوەیەکی زۆر دەمبیست دەیفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدهُ)، وە شەوانە ماوەیەکی زۆر دەمبیست دەیفەرموو: (الْحَمْدُ لِلهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ).**

## دەربارەی: ئەوەی دەخەوێ و چەورایی (خواردن) بە دەستیەوە ماوە

١٠٤٣- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ نَامَ وَبِيَدِهِ غَمَرٌ[٢] قَبْلَ أَنْ يَغْسِلَهُ، فَأَصَابَهُ شَيْءٌ، فَلَا يَلُومَنَّ إِلَّا نَفْسَهُ»»[٣].

**واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بخەوێ پێش ئەوەی دەستەکانی بشۆرێ، لە کاتێکدا چەورایی بەدەستیەوە بێ، ئەگەر شتێکی بەسەر هات، ئەوە با تەنها سەرزەنشتی خۆی بکات (چونکە ڕەنگە خشۆکێك، یان ئاژەڵێك بۆنی بکات و، بچێتە لای و زیانی پێ بگەیەنێ).**

١٠٤٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ بَاتَ وَبِيَدِهِ غَمَرٌ، فَأَصَابَهُ شَيْءٌ، فَلَا يَلُومَنَّ إِلَّا نَفْسَهُ»»[٤].

**واتە: ئەبو هوڕەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بخەوێ و چەورایی بە دەستیەوە بێ، ئەگەر هەر شتێکی تووش بوو، با تەنها سەرزەنشتی خۆی بکات.**

---

(١) صحيح: «صحيح أبي داود» (١١٩٣): [الترمذي: كتاب الدعوات، ٢٧- باب: منه، حدثنا إسحاق بن منصور].

(٢) الغمر بفتح الغيم والميم: هو الدسم.

(٣) صحيح لغيره: «السلسلة الصحيحة» (٢٩٥٦).

(٤) صحيح: «الروض النضير» (٨٢٣)، «المشكاة» (٤٢١٩)، «السلسلة الصحيحة» (٢٩٥٦): [الترمذي: ٢٣- كتاب الأطعمة، ٤٨- باب: في كراهية البيتوتة وفي يده ريح غمر].

## دەربارەی: كوژاندنەوەی چراو ڕووناكی (ئاگرو ئامێری كارەبایی)

١٠٤٥- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَغْلِقُوا الْأَبْوَابَ، وَأَوْكُوا السِّقَاءَ، وَأَكْفِئُوا الْإِنَاءَ، وَخَمِّرُوا الْإِنَاءَ، وَأَطْفِئُوا الْمِصْبَاحَ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَفْتَحُ غَلَقاً، وَلَا يَحُلُّ وِكَاءً، وَلَا يَكْشِفُ إِنَاءً، وَإِنَّ الْفُوَيْسِقَةَ تُضْرِمُ عَلَى النَّاسِ بَيْتَهُمْ»»[1].

واتە: جابری كوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەرگاكان دابخەن و، دەمی كوندەی شلەمەنیەكانتان ببەستن و، سەری مەنجەڵ و قاپەكانتان دابخەن و، ڕووناكیەكان بكوژێننەوە، چونكە شەیتان شتی داخراوو گرێی كوندەو مەشكەكان ناكاتەوەو سەرقاپیش لانادات، بێگومان (زیندەوەرو باڵندە) لە سنوور دەرچووەكان (واتە زیان بەخشەكان، وەك مشك و مارو دووپشك و قەلەڕەش ... هتد) بە هۆی چراكانەوە ئاگر بەردەدەنەماڵەكانی خەڵكی.

١٠٤٦- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: جَاءَتْ فَأْرَةٌ فَأَخَذَتْ تَجُرُّ الْفَتِيلَةَ، فَذَهَبَتِ الْجَارِيَةُ تَزْجُرُهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «دَعِيهَا»، فَجَاءَتْ بِهَا فَأَلْقَتْهَا عَلَى الْخُمْرَةِ الَّتِي كَانَ قَاعِداً عَلَيْهَا، فَاحْتَرَقَ مِنْهَا مِثْلُ مَوْضِعِ دِرْهَمٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا نِمْتُمْ فَأَطْفِئُوا سُرُجَكُمْ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَدُلُّ مِثْلَ هَذِهِ عَلَى مِثْلِ هَذَا فَتَحْرِقُكُمْ»»[2].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: مشكێك هات فتیلەی چراكەی ڕادەكێشا، جا كەنیزەكێك ڕۆیشت دووری بخاتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وازی لێ بێنە (ببینن بزانن چی دەكات، تا شتێكتان فێر بكەم)، جا مشكەكە فتلیەكەی هێناو فڕێیدایە سەر ئەو پارچە پەڕۆكەی لەسەری دانیشتبوو، ئیدی بە ئەندازەی درهەمێك لە پەڕۆكەكە سووتا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر خەوتن چراكانتان بكوژێننەوە، چونكە شەیتان ڕێنمایی هاوشێوەی ئەم مشكە دەكات بۆ كارێكی ئاواو دەتانسووتێنێ.

## دەربارەی: ئاگر لە ماڵدا بەجێ ناهێڵرێ لە كاتی خەوتن

١٠٤٧- «عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا تَتْرُكُوا النَّارَ فِي بُيُوتِكُمْ حِينَ تَنَامُونَ»»[3].

---

(١) صحيح: «الإرواء» (٣٩): [البخاري: ٢٩- كتاب بدء الخلق، ١٦- باب: خمس من الدواب فواسق يقتلن في الحرم. مسلم: ٣٦- كتاب الأشربة، ح ٩٦،٩٧].

(٢) صحيح: «الصحيحة» (١٤٢٦): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ١٦١- باب: في إطفاء النار بالليل، ح ٥٢٤٧].

(٣) صحيح: [البخاري: ٧٩- كتاب الاستئذان، ٤٩- باب: لا تترك النار في البيت عند النوم مسلم: ٣٦- كتاب الأشربة، ح ١٠٠].

**واتە: سالم لە باوكيەوە (خوا لێيان ڕازى بێ) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ كە فەرموويەتى: ئاگر لەماڵەكانتاندا جێ مەهێڵن (چراو ئامێرە كارەباييەكان بكوژێننەوە) كاتێ دەتانەوێ بخەون.**

١٠٤٨- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: قَالَ عُمَرُ: إِنَّ النَّارَ عَدُوٌّ فَاحْذَرُوهَا. فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَتْبَعُ نِيرَانَ أَهْلِهِ وَيُطْفِئُهَا قَبْلَ أَنْ يَبِيتَ»(١).

**واتە: ئيبنو عومەر (خوا لێيان ڕازى بێ) دەڵێ: بەڕاستى ئاگر دوژمنە كەواتە لێى وريابن و خۆتانى لێ بپارێزن، جا ئيبنو عومەر چاودێرى ئاگرى ماڵەكەى دەكردو دەيكوژاندەوە پێش ئەوەى بخەوێت.**

١٠٤٩- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لَا تَتْرُكُوا النَّارَ فِي بُيُوتِكُمْ، فَإِنَّهَا عَدُوٌّ»»(٢).

**واتە: ئيبنو عومەر (خوا لێيان ڕازى بێ) دەگێڕێتەوە، كە گوێى لە پێغەمبەر ﷺ بووە دەيفەرموو: ئاگر جێ مەهێڵن لە ماڵەكانتاندا، چونكە دوژمنە.**

١٠٥٠- «عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: احْتَرَقَ بِالْمَدِينَةِ بَيْتٌ عَلَى أَهْلِهِ مِنَ اللَّيْلِ، فَحُدِّثَ بِذَلِكَ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ: «إِنَّ هَذِهِ النَّارَ عَدُوٌّ لَكُمْ، فَإِذَا نِمْتُمْ فَأَطْفِئُوهَا عَنْكُمْ»»(٣).

**واتە: ئەبو مووسا (خوا لێى ڕازى بێ) دەڵێ: لە مەدينەدا شەوێك خانووێك ئاگرى گرت بەسەر خانەوادەكەيدا، جا ئەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ باسكرا، ئەويش فەرمووى: بەڕاستى ئەم ئاگرە دوژمنى ئێوەيە، جا كاتێ خەوتن لەسەر خۆتان بيكوژێننەوە.**

## دەربارەى: وەرگرتنى بەرەكەت و پيت لە بارانەوە

١٠٥١- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّهُ كَانَ إِذَا مَطَرَتِ السَّمَاءُ يَقُولُ: «يَا جَارِيَةُ، أَخْرِجِي سَرْجِي، أَخْرِجِي ثِيَابِي»، وَيَقُولُ: ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوٓاْ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ق: ٦»(٤).

**واتە: لە ئيبنو عەبباسەوە (خوا لێيان ڕازى بێ) گێڕدراوەتەوە، كاتێ لە ئاسمانەوە باران دەبارى دەيگوت: ئەى كەنيزەكەكەم، زينەكەم بۆ ببە دەرەوە، پۆشاكەكانم بۆ ببە دەرەوە (تا بەرەكەتى بارانى بەر بكەوێ)، وە ئەم ئايەتەى دەخوێندەوە: ﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوٓاْ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾ق: ٦، واتە: (وە لە ئاسمانەوە ئاوێكى پيرۆزو بە پيتمان بۆ دابەزاندووە).**

---

(١) صحيح الإسناد موقوفاً.

(٢) صحيح: [البخاري: ٧٩ كتاب الاستئذان: ٧٩ باب: لَا تَتْرُكُوا النَّارَ فِي بُيُوتِكُمْ حِينَ تَنَامُونَ].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٤٣٠١/ التحقيق الثاني): [البخاري: ٧٩- كتاب الاستئذان، ٤٩- باب: لا تترك النار في البيت عند النوم مسلم: ٣٦- كتاب الأشربة، ح١٠١].

(٤) صحيح الإسناد موقوفاً.

## دەربارەی: هەڵواسینی قامچی لە ماڵدا

١٠٥٢- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ بِتَعْلِيقِ السَّوْطِ فِي الْبَيْتِ»[1].

واته: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بە هەڵواسینی قامچی لە ماڵەوە (واتە: وەك پێشاندانی ڕێکارێکی تەمبێ کردن، بۆ هەر ئەندامێکی خێزان کە سنوور ببەزێنێ).

تێبینی: بێگومان مەبەست لەم ڕەفتارە لێدان و ئەزیەتدان نیە، بەڵکو مەبەست پێی دیاری کردنی سنوورەکان و نەبەزاندنیانە بە تایبەت بە نسبەت منداڵەوە، ئەمە یەکێکە لە ڕێکارو هۆکارەکانی تەمبێ کردنیان، بە بەڵگەی ئەوە مەبەست پێی ئازارو ئەزیەت دانیان نیە، چونکە خۆشەویست ﷺ خودی خۆی ئەزیەتی خاووخێزانی خۆی نەداوە تاکو فەرمان بە خەڵك بکات سزای ماڵ و منداڵیان بدەن و ئازاریان پێبگەیەنن.

## دەربارەی: دەرگا داخستن بە شەو

١٠٥٣- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِيَّاكُمْ وَالسَّمَرَ بَعْدَ هُدُوءِ اللَّيْلِ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَا يَدْرِي مَا يَبُثُّ اللَّهُ مِنْ خَلْقِهِ، غَلِّقُوا الْأَبْوَابَ، وَأَوْكُوا السِّقَاءَ، وَأَكْفِئُوا الْإِنَاءَ، وَأَطْفِئُوا الْمَصَابِيحَ»»[2].

واته: جابری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە قسەو حیکایەتی شەوانە دوای ئەوەی شەو ئارام دەبێت، چونکە یەکێك لە ئێوە نازانێ خوا چی لە نێو دروستکراوەکانیدا بڵاودەکاتەوە (دروستکراوی دیکە دەست بە جوڵە دەکەن لە جنۆکەو ئاژەڵان و خشۆکەکان)، دەرگاکان دابخەن و، دەمی کوندەی ئاوەکانتان ببەستن و، ڕووناکی و چرایەکان بکوژێننەوە.

## دەربارەی: بردنە ژوورەوەی منداڵان لە کاتی سەرەتای شەودا

١٠٥٤- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كُفُّوا صِبْيَانَكُمْ حَتَّى تَذْهَبَ فَحْمَةُ «أَوْ فَوْرَةُ» الْعِشَاءِ، سَاعَةَ تَهَبُّ الشَّيَاطِينُ»»[3].

---

(١) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٤٤٧): [ليس في شيء من الكتب الستة].

(٢) حسن: «السلسلة الصحيحة» (١٧٥٢): [ليس في شيء من الكتب الستة].

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٤٠): [مسلم: ٣٦- كتاب الأشربة، ح ٩٨].

**واتە: جابر (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: منداڵەكانتان بگرنەوە هەتا تاریكایی عیشا دەڕوات، ساتێكە شەیتانەكان بڵاوە دەكەن.**

## دەربارەی: تێكبەردان و بەشەڕ هێنانی ئاژەڵان

١٠٥٥- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَّهُ كَرِهَ أَنْ يُحَرِّشَ بَيْنَ الْبَهَائِمِ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) پێی حەڕام بووە ئاژەڵەكان لە نێوان یەكدی تێكبەربدرێن و، شەڕیان پێ بكرێ.**

## دەربارەی: وەڕینی سەگ و زەڕینی گوێدرێژ

١٠٥٦- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَقِلُّوا الْخُرُوجَ بَعْدَ هُدُوءٍ، فَإِنَّ لِلهِ دَوَابَّ يَبُثُّهُنَّ، فَمَنْ سَمِعَ نُبَاحَ الْكَلْبِ، أَوْ نُهَاقَ حِمَارٍ، فَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، فَإِنَّهُمْ يَرَوْنَ مَا لَا تَرَوْنَ»»[٢].

**واتە: جابری كوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دەرچوون كەم بكەنەوە دوای ئارامی و بێدەنگی لە شەو، چونكە خوا چەندین ژیانلەبەرێكی هەیە بڵاویان دەكاتەوە (ئێوە هەستیان پێناكەن)، جا هەر كەسێك گوێی لە وەڕینی سەگ و زەڕینی گوێدرێژ بووبا پەنا بگرێ بە خوا لە شەیتانی نەفرین لێكراو، چونكە ئەوان شتانێك دەبینن كە ئێوە نایانبینن.**

١٠٥٧- «عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا سَمِعْتُمْ نُبَاحَ الْكِلَابِ أَوْ نُهَاقَ الْحَمِيرِ مِنَ اللَّيْلِ، فَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ، فَإِنَّهُمْ يَرَوْنَ مَالَا تَرَوْنَ، وَأَجِيفُوا الْأَبْوَابَ، وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهَا، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَفْتَحُ بَابًا أُجِيفَ وَذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ، وَغَطُّوا الْجِرَارَ، وَأَوْكِئُوا الْقِرَبَ وَأَكْفِئُوا الْآنِيَةَ»»[٣].

**واتە: جابری كوڕی عەبدوڵلا (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر لەشەودا گوێتان لە وەڕینی سەگ، یان زەڕەی گوێدرێژ بوو، ئەوە پەنا بگرن بە خوا، چونكە ئەوان شتانێك دەبینن ئێوە نایانبینن، وە دەرگاكان دابخەن و ناوی خوای لەسەر بێنن،**

---

(١) حسن لغيره موقوفاً، وروي مرفوعاً: «غاية المرام» (٣٨٣): [أبو داود: كتاب الجهاد، ابن عباس مرفوعاً]

(٢) صحيح لغيره: «السلسلة الصحيحة» (١٥١٨): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ١٠٦- باب: ماجاء في الديك والبهائم، ح ٥١٠٣ و ٥١٠٤].

(٣) صحيح: انظر ما قبله.

چونكە شەیتان دەرگایەك ناكاتەوە داخرابێ و ناوی خوای لەسەر هێنرابێت، وە دەمی كوپەكانتان دابپۆشن و، پەتی گونیەكان ببەستن و، قاپەكانتان سەراو نخون بكەنەوە (با حەشەڕات و جانەوەر بەناویاندا تێپەڕ نەبن).

١٠٥٨- «عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ سَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «أَقِلُّوا الْخُرُوجَ بَعْدَ هُدُوءٍ، فَإِنَّ لِلَّهِ خَلْقًا يَبُثُّهُمْ، فَإِذَا سَمِعْتُمْ نُبَاحَ الْكِلَابِ أَوْ نُهَاقَ الْحَمِيرِ، فَاسْتَعِيذُوا بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ»»[١].

واتە: جابر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە ئەو بیستی پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: دەرچوون كەم بكەنەوە لە دوای ئەوەی بەشێك لە شەو تێپەڕ دەبێ و بێ دەنگی دروست دەبێ، چونكە خوا چەندین گیانلەبەری هەیە بڵاویان دەكاتەوە (نۆرەی دەرچوونی ئەوان دێ، ڕەنگە زیانتان لێ بدەن)، جا ئەگەر وەڕینی سەگ و زەڕینی گوێدرێژتان بیست، ئەوە پەنا بگرن بە خوا لە شەیتانی نەفرین لێكراو (چونكە شەیتانەكانیان بینیوە، كە لەم كاتە بڵاو دەبنەوە).

## دەربارەی: (مسوڵمان) ئەگەر گوێی لە كەڵەشێر بوو

١٠٥٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: إِذَا سَمِعْتُمْ صِيَاحَ الدِّيَكَةِ مِنَ اللَّيْلِ، فَإِنَّهَا رَأَتْ مَلَكًا، فَسَلُوا اللَّهَ مِنْ فَضْلِهِ، وَإِذَا سَمِعْتُمْ نُهَاقَ الْحَمِيرِ مِنَ اللَّيْلِ، فَإِنَّهَا رَأَتْ شَيْطَانًا، فَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ»»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر گوێتان لە دەنگی كەڵەشێر بوو لە شەودا، ئەوە فریشتەی بینیوە، بۆیە داوای فەزڵ و چاكەكەی لە خوا بكەن، وە ئەگەر زەڕەی گوێدریژتان بیست لە شەودا، ئەوە شەیتانی بینیوە، بۆیە پەنا بگرن بە خوا لە شەیتان.

## دەربارەی: قەیلولەو سەرخەو شكاندن

١٠٦٠- «عَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: رُبَّمَا قَعَدَ عَلَى بَابِ ابْنِ مَسْعُودٍ رِجَالٌ مِنْ قُرَيْشٍ، فَإِذَا فَاءَ الْفَيْءُ قَالَ: قُومُوا فَمَا بَقِيَ فَهُوَ لِلشَّيْطَانِ، ثُمَّ لَا يَمُرُّ عَلَى أَحَدٍ إِلَّا أَقَامَهُ، قَالَ: ثُمَّ بَيْنَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ قِيلَ: هَذَا مَوْلَى بَنِي الْحَسْحَاسِ يَقُولُ الشِّعْرَ، فَدَعَاهُ فَقَالَ: كَيْفَ قُلْتَ؟ قَالَ: وَدِّعْ سُلَيْمَى إِنْ تَجَهَّزْتَ غَازِيَا ... كَفَى الشَّيْبُ وَالْإِسْلَامُ لِلْمَرْءِ نَاهِيَا، فَقَالَ: حَسْبُكَ، صَدَقْتَ صَدَقْتَ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٣١٨٣): [البخاري: ٥٩- كتاب بدء الخلق، ١٥- باب: خير مال المسلم غنم. مسلم: ٤٨- كتاب الذكر والدعاء، ح ٨٢].

(٣) حسن الإسناد.

**واتە: عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: هەندێکجار کۆمەڵە پیاوێك لە قورەیش دادەنیشتن لەبەر دەرگای ئیبنو مەسعوود، جا کاتێ خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان لایدەدا، دەیگوت: هەڵسن (بڕۆن)، ئەوەی ماوەتەوە ئەوە بۆ شەیتانە (واتە: شەیتان بەسەریدا زاڵ دەبێ و زەرەر دەکات)، پاشان بەلای هەرکەسێکدا تێپەڕ بووایە ئەوە هەڵیدەساند، دەڵێ: جا کارەکە بەو شێوەیە بەردەوام بوو، لە ناکاو گوترا: ئەمە خزمەتکار (کۆیلەی ئازادکراو)ی نەوەکانی حەسحاسە شیعر دەڵێ، ئەویش بانگی کردو گوتی: چیت گوت؟ گوتی:**

**وَدِّعْ سُلَيْمَى إِنْ تَجَهَّزْتَ غَازِيَا ... كَفَى الشَّيْبُ وَالْإِسْلَامُ لِلْمَرْءِ نَاهِيَا.**

**واز لە سولەیما بێنە کاتێ خۆی ئامادەکرد بۆ غەزا ...پیری و ئیسلامەتی بەسە بۆ مرۆڤ ڕێگربێ لە خراپەکاری.**

**گوتی: ئەوەندەت بەسە (ئیتر بڕۆ ماڵ)، ڕاستت کرد ڕاستت کرد.**

**١٠٦١- «عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: كَانَ عُمَرُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَمُرُّ بِنَا نِصْفَ النَّهَارِ «أَوْ قَرِيباً مِنْهُ» فَيَقُولُ: قُومُوا فَقِيلُوا، فَمَا بَقِيَ فَلِلشَّيْطَانِ»[١].**

**واتە: سائیبی کوڕی یەزید دەڵێ: عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، لە نیوەی ڕۆژدا (واتە: لە نیوەڕۆدا) «یان نزیك لە نیوەی ڕۆژ» تێدەپەڕی بە نێوانماندا و دەیگوت: هەڵسن قەیلولە بکەن (واتە تۆزێك بخەون، تا چالاکبن بۆ شەونوێژو کردەوەی پێویست لە دوای نیوەڕۆوە)، ئەوەی بمێنێتەوە ئەوە بۆ شەیتانە (واتە: ئەوەی هەڵنەستێ و قەیلولە نەکات، ئەوە شەیتان بەسەریدا زاڵ دەبێ و خاوو ساردو ناچالاکی دەکات).**

**١٠٦٢- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كَانُوا يَجْمَعُونَ، ثُمَّ يَقِيلُونَ»[٢].**

**واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: (هاوەڵان) کۆدەبوونەوە پاشان قەیلولەیان دەکرد، (واتە: پێش نیوەڕۆ تۆزێك دەخەوتن، یان دوای نیوەڕۆ تۆزێك دەخەوتن).**

**١٠٦٣- «عَنْ ثَابِتٍ، قَالَ أَنَسٌ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): مَا كَانَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ شَرَابٌ، حَيْثُ حُرِّمَتِ الْخَمْرُ، أَعْجَبَ إِلَيْهِمْ مِنَ التَّمْرِ وَالْبُسْرِ، فَإِنِّي لَأَسْقِي أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَهُمْ عِنْدَ أَبِي طَلْحَةَ، مَرَّ رَجُلٌ فَقَالَ: إِنَّ الْخَمْرَ قَدْ حُرِّمَتْ، فَمَا قَالُوا: مَتَى؟ أَوْ حَتَّى نَنْظُرَ، قَالُوا: يَا أَنَسُ، أَهْرِقْهَا، ثُمَّ قَالُوا عِنْدَ أُمِّ سُلَيْمٍ حَتَّى أَبْرَدُوا وَاغْتَسَلُوا، ثُمَّ طَيَّبَتْهُمْ أُمُّ سُلَيْمٍ، ثُمَّ رَاحُوا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَإِذَا الْخَبَرُ كَمَا قَالَ الرَّجُلُ. قَالَ أَنَسٌ: فَمَا طَعِمُوهَا بَعْدُ»[٣].**

---

(١) حسن الإسناد.

(٢) صحيح: «صحيح أبي داود» (٩٩٧).

(٣) صحيح الإسناد: [البخاري: ٤٦- كتاب المظالم، ٢١- باب: صب الخمر في الطريق. مسلم: ٣٦- كتاب الأشربة، ح ٣، ٤، ٥، ٦، ٧].

واتە: ثابیت دەگێڕێتەوە، ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: ئەو كاتەی شەڕاب حەڕامكرا، هیچ شەڕابێك بە لای خەڵكی مەدینەوە خۆشتر نەبوو لە (شەڕابێك كە دروست دەكرا لە) خورماو فەریكە ڕووتاب، وە من شەڕابگێڕی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا بووم ﷺ، ئەو كاتە ئەوان لەلای ئەبو طەڵحە بوون، پیاوێك تێپەڕی و گوتی: شەڕاب حەڕام كرا، ئیدی نەیانگوت: كەی؟ یان با چاوەڕێ بكەین (و تەماشا بكەین بزانین بابەتەكە چۆنە؟! هیچ قسەیەكی وایان نەكرد)، گوتیان: ئەی ئەنەس! شەڕابەكان بڕێژە، دواتر پاڵكەوتن و قەیلولەیەكیان كرد لەلای ئوممو سولەیم تاوەكو فێنكیان داهێناو خۆیان شۆرد، دوایی ئوممو سولەیم بۆنخۆشی كردن، پاشان چوون بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، جا هەواڵەكە هەمان ئەو هەواڵە بوو كە پیاوەكە گوتی (واتە: شەڕاب حەڕام كرابوو)، ئەنەس گوتی: ئیدی لە دوای ئەوە هەرگیز دەمیان لە شەڕاب نەدایەوە.

## دەربارەی: خەوی كۆتایی ڕۆژ

١٠٦٤- «عَنْ خَوَّاتِ بْنِ جُبَيْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: نَوْمُ أَوَّلِ النَّهَارِ خُرْقٌ، وَأَوْسَطُهُ خُلْقٌ، وَآخِرُهُ حُمْقٌ»[1].

واتە: خەوواتی كوڕی جوبەیر (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: خەوی سەرەتای ڕۆژ گێلی و گەوجیە، خەوی نێوەڕاستەكەشی خووە (واتە: خەوێكی چاك و سوننەتە)، خەوی كۆتاییەكەشی كەم عەقڵییە.

## دەربارەی: خواردن (چێشت) دروست كردن بۆ دەعوەت

١٠٦٥- «عَنْ مَيْمُونٍ يَعْنِي ابْنَ مِهْرَانَ قَالَ: سَأَلْتُ نَافِعاً: هَلْ كَانَ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، يَدْعُو لِلْمَأْدُبَةِ؟ قَالَ: لَكِنَّهُ انْكَسَرَ لَهُ بَعِيرٌ مَرَّةً فَنَحَرْنَاهُ، ثُمَّ قَالَ: احْشُرْ عَلَيَّ الْمَدِينَةَ، قَالَ نَافِعٌ: فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَلَى أَيِّ شَيْءٍ؟ لَيْسَ عِنْدَنَا خُبْزٌ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ، هَذَا عُرَاقٌ، وَهَذَا مَرَقٌ «أَوْ قَالَ: مَرَقٌ وَبَضْعٌ» فَمَنْ شَاءَ أَكَلَ، وَمَنْ شَاءَ وَدَعَ»[2].

واتە: مەیمونی كوڕی میهران دەڵێ: پرسیارم لە نافیع كرد: ئایا ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) خەڵكی بانگ دەكرد بۆ نان خواردن و دەعوەت؟ گوتی: جارێك وشترێكی قاچی شكا ئێمەش سەرمان بڕی، پاشان گوتی: خەڵكی مەدینەم بۆ كۆبكەنەوە، نافع گوتی: ئەی ئەبو عەبدوڕڕەحمان بۆچی كۆیان بكەینەوە؟ نانـمان لا نیە، گوتی: خوایە ستایش بۆ تۆ ئەمە گۆشتەو ئەویش شلەیە «یان گوتی: شلەو گۆشتە» هەر كەسێك ویستی دەخوات، وە هەر كەسێك ویستی با نەیخوات.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح الإسناد.

## دەربارەی: خەتەنە كردن

١٠٦٦- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «اخْتَتَنَ إِبْرَاهِيمُ ﷺ بَعْدَ ثَمَانِينَ سَنَةً، وَاخْتَتَنَ بِالْقَدُومِ» قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: يَعْنِي مَوْضِعًا»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (پێغەمبەر ئیبراهیم خۆی خەتەنە كرد دوای هەشتا ساڵ، وە لە (الْقَدُومِ) خۆی خەتەنە كرد، ئەبو عەبدوڵلا دەڵێ: واتە: (قەدوم) جێگایە.**

## دەربارەی: دەعوەت كردنی خەڵك بە هۆی خەتەنە كردن

١٠٦٧- «عَنْ عُمَرَ بْنِ حَمْزَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَالِمٌ قَالَ: خَتَنَنِي ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، أَنَا وَنُعَيْمًا، فَذَبَحَ عَلَيْنَا كَبْشًا، فَلَقَدْ رَأَيْتُنَا وَإِنَّا لَنَجْذَلُ بِهِ عَلَى الصِّبْيَانِ أَنْ ذَبَحَ عَنَّا كَبْشًا»[٢]

**واتە: عومەری كوڕی حەمزە دەڵێ: سالم هەواڵی پێدام گوتی: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) من و نوعەیمی خەتەنە كرد، بەرانێكی بۆ سەر بڕین، ئێمەش دڵخۆشیمان دەردەبڕی لە نێو منداڵەكاندا بە هۆی ئەوەی بەرانێكمان بۆ سەربڕا بوو.**

## دەربارەی: بەسەر بردنی كات و دڵخۆشكردنی منداڵان بە هۆی خەتەنەكردنەوە

١٠٦٨- «عَنْ بُكَيْرٍ أَنَّ أُمَّ عَلْقَمَةَ أَخْبَرَتْهُ، أَنَّ بَنَاتَ أَخِي عَائِشَةَ اخْتُتِنَّ، فَقِيلَ لِعَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا): أَلَا نَدْعُو لَهُنَّ مَنْ يُلْهِيهِنَّ؟ قَالَتْ: بَلَى، فَأَرْسَلْتُ إِلَى عَدِيٍّ فَأَتَاهُنَّ، فَمَرَّتْ عَائِشَةُ فِي الْبَيْتِ فَرَأَتْهُ يَتَغَنَّى وَيُحَرِّكُ رَأْسَهُ طَرَبًا، وَكَانَ ذَا شَعْرٍ كَثِيرٍ، فَقَالَتْ: أُفٍّ، شَيْطَانٌ، أَخْرِجُوهُ، أَخْرِجُوهُ»[٣].

**واتە: بوكەیر دەگێڕێتەوە كە دایكی عەلقەمە هەواڵی پێداوە (گوتوویەتی): كچەبراكانی عائیشە خەتەنە كران، جا بە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) گوترا: ئایا كەسێك بانگ نەكەین قسەی خۆشیان بۆ بكات و خۆیان لە یاد بكەن؟ گوتی: بەڵێ، منیش ناردم بە شوێن عەدیدا ئەویش هات بۆ لایان،**

---

(١) صحيح: (الإرواء» (٧٨): [البخاري: ٦٠- كتاب الأنبياء، ٨- باب قول الله تعالي: وأتخذ الله إبراهيم خليلًا. مسلم: ٤٣- كتاب الفضائل، ح ١٥١].

(٢) صحيح الإسناد موقوفاً.

(٣) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٧٢٢) .

جا عائیشە تێپەڕی بە لایاندا بینی عەدی گۆرانی دەڵێ و سەری دەجوڵێنێ، قژێکی زۆری هەبوو، (دایکمان عائیشە کە بینی) گوتی: ئۆف، ئەوە شەیتانە دەری بکەن، دەری بکەن.

## دەربارەی: خەتەنە کردن بۆ کەسی گەورە

١٠٦٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: اخْتَتَنَ إِبْرَاهِيمُ ﷺ وَهُوَ ابْنُ عِشْرِينَ وَمِائَةٍ، ثُمَّ عَاشَ بَعْدَ ذَلِكَ ثَمَانِينَ سَنَةً، قَالَ سَعِيدٌ: إِبْرَاهِيمُ أَوَّلُ مَنِ اخْتَتَنَ، وَأَوَّلُ مَنْ أَضَافَ، وَأَوَّلُ مَنْ قَصَّ الشَّارِبَ، وَأَوَّلُ مَنْ قَصَّ الظُّفُرَ، وَأَوَّلُ مَنْ شَابَ فَقَالَ: يَا رَبِّ، مَا هَذَا؟ قَالَ: وَقَارٌ، قَالَ: يَا رَبِّ، زِدْنِي وَقَاراً»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئیبراهیم خۆی خەتەنە کرد، لە کاتێکدا تەمەنی سەدو بیست ساڵ بوو، پاشان دوای ئەوە هەشتا ساڵ ژیا، سەعید دەڵێ: ئیبراهیم یەکەم کەس بوو کە خەتەنەکرا، وە یەکەم کەس بوو میوانداری کرد، وە یەکەم کەس بووە سمێڵی کورت کردۆتەوە، وە یەکەم کەس بوو نینۆکی بڕی، وە یەکەم کەس بوو مووی سپی لێهات، وە گوتی: ئەی پەروەردگارم ئەمە چیە، فەرمووی: سەنگینی و ویقارە، گوتی: ئەی پەروەردگارم سەنگینی و ویقارم بۆ زیاد بکە.

١٠٧٠- «عَنِ الْحَسَنِ يَقُولُ: أَمَا تَعْجَبُونَ لِهَذَا؟ يَعْنِي: مَالِكَ بْنَ الْمُنْذِرِ عَمَدَ إِلَى شُيُوخٍ مِنْ أَهْلِ كَسْكَرَ أَسْلَمُوا، فَفَتَّشَهُمْ فَأَمَرَ بِهِمْ فَخُتِنُوا، وَهَذَا الشِّتَاءُ، فَبَلَغَنِي أَنَّ بَعْضَهُمْ مَاتَ، وَلَقَدْ أَسْلَمَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الرُّومِيُّ وَالْحَبَشِيُّ فَمَا فُتِّشُوا عَنْ شَيْءٍ»[٢].

واتە: حەسەن دەڵێ: ئایا سەرتان سووڕنامێنێ لەمە؟ یانی مالیکی کوڕی مونزیر، چووە بۆ لای کۆمەڵە پیاوێك لە خەڵکی کەسکەر مسوڵمان بوون، ئەویش لێیکۆڵیونەوە (تا بزانێ خەتەنەکراون)، پاشان (کە زانیویەتی خەتەنە نەکراون) فەرمانی پێکردوون (خەتەنە بکەن) ئیدی خەتەنە کران، لە کاتێکدا ئێستا زستانە، جا هەواڵم پێگەیشتوە هەندێکیان مردوون، جا بێگومان ڕۆمی و حەبەشی لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ مسوڵمان بوون بە هیچ شێوەیەك لێکۆڵینەوەو پشکنینیان بۆ نەکرا (تا بزانرێ خەتەنە کراون یان نا).

١٠٧١- «عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: وَكَانَ الرَّجُلُ إِذَا أَسْلَمَ أُمِرَ بِالاخْتِتَانِ وَإِنْ كَانَ كَبِيراً»[٣].

واتە: ئیبنو شیهاب دەڵێ: پیاوێك ئەگەر ببایە بە مسوڵمان ئەوە فەرمانی پێ دەکرا بە خەتەنەکردن، هەرچەندە گەورەش بووایە.

---

(١) صحيح الإسناد موقوفاً ومقطوعاً، وصح اختتانه بعد ثمانين كما تقدم.

(٢) صحيح الإسناد موقوفاً ومرسلًا، ورواه الخلال في «الوقوف والترجل» «١٥٠/ ١٩٧» من طريق أحمد بسنده الصحيح عن الحسن.

(٣) صحيح الإسناد موقوفاً أو مقطوعاً.

## دەربارەی: زمان و دەم شیرین كردنی منداڵ (كاتێ لە دایك دەبێ)

١٠٧٢- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: ذَهَبْتُ بِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يَوْمَ وُلِدَ، وَالنَّبِيُّ ﷺ فِي عَبَاءَةٍ يَهْنَأُ بَعِيراً لَهُ، فَقَالَ: «مَعَكَ تَمَرَاتٌ؟» قُلْتُ: نَعَمْ، فَنَاوَلْتُهُ تَمَرَاتٍ فَلَاكَهُنَّ، ثُمَّ فَغَرَفَا الصَّبِيِّ، وَأَوْجَرَهُنَّ إِيَّاهُ، فَتَلَمَّظَ الصَّبِيُّ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «حُبَّ الْأَنْصَارِ التَّمْرَ»، وَسَمَّاهُ: عَبْد اللَّه»[1].

**واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: ئەو ڕۆژەی عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو تەڵحە لە دایك بوو، بردم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، لەكاتێكدا پێغەمبەر عەبایەكی لەبەردا بوو خواردنی دەدا بە وشترەكەی، فەرمووی: چەند دانە خورمایەكت لەلایە؟ گوتم: بەڵێ، چەند دانە خورمایەكم پێدا، خستیە دەمی و بە ددانەكانی جوی، پاشان خستیە دەمی منداڵەكە لە نێو دەمیدا دەیهێناو دەیبرد، منداڵەكەش زمانی دەجوڵاندەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەی خۆشەویستە لای ئەنصار خورمایە، وە ناویشی لێنا: عەبدوڵڵا.**

## دەربارەی: دوعا كردن بە بۆنەی لە دایك بوونەوە

١٠٧٣- «عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنَ قُرَّةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: لَمَّا وُلِدَ لِي إِيَاسٌ دَعَوْتُ نَفَراً مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ فَأَطْعَمْتُهُمْ، فَدَعَوْا، فَقُلْتُ: إِنَّكُمْ قَدْ دَعَوْتُمْ فَبَارَكَ اللَّهُ لَكُمْ فِيمَا دَعَوْتُمْ، وَإِنِّي إِنْ أَدْعُو بِدُعَاءٍ فَأَمِّنُوا، قَالَ: فَدَعَوْتُ لَهُ بِدُعَاءٍ كَثِيرٍ فِي دِينِهِ وَعَقْلِهِ وَكَذَا، قَالَ: فَإِنِّي لَأَتَعَرَّفُ فِيهِ دُعَاءَ يَوْمِئِذٍ»[2].

**واتە: موعاویەی كوڕی قوڕڕە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: كاتێ ئیاسی كوڕم لە دایك بوو، كۆمەڵە پیاوێكم بانگهێشت كرد لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و، خواردنم پێدان، ئەوانیش دوعایان كرد، گوتم: ئێوە دوعاتان كرد، ئەی خوا بەرەكەت بخاتە نێو ئەو شتانەی دوعاتان بۆ كرد، وە ئەگەر من دوعایەكم كرد ئێوە بڵێن: ئامین، گوتی: جا دوعایەكی زۆرم بۆ كرد بۆ دین و عەقڵ و شتی دیكەی، دەڵێ: جا من (ئێستا كە گەورە بووە) دوعای ئەو ڕۆژەی تێدا دەبینم (كە هاتۆتە دی و قبووڵ بووە).**

---

(١) صحيح: «أحكام الجنائز» (٢٤- ٢٦): [البخاري: ٧١- كتاب العقيقة، ١- باب: تسمية المولود غداة يولد. مسلم: ٣٨- كتاب الآداب، ح ٢٢].

(٢) صحيح الإسناد.

## دەربارەی: ستایشکردنی خوا بە لە دایك بوونی منداڵ بە ساغی، بێ گرنگیدان بەوە کوڕە یان کچە

١٠٧٤- «عَنْ كَثِيرِ بْنِ عُبَيْدٍ قَالَ: كَانَتْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) إِذَا وُلِدَ فِيهِمْ مَوْلُودٌ «يَعْنِي: فِي أَهْلِهَا» لَا تَسْأَلُ: غُلَامَاً وَلَا جَارِيَةً، تَقُولُ: خُلِقَ سَوِيّاً؟ فَإِذَا قِيلَ: نَعَمْ، قَالَتِ: الْحَمْدُ لِلهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ»[١].

**واتە: کەثیری کوڕی عوبەید دەڵێ: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) ئەگەر خزم و کەسەکانی منالێکیان ببووایە، پرسیاری نەدەکرد (ئایا منداڵەکە): کوڕە یان کچە، دەیگوت: تەواو دروستکراوە (ساغ و سەلامەتە؟) ئەگەر بگوترایە: بەڵێ، دەیگوت: ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانییان.**

## دەربارەی: لابردنی مووی دامێن

١٠٧٥- «عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، كَانَ يُقَلِّمُ أَظَافِيرَهُ فِي كُلِّ خَمْسَ عَشْـرَةَ لَيْلَةً، وَيَسْتَحِدُّ فِي كُلِّ شَهْرٍ»[٢].

**واتە: نافیع دەگێڕێتەوە، ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) پازدە شەو جارێك نینۆکەکانی دەکرد، وە مانگێ جارێك مووی شەرمگەو دامێنی لادەبرد.**

## دەربارەی: قومار

١٠٧٦- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: الْمَيْسِرُ: الْقِمَارُ»[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: (الْمَيْسِرُ) بریتیە لە قومار.**

## دەربارەی: ئەو کەسەی بە هاوەڵەکەی بڵێ: وەرە با قومار بکەین

١٠٧٧- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَلَفَ مِنْكُمْ فَقَالَ فِي حَلِفِهِ: بِاللَّاتِ وَالْعُزَّى، فَلْيَقُلْ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ: تَعَالَ أُقَامِرْكَ، فَلْيَتَصَدَّقْ»»[٤].

---

(١) صحيح الإسناد موقوفاً.

(٢) صحيح الإسناد موقوفاً.

(٣) صحيح الإسناد موقوفاً.

(٤) صحيح: [البخاري: ٨٣- كتاب الأيمان والنذور، ٥- باب: لا يحلف باللات والعزى. مسلم: ٢٧- كتاب الأيمان، ح ٥].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لە ئێوە سوێندی خواردو لە سوێندەکەیدا گوتی: (سوێند) بە لات و عوززا، (یان هەر شتێکی دیکەی غەیری خواو قورئان)، ئەوە با بڵێ: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)، وە هەر کەسێکیش بە هاوەڵەکەی بڵێ: وەرە با قومارت لەگەڵ بکەم، ئەوە با خێرو صەدەقەیەك بکات (تا ببێتە کەفارەتی ئەو قسەیەی).

## دەربارەی: هاندەرو خێراکەری وشتری ئافرەتان

١٠٧٨- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ الْبَرَاءَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، كَانَ يَحْدُو بِالرِّجَالِ، وَكَانَ أَنْجَشَةُ يَحْدُو بِالنِّسَاءِ، وَكَانَ حَسَنَ الصَّوْتِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا أَنْجَشَةُ، رُوَيْدَكَ سَوْقَكَ بِالْقَوَارِيرِ»»[١].

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، بەڕائی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)، وشتری پیاوانی لێدەخوڕی (خێرای دەکردن)، ئەنجەشەش وشتری ئافرەتانی لێدەخوڕی (گۆرانی بۆ وشترەکان دەگوت و هانی دەدان لەسەر ڕۆیشتن)، وە دەنگی زۆر خۆش بوو، جا پێغەمبەر ﷺ (کە بینی وشترەکان خێرا لێدەخوڕێ، ترسا ئافرەتەکان ئازار بخۆن) فەرمووی: ئەی ئەنجەشە لێخوڕینەکەت هێواش بکە بە شوشەکان (واتە وشتری ئافرەتان بە هێواشی لێبخوڕە، چونکە ئافرەتان وەك شوشە ناسکن، زوو ئازار دەخۆن).

## دەربارەی: گۆرانی (و هاوشێوەکانی)

١٠٧٩- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، فِي قَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ ۝٦ ﴾لقمان، قَالَ: الْغِنَاءُ وَأَشْبَاهُهُ»[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە بارەی فەرمایشتی خوا (عَزَّ وَجَلَّ): ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ ۝٦ ﴾، (واتە: هەندێ لە خەڵکی هەیە قسەو باسی بێهودەو بێسوود دەکڕێ) گوتوویەتی: (مەبەست) گۆرانی و هاوشێوەکانیەتی.

١٠٨٠- «عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفْشُوا السَّلَامَ تَسْلَمُوا، وَالْأَشَرَةُ شَرٌّ»، قَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ: الْأَشَرَةُ: الْعَبَثُ»[٣].

---

(١) صحيح.

(٢) صحيح الإسناد موقوف.

(٣) حسن: «الإرواء» (٧٧٧)، «السلسلة الصحيحة» (١٤٩٣): [ليس في شيء من الكتب الستة].

واتە: بەڕائی كوڕی عازیب (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سڵاوو بڵاوبكەنەوە سەلامەت دەبن، ئەشەڕەش خراپترین شتە، ئەبو موعاویە گوتوویەتی: (الْأَشَرَة)، واتە: بێ كەڵكی و بێ هوودەیی (واتە: بێ هودەیی و كاری بێ بەرهەم و گاڵتەو گەپ خراپترین شتە).

## دەربارەی: گوناهی ئەو كەسەی یاری بە (النَّرْدِ) دەكات

١٠٨١- «عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ لَعِبَ بِالنَّرْدِ فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ»»[1].[2]

واتە: ئەبو مووسای ئەشعەریی (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك یاری بە زاری تاوڵە بكات، ئەوە سەرپێچی خواو پێغەمبەری كردوە (چونكە كاتەكانی بێهودە بەسەر بردووەو ڕەنگە دڵڕەنجانیشی لێ دروست ببێ).

١٠٨٢- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: إِيَّاكُمْ وَهَاتَيْنِ الْكَعْبَتَيْنِ الْمَوْسُومَتَيْنِ اللَّتَيْنِ يُزْجَرَانِ زَجْراً، فَإِنَّهُمَا مِنَ الْمَيْسِرِ»[3].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: خۆتان دووربكەنەوە لە یاری كردن بەو زارەی دوو (یان سێ یان چوار یان شەش) ڕووی هەیە (لای خۆشمان پێی دەگوترێ زارو مار)، چونكە ئەو دووانە سەرزەنشت كراون بە سەرزەنشتكردنێكی زۆرو بەشێكن لە قومار كردن.

١٠٨٣- «عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنْ أَبِيهِ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ لَعِبَ بِالنَّرْدَشِيرِ فَكَأَنَّمَا صَبَغَ يَدَهُ فِي لَحْمِ خِنْزِيرٍ وَدَمِهِ»»[4].

واتە: ئیبنو بورەیدە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە لە باوكیەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەركەسێك یاری بە زاری تاوڵە بكات وەكو ئەوە وایە دەستی خستبێتە ناو گۆشت و خوێنی بەراز.

---

(١) (المعجم الوسيط) لە لاپەڕە (٢١٩)دا ئاوا پێناسەی (نرد) دەكات، كە (نردشیر)یشی پێ دەگوترێ، دەڵێ: (النَّرْدُ: فَهُوَ لُعْبَةٌ ذَاتُ صندُوقٍ وَحِجَارَةٍ وَفَصَّين، تَعْتَمَد عَلَى الحَظِّ وَتُنْقَلُ فِيهَا الحِجَارَة عَلَى حَسَبِ مَا يَأْتِي بِهِ الفَصّ: الزَهر، وَتُعْرَف عِنْدَ العَامَّةِ بالطَّاوْلَة، يُقَالُ: لَعِبَ بالنَّرْد) واتە: (نرد) بریتیە لە یارییەك كە لە صندوقێك و بەردێك پێكدێ (ئەو بەردە) دوو دیوی هەن، (هەڵبەتە ڕەنگە ئەوەش جۆرێكی بێ و ڕەنگە زۆر جۆری هەبن)، وە ئەو یارییە بەستراوەتەوە بە بەخت و شانس (واتە: هەڵی دەدا بە كام دیوەی دا دەكەوێ و كام دیوەی بۆ دەردەكەوێ)، وە بەردەكە دەگوازرێتەوە بەپێی ئەوەی كە ئەو مۆرە، (زارە) خاڵەكانی لێ دەردەكەون، لەلای خەڵكی بە گشتی بە (طاولة) ناسراوە، وە دەگوترێ (لَعِبَ بالنَّرْد).

(٢) حسن: «الإرواء» (٢٦٧٠): [أبو داود: ٤- كتاب الأدب، ٥٦- باب: النهي عن اللعب بالنرد ح ٤٩٣٨. جه: ٣٣- كتاب الأدب، ٤٣- اللعب بالنرد وح ٣٧٦٢].

(٣) صحيح: «حجاب المرأة» (١٠١).

(٤) حسن: «الإرواء» (٢٦٧٠): (مسلم: ٤١- كتاب الشعر، ح ١٠).

١٠٨٤- «عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ لَعِبَ بِالنَّرْدِ فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ»»[1].

واتە: ئەبو مووسا (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك یاری بە زاری تاوڵە بکات ئەوە سەرپێچی خواو پێغەمبەرەکەی کردوە.

تێبینی: خاوەنی (تەفسیری قورئانی بەرزو بە پێز) دەڵێ: من وا لەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر ﷺ تێدەگەم کە ئەو کاتە دیارە ئەو یارییانە هەموویان لەسەر پارەو شت بوون، تەنیا بۆ سەرگەرمیی نەبوون، بۆیە پێم وایە ئەگەر لەسەر پارەبن قەدەغەو حەرامن، هەرچەندە لە دەقەکەدا دیار نیە بڵێ لەسەر پارەیە، یان لەسەر پارە نیە، بۆیە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەو یارییانە بە ڕەهایی (مُطْلَق)ی حەرامن، هەر یارییەك لەسەر شانسەو لەسەر هەڵدانی مۆرە، یاخود بن دەستەو ئەو شتانەی کە هەڵدەدرێن، کامەت دەوێ شێر، یان خەت؟ ئەوانە هەندێ لە زانایان هەموویان بە قەدەغەیان داناون، چونکە ڕواڵەتی فەرمایشتەکانیان وەرگرتوە.

هەندێکیش دەڵێن: لەبەر ئەوەی عادەت وابووە کە لەسەر پارەو شت کراون، بۆیە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوون، لەبەرئەوەی هەموویان هەر لەسەر شت بوون، یانی: گرەو کردن بوون، لەسەر پارەو شت بردنەوە، وە براوەو دۆڕاویان تێدا هەبووە، بەڵام ئەگەر هەر بۆ سەرگەرمی بن، ئەوە قەدەغە نین، ئەوەش ڕایەکی زانایانە.

من ڕای دووەمم پێ ڕاستە، بەڵام بەو مەرجە کە:

**یەکەم:** نەبێتە هۆی چواندی نوێژو لە خوا بێئاگابوون.

**دووەم:** نەبێتە هۆی دوژمنایەتیی و ڕق و بوغز لە نێوان ئەو گەمەکەرانەدا کە یاریی بەو شتانە دەکەن، وَاللَّهُ أَعْلَم.

هەڵبەتە من بە قەتعی ناڵێم ڕەوان، دەڵێم: بۆچوونم وایەو پێم وایە ئەوە کە ئەو بەردە نەقڵ بکرێ لە وێ بۆ شوێنێکی دی، تەصەووڕ ناکەم تەنیا لەبەر ئەوەندە قەدەغە بێت، بەڵکو لەبەرئەوە بووە لەسەر پارەو شت کراون، دەشگونجێ ڕایەکەی دیکەش ڕاست بێ، بە هەر حاڵ لەو شتانەدا کە ڕاجیایی تێدایە، ئینسان نابێ بڵێ بە تەئکید هەر ئەو ڕایە ڕاستە.

---

(١) حسن.

## دەربارەی: تەمبێکردن و دەرکردنی ئەوانەی یاری تاوڵە دەکەن و بە دوای شتی پووچ کەوتوون

١٠٨٥- «عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، كَانَ إِذَا وَجَدَ أَحَداً مِنْ أَهْلِهِ يَلْعَبُ بِالنَّرْدِ ضَرَبَهُ، وَكَسَرَهَا»[١].

**واتە: نافیع دەگێڕێتەوە عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) کاتێ یەکێك لە کەسوکاری خۆی بینیبا کە یاری بە زاری تاوڵە بکردایە لێیدەداو (یاریەکەی) دەشکاند.**

١٠٨٦- «عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، أَنَّهُ بَلَغَهَا أَنَّ أَهْلَ بَيْتٍ فِي دَارِهَا، كَانُوا سُكَّاناً فِيهَا، عِنْدَهُمْ نَرْدٌ، فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِمْ: لَئِنْ لَمْ تُخْرِجُوهَا لَأُخْرِجَنَّكُمْ مِنْ دَارِي، وَأَنْكَرَتْ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ»[٢].

**واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) لێی گێڕدراوەتەوە، هەواڵی پێگەیشت کە کەسێك لە ماڵەکەیدایە کە نیشتەجێ بوون، تاوڵەیەکیان لەلا بوو، ئەویش نێردراوی نارد بۆ لایان (گوتی): ئەگەر ئەو تاوڵە دەرنەکەن لە ماڵەکەم دەرتان دەکەم، وە نکووڵی ئەوەی کرد لێیان.**

**تێبینی: دیارە مەبەست پێی ئەوەیە: هەندێ لەو کەسانەی لە ماڵی دایە عائیشە نیشتەجێ بوون، هاتوون یاری تاوڵەیان هێناوەتەوە بۆ ماڵێ، جا دایکمان دەفەرموێ: ئەگەر ئەو یاریەی هێناوتانە نەیبەنە دەر، ئەوە خۆتان دەر دەکەم لە ماڵەکەم.**

١٠٨٧- «عَنْ كُلْثُومِ بْنِ جَبْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: خَطَبَنَا ابْنُ الزُّبَيْرِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، فَقَالَ: يَا أَهْلَ مَكَّةَ! بَلَغَنِي عَنْ رِجَالٍ مِنْ قُرَيْشٍ يَلْعَبُونَ بِلُعْبَةٍ يُقَالُ لَهَا: النَّرْدَشِيرُ «وَكَانَ أَعْسَرَ» قَالَ اللَّهُ: ﴿إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ ﴿٩٠﴾ ﴾المائدة، وَإِنِّي أَحْلِفُ بِاللَّهِ: لَا أُوتَى بِرَجُلٍ لَعِبَ بِهَا إِلَّا عَاقَبْتُهُ فِي شَعْرِهِ وَبَشَرِهِ، وَأَعْطَيْتُ سَلَبَهُ لِمَنْ أَتَانِي بِهِ»[٣].

**واتە: کەلسومی کوڕی جەبر گوتوویەتی: باوکم بۆی گێڕامەوە گوتی: ئیبنو زوبەیر (خوا لێیان ڕازی بێ) وتاری بۆ داین، گوتی: ئەی خەڵکی مەککە! هەواڵم پێگەیشتووە دەربارەی پیاوانێك لە قوڕەیش کە جۆرە یاریەك دەکەن پێی دەگوترێ: تاوڵە «کە زەحمەت بوو» خوا فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ ﴿٩٠﴾ ﴾، (واتە: بێگومان ئارەق و قومار) من سوێند دەخۆم بە خوا، هەر کەسێکم بۆ بێنن یاری پێبکات (قژی ڕادەکێشم)و ڕووخساری ئازار دەدەم، وە هەرچی پێ بێت دەیدەم بەو کەسەی بۆم دێنێ.**

---

(١) صحيح الإسناد موقوف.

(٢) حسن الإسناد موقوف.

(٣) حسن الإسناد موقوف.

١٠٨٨- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: اللَّاعِبُ بِالْفُصَّيْنِ قِمَاراً كَآكِلِ لَحْمِ الْخِنْزِيرِ، وَاللَّاعِبُ بِهِمَا غَيْرَ قِمَارٍ كَالْغَامِسِ يَدَهُ فِي دَمِ خِنْزِيرِ»[١].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەمری كوڕی عاص (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: ئەو كەسەی یاری دەكات بە (الْفُصَّيْنِ) (كە جۆرە زارێكە) بە شێوەی قومار كردن، ئەوە وەك ئەو كەسە وایە كە گۆشتی بەراز دەخوات، وە ئەو كەسەی یاریان پێ دەكات بێ قومار، ئەوە وەك ئەو كەسە وایە كە دەستی بخاتە خوێنی بەرازەوە.

## دەربارەی: كەسی بڕوادار دوو جار لە كونێكەوە ناگەسترێ

١٠٨٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قال: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ مَرَّتَيْنِ»»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كەسی بڕوادار دووجار لە كونێكەوە ناگەسترێ (واتە: نابێ ئەوەندە سادەو ساویلكەبێ دوو جار هەمان فێڵی لێ بكرێ و هەڵبخەڵەتێنرێ).

## دەربارەی: ئەو كەسەی (تیرو ڕم و بەردو گوللە) بە شەو دەهاوێژێ

١٠٩٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ رَمَانَا بِاللَّيْلِ فَلَيْسَ مِنَّا»»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك بە شەو تیرمان بۆ بهاوێژێ لە ئێمە نیە.

١٠٩١- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلَاحَ فَلَيْسَ مِنَّا»»[٤].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك چەك بەرانبەرمان بەرز بكاتەوەو هەڵبگرێ ئەوە لە ئێمە نیە (لەو ئاكارە دزێوو ناشیرین و تێكدەریەدا).

---

(١) حسن الإسناد موقوف.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١١٧٥): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٨٣- باب: لا يلدغ المؤمن من جحر مرتين. مسلم: ٥٣- كتاب الزهد والرقائق، ح ٦٣].

(٣) صحيح لغيره: «السلسلة الصحيحة» (٢٣٣٩): [ليس في شيء من الكتب الستة].

(٤) صحيح: (تخريج إيمان أبي عبيد» (٧١/٨٥): [مسلم: ١- كتاب الإيمان، ح ١٦٤].

١٠٩٢- «عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلَاحَ فَلَيْسَ مِنَّا»»[1].

واتە: ئەبو مووسا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك چەك بەرانبەرمان بەرز بکاتەوەو هەڵبگرێ، ئەوە لە ئێمە نیە (لەو ئاکارە دزێوو ناشیرین و تێکدەریەدا).

## دەربارەی: کاتێ خوا دەیەوێ ڕووحی بەندەیەك لە شوێنێك بکێشێ، ئەوە کارێکی بۆ ڕێکدەخات لەوێ

١٠٩٣- «عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ قَوْمِهِ، وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا أَرَادَ اللَّهُ قَبْضَ عَبْدٍ بِأَرْضٍ جَعَلَ لَهُ بِهَا حَاجَةً»»[2].

واتە: ئەبو مەلیح دەگێڕێتەوە لە پیاوێك لە قەومەکەی، کە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بوو، گوتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خوا بیەوێ ڕووحی بەندەیەك بکێشێ لە (شوێنێك) زەویەکدا، ئەوە پێویستیەکی بۆ ڕێکدەخات لەو شوێن و زەویەدا (و دەچێتە ئەو شوێنە).

## دەربارەی: ئەو کەسەی لووتی فن دەکاتە نێو پۆشاکەکەی

١٠٩٤- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّهُ تَمَخَّطَ فِي ثَوْبِهِ، ثُمَّ قَالَ: بَخٍ بَخٍ، أَبُو هُرَيْرَةَ يَتَمَخَّطُ فِي الْكَتَّانِ، رَأَيْتُنِي أُصْرَعُ بَيْنَ حُجْرَةِ عَائِشَةَ وَالْمِنْبَرِ، يَقُولُ النَّاسُ: مَجْنُونٌ، وَمَا بِي إِلَّا الْجُوعُ»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) لێی گێڕدراوەتەوە، کە لووتی فن کردە ناو پۆشاکیەوە (ڕەنگە شوێنەکە وا بووبێ، بۆی نەگونجابێ فرێی بداتە سەر زەوی)، دوایی گوتی: بخ بخ (ئەمە وشەیەکە بۆ ڕازی بوون و سەرسام بوون بە کارەکەی بەکاردێ، جا بە ڕازی بوونەوە گوتی:) ئەبو هورەیرە لووتی فن دەکاتە نێو پۆشاکە کەتانەکەی، دەمبینی لەهۆشخۆم دەچووم لە نێوان ژوورەکەی عائیشەو مینبەر، خەڵکی دەیانگوت: شێتە، منیش هیچ شتێکم نەبوو جگە لەوەی برسی بووم.

---

(١) صحيح: [البخاري: ٩٢- كتاب الفتن: ٧ باب: قول النبي ﷺ من حمل علينا السلاح فليس منا].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٢٢١)، «تخريج المشكاة» (١١٠) .

(٣) صحيح: «مختصر الصحيح» (٩٦- كتاب الاعتصام / ١٦- باب)، «مختصر الشمائل / ١٠٨».

## دەربارەی: وەسوەسەو خوتخوتە

١٠٩٥- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا نَجِدُ فِي أَنْفُسِنَا شَيْئاً مَا نُحِبُّ أَنْ نَتَكَلَّمَ بِهِ وَإِنَّ لَنَا مَا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ، قَالَ: «أَوَ قَدْ وَجَدْتُمْ ذَلِكَ؟» قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: «ذَاكَ صَرِيحُ الْإِيمَانِ»»[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە کۆمەڵە شتێك دێ بە دڵماندا حەز ناکەین بە زمان بیڵێین، ئەگەرچی ئەوەی خۆری لەسەر هەڵدێ بیێتە هی ئێمە (واتە: ئەگەر هەموو دونیاشمان پێ بدرێ هەر دەرینابڕین، چونکە وەسوەسەکە کوفرە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا شتی واتان هەست پێکردووەو ڕوویداوە؟ گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: ئەوە ئیمانی ڕوون و تەواوە.**

تێبینی: دیارە کاتێ شەیتان دەزانێ ئیماندار بووەتە خاوەن ئیمانێکی تۆکمەو هیچی لە دەست نایەت بەرانبەری ئەنجامی بدات لە کردەوەی خراپ، دێت گومان و خوتخوتەی خراپ و کوفریی بۆ دروست دەکات و مرۆڤیش بەو ئیمانە تۆکمەو تەواوەوە ڕووبەڕوی خوتخوتەو وەسوەسەی شەیتان دەوەستێتەوە بۆیە پێی ناخۆشە دەریببڕێ).

١٠٩٦- «عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: **لَنْ يَبْرَحَ النَّاسُ يَسْأَلُونَ عَمَّا** لَمْ يَكُنْ، حَتَّى يَقُولُوا: اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ، فَمَنْ خَلَقَ اللَّهَ»[٢].

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵکی وازناهێنن و بەردەوام پرسیار دەکەن لە بارەی شتێکەوە کە نەبووەو ڕووینەداوە، هەتا دەڵێن: خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە، ئەدی کێ خوای بەدیهێناوە (لە کاتێکدا پرسیارەکە خۆی مەعقول نیە، وەك ئەوە وایە بوترێت هەموو ژمارەکان دوای سفر دێن، ئەی سفر دوای چی دێت؟!).**

## دەربارەی: گومان (ی خراپ) بردن

١٠٩٧- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ، فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ، وَلَا تَجَسَّسُوا، وَلَا تَنَافَسُوا، وَلَا تَدَابَرُوا، وَلَا تَحَاسَدُوا، وَلَا تَبَاغَضُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَاناً»»[٣].

---

(١) صحيح: «ظلال الجنة» (٦٥٧-٦٥٧): [مسلم: ١- كتاب الإيمان ح ٢٠٩].

(٢) صحيح: «الظلال» (٦٤٧): [البخاري: ٩٦- كتاب الاعتصام، ٣- باب: ما يكره من كثرة السؤال. مسلم: ١- كتاب الإيمان].

(٣) صحيح: (غاية المرام» (٤١٧): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٥٨- باب: يايها الذين أمنوا اجتنبوا كثيراً من الظن. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة والآداب، ح ٢٨].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە گومان، چونکە گومان درۆترین قسەیە (واتە: درۆترین قسەی دڵە)، وە جاسوسی مەکەن، وە کێبڕکێ مەکەن (لە حەزو ئارەزووی دونیادا، چونکە دڵی مرۆڤ ڕەق دەکات)، وە پشت لە یەکدی مەکەن، وە ئیرەیی بە یەکدی مەبەن، وە ڕەق و کینەتان بەرانبەر یەکدی نەبێ و، یەکدی مەبوغزێنن، وە ببنە بەندەی خواو برای یەکدی بن.

١٠٩٨- «عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: بَيْنَمَا النَّبِيُّ ﷺ مَعَ امْرَأَةٍ مِنْ نِسَائِهِ، إِذْ مَرَّ بِهِ رَجُلٌ، فَدَعَاهُ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: «يَا فُلَانُ، إِنَّ هَذِهِ زَوْجَتِي فُلَانَةُ» قَالَ: مَنْ كُنْتُ أَظُنُّ بِهِ فَلَمْ أَكُنْ أَظُنُّ بِكَ؟! قَالَ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنِ ابْنِ آدَمَ مَجْرَى الدَّمِ »»(١).

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ یەکێك لە خێزانەکانیدا بوو، لە ناکاو پیاوێك بە لایدا تێپەڕی، پێغەمبەریش ﷺ بانگی کردو فەرمووی: ئەی فڵان، ئەمە (ئافرەتە) فڵانە خێزانمە، (کابرا) گوتی: من گومانم بە کێ بردووە تا گومانم بە تۆ بردبێ؟! (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: بەڕاستی شەیتان لە نێو (نەفس و دڵی) مرۆڤدا دێت و دەچێ، هەروەك چۆن خوێن (لە نێو دەمارەکان) دێت و دەچێت.

١٠٩٩- «عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: مَا يَزَالُ الْمَسْرُوقُ مِنْهُ يَتَظَنَّى حَتَّى يَصِيرَ أَعْظَمَ مِنَ السَّارِقِ »(٢).

واتە: عەبدوڵلا (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئەو کەسەی ماڵەکەی دزراوە بەردەوام گومانی خراپ دەبات (بەم و بەو) هەتا لە دزەکە زیاتر گوناهبارتر دەبێ.

## دەربارەی: هەڵکێشانی مووی هەنگڵ

١١٠٠- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: الْفِطْرَةُ خَمْسٌ: الْخِتَانُ، وَالِاسْتِحْدَادُ، وَنَتْفُ الْإِبْطِ، وَقَصُّ الشَّارِبِ، وَتَقْلِيمُ الْأَظْفَارِ »(٣).

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پێنج شت لە فیترەت و سروشتی جوانی مرۆڤن (کە بریتین لە): خەتەنەکردن و، لابردنی مووی شەرمگە، هەڵکێشان (لابردنی)ی مووی بن هەنگڵ، وە کورتکردنەوەی سمێڵ و، نینۆك کردن.

---

(١) صحيح: [أبو داود: ٣٩- كتاب السنة، ١٧- باب: في الذراري، ح ٤٧١٩].

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) صحيح: «الإرواء» (٧٣): [البخاري: ٧٧- اللباء، ٦٣- باب قص الشارب. مسلم: ٢- الطهارة ح ٤٩ و ٥٠].

١١٠١- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): خَمْسٌ مِنَ الفِطْرَةِ: تَقْلِيمُ الْأَظْفَارِ، وَقَصُّ الشَّارِبِ، وَنَتْفُ الْإِبْطِ، وَحَلْقُ الْعَانَةِ، وَالْخِتَانُ»[١].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: پێنچ شت لە فیترەت و سروشتی جوانی مرۆڤن (کە بریتین لە): نینۆك کردن و، کورتکردنەوەی سمێڵ و، هەڵکێشانی مووی بن هەنگڵ (یان تاشینی)و، تاشینی مووی عەورەت و، خەتەنەکردن.

## دەربارەی: یاریکردنی منداڵان

١١٠٢- «عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: كَانَ أَصْحَابُنَا يُرَخِّصُونَ لَنَا فِي اللُّعَبِ كُلِّهَا، غَيْرِ الْكِلَابِ قَالَ أَبُو عَبْدِ اللَّهِ: يَعْنِي لِلصِّبْيَانِ»[٢].

واتە: ئیبڕاهیم دەڵێ: هاوەڵانمان ڕێگەیان پێ دەدایین بە هەموو یاریەکان، جگە لە شەڕە سەگ، ئەبو عەبدوڵڵا دەڵێ: واتە: بۆ منداڵان (مەبەستی ئەوەیە ڕێگەپێدانەکە بۆ منداڵان بوو).

## دەربارەی: سەربڕینی کۆتر

١١٠٣- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَجُلاً يَتْبَعُ حَمَامَةً، قَالَ: «شَيْطَانٌ يَتْبَعُ شَيْطَانَةً»»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بینی شوێنی کۆترێك کەوتبوو، فەرمووی: ئەمە شەیتانێکە شوێنی شەیتانێك دەکەوێ.

تێبینی: لەبەر ئەوە کەسەکەی بە شەیتان ناوهێناوە، چونکە بەهۆی ئەو باڵندەوە زۆر کات ڕەفتاری نابەجێی لێ ڕودەدات، وە دڵی خەڵکی دەڕەنجێ لەبەر چوونە سەر بان و، دەرکەوتنی حەیاو دیوی شاراوەی خەڵکی بەهۆی سەیرکردنی ماڵەکانیان لەسەر بانەوەو، سەیرکردنی ئاسمان و تووشبوونی ڕەفتاری منداڵانەو کاری حەڕام بە هۆی گرتنەوەی کۆتری خەڵکی و...هتد، کەواتە هەر شتێك مرۆڤ بەرەو خراپە ببات شەیتانە، یاخود مەبەست ئەوەیە شەیتان وای لێکردوە ئەم جۆرە هەڵسوکەوتە بکات.

---

(١) صحيح الإسناد موقوفاً، والأصح المرفوع: الذي قبله بحديث.

(٢) صحيح الإسناد.

(٣) حسن صحيح: «تخريج المشكاة» (٤٥٠٦): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٥٧- باب: اللعب بالحمام، ح ٤٩٤٠ إبن ماجه: ٣٣- كتاب الأدب، ٤٤- باب: اللعب بالحمام ح ٣٧٦٥].

## دەربارەی: هەر كەسێك پێویستی بە كەسێكی دیكە بوو، خۆی شایستەترە بچێتە لای

١١٠٤- «عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، جَاءَهُ يَسْتَأْذِنُ عَلَيْهِ يَوْماً، فَأَذِنَ لَهُ وَرَأْسُهُ فِي يَدِ جَارِيَةٍ لَهُ تُرَجِّلُهُ، فَنَزَعَ رَأْسَهُ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): دَعْهَا تُرَجِّلُكَ، فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، لَوْ أَرْسَلْتَ إِلَيَّ جِئْتُكَ، فَقَالَ عُمَرُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): إِنَّمَا الْحَاجَةُ لِي»[١].

واتە: زەیدی كوڕی ثابیت دەگێڕێتەوە كە عومەری كوڕی خەتتاب (خوا لێیان ڕازی بێ) ڕۆژێك هات بۆ لای داوای مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی لێكرد، ئەویش مۆڵەتی پێدا، لە كاتێكدا سەری لە نێو دەستی كەنیزەكەكەی دا بوو شانەی دەكرد، بۆیە سەری دەرهێنا، عومەریش (خوا لێی ڕازای بێ) پێی گوت: وازی لێ بێنە با قژت شانە بكات، ئەویش گوتی: ئەی گەورەی بڕواداران ئەگەر بتناردبایە بە شوێنمدا من دەهاتم بۆ لات، عومەریش (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: من ئیشم (بە تۆ) هەیە (واتە: دەبێ من بێم بۆ لات، نەك تۆ بێیت، چونكە من كارم بە تۆیە).

## دەربارەی: ئەگەر كەسێك قسەی بۆ خەڵك كرد، ئەوە با تەنیا ڕوو نەكاتە یەك كەس

١١٠٥- «عَنْ حَبِيبِ بْنِ أَبِي ثَابِتٍ قَالَ: كَانُوا يُحِبُّونَ إِذَا حَدَّثَ الرَّجُلُ أَنْ لَا يُقْبِلَ عَلَى الرَّجُلِ الْوَاحِدِ، وَلَكِنْ لِيَعُمَّهُمْ»[٢].

واتە: حەبیبی كوڕی ئەبو ثابیت دەڵێ: ئەوان حەزیان دەكرد ئەگەر پیاوێك قسە بكات (بۆ كۆمەڵێك) ئەوە تەنها ڕوونەكاتە یەك كەس، بەڵكو ڕوو بكاتە هەموویان بە گشتی.

## دەربارەی: كەسێك تەماشای شتێك بكات، كە پەیوەندی بەوەوە نیە

١١٠٦- «عَنِ ابْنِ أَبِي الْهُذَيْلِ قَالَ: عَادَ عَبْدُ اللَّهِ رَجُلاً، وَمَعَهُ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ، فَلَمَّا دَخَلَ الدَّارَ جَعَلَ صَاحِبُهُ يَنْظُرُ، فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ: وَاللَّهِ لَوْ تَفَقَّأَتْ عَيْنَاكَ كَانَ خَيْراً لَكَ»[٣].

واتە: ئیبنو ئەبو هوزەیل دەڵێ: عەبدوڵڵا سەردانی پیاوێكی كرد (كە نەخۆشكەوتبوو، وە یەكێك لە هاوەڵەكانی خۆشی لەگەڵ بوو، جا كاتێ چوونەماڵەكە، هاوەڵەكەی تەماشای (ماڵەكەی)

---

(١) حسن الإسناد.

(٢) حسن الإسناد.

(٣) حسن الإسناد موقوفاً.

دەكرد، عەبدوڵڵاش پێی گوت: سوێند بە خوا ئەگەر چاوت بڕژایەو كوێر بووایە ئەوە چاكتر بوو بۆت (نەك تەماشای ماڵی خەڵك بكەی، بێگومان مەبەست ئەوەیە مرۆڤ ئەگەر كەسێك متمانەی پێكردو بردیە ماڵی خۆی، پێویستە لەسەری زۆر وریای چاوگێڕانی بێ لەم ماڵەدا).

١١٠٧- «عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ نَفَراً مِنْ أَهْلِ الْعِرَاقِ دَخَلُوا عَلَى ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما)، فَرَأَوْا عَلَى خَادِمٍ لَهُمْ طَوْقَاً مِنْ ذَهَبٍ، فَنَظَرَ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، فَقَالَ: مَا أَفْطَنَكُمْ لِلشَّرِّ»[١].

واتە: نافیع دەگێڕێتەوە (دەڵێ): كەسانێك لە خەڵكی عێراق هاتن بۆ لای ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، خزمەتكارێكی خۆیانیان بینی ملوانكەیەكی زێڕی لە ملدا بوو، جا هەندێكیان تەماشای هەندێكی دیكەیان دەكرد (دەیانزانی ئێستا ئیبنو عومەر سەرزەنشتیان دەكات)، (ئیبنو عومەریش) گوتی: چەندە بە زیرەكی خراپە دەناسن!

١١٠٨- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «شِرَارُ أُمَّتِي الثَّرْثَارُونَ، الْمُشَدِّقُونَ، الْمُتَفَيْهِقُونَ، وَخِيَارُ أُمَّتِي أَحَاسِنُهُمْ أَخْلَاقَاً»»[٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خراپترینی نێو ئوممەتەكەم ئەوانەن: ١- زۆر قسە دەكەن و دووبارەی دەكەنەوەو لە هەق لا دەدەن، ٢- ئەوانەش پڕ دەمیان قسە دەكەن بە لووت بەرزیەوەو گاڵتەكارن بە خەڵك، ٣- ئەوانەش كە قسەكانیان فراوان دەكەن بەبێ ئەوەی پێویست بەوە بكات، وە چاكترینی ئوممەتەكەم ڕەوشت جوانترین و باشترینیانن.

## دەربارەی: دووڕوویی (نیفاق)

١١٠٩- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مِنْ شَرِّ النَّاسِ ذُو الْوَجْهَيْنِ، الَّذِي يَأْتِي هَؤُلَاءِ بِوَجْهٍ، وَهَؤُلَاءِ بِوَجْهٍ»»[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خراپترین كەسی نێو خەڵكی بریتیە لە كەسی دووڕوو، ئەوەی كە دێ بۆ لای كۆمەڵێك بە ڕووێكەوە، وە بۆ لای كۆمەڵەكەی دیكەش بە ڕووێكی دیكەوە.

---

(١) صحيح الإسناد.

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٧٥١، ٧٩١، ١٨٩١): [الترمذي: ٢٥- كتاب البر والصلة، ٧١- باب: ماجاء في معالي الأخلاق، جابر].

(٣) صحيح.

## دەربارەی: گوناهی دووڕوویی (نیفاق)

١١١٠- «عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ كَانَ ذَا وَجْهَيْنِ فِي الدُّنْيَا، كَانَ لَهُ لِسَانَانِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ نَارٍ» ، فَمَرَّ رَجُلٌ كَانَ ضَخْمًا، قَالَ: «هَذَا مِنْهُمْ»»[١].

**واتە: عەمارِی کوڕی یاسر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: بیستم پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: هەر کەسێك دووڕوو بێ لە دونیادا، ئەوە دوو زمانی ئاگرینی هەن لە ڕۆژی دواییدا، جا پیاوێك تێپەڕی کە زەبەلاح و لاشە گەورە بوو، فەرمووی: ئەمە لەوانە.**

## دەربارەی: خراپترین کەس ئەوەیە خەڵك خۆیانیانی لێی بپارێزن

١١١١- «عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ أَنَّ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا)، أَخْبَرَتْهُ: اسْتَأْذَنَ رَجُلٌ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «ائْذَنُوا لَهُ، بِئْسَ أَخُو الْعَشِيرَةِ» فَلَمَّا دَخَلَ أَلَانَ لَهُ الْكَلَامَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قُلْتَ الَّذِي قُلْتَ، ثُمَّ أَلَنْتَ الْكَلَامَ، قَالَ: «أَيْ عَائِشَةُ، إِنَّ شَرَّ النَّاسِ مَنْ تَرَكَهُ النَّاسُ «أَوْ وَدَعَهُ النَّاسُ» اتِّقَاءَ فُحْشِهِ»»[٢].

**واتە: عوروەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە کە عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، هەواڵی پێداوە (گوتوویەتی): پیاوێك داوای مۆڵەتی کرد بچێ بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی: مۆڵەتی بدەن، (ئەمە) خراپترین پیاوی نێو هۆزەکەی خۆیەتی، جا کاتێ هاتە ژوورەوە (پێغەمبەر ﷺ) بە نەرم و نیانی قسەی لەگەڵدا کرد، (دایکمان عائیشە دەڵێ) گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی گوتت گوتت (دەبارەی ئەو پیاوە)، پاشان نەرم و نیانیت نواند لەگەڵیدا (ئەمە چۆنە)؟ فەرمووی: ئەی عائیشە! بەڕاستی خراپترین کەس ئەو کەسەیە خەڵك وازی لێ بێنن لە ترسی خراپەکاریەکانی (واتە: لەبەر خراپییەکەی خۆم لێ پاراست، تاوەکو تووشی خراپەو شەڕی نەبم).**

---

(١) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٨٩٢): [أبو داود: ٤٠- كتاب الأدب، ٣٤- باب: في ذي الوجهين، ح ٤٨٧٣].

(٢) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (١٠٤٩): [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٣٨- باب: لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ ﷺ فاحشا. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة، ح ٧٣].

## دەربارەی: شەرم و حەیا

١١١٢- «عَنْ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الْحَيَاءُ لَا يَأْتِي إِلَّا بِخَيْرٍ»، فَقَالَ بُشَيْرُ بْنُ كَعْبٍ: مَكْتُوبٌ فِي الْحِكْمَةِ: إِنَّ مِنَ الْحَيَاءِ وَقَاراً، إِنَّ مِنَ الْحَيَاءِ سَكِينَةً، فَقَالَ لَهُ عِمْرَانُ: أُحَدِّثُكَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَتُحَدِّثُنِي عَنْ صَحِيفَتِكَ»[1].

واتە: عیمڕانی کوڕی حوصەین (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شەرم و حەیا جگە لە خێرو چاکە هیچ شتێك (بۆ مرۆڤ) ناهێنێ، جا بوشەیری کوڕی کەعب گوتی: لە حیکمەتدا نووسراوە: بەڕاستی لە شەرم و حەیادا سەنگینی هەیە، بێگومان لە شەرم و حەیادا هێمنی و دڵنیایی هەیە، جا عیمڕان پێی گوت: من لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموودەت بۆ باس دەکەم (دەربارەی شەرم و حەیا)، کەچی تۆش لە پەڕاوەکانتەوە بۆم باس دەکەیت (واتە زانیاریی و وتەی خەڵکی مەهێنە ئاست فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ).

١١١٣- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: إِنَّ الْحَيَاءَ وَالْإِيمَانَ قُرِنَا جَمِيعاً، فَإِذَا رُفِعَ أَحَدُهُمَا رُفِعَ الْآخَرُ»[2].

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: بە ڕاستی حەیاو ئیمان بەیەکەوە کۆکراونەتەوە، ئەگەر یەکێکیان لاچوو ئەوەی تریشیان لادەچێ.

## دەربارەی: خـــراپـــە

١١١٤- «عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْحَيَاءُ مِنَ الْإِيمَانِ، وَالْإِيمَانُ فِي الْجَنَّةِ، وَالْبَذَاءُ مِنَ الْجَفَاءِ، وَالْجَفَاءُ فِي النَّارِ»»[3].

واتە: ئەبو بەکرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شەرم و حەیا لە ئیمانەوەیە، (خاوەن) ئیمانیش لە بەهەشت دایە، وە زمان پیسی و جوێندان لە خراپەوەیە، خراپەش لە ئاگردایە.

---

(١) صحيح: [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٧٧- باب: الحياء. مسلم: ١- كتاب الإيمان ح ٦١].

(٢) صحيح: «تخريج المشكاة» (٥٠٩٤)، «الروض» (٤٢٣/٢) .

(٣) صحيح: «السلسلة الصحيحة» (٤٩٥): [الترمذي: ٢٥- كتاب البر والصلة، ٢٥- باب: ماجاء في الحياء. إبن ماجه: ٣٧- كتاب الزهد ١٧- باب: الحياء، ح ٤١٨٤].

١١١٥- «عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَلِيٍّ ابْنِ الْحَنَفِيَّةِ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ ضَخْمَ الرَّأْسِ، عَظِيمَ الْعَيْنَيْنِ، إِذَا مَشَى تَكَفَّأَ، كَأَنَّمَا يَمْشِي فِي صَعَدٍ، إِذَا الْتَفَتَ الْتَفَتَ جَمِيعاً»[1].

واتە: موحەممەدی كوڕی عەلی كوڕی حەنەفیە لە باوكیەوە گێڕاویەتیەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ سەری گەورە بوو، چاوەكانیشی گەورە بوون، كاتێ بە ڕێگە بڕۆیشتبایە تەكانی دەدا بەرەو پێشەوە، وەك ئەوەی بەسەر بەرزاییەكدا سەر بكەوێ (ڕۆیشتنی ئاوا گورج و گۆڵ بوو)، كاتێ ئاوڕی دەدایەوە بە هەموو جەستەی ئاوڕی دەدایەوە.

تێبینی: تۆ بێنە بەر چاوت ئەو یوسفەی ئێمە كە لە یوسف جوانترە دەبێ چەندە جوان بووبێ: چاوێكی گەورە، جوانترین باڵا، سوورو سپی وەك دەنكە هەنار، كاتێ ئاوڕ دەداتەوە تەنها سەری ناسووڕێنێ بەڵكو بەوپەڕی ویقارەوە بە هەموو جەستەی ئاوڕ دەداتەوە (لە كاتێكدا ئێستا دوای هەزارو چوار سەد ساڵ تازە كەسە گەورەكان خەریكن خۆیان فێری ئەو جۆرە ئاوڕدانەوە دەكەن و كردوویانە بە ئەتەكێتی خۆیان، كەچی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو سیفەتەی خواڕسكی بوو)، كە دەكەویە بەرانبەری نازانی سەیری بكەی یان شەرم بكەی!!!.

## دەربارەی: ئەگەر شەرمت نەكرد چی دەكەی بیكە

١١١٦- «عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسَ مِنْ كَلَامِ النُّبُوَّةِ الْأُولَى: إِذَا لَمْ تَسْتَحْيِ فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ»[2].

واتە: ئەبو مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی خەڵكی پێی گەیشتووە لە قسەی پێغەمبەرانی پێشوو (بریتیە لەوەی فەرمویانە): ئەگەر شەرمت نەكرد چی دەكەی بیكە.

## دەربارەی: تووڕەیی

١١١٧- «عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ الشَّدِيدُ بِالصُّرَعَةِ، إِنَّمَا الشَّدِيدُ الَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ»»[3].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەهێز ئەوە نیە پشتی خەڵكی لە زەوی بدات، بەڵكو بەهێز ئەوەیە كە دان بە خۆیدا دەگرێت لە كاتی تووڕەییدا.

---

(١) حسن: «السلسلة الصحيحة» (٢٠٥٢)، و «مختصر الشمائل» (٤) .

(٢) صحيح.

(٣) صحيح: [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٧٦- باب: الحذر من الغضب. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة، ح ١٠٧]

١١١٨- «عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: مَا مِنْ جَرْعَةٍ أَعْظَمَ عِنْدَ اللَّهِ أَجْراً مِنْ جَرْعَةِ غَيْظٍ كَظَمَهَا عَبْدٌ ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللَّهِ»[١].

**واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: هیچ قوتدانەوەیەك پاداشتی مەزنتر نیە لە لای خوا لە قوتدانەوەی تووڕەییەکی بەندەو دەرنەبڕینی تووڕەییەکەی لە پێناوی خوادا.**

## دەربارەی: (مسوڵمان) لە کاتی تووڕەییدا چی دەڵێ؟

١١١٩- «عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ صُرَدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: اسْتَبَّ رَجُلَانِ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَجَعَلَ أَحَدُهُمَا يَغْضَبُ، وَيَحْمَرُّ وَجْهُهُ، فَنَظَرَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي لَأَعْلَمُ كَلِمَةً لَوْ قَالَهَا لَذَهَبَ هَذَا عَنْهُ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، فَقَامَ رَجُلٌ إِلَى ذَاكَ الرَّجُلِ فَقَالَ: تَدْرِي مَا قَالَ؟ قَالَ: قُلْ: أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: أَمَجْنُوناً تَرَانِي؟»[٢].

**واتە: سولەیمانی کوڕی صورەد (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: دوو پیاو (بوو بە کێشەیان)و جوێنیان بە یەکدیدا لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ، ئیدی یەکێکیان هەر تووڕە دەبوو و ڕووخساری سوور هەڵدەگەڕا، پێغەمبەر ﷺ تەماشای کردو فەرمووی: من وشەیەك دەزانم ئەگەر بیڵێ ئەو تووڕەییەی نامێنێ (وشەکەش بریتیە لەوەی بڵێ): (أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)، جا پیاوێك هەڵساو چوو بۆ لای ئەو پیاوە تووڕەیە، گوتی: دەزانی (پێغەمبەر ﷺ) چی فەرموو؟ گوتی: بڵێ: (أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)، جا پیاوەکە گوتی: بۆ بە شێتم دەبینی؟**

١١٢٠- «عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ صُرَدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: كُنْتُ جَالِساً مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَرَجُلَانِ يَسْتَبَّانِ، فَأَحَدُهُمَا احْمَرَّ وَجْهُهُ، وَانْتَفَخَتْ أَوْدَاجُهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنِّي لَأَعْلَمُ كَلِمَةً لَوْ قَالَهَا لَذَهَبَ عَنْهُ مَا يَجِدُ»، فَقَالُوا لَهُ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «تَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ»، قَالَ: وَهَلْ بِي مِنْ جُنُونٍ؟»[٣].

**واتە: سولەیمانی کوڕی صورەد (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: من لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبووم (لە کاتێکدا دوو پیاو (بوو بە کێشەیان و) جوێنیان بە یەکدیدا یەکێکیان ڕووخساری سوور هەڵگەڕاو شادەمارەکانی ملی ئەستور بوون لە تووڕەییان، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: من وشەیەك دەزانم ئەگەر بیڵێ ئەو تووڕەییەی نامێنێ، جا پێیان گوت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پەنا بگرە بە خوا لە شەیتانی دوورخراو لە ڕەحمەتی خوا، (پیاوەکەش) گوتی: (بۆچی) ئایا من شێتم؟**

---

(١) موقوف، رجاله ثقات، وقد صح مرفوعاً: «تخريج المشكاة»: «٥١١٦/ التحقيق الثاني».

(٢) صحيح.

(٣) صحيح: [البخاري: ٧٨- كتاب الأدب، ٧٦- باب: الحذر من الغضب. مسلم: ٤٥- كتاب البر والصلة، ح ١٠٩].

## دەربارەی: (مسوڵمان) بێ دەنگ دەبێ كاتێ تووڕە دەبێ

١١٢١- «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا)، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَلِّمُوا وَيَسِّرُوا، عَلِّمُوا وَيَسِّـرُوا، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، وَإِذَا غَضِبْتَ فَاسْكُتْ مَرَّتَيْنِ»»[١].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (خەڵك فێری (ئایین و زانستی بە سوود) بكەن و، ئاسانكاربن، سێ جار ئەوەی دووبارە كردەوە، پاشان فەرمووی: ئەگەر تووڕە بووی بێدەنگ بە، دووجاریش ئەمەی فەرموو.

## دەربارەی: خۆشەویستەكەت خۆشبوێ بێ زێدەڕۆیی

١١٢٢- «عن مُحَمَّدِ بْنِ عُبَيْدٍ الْكِنْدِيُّ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيّاً (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، يَقُولُ لِابْنِ الْكَوَّاءِ: هَلْ تَدْرِي مَا قَالَ الْأَوَّلُ؟ أَحْبِبْ حَبِيبَكَ هَوْناً مَا، عَسَى أَنْ يَكُونَ بَغِيضَكَ يَوْماً مَا، وَأَبْغِضْ بَغِيضَكَ هَوْناً مَا، عَسَى أَنْ يَكُونَ حَبِيبَكَ يَوْماً مَا»[٢].

واتە: موحەممەدی كوڕی عوبەیدی كیندی لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: گوێم لە عەلی بوو (خوا لێی ڕازی بێ) بە ئیبنو كەووائی دەگوت: ئایا دەزانی یەكەم چی گوتووە (واتە: دەزانی پێغەمبەری خوا كە بریتیە لە یەكەم كەسی ئوممەت چی فەرمووە)؟ فەرموویەتی: خۆشەویستەكەت ئەوەندە خۆش بوێ كە زێدەڕۆیی تێدا نەبێ، ڕەنگە ڕۆژێك لە ڕۆژان ڕقت لێی بێتەوەو ببێتە دوژمنت، وە ئەوەندە ڕقت لەو كەسە بێ كە ڕقت لێیەتی كە زێدەڕۆیی تێدا نەبێ، ڕەنگە ڕۆژێك لە ڕۆژان ببێت بە خۆشەویستت.

## دەربارەی: با ڕق لێبوونەوەو تووڕەبوونت لەناوبەر نەبێ

١١٢٣- «عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)، قَالَ: لَا يَكُنْ حُبُّكَ كَلَفاً، وَلَا بُغْضُكَ تَلَفاً، فَقُلْتُ: كَيْفَ ذَاكَ؟ قَالَ: إِذَا أَحْبَبْتَ كَلِفْتَ كَلَفَ الصَّبِيِّ، وَإِذَا أَبْغَضْتَ أَحْبَبْتَ لِصَاحِبِكَ التَّلَفَ»[٣].

واتە: عومەری كوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: با خۆشەویستیت نەبێتە ئەرك، وە با ڕق لێبوونەوەشت نەبێتە لەناو چوون، (ئەوەی لە ئیمامی عومەری گێڕاوەتەوە، (دەڵێ) گوتم:

---

(١) صحيح لغيره: «السلسلة الصحيحة» (١٣٧٥) .

(٢) حسن لغيره موقوفاً وقد صح مرفوعاً: «غاية المرام» (٢٧٢).

(٣) صحيح الإسناد.

ئەوە چۆنە؟ گوتی: (خۆشەویستی دەبێتە ئەرك) ئەگەر كەسێكت خۆشویست وەكو منداڵ ئەرك بخەیتە سەرشانی، وە (ڕق لێبوونەوە دەبێتە لەناوچوون) ئەگەر ڕقت لێی بوو پێتخۆش بێ لە ناو بچێ.

وَصَلَّى اللَّهُ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّد وَسَلَّم تَسْلِيمَاً، والْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي بِنِعْمَتِهِ تَتِمُّ الصَّالِحَاتُ.

**ســــيروان كاكــه أحـــمد**

**دوا پێداچوونەوە**

**هـــەولێر**

**٢٠٢٠/٦/١٢**

# نـــاوەڕۆك

